ناوی کتێب: دیوانی کوردی – بەرگی یەکەم
نووسینی: محەمەد مستەفا "حەمەبۆر"
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٤٧
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
هێلکاریی بەرگ: وێنەی مستەفا بەگی کوردی بەخەیاڵی هونەرمەند قەرەنی جەمیل
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٩٦ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

# پێڕست

## پێڕست بەرگی یەکەم

## پێڕستی بەگی دووەم

**هەڵبەستی (کوردی) بە شێوەزاری گۆران**



**بەشی فارسی**

## پێشەکی

ئەمە (٦٣) ساڵی ڕەبەقە شەیدای هەڵبەستەکانی (مستەفا بەگی کوردی)ی ساحێبقرانم.

بەر لەم ماوەیەیش، تا ئێستە چەند جارێک، دیوانی (کوردی) لە عێراق و ئێران و پاکستان چاپ کراوە و، لە گەلێ ڕۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنییە کوردییەکانیشدا، هەڵبەستی بڵاو کراونەتەوە. ژمارەی ئەو هەڵبەستە بڵاوکراوانەی گەیشتووەتە (٦٠) پارچەی هەڵە و ناتەواو و هەروەها ژیننامەی (کوردی)یش، بەهەڵە و ناڕاست نووسراوە.

منیش لەم ماوەیەدا بەپێی سەدان سەرچاوەی دەسنووسی کۆن و باوەڕ پێکراو، چاپکراوی جۆراوجۆر و لە دەمی سەدان کەسی شارەزا و ئەدەبدۆستەوە، (١٢٤) پارچە هەڵبەستی بێ هەڵە و ساغکراوە و تەواوی ئەوم گرد کردووەتەوە وێڕای دیاریکردنی زۆرترین بۆنە و، کاتی دانانیانەوە.

ژیننامەی (کوردی)شم بەدرێژی و ڕاستی و بەپشتبەستن بەبەڵگە ئەکادیمی و مەیدانییەوە ساغ کردووەتەوە، هاکا بڵێم کە (کەلێن)م لە سەراپای ژیانیدا نەهێشتووەتەوە و، پەیم پێ بردووە.

ئەم ڕاستییانەیشم لە ساڵی (١٩٧٠)ز.دا لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاو کردووەتەوە، چونکە بەڕێوەبەری گشتیی ئەوسای دەسگای هاوکاری جەمال عەبدولقادر بابان بوو کە بەڵێن و بڕیاری لە چاپدانی دیوان و ژیننامەی (کوردی)ی دابوومێ کە ئەوسا تەواوم کردبوو، بەڵام بەداخەوە مامۆستا بابان نەگەیشت ئەو ئاواتەم بێتە دی و، لەسەر ئەو کارەی نەما.

سەیر ئەوەیە کە لە دوای ١٠ – ١٢ ساڵ پاش تەواوکردنی ئەو دیوانە و، بەهۆی ئەوەوە کە ئەندامێکی (کۆڕی زانیاری عێراق) – دەستەی کورد – (المجمع العلمي العراقي – الهيئة الكردية) بووم وە بەنیازی ئەوەی کە کۆڕ ئەو بەرهەمەم بۆ چاپ بکات، هەر هەفتەیەی هەندێکی لێکۆڵینەوەکەم بۆ ئەندامانی ئەو کۆڕە دەخوێندەوە ئەویش تەنیا بۆ بڕیاردان لەسەر بڵاوکردنەوە یان نەکردنەوەی بەرهەمەکەم وەک خەبیرێک، ئەندامانیش بەبێ ئەوەی شتێکی سەرەکی بهاوێژنە سەر ئەم دیوانە. کەچی دوای ئەوەی هەمووییم بۆ خوێندنەوە،

هەندێ لە ئەندامانی کۆڕەکە مرخیان لە بەرهەمەکەم خۆش کرد کە گوایە ئەوانیش هاوتای مافی مـن لە لێکۆڵینەوەی دیوانەکەدا و لەوساوە تا ئێستا ئەو بەرهەمەم وەک ئەسپێی ناولەپی کوێر دەیگلوفنەوە و چاپکردنیان دوا خستووە.

## ژیننامەی کوردی

**پێشدەستی:**

بارودۆخی خۆرسک، جوگرافی، کۆمەڵایەتی، ڕامیاری، ئابووری، ئاینی و... هتد، کاریگەریی خۆیان لەسەر هەر تاکێکی نەتەوەکاندا، بەپێی هەڵکەوتوویی ئەو تاکانە نواندووە و دەنوێنن. هەر ئەو کاریگەرییەش لە هەڵبەستی هۆنەرانی نەتەوەیەکدا دەنگ و ڕەنگی داوەتەوە و دەداتەوە.

جووتە چەرخی ١٨ و ١٩ی زاینی لە مێژووی جیهاندا، تایبەتکاریی گرینگ و زەقیان لە ئاڵوگۆڕ و ژیانی مرۆڤایەتیدا هەبووە. مستەفا بەگی کوردیی ساحێبقران، ژیاوێکی نێوان ئەو جووتە چەرخە بووە. ئەمەش بەسە بۆ گرینگیی کوردی و بایەخی هەڵبەستەکانی. بۆیە ژیان و هەڵبەستەکانی کارتێکراوی ئەو بارودۆخ و ئاڵوگۆڕ و کارەساتەکانی هەردوو چەرخەکەن و ئاوێنەی سەردەمەکەی خۆیێن، وەک ئەم ڕاستییە لە بەرهەمەکەی مندا لەسەر هەڵبەست و ژیننامەی کوردی ئاشکرایە و بەدرێژی شی کراونەوە و بنەمایەکی گرینگی مێژووی ڕاستی نەتەوەکەمانە.

**ساحێبقران:**

ئەم وشەیە ناوی خانەوادەیەکی دێرینی (کوردستانی ئێران)ە و مێژووەکەیان هەڵدەگەڕێتەوە بۆ پێنج سەدە لەمەوپێش و لە سەرچاوە مێژووییەکاندا و ناوی دەیان زانا و، هونەر و جوامێر و گەورەپیاوانی هەڵکەوتووی ئەم خانەوادەیە بەدی دەکرێ. کە مایەی سەربەرزیی نەتەوەکەمانن.

لێرەدا بەکورتی هەر لەو بەشەی بنەماڵەی ساحێبقران دەدوێم کە کەوتووەتە ناو کوردستانی عێراقەوە و لە کورتە ژیننامەی کوردیدا کۆتاییی پێ دەهێنم کە ئەویش یەکێ بووە لەو خانەوادە ناودارە.

**ئەحمەد بەگی گەورەی ساحێبقران:**

پاڵەوانێکی ئازا و جەنگاوەری ئەم بنەماڵەیە بووە لە شاری سنەی کوردستانی ئێران،

لەسەر خواستی سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشای بابان کە لە ١٧٤٧ – ١٧٦٣ز.دا فەرمانڕەوا بووە. لە سنەوە گواستوویەتییەوە شاری قەڵاچوالانی پایتەختی ئەوسای بابان و کراوەتە سەرفەرماندەی سوپای فەرمانڕەوایییەکە و ڕاوێژگەی پاشای بابان. دەشڵێن یەکێک بووە لە جەنگاوەرانی دوازدە سوارەی مەریوان کە لە نێوان ساڵانی ١٧٤٧ – ١٧٧٢ز.دا ڕووی داوە. کە لە مێژووی جەنگدا کەم هاوتایە.

ئەو ئەحمەد بەگە باپیرە گەورەی ساحێبقرانەکانی عێراقە، بەئەحمەد بەگی گەورە ناوی دەرکردووە. لەبەر خۆشەویستی (ئەحان)یشی پێ وتراوە، کە چووەتە حەج بەحاجی ئەحان ناسراوە و هونەرێکی بەتوانایش بووە بەنازناوی شیعریشی (شەوقی) بووە کاتێک کە شاری سلێمانی ١١٩٨ک = ١٧٨٤ز.دا لەلایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە بنیات نرا، پایتەختی (بەبە) گوێزرایەوە سلێمانی، ئەحمەد بەگ بەخێزان و دەست و پێوەندییەوە هاتە سلێمانی و لە نزیک خانووەکەی خۆیەوە مزگەوتێکی دروست کرد کە تا ئێستاش گەڕەکی خانووەکەی و مزگەوتەکەش بە(حاجی ئەحان) ناو دەبرێن.

**خێزانی ئەحمەد بەگی گەورە:**

خێزانەکەی جگە لە خۆی و ژنەکەی، کچێک و دوو کوڕی هەبووە.

١– ژنەکەی: (سەلما خان)ی پورزای بووە و هەر ئەو ژنەی هێناوە.

٢– کچەکەی ئافتاو خان و لە خۆشەویستیدا ئاتە خانی پێ وتراوە هۆنەرێکی بەهێز و لە ئافرەتە ناودارەکانی کوردە.

٣– کوڕە گچکەکەی محەمەد بەگ بووە و خستوویەتە سەر گوندی قەرە جەهەننەم–ی لای سنە، بۆیە بە محەمەد بەگی قەرە جەهەننەم ناسراوە. کە هۆنەریش بووە و لە فاتمە خان–ی کچی سلێمان ئاغای ئیلیاس ئاغا کە ژنی بووە تاقە کوڕێکی لەو ژنە عەبدوڕەحمان بەگی سالم و هۆنەری بەناوبانگە کوردە بەهەڵبەستە گرینگەکانی بووەتە هۆمیرۆسی کورد.

٤– کوڕە گەورەکەی ئەحمەد بەگیش، مەحموود بەگ بووە کە لەگەڵ باوکیدا هاتووەتە قەڵاچوالان و سلێمانی و لە دوای باوکی کراوەتە وەزیری جەنگی بابان.

**خێزانی مەحموود بەگ:**

مەحموود بەگیش هۆنەرە و لە ڕەحمە خانی ئامۆزای دوو کچ و پێنج کوڕی هەبووە. لە

کوڕەکانی، هەر تەنیا لە مستەفا بەگی کوردییان دەدوێم کە ئەویش دوای مردنی حەمید بەگی برای لە سنە کە زۆر خۆشەویستی یەکتری بوون دەبێتە داشدیاری قادری برازای کە کوڕە بچکۆلەی حەمید بەگ بووە و کوردی خودانی دەکات و دەبێتە ئەو قادر بەگەی باوکی عادیلە خانم واتە خانمی ژنی وەسمان پاشای جاف کە خانم دایکی تاهیر بەگی جاف و ئەحمەد موختار بەگی جاف ناهیدە خانم کە ئەم هەر سێ کەسەش هۆنەر بوون، عادیلە خانمیش لە ژنانی ناوداری مێژووی کوردە.

**کۆتاییی مەحموود بەگ:**

کە فەرمانڕەوایی بابان لەلایەن عوسمانییەکانەوە بەدەسیسەی عەبدوڵا پاشای بابان ڕووخێنرا، ئەم مەحموود بەگەی باوکی کوردی بەهاوکاری لەگەڵ جوامێرێکی بابان (عەزیز بەگ) شۆڕشێک بەرپا دەکەن، بۆ گێڕانەوەی فەرمانڕەوایی بابان و عوسمانی تەنگاو دەکەن. عوسمانییەکان بەناچاری دەستی وتووێژ و ڕێککەوتن بۆ مەحموود بەگ درێژ دەکەن و ئەمیش بۆ گفتوگۆ دەچێتە کەرکووک و تورکەکان لەوێ لە کاتی نوێژکردندا پەلاماری مەحموود بەگ دەدەن و دەیکوژن و ئێستە گۆڕەکەی کە کەلانەکەی پشت تەکیەی تاڵەبانییە لە کەرکووک وێنەیەکی دیاری هەیە.

بەگوێرەی یەکەمین سەرچاوە کە پێشەکییەکەی یەکەم دیوانی (کوردی) کە (کوردی و مەریوانی) لە ساڵی ۱۹۳۱ز.دا لە بەغدا چاپیان کردووە، (کوردی) لە سلێمانی لەدایک بووە. هەر ئەو دوو چاپکارەش وەک دڵنیا نەبووبن لە ڕاستیی زانیارییەکان و بۆ خۆ قوتارکردن لە بەرپرسیاری لە هەمبەر مێژووی وێژەی، لە هەمان پێشەکیدا نووسیویانە:

«ئەم دیاریکردنی (شوێنی تیا لەدایکبوون)ە، بە(مەزندە)ی هەندێ کەس نووسراوە، لەو کەسانەیشدا هەندێکیان یەک ڕا نەبوون و ئیختیلافیان لە نێواندا هەبووە».

هەردوو (دیوانی کوردی) چاپی دووەم و سێیەم و مامۆستا گیوی موکریانی و دیوانی چوارەم و هەر چاپکراوێکی تری دوای چاپی یەکەم، هەر شاری سلێمانییان بەشوێنی لەدایکبوونی (کوردی) داناوە، بەبێ ئەوەی سەرنجی وشەی (مەندە)یان دابێ و بەدوایدا بچن و لێی بکۆڵنەوە.

**کوردی لە کوێ لەدایک بووە:**

من لە ساڵانی ۱۹۳۳ – ۱۹۳٦ز.دا بەهۆی خزمێکم کە ناوی (ساڵە نەریمان) بوو لە گەڕەکی (حاجی حان)ی نزیک ماڵی شاعیر، ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران بوو، خۆی

بەیەکێ لە دەستوپێوەندەکانی ئەو شاعیرە دەزانی، جارجارە لە دیواخانە هەمیشە ئاوەدانەکەی (ئەحمەد حەمدی بەگ) بەهرەمەند دەبووم. جارێکیان لە ناوبراوم بیست کە فەرمووی:

«مەحموود بەگی ساحێبقران» بەبۆنەی لەدایکبوونی مستەفا (کوردی)ی کوڕیەوە، هەڵبەستێکی داناوە و تێدا ڕای گەیاندووە کە کوردی لە قەڵاچوالان پایتەختی شانشینی بابان لەدایک بووە و ئەو شیعرەشم بەدەستنووس لە کەشکۆڵێکدا خوێندووەتەوە، کەشکۆڵەکە لە تاڵانکردنی ماڵەکەیاندا، دوای شکانی پاشایەتیی شێخ مەحموود، لە دەربەندی بازیاندا، لەناو چووە و لام وایە دەست ئینگلیزەکان کەوتبێ و نێردرابێ بۆ پەڕاویخانەیەکی میری لەندەن، هەروەها هەواڵی ئەو هەڵبەستە و لەدایکبوونی کوردیم لە میرانی تۆفیق بەگی برای ئەحمەد حەمدی بەگ بیستووە.

لەم جووتە هەواڵە لە یەکتری جیایەی (کوردی و مەریوانی) و جووتە برای شاعیر (ئەحمەد حەمدی بەگ) و (تۆفیق بەگی ساحێبقران) یەکسەر بڕوا بەڕاستیی شوێنی لەدایکبوونی کوردی دەکرێ کە:

(کوردی) لە قەڵاچوالانی پایتەختی باباندا لەدایک بووە، چونکە یەکەم ئەم دوو (شاعیر)ە (ساحێبقران)یەی خزمی مەحموود بەگ و (کوردی)ی کوڕی بوون. دووەم خۆیان شیعرەکەی مەحموود بەگیان خوێندووەتەوە و سێیەم مەحموود بەگ شیعرەکەی بەبۆنەی لەدایکبوونی ئەو کوڕە نۆبەرەیەوە دانەوە و چوارەم، هەواڵەکەی (کوردی و مەریوانی) لە خۆیانەوە نووسیویانە مەزندەیە کە لە شاری سلێمانی لەدایک بووە کە ڕاست نییە و پێنجەم هەردوو شاعیر (حەمدی بەگ) و (تۆفیق بەگ) شوێنی لەدایکبوونیان بەپایتەختی پاشایەتیی بابان ناو بردووە واتە کاتی لەدایکبوونەکەیدا. قەڵاچوالان هەتا ساڵی ١١٩٩ک – ١٧٨٤ز هەر پایتەخت بووە و شاری سلێمانی لەو ساڵە بەدواوە کراوەتە پایتەختی پاشایەتیی بابان.

**کاتی لەدایکبوونی کوردی:**

لە ساڵی ١٩٤٠ز.دا کەسایەتیی شیعردۆست، نامیق ئاغا مستەفا ئاغای حاجی حەسەنی سەر شەقام لە سلێمانی ناسی. نامیق ئاغا کەشکۆڵێکی باپیری لەلا بوو کە چەند ڕۆژێک بەدەستیاو لێم وەرگرت و دوای لەبەر نووسینەوەی ئەوەی پێویستم بوو، دامەوە بەخۆی، لەوانەی لەبەر ئەو کەشکۆڵەم نووسییەوە، ئەو هەڵبەستەی مەحموود بەگی

ساحێبقران بوو کە بەبۆنەی لەدایکبوونی (مستەفا)ی کوڕە نۆبەرەکەی دای ناوە.

پوختەی دیاریکردنی ساڵی لەدایکبوونەکەیش ئەمەیە: لە ڕۆژی سێشەمەی ١١ی مانگی موحەرەم (پایزی) ساڵی ١١٩٧ز.دا (مستەفای کوڕم تێدا لەدایک بوو).

بەلێکدانەوەی من ئەو ڕۆژی سێشەمەی ١٧ی مانگی کانوونی یەکەمی ١٧٨٢ز.یە وەک دەردەکەوێ ئەو ساڵە (کۆچی)یەی کە لە یەکەم (دیوانی کوردی)دا هاتووە، ئەو ساڵەیە کە مەحموود بەگ دیاریی کردووە.

لە یەکەم دیوانە چاپکراوەکەی و ئەو چاپکراوانەی دوای ئەودا نیو باڵی (یەک میسرەع)ی فارسی نووسراوە کە گوایە کوردی لەسەر نقێمی ئەموستیلەکەی خۆی ناوی باپیری و باوکی خۆی هەڵکەندووە کە وەک (مۆ ر= شەقڵ) یا (ئیمزا) یا (پەنجەمۆر)ی ئێستە بەکار هاتووە.

بەپێی ئاگاداریم لە بەند و باوی کۆن، ئەو نووسینانەی سەر ئەموستیلەکە بەزۆری بەپێی نەریتی ئەبجەدی ساڵی لەدایکبوونی خاوەن ئەموستیلەکەیش بووە. لە گەڕانم بەدوای هەڵبەستێکی کوردیدا هەڵبەستێکی فارسیم دەس کەوت کە نووسراوی سەر نقێمی ئەموستیلەکەی کوردی (نیو باڵی) ئەو هەڵبەستەیە کە لەم دیوانەدا نووسیومە بەپێی پیتی (ئەبجەدی) لەو هەڵبەستەدا، ئەو نیو باڵییەم لێک داوەتەوە کە هێشتا بەر لەم نووسینی ئەم دیوانە، کەس ئەوەی لێک نەداوەتەوە کە هەڵکۆڵراوی سەر ئەموستیلەکەی کوردی ساڵی لەدایکبوونی (کوردی)یش دەگرێتەوە، تەنانەت سەرچاوە چاپکراوەکانیش نووسینی سەر ئەموستیلەکەیان تەنیا بە(مۆر)ەکەی کوردی ناو بردووە.

نووسینەکەیش ئەمەیە:

«احمد است جد و پدر محمود نامم مصطفی»

واتە: (ئەحمەدە باپیر و باوک مەحموود و ناوم مستەفایە).

ئەمیش گۆڕینی ئەو نووسینەیە بەپیتی ئەبجەدی:

«احمد است = ٥١٤ + جدو = ١٣ + پدر = ٢٠٦ + محمود = ١٠٤ + نامم = ١٣١ + مصطفی = ٢٢٩» کە کۆی ئەم هەموو ژمارانە دەکاتە (١١٩٧) و ئەم ژمارەیەش هاوچەشنی ژمارەی ساڵی کۆچی (ئیسلامی = هیجری)ی یا لەدایکبوونەکەی (کوردی)یە ئەو ساڵە کۆچییەش بەرامبەرە بەژمارەی ساڵی ١٧٨٢ زاینی کە ئەمەش لەگەڵ دیاریکردنەکەی (کوردی و مەریوانی) و شیعرەکەی مەحموود بەگی باوکی کوردیدا یەک دەگرنەوە کە بەپێی ئەمەش کوردی بەساڵنامەی کۆچی (٧٩) ساڵ و بەساڵنامەی زاینی ٧٧ ساڵی تەمەن بووە.

**خوێندنی کوردی:**

بیستوومە و بەساغکردنەوە دڵنیا بووم لەوەی کە خوێندنی کورد بە سێ قۆناخ بووە کە بریتین لە:

قۆناخی یەکەم:

کوردی لە ٤ – ٥ ساڵانیدا لە سلێمانی خراوەتە (حوجرە)ی ناو مزگەوتی حاجی حان کە باپیری دروستی کردووە. لە زیرەکیدا بەتەمەنی ٨ – ٩ ساڵانی سێ جزمەی قورئانی پیرۆزی خوێندووە، بێ هەڵە و بەدەنگە خۆش و ناسکە منداڵانەکەی لە دیوانەخانەکەی مەحموود بەگی باوکیدا خوێندوویەتەوە کە مایەی سەربەرزیی خۆی و ئافەرینی هەمووان و پێخۆشبوونی باوکی بووە، کە ئاواتەخوازی ئەوە بووە (مستەفا)ی کوڕە گەورەی ببێتە مەلا چاکێک.

وەکو جاران باو بوو لەگەڵ خوێندنی قورئانیشدا، وردە پەڕاوی کوردی، عەرەبی، فارسی و تورکی بەئاینی و وێژەیی و مێژوویی و... خوێندوون کە لە ڕێڕەوی (١٠ – ١٢) ساڵانیدا بەرنامەی خوێندنی (حوجرە)یە. بە لەبەرکردن، هەندێ لەو پەڕاوییانەی بەچاکی تەواو کردووە. هەرچەندە ئەم تەمەنی ١٠ – ١٢ ساڵانییە، بەپێی بەرنامەی خوێندنی فەقێیەتی نەدەبوو لە مزگەوتدا وەربگیرێ، بەڵام چونکە مزگەوتەکە هی بنەماڵەی (کوردی) و مووچەی مامۆستایەکانی و مەسرەفی مزگەوتە لەسەر کیسەی مەحموود بەگی باوکی بووە، بۆیە گورج بەفەقێ وەرگیراوە، بڕوانە هەڵبەستی ژمارە ٤٠ و ٤١ی دیوانەکە.

کوردی لە خوێندنی مزگەوتیدا وەک خوێندنەکەی حوجرەی هەر لە پێشکەوتندا بووە و زۆر لە هاوخوێندنەکانی خۆی بەجێ هێشتوون و لە دەورکردنەوەدا هەڵەی بۆ ڕاست کردوونەتەوە، سەرەڕای بەهرەمەندیی کە ناوبانگی پێوە پەیدا کردبوو. بەهۆی ئارەزووی زۆری خوێندن و زیرەکییەکەیەوە، کە لە ١٤ – ١٥ ساڵانی تێ پەڕیوە، خوێندنەکەی گەیشتووەتە پلەی موستەعیدی.

قۆناخی دووەم – وازهێنان لە خوێندن:

لەم سەروبەندە کامەرانییەی (کوردی) و خێزانەکەیدا، مەحموود بەگی باوکی کە وەزیری بەرگریی پاشایەتیی بابان بوو ڕاپۆرتێکی گرینگ لەبارەی بنکۆڵبوونی پاشایەتییەکە، وێڕای هەندێ پێشنیاز و پلان بۆ بەگوڕهێنانەوەی میرایەتییەکە، وەخۆکەوتن دژی ناپاکە

ناوخۆییەکان، چارەسەرکردنی ناکۆکییە بنەماڵەییەکان و هەروەها پووچەڵکردنەوەی پیلانی ناحەزان دەداتە مەحموود پاشا، ناوبراو ئەو پێشنیاز و پیلانانەی (وەزیر) پەسند ناکات و، وەزیر زویر دەبێ و ماڵی دەپێچێتەوە و بەخێزان و دەستوپێوەندییەوە دەچێتە کەرکووک.

کەرکووک ئەوسایە بەهۆی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی بابانەوە هێزێکی تێ گەڕابووەوە. مەحموود بەگ چەند ڕۆژێک میوانی دۆستێکی دەبێ بەخێزان و دەستوپێوەندییەوە هەتا دوو خانووی زۆر گەورە بەتەنیشت یەکەوە دەگرێت بۆ نیشتەجێبوونی خۆی و خێزان و پیاوەکانی (لە گەڕەکی صاری کەهیە) و دوای ئەوە گورج مستەفای کوڕی لە مزگەوتەکەی (صاری کەهیە) بۆ خوێندنی (موستەعید)ی دادەمەزرێنێ. ئەو گواستنەوە چاوەڕواننەکراوە لە کوردی دەبێتە ئاگر و لە لەش و دەروونی بەردەبێ، بەهۆی ئەم گیروگرفتانەی خوارەوە، وەک:

أ- جیاوازیی ژیانی سلێمانی و کەرکووک کە (کوردی) پێی ڕانەهاتبوو.

ب- دوورکەوتنەوەی (کوردی) لە خزم و مامۆستا و هاواڵ و ئاشنایانی کە بارێکی سەخت بوو بەسەریەوە.

ج- کوردی لە کەرکووک خۆی بەئاوارەیەکی کەس نەناس زانیوە.

د- نائاشنایەتیی لەگەڵ مامۆستایان و هاواڵە فەقێ نوێیەکانی لە کەرکووک.

هـ- بەر لە دەرچوونی لە سلێمانی دەستی دابووە هەڵبەستدانان و بۆیە لە باوکی و دایکی و خزمانی سارد بووە و لە کەرکووک، هاواڵێکی نەبوو کەفوکوڵ و هەڵچوونە دەروونییەکەی هەڵبەستەکانی لەلا دەرببڕێ و پێی ئارام ببێ.

و- بارتەقای ئەو هەموو دەرد و مەینەتییانە، ئەو هەواڵە ناخۆشانەش بوون کە ڕۆژانە لەبارەی دژواریی باری سلێمانی و چرووکیی بەڕێوەبەرایەتیی گەندەڵانەی ئەو شارە و، ئەو دووبەرەکی و چەند بەرەکییەی پاشاکانی خانەوادەی بابان لە ناو یەکدا، خراپەی بەکرێگیراوە خۆییەکان، ئاژاوەنانەوە و پەلامارەکانی ڕۆم و عەجەم و کنەکردنی دوشمنانەی والییەکانی ئەو دوو ڕژێمە ئەم چەشنە هەواڵانە گەیشتوونەتە خێزانەکەی کوردی و خەفەتی بێ دەسەڵاتییەوە تلاندووینەتەوە.

ئەمانە و کۆمەڵێ کۆسپی گرانی تر سەر و دڵی (کوردی)یان گرتووە و تاقەتی خوێندنیان لێی بڕیوە و، دڵی لێی سارد بووەتەوە. هەرچەندە مامۆستایەکانی ئامۆژگاریی دەکەن و

مەحموود بەگی باوکیشی لێ ئاگەدار دەکەنەوە و هەرچەندە باوکی و دایکیشی هانی دەدەن کەڵکی نابێ. کتێبەکانی بەسەر فەقێ هەژارەکاندا دابەش دەکات و بەوە دوا قۆناخی خوێندنەکەی کۆتاییی دێت و لەوە دوا یا لە ماڵەوە، یا لە مزگەوت لەگەڵ خێزانەکەی و مامۆستا و فەقێیان ڕۆژ بەسەر دەبات و خوو دەداتە چیرۆک و داستان خوێندنەوە. بڕوانە باسی (داستان و چیرۆکنووسی)یەکەی کە هۆیەکی ئارام گرتنی بووە.

### دڵداریی کوردی(*)

(کوردی) لە کەرکووک لەگەڵ کچی پیاوێکی کرێکاری دراوسێیان، دڵیان بەیەک چووبوو. جوانی و ڕێکوپێکی و شەنگ و شۆخییەکەی ئەو کچە کە ناوی (چنار) بووە بە(چنە) ناسراوە لە کەرکووکدا دەنگی دابووەوە، (کوردی)ی شێت و شەیدا کردبوو، چونکە بەپێی بەند و باری کۆمەڵایەتیی خانەوادەکەی هەرچەند بیری کردووەتەوە ناگونجێ کوڕە وەزیرێک لە خانەوادەی ساحێبقرانی ناودار، کچی کرێکارێک مارە بکات. بۆیە ئەو دەردە پەستاوەتە دڵییەوە و دیوانە ئاسا ئارامیی لێ بڕاوە و پێوەی تلاوەتەوە و لای باوک و دایکی ئاشکرای نەکردووە، کە باوکی (کوردی) لەگەڵ پاشای باباندا ئاشت بووەتەوە و گەڕاوەتەوە سلێمانی، یەکەم کارێک دەستی داوەتێ، هەوڵی ژنهێنان بووە بۆ مستەفای کوڕی. مستەفا بەگیش بەهەموو (نامۆ)بوونێکەوە دژی ئەو ژنهێنانەی ڕاوەستاوە، بەڵام باوکی و دایکی بەهۆی هاواڵەکانیەوە زانیویانە کە کوردی گوتوویەتی: (یا چنە یا چ نە) و باوکی لە ترسی ئەوەی کوڕەکەیان لە دەست نەچێ قیروسیای لە چینی خانەوادەییی کردووە بڕیاری داوە لەگەڵ دایکی مستەفادا بڕۆنە کەرکووک و سووسەی ڕەوشتی خانەوادەی (چنە) بکەن (مستەفا) گوتوویەتی دەبێ منیش لەگەڵتاندا بێم.

مەحموود بەگ و خێزانەکەی و کوردی دەچنە کەرکووک و لەوێ تێ دەگەن کە دوای چەند هەفتەیەک لە گواستنەوەیان بۆ سلێمانی ڕۆژێک (چنار = چنە) لە گەڕانەوەیدا لە ماڵی خزمێکیان دوو پیاوی نەناس پەلاماری دەدەن دوایی دەیبەستنەوە و دەیخەنە ناو گوونییەکەوە و دەیفڕێنن و پاش هەفتەیەک بەدەم و دەست و قاچی بەستراوەوە لە ناو گوونییەکدا لە نزیک ماڵەکەی (چنە) فڕێی دەدەن و کە دراوسێ لە گوونییەکەی دەردەهێنن هەر هەوڵی خۆکوشتن دەدا و وەک شێتی لێ دێ و دوای ٢ - ٣ مانگێک منداڵێکی لەبار

(*) بەسەرهاتی دڵداریی (کوردی)م لە مامۆستا محەمەد جەلال حەیدەری (مەلا جەلالی سەعاتچی) لە ١٩٨٣/١٢/١٦دا وەرگرتووە.

دەبەن و دەڵێن چنە وەک شێت وایە هەر دەگری (مستەفا بەگ) دەڵێ دەمەوێ خۆم چنە ببینم، ئەگەرنا بڕواتان پێ ناکەم و کە دەڕۆنە ماڵی چنە (مستەفا بەگ) و (چنە) یەک دەبینن هەردووکیان دەبوورێنەوە (مستەفا بەگ) کە دێتەوە هۆش خۆی بەگریانەوە ڕوو دەکاتە ئاسمان و دەڵێ:

«خوایە کە کار وا لێ هات ئیتر هەرچی ژنە لە من حەرام بێت» بۆیە لەودەمەوە هەتا مرد ژنی نەهێنا.

(ناو) وە (نازناوی):

أ- ناو:

(کوردی) کە لەدایک بووە، مەحموود بەگی باوکی بەناو باپیری خۆیەوە، واتە باوکی ئەحمەد بەگی گەورەوە ناوی ناوە (مستەفا). مەحموود بەگ لەو هەڵبەستەیدا کە بەبۆنەی لەدایکبوونی کوڕە گەورەکەیەوە ناوی (مستەفا)ی بۆ دیاری کردووە. مستەفا خۆیشی لە نیوباڵێیەکی فارسیدا کە لەسەر نقێمی ئەموستیلەکەی هەڵکەنراوە، فەرموویەتی:

«احمد ست جد پدر محمود نامم مصطفی است»

واتە: ئەحمەد و باپیر و باوک مەحموود و ناوم مستەفایە.

حاجی قادری کۆیی لە نیوباڵییە هەڵبەستێکیدا فەرموویەتی:

«مستەفایە تەخەللوصی کوردی».

ب- نازناو:

بەپێی دەستووری وێژەی کۆن دەبوو هەر شاعیرێک ناوێکی هەبێ بۆ پێناسەی شاعیریەتییەکەی، ئەو نازناوەش لە دوا بەیتی هەر پارچە هەڵبەستێکیدا ڕابگەیەنێت، یا بەر لە دوا تاکەیدا دیاریی بکات یا هەر بەو نازناوەوە ناسراوە لە هەڵبەستیدا و بەکاری نەهێناوە.

شاعیریشمان هەبووە لە یەک نازناو پتری هەبووە، (مستەفا)ش یا بەپێی خانەوادەکەی کە (مستەفا بەگ)یشی پێ وتراوە دوو نازناوی هەبووە.

ج- نازناوی یەکەم:

(مستەفا بەگ) لە سۆنگەی شانازیی بە نەتەوە و نیشتمانەکەیەوە، نازناوی (کوردی)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

گیوی موکریانی لە پێشەکیی چاپی (دیوان)ەکانی (کوردی)دا، ئەم شاعیرەی بەوە هەڵناوە کە ئەم ناوە پیرۆز و نیشتمانپەروەرانەیەی داوە بەخۆی، منیش لەم ڕایەدا لەگەڵ ناوبراوم؛ چونکە لاپەڕەکانی مێژوویە باسی گەلێ زانا و هۆنەری کوردیان تێدایە کە بەر لە (مستەفا بەگی کوردی) بەسەدان ساڵ نازناوی (کوردی)یان هەبووە.

د- نازناوی دووەم:

(کوردی) لە گەڕیدەیی و لە دەرەوەی کوردستاندا، وەک یادکردنەوەی کوردستان و دەربڕینی خەمی دووربوونەکەی لە هەموو ئەو چەشنە هەڵبەستانەیدا لە جێگەی نازناوە (کوردی)یەکەی، نازناوی دووەمی خۆی بەکار هێناوە کە (هیجری)یە وەک لە یەکێک هەڵبەستی فارسییەکانیدا فەرموویەتی:

«کردم و کردی تخلص، هیجرتم هجری ربود»

واتە: «کوردم و کوردی نازناومە و گەڕیدەییم نازناوی (هیجری)می بۆ خۆی فڕاند»

زۆربەی هەڵبەستە فارسییەکانی لە دەرەوە و بەناوی «هیجری»یەوەن، زۆربەی سەرچاوە و دەسنووس و چاپکراوەکان ئەم نازناوی (هیجری)یەی کوردییان دیاری کردووە. هەر لە سەرێنی (کوردی)دا زۆر شاعیر هەبوون کە نازناوی (هیجری)یان هەبووە وەک: (سەید فەیزوڵای موکری) و (حاجی شێخ محەمەد ئەمینی کەسنەزان) کە ئەمیان دۆستی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ و سەردولکەبێژی بووە.

بەهۆی بوونی ئەم دوو نازناوەی (مستەفا بەگ)ەوە پێویستە بڵێین هەندێ لە شاعیری تریش هەردوو نازناوەکەیان هەبووە بۆیە نامەوێ ئەوانی نازناوی (هیجری)شیان هەبووە، بخەمە ئێرەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ زۆر بەپارێز و وریاییەوە هەڵبەستی (مستەفا بەگ) هەڵبژێردرێن و ساغ بکرێنەوە و جێگیر بکرێن و لەگەڵ یەک تێکەڵ نەکرێن. وەک لەم دیوانەدا ئەمە ڕەچاو کراوە.

قوتابخانەی شێوەی هەڵبەستی کوردی:

(کوردی) شاعیرێکی بەتوانا و پایە بەرزە، لە ساز و سۆز و سادەیی و ڕەوانی و ناسکی و دڵگیری و هونەرمەندیشدا دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەت و داهێنەرانە بووە. ئەو قوتابخانەیەی وەک چراخانێکی مێژووی وێژەی کوردی، دەروونی بەسەدان شاعیری پڕ ئەوین کردووە و بوونەتە قوتابیی کوردی و قوتابخانەکەی. هەڵبەستەکانی (کوردی)، دەربڕدراوی هەستێکی خەست و پەنگخواردووی پڕ جۆش و خرۆشی دەروونی و

دامرکێنەرەوەی کەفوکوڵ و هەڵچوونی ناخی بوون و هاوچەشنی هەمان هەست و خرۆش و خواستی هەرە زۆری تاکەکانی نەتەوەکەیشی بوون کە ئەم هاوچەشنیی ئارەزووە، هۆی بەدڵاچوون و پەسندکردنی هەڵبەستەکانی بوون و لە لای هەمووانەوە و زۆرتر لە هیی شاعیرانی هاوچەرخی (کوردی) وەک نالی و مەولانا خالید و...

(کوردی) شاعیرێکی بوێر و هەمیشە لەسەرپێ بوو، لە هەڵبەست و لە ئاخاوتنیشدا. ئەمەیش مایەی شکۆداریی بووە نەک هەر لای قوتابییانی، بەشکو لای هەمووان. لەو هەڵبەستانەیدا دەستم کەوتوون (بێ ئەدەبی و بێ شەرمی)م نەدیوە.

**کوردی و بەیتبێژی و چیرۆکنووسی:**

ناتوانم بڵێم یەکەم کەسێکم کوردی بەدانەری بەیت و چیرۆک و یا کەسێک دابنێم کە لە زمانەکانی فارسی و عەرەبی و تورکییەوە کردوونی بەهەڵبەست یا پەخشانی کوردی، وەیا هەر لە دەرفەتێکی ژیانیدا نووسیویەتەوە و فرۆشتوونی و سەرچاوەیەکی بژێوی بوون. بەڵام دەتوانم بڵێم ئەم پیشەیەی (کوردی) وەکو گەنجێک وایە کەوتبێتە ژێر کەلاوەیەکی رووخاوی دێرینەوە و بەدرێژاییی رۆژگار لە بیری چووبێتەوە و من یەکەم کەسێکم بۆم رێک کەوتووە کە ئەو گەنجە نهێنییە لە بن ئەو داروپەردووەدا دەرهێناوە و، بەبیر خەڵکم هێناوەتەوە و جارێکی تر گیانم کردووەتەوە بەبەریدا و ئەو بۆ رێککەوتنەیشم بەم جۆرە بووە:

(هێشتە لە حوجرە دەمخوێند و تازە فێری خوێندنەوە و نووسین بووبووم کە باوکم جارجارە کورە هاواڵی منداڵی دراوسێمانی شەوانی زستان بانگ دەکرد کە بەیت و چیرۆکی بەهەڵبەستی هەتا نزیکی خەوتنان بۆ دەخوێندینەوە، بەو جۆرە هەر شەوە هەندێکی چیرۆک و بەیتەکەی بۆ تەواو دەکردین. ئەو کوڕی هاواڵەی باوکم، ناوی مستەفا ئەفەندیی کوڕی حاجی ئەحمەدی فاتێ بوو، ئەو حاجییەی برادەری باوکم چەخماخسازێکی زۆر شارەزا بوو لە چاککردنەوەی هەموو جۆرە چەکێک و دروستکردنی باروت و فیشەک داگرتنەوەدا و دووکانەکەی لە ماڵەکەی خۆیدا بوو.

ئەو مستەفا ئەفەندییە بەیت و چیرۆکخوێنە خوێندەوارێکی رۆشنبیر و خۆشنووس و وێژەوانێکی بەئاگا و ئەدەبدۆست بوو. لەبەرئەوە بەرۆژیش بۆ خۆ پێ ژیاندن، کەشکۆڵ و بەیاز و پەڕاو و بەیتە کوردییە هەڵبەستراوەکانی وەک (بێژەن و مەنیجە، کاکە لاس، بارام و گوڵەندام، شیرین و فەرهاد، شیرین و خوسرەو، خورشید خاوەر، لەیلێ و مەجنوون، یووسف

و زولەیخا، ڕۆستەم و زۆراب، خەج و سیامەند، دز و قازی و کەهرەمان، ئەرچۆ و شرۆ، محەمەدی حەنیفە، سەما و زەمین، مشک و پشیلە، جەنگی خەیبەر و میعراجنامە، مەولوودنامە، نان و ماست و... هتد. بەپارە بۆ خەڵک دەنووسینەوە کە هەندێکیانی دەدایە پاڵ (مستەفا بەگی کوردی) وەک شیرین و فەرهاد، ڕۆستەم و زۆراب، دز و قازی و... هتد، من ئەوسایە بەهۆی مامۆستای حوجرەمەوە (مستەفا بەگی کوردی)م دەناسی و شیعری ئەویشم لەبەر بوون. بەڵام یەکەم جار بوو لەوەوە بەبەیت و چیرۆک دانەریی (کوردی)م زانی. باوکم لەگەڵ ئەو (مستەفا ئەفەندی)یە ڕێک کەوت لە ڕۆژدا بەعەسران هەتا نوێژی شێوان چەند بەیتێکی هەڵبژاردەم بۆ بنووسێتەوە و ئەو بەیتانەیشم پێ بخوێنێت و ئەوەیشی لەگەڵدا کردم، خۆم لە ماڵەوە بۆ باوکم و دایکم و خوشکم و خزمانم دەخوێندنەوە. تەنیا بەیتی محەمەدی حەنیفە و نیوەچڵێکی شیرین و فەرهادە کە ماون کە بەناوی (کوردی)یەوەن.

ئەوەی شایانی باسە ئەو شیرین و فەرهادەیان کوتومت وەک (شیرین و فەرهاد)ەکەی نەشرەی (دەنگی گێتی تازە)ی ساڵی ١٩٤٦ز.یەکەی سەید حوسێن حوزنی موکریانییە.

(مامۆستا حوزنی)یش لە پێشەکییەکەیدا نووسیویە:

«دانەرانی ئەم بەیتە وەک (مستەفا بەگی بێسارانی و... وەهان) منیش بەرامبەر بەم دەقەی مامۆستا حوزنی دەڵێم:

ئەو دەقە هەڵەی چاپیی تیایە و ڕاستییەکەی: (مستەفا بەگ و بێسارانی) و نەخوازەڵا حوزنی نووسیویە ئەوانەی نەینووسیوە ئەوەی... و جگە لەوە بێسارانی بە(مەلا) بەناوبانگ بووە نەک بە(بەگ) وە بێگومان لەو گۆڕینی بەکوردییەشدا دەسکاریی کردوون.

ئاواتەخوازم لە دەستنووسەکانی ئەو (مستەفا ئەفەندی) کە بە مەرەکەبی مۆر و، لەسەر دەفتەری لاپەڕە فۆلسکاپی خەت خەتی مەکتەب دەینووسینەوە سەر هەڵبدەن و ئەم نهێنییە ئاشکراتر بێ.

**دۆزینەوەی گۆڕی کوردی:**

دوای ئەوەی عەبدوڵا پاشای بابان، کە تێکدەری فەرمانڕەواییی بابان بوو، گۆڕەکانی کوردی و سالم و ئەحمەد بەگی باپیریانی تێک دابوو کە بەمەرمەڕ هەڵبەسترابوون، منیش لە بەدواداگەڕان و پرسیار و سۆراخدا لە پیاوە شارەزا و وێژەوانە کۆنەکان و کەسانی ساحێبقران وەک: ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران، تۆفیق بەگی برای، هۆنەری مەزنمان عەلی باپیر ئاغا کەمالی و... هتد. هەر لە ساڵە سییەکانەوە گۆڕەکەی (کوردی)م پێ زانیوە.

بەتایبەتی ئەحمەد حەمدی بەگ بۆ یەکەم جار یەکێ لە پیاوەکانی کە: ساڵە نەریمان-ی حاجی خان کە خزمیشم بوو لەگەڵمدا ناردی و نەک هەر گۆڕەکەی (کوردی) بەشکو گۆڕەکەی سالم-یشی نیشان دام بەگردی سەیوانەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی شوێنی ئەو جووتە گۆڕەیشم لە چەند مەلایەکی کوێری پیری قورئان لەسەر گۆڕستانخوێن (حافظ)ی ئەوساوە بۆ دەستنیشان کرابوو.

ئیتر لەوساوە گەلێ جار، لە بۆنەی تایبەتیدا تێ کۆشاوم و هانام بردووەتە بەر گەلێ لە سامانداران و لە چەند دەرگای دەسگای وەک ئیدارەی مەحەللیی سلێمانی و ئۆتۆنۆمیی هەولێر و بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن لە بەغدا داوە، بۆ ئەوەی لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا بە کێل یا ئەستوندەیەک هەریەکێ لەو جووتە گۆڕە دیاری بکرێن. تەنانەت لە وتارێکمدا کە لە ئێوارەکۆڕێک لە ١٩٨٣/١/٢٣دا پێشکێشم کرد و لە وتارێکی ترمدا لە بیرەوەریی ٢٠٠ ساڵەی بنیاتنانی سلێمانیدا و لە گۆڤاری ڕەنگینی ژمارە ٨٥ی ساڵی ١٩٩٥ی زاینیدا کە بەدرێژی شوێنی جووتە گۆڕەکەم تیا ڕاگەیاندووە. بانگەوازی چارەی ئەو دوو گۆڕە بێ نازەم بڵاو کردەوە بەڵام هەموو تەقەلایەکم بێ سوود بوو.

لە سەرەتای مانگی ڕەزبەر (ئەیلوول)ی (١٩٩٨ز)دا بۆ دواجار بەهۆی ڕۆژنامەگەر د. شێرکۆ فەتحوڵڵا، سەرنووسەری سیخوڕەوە/ هەمان هانام بردە بەر بەڕێز هێرۆ خان و ئەویش بەبێ سێ و دوو دەسبەجێ فرمانی دا کە هەردوو هونەرمەندی پەیکەرتاش زاهیر سدیق و ئاکۆ غەریب بگەیەنمە سەر جووتە گۆڕەکە بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی شایان بەو دوو گوڵکۆ پیرۆزە و هەروەها هێنانە دیی ئاواتەکەم.

**مردنی کوردی:**

بۆم ساغ بووەتەوە کە ئەو هەڵبەستەی حاجی قادری کۆیی دایناوە چوار تاکە هەڵبەستی لە دواوە ڕانەگەیەنم، مەبەستی لە کاتی مردنی (کوردی) بووە کە فەرموویەتی:

شەهسواری بەلاغەتی کوردان
یەکەبازی فەساحەتی بابان
مستەفایە تەخەللوصی کوردی
غەزەلی کردە بەربوتی کوردی
ئیسمی ساحێب قران خاصی ئەوە
چونکە لەم عەرصە ئەسپی ئەو بەدەوە

ئەو کـــە نۆشـی شــــەرابێکی تاڵی
(نـالـی) ئەو وەخـــــتــــــە بـووە تـالـی

لەم هەڵبەسـتـەدا ڕسـتـەی (ئیسـمی سـاحـێب قڕان خـاصـی ئەوە)، بە نەریتـی حیسـابی ئەبجەدی و بەڕێنووسی کۆن پیتەکانی وشەکەی (اسمی صاحبقران خاصی اوه) ئەکاتە (١٢٧٦) کـە ئەم ژمـارەیەش ئەو سـاڵی کـۆچـیـیـەیە کـە (کـوردی) گـیـانی تـیـا دەرچووە و (کوردی)یش بەر لە نالی مردووە و ئەو ساڵە کۆچییەش بەرامبەرە بەساڵی ١٨٥٩ی زاینی، کە کۆچی تیا کردووە. ئەمە لە کاتێکدا، کە هەموو سەرچاوە چاپییەکان بەهەڵە و مەزەندە ساڵی مردنی (کـوردی)یان بە(١٨٤٩) زاینی دانـاوە، وە من گەلێ بەڵگەی بەهێـزی تریشـم هەن بۆ جێگیرکردنی ئەم ڕاستییە کە لە بەرهەمەکەمدا بەدرێژی نووسراون و (کوردی) لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا نەمردووە بەشکو لە ٧٧ ساڵیدا مردووە نەک لە چل ساڵیدا.

ئەم دیاریکردنە ڕاستەی کاتی لەدایکبوون و مردنەی (کوردی) من جێگیرم کردووە و بەر لە من ئاوا ڕانەگەیەنراوە.

**کوردی لای گەورەپیاوان:**

جگە لەوانەی ناڕەواییـیـان کردووە و (کـوردی) بێ پەروا لێیـان دواوە و بـوونەتە دوژمـنی، ئیتر کەسێکی خۆشەویست و لای هەمووان بەڕێز بووە. هەمیشە لە سەرووی دیوانی مەلا چاک و زانا و پاشـا و گـەورەپیـاوانەوە جـێگەی کـراوەتەوە و کـەڵکیـان لە ناوەرۆکی هەڵبەسـتـەکانی وەرگرتووە و پێیـان دڵخـۆش بوون. ئەمەش وەنەبێ بەشـاعیـرێتی بەسـەر کەسانەوە ژیابێ چاوی لە دەستی کەس و خوازەڵۆک نەبووبێ و لەوانەیش:

أ- لەگەڵ مەحمود پاشای عەبدوڕەحمان پاشای باباندا دۆستایەتییەکی پتەوی هەبووە.

لە هەڵبەستی ژمارە (٣١)یدا کە لە بارەگەی محەمەد عەلی میرزای قاجاری (والی)ی کرماشاندا لەمەڕ دۆستایەتیی خۆیەوە بۆ ئەو مەحموود پاشایەی داناوە کە زۆر کەس بۆنەی ئەو هەڵبەستەیان بەهەڵە لێک داوەتەوە.

ب- پێوەندیی (کوردی) دیسان لەگەڵ دوا پاشای بابان (ئەحمەد پاشا)دا زۆر خۆش و لەلای ئەو پادشایە بەڕێز بووە. کوردی چەندان هەڵبەستی لەمەڕ ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ ئەحمەد پادشادا داناوە و لە ئەستەمبووڵ و لە پاریسیش سەری لێ داوە.

ج- دۆستایەتیی کوردی لەگەڵ (عوسمان بەگ)ی برای مەحموود پاشادا لە هەڵبەستی ژمارە (٢٢)یدا دیارە. من ئەو (عوسمان بەگ)ە بەو عوسمان بەگە نازانم کە شێخ

ڕەزای تاڵەبانی لە باسی (کۆیی)یاندا لێی دواوە.

د- عەزیز بەگی بابان و کوردی جووتێ دۆستی گیانی بەگیانیی یەکتر بوون و لە هەڵبەستی ژمارە (١٩)ەیدا ئەو پێوەندییەیان دەردەکەوێت و هاوبەشی شۆڕشەکەی دوای ڕووخێنرانی بابان بوون.

هـ- کوردی و کەیخوسرەو بەگی سەرکۆماری (جاف) زۆر دۆست بوون، لە هەڵبەستی ژمارە (٩٩)یدا کوردی ئەو دۆستایەتییەی ڕاگەیاندووە.

و- هەڵبەستی ژمارە (٦٨)ی کوردی نیشانەی دۆستایەتییەتی لەگەڵ گەورەپیاوی بەناوبانگ مەحموود ئاغای شیوەکەلدا کە لە پیاوی بەرپرسیارێکی بەڕێوەبەرایەتیی بابان بووە لە ناوچەکەیدا.

ز- دۆستایەتیی کوردی لەگەڵ (ئەحمەد ئاغا)ی کوڕی ئەو (مەحموود ئاغای شیوەکەل)دا لە هەڵبەستەکانی (٦٨ و ٩٠)یدا ئاشکرایە.

ح- دۆستایەتیی لەگەڵ حەکیم باشی سەر پزیشکان)ی سەرێنی بابان بابەجانی بەناوبانگ و یەکەم هەڵبەستی ژمارە (٤٩)ی (کوردی) دەوری دەکات.

ط- فەخرولعولەمای سنەیی (مەردۆخی) کە ناوی خۆی بەخۆیەوەیە، دۆستێکی تێکەڵ بووە کە لە هەڵبەستی ژمارە (٤١)ی کوردیدایە.

ی- یەکێ لە هۆنەرانمان مامۆستا مەلا عومەر و زانای پسپۆڕی گەردووناسی کە نازناوی (ڕەنجووری) بووە و یەکێ لە دۆستە خۆشەویستەکانی (کوردی)یە و (کوردی)یشی لەلا بەڕێز و خۆشەویست بووە و لە دوو هەڵبەستی ژمارە (١٧ و ٧٩)ی کوردیدا، ئەم دۆستایەتییە دەردەکەوێ.

ک- شێخ محیەدین (غەوسە)ی سلێمانی کە (شێخی تەریقەت) دۆستی (کوردی) بووە و گۆڕەکەی لە بن دارەکەی سەر گردی شێخ محیەدیندایە کە ئەوسایە بەناوی گردی (قۆری شکاو) بووە، هەڵبەستی ژمارە (١٠)ی کوردی دۆستایەتیی لەگەڵ غەوسەدا دەردەخا.

ل- (صەیدی)ی هەورامی (دووەم)، لەگەڵ (کوردی)دا دوو برادەری خۆشەویست بوون، بڕوانە هەڵبەستی (گۆرانی) ژمارە (١٠٦)ی کوردی.

م- دۆستایەتیی بەهێز لەگەڵ حەسەن ئەفەندی کوڕی هەمزە ئاغای مەسرەف، کە نامە و نامەکاری لە نێوان (ئەو) و (کوردی)دا هەبوو و لە زۆر شوێنی ئەم دیوانەدا ناوی

هاتووه و یەکێکە لەوانەی هەڵبەستی لاواندنەوەی ئەوم بۆ (کوردی) و هەڵبەستی تریم دەست کەوتووە. جگە لە هەڵبەستی ژمارە (٣٢)ی کوردی.

ن- کوردی لەگەڵ (سالم)ی ئامۆزایدا بەبێ یەک هەڵیان نەکردووە و لە زۆر شوێنی ئەم دیوانەدا و بەتایبەتی هەڵبەستەکانی ژمارە (٨، ٢٤، ٣٣، ٥٠، ٨٤) و... هتددا پێوەندییەکەیان دەرخراوە.

س- لە وتووێژێکی درێژدا لەبارەی کوردییەوە، لە ١٩٨٢دا، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا فەرمووی:

«کوردی شاعیرێک بووە تەعبیری لە نەفس و ئیحساساتێکی خاوێن کردووە لە شیعرەکانیدا، نەفسیەت و ڕوحیەتێکی موجەڕەد لە مادەی هەبووە».

ع- منیش گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە چونکە (کوردی) یەکێک بووە لە میللەتەکەی، بۆیە ئەو تەعبیرە پڕ سۆز و ساز و بێ فێڵ و ڕاست و حەقبێژییەی ناو شیعرەکانی لە ئارەزووی هەر کەسێکی پاکی نەتەوەکەیەوە هەڵقوڵاوە. لەبەر ئەوەیشە کە لە زۆربەی شیعری شاعیرانی تر زووتر چەسپاوە و دەچێتە دڵانەوە.

ف- جگە لەمانەیش هۆنراوەی ژمارە (٢٥ و ٧٢)ی بۆ دۆستی تری نووسیون و (هەرچەندە هەندێ ئاگەداریم لەبارەیانەوە لەلایە) بەڵام هێشتە بەدڵی خۆم بۆم ساغ نەبوونەتەوە ئەو کەسانە کێن و... بەڵام بەبێ سێ و دوو لە گەورەپیاوان بوون.

**کوردی لای حاجی قادر:**

ئەوەندە بەسە کە وەک دەڵێن دوڕناسێکی وەک حاجی قادری کۆیی، سەرەتای نامیلکە گرینگەکەی لەبارەی هۆنەرانی کورد لە هەرە کۆنەوە هەتا سەرێنی خۆی بە(مستەفا بەگی کوردی) دەستی پێ کردووە و (کوردی)ی پێش شاعیرانی تر خستووە. من کە ئەو چامە بڵاوکراوەیەی (حاجی)م بە(نامیلکە) ناو بردووە، لەوە دڵنیا بووم کە بریتی نەبووە لەوەندەیەی کە لە دیوانە چاپکراوەکانی (حاجی) دەخوێندرێتەوە، بەڵکو جیاواز بووە لە بەرهەمەکانی حاجی بەشێوەی (نامیلکە) و بەڵام بەهۆی دوورکەوتنەوەی (حاجی)یەوە لەو نامیلکەیەیش و هەڵبەستەکانیش زۆریان لەناوچوون.

هەر لە سەردەمی ژیانی (حاجی) خۆی و (نالی) و (کوردی)دا کە (نالی) بلیمەتی هەڵبەستە، بەپێی هەرە هونەرمەندێتیی دەستووری وێژەی کۆن سەرۆکی شاعیرانی هەموو نەتەوە ئیسلامییەکان بووە (حاجی)یش ئەو ڕاستییەی زانیوە و ئەمجا لە چامەی ئەو

ناميلكەيەدا كورديی كردووەتە تاجی سەری چامەكەی.

ئەگەر شاعيرێكی وەک (كوردی) لە شيعردا هەمان ڕێڕەوی (حاجی)ی واتە ڕێڕەوی كۆمەلايەتی و ڕاميـاری و شۆڕشگێڕی و نيشتمانپەروەريی نەبووايە حاجی ئەوەندە شيفتەی كەسەتييەكەی كوردی و هەڵبەستەكانی نەدەبوو ئەو ڕێز و شكۆدارييەی نەدەدايە لە چامەكەيدا كە فەرمووويەتی:

شەهسواری بەلاغەتی كوردان
يەكە تازی فەصاحەتی بابان
(مصطفا)يە تەخەللوصی (كوردی)
غەزەلی كردە بەربتی كوردی و......

(حاجی) كە فەرموويەتی (مستەفا)يە ئەوە دەگەيەنێ كوردی هاوچەرخی (حاجی) بووە، وەک بۆم دەركەوتووە لە سەرچاوە دەمييەكانەوە كە كوردی لەو يەک دوو جارە سەردانەی (ئەستەمووڵ)ی كردووە سەردانی (حاجی) و (نالی) و ئەحمەد پاشای دوا پاشای بابان و شاعير و كوردەكانی تری ئەستەمووڵيشی كردووە.

حاجی كە فەرموويەتی:

كوردی غەزەلی كردووەتە بەربتی كوردی، هەم مەبەستی لەوە بووە شيعری كوردی وەک بتێكی هونەرمەندانەی بە (غەزەل) كوردی (خۆی كوردی) پۆشتە كردووەتەوە و گيانی بەبەرا كردووە و هەم (كوردی) غەزەل (هەڵبەستی خۆی) كردووەتە بەر (بەربت) ئامێری مۆسيقای كوردی.

**كوردی لای نالی:**

(نالی)ی بليمەتی هەڵبەست و مامۆستای وێژە و هۆنەران، ئەگەر لەبارابووييی شاعيرێتيی (كوردی)ی ڕەچاو نەكردايە، ئەوە ئەو كاتە (شەڕەشيعر)ە لەگەڵ (مەشوی = مەحوی) و، (سالم) و (كوردی) كە لە هەڵبەستەكەی (سالم)دا هاتووە لەو بارەيەوە. هەروەها لە زۆر لە سەرچاوە دەمييەكانەوە بيستوومە كە (كوردی) لە سەردانەكەی (ئەستەمووڵ)يدا بۆ لای (ئەحمەد پاشای بابان) چاوی بە زۆر لە هۆنەرانی وەک: نالی و حاجی قادری كۆيی و كەيفی و هيی توركيش كەوتووە، بەتايبەتيش ديدەنی كردوون.

(كوردی) لە هەڵبەستی ژمارە (٦٦)يدا كە لە ڕەديفی هەڵبەستێكی ناليدا دای ناوە، لە

دانیشتنێکیدا لەگەڵ (نالی) ئەو هەڵبەستەی پێشکەش کردووە بۆ تێگەیشتنی ڕای ناوبراو لەسەری. (نالی)یش لە پشتی کاغەزەکەی (کوردی)دا ئەم تاکەی دوایی لەسەر کێش و پاشبەندی نووسیوە:

«ئەگەرچی ظاهیرا نەظمت لە عەشقی چاوی مەخمووره

حەقیقەت جۆی ڕەوان و ڕووتە شوعلە مەنبەعی نووره»

ئەم هەڵسەنگاندنە وێژەییە قووڵ و بەهێزەی دەریایەکی پان و بەرین و بێ پەیی وەک (نالی) بەڵگەیەکی گرینگە بۆ (کوردی).

**کوردی لای مەولانا خالید:**

مەولانا خالید نەقشبەندی کە دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی و یەکێک بووە لە شاعیرانی ڕیزی پێشەوەی جیهانی ئیسلامی و بەکوردی و فارسی و عارەبی شیعری زۆرە، دیارە پیاوێکی ئیسلامی وەها مەزن، دۆستایەتیی لەگەڵ شاعیرێک کە زۆر شاعیر و پاک نەبووبێ نەکردووە.

(کوردی) ئەگەر لەو چەند شاعیرانە نەبووایە دۆستایەتیی لەگەڵ نەدەکرد. ڕێگەدانی شەڕەشیعرەکەی نالی و مەحوی (مەشوی) و سالم و کوردی لە خانەقا و بارەگای مەولانا و بەسەرۆکایەتیی خۆی لە بڕیاری هەڵسەنگاندنی شاعیرێتیی ئەو شاعیرانە بەڵگەی دۆستایەتیی بووە لەگەڵ ئەو شاعیرانەدا وەک لە سەرچاوە (بەدەمی)یەکانەوە دڵنیا بووم کە مەولانا هەڵبەستەکانی کوردیی زۆر بەدڵ بوون.

ئەوەش بووەتە هۆی بەهێزبوونی پێوەندیی نێوان (مەولانا) و (کوردی) لە دوای هەڵهاتنەکەی (مەولانا لە ١٨٢٠ز.دا) لە دژایەتییەکانی شێخ مارفی نۆدێیی بەرامبەر مەولانا گیرسانەوەی لە شام، کوردی دووجار چووە بۆ شام بۆ دیدەنی مەولانا خالیدی دۆستی.

**کوردی لای شێخ ڕەزای تاڵەبانی:**

شێخ ڕەزای تاڵەبانی ئەوەندە ورد و قسەزان نەبووە لە (شیعر) و لە ئاخاوتندا، وەک لە یەکەم دیوانی چاپکراوی (کوردی)دا هاتووە و گەلێ لە سەرچاوە چاپکراوەکانی دوای ئەو دیوانە لەویانەوە وەرگرتووە کە جارێک لە شێخ ڕەزایان پرسیوە:

گەورەترین شاعیری کورد کێیە و چۆنی هەڵدەسەنگێنی و فەرموویەتی:

«ئەگەر شوعەرای قەدیم هەموو زینگوو بوونایەوە، هەریەکەیان ڕۆژێ جارێک زیارەت ئەکردن، بەڵام (کوردی) ڕۆژێ پێنج جار».

(زیارەت) مەبەستی لە دەست ماچکردنیشە و ئەوەتا شێخ ڕەزا ژمارەی ئەو دەست ماچکردنەی (کوردی) بەژمارەی نوێژەکانی هەر ڕۆژێک هاوتا کردووە، دیارە بەلایەوە ئەو زیارەتەی لەسەر خۆی بە(فەرض) داناوە.

(کوردی) کە لە هەڵبەستەکانیدا یەکجار بەئەدەب و زمان پاک بووە، سروشتی شێخ ڕەزایش لە ئاخاوتن و لە هەڵبەستەکانیدا زۆر دەم پیس و بێ شەرم، چاو لە دەستی خەڵک و خوازەڵوک بووە و بەزۆری زەمکردنی کەڵکی لە خەڵک وەرگرتووە. بەپێچەوانەی سروشتی کوردییەوە، ئەمجا شێخ ڕەزا کە دەبوو هەر لە بنەڕەتدا (کوردی)ی نەویستایە بەو حاڵەش (کوردی)ی بەیەکێ لە گەورەترین شاعیرانی کورد زانیوە و بە ڕێزەوە ناوی بردووە و هەڵبەستی (ئەمان مردم عیلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەر چارێ)ی (کوردی)ی کردووەتە، پێنج خشتەکی کە لە باسی (کوردی) بەلای بێکەسەوە دەگەڕێمەوە سەر ئەو پێنج خشتەکییە.

**(کوردی) لای شێخ سەلام:**

شێخ سەلام کە هۆنەر و گەنجینەی پڕ لە گەوهەری گرانبەهای مێژووی وێژەی کوردی بوو، لە دەستنووسێکی سەرگوزەشتەی ژیانی خۆیدا نووسیویە و کە لە کەشکۆڵی (مینای شکستە) بەرگی سێیەمدا نووسیویە.

لە دوای ساڵی ١٣٢٠م (١٩٠٢ز.)دا و وەقتم و... موطالەعەی ئەشعاری بەموکالەمەی ئەشقا فارسی و کوردی صەرف ئەکرد.

وە لە کوردیدا زیاتر ئەشعاری شاعیر مەشهوور (نالی) و (کوردی)ە.

«(نالی) فی لجوملە، لای بەعضێ کەس کۆ کرابووەوە، لاکین (مصطفا بەگی کوردی) موتەفەڕیقە بوو، بەڵکە لای هیچ کەسێ (٤) غەزەلی ڕێکی دەست نەئەکەوت، زۆر سەعی و تەقەلام دا میقدارێکی موناسیب لەگەڵ ڕەفیقێکم کە ناوی (مەلا محەمەد قەرەداغی) بوو، کۆمان کردەوە، مەطبوعات زۆر نایاب بوو، هەروا بەبێ چاپدان مایەوە لاکین زۆر نوسخەی بەخەط لێ وەرگیرا.

ئەم بایەخ پێدانەی شێخ سەلام کە خۆیشی یەکێک بوو لە شاگردانی قوتابخانەکەی (کوردی) نیشانەی گرینگیی هەڵبەستی (کوردی) و پلەی بەرزی شاعیریەتییەکەیەتی.

**(کوردی) لای بێکەس:**

هۆنەری نیشتمانپەروەر (بێکەس) وەک لە خۆیم بیستووە، لای زۆر کەسی تریش گوتوویەتی:

«من لە شاعیریەتیدا یەکەم جار لە سەرچاوەی هەڵبەستەکانی (کوردی)یەوە تێراوی وێژە بووم و چێژکەی هەڵبەست دانانم لەو هەڵبەستانە کردووە، لە قوتابخانە نیشتمانپەروەرییەکانی (خانی) و (حاجی قادر) و (کوردی) و (سالم)م خوێندووە».

بێکەس لە (تەخمیس)کردنی هەڵبەستە بەناوبانگەکەی (کوردی)یدا لە ژمارە (٨٩) ئەم دیوانەدا ئاوا کۆتاییی پێ هێناوە:

«هەزاران ڕەحمەتت لێ بێ لە شیعرا چەندە تۆ وردی»
عەزیزم «مستەفا بەگ» تۆ نەمردووی کێ ئەڵێ مردووی!»
جوابی دایە (بێکەس)، کە بڵێن: تەقدیری بۆ چ کردی؟!
«دوڕ و یاقووت ئەبارێ لەم کەلامە شیرینەی (کوردی)
خوا سا کوا لە دونیادا؛ قەدرزان و خریدارێ؟»

هەر خۆم لە خودی بێکەسم بیستووە و لای زۆر کەسیش دەیفەرموو:

هەموو ئەوانەی ئەو هەڵبەستە بەناوبانگە باڵایەی (کوردی):

(ئەمان مردم عیلاجێ سا؛ لە ڕێی پێغەمبەر، چارێ)یان کردووەتە پێنج خشتەکی (بە منیشەوە) هیی هەموومان (نەظم)ە و تەنیا ئەوەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەحەق (شیعر)ە و توانیویەتی خۆی لەگەڵ (کوردی)دا تیا ڕاست بکاتەوە.

**کوردی لای کۆشکی:**

هۆنەرێک کە خەڵکی گوندی (کۆشک) بووە، لە ناوچەی زەردیاو (قەرەداخ) و نازناوی شاعیریەتییەکەی بەناوی (گوند)ەکەیەوە بوو. لە دوا تاکی پارچە هەڵبەستێکیدا کە پێم وایە هێشتە چاپ نەکراوە، فەرموویەتی:

(نالی) و زوڵفی دولبەری (کوردی) گەردی عەنبەری
(حاجی) و کاڵۆڵی سەری، کۆشکی مەیلی ڕوو دەکا

(کۆشکی) بەم هەڵبەستەیدا هاوچەرخی (نالی) و (کوردی) و (حاجی) بووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (٧) نوسخەی دەسنووسیدا هەر بەم جۆرەی سەرەوەی تەنیا لە دەسنووسێکی مامۆستا نەجمەدین مەلادا (کاکۆڵی سەری) داوە بە (کوردی) و گەردی عەنبەری داوەتە پاڵ (حاجی).

**(کوردی) لای ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران:**

(حەمدی) لە چەندین شوێنی دیوانە چاپکراوەکەیدا هەر جارەی بەجۆرێک (کوردی)ی بەسەر کردووەتەوە و بەڕێزەوە ناوی بردووە، کە نامەوێ ئەم باسەمی پێ درێژ بکەمەوە و هەر بەم چوار باڵییەی (حەمدی) کۆتایی بەم باسەم دەهێنم.

خەرمانی لەفظی کوردی لە (کوردی) کردی پێوان
(نالی) کە نالی، کاسەیێکی دا بەویش لێوان
تاراجی کرد (مەحوی ئەفەندی) لە لوطفی خۆی
(عوشر)یشی دا بەحەمدی، وتی بیبەرە دیوان

کە ئەوەتا (حەمدی) لە شاعیرانی وەک نالی و مەحوی و خودی (حەمدی) کردوونە ڕێزە خۆر یا گوڵەوەچنی (کوردی). ئەمەش گەواهیدەرێکی زۆر گەورەیە بەرامبەر حەقبێژێکی وەک (کوردی).

**هەڵبەستی کوردی بەلای سەرچاوەکانیەوە:**

أ- لە یەکەم (دیوانی کوردی) چاپی (کوردی و مەریوانی) نووسراوە:

«هەموو شیعرەکانی ئیرتیجالی ووتووە، شیعرەکانی بێ قۆرت و گرێ یە، زۆر جوان کوردیی پەتی یە، موئەثیر و دڵگیرە.

لە (غرامیات)دا یەکەم شاعیری کوردە، غەزەلی میللی، ئیجتیماعی، تەئریخیشی هەیە، ئەشعاری کوردی وەکو (سینەما) سەراپا تەئریخێکە، بۆ ژین و ژیانی ئەو زەمانەی (بابان)ەکان، زۆر جار تەعریفی فەجائیع و ظولم و جەوری تورکەکان کە بەکوردەکانیان کردووە، ئەکا»

ب- من لەگەڵ هەموو ڕایانەی سەرەوەدام، جگە لەوەی کە (کوردی)ی بەیەکەم شاعیری کورد داناوە لە غیرامیاتدا؛ چونکە زۆر شاعیری تری یەکجار وەستاتر هەن لەم بارەیەوە.

ج- (مێژوونووس) ئەمین زەکی بەگی نەمر لە مێژووی کورد و کوردستان و ناودارانی

کورددا نووسیویە:

«(کوردی) شاعیرێکی حازر جەواب و بەزۆری بەکوردی هەڵبەستی داناوە، هەندێ جاریش بەفارسی و تورکی و عەرەبی.»

د- عەلائەدین سەجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا نووسیویە:

«کوردی (شاگرە) و سالم (خەلیفە)، ئەم (سوختە) و ئەو (موستەعید)».

هـ- بەڵام من لە جووتە شاعیر (ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران) و (تۆفیق بەگ)ی برای لە سەرەتای نیوەی دووەمی سییەکانی چەرخی بیستەمدا بیستوومە کە کوردی لە خوێندندا لە سالم لە پێشتر بوو.

هـ- عەلائەدین سەجادی لە هەمان سەرچاوەدا نووسیویە:

«کوردی شاعیری فیتری و، شیعرەکانی وەکو ئاوخواردنەوە دابووە بۆی».

و- لە پێشەکیی دیوانی (میسباحودیوان - ئەدەب)ی چاپی (بەشیر موشیر)دا نووسراوە:

«کام شاعیر بەقەد شیعرەکانی (مستەفا بەگی کوردی) سەهلی مومتەنیع و بەقەد ئەو سۆزی هەیە؟

**نرخاندنی کوردی لە ئێران:**

ئەدەبی فارسی لە باڵاترین ئەدەبەکانی گەلانی جیهانە و شاعیری زۆر ناوداری تیا هەڵکەوتووە. (کوردی) ئەگەر لە پایەی هەرە شاعیرێتی زانیارییە فرە بابەتەکەی و شکۆداریی کەسەتییەکەیەوە نەبووایە، هەرگیز (ئەنجومەنی ئەدیبانی ئێران) ناوبراوی لەو ئەنجوومەنەدا وەرنەدەگرت (کوردی) نەیدەتوانی ببێتە یەکێ لە ئەندامە پێشەوەکانی ئەنجومەنەکەیان بێت و بەڕێزەوە جێگەی خۆی لەو بوارەدا بکاتەوە.

تەنانەت (شای ئێران)ی ئەوسایە سەرەڕای ئەمە و ئەدیب و شاعیر و زانا و دیارەی ئێران، کوردێکی وەک (مستەفا بەگی کوردی)ی هەڵبژاردووە بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانی و لە بەشێکی لەو کۆشکەدا کە خۆی و خێزانی تیا نیشتەجێ بوون، کوردیی تیا نیشتەجێ نەدەکرد، هەر لەبەر ئەو لێهاتووییە وێژەیی و شاعیرییە دیارییەی (کوردی) بووە کە دەبووایە لە هەموو کۆبوونەوەکانی ئەو ئەنجومەنەدا ئامادە بووایە.

بۆ زۆرتر ئاگەداری لەم بابەتە لە سەیری لێکدانەوەکانی چامە فارسییە تەرجیع بەندە (نەعت)ەکەی (کوردی)دا کە ژمارە (١٢٤)دا لێکم داوەتەوە، بکەن.

**داهێنەری هەڵبەستی بابانی کێ بووە:**

بۆچوونێک لەلایەن نووسەرانی ئێستاوە هاتووەتە ئاراوە و پوختەکەی ئەمەیە کە گوایە:

«داهێنەری شیعری بابانی (نالی) و بەدوای ئەودا (سالم) و ئەنجا (کوردی) بووە و شاعیرانی تری هەرێمەکەش شاگردانی قوتابخانەی ئەو سێیانەن».

بەرپەرچی ئەو بۆچوونەش باسەکەی کردووەتە کێشەیەکی یەکلایی نەکراوە، چونکە ئەم باسەیش پێوەندیی بە(کوردی) و ناوەرۆکی ئەم دیوانەوە هەیە و منیش لەگەڵ هەردوو لایەنی بۆچوونەکە زۆرتر ژیاوم، بۆیە ئەم نووسینەم تێکەڵ بەو کێشەیە دەکەم و سەرەتا ڕای دەگەیەنم کە لەگەڵ ئەو بۆچوونە نیم کە بەڵگەی بۆ پێشەوایەتیی ئەو سێ کەڵەشاعیرە لەو داهێنەرێتییەدا تەمەنە:

لەم دیوانەدا بەبەڵگەوە ساغم کردووەتەوە کە (کوردی) بە(١٤ – ١٥) ساڵێک بەر لە نالی لەدایک بووە، کەواتە ئەو پێشەوایە (کوردی)یە، سەرەڕای ئەوەی (کوردی) یەکەمین شاعیری سلەیمانی پایتەختی پاشایەتیی بابان بووە.

لەگەڵ ئەوەشدا بڕوام وایە کە (نالی) بەر لە ساڵی (١٢١٥ک = ١٨٠٠ز) لەدایک بووە کە سەرچاوە چاپکراوەکان بەهەڵە ئەو ساڵەیان بۆ دیاری کردووە و (مەولانا خالید)یش (٥ – ٨) ساڵێک بەر لە (کوردی) لەدایک بووە و (شێخ مەعرووفی نۆدێیی) بە (٣١) ساڵێک بەر لە (کوردی) لەدایک بووە و ئەم دوو شێخەیش شیعریان بەکوردیی سۆرانی هەیە.

لەمانیش کۆنتر (مامۆستا مەلا عەبدوڵای بێتووشی بە (٦٠ – ٧٠) ساڵ بەر لە (کوردی) لەدایک بووە، شیعری هەڵبەستی بە کوردیی بابانی هەیە. بەر لەمیش مەلا محەمەدی حاجی حەسەن (ئیبنولحاج) بەر لە لەدایکبوونی (کوردی) بە ٢٥ ساڵ نامیلکەی (مەهدینامە)ی بەهەمان (زارگوت = لەهجە)ی بابانی هەڵبەستووە کە (بێتووشی) و (نۆدێیی) قوتابیی ئەو بوون. (ئیبنولحاج)یش بەلای کەمەوە (٨٠ – ٩٠) ساڵێک بەر لە (کوردی) لەدایک بووە.

محەمەد عەلی قەرەداغی لە لێکۆڵینەوەی نامیلکەی (مەهدینامە)دا کە لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری بەغدا) لە ١٩٧٥دا چاپ کراوە نووسیویە:

(«ئیبنولحاج» یەکەم کەس بوو لە ناوچەی سلێمانیدا نووسینی کوردیی فێری فەقێیەکانی کردووە کە لە مامۆستا کوردەکانی ئێرانەوە ئەو بە کوردی نووسینەی پێ زانیوە).

بێگومان بەکوردی نووسینی گەلێ گەلێ لەو مامۆستایانە کۆنترە و کە شاعیر (کوردی)

بەپێی بۆچوونی لایەنگرانی سێ کوچکەی بابان، دواترینی سێ کەڵەشاعیرەکە بێت و یەکەمی ئەو سێیانەیش (نالی)یە و نالیش بەپێی تەمەن دوای کوردی لەدایک بووە کەواتە یەکەم و پێشەوای ئەو داهێنەری هەڵبەستی (زارگوت)ی بابانییە (کوردی)یە نەک (نالی)، ئەگەرچی (نالی) پێشەوای هونەری وێژەی بگرە نەتەوە ئیسلامییەکان بووە.

ئەو (نالی)یە کە گوایە داهێنەری هەڵبەستی (هەرێمی بابان)ە کە لە سەردەمی (کوردی)دا ژیاوە و ئەو (کوردی)یە بێ پەروا لە نالی لە هەڵبەستی ژمارە (٦١)یدا فەرموویەتی:

«کوردی؛ دلێری عەرصەیی نەظم و فەصاحەتە

جەولان دەکا هەمیشە وەکو بەرقی تیژڕەو».

ئەمەتا (کوردی) بەبێ پەروا بەرامبەر نەک هەر (نالی) بەشکو بەرامبەر بەهەموو شاعیرانی تریش ئەوەی گوتووە.

(حاجی قادری کۆیی)یش سەد ساڵ پترە لە چامە درێژەکەیدا لەمەڕ شاعیرانی کوردەوە (کوردی)ی بە:

«شاسواری بەلاغەت و فەصاحەتی بابانی و بەپۆشتەکەرەوەی پەیکەری هەڵبەستی کوردی بە(غەزەلی خۆی) و بەگیان بەبەراکەرەوەی (بەیتی شیعری کوردی) و ناوچەی بابان داناوە، کە پێشەوا و داهێنەر دەگرێتەوە و ئەسپی یەکەتازی خۆی (کوردی) پێش نالی خستووە».

(حەمدی) لە چوار باڵییەکەیدا بەڕاشکاوی:

«خەرمانی زمانی کوردیی بە(کوردی)ی شاعیر هەڵگرتووە و دوای هاوار و ناڵەناڵکردنی (نالی)یە و ئەمجا لەو خەرمانە (کاسەیەکی) بەخشیوە بە(نالی)، وەک لە باسی: (کوردی) (حەمدی)دا نووسیویە و دەبێ ئەوە بزانین (حەمدی) ئەوەندە ڕاستگۆ بووە کە دیوانەکەی بەدەیان بەڵگەی ڕاستگۆییەکەی تیایە و لەو چوارینەیەیدا لایەنی خزمایەتیی خۆی (کوردی)ی نەگرتووە، زمانی شیعری کوردی زمانی بازاڕ بووە، نەک هیی مزگەوت. کەواتە هەرێمی بابان بەر لە سێ کەڵەشاعیرەکەمان هەڵبەستی تێدا هاتووە و ئەو سێ شاعیرە پێشەواترین شاعیری بوون و (کوردی)یش یەکەمی ئەو سێ شاعیرە بووە و کە لایەنگرانی سێ کوچکەی بابان، مافی (کوردی)یان پێشێل کردووە.

**هاندەرانم لە کاری ئەم دیوانەدا:**

لە چلەکانی چەرخی بیستەمی زاینی بەملاوە، گەلێ لە مامۆستایان و دۆستانم پێیان زانیوە کەرەستەیەکی زۆری ئەم دیوانەم گرد کردووەتەوە، ئیتر هەموویان هەمیشە هانیان داوم کە هەرچی زۆرتر (لەز) بکەم لە گەیاندنی بەچاپ. هەرچەندە ئەوسایەش ئەوەندەی ئێستە کەرەستەم نەبووە و ساڵ لە دوای ساڵی ئەم دیوانەم پڕتر و پۆشتەتر کردووە. لە دوای ئەم ڕستەیەوە بەپێی یەکەم پیتی هیجایی سەرەتای (ناو) یا (نازناو)ی ئەو کەسانە ڕیز و پێشکێش دەکەم کە:

دوکتۆر عەبدولڵا ئاگرین، جەمال عەبدولقادر بابان، سەبری بۆتانی، بەختیار زێوەر، فایەق بێکەس، عەبدولڕەزاق بیمار، حەسەن عەباس جاف، محەمەد جەلال حەیدەری، عەبدولڵا (زێوەر)، عەلائەدین سەجادی، شاکیر فەتاح، مامۆستا مەلا فەرەجی واژەیی (شەکیبی)، ئەحمەد شوکری، محەمەد عەلی قەرەداخی، عەلی باپیر ئاغا، قانیع، گۆران، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، گیوی موکریانی، محەمەدی مەلا کەریم، (هەردی)، محەمەد سەعید بەگی جاف، (هەژار) و...

لە ناو ئەو بەڕێزانەشدا:

یەکەم – محەمەد عەلی قەرەداغی کە یاریدەری سەرەکیم بووە لە ژیانمدا و لە لێکۆڵینەوەی ئەم دیوانەدا.

دووەم – مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە زوو زوو سەریم دەدا و ئەویش لە ماڵەوە سەری دەدام.

سێیەم – جەمال بابان جگە لە هاندانی زۆرم و لە کاتێکدا کە (بەڕێوەبەری گشتیی دەسگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) بوو لە بەغدا بڕیاری ڕەسمیی دا بۆ لە چاپدانی ئەم دیوانە.

چوارەم – حەسەن عەباس جاف سەرەڕای هاندانم ئامادەیی خۆی پێ ڕاگەیاندم کە ئەگەر پێویستم بەپاکنووس بێت بۆم پاکنووس دەکات.

ئەو هەموو بەڕێزانە خۆشبەختانە ماون و هەر تەمەن درێژ و کارا بن، هەندێکیشیان خوا لێیان خۆش بێت.

**یاریدەدەرترینم:**

یاریدەدەری سەرەکیم لە بەرهەمهاتنی ئەم دیوانەدا، مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی

بوو ناوبراو جگە لەوەی تاکە پشتگیرێکی کۆڵنەدەری نەبوونیم بووە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ز.دا کە بەناسینی بەهرەوەر بووم و تا ئێستەش پەیتا پەیتا هەڵبەستی (کوردی)ی پێ گەیاندووم لە کەلەپووری نەتەوایەتیماندا بەدەیان کەشکۆڵ و بەیازی دانسقە و سەرچاوەی چاپکراو لە پەڕاوی و گۆڤار و ڕۆژنامەی بەدەستیاو پێ داوم و دوای ئەوەی پێویستیی خۆمم لەبەر نووسیونەتەوە بەسوپاسەوە بۆم گەڕاندوونەتەوە، ئەو بەڕێزە خەباتکارە کە پتر لە نیو سەدەیە عەوداڵی کۆکردنەوەی کەلەپووری گەلەکەمانە و لەسەری نووسیوە، لەو کارە پیرۆزەی خۆیدا لە هەر لایەک و لە هەر پەڕاویخانەیەکی تر و بەهەڵبەستی (کوردی)ی زانیبێ، گورج لەسەر کیسەی خۆی بۆی ئامادە کردووم و پێی داوم و وەڵامی هەر پرسیارێکی ئاینی و وێژەیی و مێژوویی منی بەپڕوچڕی داوەتەوە.

ناوەرۆکی ئەم دیوانە لە سەدان شوێنیدا گەواهیدەری ئەم ڕاستییانەی سەرەوەن کە بەناوی خۆیەوە و بەسوپاسەوە، جێگیر کراون، هەمیشەیش لە پێشەوەی هاندەرە بەجەختەکانی ئەم ڕێگەیەم بووە و دەستی لێ بەرنەداوم. هەتا لە (ئاراس)ی لە شکۆمەندترین دەسگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ناوچەکەدا. لەوەبەریش چەندین هەوڵی ئەم لە چاپدانەی بەجێ گەیاندووە، ئەگەرچی دیوانەکەی تیا کەوتووەتە گێژەو لەوانیشی دەرباز کردووە.

لە پێزانینمدا بەرامبەر بەم هەموو هەوڵ و کۆشش و هەڵوێستە مرۆڤایەتی و ئیسلامی و نەتەوایەتی و زانیارانەی ئەم مامۆستا بەڕاستی مەزن و دڵسۆزەم هەرگیز یارای سوپاسگوزاریم بەدەم و بەنووسین و بەکردەوە نییە و لە خوای گەورە خوازیارم کە بەرخوردار و تەمەن درێژ و تەندروست و کامەرانی بکات و پڕاوپڕی ئارەزووی خۆی پڕ بەرهەمتر بێ و بەئاواتی خۆی بگات.

**گرینگترین سەرچاوەم:**

ئەم دیوانە لە سەدەها سەرچاوەی بەدەمی و دەسنووس و چاپیی گرینگ و بایەخدار و لە نرخ نەهاتوو، بەدی هاتووە. گرینگترینی هەمووانیان جووتە کەشکۆڵە دەستنووسە نایاب و دانسقە دەگمەنەکەی (عەلی ئاغای نەوتچی)ی زەنگەنەیی و براکەی حسەینەڕەش (قەرە حسەین) سەرۆکی خانەوادەی نەوتچییانی کەرکووک بوو.

لەو جووتە کەشکۆڵەدا چەندین هەڵبەستی (کوردی) و دەسنووسی خودی (کوردی)ی نووسراون کە (ئاغا) لە کەشکۆڵێکی محەمەد فەیزی ئەفەندی (موفتی زەهاوی)یەوە وەری گرتوون.

ئاغا زۆربەی هەڵبەستەکانی (کوردی) و شاعیرانی تری لێک داونەتەوە و بەقوولی چووەتە بنج و بناوانیانەوە، بۆنە و کاتی دانانیان و وردەکاری و یاری بەو وشەکردنەکانیانی شی کردوونەتەوە کە وەک کلیلی دەرگای گەنجینەی پڕ نهێنیی زانیارییانەی کەلەپووری و، وێژەیی و مێژووییمانن.

لەم لیستەی سەرچاوەکانی ئەم دیوانەدا ئەو دوو کەشکۆڵەم بە (عن) نیشانە کردووە، هەردووکیانم لە سلەیمانی لە جەمیل ئاغای برای (عەلی ئاغا) وەرگرتوون، کە لە نیوەی دووەمی سییەکانەوە هەتا سەرەتای پەنجاکانی چەرخی بیستەمی زاینی (ئەمینداری خەزینەی سلێمانی) بووە و دوایی لەبەر نووسینەوەی ئەوەی پێویستم بووبێ لەو ماوەیەدا لەبەریانم نووسیونەتەوە. لە دوای خانەنشینکرانی جەمیل ئاغا بەکەشکۆڵەکانەوە گەڕایەوە کەرکووک.

بەداخەوە «هەردوو کەشکۆڵەکە کەوتبوونە دەست کوردێکی لەخۆگۆڕاو (تەرزی باشی) و، گورج لەناو دراون».

**لێ کورتکرانەوەی ئەم دیوانە:**

لەم دیوانەدا سەرپاکی (وشە)ی فەرهەنگی و ناوی کەسان و شوێن و شت و کارەسات، زاراوەکانی سۆفیگەری و وێژەیی و زانیاری و کەلەپووری و دیاردەی ئاینی لە ئایەت و حەدیس، بەپێی هەموو فەرهەنگە کوردییەکان و هەندێ لە فەرهەنگی زمانە بێگانەکان و پەڕاوی، ئینسیکلۆپیدییەکان و سەرچاوە دەسنووس و چاپکراوەکان لە پەڕاویخانەکەی خۆمەوە لە هەموو لایەنێکەوە و داڕشتن و نووسین و نیشانی خۆم بوون و بەس بەپاکنووس و زۆر بەدرێژی نووسیومن.

## پێڕستی سەرچاوەکان

أ- کەشکۆڵی دەسنووسی ئەوقافی سلێمانی محەمەد عەلی قەرەداخی لە (زستانی ١٩٦٠) ز.

ئا- ئەنجوومەنی ئەدیبان - ئەمین فەیزی بەگ - چاپی کاکەی فەلاح.

ب- کەشکۆڵێکی کۆنی دەسنووسی عەبدوڕەزاق بیمار، (١٩٦١) ز.

با- کەشکۆڵێکی دەسنووسی عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) کە لە پایزی ١٩٤٧ز.دا لە هەڵەبجە بۆ من (حەمەبۆر)ی نووسیویەوە.

با/١ - (حەوت بەند)ە فارسییەکەی مستەفا بەگی کوردی کە (کەمالی) بۆ (حەمەبۆر)ی نووسیوەتەوە.

بح- کەشکۆڵی (بیرەوەری و بژار) دەسنووسی (حەمەبۆر) کە لە زستانی ١٩٤٠ز.دا نووسراوە.

بل- کەشکۆڵێکی کۆ دەسنووسی (بلال المحمدی).

بم- کەشکۆڵێکی کۆنی مامۆستا عەبدوڕەزاق بیمار کە محەمەدئەمین ناوێک نووسیویەتییەوە.

ج- نامیلکە لێکدانەوەکەی (حەوت بەند)ە فارسییەکەی (کوردی) محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، چاپی ڕۆنیۆ/١٩٩٨ز.

جەلی- کەشکۆڵە کۆنە پەڕە پەڕە دەسنووسەکەی خانەوادەی (جەلی زادە) کە (نەجیبە خان)ی خوشکی مەسعوود محەمەد جەلی زادە پاراستوویە.

جم- دەسنووسی (حەوت بەند)ە فارسییەکەی (کوردی) کە هیی خانەوادەی موفتیی سلەیمانی و لای مامۆستا جەمال موفتی بوو.

ح- کەشکۆڵی دەسنووسی (شێخ حەسیب بەرزنجی) لە ساڵی ١٣٢٢ - ١٣٢٦ک = ١٩٠٤ - ١٩٠٨ز.

حا- کەشکۆڵە بەناوبانگ و دەسنووسەکەی (مەحموود پاشای جاف).

حب - کەشکۆڵی دەسنووسی شێخ حەسەنی بەرزنجی و هیی (موفتی پێنجوینی) لە

بەهاری ١٩٤٠ز.دا لە پێنجوێن کەڵکم لێ وەرگرت.

حص- دیوانی ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان چاپی مامۆستا جەمال محەمەد ئەمین.

حم - کەشکۆڵی (پەڕاوی سەنگین و شەنگ) دەستنووسی (حەمەبۆر) ١٩٣٩.

دس- کەشکۆڵێکی دەسنووسی شاعیر (شێخ سەلام) لە ١٩٢٩ز.دا نووسیویەتەوە، لە ١٩٣٩ز.دا کەڵکم لێ وەرگرتووە.

دو- (دیوانی وەفایی) ئامادەکردنی محەمەد عەلی قەرەداغی.

ر- ئۆفسێتی کەشکۆڵی دەسنووسی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی تۆربەیی لە ساڵی ١٣١٠ - ١٣١٢ک = ١٨٩٢ - ١٨٩٤ز نووسیویەتەوە.

ژ- ڕۆژنامەی (ژین)ی پیرەمێرد لە ناوەرۆکدا ژمارە و ڕۆژی نووسراوە.

س- ئۆفسێتی چاپی (٢/گیو)ی (دیوانی کوردی) کتێبفرۆشیی سەیدیان-ی مەهاباد لە «پاکستان» چاپی کردووە.

س/١- (دیوانی سالم) چاپی کوردی و مەریوانی/١٩٣١ چاپخانەی (ئیتام).

س/٢- (دیوانی سالم) چاپی ٢ی (گیو).

سا- مێژووی ئەدەبی کورد - عەلائەدین سەجادی/١٩٥٢.

سجا - حەوت بەندە فارسییەکەی (کوردی) کە عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) لە ١٩٤١ز.دا بۆ عەلائەدین سەجادیی نووسیویەتەوە.

ش- کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا عەزیزی ڕێشاویی لە محەمەد عەلی قەرەداغیم خواست.

شح- کەشکۆڵێکی کۆنی دەسنووس کە هیی (مەلا عەبدوڕەحمانی بانەیی) بوو کە لە ١٩٣٨ز.دا چەندین جار لێم وەرگرت.

شک - دیوانی شوکری فەزڵی دەسنووسی (حەمەبۆر) لە ١٩٤٠ز.

ص- کەشکۆڵی (صەدباری)، محەمەد عەلی قەرەداغی.

ص/١- کەشکۆڵی دەسنووسی (صەدباری)، محەمەد عەلی قەرەداغی.

صا - کەشکۆڵی دەسنووسی (ئەمجەد حەسەن صەدباری)، محەمەد عەلی قەرەداغی.

صح - دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران، دەسنووسی نەجمەدین مەلا.

ط- (حەوت بەند)ەی فارسییەکەی (کوردی)، سەید تاهیر هاشمی.

ع- کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا عەزیزی بالیکەدەری کە لە کۆڕی زانیاری بەغدایە.

عب- چامە نیشتمانییەکەی (سالم) لەبارەی ڕووخاندنی پاشایەتیی بابانەوە، بەدەسنووسی کۆن (عەبدوڕەزاق بیمار).

عق – کەشکۆڵێکی مامۆستا مەلا عەبدوڵای قزڵجی لە ساڵی ١٣٤٢ک = ١٩٢٣ز.دا نووسیویەتەوە.

عن – دوو بەرگی کەشکۆڵە دەسنووسەکەی عەلی ئاغای نەوتچی کە لە ساڵانی ١٢٩٦ – ١٣١٣ک = ١٨٧٨ – ١٨٩٥ز.دا نووسیونیەوە. ئەم دوو کەشکۆڵە بەر لە مردنی کوردی بە ١٩ ساڵ نووسراونەتەوە و گرینگترین پەراوێزی مێژوویی و وێژەییی لەسەر شیعرەکانی (کوردی)ی نووسیوە.

ف– دیوانی شاعیر فیکری دەسنووسی (حەمەبۆر) لە ساڵی ١٩٤٠ز.دا.

فح – کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا فەتاحی کاگردەڵێ، (م. قەرەداغی).

فح/١– کەشکۆڵی هەمان نووسەر.

ق

ق/١

ق/٢ پێنج کەشکۆڵی ئۆفسێت هیی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی

ق/٣

ق/٤

ک– پەراوی شاعیرە لەبیرکراوەکانمان چاپی عەلی باپیر ئاغا (کەمالی).

ک/١– کەشکۆڵی دەسنووسی شاعیر (شێخ عەبدورەحمان کاکە – نسیب) لە ساڵانی (٢٠ و ٣٠)یەکانی چەرخی پێشوودا نووسیویەتەوە.

کا– دیوانی هەمان شێخی ناوبراو.

کش

کش/١

کش/٢ پەرە پەرەی پاشماوەی ٣ کەشکۆڵی پەرپووت و دڕاوی (محەمەد عەلی قەرەداغی).

کم– یەکەم چاپی (دیوانی کوردی)ی کوردی و مەریوانی ١٩٣١ز.

کو– کەشکۆڵێکی پەراویخانەی کۆڕی زانیاری بەغدا کە مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ پێشکەشی بەکوڕی کردووە.

گ – چامەکەی (سالم) لەمەڕ ڕووخاندنی پاشایەتیی بابان لە گۆڤاری گەلاوێژدا.

گ/٢

گ/٣ دیوانی (کوردی) چاپی مامۆستا گیوی موکریانی چاپی (٢) و چاپی (٣).

گل/١– کەشکۆڵی دەسنووسی مامۆستا مەلا عەبدوڵای گەلاڵەیی ١٢٨٢ک = ١٨٦٥ز کە لە قەبارەی (بەیاز)ی بەرباخەڵدایە.

گل/٢– مامۆستا مەلا عەبدوڵای گەلاڵە کە لە ١٣٠٠ک = ١٨٨٢ز.دا نووسیویەتەوە.

گل/٣– دەسنووسی هەمان گەلاڵەییە لە ١٣٠٢ک = ١٨٨٤ز.دا و هیی مستەفا ئەفەندی حاجی ئەحمەدی فاتێی کەشکۆڵنووس بوو.

گل/٤– دەسنووسی هەمان گەلاڵەییە لە ١٣٠٦ک = ١٨٨٨ز.دا.

گل/٥– هەمان گەلاڵەیی لە تەکیەی شێخ مارفی سلێمانی لە ١٨٩٠ک = ١٨٨٨ز.دا نووسیویەتەوە.

گل/٦– کەشکۆڵی هەمان گەلاڵەیی بوو کە لە ساڵی ١٣٠٩ک = ١٨٩١ز.دا هیی شێخ ڕەئووفی شێخ مەحموودی حەفید بوو.

گل/٧– هەمان گەلاڵەیی لە ١٣١٠ک = ١٨٩٢ز.دا نووسیویەتەوە هیی عەلی کەمال باپیر ئاغا (کەمالی) بوو.

گل/٨– هەمان گەلاڵەیی لە ١٣١٠ک = ١٨٩٢ز.دا نووسیویەتەوە. (مەلا ئەحمەدی حاجی ڕەشید).

گل/٩– دەسنووسی هەمان مامۆستا بوو ١٣١٧ک = ١٨٩٩ز.دا هیی مەلا مستەفای ئیمامی مزگەوتی کانی ئاسکان بوو.

گل/١٠– هەمان گەلاڵەیی لە چەند ساڵی جیاجیادا نووسیویەتەوە لە ساڵە (١٣٠٠ک)ەکاندا.

م– کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵا موفتی پێنجوینی کە دەسنووسی خۆی بوو.

ما– کەشکۆڵی دەسنووسی محەمەد ئەسوەد.

ما/١– کەشکۆڵی دەسنووسی محەمەد ئەسوەد.

ما/٢– کەشکۆڵی دەسنووسی (محەمەد ئەسوەد).

مدرس = ئۆفسێتی کەشکۆڵێکی دوکتۆر کەمال فوئاد بوو، بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی ناردووە.

مدرس/١– کەشکۆڵێکی نووسینی قەبارەی ٥,٥×١١سم ١٢٠ لاپەڕە. بۆ مامۆستا مەلا

عەبدولکەریمی مودەڕیس.

مر- کەشکۆڵێکی مەلا عەبدوڵا ڕەشەکانی کە لە ١٩٢٠ز بەدواوە بۆ خۆی نووسیویەتەوە.

مس- کەشکۆڵێکی نەوەی سەیدیی هەورامیی دووەم کە هیی نەوەیەکیانە (محمد) ناوە. لە ساڵی ١٢٥٠ک = ١٨٣٤ز.دا بۆ مەلا محەمەد ناوێکیان نووسیوەتەوە.

مع- کەشکۆڵێکی دەسنووسی مەلا عەبدوڵای ڕەش (پشدەر)ی کە لە ١٣٠٨ک = ١٨٩٠ز.دا نووسیوەتەوە.

مک- ئۆفسێتی کەشکۆڵی (موعەممەری کاشانی)، سەید تاهیری هاشمی لە ساڵی ١٩٦٣ز.دا لە تارانەوە بۆ حەمەبۆری ناردووە کە «حەوت بەند»ە فارسییەکەی کوردیشی تیایە.

ن- کەشکۆڵێکی کۆنی دەسنووسی کە گەلێ هەڵبەستی تیایە و ٢٣ ساڵ دوای مردنی کوردی نووسراونەتەوە.

ئەو کەشکۆڵە هیی نامیق ئاغای مستەفا ئاغای حاجی حەسەن بوو.

نا- (دیوانی نالی) چاپی کوردی و مەریوانی.

نع- (دیوانی نالی) چاپی عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕانی.

نگ- دیوانی نالی چاپی گیوی موکریانی.

نم/١- کەشکۆڵی (مینای شکستە) بەرگی/١ دەسنووسی نەجمەدین مەلا بوو. بۆ (حەمەبۆر)ی نووسیوەتەوە لە ١٩٣٩.

نم/٣- بەرگی سێیەمی کەشکۆڵی پێشوو.

نن - کەشکۆڵی نووسراوە (پەرێشان) و دەسنووسی نەجمەدین مەلا.

و- دیوانی وەفایی کۆکردنەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی.

و/١- دیوانی وەفایی چاپی یەکەم - گیو موکریانی.

و/٢- دیوانی وەفایی چاپی دووەم - گیو موکریانی.

ه- کەشکۆڵی دەسنووسی (حەمەبۆر) بەناوی (هونەرگە).

یح- ئۆفسێتی کەشکۆڵێکی (دانشکدە تهران) کە سەید تاهیری هاشمی بۆی ناردووم.

(حەمدوون) پاکنووسکراوی پەڕاوی مەلا حەمدوونی شاعیر و زانای کورد. لێکۆڵینەوەی (حەمەبۆر) و محەمەد عەتا.

## أ

١

### دڵم نایێ کە جێت بێڵم

١- دڵم نـایـێ کــــــە جــــێت بێـــــڵم، بڕۆم بـێ تـۆ بـەڕێـگادا
سـەری خـۆم هـەڵگرم وەک شـێت، بـەکێـو و، دەشت و، صـەحـرادا
٢- دەڵێم: ناکــەم هـەڵێم ڕاکــەم؟ عــیــلاجی دەردی ســـەوداکـــەم
کـــەمـــەندی تـۆم لە ئەســتـــۆدایە، ســـا چیـــبکەم؟ بەرم نـادا
٣- لە ســینەی پڕ بڵـێـســەم؛ هـێند، دەکـێـشم ئاهـی گـەرم و سـەرد
خـــەلیلـی تۆیە، دڵ بۆیە؛ کــــە ناریش پێی ضـــــەرەر نـــادا
٤- ئیـــتـــر قـــەت مـــومکینم نابێ خـــەیاڵی تـۆ لە دڵ دەرکــــەم
چ کــەس؛ بێ قــووتی ڕۆح ناشێ بژیـی هـەرگــیــز لە دونیـــادا
٥- لە ناو فـــیکر و خــــەمـــانی کـــاکـــۆڵت قـــوربـان وەها مـــاتم
شـــــەو و ڕۆژ نـابـزووم ئەصـــــلا، نـە بـەمـــــلادا و نـە بـەولادا
٦- چ خـۆشـە (هـەست) و (ڕۆح) و (دڵ)؛ (بـەسـانـی) بـەندیی و بەندەت
(کەمەندکێش) بن، بە(تاڵێ موو)، لە (دەست) و (گەردن) و (پا)دا
٧- لە (ســەیل)ی ئەشکـی چاوانم، (قـوم) و (غـەرق)ە هـەتا (فـەرق)م
بـە(بلـق بلـق)ی نـەفـــەس فـــەرقـم ئـەکـــەن، غــــەرقـم لە دەریـادا
٨- لە (کـەشـتی)ی عـەشـقی تۆدا بم لە (بادی عـەکس) سڵ ناکـەم
دەبا لـەم (گــــێـــــژی دەریا)یە، نـەیـەن (خــــەڵق)م بـەهـانـادا
٩- مـوڕەببیی مـوشـفـیـقی عـەشـقـە کـە (کوردی)ی کـرد جگەر پارە
کـــــە دەیزانـێ، چ کــــەس بـێ پـارە، هەڵناکـــــا لـە بـەغـــــدادا

---

١- بێ تۆ: لە ڕێنووسی کۆندا بە(بێتو) نووسراوە بە(بێ تۆ) و (بێتوو)ش دەخوێندرێتەوە.

ڕێگا: جگە لە واتەی (ڕێ)، هەروەها: ڕێبـاز (تەریقـەت)یش دەگـرێتـەوە کـە (غـەوث) دانەری (طەریقەی قادری) بووە لە کوردستاندا. (کوردی) پەیڕەوی ئەو ڕێبازە بووە.
ئەم هەڵبەستە لە سەرچاوەی (عن) و (مچ) (گ/٣)ە وەرگیراوە، بەڵام (عن)م کردووەتە دەسکەلا (ئەصل) کە لەوێشدا بەفارسی ئەم پەراوێزە نووسراوە کە من کردم بەکوردی:
(ئەم هەڵبەستە لە بارەگای غەوثی گەیلانیدا هۆنراوەتەوە).
(کە جێت بێڵم) لە (گ/٣)دا: (بەجێت بێڵم)ە.
(بێ تۆ) لە (گ/٣)دا: (بۆ خۆم)ە.
٢- سەودا: دڵداری، سەوداکەم: سەودا بکەم یا سەودایەکەم وەیا سەودا (موعامەلەی کڕین) بکەم.
کەمـەند: یا کەمـەنگ، ئەو گوریسـەیە کە بەقوڵفە تێگیراندنی، ولاخی بوغرا و بەلەسـەی پێ بەیدەس دەکرێ، یا؛ لە جەنگدا بۆ گرتنی دوژمن بەکاربراوە و، یا؛ مەبەست لە بەکێشکردنی دڵدار و، دەروێشە (کەمەندکێش) لە سۆفیگەریدا.
جوانیی وێژەیی لەم تاکەیەدا: جیناس ئاراییە، هاوئاهەنگییە لە وشەی (دەڵێم) و (هەڵێم) و، لە (ناکەم) و (ڕاکەم) و (سەوداکەم) و، (ساچبکەم)، لە (تۆ) و، (ئەستۆ)دایە.
(ئەستۆ) لە (گ/٣)دا: (گەردن)ە.
٣- سینە: سنگ.
ئاه: هەناسەی خەفەتباری.
سەرد: سارد.
خەلیل: دۆست. بەڵام (ئیبراهیم خەلیلولڵا)ش دەگرێتەوە کەوا (نەمروود) هاویشتییە ئاگرەوە و نەسووتا-وەک لە قورئاندایە.
کە نار: کە ئاگر.
٤- (دڵ بۆیە) لە (گ/٣)دا: (دڵ بۆیە دڵ)ە.
قووت: خۆراک.
(کـوردی) بەم تاکـەیەی بەندیواری بەهێـزیی خـۆیمان بەبڕوای فـەلسـەفی و گـیـانی و، خۆشەویستییەوە بۆ دەربڕیوین.
(ئیتر) لە (گ/٣)دا: (ئەمن)ە.
(ناشێ) لە (گ/٣)دا: (نابێ)یە.
(هەرگیز) لە (گ/٣)دا: (بێ شک)ە.
٥- خەمانی: لوولی، پێچ و خەمەکانی قژ. جگە لەمەش واتەی (خەفەتەکانی) دەدا.
وەها ماتم: ئاوەها خەمبارم، ئاوا ڕووم لە چۆڵەوانی (هامات)ەکانە، هەروەها (مات) لە یاریی (شەطرنج)دا ژێرکەوتن و دۆڕاندنە. کە جوانیی وێژەیی لەم دەربڕینەدا هەیە.
خەمانی (گ/٣): خەیاڵی.

(ئەم تاکە)
ناوەڕۆکی ئەم تاکە، درێژەدانە، بەواتای تاکی پێشوو، بەشێوەیەک؛ کە بێزار نەبێ لەو باری ژیانی دڵدارییە گیانییەی خۆی لە پەژارەیی بیر و لە (دیلێتی)ی ناو پێچ و خەمی ناو کاکۆڵ و، لە بەندکراویی و بەندەیەتیدا و، سەرەڕای ئەوانەش ئەمەتا شادمانیی خۆی لەم تاکەدا هەڵبەستووە و باری دەروونیی خۆی لەگەڵ چەندین فەلسەفەی زانیارانە و عاقلانەی هەست واتە (ئیحساس)ی (ماددی) و باری گیانی (ڕوحی) واتە (مەعنەوی) و (دڵ) واتە سۆز (عاطیفە)دا گونجاندووە و بەئارامی بانگەوازی ئەو پەیوەندییە گیانییەی خۆی هەڵداوە.
هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستەم تەنیا لە سەرچاوەی (عن) و (مچ)دا دیوە یا بیستووە کە ئەمە یەکەم جارە چاپ دەکرێ.
هەرچەندە زنجیرەی یەک لە دوای یەکی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە بەم تاکە دەگۆڕدرێ بەپێی سەرچاوەی (گ/٣).

٦- (بەسان): وەک، بەوێنەی، هەروەک، چون.
(بەندی): بەندکراو، گرتوو، گیراو (سزای بەندکران بەسەر دادراو، لە بەندیخانەی هەستی سۆفیگەرییەکەیدا کە پێی خۆش بووە.
(بەندە): کۆیلە، چاکیر.
(تاڵێ موو): مەبەس لە تاڵە قژی ئەو کاکۆڵەیە کە لە تاکە هەڵبەستی پێشوودا ناوبراوە کە وەک (تەوق) لە ملیا و، وەک (کەلەپچە) و (زنجیر) لە دەستیدا و، وەک (کۆت) و (پێوەند) لە پێی ئالاوە و بەیدەستی کردووە لە بەندێتییەکەیدا.

٧- (سەیل): چۆڕاوگە، چۆڕانی ئاو، یا شلەیەکی وەک فرمێسکەکەی، هەروەها (سەیل) ناوی (بەردی بەنرخ)ی وەک (یاقووت)ی سوورە کە فرمێسکە خوێنینەکەی بووە.
ئەشک: فرمێسک، ڕۆنتک.
(قومە): نوقومە، بەقووتا چووە.
(غەرقە): خنکاوە، (لە ناو لێشاوی فرمێسکەکەیدا).
(فەرق): ناوچەوان، پێشانی، ئەنی، هەروەک (فەرق کردن) بەواتە (پێزانین).
(بلق بلق): مەبەست لە بلقی (بای هەناسە)یە لە خنکاندنی کەسێکدا لە ئاودا کە بەبلقە بلق لە بن ئاوەکەوە سەر دەکا.
(دەریا): جگە لە واتای (زەریا)ییەکەی (لە دەریا) بەواتە (لە دەرگانەی ئەودا) دەگرێتەوە.
(کوردی) لەم تاکەیدا یاریی بەوشە کردووە، وەستاییی وێژەیی و هونەرمەندی و جیناس ئارایی نواندووە.
لە سەیلی ئەشکی چاوانم (گ/٣): لەبەر فرمێسکی چاوانم
قوم و غەرقە هەتا فەرقم (گ/٣) هەتا فەرقم وەها غەرقم.

٨- کـەشـتی: گـەمێ، کـە مـەبـەسـتی لە ژیانی (غـەوثی گـەیلانی) بووە کـە لە سـاڵی (٤٧٠ک = ١٠٧٧ز)دا لە دایک بووە و لە ساڵی (٥٥٩ک = ١١٦٣ز)دا کۆچی دوایی کردووە.

لێرەدا (کـەشـتیی عـەشق)ەکـە و وشـەی (عشق) بەرێنـووسی کۆن بەرامبـەرە بە(٤٧٠) بەپێی نەریتـی ئەبجـەدی کـە (ع = ٧٠، ش = ٣٠٠، ق = ١٠٠) کـە هەمـووی (٤٧٠)یە، کـە مـەبەس لە (عشق)ە کە ساڵی لە دایکبوونەکەی (غەوث)ە کە هەر لەو ساڵەوە کە (عـەشق)یش دەگرێتەوە، عەشقەکەی کوردی بووەتە گەمیەیەکی بێ مەترسی لە (بای عەکس) واتە (الریاح العکسیە) کە بەپێچـەوانەی ڕۆیشتنی گـەمیە دەبێ، بۆیە ئەوەتا بێ باکیی خـۆی دەربڕیوە لەوەی کـە نایەوێ (خـەلق) بەهانـایەوە بێن، چونکـە خـۆی وەهـا دیتـووە کـە لەو (کـەشـتی)ی عـەشـقـەی ئەودایە، پارێزراوە.

ئەم تاکـەیش تـەنیـا لـە (عن) و (مچ)دا هـەیە و لـە (گ/٣)دا نیـیـە و کـەواتە ئەمـە یەکـەم جـاری چاپکردنیەتی.

لەم تاکەدا (کـوردی) شـارەزاییی خـۆی لە دەریاوانیـدا دەربڕیوە، لە گەشتـەکـانیدا بە(دەریای سـپـیی ناوەڕاست) واتە (مـیـدیترانە) یا (بـحـر الابیض المتوسط)دا کە لە شـوێنـی دیکەدا لەم پەڕاویەدا ئەو گەشتیارییانەی دەردەکەون.

موڕەببی: پەروەردیار کە مەبەستی غەوث بووە.

عـەشق: جگـە لەوەی بەواتە (دڵداری)یـە، بەڵام تیـپـەکـانی ئەم وشـەی (عـەشـق)ە کـە سـاڵی لە دایکبوونی (غەوث)ە بەپێی ساڵی کۆچی و بەرامبەرە بە ١٠٧٧ز.

پارە: پارچە، لەت و، یا ناوی (بچووکتری) (پوول)ێکی (عوسمانی) بووە لە سەرێنی (کوردی)دا کە (پارە) بەرامـبـەر بە(فلس)ی ئێـسـتـایە. سـەرپاکی ئەم پارچە هەڵبـەسـتـە کە پێوەنـدییـەکی گیانی و خـۆشـەویستییـە لەگەڵ (غەوث)دا؛ پەردەیەکمان لەسـەر لایەکی تاریکی ژیانی (کوردی) بۆ هـەڵئەداتەوە لە بارەی بەسـتنەوەی (کوردی)یەوە بە(قادر)ی خۆشـەویستییـەوە کە ئەشزانرێ (غەوث) ناوی (عەبدولقادر) بووە لە لایەن نەشارەزایانەوە. کە بەداخـەوە ناوبردنی ئەو (قادر) و چەند قادرێکی تر کە لە پاشتر ناویان دێ (کوردی) بەوە تاوانبار کراوە کە (قـادرباز) بووە کە لەم پەڕاوەیەدا ئەو تاوانەم بەبەڵگەوە لەسـەر (کوردی) لاداوە، لێرەدا (قادر) غەوثە.

کرد (گ/٣) کرا.

(کوردی) پارە پارەیـی (لەت لەت)ی جگەری خـۆی لەو ئـەڤینەیدا بەپوول و پـارە چواندووە، بۆیە خـۆی بەبێ پارە نەزانیـوە لە سـایەی خـودی (غـەوث)ەوە، ئەم ناوبردنی (بەغدا)یـە پشـتگیـری و ڕاستیی ئەوەیە کە لە بارەگای (غەوث)دا ئەم هەڵبەستەی بۆ ئەو داناوە.

٢

## ئەی ڕەفیقان

١- ئەی ڕەفـیـقـان؛ بێن بەخـەنجـەر بمکوژن ئێـوە و خـودا
تا؛ خـەلاصـیـم بێ لە دەس هـیـجـرانی یاری بێ وەفـا

٢- تووشـی یـارێ هـاتو، وم سـەحـحـار و، دوزد و حـیـلەباز
تورک ڕەفـتـار و، طەبیـعـەت کـافـر و، صـوفی نومـا

٣- من وەهـام زانی کـە ئاهوو، کـەوتە داوم؛ ئێـسـتـەکـە
خـۆم خـەلاص نـابم، لەداو، کـەوتوومـە ناو چاهـی بەلا

٤- هات بەعـەییـاری دڵی لێم سـاند و ئێستـەش پێم دەڵێ
من لـە کـوێ تـۆم دیوە هـەی پـەتیـارە لاچۆ لێـرە، سـا

٥- دێم؛ بچم بـیـــــبـــــینم ئەو دەڕوا بـەیارانی دەڵێ:
کـەس سـلاوی لـێ نەکا، دوور بـێ لە جـەمـعی ئێـمـە با

٦- ئەز دەڵێم قـوربـان، دەڵێ: مَن صـاحب الصـوت الکریە
غــەیرکــە بانگی کــا، دەڵێ: لَبَّــیك یا خــیــر الندِا

٧- ڕووی هـەزار داد و (فـیـغـان)ی تێ دەکـەم لێم نابیـەت
سـەنگدڵ، ئاخـر بەحـاڵی مـن، تەڕەحـوم کـەی دەکـا؟

٨- گـەر ڕەقـیب لالووت ئیـشـارێکی بکا گـاهـێ لە دوور
هەڵدەسێ چـەسـپان بەسـەر شـانیا دەدا جـەڵدی عـەبا

٩- بەختی (کوردی)نەحس و، دڵ بێ صەبرو، لەیلا بێ وەفا
ئـەی خـــودا ڕۆ، دڵ وەها، طـالـع وەســـا، جـــانانەوا

---

١- بمکوژن: گەلێ لە زانا پزیشکییەکان بەلایانەوە وایە: ئەو نەخۆشەی هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێ، یا؛ ترسی تەشەنە لێوەکردنی هەبێ؛ بکوژرێ چاکترە، بۆ ڕسگاربوون لە ئازار.
(کوردی)ش لێرەدا و لە زۆر جێگەی تری هەڵبەستەکانیا، سوور بووە لەسەر ئەوەی کە بیکوژن کە هیوای خۆشیی ژیانی براوە؛ چونکە پیاوێکی بەڕاستی کوڵۆڵ بووە.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (عن)، (ر) ، (گ/٣)یە و، لێرەدا (عن)م کردووەتە بنکە و دەسکەلا، کە کۆنترین و بێ هەڵە و ڕێکوپێکترینە وە لە (الموسوعة العربية الميسرة)دا و (المنجد في اللغة والأعلام) کەڵک وەرگیراوە.

(تا خەلاصیم بێ): (ر): (یا خەلاصیم بی).

(لە دەس) (ر)دا: (لە دەست).

**تێبینی:** بۆ سەرچاوەی (ر)یەکە، مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی ئاراستەی کردم و ئەو کەشکۆڵەی مەلا ڕەسوولی تۆربەییی پێ دام و هەرچی هەڵبەستێکی (کوردی)ی تیا بوو، لێم وەرگرت و شایانی سوپاسی بێ پایانمە.

٢- سەحار: جادووگەر.

دوزد: دز. کە مەبەست لە دزینی (دڵ)ە.

تورک ڕەفتار: تورک ڕەوشت، مەبەس لە ڕەوشتی بەدی عوسمانییان و خراپیی (تورکەکان) بووە لە چەوساندنەوەدا کە هەمیشە لە داگیرکردن و پێشێلکردنی ماف و (بەتورککردن)دا بوون و هەن.

نوما: خۆ دەرخەر.

لە سەرچاوەکاندا صۆفیەتیش ڕێبازێکی فەلسەفیی گیانی و ئاینییە کە بەهۆی پاکییەوە بەندیوارییە لەگەڵ پەرتەوی خوا، یا خودی خوادا، لە وێژەی کلاسیکی لە صۆفی دواندن باوە، بەڵام (کوردی) مەبەسی لە صۆفیە درۆزنە سەرزارییەکانیانە کە ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر)دا نییە و لە (گ/٣)دا سێیەمینە.

(سەحار) لە (گ/٣)دا: (قەڵلاش) ئەمەش بەدەسکاری مامۆستا گیوی دەزانم.

(کافر) لە (گ/٣)دا: (گاور) دیسان هەر ئەو دەسکارییەیە، (کافر)یش وشەیەکی کوردیی بەڕەچەڵەک لە (گاور) و (گەبر)ەوەیە، مەبەست لە بێ باوەڕییە بەخوا و پێغەمبەر و ئاین و بەداخەوە لە ڕووی نەزانییەوە بەهەڵە، لەباتی (فەلە = مەسیحی) بەکار دێت، وە عەرەبەکانیش لەسەر نەریتە نازانیارییانەکەیان وشەکەیان (تەعریب) کردووە بە(کافر) و بووەتە وشەیەکی (ئیسلامی).

٣- ئاهوو: ئاسک.

چاه: چاڵ.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر)دا نییە و لە (گ/٣)دا دووەمینە.

لەداو (ر) و (گ/٣): وەها.

(چاهی بەڵا) مەبەس لە (بەندیخانە) یا (زیندان) و لێرەدا بۆ مێژوو لێیان دەدوێم:

(چاه) یا (زیندان): ئەوەندەی ژوورێکی گەورەی زۆر قووڵ، لە زەوی هەڵکەندراوە و سەرەکەی دارەڕاو گڵەبان کراوە و تەنیا کونێکی ئەوەندەی پیاچوونی زەلامێک لە سەربانەکەیەوە

هێڵراوەتەوە زیندانی بەگوریس لێوە ڕاهێڵراوەتە ناوی و لەوێوە بەلەسە بەشەیەکدا بەبەندێک خواردن و ئاو داچۆڕی خوارەوە کراوە و ئەو زیندانییەی تێی خرابێ (مەگەر چوونها) لێی دەرنەهێنراوە. ئەم جۆرەیان لە چیرۆکە گوێ ئاگردانی و ئەفسانەییەکانماندا هەن و زۆربەی فەرمانڕەوا دێرینەکانمان هەیان بووە.
خانزادە خاتوونی سۆران لەم جۆرە زیندانەی هەبووە و من لە نیوەی دووەمی ساڵە پەنجایەکانی چەرخی بیستەمی زایینیدا ئەو زیندانەم بەسەر والایی دیوە لە دامێنی قەڵای (خانزاد)دا، کە لە دوا دوای سەدەی شانزەهەمی زایینیدا دروستی کردووە. بۆ گرتووە تاوان گەورەکان، بەکاری هێناوە و کەوتووەتە نزیک لای خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵایە بەناوبانگەکەی خۆیەوە کە ئەوسا قەڵایەکەم دەدی بەڵگە و شوێنەواری کاولبووی سێ نهۆمی مابوو، ئەو ڕێگایەی بۆی سەردەکەوت لەملا و ئەولای ڕێگەکەوە پلیکانەی زەلامی پیادە پیا ڕۆیشتن و لە ناوەڕاستیاندا ڕێگای تەخت بۆ (گالیسکە – عارەبانە) و سواری هەبوو، لە ئەو قەڵایەیدا فەرمانڕەوایی کردووە.
ئەو قەڵا و زیندان چاڵاوانەی داوێنی قەڵا کەوتوونەتە پشت (باکور)ی گوندی (خرواتان)ەوە لەسەر ڕێگەی (شەقڵاوە–ڕواندز). بەلای سەرووی ڕێگەکەوە لە ڕۆژهەڵاتی جووتە شارۆچکەی (حەریر) و (باتاس)دا لە پارێزگای هەولێر.
جۆری دووەم (بەندیخانە)ی ئاسایی بووە کە لە شارەکان و لە ناو (قەڵایەکان)دا بوون.
لەسەرێنی (کوردی)دا بەندیخانە و زیندانی (بابان)ەکان لە شاری سلێمانیدا لای (ئاشی ئەحان) لە نزیک مزگەوتی (ئەحان)ی ئێستەدا بووە کە ئەو (ئەحان)ە ئەحمەد بەگی صاحێبقرانی (گەورە)ی باپیری خودی (کوردی) بووە کە وەزیری بەرگریی فەرمانڕەوایی بابان بووە.
(کوردی) ناوی ئەو (زیندان) و (قەڵایە)ی (سلێمانی)ی لەو هەڵبەستی:
(ئەی دوری تاجی...)ی لە پیتی (ن)دا بردووە.
٤– عەییار: فێڵباز، نازوفرۆش.
(دڵی لێم ساند و) لە (ر) و (گ/٣)دا: (دڵی لێ ساندم)ە.
(هەی پەتیارە) و (عن)دا لە پەراوێزدا نووسیویە: نوسخە: (ئۆی لێم لادە).
(هەی پەتیارە) لە (ر)دا: (لام لێ لادە)یە.
(هەی پەتیارە) لە (گ/٣)دا: (ئەی بێعار)ە.
(عەیار) لە زۆر سەرێنی فەرمانڕەوایان و بەتایبەتی (عەبباسی)یەکاندا ئەو دەستە، یا ئەو کەسە هەژار و دەغەڵ و فێڵباز و دووزمان و لە ڕێ دەرچووی زیرەکانە بوون، بەلێهاتوویی و کەڵەکچێتی خۆیان ژیاندووە ئای بەدەرچوون لە چوارچێوەی یاسا و (یاخیگەری)ی ئاشکرا یا نهێنی وەیا بەخۆدانە بن سایەی فەرمانڕەواکانەوە بەمەرایی و چوغولی کردن، ژیاون کە

نموونەیان زۆرە لە پەڕاوی (حکایات الشّطار والعیارین من التراث العربي)دا ناوبراون.

٥- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گ/٣)دا نییە و لە (ر)دا دووەمین تاکە. بەم پێیە هێشتا ئەم تاکە لە چاپ نەدراوە.

(دێم بچم ببینم) لە (ر)دا: (من دەچم ببینم) نووسراوە.

(دوور بێ لە جەمعی ئێمە با) لە (ر)دا: (زیوریی توزبر وابلا)یە؟

٦- ئەم تاکە لە (تۆربەیی)دا سێیەمینە لە (گیو/٣)دا پێنجەمینە.

- ئەز: من- وا ئێستە ئەم وشەیە بەتێکڕایی بادینی بەکاری دێنن، بەڵام وا دیارە لە سەرێنی (کوردی)دا ئەم وشەیە سۆرانیش بەکاری بردووە، چونکە لە هەڵبەستی (نالی) و (سالم) و هۆنەرانی تری ئەو سەردەمەماندا هاتووە.

ئەز (تۆربەین، گیو/٣): من.

- قوربان: بەقوربان، بالا گەردانت بم، لە دەورت گەڕێم، کە (کوردی) لە شوێنی تردا ئەم وشەیەی زۆر بەکار هێناوە و (قوبان)یشی وتووە کە کورتکراوەی قوربانە و پترێک بۆ خۆشەویستییە.

ئەم وشەی (قوربان)ە عارەبییە کە ڕستەیەکی زمانیی ئاینی ئیسلامە، لەوەوە هاتووە کە (ابراهیم خلیل الله) خەریکی سەربڕینی (ئیسماعیل)ی کوڕی بوو وەک قوربانییەک بۆ خوا- هەرچەند لە ناو کوردانیشدا بەر لە ئیسلام و لە زەردەشتیدا و بەر لەویش هەر قوربانییان بۆ خواکان کردووە.

مَنْ صاحب الصوت الکریە: کێیە خاوەنی دەنگی ناساز و ناخۆش.

غەیر کە بانگی کا دەڵێ: دوشمن أر بانک دکا دلی:

غەیر کە بانگی کا دەڵێ (گ/٣): دوژمن ئەر بانگی دەکا.

لبیک یا خیر الندا: بەڵێ ئەی چاکترین بانگ.

٧- فیغان: گریە و زاری.

سەنگدڵ: دڵ بەرد، دڵڕەق.

تەرەحوم: بەزەیی، دڵسۆزی، کەی دەکایە (کەید دەکا) دەخوێندرێتەوە، واتە فێڵ دەکا.

- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر) و (گ/٣)دا نییە و ئەمە دووەمین تاکە، لەم هەڵبەستەدا کە تا ئێستا چاپ نەکراوە.

٨- ڕەقیب: دژ، ناکەس، (کەسێک لە سووسەکردن)دا بێ بۆ خراپکاری ئەم ناوی (ڕەقیب) هێنانە، باوێکی وێژەیی کۆنە لە هەڵبەستی کورد و گەلانی ناوچەکەدا بەگشتی.

گاهێ: دەمێ، کاتێ.

چەسپان: گورج، خێرا، چالاک.

جەڵد: بریسکوباکدار، لە جلوبەرگدا.

- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر)دا نییە و، لە (گ/٣)دا شەشەمینە.
- (لالووت) لە (گ/٣)دا: (هەڵسێ).
- (بەسەر شانیا دەدا) لە (گ/٣)دا: (لەسەر شانی دەدا)یە.

عەبا: بەرگێکە لە سەروو هەموو پۆشاکێکەوە لەبەر دەکرێ، یا دەدرێ بەشاندا، کە نێرینە دەیکاتە بەری یا دەیدا بەشانیدا و لە (گەرما) و (سەرما)شدا دەیدا بەسەریدا. هەروەها لە کاتی باران و بەفریشدا یا لە پێویستی تایبەتیدا وە یا قۆڵی تێهەڵئەکێشرێ (لەبەر دەکرێ) و زۆر کەم مێیینەش بەکاری هێناوە.

٩- بەخت: لە شوێنی تری ئەم پەڕاوەیەدا لەسەر (بەخت) و بڕوای کوردی بە(بەخت) دواوم.

نەحس: پێم وایە عەرەب ئەم وشەیەی لە (ناکەس)، یا لە (ناچیز)ی کوردییەوە، وەرگرتبێ کە بەواتە: (نالەبار)، (تووش)، دێ.

صەبر: ئارام، پشوو.

لەیلا: هێمایە بۆ خۆشەویست و دڵخواز، کە وشەیەکی کۆن و ڕەسەنی باپیر (لۆ لۆ)یی یا (لوو لوویی)یەکانمانە کە بەئافرەتیان وتووە (لێ) و بەپیاو (لۆ) وتراوە.

هەتا ئێستەش لە گۆرانییە کوردییەکانماندا (لۆ لۆ) و (لێ لێ) بەواتە (کوڕۆ کوڕۆ) و (کچێ کچێ)یە؛ وە (لێ لێ)یەکە بووە بە(لەیلا) کە عەرەب لەوەوە وەری گرتووە و کردوویە بەعەرەبی و (کوردی) خۆی کردووەتە (مەجنوون)ی (لەیلا).

وەفا: ئەمەک، ئەمەگ، ناسپڵە.

ئەی خوارۆ: ڕێژە (صیغە)یەکی (هەڵەی باوە) کە لە کۆستی گەورە و گریان و داد و فیغاندا، وە لە داخ خواردن و کارەساتی خراپدا وتراوە و دەوترێ وەک باوکەڕۆ، براڕۆ، ڕۆڵەڕۆ، هەڵەی (خوارۆ) لە ڕووی زمانییەوە ناگونجێ، چونکە (خوا) وەک (باوک و برا و... (نەمردووە) و (نامرێ)، ئەگەرچی مەبەس لەمە گازندەیشە.

طالع: بەخت، چارەنووس.

وەسا: وەها، ئاوا، ئاوەها، ئەم چەشنە.

جانانە: دڵخواز، خۆشەویست، ئەوی وەک گیان خۆشەویستە، هەروەها مەبەست لە (ئافرەت)ی جادووکار و فێڵباز و نازونووزکارە.

ئەم تاکە، لە (ر)دا پێنجەمینە و، لە (گ/٣)دا حەوتەمینە و، لە هەرسێ سەرچاوەکەی دیدا دوا تاکە.

بەختی کوردی نەحس و (گ/٣) کوردی وا بەدبەخت و- ئەمەش دەسکارییە.

لەیلا (ر) لیلیش.

بێ وەفا (ر) دڵگران.

بێ وەفا (عن) لە پەراوێزەوە نووسیویە: نوسخە ئەی خوا.

ئەی خودا (عن) لە پەراوێزەوە نووسیویە: نوسخە ئەی خوا.
وەسا (ر) و (گ/٣) وەها.
کوردی، بۆ دووبارەبوونەوە، سێ وشەی (وەسا) (وەها) و (وا)ی بەکارهێناوە کە ئەوەش شارەزاییە لە زمان و وێژەدا.

٣

## حیرەتم لەم مەستە چاوە

١- حــیــرەتم لەم مــەســتــە چاوە؛ بۆ لـەگــەڵ من وا دەكـا؟
ئەم هەمــوو دەرد و جـەخـارەم بـۆ؛ (لە كـوێی پەیدا دەكـا)؟

٢- شــاهـیــدان حــەقــیــانە؛ نـازی، جــوانی بـفــرۆشن وەلێ
ئەم بـەمــاڵ و دڵ رەضــا نـابێـتــوو، ســەر یەغــمـا دەكـا

٣- دڵ بـوو؟ بردی. عــەقـڵ و دین و ئـابـڕوو بوو؟ لێی ســەندم
بـۆیە؛ نـابـووت، تـەپڵـی، تـەپڵـی ســەر، لە دەس ئـاڵا دەكــا

٤- هێندە وەحشـە، هەر لەگەڵ: (صـەییاد)ی دی ئاهوو صیفەت
گــەردن هـەڵدەبـڕێتــوو، دەڕوانێـتــوو، چەســپـان ڕادەكـا

٥- من شكایەت لەم بكەم، یاخــۆ بڵــێم: ســووچی دڵـە؟؟
یا گلـەی بەخـتـی ڕەشی خـۆم كـەم؟؟ كـە ڕێی بێ ڕا دەكـا

٦- ئـای: كــە مــەغـدوورم؛ نیگارم وایە، بەخــتم وا و كــەچی؟
دڵ ئـەوەندە بێ عــارە هێــشــتــا ئـارەزووی ئەولا دەكــا

٧- دائیــــمـــا دڵ وا لە ســــەعـــیی ئـەتک و، ئابـڕوو بـردنم
پێـشـینان (كـوردی) دەڵێن هەر خـزمـە خـۆ ڕیسـوا دەكـا

.................................................................

١- حیرەتم: سەرسامم، واق وڕماوم.
مەستە چاو: چاو مەست، چاو بەخومار، (چاوخومار) هاتووە. چاو نەرم، چاوی خەواڵواوی.
جەخار: ناخۆشی، مەینەت، غەم، ئازار.
ئەم هەڵبەستە هێشتا چاپ نەكراوە و، لە سەرچاوەی (عن، ص، ما) وەرگیراوە، بەڵام من (ص)م كردە دەسكەلا چونكە هەموو تاكەكانی تیایە و ئەم تاكە لە (عن) و (فا)دا نییە.
وەك دەبینرێ لەگەڵ سەرچاوەكەیشیدا هەندێ لە تاكەكانی ئاوێتە و زۆربەی ڕستەكانی لە نێوان سەرچاوەیەكەوە بۆ یەكێكی تردا جیاوازن، بەڕادەیەك تێكڕای هەڵبەستەكەیان لاواز و ئاوقای جۆرە وشكییەك كردووە كە تۆزێ لە هی (كوردی)یان دوور خستوونەتەوە، هەرچەندە مۆركی ئەوی هەر پێوە ماوە.

ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە (ص)دا هەیە و لەوانی تردا نییە.

٢- شاهیدان: لێرەدا بەواتە: جوانان، نازداران دێ.

سەر: کەللەی سەر، کە مەبەست لە (هۆش و بیر-عەقڵ)یشە یا سەربڕین.

یەغما: تالان، (وشەیەکی تورکی)یە.

جگە لەوەش (ماڵ) هێمای (مادده) و (دڵ) هێمای سۆز (عاطیفە) و (سەر) هێمای (عەقڵ و گیان-ژیان)ە.

(بفرۆشن وەلێ): لە (عن)دا: (دفروش بلا)یە.

(بەماڵ و دڵ ڕەضا نابێتوو سەر یەغما دەکا) لە (عن)دا: (بەماڵ و سەر کە ڕاضی نابێتوو خۆم ڕیسوا دەکا)یە.

ئەگەر لە دوا تاکی ئەم هەڵبەستەدا، پاشبەندی وشەی (ڕیسوا) نەبووایە ئەم دەقەی (عن) بۆ ئێرە بەجێتر بوو.

جگە لە نیشانەی لاوازبوون بەهۆی دەستاودەست و دەماودەم کردن، گۆڕین و پچڕ پچڕییەوە، بەسەر ئەم هەڵبەستەدا هاتووە یان لەوانەیە لە هەڵبەستە هەرە کۆنەکانی (کوردی) و سەرەتای هۆنەرێتیی بێ و ئاواتەخوازم سەرچاوەی تر سەرهەڵبدا ئەم لێڵییەمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

لە (ما) و (عن)دا ئەم تاکە ئاوێتەی هەڵبەستی (چاوی مەستت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا)ی کوردی کراوە.

٣- نابووت: چی بەدەستەوە نەماوە (موفلیس).

تەپڵی سەر: کاسەی سەر، تەوقی سەر، کە سەری خۆی کردووە بەتەپڵ لەبەر ناو بۆشی (تەپڵ)ەکەیە کە سەریشی ئاوا بێ مێشکە و (کوردی) لە جێگەی ئەوەی کە وەک (باو)ە (مۆم یا چرای) نابووتی هەڵدەکرێ، ئەم بەلێدان و دەنگی تەپڵی سەری خۆی ئەو ئاگادارییە دەگەیەنێ و بەدەست بەسەری خۆ داماڵین ئالای نابووتی هەڵدەکا.

ئالا: بەیاخ- وە یا دەستی خۆی وەک (ئالا) لە جێگەی ئەو (مۆم) و (چراکە)یە ئەشەکێنێتەوە کە نابووت دایان دەگیرسێنێ.

ئەم تاکە تەنیا لە (ص)دا هەیە و لەوانی ترا نییە.

٤- ئەم تاکە لە (عن) و (ما) ئاوێتەی هەڵبەستی (چاوی مەستت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا)ی کوردی کراوە.

وەحش: کێویی.

صەییاد: نێچیروان، ڕاوکەر.

ئاهوو: ئاسک.

چەسپان: گورج، خێرا، چوست (چوستان).

هەڵسەنگاندن-ئەم بیری خۆشەویست بەئاسک کردنە لە وێژەی کۆنی گەلانی ناوچەکەدا زۆرە ئەویش لەبەر بوونی ئاسک و شکارکردن و وێکچوونی چاوی و (سلّی)ی ئاسک و دڵخوازە.

اهو ز تو اموضـــت بهنگــای دویدن

رم کردن وایستاون و واپس نگریدن

ئەم تاکـە لـە (عن) و (مـا)دا پێنجـەمین تـاک و ئاوێتـەی هەڵبـەسـتی (چاوی مـەسـتت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا)ی کوردی کراوە.

(هێندە) لە (ما)دا: (هندە)یە.

(لەگەڵ) لە (عن)دا: (دەمێ)یە.

(گەردن هەڵدەبڕێتوو، دەنوارێتوو) لە (عن)دا: (سەر هەڵبڕێتو دەنۆڕێ)یە.

(گەردن هەڵدبڕێتوو، دنوارێتوو) لە (ما)دا: (گردن هلدبریتو دنواری)یە.

(چەسپان ڕادەکا) لە (عن)دا: (زۆر بەگورجی ڕادەکا)یە.

(چەسپان ڕادەکا) لە (ما)دا: (کتوی دی ڕادەکا)یە.

(کـوردی) ئاسکێکمـان بۆ دەسنیـشـان دەکـا کـە خـەریکی چەرین بـووە و لە ڕێگەی ژیـانی ئاسـوودەیی و ئازادی خـۆیدا وریا و سـڵ بووە و ئاگەداری هـەر جـوولە و هـەست هەڵگرتنێک و هـەر دەنگێکـی نائـاسـایی بـووە، چونکـی ئەو ئـاسکـە ئـەوەندەی ڕاوکـەر دیوە، کـە ئـاسکـە هاوڕەوەکانی ئەویان کوشتوون و ڕایان پەڕاندوون، ئیتر ئەویش وریای هەر نێچیرەوانێک بووە و، بەهەسـتپـێکردنی یا بینینی سـەری لە چەراندن بەرز کـردۆتەوە هـەرکـە سـەرچاوەی دەنگ و ڕەنگە نائاساییەکە، یا ڕاوکەرەکەی دیوە گـورج خۆی ئاسایییانە تێی تەقاندووە و بەتیژڕەویی خـۆی، خـۆی لەو سـەرچاوەی دەنگ یـا ڕەنگە گوم کـردووە و لە دەس نێچـیروانەکە خـۆی ڕزگـار کردووە.

(کوردی) لەم دیاریکارییەیدا و، لەم ڕوانگەیەوە بەشێوەی دەربڕین و دەروونی خۆی وەنەبێ هەر بەم تاکـە هەڵبەسـتـەی ئەم دیمەنە سـادەیەی لێ دەرخـسـتبـێ، بەشکو ئەم دیمەنەی بەسـتـووە بەسـڵـیی یاری و جوانیی چاوەکانییـەوە کە وەک ئاسکەکە سڵ و چاو جوان و ئێسک سـووک بووە، ئەمیش وردەکارییەکی تری (کوردی)مانە.

٥- ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە (ص)دا هەیە و لەوانی تردا نییە.

(کوردی) لەم تـاکە هەڵبەسـتەیدا زۆر بابەتیـیانە دواوە و چەندین ئـەملا و ئەولای بابەتەکەی تیا بەسەرکردوونەتەوە بەشێوەیەکی ورد و بێ خۆپەرستیی زانیارانە.

بەڵام بەپێی بیروبڕوای باوی ئەو سـەردەمە (کوردی) هەسـتی خۆی و بڕوا بە(بەخت) دەربڕیوە، کە فەلسەفەیەکی ئەفسانەئامێزە و گوایە شتێک هەبووە و هەیە بەناوی (بەخت)ەوە لە ژیاندا و لە ڕووداوی هەر بار و کارەساتێکدا کاریگەر و پێوەندیداری ئەو (چارەنووس) لە ئارادا بووە، و هەر لەناو گەلە دواکەوتووەکاندا بەبێ بەرچاوگرتنی هۆیەکانی ڕووداو و کارەساتەکان، وە ئەو بۆچوونە هەڵەیەشیان بەستووە بەئایینەوە کە ئاین لە خودی خۆیدا چارەساز و ڕێنومای چاکە و ڕەوشتی بەرز و ورییاییە.

٦- نیگار: نازدار، یار.

کەچی: (لەگەڵ ئەوەشدا) و، (چەوتی)یش دەگرێتەوە.
ئەم تاکە تەنیا لە (ص)دا هەیە و لەوانی تردا نییە و ئەم بیرەی ئەم تاکە لە زۆر هەڵبەستی تری کوردیدا هەن ئەویش لە ڕێکەوتی ئاوقابوونییەوە بووە بەنەهاتی و نوشوستی و سەرنەکەوتن و بەئارەزووی خۆ نەگەیشتن کە ئەم جۆرە ڕەشبینییەی دەربڕیوە، کە خۆی لە نێوان (ژیری) و (دڵ)دا دیوەتەوە بەرامبەر بەخواست و پێداویستییەکانی کە بەزۆری نەهاتوونەتە دی بەڵام (ئەولا)یەکەی دیاری نەکردووە. کە ئایا (ئەولا) یا (ئەولاد)ە.
٧- ئەم تاکە لە (عن) و (ما)دا ئاوێتەی هەڵبەستی (چاوی مەستت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا)ی کوردی کراوە.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لەو پەندی پێشینانەوە هاتووە کە دەڵێ: (ئەوی خۆ بەخۆی دەکا بێگانە بەخۆی ناکا).
ئەم تاکە لە (ص)دا حەوتەمین و دوا تاکە، وە لە (ما)دا هەشتەمین تاک و ئاوێتەی هەڵبەستی ناوبراوە لە (عن)دا دیسان نۆیەمین تاکی ئاوێتەی هەمان هەڵبەستە.
کوردی لە (ص)دا لە پەراوێزەوە نووسیویە: (نسخە = هجری).
کە (وشە) یا (ناو)ی (هیجری)یش هەر نازناوی خۆی بوو، بەڵام وەک بۆم دەرکەوتووە، هەر هەڵبەستێکی لە دەرەوەی کوردستاندا دانابێ نازناوی (هیجری)ی تیا داناوە.
ئابڕوو بردنم (ما) ئابڕووچوونی من
(کوردی) وەک زۆربەی هۆنەرانمان لێرەدا خۆی بەدوو کەس ڕاگەیاندووە: (دڵ) و (خۆی) و ڕەنگە دڵەکەش مەبەستی لە خزمی خراپ بووبێ و بەهانا بردنە بەر (پەندی پێشینان) بەندیواری خۆی بەکەلەپووری گەلەکەیەوە دەربڕیوە کە بەداخەوە زۆر لەوانەی گوایە هەڵبەستی نوێیان داناوە و دائەنێن بانگەوازی جەنگ و دوژمنایەتییان بەرامبەر بەکەلەپووری گەلەکەیانەوە هەڵداوە کە ئەوانە بێ بناغەن و ئاکامیان تەپینە.

٤

## ڕۆحی خۆم لێ زویره

١- ڕۆحی خـــــۆم لـێ زویره دائیم، بـۆیـه وا زاری دەکـــا
ئـای چ بێـــزاره بەزار، فـــریادی بیـــمـــاری دەکـــا

٢- (ڕۆح) کـه یار و هاوسـەری (دڵ) بوو فـڕاندت، (شـین)ییـه
ئارێ، ئارێ حـەقـیـەتی، ئەو مـەیلی هاوشـاری دەکـا

٣- هەر شـــەوێ وەعـدەی ویصـالت بێ؟ هەتا ڕۆژ ناسـرەوم
لەیلەتولقـەدرە، هەمـوو کـەس حـەز بەبێـداری دەکـا

٤- دڵ لـه قـاپی تۆیە، وریای هەر کـەسـێکه بێـتـه لات
چوون؛ غـەریب و کەس نەناس، مـەشقی هوشـیـاری دەکا

٥- چاوەکـەت بۆ قـەتڵی من هیچ ڕەحم و ئەندێشـەی نییـه
حـاکـمێ مـەست بێ، هەمـیـشـه مـەیلی غـەدداری دەکـا

٦- عـیللەتی بێ ئیلتـیـفـاتیی تۆیە ناڵەی سـۆزشـم
باعـیـثی شـەرمی گـوڵە؛ بولبـول کـەوا: (زاری دەکـا)

٧- (کوردی) مەستی دوردی بادەی عەشقە ویردی نەظمی ورد
دەردی هیـجـره گـەر بەحـەرفی کـوردی هەر یاری دەکـا

..................................................................

١- زاری: گریان، داد و هاوار، فوغان.
بێزار: جاڕس، قەڵس، تەنگاوی.
زار: زمان، دەم، زەبوون.
فریاد (فەریاد): هاوار.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (مس) و (گ/٣)یە و (مس)م کردە دەسکەلا.
(ڕۆحی خۆم لێ) لە (گ/٣)دا: (ڕۆحی لێم) واتا نادا و لەنگیشە، (زویرە لە (گ/٣)دا (عاجزە)ە و لەنگە)،
(بۆیە وا) لە (گ/٣)دا: (کەوا)یە-و لەنگە.
بەپێی دەستووری وێژەی کۆن، یەکخستنی وشـەگەلی (زویر، زاری، بێزار و زار) جوان ئارایی

بووە، وەک لەم تاکەدا (کوردی) گردی کردوونەتەوە.

وا دیارە ئەم هەڵبەستە زۆری دەستاودەست و دەماودەم کردبێ، بۆیە هەندێ دووبارەکردنەوەی تێ کەوتووە و لەنگیی پێوە دیارە و بەڵام (کوردی) هۆنەرێکی زۆر وەستاکار و لێهاتوو و لە کێش زان بووە، بەڵام نەشارەزایان لە نووسینەوەدا وایان بەسەر هەڵبەستەکەدا هێناوە وەک (لێرەدا) و لە تاکی سێیەمدا وشەی (دائیم) هەیە و....

٢- (شین)ییە: لە شیوەندایە.

ئارێ ئارێ: بەڵێ بەڵێ، هەرێ هەرێ...

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گ/٣)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

مەبەست لە (هاوشارێتی) لەشی خودی (کوردی)یە کەوا (گیان) و (دڵ)ی تیا بووە و بەڵام (یار) دڵەکەی لەو شاری لەشی (کوردی)یەدا لە گیانەکە فڕاندووە.

٣- لەیلەتولقەدر (لَيْلَةُ القَدْرْ): ئەو شەوەیە کە خوا بەهۆی (جبرائیل)ەوە سەرەتای قورئانی بۆ پێغەمبەری ئیسلام نارد و مژدەی پێغەمبەرێتی درایە، کە ڕێکەوتی یەکێ لە شەوە تاکەکانی (دە) شەوی مانگی ڕۆژوو (ڕەمەزان) دەکا و بەتایبەتی شەوی (٢٧)ی. کە (٣) جار لە قورئاندا لە سورەتی (اَلْقَدَرْ)دا ناوی ئەم شەوە هاتووە، بۆیە ئیسلامەکان بەشەوی پیرۆز و بەڕێزی ناو دەبەن.

بێداری: نەنووستوویی، مەبەس لەو شەوە پیرۆزەدایە بۆ دوعاکردن.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گ/٣)دا دووەمینە چونکی تاکی پێشووی ناتەواوە.

٤- چون: چونکە، وەک، هەروەک.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا سێیەمینە چونکە تاکی دووەمینی تیا نییە.

(وریای هەر کەسێکە بێتە لات) لە (گ/٣)دا: (دائم هەر کەسێ بێ دێتە لای)یە کە بەدوو سنگەیە.

(چون غەریب و کەس نەناس، مەشقی) لە (گ/٣)دا: (هەر غەریبێ کەس نەناسێ مەیلی)یە.

٥- ئەندێشە: بیر، لێکدانەوە.

حاکم: فەرمانڕەوا.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا چوارەمینە.

بەدووری نازانم کە ئەم تاکە هەڵبەستە وەک توانجێک وەها بووە لە کەسانی خانەوادەی بابانی وەک (عوسمان بەگ) و (عەبدوڵڵا پاشا) کە گێرەشێوێنییان لە فەرمانڕەواییەکەدا کردووە. کە ئەم بیرەی (کوردی) لە هەستی نەتەوایەتییەوە هەڵقوڵاوە. هەروەک لە شوێنی تردا بەئاشکرا ناوی ئەوانەی بردووە و بەتایبەتی (عەبدوڵڵا پاشا)کەیان هۆی ڕووخاندنی (فەرمانڕەوایی بابان) بووە بەیاریدەی سپایی عوسمانی وەک لە هەڵبەستی تری (کوردی)دا ئەم ڕاستییە دەر دەکەوێ.

٦- ئیلتیفات: لا لێکردنەوە.

سۆزش: سووتان، بەسۆز.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گ/٣)دا پێنجەمینە و دوا تاکە.

٧- (کوردی): مەبەسی خۆیەتی و کوردی دووەم زمانی کوردییە.

دورد: خڵتە یا دواچۆڕی بادە (شەراب = مەی).

ویرد: خوێندنەوەی (نزا) واتە دوعا و ئایەتی قورئان.

نەظمی: هۆنراوەی، هەڵبەستی.

حەرفی: هەرچەند بەواتە (پیتی)یە. بەڵام مەبەست لە (وشە)یە.

جوانکاری لەم تاکە هەڵبەستەدا-لە ڕووی وەستایی وێژەییەوە، ئەوەیە ئەم تاکە بەشابەیتی پارچە هەڵبەستەکە دادەنرێ کە ئەم هەموو تیپی (د، ر، و، ی)یەی تیا گرد کردووەتەوە و جیناس ئارایی لە (دورد)، (ویرد) و (ورد) و (دورد) و (کوردی)دا کردووە.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە و ئەمەش دووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە کە تا ئێستا چاپ نەکراوە.

٥

## چاوی مەستت

١- چاوی مەستت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا
خوانی دین وەک (تورکی یەغمایی) بەناز یەغما دەکا
٢- تورکی دیدەت بەو دوو قەوسی حاجیب و تیری موژەت
بۆ گرفتی دڵ لە کاکۆڵت عەلەم پەیدا دەکا
٣- چاوی فەتتانت دەکا سیڕی نیهانی دڵ عەیان
واقیعا هەر فیتنە ئەسراری جیهان ئیفشا دەکا
٤- مەردومی چاوت کە دێتە سەر سوپاهی جان و دڵ
وەک (قەجەر) دائیم بە(قیرقاچ)ی نیگا دەعوا دەکا
٥- چونکە هیچ شاهید لە مابەینا نەبوو ڕۆژی ئەزەل
عەقڵ و دینم نایە مستی، بۆیە: وا حاشا دەکا
٦- گەر بەناحەق بمکوژێ؟ نابێ کە کەس مەنعی بکا
حاکمێ کافر بێ ئەڵبەت هەر عەدالەت وا دەکا
٧- پێم دەڵێ (کوردی) وەکو من ئارەزووی وەصلی نییە
بۆچی تۆ مانع دەبی، ئەم بەندە چۆن بێجا دەکا؟

---

١- خوان: سفرە، تەیکە.
تورک: عوسمانی، کە بەتالانکار ناوبراوە.
یەغمایی: تالانی. و، (یەغما) ناوی شارێکە لە تورکمانستان، کەوا نیشتمانییەکانی بەجوانی بەناوبانگن و بە(دڵ دز) ناسراون. ئەم هەڵبەستە لەم سەرچاوانە وەرگیراوە: (عن، ع، گل/١، گل/٤، گل/٦، گل/٩، ف، ص، ما، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣) و فەرهەنگی طەلائی (فت ١) و (کم)م کردە دەسکەلا.
(چاوی مەستت) لە (ما، گ/٢، س)دا: (چاوت ئەمشەو)ە.
(وا دیارە) لە (کم)دا: (وا یارە). ئەشێ هەڵەی چاپی بێ.
(بەرپا) لە (ما): (پەیدا)یە.
(دەکا) لە (کم، نم/١)دا: (ئەکا)یە، بۆیە هەموو پاشبەندەکانم کردنە (دەکا)، چونکە لە زۆرینەی

سەرچاوەکاندا (دەکا) نووسراوە.
(بەناز) لە (کم، نم/١، ف، ع، گ/٢، س، گ/٣، با): (بەتاو)ە.
٢- قەوس: کەوان، مەبەس لە (کەوان)ی برۆ و تیری برژانگە. هەرچەندە (تیر و کەوان) لە سەردەمی (کوردی)دا بەکار نەبراوە، بەڵام چاولێکەرییەکی وێژەیی کۆنە.
گرفت: گرتن، دەسبگیر.
کاکۆڵ: قژی ناوەڕاستی سەری نێرینەیی کە نەختێک درێژترە، هێمایەکی صۆفییانە و پیاوانەیی بووە.
عەلەم: ئاڵا، بەیداخ.
(بەو) لە (ع)دا: (بوی)یە.
(لە) لە (ع)دا: (کە)یە.
پەیدا لە (ما، ف، ع، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: (بەرپا)یە-دووبارەیە.
(پەیدا) لە (ص) (واڵا)یە- زۆر جوانە بەواتە بڵاوکردنەوە، بەڵام تەنیا ئەم سەرچاوەیە (واڵا)ی نووسیوە ئەوانی تر هەر (پەیدا)ن بۆیە (پەیدا)یەکەم لە دەقی هەڵبەستەکەدا هێشتەوە.
٣- فەتتان: جوان، (فەتتان) مەبەست لە (سەنگی مەحەک) کە ئەویش بەردێکە ساغی و ناساغی زێری پێ ئەزانرێ.
عەیان: ئاشکرا.
واقیعا: لە ڕاستییا.
ئەسرار: (کۆ)ی (سیر)ە بەواتە نهێنی.
ئیفشا: دەرخستن، ئاشکراکردن.
ئەم تاکە هەڵبەستە لە (نم/١)دا نییە.
(واقیعا) لە (ف)دا: (واقع)ە.
(واقیعا) لە (ع، کم، گ/٢، س، گ/٣، ما): (واقیعی)یە.
(جیهان) لە (کم، گ/٢، س، گ/٣، ف، نم/١، ع، ما)دا: (نیهان)ە کە (جیهان) هەڵەیە.
(دەکا) لە (کم)دا: (ئەکا)یە دیارە هەڵەیە.
٤- مەردومی چاو: بیلبیلە، گلێنە. (مەردوم = خەڵک، مرۆڤ) لە بیلبیلەکەی بەپیاوێکی ئاشووبەگێڕ چواندووە.
جان: گیان، ڕەوان (ڕۆح).
قەجەر: قاجار، عێلێکی کۆنی تورکە، دەوڵەتی قاجاریان دامەزراندووە.
قیرقاچ-یا-قیرقاج-یا-قیروقاج: گورج وەرگەڕانەوەی سوارە بەهەر لایەکدا و بۆ دواوە و خۆ بەتەنشتی زیندا شۆڕکردنەوە و تیر هاویشتنە لە (غار)داو وشەیەکی کوردییە.
دەعوا: هەڵڵا، ئاشووبە، گێچەڵ، چونکە قەجەر (قاجار)ییەکان دەسدرێژییان دەکردە سەر کورد.

جوانكاری لەم تاكە هەڵبەستەی (كوردی)دا (قەجەر) و (قیرقاچ)ە كە جیناس ئاراییەكی وێژەییشە.
ئەم تاكە لە (نم/١)دا سێیەمینە.
(مەردومی چاوت) لە (ما)دا: (فوجی مژگانت)ە.
(كە دێتە) لە (ع)دا: (ددیتە)یە.
(سوپاهی) لە (ع، ف)دا: (سپاه)ە.
(جان و دڵ) لە (گ/٢، س)دا: (موڵكی گیان)ە.
(دائیم) لە (نم/١، ف)دا: (دایم)ە.
(قیرقاچ) لە (نم/١، ف، ع)دا: (قرتاج) و لە (گ/٢، س)دا: قیقاج و لە (گ/٣)دا: قیرقاج.
(نیگا دەعوا) لە (ما)دا: (نكا داوا) و لە (كم)دا: (نیگا و دعوا) و لە (ع، گ/٣)دا: (نیگەه دەعوا) و لە (گ/٢، س)دا: (نیگاه دەعوا)یە.

– یارب سندی ملک زدست چومنی
دادی بەمخنتی، نەمروی، نەزنی
از گردش روزگار معلومم شود
پیش تو، چ دف زنی، چ شمشیرزنی

هاتنی ناوی (قاجار) لەم هەڵبەستەدا و سوارچاكی و دەعواكردنیان لەوەوە هاتووە كە لە سەرێنی (كوردی)دا زۆر جووڵە جووڵ و دەسدرێژییان بەملا و بەولادا دەكرد، بەتایبەتی بۆ سەر عیراق و سنووری بابان بەپشێوییان لە ناوچەكەدا، بەرادەیەک لە (كوردی) و زۆربەی هۆنەرانی ترمان لە ئاكامی بێزارییانەوە، لە هەراوهوریا و ئاشووبەیان، بەناچاری بەهەڵبەست رازی دڵی خۆیان دەربڕیوە. كە (كوردی) بیلبیلە كاریگەرەكەی چاوی خۆشەویستەكەی وەک سواری ئەسپە سپە (بۆرە)كەیەوە كە سپێنەی چاوەكەیەتی و بەملا و بەولادا تیلاو روانینەكەی، وەک قیروقاچ كردنی ئەو شاسوارە هێرشبەرە، سەر سوپای گیان و دڵە و داگیركەرە دەربڕیوە كە هێشتا هۆنەرێكی تر، جگە لە سالم بەم جۆرە لە چاو نەدواوە كە ئەوەتا (سالم)یش وتوویەتی:

دڵ قەفای خوارد و شكا، كردیە نیشانەی قیروقاج
گەردشی تیری نیگاهت لە قەفا میثلی قەجەر

كە سالم لەم دەربڕینەیدا بە رەوانی، سادەیی، پڕ واتایی و دڵگری تۆزی ئەوەكەی كوردی ناشكێنێ (دیوانی سالم، چاپی ٢ی گیو ١٩٧٢، هەولێر-چاپخانەی كردستان ص ٦٥).
لە هەڵبەستی «حیرەتم ئەم مەستە چاوە بۆ لەگەڵ من وا دەكا» سێ تاكی خرابووە ئەم هەڵبەستەوە.

**رەخنە:**

وەک دیترا ئەم چوار تاكەی پێشەوەی ئەم هەڵبەستەی (كوردی) لە دەربڕینیدا رووی كردووەتە

خۆشەویستەکەی و لەگەڵیدا وەک (مُخَاطَبْ) دواوە کەچی لێرەودوای ئەم هەڵبەستەوە، واتە لە هەرسێ تاکی دواییدا (کوردی) ئەو شێوەی دەربڕینی دەستووری زمانییەی گۆڕیوە و وەک یەکێ قسە لەگەڵ خۆیدا یا لەگەڵ یەکێکی تردا (کەسی سێیەم)دا بکا و شتێکی بۆ بگێڕێتەوە و لە نادیاری (غائب)ێک بدوێ ئاوەهایە. ئەگەرچی ئەم کارەی کوردی لە دەستووری وێژەی کۆندا بە(لەگەڵ خوا دواندن) یا (تەداعی) دانراوە کە کارێکی ڕەوایە.

٥- ئەزەل: مەبەست لە کاتێکەوە کە خوا (کوردی)ی و هەموو (بوونەوەر)ێکی دروست کردووە، ئەمەش نیشانەیە بۆ ئایەتی (ألست بربكم قالوا بلا) کە دەربڕینێکی صۆفییانەیە.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (نم/١)دا چوارەمینە ئەویش لەبەر ناتەواویی تاکی سێیەم، هەروەها ئەم تاکە لە (ما)دا شەشەمینە چونکە: تاکی دووەمی (دوایی) ئاوێتەی پێشی ئەم تاکە بووە، وەک لە (عن)دا حەوتەمینە، چونکی تاکی (٢ و ٤)ی هەڵبەستە ناوبراوەکەی ئاوێتە کراوە.

(لە مابەینا) لە (کم، ف، ما)دا: (لە مابەینمان)ە.

(لە مابەینا) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (لە نیوانمان)ە.

(لە مابەینا نەبوو) لە (ع)دا: (لە نیوان)ە.

(دینم) لە (ف، نم/١، کم، ع)دا: (هوشم)ە.

(مستی) لە (ما)دا: (دەستی)یە کە وشەی (مستی) بەڕێنووسی کۆنە و (مەستی) واتە (سەرخۆشی) دەگرێتەوە کە (مەبەست) لە سەرخۆشیی ئاینییە.

(بۆیە) لە (ع، گل/٤، گل/٦، گل/٩، ف، ما، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: (ئیستە)یە.

هیچ: هیچ شاهید نەبوو، ڕستەیەکە لە بارەی زمانییەوە واتای (شت شاهید هەبوو) یا (هەموو شاهیدێک هەبوو) ئەدات، هەرچەندە ئەم ڕستەیە، یا بەکارهێنانی ئەم وشەی (هیچ)ە، یەکێکە لە هەڵە باوەکانی زمانی، کە بەلای کەمەوە لە سەرێنی کوردییەوە لە ئارادا بووە و بێگومان ماوەیەکی تریش لەوەبەر هەر لە کارا بووە. ئەمەش ڕۆیشتووە و جێگیر بووە، هەموو کەس بەهەڵەی وەرناگرن.

ئەزەل (ع): بەکارهێنانی وشەی ئەزەل بۆ شوێنێکی وەک ئێرە لەسەر زارەکیدا هەڵنان (موبالەغە)یەکی یەکجار گەورەیە و لەوانەیە بڕوای پێ نەکرێ کە ئەمەش هەرچەندە بەپێی وێژەی کۆن ڕەوا بووە، ئەوەتا هۆنەرێکی وەک (فیردەوسی) ئێرانی کە لە (شاهنامە)کەیدا لە هەڵسووڕاندنی گورزی پاڵەوانێک دەدوێ دەڵێ، کە لە سەرەوە گورزەکەی بەر مانگ دەکەوت و لە خواریشەوە بەر ئەو (ماسی)یە کەوت کە گۆی زەویی بەسەرەوە بەندە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەڵبەستدا ئەم جۆرە هەڵنانانە لاوازین، چونکی کەی لە ڕۆژی (ئەزەل)ەوە (کوردی) عەقل و دینی ناوەتە مست جوانەکەی و ئەوسا کەی کوردی ئیسلام بووە و کەی ئەوسایە ئیسلام هەبووە و... هتد.

بەڵام ئەم جۆرە (موبالەغە) و ناوی (ئەزەل) بردنە، لێرەدا تێ ڕۆچوونێکی صۆفییانەیە، چونکە ئەو وشەی (ئەزەل)ە یەکێکە لە زاراوە (مصطلحات)ەکانی صۆفیگەری کە گوایە هەر لە

دروستبوونی (کوردی)یەوە بەندیواری ئەو جوانەیە و، ئاوێتەی خۆشەویستیی ئەوە و، تیا تواوەی یەکتری بوون، کە ئەویش بەلایانەوە هەر لە (ئەزەل)ەوە خوا ئەم پەیوەندییەی لە نێوان هەردوو لادا دروست کردووە و ئەمەش لە فەلسەفەی (مُسیّر)ەوە کە شت بەپێی ویستن و ئارەزووی خوا دانراوە و دەبێ وا بێ نەک بەئارەزووی شت یا کەسان... هتد. (موخەییەر) یا ئیختیاری.

**تێبینییەکی ئاینی لەم تاکە هەڵبەستە:**

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا کە هەرچەندە گازندەش دەکا لەوەی کە (شاهید) لە نێواندا نەبووە، کە عەقڵ و دینی ناوەتە مستی و حاشای لێ ئدکا ئەمیش وەک نیشانەی کردن بێ، بۆ ئایەتی (١٩٥)یەمی سوورەتی (الانعام) کە لە قورئاندا خوا فەرموویەتی:

(قل أيٌّ شيءٍ اكبر شهادة؟ قل الله شهيد بيني وبينكم)

واتا بڵێ ئەی موحەممەد چ شتێک مەزنترین گەواهییە، بڵێ خوا ئاگەداری نێوانمان و گەواهیدەرە.

یا لە ئایەتی ١٧ی سورەتی (الحج)دا کە فەرموویەتی:

«وان الله على كل شيء شهيد» واتە: (وە خوا ئاگەدار و گەواهیدەرە لەسەر هەر شتێک). و... هتد.

کە کوردی بەم ئایەتانە وەک پشووی دڵی خۆی دابێ وەهایە (القرآن الكريم) و (المعجم المفهرس لألفاظ القرآن الكريم).

٦- ئەم تاکە لە (نم/١)دا پێنجەمینە چونکی تاکێکی ناتەواوە، وە لە (ما)دا حەوتەمینە و، چونکی تاکێکی تری ئاوێتە بووە و لە (عن)دا هەشتەمینە، چونکی دوو تاکی تری (کوردی)ی ئاوێتە بووە.

(کە کەس) لە (ما)دا: (کەچی)یە.

(بکا) لە (ع)دا: (بکا بکا)یە.

(ئەڵبەت هەر) لە (ف، کم، ع، نم/١، گ/٢، س)دا: (ئەڵبەتتە)یە.

(ئەڵبەت هەر) لە (ما، گ/٣)دا: (سا ئەڵبەت)ە.

(دەکا) لە (ع)دا: (دکا کا)یە.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا دەنگی لە ستەمکاری خەلیفەکانی عوسمانی و پاشاکانی عەجەم داوە. کە نیشانەیە بۆ ئایەتی (٤/ی- المائدہ) کردووە کە (ومن لم يحكمُ بما أنزل الله فأولئك هُم الكافرون)ە و بەکافر و ناڕەواکار دانانی یارەکەی هێمایەکی ڕامیاریی فەرمانبەرە ڕاستەقینەکانی سەردەمەکەیەتی، ئەگەر نا ئەگەر مەبەست لە یارەکەی بی، ئەوە (بوختان) پێ کردنیەتی و ناڕەوایە.

(کوشتن) = بێ گیان کردن = مراندن: وشەیەکە زۆر جار لە هەڵبەستەکانی (کوردی) و هۆنەرانی هاوچەرخیدا بەزۆری هاتووە، یەکێکی وەک مستەر (ریچ) کە لەو سەرێنییەدا و لەو

ناوچەیەشدا ژیاوە لە گەشتەکەیدا بۆ سولەیمانی مەترسیکردن لە تالان و لە کوشتن ڕادەگەیەنێ، ئەمە جگە لەوەی کە مێژووەکانی ئەو سەردەمەش دان بەکوشتنی زۆر دادەنێن کە بەهۆی فیتی عوسمانییەکان و مەمالیک یا پیلانی عەجەم و خۆ بەخۆی ناوخۆییمان خانەوادەی باباندا ڕووی داوە.

٧- بەندە: وشە، یا زاراوەیەکی خۆ بەکەم زانینی صۆفییانەیە، پێچەوانەی (وەصل)ێکی حەقیقی واتە (جنسی)یەوەیە مەبەس لە وەصلی (گیانی)ی ئاینی صۆفیگەرییە.

بێجا: بێ جێ، خراپ، ناشایستە.

هەڵسەنگاندنی ئەم تاکە هەڵبەستە: لە واتە و دەربڕینیدا وەستایی و ئاڵۆزیشی تیایە، کە (کوردی) خۆی لە یەک کەس پتر تیا دەربڕیوە.

(مامۆستا سەجادی) ئەم شێوەیەی بە(تیل نیگا = ئیلتیفات) داناوە کە (کوردی) لە کەسی سێیەم (غائیب)ەوە، بۆ کەسی دووەم (موخاطەب) تێ هەڵچووە کە بەپێی زانیاریی خۆشخوانی (البلاغە) ئەم جۆرە گوزارشتە جوانییەکی وێژەییە و ئەگەر وا نەبووایە دەبوو لە جێگەی (بۆچی تۆ) بیوتایە (بۆچی ئەو).

جگە لەمانەش ئەم تاکە واتای دوو سەری جیاوازی ئارەزووی (وەصل کردن) وە (نەکردنیشی) تیایە، لەگەڵ یەکلا نەکردنەوەی وەڵامەکە کە ئایا هی (کوردی)یە یان نە؟ کە ئەمانە هەموو وەستایین.

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (نم/١)دا شەشەمینە، چونکی تاکی سێیەمی تیا ناتەواوە. هەر ئەم تاکە لە (ما)دا نۆیەمینە چونکە لە پێشەوە وتم تاکێکی تری ئاوێتەی تێ کەوتووە و لە پێش ئەم تاکەی سەرەوەشدا تاکی حەوتەمی هەڵبەستێکی تری ئاوێتە بووە. هەروەها ئەم تاکەی سەرەوە لە (عن)دا دەیەمینە، چونکە وەک سێ تاکی لەم هەڵبەستە ئاوێتە بووبوو، ئەوا بەر لەم تاکەش دیسان تاکی حەوتەمی هەمان هەڵبەستی ئاوێتە بووە کە لەوێدا ئەمانە شی کراونەتەوە جگە لەم هەموو سەرچاوانەی ئەم پارچە هەڵبەستە؛ ئەم تاکەی سەرەوە، بەتەنیا سەرچاوەیەکی تریشی هەیە کە ئەویش پەڕاوی (خۆشخوانی-مامۆستا سەجادی)یە وەک لە پێشەوە دیاریم کرد.

بەڵام لە هەموو سەرچاوەکاندا، ئەم تاکە دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

(پێم دەڵێ) لە (ما)دا: (دڵ دەڵێ)یە.

(نییە) لە (ما)دا: (بکە)یە.

(نییە) لە (گ/٢، س)دا: (هەیە)یە.

(نییە) لە (گ/٣)دا: (مەکە)یە.

(بۆچی تۆ) لە (ع)دا: (تو بوچی)یە.

ئەم نیوباڵی دووەمی ئەم تاکە لە (ما)دا بەم جۆرەیە: «هر کەس منعت دکا صەد مرتبە بیجا دکا».

**یەکێتی بیر و بابەت لەم هەڵبەستەدا:**

بەتێکڕایی هەڵبەستی کۆنی ناوچەکە و بەتایبەتی لە هەڵبەستی هۆنەرانی کۆنی کورددا، زۆر کەم هەیە کە پارچە هەڵبەستێک لە بارەی بابەت یا باسێکی تایبەتەوە و لەسەر بیرێک بێ و تاکەکانی هەڵبەستەکە بەندیواری یەکتری بن، لەو بیر و بابەتەدا، بەتایبەتی کە ڕێبازی وێژەی کۆن بەری لە (ئاوێتەکردنی) لە چەند بابەتێک دوانی لە پارچە هەڵبەستێکدا نەگرتووە و، بەهەزارەها هەڵبەستیان هەن کە هەر تاکە لە بابەتێکی سەربەخۆیە و جیاوازە لە تاکەکانی تری پارچە هەڵبەستەکە.

بەڵام خۆشبەختانە گەلی کورد زۆر هۆنەری کۆن و توانای هەن کە لە هەڵبەستیاندا پەیڕەوی یەکێتیی بیر و بابەتیان کردبێ وەک مەولەوی و بێسارانی و حەمەئاغای دەربەندفەقەرە و خانای قوبادی و... هتد کە یەکێکی کەش لەوانە (کوردی)یە.

ئەوی ئەم هەڵبەستەی (کوردی) بخوێنێ، ئەوە دەگاتە ئەو بڕیارەی کەوا بەتێکڕایی (یەکێتیی بیر و بابەت)ی بەتایبەتی لە نیوەی یەکەمیدا هەیە و لەسەر (چاو) دواوە و ئەوی تریش لەوانە بوترێ کە بەندیواری ئەو چاو جوانەن کە کوردی لێی دواوە کەوا بابەتی (چاو) و بیری لە چاو دوانن کاریگەرییەکی دیاری لە ژیانی کوردیدا پیشان دەدا. کەوا لەم هەڵبەستەیدا بەجۆرەها ڕستە ئەو بیرەی دەربڕیوە، هەروەک لە بەشی ڕەخنەی ئەم هەڵبەستەشدا جیام کردەوە، کە سیغەی هەڵبەستەکە دوانە و پێشەوەی دواندنی ڕووبەڕوو (مخاطب) بەرامبەر بەچاو مەست و بەشی دووەم لەگەڵ (غائب) دواندنە لە بابەت ئەو چاو مەستەوە کە ئەم گرتنی ڕێگری یەکێتی بیر و بابەتی چاودێریکردنە لە هەڵبەستدا لە زۆر لە هەڵبەستەکانی تری (کوردی)دا ڕەچاو دەکرێ.

**پایەی ئەم هەڵبەستە لە کۆڕی هۆنەراندا:**

ئەم هەڵبەستەی (کوردی) ئەوەندە بەرز و کاریگەر و دڵبەرە، ئەگەر بەدیوان و هەڵبەستی هۆنەرانی سەرێنی و پاش (کوردی)دا بگەڕێین چ لە نالی و سالم و وەفایی و کێو کێوە هەتا دەگاتە عەلی کەمال و قانع و هۆنەرانی کلاسیکی چل و پەنجاکانیشمان و... هتد، کەوا بەدەیان لەو هۆنەرانە لەسەر هەمان کێش و (سەروا) و هەمان بیر و بەکارهێنانی هەمان وشەکانی هەڵبەستەکەی (کوردی)ش هەڵبەستیان داناوە. وەک بڵێی هەموو بەدوای ئەم هەڵبەستەی (کوردی)دا ڕۆیشتوون و بەداخەوە ئێرە جێگەی گێرانەوەی یەک لە دوای یەکیان نییە کە ئەگەر کۆ بکرێنەوە، بەتەنیا پەڕاوێکی مەزن پێک دەهێنن کە ئەم ڕواڵەتەش لە زۆر هەڵبەستی تردا دەبینرێ.

چونکی وەک نووسیم، یەکێتی بابەت و بیر و زنجیرەی تاکەکانی هەڵبەستەکە و بەندیوارییان بەیەکە وەسفێتی تاکەکانی ئای لە واتایاندا و ئای بەپێکەوە بەسترانیانەوە کە تەنیا لە چاو ئەدوێ کە ئەمانە هەڵبەستەکەیان وا لێ کردووە گەر بەدانسقە لە کۆنەکاندا هۆنەرێکی تر توانیبێتی ئاوا هەڵبەستێک بەم ساز و سۆز و سادەیی و دڵگیرییە پێشکەش بکات.

٦

**بەخ بەخ کە، چ مەوزوونە**

١- بەخ بەخ کە، چ مەوزوونە، نەخلی قەدی شمشاڵت
لایقییە هەیاسە و، پات پاوانە و و خرخاڵت

٢- لاگیرە و و، سەر پەرچەم، گوارە و، گوڵ و، گەردانە
چەند دڵگر و نەخشین فێس و گوڵی دەسماڵت

٣- زەردوویی و، گۆ و بازن، گوستیلکە و و بازی بەند
قوربان و بەلا گەردی، پەنجە و مەچەک و باڵت

٤- تەنیا کە لە خۆت دێ و بەس، لوولە و بەرەگۆ و ساجلەخ
کۆڵوانەیی سیمین و زێڕ بافتی قەبای ئاڵت

٥- ئەو دوگمە و، دۆلابە، قفڵێکی چ نایابە
بۆ گەنجی گوهەرسەنجی، زیوین و تەلای قاڵت

٦- ئەو مەمکە چ شیرینە، طیفلی دڵی بۆ ئەگری
داوی دڵە، دانەی داو، ئەگریجە و (خڕ)خاڵت

٧- صەد خۆزگە بەکرمەک بێ، جانا بەغەزێمت بم،
سەر بێ بەفیدای، ماڵیش، مل و ملوانکەی لاڵت

٨- بیمار و غولامی خۆت، کەبکێکە لە داوتدا
مەیدە بە رقیبی بەد، بیدە بەقەلووداڵت

٩- ڕاضیم دڵەکەت (کوردی) بەردێ بێ لە بەرمووڕا
بەدبەختییە بۆیێ وا؛ هەرزانە سەر و ماڵت

---

١- بەخ بەخ: بەه بەه-واتە چەند جوانە.
مەوزوون: سووش و باریک، ڕێکوپێک.
نەخل: دارخورما، مەبەست لە هەڵچوویی و ڕاستییەکەیەتی کە وەک باڵای یارەکەی.
شمشاڵ: مەبەست لە شێوە ڕاست و باریکییەکەیەتی کە وەک بەژن و باڵای خۆشەویستەکەیەتی، ناوی جۆرە سپیدارێکە پێی دەڵێن (شمشاد) واتە شمشاڵ، ئەویش وەک

بالاَیەکەی ڕاستە.
پاوانە: خشڵێکە لە زێڕ ڕیزە موورو و، یا بێجادە، یا زەنگیانەی هۆنراوەیە، ئافرەت وەک خشڵ دەیکاتە قولەپێی...
خرخاڵ: جۆرە خشڵێکە، لە زێڕ یا زیو، کە ئافرەت دەیکاتە قولەپێی. کە جۆرە پاوانەیەکی زێڕینی پلپلەدارە.
سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستە (٩) کەشکۆڵی دەسنووسن و (٢)ی چاپکراو کە ئەوانیش بەرامبەر بەخاوەنی ئەم هەڵبەستە لەسەر سێ ڕان کە:
یەکەمیان: ئەم هەڵبەستەیان بە هی (کوردی) داناوە کە ئەوانیش (مس، عن، ن، گل/١، گل/٩، گ/٣)ن و لەمانەدا (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە و، منیش بە هی (کوردی)ی دەزانم و مۆرکی ئەوی پێوەیە.
دووەمیان: تاکی (١، ٨)ی هەڵبەستەکەیان بە هی (بیمار) داناوە ئەوانیش (گل/١٠، نم/١، نن) وە (گۆڤاری ئاسۆی زانکۆیی ژمارە/٢ساڵی ١٩٨٠)یە کە مامۆستا جەمال محەمەد محەمەدئەمین لە (گەلاڵەی)یەوە وەری گرتووە و بەپێی لێکۆڵینەوەی مامۆستا (جەمال)یش، ئەم (بیمار)ە (سالم) نییە کەوا لە سەردەمێکدا نازناوی (بیمار) بووە، بەشکو (میرزا مووسا) ناوێکی زەردیاوایی (قەرەداغی)ی نووسەری (ئیبراهیم پاشای بابان) بووە و (١٤٠) ساڵ ژیاوە.
سێیەمیان: تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەی ئاوێتەی (٩) تاکی تر کردووە و بە هی (سالم)ی داناوە و ئەویش (س/٢)ە.
تاکەکانی تری ئەم دوو بەشەی دواییان هی دوو پارچە هەڵبەستی ژمارە (٩ و ١٠)ی (کوردی)ن کە بەهەڵە ئاوێتەی یەکتری بوون و بە هی (کوردی) دانەنراون، وەک لە شوێنی خۆیاندا ساخم کردوونەتەوە.
ئەم تاکە یەکەمەی سەرەوە لە (گل/١٠، ن، نم/١ و ئاسۆی زانکۆیی)دا سێیەمین و لە (س/٢)دا پێنجەمینە و لە (گ/٣)دا دوانزەیەمین تاکە.
(بەخ بەخ) لە (نم/١)دا: (نەخ نەخ). بێ گومان ئەمە هەڵەی دەسنووسە.
دڵبەر (ئاسۆی زانکۆیی): شیرین.
لە جێگەی نیو باڵی دووەم ئەم سەرچاوانە بەم جۆرەیان نووسیوە:
(گل/١٠، ئاسۆی زانکۆیی): سەیریکە چ شیرینە فێس و گوڵی دەسماڵت.
(نم/١، گ/٣، س/٢): سەیریکە چ شیرینە پاوانە و خرخاڵت.
(عن): چەند دڵگر و نەخشینە پاوانە و خرخاڵت.
فێس: کڵاوێکی ئافرەتانە بووە کە بەجۆرە کڵاوێکی پیاوانەی سەرێنی عوسمانی وتراوە (فێس)، لێرەدا مەبەست لەم جۆرە پیاوانەییە نییە.

هەیاسە: جۆرە کەمەربەندێکی (بەزۆری) لە زیو دروستکراو بووە، سامانداره‌کانیش هی لە ئاڵتوون دروستکراویان هەبووە کە لە ناوەڕاستەکەیدا لە پێشە بەنیوە گۆیەک (قوببە) ئەوەندەی قولەمستێ گەورەتر بووە و پلپلەداریش بوو، ئەم (نیو گۆ)یە جیاواز بوو لە نێوان هەیاسە و (کەمەرە)دا کە (کەمەرە) ئەو نیو گۆیەی پێوە نەبوو کە هەردووکیان لە جێگەی پشتێنی ئافرەت بوون.

٢- لاگییرە: خشڵێکی زێڕی ژنانەیە وەک کرمەک، بەڵام پلپلەدار و دەشکرێ بەسەرپێچەوە.

سەرپەرچەم: خشڵێکی زێڕ یا زیوە کە ئافرەت بەپێشەوەی سەرپێچەوەی دەکرد.

گوارە: خشڵێکە لە زێڕ یا زیو کە ئافرەت دەیکاتە گوێی و جۆرەهای هەیە.

گوڵ: نقیمێکە لە بەردی بەنرخ وەک پیرۆزە و شیلان و هتد کە لە زێڕ یا زیو دەگیرێ و پلپلەداریش هەن. وە دەکرێ بەداوێنی ملوانکەی ئافرەتەوە یا دەکرێ بەسەریشەوە.

گەردانە: ملوانکەیەکی زێڕە، ئافرەت دەیکاتە گەردنی، بەڵام کورتە و لە گەردنەوە نزیکە.

فێس: کڵاوی ئافرەتە، لە لبادێکی تەنکی ڕەشی جگەری و دیوی دەرەوەی خەیاتەی خومیی پیا دەگیرێ و دراوە سەری تێ دەگیرێ بەسەر تەپڵەکەیەوە.

دەسماڵ: کۆڵوانەیەکی سێ سووچە ئافرەت ئەیدا بەشانیا کە ناوەندەکەی قولاپە یا قوڵفە بەفێستەکەوە بەند دەکرێ و ئەملا و ئەولایەکەی لە (مل)دا دەگرێ دەدرێ و سووچی خوارەوەی شۆڕ دەبێتەوە بەپشتی ئافرەتدا. ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نم/١، نن، گ/٣، س/٢ و ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٣- زەردوویی: جۆرە بەردێکی بەنرخە، ڕەنگی زەردە، لە خشڵی ژنان و بازنگ و تەزبیحی لێ دەکرێ بۆ مل. وە (کارەبا)شی پێ دەڵێن. یا (کەهرەب). واتە (کافرێن) چونکە ئەگەر لە شتێ بسووڕێ، ئیتر وردە پووش و کا بۆ خۆی دەکێشێ.

گۆ: خشڵێکی زێڕینە لە شێوەی مووروودا دەکرێ و ئافرەت دەیکاتە مەچەکی.

بازن یا (بازنگ): خشڵێکی زێڕین یا زیوینە لە شێوەی تووڵی باریکدا یا بەپانی، کە ئافرەت دەیکاتە مەچەکییەوە.

گوستیلکە: ئەموستیلە، کلکەوانە، گوستیلک، ئەموستەوانە.

بازی بەند: کیفێکی چەرمینی ئاوزوونەدارە (نوشتە)ی تێ دەخرێ و لە قۆڵ ئەبەسترێ، (بازی بەنگ)یشی پێ ئەوترێ.

بەلا گەرد: لە دەور گەڕاو، بەقوربان بوون.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

**هەڵسەنگاندن:**

لەم تاکەدا (لەف و نەشر)ی (مشوەش) هەیە. هەڵبەستەکەش بەتێکڕایی (دەگمەن و دانسقە)یە

کە پۆشاک و خشڵی ئافرەتانەی بەجوانی و لەسەر کێشێکی سووکەڵە و سوار، گرد کراونەتەوە و مایەی پاراستنی ناوەکانیانە و کەلەپوورگەیەکی کوردانەیە. کە هەستە نیشتمانپەروەرییەکەی کوردی لەم هەڵبەستەیدا بۆی پاراستووین. بەتایبەتی کە ئێستە باوی زۆریان نەماون و خۆشیان ئەگەر تاکە تاکە مابن، لە لەناوچوونن.

٤- لوولە: جۆرە ملوانکەیەکە لە زێڕ یا لە زیو، جێ جێ لوولەی ئەوەندەی پەنجەیەک ئەستوور و درێژ و سەر و بن گیراوی پلپلەداری پێوەیە کە نوشتەیان تێ دەخرێن و ئافرەت ڕاست و چەپ لە ملی دەکا.

بەرەگۆ: خشڵێکی زێڕینە وەک (گۆ)ی دەستبەند وایە بەڵام درێژترە و ناوەندەکەی گۆڵی پلپلەداری لەسەرە و ئافرەت دەیکاتە ملی و هەتا ناوەندی سنگی شۆڕ دەبێتەوە.

ساجلەخ: جۆرە قۆزاخەیەکی پلپلە و زەنگوڵەی بچووک و ڕیشووداره لە زێڕ یا زیو، کە ئافرەت بەکۆتایی هەر پرچێکییەوە بەندی دەکا.

کۆڵوانە: پارچە قوماشێکی چوارگۆشەی ڕیشوو گوڵنگەدارە یا (چەتفە) یا (مشکی)ی ڕیشوودار و گوڵنگەدار دەدرێ بەپشتی ئافرەت لەسەر بەرگەوە، دوو چمکی لە پێش چەناگەیەوە گرێ دەدا و بەپشتیدا شۆڕ دەبێتەوە.

سیمین: زیویی واتە تووڵ تووڵی یا داوی زیویی یا زێڕیی تیایە.

زێڕ بافت: تووڵی سیمدار. کە داو (تاو)ی زێڕی یا زیویی تیا بێ.

قەبا: کەوا.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.

٥- دوگمە و دۆڵاب: قولاپەیەکی قوڵفە و پلپلە و گۆ تێخراوی زێڕین یا زیوینە کە داوێنی سوخمەی پێ دێتەوە یەک و، قوتیی مەمک دیاریتر دەکا، بۆیە بەقفڵی نایابی ناو بردووە.

گوهەرسەنج: گەوهەر تێکێشراو، گەوهەرین.

تەڵای قاڵ: ئاڵتوونی تێزاب، ئاڵتوونی پاڵاوتەی عەیار/٢٤، لە جاران هەبوو ئێستا نەماوە و عەیارەی کەمتر هەیە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.

٦- شیرین: تام شیرین، شیردار، شیر تێزاو، جوان، دڵگیر.

طیفل: مناڵ، ساوا، کۆرپە.

دانەی داو: ئەو دانەوێڵەیەی کە لە نێوان (داو)دا ڕۆ دەکرێ بۆ بەکێشکردنی (مەل) کە چینەی تیا بکەن و بەداوەکەوە ببن مەبەستی لە دانە خاڵە جوانەکانییەتی کە لە نێوان تاو تاوی زولفەکەیدا بۆ بەکێشکردنی دڵ.

خرِخاڵت: لە تاکی یەکەمدا (خرِخاڵت) مەبەست لە جۆرە پاوانەیەکە و یەک وشە بوو، لێرەدا مەبەست لە (خرِ = گشت) وە (خاڵت = خاڵەکانت)ە کە دوو وشەیە و ئەمیش وەستاییەکی زمانی و جوانییەکی وێژەییە.

ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (عن)دا دوا تاکە؛ چونکە لەم سەرچاوەیەدا تەنیا یەک چوار باڵی (چوار خشتەکی)ی لەم هەڵبەستە نووسیوە.

ئەم تاکە هێشتە ژێر چاپ نەکەوتووە.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم تاکە دەربرِینێکی وێژەییی جوان و بیرێکی ناسک و نیو باڵی دووەمیشی (لەف و نەشر)ی (مورەتتەب)ی تیایە. کە مەمکەکەی شوێن داو نانەوە و دڵیش (مەل) و ئەگریجە (داو)ە و خاڵیش دانەی ناو داوەکەیە وە یا گۆی مەمک (دانە)ی ناو داوەکەیە کە ئەگریجەی بەسەردا شۆرِ و پەخشە.

٧- کرمەک: جۆرە خشڵێکە لە زێرِ دروست دەکرێ، ئافرەت دەیگرێ بەژێر چەنەیدا و لەملا و لەولاوە بەلاجانگی فێستەوە بەند ئەکرێ.

غەزێم: خشڵێ کە لە زێرِ، ئافرەت دەیکاتە پەرەی لای لووتییەوە کە لە مناڵییەوە بۆی دەسمرێ و جۆرەهای هەیە.

لاڵ: لەعل، جۆرە بەردێکی بەنرخی سوور و (پیرۆز)ە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و هێشتەش بەر چاپ نەکەوتووە.

**کێشی ئەم تاکە:** لە دەربرِینی نیو باڵی دووەمیدا گیرییەک هەیە، ئەگەر بەشێوەیەکی تایبەتی دەرنەبدرێ، لەنگ دەنوێنێ. لەوانەیە دەستاودەست و دەماودەم گۆرِیبێتی، چونکە (کوردی) زۆر ورد و وەستای کێشی هەڵبەست بووە.

٨- کەبک: کەو.

ئەم تاکە لە (عن، گ/٣، س/٢)دا نییە وە لە (گل/١٠، نن، نم/١ و ئاسۆی زانکۆیی)دا شەشەمین تاکە و لەوانەیە لەبەر هاتنی وشەی (بیمار)ی ئەم هەڵبەستە کە بە هی (بیمار) دانراوە بەتایبەتی لەو چەند سەرچاوەیەدا کە بەناتەواوی دەسیان کەوتووە و، دوا تاکی کە نازناوی (کوردی)ی تیایە دەستیان نەکەوتووە، بۆیە کردوویانەتە هی (بیمار) کە وشەیە نەک نازناو.

(کەبکێکە لە داوتدا) لە (گل/١٠، نم/١، نن)دا: (لطفت لێ قبوڵ ناکا)یە.

(کەبکێکە لە داوتدا) لە (ئاسۆی زانکۆیی)دا: (لوتفت بێ قبووڵی کە)یە.

وە لە جێگەی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لەم سەرچاوانەدا بەم جۆرە نووسراوە:

(نن، گل/١٠): (بو رسم عبودیت سا بکرە کوی تاڵت)ە.

(نم/١): (بو رەسمی عبودیت سا بکرە کوی خاڵت)ه.

(ئاسۆی زانکۆیی): (بۆ رەسمی عبودیت سا پەیکەرە گۆی ناڵت)ه.

سەیریش ئەوەیە کە مامۆستا (جەمال) وشەی (گۆ)ی بەبزماری سەر خڕی بنەپێلاو لێک داوەتەوە کە ببێتە هۆی نەخلیسکاندن...

٩- بەرموور: ملوانکەیەکی درێژە، ئافرەتی کورد جۆرەها بەردی بەنرخی ڕێکوپێکی تیا دەهۆنێتەوە وەک بەردی سەر دەستار و بن دەستار، دۆشاو و ڕۆن، چەور و شیرینی، ترش و شیرینی، پەشم، دڵ، کارەبا، شەوە، شیلان... و هتد کە هەریەکەی بۆ ئامانجێک بەکەڵکە و ڕاست و چەپ دەکرێتە مل.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١٠، نن، نم/١، گ/٣، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە، هێشتە ژێر چاپیش نەکەوتووە.

**تێبینی لەسەر ئەم پارچە هەڵبەستە:**

لە چاو پیا خشاندنێکی لێکۆڵینەوەی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە و پچڕ پچڕی و جیاوازیی سەرچاوەکانیدا؛ ئاشکرا دەبێ کە شێواوی و گۆڕان و ئاوێتەبوونێکی زۆر لە تاکەکانی ئەم هەڵبەستەدا ڕووی داوە کەوا تێکەڵ بەچەند پارچە شیعرێک و هەریەکەی بەناوی هۆنەرێکەوە نووسراوە، دەبێ لاوازییەکەشی لەوەوە بێ لە ڕووی کێش و کووڕییەوە.

٧

### موشتاقە دڵم...

نامەی (کوردی) بۆ (سالم):

١- موشتاقە دڵم، لەو دەمەوە چۆڵە مەقامت
بۆ بیستنی ئەشعاری پڕ و خۆشی کەلامت

٢- دڵ تابی غەمی هیجری نەماوە بەسە ئیتر
تازەی بکەوە عوشرەتەکەی ساڵ و عەیامت

٣- تا (شیوەکەڵ)ت مەسکەنە شێواوە کەڵی ژین
ئارێ کە گومە لێم خەبەر و پەیک و پەیامت

٤- ئەی جیلوەیی خاشاکی...
شەوگاری......

٥- خۆت چاکی دەزانی...
کەی شەرتی وەفا و دۆستییە......

٦- پیکاوتە دڵ و شیفتەیی...
چاوم لە دەری مەقدەمی......

٧- مەحرومی سەری (لوطف)ی ئە (بیمار)ییە (کوردی)
بۆیێ کەسەری (سالم)ە لە هیجرانی بەسامت

..........

١- مەقام: جێگە، شوێن، بەواتای تەنگی ئاهەنگداریش دێ کە وەک بیستوومە (سالم) زۆر جوان و وەستایانە، هەڵبەستی خوێندووەتەوە ئەم هەڵبەستە تەنیا یەک سەرچاوەی هەیە و ئەویش (عن) و هێشتە چاپیش نەکراوە، هەرچەند بەداخەوە تەنیا چوار تاکی بەتەواوی ماوە و سێ تاکی (لەبەر پەڕپووتی) پچڕ پچڕێکی سەرەتاکانیان دەستکەوتووە.

هەروەها لە پەراوێز، بە(فارسی) ئەم نووسینەی خوارەوە لەو سەرچاوەیەدا لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسراوە (نامَەءِ کُردِي دَرْ سلُيمانِيَهْ بَراي سالْم بَشْيوَةكَلْ فْرسْتادَهْ غَفَّرِ اللّهُ لَهُاركَهْ دَرْ پايان جَوابَشُ بَنَظَرْ مْيرَسَدْ) واتە: (ئەم هەڵبەستە نامەی (کوردی)یە کە لە سلەیمانییەوە بۆ (سالم)ی ناردووە لە (شیوەکەڵ) خوا لێیان خۆش بێ و لە دوایشییەوە وەڵامەکەی دەبینرێ).

کە ئەو وەڵامە لە کۆتاییی ئەم پارچە هەڵبەستەدا، پێشکەش دەکەم کە ئەویش هێشتە چاپ نەکراوە.

بەوەدا کـە نووسـەری کـەشکۆڵی (عن) نووسـیویە: (خـوا لێیـان خـۆش بێ) کـەواتە کـاتی نووسینەکە (١٢٩٦-١٣١٣ک = ١٨٧٥-١٨٩٥ز)ە. (سالم)یش و (کوردی)یش لە ژیاندا نەبوون. ئەمەش گرنگییەکی زۆری هەیە لە ژیانی ئەو دوو شاعیرە ئامۆزای یەکدییەماندا.

٢- عوشرەت: ڕابواردن و پێکەوە ژیان.

٣- شـیـوەکـەڵ: ئێـسـتـە گـوندێکە لـە شـارباژێڕی سـەر بەسـولەیمانـی و لەسـەرێنی (کـوردی)دا، بنکەیەکی فەرمانڕەواییی مەزن و فرە ئاوەدانتری بابانەکان بووە.

پەیک و پەیام: پەیام = نامە و، (پەیک) بەواتە (فـرسـتـادە)یـە و مـەبەسـتی لـە (نامـەهـێن) و (نامەبەر)ە.

(شێواوا، کەڵی ژین) لە سەرچاوەکەدا لەسەر ئەمە نووسراوە: (نوسخە) و ئەمەی دوایی تر (نوسخە) (شێواوە حەیاتم) نووسراوە کە شێواوە کەڵی ژین و وێژەییانەیە. بەرامبەر بەبوونی (شیوەکەڵ) و جیناس ئارایییە.

(ئارێ) لە پاڵ ئەمیشدا نووسراوە: (نوسخە: مخصوص) واتە لە نوسخەیەکی تردا لە جێگەی (ئارێ) وشەی (مخصوص) نووسراوە.

واتە: لەبەر شێواویی واتە، تێکچوونی کەڵی (واتە پایەی پردی) ژین دەنگوباس و نامەی تۆم لێ گومە (بۆم نایەت) کە لەبەر ئەوەیە کەڵی (کەڵە پردی) ژینم و یا ئەو پردی نێوان (سلەیمانی) و (شیوەکەڵ)ە تێک چووە و ڕێگەی نێوانمان بۆ هاتوچۆ براوە.

٤- ئەم تاکە یەکەمین تاکێکی هەڵبەستەکەیە کە لەبەر پەرپووتی، لەوەندەی سەرەوە، پتری نەماوە و بەشکو ڕۆژێ بێ، بەپێی سەرچاوەی تر پڕ بکرێتەوە.

٥- ئەم تاکـەش دووەمین تاکی ئەم هـەڵبـەسـتـەیە کـە لەوەندەیم پـتـر دەست نـەکـەوت بەو هیـوایە هەمووی بدۆزرێتەوە.

٦- ئەم تاکـە سێـیـەمین تاکی نیـوە لەناوچووی ئەم هـەڵبـەسـتـەیە بـەئاواتەوەم کە نـاتەواوییـەکـەی بدۆزرێتەوە.

ئەوی شـایانی باسـە لە دوای ئەم تـاکـەوە، ئەو لاپـەڕەی سـەرچاوەی ئەم هـەڵبـەسـتـەی لێ وەرگیراوە، پێم وایە شوێنی ئەوەندەی بەلای کەمەوە (٤) تاکە هەڵبەستی تری نەماوە بەم پێیە دەبێ هەڵبەستەکە (١١) تاک بووبێ هەروەک دوا تـاکی ئەم هەڵبەستە بەر پەڕەی بەرامبەری کەوتووە، هەروەها وەڵامەکەی (سالم)یش (١١) تاکە. بۆیە بەپێی دەستووری ئەدەبی کۆن دەبێ ئەوەکەی (کوردی)یش (١١) تاک بووبێ.

٧- بیمار: نەخۆش و لە هەمان کاتدا نازناوێکی (سالم)یشە.

لێرەدا لە سـەرچاوەی (عن)دا ئەم پەراوێزە لە کەنارەوە بەفارسی نووسراوە: (مقصود ارسر

لطف حرف (ل) است و این یکی از حروفات اسم سالم است که کردی خودش محروم از آن حرف (ل) اعتبار کرده، لذا سرش بسام نه بسالم بیان فرموده). واته (مەبەس لەسەری وشەی (لوطف) پیتی (ل)ە کە ئەمیش یەکێکە لە پیتەکانی ناوی (سالم) کە (کوردی) خۆی لەو پیتی (ل) بێ بەش داناوە، بۆیە سەری خۆی بە(سام) نەک بە(سالم) ناو بردووە). واتە (سالم)ی بێ لام (ل) کە (ل) بچێتە ناو (سام)ەوە دەبێتە (سالم).

ئەم جۆرە یاری بەپیتکردنەش لە وێژەی کۆندا باو بووە و (موعەمما) و (لەغز)ی پێ وتراوە و، تا ئێرە کۆتاییی هەڵبەستەکەی (کوردی) دێ و، ئەمیش وەڵامە هەڵبەستەکەی (سالم)ە کە لە (شـــیــوەکــەڵ)ەوە ناردوویەتەوە بۆ (کــوردی) لە (سلەیمانی) و ئەویش لە چوار ســـەرچاوەی دەسنووس وەرگیراوە کە (عن)، (ص)، (ن)، (عق)ن کە ئەمە هەڵبەستەکەیە:

(ئە) لە نیو باڵی یەکەمدا بەواتە (هی) یا (ئی) وەک (ئەپاڵ)، (ئەبەر)، مەبەستی لە (لوطفی بیماری) کوردی کە (بیمار)یش نازناوێکی (سالم) بووە.

## وەڵامی (سالم) بۆ (کوردی)

١- ئەی طاسی بەدەن پوڕ فەرەحی لەذذەتی نامت
وەی داغی دڵی خەستە نمەک سوودی کەلامت
٢- ئەی سونبولی زوڵفت هەمە دەم عەطری مەشامم
وەی زێوەری سەر چەشمەیی چەم قەددی نەمامت
٣- ئەی گەردنی جانم بەئەبەد حەبسی کەمەندت
وەی مورغی دڵی شێفتە پەڕبەستەی دامت
٤- ئەی جان بەفیدای نوکتەی شیرینی دەهانت
وەی سەر بەنەثاری قەدەمی پەیک و پەیامت
٥- قاصید لە طەرەف تۆوە سەلامێکی کە هێنا
قوربانی وەفای دەمبەدەم و جەوری مودامت
٦- قاصید نییە ئەم پەیکە مەگەر خضری نەجاتە
بەخشیی بەمنی موردە حەیاتێ بەسەلامت
٧- ئارێ کە دڵ ئاوێنەی دڵ بێ چ عەجائیب
قەستەم بەسەرت شێفتەترە بۆت کوڕی مامت
٨- تۆ نیتە مەگەر ئارەزوویی دیدەنی مەهجوور؟؟
سا دەی وەرە ئەی مەردمەکی دیدە مەقامت
٩- تا سەجدە بەرن، کەبکی دەری بو بەری پێی تۆ
سا هەستە، بکەن خۆش ڕەوشان مەشقی خەرامت
١٠- کوشتت، کە هەموو مونتەظیری شۆڕشی حەشرن
قەد دەرخە هوەیدا کە قیامەت بەقیامت
١١- تأثیری عەشق، یانە لە ئەوصافە فلانی
(سالم) کە تکا شەهدی چەکیدەی، لە کەلامت

لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکەی (سالم)

بەپێی ژمارەی تاکەکانی

١- ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا (یەکەمین)ە.
٢- ئەم تاکە لە (ص)دا سێیەمینە و لەگەڵ ئەوی دواییدا پاش و پێشە.
٣- ئەم تاکە لە (ص)دا دووەمینە و لەگەڵ ئەوی پێشوودا پاش و پێشە.
٤- ئەم تاکە لە (ن)دا نییە.
و، لە جێی (پەیک و) لە (عق)دا: (پیک) نووسراوە، لە ڕێنووسی کۆنە.
٥- ئەم تاکە لە (ن)دا چوارەمینە.
وە لە جێی (گەیاندم) لە (ص)دا: (کەهینا) نووسراوە.
٦- ئەم تاکە لە (ص، ن)دا نییە.
٧- ئەم تاکە لە (ص، ن)دا نییە.
٨- ئەم تاکە لە (ن)دا پێنجەمینە و لە (ص)دا شەشەمینە.
٩- ئەم تاکە لە (ن)دا شەشەمینە و لە (ص)دا حەوتەمینە.
١٠- ئەم تاکە لە (ن)دا حەوتەمینە و لە (ص)دا هەشتەمینە.
١١- ئەم تاکە لە (ن)دا هەشتەمینە و لە (ص)دا نۆیەمینە و لە هەر چوار سەرچاوەکەشدا دوا تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
بەڵام نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (عن)دا بەم جۆرەیە:
(تأثیرِ لڤشقّتە و یا وصفِ فلاني).

٨

## تەسخیری دڵی کردم

١– تەسخیری دڵی کردم، حەملەی صەفی موژگانت
هۆش و، خێرەدی بردم، لەعلی لەبی خەندانت
٢– ڕۆیی دڵی مەحزوونم، داخم ئەوە نەمزانی
دوو (چاو)ی ڕەشت بردی، یا (زولفی) پەرێشانت؟
٦–[٥٧] بۆچم دەوێ[٥٨] ئەم قەلبە[٥٩]؟ بۆ نەیکەمە[٦٠] خاکی ڕێت؟
ڕۆحم[٦١] بەچ مەصرەف[٦٢] دێ؟ گەر نەیکەمە قوربانت[٦٣]؟
٤– پەنجەت لە حەنا مەگرە، سوورێکی تەڵخ ڕەنگە
خوێنی دڵی من ئاڵە بیکە خەنەبەندانت
٥– وەک دوڕڕ و عەقیق نەخشە، دندان و لەبی ئاڵت
هەر وەک (بەڕەزا) پەخشە، ئەگریجە لەسەر شانت
٦– تەوقی ملی شیرینی، پاوانە و خڕخاڵە
نارنجی زولەیخایە گۆ و چاهی زەنەخدانت
٧– جان، (پیر)ی کە هەر تۆیە، تەن (پیریی) لە دەست تۆیە
دڵ برسیی دوو گۆیە، تێریکە لە پوستانت
٨– لەب تشنەیی بۆسێکە، لەو دامەنی پاکی تۆ
مانیع مەبە لەم خێرە، دەستی من و دامانت
٩– ئیعجازی جەماڵی ڕووت یەک پەڕتەوی لێ دەرکەوت،
تەن چوو، بەمەرەی طوور و بەو پرتەوە سووتانت
١٠– ئەو ڕۆژە قەدی تۆم دیی، ناچاریی خەمیدەت بووم
سەجدە بەیەقین فەرضە بۆ سەرووی خەرامانت
١١– ڕەنگینە بەگوڵ دونیا، وەک خوێنی شەهیدانت
(کوردی)یش؛ بکە قوربانی، (بەم جەژنە) لە زیندانت

.............................................................

١– تەسخیر: (بەیدەس) و مەبەس لە (کردنە کۆیلە) و (بارکێشی)یە لە کاریگەریی ڕیزە برژانگە دڵگیرەکانی خۆشەویستەکەیەوە.

حەملە: هێرش.

صەف: ڕیز.

موژگ: برژانگ، موژولە.

هۆش: هەست و سۆزی دڵ (عاطیفە).

خیرەد: ژیری و تێگەیشتنی (عاقڵی) و (زانیارانە).

لەعل: ئەگەرچی لە هەڵبەستی (شەشەم) تاکی (حەوتەم)یشدا چەردەیەکم لەسەر (لەعل) نووسیوە، بەڵام چونکە ئەم ناوە گەلێ جار لە هەڵبەستی (کوردی)دا هاتووە، وەک کەلەپوورێکی کوردی لێ هاتووە، بۆیە لێرەدا کەمێ بەدرێژیتر لەسەر (لەعل) ئەنووسم.

(لەعل) وشەیەکی کوردییە و (فارسی)یش بەکاری هێناوە و دەهێنێ، لە کوردیدا (یاقووت) و (ئاقیق) و (یاقیق) و (لال)یشی پێ وتراوە کە ئەمیان سووککراوەی ناوە (لەعل)ەکەیانە.

(لەعل) یەکێکە لە بەردە بەنرخ (گەوهەر)ەکان، لە ڕەنگدا (زەرد) و (شین)ی هەیە و لە هەرە پەسندتر و گرانتریان ڕەنگ (سوور)ە (گوڵی)یەکەیەتی کە (لەعلی بەدەخشان)ی پێ وتراوە.

سەرچاوەی ئەم گەوهەرە گوێی دەریاکانی (هندستان) و (بورما) و (سەیلان) و (ئوستراليا) و... هتد. کە تیایاندا دروست دەبێ شارەزایانیان دەری دەهێنن و ڕێکی دەخەن بەپێی پێویست و گونجان.

ڕەنگی ئەم گەوهەرە هەرگیز تەڵخ نابێ و نقێم و مووررووی جۆراوجۆری بۆ (خشڵ) لێ دروست دەکرێ و لە پیشەسازیی وردکاریشدا، وەک بەرد (جویڵس = گەوهەر)ی کاژمێر (سەعات)ە چاکەکانیشی لێ دروست دەکرێ.

لەب = لێو، خەندان = بەزەردەخەنە.

ئەمجا با بێمەوە سەر ئەم تاکە هەڵبەستە و خودی هەڵبەستەکەش.

سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستەم لە لا بوون بە(٥) بەشەوە:

**بەشی یەکەمیان:**

ئەم بەشە بریتییە لە سەرچاوەکانی: (عن، ن، گل/١، گل/٩، گ/٣) کە لە هەموویاندا ئەم پارچە هەڵبەستەیان بە هی (کوردی) تیا نووسراون.

منیش بەپێی ئاشنایەتیم بەهەڵبەستی (کوردی) لەگەڵ ئەم بەشەدام، چونکە سۆز و مۆرک و شێوەی هەڵبەستی (کوردی)ی تیا هەست دەکەم لەبەر ئەوە سەرچاوەی (عن)م کردە، بنکە و دەسکەلای ئەم هەڵبەستە.

**بەشی دووەمیان:**

سەرچاوەکانی: (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی) کە مامۆستا جەمال محەمەدئەمین لە

ژماره/٢ی ساڵی/١٩٨٠ی ئەم گۆڤارەدا نووسیویە کە ئەویش لە کەشکۆڵێکی دەسنووسی مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵەییەوە وەری گرتووە ئەمانە تاکی (٤ و ٥ و ٦)ی ئەم هەڵبەستەیان ئاوێتەی هەڵبەستێکی تری شەش تاکی کردووە و بەناوی (بیمار)ەوەیە کە ئەوە بوو لە سەرەتای هەڵبەستی ژمارە (٦) = (بەخ بەخ کە، چ مەوزوونە) لەو (بیمار) دواوم کە من لەم هەڵبەستەدا ساغم کردووەتەوە ئەو تاکە هەڵبەستانە هی (کوردی)ن و بەس.

**بەشی سێیەمیان:**

لە سەرچاوەکانی ئەم بەشەدا کە: (س/٢)ە تاکەکانی (٣ و ٤ و ٥ و ٦ و ٨)ی ئەم هەڵبەستەی ئاوێتەی هەڵبەستێکی تری ٩ تاکی کردووە، بەناوی (سالم)ەوە. کە دیسان من لەگەڵ ئەم بەشەشدا نیم، وەک لە شیکردنەوەی ئەم هەڵبەستەدا جێگیرم کردووە.

**بەشی چوارەمیان:**

سەرچاوەی ئەم بەشە هەر تەنیا (نع)ە کە تاکی پێنجەمینی ئەم هەڵبەستەی (کوردی) لە نێوان تاکەکانی هەڵبەستێکی (نالی)دا بەناوی (نالی)یەوە لە لاپەڕە (٧١٧)ی دیوانی (نالی) چاپی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕانیدا بەهەڵە چاپ کراوە کە ئاشکرایە مۆرکی (نالی) و (کوردی) یەکجار لە یەکتری جیاوازن و ئەو تاکەیش بەپێی مۆرک بەلای (کوردی)دا دەشکێتەوە و بۆیە من لەسەر (کوردێتی)ی ئەو تاکە سوورم...

**بەشی پێنجەمیان:**

ئەندامانی لیژنەی (دەستەی کورد)ی (کۆڕی زانیاری عیراق)ە کە لە سەرەتای هەشتاکانی چەرخی (بیستەم)دا ئەو دەستەیە بەنیازی ئەوەی ئەم پەڕاوییەم لێ داگیر بکەن، بێ ئاگا و خواستی خۆم کردبوومیانە یەکێ لە ئەندامانی لیژنەی ناوبراو کە ئەو لیژنەیە بەبێ بەڵگە و (کوێرانە) بڕیاری ئەوەی دا کە ئەم هەڵبەستە هی (کوردی) نییە چونکە لە هەندێ شوێنیدا لاوازی و کەموکووڕیی هەیە. منیش بەر لەوەی ببم بەو ئەندامە بە دە ساڵ پتر ئەم پەڕاوییەم تەواو کردبوو وە لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا کە ئەو سایە بەڕێز (مامۆستا جەمال عەبدولقادر بابان) بەڕێوەبەری گشتیی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کوردی و بەرپرسیار و سەرنووسەری ڕۆژنامەی ناوبراو بوو. بەو نیازەی کە (مامۆستا بابان) ئەم پەڕاوییەم بۆ چاپ بکا، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە زڕە کوردێک خرایە شوێنی (مامۆستا بابان) ئەو هەلی چاپکردنەم بۆ نەڕەخسا و لە چارەڕەشی و کڵۆڵیی خودی (کوردی)یەوە، ئەم پەڕاوییە کەوتە دەریای چنۆکیی هەندێ لە ئەندامەکانی ئەو لیژنەیەوە.

ئەو بەڵگەیەشم لە دوا تاکە هەڵبەستی یازدەیەمی ئەم پارچە هەڵبەستەوە، دەرهێناوە کە بەدرێژی بەڵگەکەم بەشیکردنەوەی ئەو تاکی یازدەیەمەوە نووسیوە...

لەم پێنج بەشە لە یەکتر جیاوازیی سەرچاوەکانی سەر ئەم هەڵبەستەدا وەک دەرکەوت، تەنیا ئەوانی بەشی یەکەمیان ڕاستن کە من لەم بەشەیانم بۆ ئەوەی کە ئەم هەڵبەستە هی سەردەمێکی زووی (کوردی)یە.

٢- ئەم تاکە لە (گل/١٠، نم/١، س/٢، نع، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (گ/٣)دا هەشتەمینە و لە (ر)دا نییە و، ئەم هەڵبەستە تێکەڵ بەهەڵبەستی (کوردی)ی (چاوی ڕەشی فەتتانت) بووە.
مەحزوون: غەمبار، خەفەتبار، غەمگین.
داخم: خەفەتم مەبەسی لەوە ئەوەی مایەی پێ ناخۆشیمە.
پەرێشان: شێواو مەبەستی لە ئاڵۆزکاوی زولفەکەیەتی.
٦- ٥٧- ئەم تاکە لە (ر)، (کم)، (گیو/٢) و (ئوفسێت)دا نییە و لە (گیو/٣)دا پێنجەمین و لە (س/٢)دا هەشتەمین و لەوانی تردا شەشەمین تاکە و بەم پێیە کە سەرچاوە چاپییەکانی ئەم هەڵبەستە تەنیا هەشت تاکیان تیا نووسراوە، جگە لە (گیو/٣)وە بەچوونە سەری ئەم تاکە دەبێ بەیانزە و بەپێی ویژەی کۆن کە ژمارەی (بەیت)ەکان، دەبێ تاک بن و جووت نەبن، بەم پێیە ئەم هەڵبەستە بووە (١١) تاک کە جووتە و کەواتە هەڵبەستەکە تەواوە لە ژمارەی تاکەکانیدا.
٥٨- دەوێ: دەوێت. (بۆچم دەوێ؟): بۆ چیمە، چ پێویستمە...
٥٩- قەلب (ع): دڵ.
قەلبە (سالم گیو): قبلە-جا ئەگەر دەقی وتنەکەی (کوردی) (قبلە) بێ، کەواتە بەپێی فەرهەنگە عارەبییەکان وشەی (قوبلە و قەبلە) ناوی مووروویەکە جادووکارەکان بەکاری ئەهێنن و بڕوا وایە کە ئەو مووروو پێکهێنان و دروستکردن و هێنانە دیی زۆر شتی لە بارا بووە، کەواتە (کوردی) دڵی خۆی کردووەتە ئەو مووروو و لەگەڵ ئەوەشدا وتوویە بۆ چیمە کە نەیکەمە خاکی ڕێگوزارت؟
وە ئەگەر بە(قیبلە)ش بیخوێنینەوە بەواتە ڕووەو قیبلە یا (کەعبە)یە و مەبەسی ئەوەیە تەنانەت کەعبەشم ناوێ ئەگەر خاکی ڕێت نەبێ، یا شوێن ڕوو تێ کردی من ئەگەر ڕێگوزارت نەبی نامەوێ.
(قوبلە)ش دیسانەوە بەواتە دەم و شوێن ماچ پێ کردن و مەبەسی لەوەیە ئەم دەمە شوێن ماچ پێ کردنەم بۆ چییە ئەگەر نەیکەم بەخاکی ڕێت تاکو بەری پێت ماچ بکا.
ئەمانە بەبێ ئەوەی کە ئەگەر دەقی وتنەکەش (قەلبە) بێ، ئەوا مەبەس لەوە: ئەم دڵەم بۆ چییە کە خاکی ژێر پێت نەبێ، بەڵام (قبلە)کە زۆرتر واتا ئەدا و لەبەر ئەوەی تەنیا یەک سەرچاوەدا بوو لەم هەڵبەستەدا کە جێگیرمان نەکرد.
٤- حەنا: خەنە.
خەنەبەندان: کچ و ئافرەت لەگەڵ (بووک) بەر لە گواستنەوەیدا لە هاوبەشیکردنی بۆنەیەکی خۆشیدا، وەک شایی دەست و پێ و سەریان لە خەنە دەگرن و، ئەو نەریتە خەنەبەندانە. گوایە (کوردی)ش کوشتنی خۆی بۆ ئەو بۆنەیە داناوە.
ئەم تاکە لە (نع)دا نییە و لە (ر)دا سێیەمینە وە لە (س/٢)دا پێنجەمین تاکە و لە (گ/٣)دا دەیەمین تاکە.

بیکە خـەنەبەندانت (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسـۆی زانکۆیی): بۆ پەنجـەیی شـمـشـاڵت. وەک دەبینرێ (شـمـشـاڵت) لەگـەڵ پاشـبـەندەکـانی ئەم هەڵبـەسـتـەدا رێک ناکـەوێ و ئـەشێ بۆ رێککەوتنی لەگەڵ پاشبەندی هەڵبەستە ئاوێتەکەی ناو ئەم سەرچاوانە کرابی بە(شمشاڵت).
(بیکە خـەنەبەندانت) لە (ر)دا: (بو پـەنجـەیی شـمـشـادت)- ئـەمـیش لەگـەڵ چ کـامـێک لە هەڵبـەسـتەکان لە (سـەروا)دا ناگونجێ. بڕوانە تاکی (٩)ی هەڵبـەستی ناوبراوی ئاوێتە لەگەڵ کراو.
(خـەنە): نـاوی (تۆز)ێکە بۆ ڕەنگکردن لە کـوردسـتـاندا، کـە ئەو تۆزە هـاڕدراوە یـا کـوتراوەی گەڵای ڕووەکێکە، لە (الحنائیات)ەکان.
لە نیشـتمـانە (گەرم) و ئەو شـوێنانەی لێیانەوە نزیکن دەڕوێ. من لە کێڵگەکانی (کەڵکەتا) و (دیلـهی)ی (هندسـتـان) و لـە ناوچەی شـاری (مـەڕاکـیش)ی (مـەغـریب)دا دیومـە، ڕووەکـێکی نیـمـچـە درەخـتی جـوان و گـوڵی سـپـیی بەتۆپـەڵی (هێـشـوویی) ئـەگـرێت ئەوەندە جـوانە لە کوردەواریدا کە لە کەسێکی جوان بەهەڵنانەوە بدوێن دەڵێن:
(بێ چـاوێنی بێ ئـەڵێی داری خـەنەیە)، گـەڵای ئەو ڕووەکـە ئەهـاڕدرێ بـەوشککراوی دەبێـتـە تۆزێکی ڕەنـگ کـەسـک و، بەنەکـوتراویش دەفرۆشـرێ، تۆزی ئەو گەڵایە لـە ئاودا کـە گـیـرایەوە دەست و پێ و تووکی سـەر و برۆ و سـمـێڵ و ڕیشـی پـێ ڕەنگ دەکرێ، گـوڵێکی جـوانی بەناوی (گوڵە خەنە)ی هەیە بۆ بۆن خۆشیش لای خۆمان هەن.
٥- بەڕەزا: گـیـایەکی کوێسـتانیی کوردسـتـانە، جوان و پەل باریک و بژە، لە شـێوەی قـژی سـەردا و دەشـخـورێ و لە کـوردەواریدا بۆ ئامـانجی پزیشکی بەکـار دەهێنرێ و بەتایبـەتی بۆ گـورچیلە و هۆنەران بەقژ و زولف و ئەگریجەیان چواندووە، وەک لەم تاکەدا هاتووە.
ئەم تاکە لـە (نع)دا خـۆی تەنیـا و یەکـەمین تاکە وە لە (گل/١٠، ن، نم/١، ئاسـۆی زانکۆیی)دا یەکەمینە و لە (س/٢)دا سێیەمینە و لە (ر)دا نۆیەمینە و لە (گ/٣)دا یانزەیەمین تاکە.
(عەقیق) لە (نع)دا: (یاقووت)ە.
(دندان و لەبی) لە (ر)دا: (دندان لب)ە.
(ئاڵت) لە (نع)دا: (ئاڵی)یە.
(هەروەک) لە (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا: (میثلی)یە.
(بەڕەزا) لە (ر)دا: (ابرزە)یە.
(پەخشە) لە (ر)دا: (نخشە)یە.
(لەسەر شانت) لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا: (لەسـەر خاڵت)ە. کە لەگەڵ سەروای ئەم هەڵبەستەی سەرەوەدا ناگونجێ.
(لەسەر شانت) لە (نع)دا: (لەسـەر خاڵی)یە.
(ئەگریجە لەسەر شانت) لە (گ/٣)دا: (ئەگریجە و خرخاڵت)ە.

**هەڵسەنگاندن:**

لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتەب) هەیە جوانیی وێژەیی تیایە.

دور: لە ناو دەریادا قـاپوورێکی گـەچەکی (کلسی) پەیا ئەبێ پێی دەڵێن (گـوێچکە مـاسـی) گەورەییـیان لەوەندەی نینۆکێک هەتا دوو لەپە دەستیش مەزنتر هەیە، ئەمانە دوو دوو پێکەوە دەمەونخوون لکاون و گیاندارێکی مێرووییان لە ناودا دەژی ئەگەر هەر پارچە شتێکی وەک دەنکە لمێک بکەوێتە ناویەوە ئیتر ئەو گوێچکە ماسییە دەکەوێتە ڕژاندنی لیکاوێکی گەچی (کلسی)ی تایبەت بەسەر ئەو دەنکە شتەدا و ئەمجا ئەو لیکاوە ئەمەیێ و لیکاوی تری تێوە دەچێ و لە ئاکامدا ئەو دەنکە زۆر وردە بەرە بەرە مەزن دەبێ بەدەنکی بچووکی ئەمانە دەڵێن مرواری و بەدەنکە گەورەکانیشیان ئەڵێن (دور) کە ڕەنگەکەیان سپییەکی کراوەی ئاویی ڕوون وێ ئاسـاییی جـوان و بێگەردە وە یەکێ بە لە بەردە بەنرخەکـان دەژمـێردرێ و مـووروو و، خـشـڵـەمـەنی لێ دەکـرێ. لەوە دەچێ (دور) کـوردی بێ، بەواتە (لە ناو) و (مـرواریش) لە (مێروو)ەوە بێ لێرەدا مەبەس لەوەیە کە ئەم دورە جوانە لە ددانی خۆشەویستەکەی دەکا.

٦- تەوق: زنجـیر یا ئاسنێکی کـەوانیی چەمـاوە بووە لە بەندیخـانەدا کـراوەتە ملی بەندییـەوە. هەروەها ناوی خشڵێکی زێڕە کە وەک خرخاڵی بێ پڵپڵە و ژنان دەیان کردە گەردنیانەوە- (کوردی) ئەوەندە یارەکەی خۆی جوان و مەزن دیتووە کە پاوانە و خرخاڵی پێی ئەوی بەتەوقی ملی بەشیرین داناوە...

شیرین: ژنی خەسرەوی پەروێز و دڵخوازی فەرهادی کۆهکەن بووە.

زولەیخا: ژنی عەزیزی میسر بوو، کە حەزی لە حەزرەتی یوسف کرد و ئەو بۆی نەلواوە، لەسەر ئەوە بوختانی پێ کردووە و یوسفی خستووەتە زیندانەوە.

گۆ و چاهی زەنەخدان: خڕی و چاڵی سەر چەناگە.

ئەم تاکە لە (ر)دا نییە و لە (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا دووەمینە و، لە (س/٢)دا چوارەمـینە و لەم شـەش سـەرچاوەی دواییـدا ئەم تاکـە، هەردوو باڵی یەکـەم و دووەمی پاش و پێشە.

(گـۆ و چاهی زەنەخـدانت) لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسـۆی زانکۆیـی)دا: (گـۆی چاهی زەنەخدانت)ە-کـە ئەمـەش هەڵەیە، چونکی گۆیەکە هی چاڵییـەکە نییـە، بەڵکو (گۆ و چاهی) ڕاستە و هەریەکە شتێکن.

لە (نارنجی زولەیخا) نەگـەیشـتووم و هەمـوو ئەندامـەکانی لیـژنەی دەسـتـەی کوردی کـۆڕی زانیاری عیراقیش کە لەگەڵیاندا ماوەیەک ئەندام بووم، ئەوانیش نەیانزانی مەبەستەکە چییە.

لە سـەردانی مـیـسـریشـمدا، لە کارمـەندانی پەڕاویخـانەی مـۆزەخـانەی (قـاهیـرە)م پرسی نەیانزانی چییە.

٧- جان: گیان.

پیر: شێخ، گەورەی تەریقەت، مەزنی ئاینی.
پیری: تەمەن زۆری.
دوو گۆ: جووتێ مەمک یا هەردوو گۆی مەمک.
پوستان: مەمک.
ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی، س/٢، گ/٣)دا نییە و هێشتە ژێر چاپیش نەکەوتووە.
لە (نن)دا لە جێگە (لە دەست) نووسراوە (لەبەر).
٨- تشنە: تینوو، ئەشێ لە دەقەکانیشدا (توشنە) بێ کە بەڕێنووسی کۆن نووسراون.
ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (گ/٣)دا سیانزەیەمین تاکە و لە (س/٢)دا نۆیەمینە.
(لەب) لە (گ/٣)دا: (روح)ە و ئەمەش هەڵەیە، چونکە گیان تینووی ماچ نابێ بەشکو لێوە.
(تشنەیی) لە (گ/٣)دا: (مایلی)یە.
(بۆسێکە) لە (س/٢)دا: (ماچێکە)یە، کە ئەمەش لە دەسکارییەکانی مامۆستا (گیو)ە.
٩- ئیعجاز: کردەوەیەکی نائاساییە کە مرۆڤ نەشێ و نەتوانێ بیکا، واتە (موعجیزە) کە هەر لە دەست پێغەمبەران هاتووە و لێرەدا سووتانی خۆی بەپەرتەوی جوانی، وەک پەرتەوی خوا و سووتاندنی کێوی توور بەو پەرتەوی خۆی چواندووە. (ڕەشیی دووکەڵ)یشە.
طوور: کێوی طوور لە ناوچەی سینای لای میسردا.
ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی، س/٢، گ/٣)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم تاکە هەڵبەستەی زۆرتر بەلای (تصوف)دا دەڕوات و نیشانەیە بۆ ئەوەی کە مووسا داوای بینینی خوای کرد و پەڕتەو (جیلوە)ی جوانیی خوا کێوی طووری سووتاند.
١٠- خەمیدە: چەماوە، کۆماوە.
سەجدە: کوڕنوش.
سەروو: دارێکی بالا بەرزە- مەبەس لە بالای شووشی خۆشەویستەکەیەتی.
خەرامان: لەنجەولار، لەرزان، عیشوە وەک شەکاندنەوەی (سەروو) بەدەم باوە.
ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی، س/٢، گ/٣)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.
١١- قوربانی: ئەو ئاژەڵ (مەڕ، بزن، گا و مانگا و گامێش و گوێرەکە و بەرخ و کار و حوشتر)ەیە کە بەناوی (خێر)ەوە لە بۆنەی تایبەتی ئایینی و کۆمەلایەتی و ژیاندا سەر دەبڕدرێ و گۆشتەکەی بەسەر هەژاران و دراوسێیاندا دەبەشرێتەوە، بەتایبەتی لە (جەژنی قوربان)دا و،

حاجییەکانیش لە کاتی حەجکردندا ئەو (قوربانی)یە دەکەن.

نێوان ساڵانی ١٧٧٥ تا ١٨٧٥ی زایینییەوە کە (کوردی) تیایاندا ژیاوە و لە سەرنجێکی ساڵانی ئەو سەدەیەشدا کە بەپێی سووڕانەوەی ڕۆژ و مانگ و ئەم گۆی زەوییەمان سەرەتای وەرزەکانمان بۆ دیاری دەکرێ و جەژنی قوربانیش بەپێی نەریتی ئیسلامی ڕێکەوتی ڕۆژی ١٠/ی مانگی (ذوالحجە)ی هەر ساڵێک دەکات بەڵام وەک ئاشکرایە ئەم جەژنە لە هەموو ساڵێکدا هەر بەر بەهار ناکەوێ بەشکوو بەپێی بەدواداچوونی ساڵەکانی ئەو سەدەیەی کە کوردی تیا ژیاوە دەردەکەوێ کە تەنیا سێ جار جەژنی قوربان کەوتۆتە نێوان مانگەکانی (نەورۆز) هەتا (جۆخینان)ەوە واتە (بەهاری کوردستان)ەوە.

جاری یەکەمیان ڕێکەوتی ساڵانی ١٧٩٥ تا ١٨٠٥ی زایینی دەکا کە کوردی لەم ساڵانەدا هەرچەند مێردمناڵیش بووە بەڵام لە زیرەکیی ئەو، وەشاوەتەوە کە هەڵبەستی لاواز و بێ هێزی وەک ئەم هۆنراوەیە ڕێک بخا، چونکە هەر ئەو بووە کە لە ساڵی ١٨٢٠ز یا بەر لەو ساڵەدا لە بارەگای ئاتەشگایەکی هونەر و زانستی و وێژەیی وەک (مەولانا خالد)ی نەقشبەندیدا چووەتە جەنگی بلیمەتێکی وەک (نالی) و زانا و هونەرمەندێکی وەک (مەشویی) واتە (مەحوی) و هۆنەرێکی دەسەڵات فراوانی وەک (سالم)ەوە و شەڕە شیعری لەگەڵا کردوون، وەک لە هەڵبەستێکی (سالم)دا ئەمە جێگیر کراوە کە وتوویە:

...... لە لایەک (نالی) و (مەشویی) لە لایە (سالم) و (کوردی)،
لە هەنگامەی هونەر گەرمی، تکا جۆ بوون لە مەولانا
لە مەیدانی بەلاغەتدا بەسواری مەرکەبی مەضموون؛
بەکوردی هەریەکە (تازی سوار)ێ بوو لە مەیدانا...... هتد

کەواتە گومان نامێنێ ئەم هەڵبەستەی کوردی هی ساڵانی ئەم بەهار و جەژنی قوربانە یەککەوتنەیەتی و بەیەکێ لە کۆنترین هەڵبەستەکانی ئەو دادەنرێ، ئەم گرنگیی دیاریکردنی کاتی هەڵبەستەشی پلەی خۆی هەیە.

ئیتر هەرچەندە ئەوەندە پێویست نامێنێتەوە بۆ لێدوانی ئەو دووجارەی تر کە لە ژیانی کوردیدا بەهار و جەژنی قوربانیان تیا یەکدیگیر بوون...

هەروەها بەپێویستم نەزانی وردەکارییەکانی مانگ بەمانگ و ساڵ بەساڵی دۆزینەوەی ئەو جەژنی قوربانی وەرزی بەهارە ڕابگەیەنم کە کوردی ئەم هەڵبەستەی تیا وتووە و هەر کەسێ شارەزاییەکی ساڵنامەگەریی هەبێ، ئەو ساڵانی جەژنی قوربانەی بۆ ئەدۆزرێتەوە.

هۆیەکی تر لە لاوازی و کووڕیی ئەم هەڵبەستە کۆنێتییەکەی و بەسەرا هاتنی ڕووخاندنی (فەرمانڕەواییی بابان) و سووتاندنی شاری سلەیمانی لەو هەرایەدا لە لایەن عوسمانییەکان و (عەبدوڵڵا پاشای بابان و جاشی تورکە دڕندەکانی عوسمانییەوە بوونەتە هۆی هەزار هەزارەها کەلەپوور و کەشکۆڵ و پەڕاویی و هەڵبەستی وەها، ئەمە جگە لە دەستاودەست و

دەماودەم کردنی هەڵبەستەکە و نووسینەوەیەوە لە لایەن کۆلکە خوێندەوارەوە کە ئەمانە لە هێز و پێزی هەڵبەستەکەیان کەم کردووەتەوە جگە لەوەی کە ئەو عەبدوڵڵا پاشایە بەتایبەتی هەڵبەستی (کوردی) و (سالم) لە ناودا وەک گۆڕەکەیانی تەخت کردووە.
لە کۆتاییدا وەهای بۆ دەچم کە دەبێ ئەم پارچە هەڵبەستە (١١) تاکییە پاشماوەی دوو پارچە هەڵبەستی لەسەر هەمان کێش و پاشبەند بووبێ و تاکە زۆر لاوازەکانی ئەوەیان بووبێ کە لەو جەژنی قوربانەدا (کوردی) دای ناون بەتایبەتی تاکە هەڵبەستەکانی ژمارە (٣ و ٤ و ٥ و ٦ و ٧ و ٨) کە لە (بابەت)دا دڵدارییەکی (حەقیقی)ترن و جیاوازن لە بابەتی تاکەکانی (١ و ٢ و ٩ و ١٠ و ١١) کە بەلای سۆفیانەترا دەڕۆن و بەدووری نازانم کە سەرچاوەی وەها بدۆزرێنەوە کە ئەم بۆچوونەم بەڕاست بگێڕن.

٩

## تالانی سەرووماڵم

١- تالانی سـەر وو مـاڵم، چاوی ڕەشی فـەتتـانت
پابەندی دڵ و دینم، کـاکـۆڵی پەرێشـانت
٢- سـەر لافی ئەوەی لێ دا، گـۆی عـەرصـەیی بازیت بێ
پووسـیـدە بوو، نەیبـوو تاب، بۆ ضـەربەتی چەوگـانت
٣- دڵ دائیـمـە وەک بولبـول مـوشـتـاقی دەهەن وازە
تا ئابی حـەیات نۆش کـا لەو غـونچـەییی پەیکانت
٤- بۆ تیری (قەضـا) سینەم؛ بۆت بوو بە سوپەر قوربان
بۆ (تەجـرەبە) سـا تیـرێ باوێژەرە قـەلغـانت
٥- چاو قـاتیلی عـاشق بوو، (جـادوو بەچە) بوو عـەییـار
بۆ (شـوێنەوونێ) دەسـڕێ ئەم خـوێنە بەدامـانت
٦- باکم نیـیـە مـورغی دڵ بیکەی بەکـەباب ئەمما
بیـدە بەسـەگ و مـەیدە دەرخـوردی ڕەقـیـبـانت
٧- خۆت بۆ (ستەمان) کەم بووی؟ بیستت قسەی ئەغیاریش؟
(فیرعـەونی زەمـان) ئامـان؛ گـوێ مەگرە لە هامـانت!!
٨- عـەزمت ئەمـە بوو ئەی دڵ ڕیسـوام بکەی و کـردت
دەست هەڵگرە لێم ئیـتـر، سـا خـۆت بیـو ئیـمـانت
٩- گـەر بێـتـوو نیـقـاب لادەی فـیل جـوملە دەبن دەردەم
مـەجرووحی دوو مـوژگانت، مـەجذووبی دوو چەشمـانت
١٠- وەک خەنجەری (ذی الجەوشەن) تا ڕۆژی حەشر دەتکێ
خـوێنی دڵی مـەظلوومـان لەو ناوکی مـوژگـانت
١١- وەک دۆزەخـیـان (کـوردی) از بس کـە فـراق دل
یەکـسـانە لە لای ئێـسـتـا، نزدیکی و هجـرانت

..................................................................

١- کاکۆڵ: قژی سەری نێرینەیە لە مرۆڤدا کە بەرێکی شانا قرتابێ- وە لە صۆفیگەریدا کاکۆڵ هێمای جوانییە، بۆیە ناوبردنی کاکۆڵ لە ناو زۆربەی هۆنەرە کۆنەکاندا باوە، چونکە جوانی خوا لە نێرینەیەکی هەرە جواندا، ڕەچاو دەکەن، کە ئەوەتا (کوردی)ش کاکۆڵی بەپابەندی دڵ و دین داناوە.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەش دیسان سێ جۆرە، ڕای تیایە کە ئەوانیش:

**ڕای یەکەم:** کە ئەم هەڵبەستەیان بەهی (کوردی) داناوە، بریتین لە (مس، عن، ن، ع، گل/١، نم/١، گل/٩، ف، ما، ر، با)، (کم، گ/٢، س، گ/٣). منیش ڕام وایە کە هی (کوردی)یە و بۆیە لە نێوان سەرپاکی سەرچاوەکاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەم.

**ڕای دووەم:** ئەو سەرچاوانەن کە بە هی (بیمار)ی دەزانن و ئەوانیش (گل/١٠، نن، نم/١، گۆڤاری ئاسۆی زانکۆیی ژمارە/٢ساڵی/٨٠ کە لە هەڵبەستی پێشووتردا لێی دواوم و، ئەم سەرچاوانەش تەنیا تاکی نۆیەمی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیان ئاوێتەی هەڵبەستێکی شەش تاکی کردووە بەناوی (بیمار)ەوە.

**ڕای سێیەم:** ئەو تەنیا سەرچاوەیەیە کە ئەویش (س/٢)ە و تاکی (١ و ٩ و ١٠)ی ئەم هەڵبەستەی ئاوێتەی هەڵبەستێکی (٩) تاکی کردووە بەناوی (سالم)ەوە، هەروەها تاکەکانی تری ئەم دوو بەشە، سەرچاوەی دوایی، ئاوێتەی دوو هەڵبەستی تری (کوردی)ن، دەسکاری و پاش و پێش و پەرتەوازە کراون و بەناوی (بیمار) یا (سالم)ەوە نووسراون و مـن ساغم کردوونەتەوە.

تالآنی لە (گل/١)دا: (تالان)ە.

سەروو لە (گل/١)دا: (سەر)ە.

چاوی لە (گل/٩)دا: (چاو)ە.

ڕەشی لە (ع)دا: (ڕەش)ە.

پابەندی لە (ع)دا: (پابند)ە، پابەندی (با) پابند.

دڵوو لە (ع)دا: (دل)ە.

کاکۆڵی لە (س/٢)دا: (گیسویی)یە.

ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە.

فەتتان: ئاشووباوی.

پابەند: پەیوەندیدار.

دین: وشەیەکی کوردیی پەتیی دێرینمانە و عەرەب و نەتەوە ئیسلامەکان لە ئێمەوە وەریان گرتووە و بووەتە وشەیەکی ئیسلامی (بەواتا = ئاین) کە وشەی (دین) لە (ئاڤێستا)ی پەڕاوی پیرۆزی زەردەشتیدا، هاتووە کە دوو هەزار ساڵێک بەر لە ئیسلام بووە.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم هەڵبەستە یەکێتیی بابەتی تیا پەیرەوی نەکراوە، بەپێچەوانەی زۆربەی هەڵبەستەکانی (کوردی)یەوە.

٢- بازی: مەبەسی لە یاری (گۆیێن، یاشەقێن)ە. لە (ئەوروپایی).

پووسیدە: ڕزیو، (پۆڵۆ) یان لەمەوە وەرگرتووە، پێست پێوە نەماو، ڕووتاوە.

تاب: تاوی (داوی) تووکە سەر-مەبەسی لە ڕووتاوییە کە (کوردی) سەر ڕووتاوە (ئەصلەع) بووە.

ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (گ/٣)دا چوارەمینە.

لافی لە (گل/١، گل/٩)دا: (لاف)ە.

گۆی لە (گ/٢)دا: (گۆ)یە.

پووسیدە لە (کم، نم/١)دا: (پوشیدە)یە.

پووسیدە لە (عن)دا: لە پەراوێزەوە نووسیویە: (نسخە = پووسندە). کە ئەمیش واتەی پووسیدە دەدا واتە ڕووتاوە.

نەبوو لە (ع)دا: (نی بو)ە.

تێبینی:

لەسەر یاریی (شەقێن) لە هەڵبەستی (چێشتم ئەمرۆ ژەهری مار و ڕۆحی شیرینم نەهات) و بەدرێژیتر نووسیومە.

عەرصە: گۆڕەپانی یاری، یاریگە.

ضەربەت: لێدان.

چەوگان: گۆچان، مەبەس لە داری یاریی (شەقێن) وە یا (گۆیێن)ە.

٣- بولبول: مەلێکی جوان و بچووک و دەنگ خۆشە، لە وێژەدا هێمای دڵدارییە.

دەهەن: دەم، زار

واز: کراوە، مەبەس لە پشکووتنی خونچەیە کە هێمای دڵخوازە و بولبولی دڵدار ئارەزوومەندیەتی، ئەوتنۆکە (شەونم)ی ناو غونچەکە بخواتەوە و چاوەڕوانییە و لە بەرەبەیاندا خەوی لێ نەکەوێ و شەونمەکە بەتینی خۆرهەڵات نەبێتە هەڵم.

ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و، لە (ما)دا دووەمین و لە (ڕ، گ/٣)دا حەوتەمینە.

دائیمە لە (ر، کم، گ/٢، س)دا: (دائما)یە.

دائیمە لە (ف)دا: (دایمە)یە.

تا ئابی لە (ڕ)دا: (تا اب)ە.

تا ئابی لە (ف، ع)دا: (دا اب)ە.

(لەو) لە (ڕ)دا: (لەم)ە.
(لەو) لە (ف)دا: (لو)یە.
(غونچەیی) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (خونچەیی)یە.
واز: کراوە، بەش، والآ. (دەهەن واز = دەم کراوە) کە مەبەس لە کرانەوە (پشکووتنی) خونچەی گوڵە، خوێندنی خۆشی بولبول، کەوا (کوردی) دڵی خۆی وەک ئەو (بولبول)ە داناوە، بۆ ئاواز وتن بەئارەزوومەندییەوە، بەڵام ئەمە واتەیەکی تریش
دەدا کە:
ئەم دەم کردنەوەیەی بولبولە لەو بیرەوە هاتووە کە وا باوە گوایە بولبول بەڕۆژ هەتا ئێوارە گۆرانی بەسەر خونچە گوڵی دڵخوازیدا هەڵدەدات، کە ئێوارە داهات ئیتر وەک دڵدارێک شەکەت و ماندوو بەدەم کراوەیی بەدیار خونچەی دڵخوازیەوە بێدەنگ شەونخوونی دەکێشێ تاکو لە کاتی پشکووتنی، واتە دەمکردنەوەی بەدیار ئەو (خونچە)یەوە کە ئەو دڵۆپە شەونم (خوناڤ)ەی کە لە ناو خونچەکەدایە، وەک دڵۆپە ئاورنگێک (خوناوێک) بخواتەوە. دەڵێن گۆیا لە بەرەبەیاندا کە کاتی کرانەوە (پشکووتن)ی خونچەکەیە، بولبولی چارە ڕەش کە ئەوەندە کە (قەشەنگ)ە، خەوی لێ دەکەوێ و کاتێ چاو دەکاتەوە خونچەکەی بووەتە گوڵێکی تازە پشکووتوو، دڵۆپە شەونمەکەی ناویشی بووەتە هەڵم فڕیوە بەناو بادا و، بۆ بولبول نەماوەتەوە.
ئیتر بولبول جارێکی تر بەدیار ئەو گوڵە و خونچەی ترەوە دەس دەکاتەوە بەهەمان جۆرە ڕابواردنی پێشووی و، ئەم دەمکراوەیی ناو ئەم هەڵبەستەش لەو دەمکراوەییەی شەوانی بولبولەوەیە کە گۆیا دڵەکەی (کوردی)ش ئاوا دەمی کراوەیە لە عەشقی خۆشەویستەکەی تا بتوانێ ماچێکی لێوە خونچەییەکەی بکا.
هەروەها لە لایەکی تریشەوە، ئەمە نیشانەیە بۆ شەو بێداریی (دەروێش) و (خواپەرست)ەکان، کە هەمیشە بەشەو دڵیان بەندیواری (ذیکر) کردنە و ئەمەش بیرێکی ئاینی و صۆفیگەرییە.
ئابی حەیات: ئاوی حەیات؛ مەبەس لەو ئاوەیە کە هەر لە بیردا هەیە و بەخۆی هێشتە نەزانراوە کە ببێ و گوایە هەرچی زیندەوەر هەیە بیخواتەوە، ئەو زیندەوەرە نامرێ و لە سەرگوزەشتە ئاینی و گەلی (فۆلکلۆرییەکانی گەلانی جیهان بەگشتی و گەلانی هەرسێ ئاینە ئاسمانییەکەی جوو و فەلە و ئیسلام دا (بڕوا) وایە و هاتووە کە حەزرەتی (نووح) پێغەمبەر و (خدری زیندە) ئەو ئاوەیان خواردووەوە نامرن و تائەبەد زیندوون و ئەمەش کەلەپوورێکی کۆنی مرۆڤایەتییە و لە فەلسەفەیەکی قووڵ و بەهێزی ژیانەوە هەڵقوڵاوە کەوا مرۆڤ لە کۆنترینەوە بەدوای (ئاوی حەیات)دا وێڵە هەوڵی دۆزینەوەی هۆی نەمردنیەتی و، چیرۆکی ئەفسانەیی (کەلگامش)ی کورد، جوانترین ئەم بەڵگەیەیە کە پیاوێکی مێژوویی کورد کەوتووەتە ناوچەی ناوەند و خواروی عیراقی ئێستەوە و بەپاڵەوانێتی و ئازایی و بەهێزیی خۆی، بووەتە پاشای (شاری ئورووک) کە چیرۆکەکە لە کۆنەوە نووسراوەکەی باپیرە (سۆمەری)یەکانمان و (بابلی)،

ئەم پیاوە ئەوەندەی دەماودەم کراوە شێوەی ئەفسانەییی وەرگرتووە کە ئەو پاڵەوانە کوردە دووروودرێژ لەم ڕێگەیەدا کۆشاوە و، بەدەردیسەرییەکی زۆر گەییوە بەلای (نەبونیشتم) واتە (نووح)ی خزمی ئەویش گیایەکی داوەتێ کە گەڕایەوە لە قەراغ شارەکەی خۆی چاک بشوا و دوای ئەوە گیایەکە بخوا و ئەوجا بچێتە شارەوە.

کە (کەلگامش) دەگەڕێتەوە و لە قەراغ شارەکەی لە خۆشتندا دەبێ ئەڕوانێ ئەوا (مارێک) گیایەکەی خوارد و، لەوەوەیە کە ئەڵێن مار نامرێ یا حەوت گیانی هەیە و هەموو ساڵێک کاژێک فڕێ دەدا و تەمەنی لە نوێ دەنووسرێتەوە.

بەم ئەزموونە (کەلگامش) دەگاتە ئەو ڕاستییەی کە زیندەوەر دەبێ بەمردن کۆتایی بێ و لەوەوە دەکەوێتە چاکەکاری لە پاشایەتییەکەیدا.

پەیکان: ئەو گۆیکە قوت و نووک تیژەیە کە لە مایەی کان (مەعدەن)ی دروست دەکرێ و لەسەری تیر و نێزە بەند دەکرێ بۆ چاک و زوو کونکردنی ئەو لەشەی کە پیا دەچێ-کە لەم هەڵبەستەدا شێوەی چۆنێتی خونچەیی بەشێوەی ئەو سەرە نێز و تیر (پەیکان)ە داناوە کە لە شێوەدا هەردوو لە یەکتر دەکەن و گوایە چۆن سەرە نێزە جەرگ و دڵ و لەش کون دەکا ئاوەهاش خونچە کە (ڕەمز)ی دڵخوازی دڵی بولبولە کە (ڕەمز)ی دڵدارە و دڵەکەش هی (کوردی)یە و کونی دەکا.

٤- ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و، جارێکی تر لە (نم/١)دا سێیەمینە و لە (ما)دا نۆیەمینە وە لە (گ/٣)دا چوارەمینە.

تیر: گوللە. بەلام لە کۆندا وەکو ئێستە لە بەرهەمە (کانی) واتە (مەعدەنی)یەکانی وەکو مس و قورقوشم و ئاسن و... هتد دروست نەکراوە، بەشکو لە دار و سەرەکەی لە ئاسن (پەیکان) بووە و بەکەوان (کەمان) هاوێژراوە.

هەرچەندە لە سەرێنی (کوردی)شدا تیر و کەوان لە ئارادا نەبووە و بەشکو گوللە و تفەنگ و تۆپ هەبووە و تیر (گوللە) لە هەڵبەستدا بەکار براوە وەک لاساییەکی وێژەی کۆن.

تیری (گل/١٠): تیر.

قەضا (ع): چورتم، گێچەڵ، تەشقەڵە، بەسەرهاتنی شت یا کاروباری خراپ.

سینە: سنگ.

بۆت بوو (ما): بوت بوتە.

سوپەر: سپێر، بەرگر قەڵغان.

قوربان: ئەی بالا گەردانت بم.

تەجرەبە: تاقیکردنەوە وە لە (جَرَّب تجريباً وتَجرِبةً)ەوەیە.

تەجرەبە (گ/٢)، (ئوفسیت) و (با): تجربە.

تەجرەبە (گ/٣) و (ع): تەجروبە.

قەڵغانت (گ/٢، س، گ/٣) قەلخانت.

قـەضا: چورتم، گێچـەڵ، بەسـەرهات لە شتێک یا لە کاروباری خراپ، بـەبڕوای ئاینی ئیسـلام، ئەو بەسـەرهاتە چاک یا خراپانە لە خـواوە بڕیار دراون، بۆیە هـەر ڕووداوێک لە خـواوەیە و، بۆ ئەوەی کە لە تاوانی ڕووداو، تاوانباران بەرپرسیـار نەبن لە هەمان بڕوادا ئەوە دیاری کراوە کە (کورێزی ئیختیار) واتە کردنی شتەکە یا تاوانەکە بەندە بەبیرکردنەوە و هەڵبژاردنەوە لە لایەن تاوانبارەکەوە، گوایە ژیری (عەقڵ)ی لە خواوە پێ دراوە کە چاک و خـراپ لێک جوێ بکاتەوە و کە نەیکرد (کەسەکە) خۆی تاوانبارە.

سا تیرێ: دەسا یەک تیر.

باوێژەرە: بهاوێژە بۆ، ئاراستەی بکە، تێی بگرە، بۆی بهاوێژە...

قـەڵغان: ئەو پارچە پێستە ئەستوور یا پۆڵایەیە کە وەک، ساجێک دروست دەکرێ و لە دیوی ناوەوەی دەسک یا قـوڵفـەیەکی پێـوەیە کـە جـەنگاوەر لـە کـاتی جـەنگدا ئەیگری بەدەستـەوە و ئەیداتـە بەر تیـر و شـیـری دوژمن کـە ئاراسـتـەی ئـەوی دەکـەن و، بەوە خـۆی لە ئەنگاوتن و برینداربوون دەپارێزێ و، ئەمـەش چەکێکی زۆر کۆنە و لە چەرمـی گا و گامێش و فیل دروست دەکرێ و پشتیوانی ئاسنیشی پێوەیە و هەروەها لە کوردیدا (مەتاڵ)یشـی پێ دەڵێن.

هەرچـەندە لە سـەرێنی (کـوردی)دا، ئەم چەکـە بەکـار نەبراوە، بـەڵام وەک لاسـاییکردنەوەی نەریتی وێژەی کۆن (کلاسیکی) ئەمیش وەک هۆنەرانی ناوچەکە بەکاری هێناوە لە هەڵبەستدا.

قەڵغانت (گیو/٢، ئوفسێت، گیو/٣): قەلخانت.

**هەڵسەنگاندن:**

جوانی لەم تاکە هەڵبەستەدا قەڵغانەکە و سوپەری سینـەیە بەرامبەر بەتیری قـەضای یارەکەی کـە یا مـەبەست لە یارێکی (مـەعنەوی)یە و (قـەضـا)ی کردووە و، یا مـەبەست لە هـەر یارێکی جـوانیی مرۆڤـانە و دەبێ ئەو یارەش تیرەکـەی بهاوێژێ چونکی لە خـواوە (قـەضـا) کـراوە و بەدەس کەس نییە.

٥- ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، س/٢)دا نییە.

دەسرێ لە (ما، ف، نم/١)دا: (اسرێ)یە.

(دەسرێ) لە (ع)دا: (ڕیتی)یە.

ئەم لە (ع)دا: (او)ە.

بەدامانت لە (ما)دا: (لدامانت)ە.

**هەڵسەنگاندن:**

لێڵـی و پێکەوە نەگـونجـانـی هەردوو نیـوە باڵـی ئەم تاکە هـەست پێ دەکرێ و، هـانام بردە بەر لیـژنەی کۆڕی زانسـتی کە بـەشکو ئەو لێڵی و نەگونجاوییـە ڕوون و ڕەوان بکەن کـە بەداخـەوە نەیانزانی و لافی ئەوەشیان لێدا کە ئەم پەڕاوییە بەرهەمی ئەوانە.

قاتیل: کوژەر، بکوژ، خوێنکار، خوونکار، کوشندە...
عاشق: دڵدار.
جادوو: (سیحر -ع-)
بەچە: بێچوو، بەچکە، مناڵ.
جادو بەچە: بەواتا (مناڵی سیحر)، (بێچووی سیحر). بەڵام لە ڕاستیدا (سیحر) مناڵی نییە و بەشکوو مەبەست لە (مناڵی سیحرباز) یا (مناڵێکی سیحرباز)ە کە هەر لە مناڵییەوە جادوکار بوو بێ و ئەم جۆرە دەربڕینی (جادو بەچە)یە هەڵەیەکی زمانی باوە کە مەبەست لەوەیە چاوە کوشندەکەی کەوا عاشق دەکوژێ، وەک باوکە سیحربازەکەی خۆیشی ئاوەها جادوو دەکا.
عەییار (ع): زۆرزان، فێڵباز، شەییاد، جانانە.
عەییار جۆرە کەسێکن پەتیارە و فێڵباز و بێکار و لێهاتوون، کە لە دیوانی گەورە و فەرمانڕەواکاندا ژیاون و فێڵ و تەڵەکەیان بۆ سوودی ئەو گەورانە گێڕاوە و (ژیانیان) بەڕێگەی ساختەگەری بەسەربردووە و ئەمانەش لە کۆنەوە هەبوون.
(کوردی) و هۆنەرانمان کە لە هەڵبەستەکانیاندا و بەتایبەتی هۆنەرانی ناوچەکە زۆر جار ناوی (عەیار)یان هێناوە وەک بابای عەیار.
شوێنە ونێ: سڕینەوە و شاردنەوەی نیشانە و شوێنەواری تاوان.
داماں: داوێن.
٦- ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (ما)دا چوارەمینە و لە (نم/١ی دووەمدا) پێنجەمین تاکە و لە (ر)دا هەشتەمینە و لە (گ/٣)دا نۆیەمینە.
(بیکە) لە (ڕ)دا: (کردن)ە.
(مەیدە) لە (ڕ)دا: (مەیکە)یە.
باک: پەروا، (باکم نییە): پەروام نییە، دەربەست نیم، پێم چ نییە، گوێی نادەمێ، ناترسم، لە خۆشی ناگرم...
مورغ: مەل، باڵندە، پەلەوەر.
بیکەی لە (ڕ) و (ما)دا: کردت.
کەباب: بەسوورەوەکردنی گۆشت بەقیمەیی یا بەشیشەوە بێ.
**هەڵسەنگاندن:**
(کوردی) لێرەدا وردەکاریی زمانزانیی بەکارهێناوە، بەگردکردنەوەی وشەی (باک، بەکەباب و بیکەی کە بەپێی وێژەی کۆن (جیناس) ئاراییە.
ئەمما (ع): بەڵام، دیسان، وە یا، بەشکوو.
سەگ: گیاندارێکی ناسپڵەیە لە کۆنترین کاتەوە، ئالوودەی مرۆڤ بووە و کەوی کراوە و هەردوو لا کەڵکیان لە یەکتر وەرگرتووە، بەتایبەتی لەبەر زیرەکی و تا ڕادەیەکی زۆر لە

بارابووییی هەیە بۆ پەروەردەکردنی و فێربوونی گەلێ شت کە لە (وزە)ی مرۆڤدا نەبێ کە بیکا.
(کوردی) کە وتوویە دڵەکەم بدە بەسەگ و دەرخواردی ڕەقیبانی مەدە بەواتە ڕەقیبانی لە سەگ کە سووکە بەکەمتر داناوە.

**نوکتە:**

لێرەدا شایانە کە سەرگوزەشتەیەکی سەیری نوکتەئامێزی و وتەیەکی توێکڵداریی شاعیرانەی (مستەفا بەگی کوردی) بگێڕینەوە کە گوایە هێشتا لەگەڵ شاعیری کوردی (زەنگنە) (قائانی)دا، یەکیان نەدیوە، بەڵام نامە و نامەکاریی دۆستانەیان لە نێواندا بووە. کە جارێکیان (کوردی) ڕێی دەکەوێتە (شیراز) و (قائانی) لەوێ دەبێ و بەپرسیار ماڵەکەیان دەدۆزێتەوە و لەوێ پێی ئەڵێن کەوا (قائانی) لە (حەمام-گەرماو)ە کە ئەویش دەچێتە ئەو گەرماوە ئەپرسێ کە ئایا (قائانی) لەوێیە تێ ئەگا لە ژووری گەرم و خۆ شتنە. ئەمیش دەچێتە ژوورەوە و بەشێوەدا لە دوورەوە قائانی دەناسێتەوە کە کەسێکی تری جگە لەو خڕ و ئەستوور و کەچەڵ یا (سەر ڕووتاوە) لێ نابێ و (کوردی)یش ئەچێتە سەر ئەو جورمەیەی کە (قائانی) خۆی لەبەر دەشوا و بەرامبەری دادەنیشێ و دەس دەکا بەخۆشتن و ئەکەوێتە گێچەڵ بەقائانی کردن وەک ئەوەی لەو کاتەدا کە (قائانی) کەفی سابوونی بەسەر و چاوەوەیە و پێویستی بەجامە ئاوەکە دەبێ کە ئاوی پێ بکا بەسەر خۆیدا (کوردی) جامەکەی لێ دەگرێ و ئاوی پێ دەکا بەلەشی خۆیدا و ئەم کردەوەیەی یەک دوو جار وەک گێچەڵ پێکردنێک لەگەڵدا دووبارە ئەکاتەوە. (قائانی)ش لێی دەپرسێ ئەرێ تۆ کوێندەریت ئەویش ئەڵێ من (ئیسپەهانی)م. (قائانی)ش چونکی پیاوێکی توانا و بەڕێز و هۆنەرێکی مەزنی ناسراو ئەبێ بەبێ لێ سڵەمینەوە لەبەر خۆیەوە لە وەڵامدا دەڵێ: (سوبحان الله ئیسپەهانی لای ئێمە لە سەگ زۆرترن). واتا بەژمارە لە سەگ زۆرترن. (کوردی)یش یەکەندەردوو قسەکەی لە دەم ئەقۆزێتەوە و پێی ئەڵێ: (ئاغا ئەمە عەجایب نییە بەشکو عەجایبتر ئەوەیە کە لای ئێمە شیرازی لە سەگ کەمترن). واتە لە ڕێزدا لە سەگ کەمترن. (قائانی) کە ئەمەی گوێ لێ دەبێ و خۆیشی هۆنەرێکی وریا و خاوەن وردەکاری و وتەی بەتوێکڵ بوو، لەم وەڵامەی (کوردی) هەڵدەسڵەمیتەوە پێی دەڵێ ئەم وەڵامەی تۆ لە هی کەسێکی هۆنەر و شارەزای وێژە دەکا و بەڕاستی تۆ کێی و چ کەسی و ئەمجا (کوردی) خۆی لێ ئاشکرا دەکا و ئەمە یەکەمجاری بەیەکتر گەیشتنیان بووە و ئیتر تا دوایی دۆستی یەکدی بوون و، هەروەها جۆرێکی ئەم باسە ئەدەنە پاڵ هۆنەران و کەسانی کەش.

لەم ڕووداوە دیسان کەمێتی نرخی سەگمان بۆ دەرئەکەوێ لە کاریگەریی ئیسلامەوە لە ناو کورددا، هەرچەندە ئێستە لە گەلە پێشکەوتووەکاندا جۆرەها سەگ بۆ جۆرەها ئامانج پەروەردە و فێر دەکەن و بەکاری دەهێنن و ڕێز و نرخی باڵا و تایبەتی هەیە و سەگیش هەمیشە هاوژیانی کوردی گوند و خێڵەکی بووە.

مەیدە (ر): مەیکە.
دەرخۆردی (کم): دەرخوری–کە (دەرخۆرد = بەواتە دەرخوارد)ە.
دەرخۆردی (ما و نم): درخواردی.
دەرخۆردی (ر): درخور.
ڕەقیب (ع): دژ، ناحەز، دوژمن، ئەوی لە پەیکاری کەسێ بی بەخراپی.
بەڵام لێرەدا دەبوووایە (ڕەقیبانم) بووایە. ئەشێ لەبەر سەروا (پاشبەند)ی هەڵبەستەکە (ڕەقیبانت)ی وتووە و (ڕەقیبانم)ی نەوتووە.
لە لایەکی ترەوە دیسان ئەم وتنەش ئەوەندە هەڵە نییە، ئەگەر وەها لێک بدرێتەوە کە دڵەکەی (کوردی) با بکرێ بەکەباب و بدرێ بەسەگ بەو مەرجەی نەدرێتە دەرخواردی ڕەقیبەکانی یارەکەی چونکی بەوەدا ڕەقیبی، ئەون دیارە ڕەقیبی (کوردی)شن وەک لە پەندی پێشینانماندا هاتووە کە: دوژمنی دۆستم دوژمنمە.
٧- ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە لە (ر)دا پێنجەمینە و لە (کم، گ/٢، س)دا حەوتەمینە.
قسەی ئەغیاریش لە (کم)دا: (قسەی ئەغیار)ە.
فیرعەونی لە (ع)دا: (فرعون)ە.
گوێ لە (گ/٣)دا: (گووێ)یە.
ستەم: زۆر، خراپە، جەور، سزا، بەدکاری.
قسەی ئەغیاریش (ما): قسەی ئەغیارش = ئەمەش هەڵەی نووسین و شێوەی کۆنە، قسەی ئەغیاریش (کوردی و مەریوانی): قسەی ئەغیار ئەمیش نەنگە.
قسەی ئەغیاریش (ع) و (نم): قسەییی ئەغیار.
فیرعەون: وشەیەکی قیبطی (میسری کۆنە) بەواتا (خانەی مەزن) کە مەبەست لە کۆشک و تەلاری پاشا کۆنەکانیان بووە و ئەم ناوە لە پاشترا بووەتە ناو بۆ هەموو پادشاکانیان و، بەر لە هەزار ساڵ پێش زاین فەرمانڕەواییان بەسەر خاکی میسر هەبووە و بەزۆردار بەناوبانگ بوون. لەم فیرعەونانە یەکێکیان ڕێکەوتی سەرێنی مووسا پێغەمبەریان کردووە و زۆر دژی خۆی و ئاینەکەی بووە کە بەزۆردار بەناوبانگ بووە و دژی مووسا پێغەمبەر بووە کە (کوردی) نیشانەی بۆ کردووە.
زەمان: ڕۆژگار، سەردەم.
فیرعەونی زەمان: وەک تانووتێکە، مەبەستی زۆرداریی یارەکەیەتی.
ئامان: هاوار، هاوارکردنێکە بۆ نەکردنی شتێک، هەیداد.
گوێی (گ/٣): گووێ.
هامان: ناوی دوو کەسی مێژوویی بەناوبانگە–لە قورئاندا شەش جار لە سورەتەکانی

(القصص والعنكبوت و غافر)دا و له تەوراتیشدا باسی کراوە کە دژی مووسا و ئاینەکەی بووە.

ئەو دوو کەسەش ئەمانەن:

أ- هامان- ناوی وەزیر یا سەرەک وەزیرانی (فیرعەون) پاشای میسر بووە لە سەرێنی مووسا پێغەمبەردا و ئەم هامانە زۆر چوغولی دژی مووسا و ئاینەکەی و پەیڕەویکەرانی دەکرد لە لای فیرعەون و، بەفرمانی (فیرعەون) ئەم هامانە قەڵایەکی دروست کرد کە فیرعەون پیا بچێتە ئاسمان و بەخوای مووسا بگا کە زۆرتر (کوردی) مەبەستی ئەمەیانە.

ب- هامان-ئەم یەکەیان ناوی وەزیرێکی (ئەخشورشی) پاشای فارس بووە (الموسوعة العربیة المیسرة، المنجد في اللغة والاعلام). (کوردی) لێرەدا مەبەستی لە هامان ڕەقیبەکان بووە وەک مەبەسی لە (فیرعەون)یش یارەکەی بووە.

جوانیی وێژەیی لەم تاکەدا زەمان و ئامان و هامانە کە جناس ئارایییە سالمیش وتوویە:

وەکو فیرعەونە حەبیبم بە ستەم

تا ڕەقیـبی وەکو هامــانی هەیە

٨- ئەم تاکە لە (گل/١٠، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە وە لە (ڕ)دا چوارەمینە وە لە (نم/١ی دووەمین)دا حەوتەمین تاکە و لە (گ/٣)دا چواردەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

(ئەمە بوو) لە (ڕ)دا: د (اوە).

کردت لە (ر): (کررد).

خۆت بیو لە (ر): (خو توو).

عەزم: ئارەزوو، هێز، ویستن، خواست.

ئیمان: بڕوایی، بڕوا.

٩- نیقاب: پەچە، ناوی ڕووپۆشی پاڵەوانە کۆنەکانە کە لە جەنگدا بۆ نەناسینەوەیان بەکاریان هێناوە-کە لێرەدا (کوردی) دڵخوازەکەی کردووەتە (پاڵەوانێک).

مەجذووب: بەکێش کراو، کەمەندکێش کە ئەمەش زاراوەیەکی صۆفیانەیە.

ئەم تاکە لە (ع، ف، ما، ر، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نییە و، لە (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا پێنجەمین و لە (س/٢)دا حەوتەمینە.

(گەر بێتوو) لە (نن)دا: (بی تو)یە.

(فیل جوملە) لە (نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا: (مین جوملە)یە.

(دەبن) لە (نن، نم/١)دا: (ئەبن)ە.

(مەجرووحی دوو موژگانت) لە (گل/١٠، نن، نم/١، ئاسۆی زانکۆیی)دا: (مەجرووحی سیەهـ چەشمان)

(مەجرووحی دوو موژگانت) لە (س/٢)دا: (محزونی سیەهـ چەشمان).

(مەجذووبی دوو چەشمانت) لە (نن، نم/١)دا: (مجروحی دوو مژگانت).
(مەجذووبی دوو چەشمانت) لە (س/٢، ئاسۆی زانکۆیی، گل/١٠)دا: (مجروحی دیدەی کاڵت).
کە لێرەدا (دیدەی) کێشی هەڵبەستەکە قورس دەکا و (کاڵت) لەگەڵ پاشبەند (سەروا)کانی ئەم هەڵبەستەدا ناگونجێ و، ئەشێ بۆیە گۆڕدرابێ کە لەگەڵ ئەو هەڵبەستەدا بگونجێ کە بەناوی (بیمار)ەوە نووسیویانە، هەرچەند لە (نن، نم/١)دا لەم هەڵبەستەی بەناوی (بیمار)ەوە نووسراوە (شمشادت)یش هاتووە کە لەگەڵ تاکەکانی تری ڕێک ناکەوێ... ئیتر شوێنەواری دەسکاری و ئاوێتەکاریی زۆر بەم هەڵبەستانەوە دیارن کە ساغم کردوونەتەوە وە، لە (شمشادت)دا تاکی چوارەمی هەڵبەستی دواییدا ئەمانەم ڕوون کردوونەتەوە.
١٠- خەنجەر: چەکێکی بڕندەی کوردیی دەستەویەخەیە، ئازا و بەجەرگ بەکاری دێنێ.
ذي الجَوْشَنْ: بەواتە زرێدار، بەڵام مەبەست لە خەنجەرێکە کە زرێ خۆی لەبەر ڕاناگرێ، (جەوشەن)یش بەواتە (زرێ)یە کە دەکرێتە بەر وە هەر بەشی سنگ داپۆشینە کە ئەم وشەی (جەوشەن) لە (گوێی سنگ)ەوە هاتووە و عەرەبەکانیش وەریان گرتووە و بەم شێوەیە بەکاری دەهێنن و تێکەڵ بەزمانەکەیان بووە.
هەروەها (ذی الجەوشەن) نیشانەیە بۆ (شمری کوڕی ذی الجەوشەن) کە ناوی شرەجیل کوری قرط الاعوری عمروی کوڕی معاویەی کلاب الکلابی الغبابییە کە یەکێکە لەو صەحابانەی کە حەدیثی لێوە گێڕراوەتەوە.
ئەم پیاوە بەئازا و بەناوبانگە، هاوبەشی لە جەنگی (صفین)دا کردووە، بۆیە پێی وتراوە (ذی الجوشن) کە یەکەمین عارەبێکە و بۆ یەکەم جار زرێ (جەوش)ی پۆشیوە و گوایە ئەو زرێیەش (کسیرا) پێی بەخشیوە و لەوەوە (ذی الجەوشەن) واتە (زرێدار) یا (زرێپۆش)ی ناو لێ نراوە. وە لە (کووفە) جێ نشین بووە و یەکێکە لەوانەی کە (حسێن) کوڕی (عەلی ئەبی تالیب)یان کوشتووە و بەفرمانی (عەبدوڵڵا) کوڕی (زیاد) ئەم (ذی الجەوشەن)ە سەرەکەی (حسێن)ی بردە شام بۆ لای (یزید کوڕی معاویە).
هەروەها (ذی الجەوشەن) یەکێکە لە هۆنەرە تواناکانی عەرەب.
کاتێ (مختار الثقفی) کەوتە کۆڵینەوە لەوەی کە کێ (حسێن)ی کوشتووە، ناردی بەشوێن (شمر)دا و ئەویش هەڵهاتە (کلتانیە) کە گوندێک بووە لە خووزستان لە نێوان (سووس) و (حمیرە)دا وە بەدوایا چوون لەوانە (ئەبو عەمرە عەبدولرەحمان کوڕی (ابی الکنود) گەیشتێ و لە دوای شەڕەشیرکردن لەگەڵ یەکدا کوشتی کە ئەمە لە ساڵی ٦٦ی کۆچی بەرامبەر بە(٦٨٦ز)دا بووە.
حەشر (ع): وشەیەکی ئاینی ئیسلامە و گەلە ئیسلامەکان بەکاری دەهێنن، مەبەست لە دوا لێپرسینەوەی خوایە لە خەڵکان لە پاش مردنی هەموان و زیندووکردنەوەیان بەپێی پەتی و سەری خوێنی لە ڕۆژی قیامەتدا.

حەشر (گیو/٢): شر-ئەمەش هەڵەی چاپییە.
دەتکێ (نم/١): ئەتکێ.
دڵی (با): دڵ.
مەظلوم (ع): زۆرلێکراو، ستەم لێکراو. گوایە (کوردی) خۆی بە(حسێن کوڕی عەلی ئەبی تالیب) چواندووە گوایە خۆشەویستەکەی (ذی الجەوشەن) بووە و (کوردی)ی کوشتووە و مەظلومانی کوشتووە...
لەو ناوکی (نم/١): لەو دیدەو.
لەو ناوکی (س/٢): بەو خەنجەری.
موژک: مژۆلان، برژانگ، موژە...
موژگانت (گیو/٢، معوژگانت-ئەمەش هەڵەی چاپییە).
١١- ئەزبەس کە: لە زۆرێتی هێندە.
دۆزەخ: جەهەننەم.
ئەم تاکە لە (گل/١٠، ر، نن، نم/١، س/٢، ئاسۆی زانکۆیی)دا نییە و لە (نم/١ی دووەم جار)دا نۆیەمین تاکە و لە (عن، ع، گل/١، گل/٩، ما، ف، کم، با، گ/٢، س)دا دەیەمینە و لە (گ/٣)دا حەڤدەهەمین تاکە و لە هەموانیشا دوا تاکە.
(دل) لە (گ/٣)دا: (وی)یە.
(ئێستا) لە (ع)دا: (ایستە)یە.
(نەزدیکیو و) لە (ما، ف)دا: (نزدیکی)یە.
(نەزدیکیو) لە (کم)دا: (نەزدیگیو)ە.
(نەزدیکیو) لە (گ/٢، س)دا: (نێزیکیو).
وە لە (ما، گ/٣)دا نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە بەم جۆرەیە:
«ئەز بەسکە فیراقی دل وەک دۆزەخیان کوردی»
یەکسان: چونیەک، هاوبەش.
هیجران: خەفەت، دووری، لێ جیایی.
**(لاساییکردنەوە):**
لە ناو هۆنەرە (کلاسیکی)یەکاندا باو بووە و باوە کەوا یەکێکیان هەڵبەستێکی دانابێ، هەندێکی کەیان لەسەر هەمان کێش و سەروا و لە هەمان بابەت و بگرە بەهەمان وشە و کەرەستە و لە هەمان بیر هەڵبەستیان داناوە، ئەمجا ئەوی لە پێشەوە وتبێتی پێشرەوی و یەکەمی هی ئەو بووە. بەڵام ئەوی کە لە هەمووان جوانتری وتبێ، ئەو یەکەمی و پێشرەویی تیا وەرگرتووە کە بەوە (ڕەدیف) واتە هاوچەشن وتراوە.
لەسەر ئەم هەڵبەستەی (کوردی)ش لە نێوان هەڵبەستەکانی (سالم)دا، هەڵبەستێکی لە هەمان

کێش و پاشبەند و بیر و وشە و کەرەستە هەیە کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

ڕای گرت بەســـتەم جانـــا، چاوی ڕەشی فەتتانت

بۆ قەلبی دڵی زارم صەف صەف صەفی موژگانت

هەرچەندە نازانرێ کە کامیان لە پێش ئەوی تردا وتوویانە، بەڵام ئەمی (کوردی) ئەگەر پێش ئەوی (سالم) نەکەوێ لە جوانی و باڵاییدا بێگومان لێی دواناکەوێ.

هەروەها (حەریق)یش هەڵبەستێکی وای هەیە کە سەرەتاکەی:

قوربان وەرە قوربانە سا بمکە بەقوربانت

ڕەنگین کە بەخوێناوم کـــاکۆڵی پەرێشانت

کە ئەمی (کوردی) و (سالم) لەوی (حەریق) باڵاترن، لەگەڵ جوانیی ئەویشدا... ئەمجا ئەم باسی (چاولێکەری-یا-ڕەدیف-(هاوچەشن)ەش پێویستی بەلێکۆڵینەوە و بەراوردی تایبەتی هەیە لە وێژەی کورددا هی هۆنەرێک لەگەڵ هی خۆی لەگەڵ هی هۆنەری تری کورد و ئەمجا هی کورد لەگەڵ بێگانە و بەتایبەتی گەلە ئیسلامییەکان.

بۆیە پێشنیارم بۆ کۆلیجەکانی کوردستانە کە ئەم کارە بسپێرن بەیەکێ لە (خوێندکار)ە (وێژەوان) یا (هۆنەر)ەکانیان و کەلوویەکی پچڕاوی تۆڕی هەڵبەستی شاعیرانی کوردمان بۆ هەڵدەگێڕێتەوە.

١٠

## گرفتارم

١- گــرفــتــارم بەنازی چاوەکــانـی مــەست و فــەتتــانت
بریندارم بەزەبری ســـینەدۆزی تیـــری مـــوژگـــانت

٢- بەزولف و پەرچەم و ئەگــریجــەکــانت غــارەتت کــردم
دڵێکم بوو ئەویشت خـســتــە نێــو چاهـی زەنەخــدانت

٣- گـرۆهـی عـاشــقــان ئەمــڕۆ هـەمــوو هـاتوونە پابۆســیت
منیش هاتووم بفــەرمــووی بمکوژن بمکەن بەقــوربانت

٤- لە کـوشـتن گــەردنت ئازادە، بێــتــوو بێـیــە ســەر قــەبرم
بەڕۆژی جــومــعــە بمنێــژن لە لای قــەبری شــەهیــدانت

٥- کـەسێ تۆ کـوشـتـبێـتت ڕۆژی مەحشـەر زەحـمـەتی نادەن
ئەگــەر وەک من لە ئەم دونیـایە ســووتابێ لە هیــجــرانت

٦- مــحــەللی ســەجــدەگــاهـم خـاکی بەر دەرگـانەکـەی تۆیە
ڕەقــیب ڕووی ڕەش بێ، ناهێــڵێ بگا دەســتم بەدامــانت

٧- دڵم مــەشکێنە، چونکە مــەخــزەنی دەرد و غــەمی تۆیە
فیدای شەرت و وەفات بم، چی بەسەر هات عەهدی جارانت؟

٨- بەســە بێ مــروەتی جــانا ئەســیــری تۆیە دڵ بۆیە
(وەفا) کەی (چاکە) تا ماوە بکەی (کوردی) بەمیـهمـانت

.................................................................

١- سینەدۆز: سنگ، کونکەر، ناوی جۆرە تیرێکی تایبەتی بووە یا ئەو تیرەی بەر سنگ دەکەوێ.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/٥، ش، ق/٤ و گۆڤاری دەنگی گێتی تازە، ژمارە/٢ی مایسی ١٩٤٤) من (عن)م کردە بنکەی ئەم هەڵبەستە.
هەرچەندە بەپێی لاپەڕەیەکی دەسنووسی مامۆستا (ڕۆژبەیانی) کە لە ١٦/مایس/١٩٦٨دا نووسیویەتەوە، لەگەڵ وتارێکی دەسنووسی مامۆستا (محەمەدئەمین کاردۆخی) کە لە ٣٠/١٠/٩٧٩دا بۆ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی نووسیوە و کە نازانم چاپ کرا یان نەکراوە؛ وە گۆڤاری دەنگی گێتی تازە، ژمارە/٢ مایسی ١٩٤٤ لە ئەم سێ سەرچاوەیە ئەم

هەڵبەستەیان بە هی ماه شەرەفخانم (مەستوورە) داناوە، بەڵام وەک لە دواترا جێگیری دەکەم کە ئەگەر هی (کوردی)ش نەبێ دیسان هەر هی (مەستوورە) نییە، لەگەڵ ئەوەشدا مۆرکی (کوردی)ی پێوەیە، کە لە ناو هەموو ئەندامەکانی (کۆڕی زانیاری)دا، تەنیا تاکە ئاگەدارییەک پێشکەش بەم بەرهەمە کرابێ، ئەم نووسینەی (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی)یە کە وەک لەم ساخکردنەوەیەمدا دەردەکەوێ، ئەمیش بەتەواوی هەڵە و ناڕاست و تێ نەگەیشتووانە بوو.

ئەم تاکەی سەرەوە لەوەکەی (ڕۆژبەیانی)دا نییە.

(مەست و) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (مەستی).

(زەبری) لە (ش)دا: (زەخمی)یە.

(سینەدۆزی) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (هەردوو چاو)ە.

(سینەدۆزی) لە (ش)دا: (سینەدۆز)ە.

تیری موژگانت لە (ش): (تیر مژگانت)ە.

٢- چاهی زەنەخدان: چاڵی سەر چەناگە.

ئەم تاکە لە دەسنووسەکەی (ڕۆژبەیانی)دا (یەکەمین)ە.

(پەرچەمو) لە (ش)دا: (پەرچەم)ە.

(غارەتت) لە (ش)دا: (غارەتی)یە وە لە پەراوێزیشەوە نووسیویە: نسخە = غارەتت.

(غارەتت) لە (ق/٤)دا: (غارەتی).

(ئەویشت) لە (ش)دا: (ئەویچت)ە.

(چاهی) لە (ش)دا: (چاە)ە.

(چاهی) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (چایی)یە.

٣- گرۆه: کۆمەڵ، دەستە.

ئەم تاکە لە دەسنووسەکەی (ڕۆژبەیانی)دا سێیەمینە و لە (دەنگی گێتی تازە)دا دووەمینە.

(گرۆهی) لە (ش، ق/٤، کاردۆخی، دەنگی گێتی تازە)دا: (جەنابی)یە.

ئەمڕۆ لە (ش)دا: (امر)ە.

ئەمڕۆ لە (عن)دا: (لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = بیستم).

هاتوونە لە (ڕۆژبەیانی، دەنگی گێتی تازە): (هاتن بە)یە.

پابۆسیت لە (ڕۆژبەیانی، کاردۆخی، دەنگی گێتی تازە)دا: (پابۆست)ە.

منیش لە (ش)دا: (منیچ)ە.

هاتووم لە (ش)دا: (هاتون)ە.

هاتووم لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (هاتم)ە.

(بفەرمووی) لە (ش، ڕۆژبەیانی، کاردۆخی)دا: (بفەرمو)ە.

(بفەرمووی) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (بفرمون)ە.

(بمكوژن) له (ش)دا: (بمكوژ)ه.

ئەم تاكە لە دەسنووسەكەی ڕۆژبەیانیدا سێیەمینە.

گورۆهـ: كۆمەڵ، دەستە،....

گورۆهی (ڕێشاوی، قەرەداغی، كاردۆخی): جەنابی.

عاشق (ع): دڵدار، عاشقان دڵداران.

ئەمرۆ (ڕێشاوی): امر–دیارە هەڵەی نووسینە.

ئەمرۆ (   ) لە پەراوێزەوە لە جێی ئەم (ئەمرۆ)یە نووسیویە: نسخە = بیستم.

هاتوونە (ڕۆژبەیانی) (هاتن بە).

پابووسیت: (پا = پێ) و (بووسیت = ماچكردنت) واتە پێ ماچكردنت.

پابووسیت (ڕۆژبەیانی، كاردۆخی) پابۆست.

منیش (ڕێشاوی): منیچ. ئەم وشەیەش زاراوەیەكی سنەییانەیە و بەڵام ئەگەر هەموو هەڵبەستەكە بەم زارگوتە بووایە ئەبوو لە دوای ئەم (منیچ)ەوە لە جێی وشەی هاتووم وشەی (هاتگم) بووایە كە ئەمیش سنەییانەیە، بەڵام وا دیارە ئەم هاتنی چەند وشەیەی زارگوتی سنەییانەیە دەسكارییە و بەڵام بەتەواوی نەكراوە.

هاتووم (ڕێشاوی): هاتون–ئەمیش هەڵەی نووسینە.

بفەرمووی (ڕێشاوی، ڕۆژبەیانی، كاردۆخی): بفەرموو.

بمكوژن (ڕێشاوی): بمكوژ. دیارە هەڵەی نووسینە.

قوربان: باڵا گەردان.

٤– ئەم تاكە لە (ڕۆژبەیانی) و (كاردۆخی)دا نییە، لە (دەنگی گێتی تازە)دا سێیەمینە.

(ئازادە) لە (ش، ق/٤)دا: (ئازاد)ە.

ئازادە لە (دەنگی گێتی تازە)دا: ئازا دەكەم.

(بێتو بێیە) لە (ش، ق/١)دا: (بەشەرتێ بێ یە)یە.

بێتو لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (گە بێ تە)یە.

بەڕۆژی لە (ش، ق/١)دا: (لە ڕۆژی)یە.

بمنێژن لە (ش)دا: (بمنێژی)یە.

(قەبری) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (نەعشی)یە.

٥– ئەم تاكە لە (ڕۆژبەیانی و دەنگی گێتی تازە)دا نییە و لە (كاردۆخی)دا شەشەمینە و دوا تاكە و نووسیویە گوایە دوو تاكی تری ماوە و دەستی نەكەوتوون.

(كەسێ) لە (كاردۆخی)دا: (كەسێك)ە.

(كوشتبێتت) لە (ش، ق/١)دا: (كوشتوێتت)ە.

(ئەگەر وەك من لە ئەم دونیایە) لە (عن)دا: (لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = لە أم دنیا اگر وک بندە).

(ئەگەر وەک من لە ئەم دونیایە سووتا بێ) لە (ش)دا: (ئەگەر وەک من کە سووتا بێ لە ئەم دونیا).

(ئەگەر وەک من لە ئەم دونیایە سووتا بێ) لە (ق/٤)دا: (ئەگەر وەک من کە سووتابێ لەم دونیا)یەیە.

٦- ڕەقیب: مەبەستی، دوژمن، بەدکارە.

ئەم تاکە لە (ڕۆژبەیانی)دا چوارەمینە و لە (کاردۆخی)دا نییە.

محەللی لە (ڕۆژبەیانی، دەنگی گێتی تازە)دا: (هەمیشە)یە.

خاکی لە (عن)دا: (لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = چاکی. کە چاک مەزاری پیاوچاکانە کە هەڵەیە.

ناهێڵێ لە (ڕۆژبەیانی)دا: (نائێڵێ)یە.

ناهێڵێ لە (ش، دەنگی گێتی تازە)دا: (نایلی)یە.

ڕووی ڕەش بێ ناهێڵێ لە (ق/٤)دا: (ناهێڵێ رووی ڕەش بێ)یە.

٧- ئەم تاکە لە (ڕۆژبەیانی)دا پێنجەمینە و لە (کاردۆخی)دا نییە و لە (ش، ق/٤)دا دوا تاکە و لە دەنگی گێتی تازەدا شەشەمینە.

وەفات بم لە (ش)دا: (وفات بم)ە.

(فیدای شەرت و وەفات بم) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: (فدایی شەرتەکەت بم).

عەهدی جارانت لە (ش، ق/٤)دا: (شەرتی جارانت)ە.

(عەهدی) لە (دەنگی گێتی تازە)دا: شەرتی.

(عەهدی) لە (ڕۆژبەیانی)دا: (مەیلی)یە.

نیوەی یەکەمی ئەم تاکە لە (دەنگی گێتی تازە)دا بەم جۆرەیە:

(لە شەرت و هەم وەفاداری تو خو مەشهوری ئافاقی).

٨- ئەم تاکە لە (ش، ق/٤، ڕۆژبەیانی، کاردۆخی)دا نییە، بەڵام لە (ڕۆژبەیانی)دا ئەم تاکەی دوایی لە جێگەی دوا تاک نووسراوە:

«بڕۆ (مەستوورە) شوکرێ کە لە دەرگا پادشای داوەر
کە شوعلەی ڕۆژی ڕووی (والی) دەگاتە کۆشک و ئەیوانت»

(کە شوعلە ڕۆژی ڕووی) (دەنگی گێتی تازە)دا: لە ڕۆژی روئیەتی.

ئەمجا ئەم تاکەی (مەستوورە) بەنازناوی خۆیەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو، لە هاوچەشن (ڕەدیف)ی (کوردی) پارچە هەڵبەستێکی داناوە و لەوانەیە سەرەتای ئەم هەڵبەستەی (کوردی)ی وەرگرتبێ و بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم هەڵبەستەی (کوردی) بە هی (مەستوورە) دابنرێ، هەرچەندە پایەی ئەم تاکەی (مەستوورە) ناگاتە پایەی هەر یەکێ لە تاکەکانی ئەم هەڵبەستەی (کوردی).

١١

## کوێر بوو دیدەم

١– کوێر بوو، دیدەم وەکو (یەعقووب) بەخودای (دیدەکە) بۆت
سا بنێرە وەکو (یووسف) بەشفای دیدەکە (بۆ)ت
٢– دڵ کە جێ خۆت بوو، بەئاگری غەمی هیجرانت سووتاند
بۆچ بەدەس خۆت دەخەی ئەم ئاگرە نێو مەنزڵی خۆت
٣– دڵ لە دەست تورکی دوو چاوت چ دەبوو حاڵی ئەگەر
نەبووایە سەری تیری مژە وو تیغی برۆت؟
٤– بەرگی ڕووتی بەهەزار خەرقەیی شایی نادەم
چونکە مەحبووبە بەناز، پێم دەڵێ گاهێ: (مچە ڕووت)
٥– من وتم: کوشتمت، ئەو پێ دەکەنی و، صەبرێ وتی:
(کۆنە کرپاچ) ئەمە ساڵێکە بەڵەد بووم لە درۆت
٦– شەمعی مەیخانە فتیلەی نەبوو، تا دوێنێ شوکور
شێخی خۆمان، بەشەراب: دەلقی گەدایی دەفرۆت
٧– ئەمڕۆ (ئاوا)یە لە ئەربابی دڵان، (مەیکەدە)مان
بۆیە سەرگەردی بەری پێتە؛ (دڵ) و، نایکەیە گۆت
٨– کە ڕەقیب دیی؛ (من و یار) پێکەوە نیشتووین لە ڕقا
وەک سەگێ پەت بکرۆژێ، دەم و لێوی دەکرۆت
٩– دڵی (کوردی) کە گرفتاری جبەی قرمزیە
بۆچ دەکا مەنعی، بەخوێنی دڵ، ئەگەر بەرگی بشۆت

---

١– بۆت: بۆ تۆ، وەک چۆن یەعقووب لە دووریی یوسف کوێر بوو.
(بۆت)ی دووەم بەواتە (بۆنت) وەک چاکبوونەوە چاوی لە (بۆنی) کراسەکەی یووسفە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (گل/٣، ف، نم/١، با) و، (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لەمانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە.

بەپێی وتەی دەماودەمی وێژە دۆستە كۆنەكان بۆم ساخ بووەتەوە كە (كوردی) ئەم هەڵبەستەی بۆ (ئەحمەد پاشا)ی بابان نووسیوە، كە داوای (خەرقە)یەكی لێ كردووە و ناوەڕۆكەكەشی ئەم ڕاستییە دەردەخا.

(كوێر بوو دیدەم) لە (ف، جلی، نم/١، كم)دا: (كویر بووم)ە.

(كوێر بوو دیدەم) لە (گ/٢، س)دا: (كوێر بوە)ە.

(كوێر بوو دیدەم) لە (گ/٣)دا: (كوێر بوە هەر)ە.

(بەخودای) لە (ف، گ/٢، س، گ/٣)دا: (بەخودا)یە.

(دیدەكە بۆت) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (دیدە لە بۆت)ە.

یەعقووب كە باوكی حەزرەتی بوو كە بەنگوم بوونی یووسف كوێر بوو.

(یووسف) براكانی خستیانە چاڵاوێكەوە و بەیەعقووبی باوكیان وت كە یووسف گورگ خواردوویەتی، بەڵام كە یووسف لە كاتێكدا بووبوو بەعەزیزی میسر و كراسێكی خۆی بۆ باوكی نارد، بەبۆنی ئەو كراسە چاوی چاك بووەوە.

٢- (خۆت بوو) لە (نم/١)دا: (خۆتە).

(ئاگری) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (ئاوری).

(هیجرانت) لە (ف، كم، نم/١، گ/٢، جلی، س، گ/٣)دا: (هیجرت)ە.

(بەدەس) لە (ف، كم، نم/١)دا: (بەدەستی).

(بەدەس) لە (جلی، گ/٣)دا: (بەدەست)ە.

(ئاگرە) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (ئاورە)یە.

(نێو) لە (ف، كم، نم/١، گ/٣، جلی)دا: (ناو)ە.

٣- (سەری) لە (با)دا: (سوپەری).

(سەری) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (لەسەری)یە.

(موژەوو) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (موژەت)ە.

٤- خەرقە: جبە، پۆشاكێكی سەرەوەی زانا و هۆنەر و گەورەپیاوان بووە.

شایی: پاشایی، شایی (ئاهەنگ).

(مچە): سووككراوەی (مستەفا)یە كە ناوی هۆنەرمان (كوردی)یە، و لەبەر خۆشەویستی، ئەم جۆرە ناو كورت كردنەوەیە، بەكار براوە و، دەبرێ.

(شایی) لە (ف، نم/١)دا: (شاهی)یە.

(شایی) لە (كم، گ/٢، س، گ/٣)دا: (شادی)یە.

پاشبەند (سەروا)ی ئەم تاكە بەپێی وێژەی كۆن كە هاودەنگ و هاوئاهەنگی سەروای تاكەكانی تری ئەم پارچە هەڵبەستە نییە، پێی ئەوترێ (ئیقوا) و ئەمەش هەرچەندە لاوازییە، بەڵام دەشێت.

ڕووت: ڕووتوقووت، هەروەها بەواتای (ڕووی تۆ)یش دێ.

٥- کرپاچ: بەرەڵلا.

(وتم) لە (گل/٣)دا: (کوتم). وە لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = (وتم).

(کوشتمت) لە (گ/٣)دا: (کوژتمت)ە.

(پێدەکەنی) لە (نم/١)دا: (پیدەکی)یە.

(پێدەکەنی) لە (گل/١)دا: (پیکنیو)دا- لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = (پیدکنیو).

(وتی) لە (گل/٣)دا: (کوتی)یە و لە پەراوێزەوە نووسیویە: نسخە = وتی.

(وتی) لە (ف، کم، نم/١، گ/٢، س)دا: (دەڵێ)یە.

(ئەو پێدەکەنی و صەبرێ) لە (گ/٢، س)دا: (ئەو صەبر و بەبێ دەنگی)یە.

(ئەو پێدەکەنی و صەبرێ) لە (گ/٣)دا: (ئەو صەبر بەبێ دەنگی)یە.

٦- دەلق: سەربەرگێکی هەژاران و، دێوانە و جووکی و پیاوچاکان بووە، جیاوازی لەگەڵ خەرقەدا ئەوەیە کە (دەلق) پێشەکەی یەکالاّ نییە و لە قوماشێکی هەرزانی ڕەنگاوڕەنگ یا پینە پینە دروست کراوە.

ئەم تاکە تەنیا لە (گل/٣ و گ/٣)دا هەیە و لەوانی تردا نییە.

٧- ئاوا: ئاوەدان، ئاوەها، وەها (جوانیی جیناس ئارایی تیایە).

مەیکەدە: مەیخانە-مەبەستی لە کۆڕی ئەو ئەربابانەیە.

گۆ: گۆی یاری شەقێن.

ئەم تاکە تەنیا لە (گل/٣)دایە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٨- دەکرۆت: دەیکرۆژت.

ئەم تاکە لە (ف، کم، نم/١، با)دا شەشەمینە و لە (گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە.

(نیشتووین) لە (نم/١)دا: (دانیشتووین)ە.

(لە ڕقا) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (لە ڕقان)ە.

(دەکرۆت) لە (کم، نم/١، با)دا: (کرۆشت)ە.

٩- قرمز: سوور = ڕەنگی سووریش لە ناو بەندیوارەکانی ڕێباز (طریقە)ی (قادری)دا باوە و، (کوردی)ش پەیوەندی دەروونیی بە(غەوث)ەوە بووە کە سەرەکی ئەم ڕێگەیەیە.

ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا، دوا تاکە، بەڵام لە (ف، کم، نم/١، با)دا حەوتەمینە و لە (گ/٢، س، گ/٣)دا هەشتەمینە.

(دەکا) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (دەکەن)ە.

(ئەگەر بەرگی) لە (س)دا: (ئەگار بەرگی)یە.

(بەرگی) لە (ف)دا: (برگ)ە.

(بشۆت) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (دەشۆت)ە.

١٢

## بەداوی زولف

١- بە(داو)ی زوڵف و، (دانە)ی خاڵی سەر ڕووت
گرفتارە دڵی صەد عاشقی ڕووت
٢- نیگاهی چاوی مەستی نیمە خوابت
هەزاری وەک منی خستووەتە تابووت
٣- صەبا گەر لابدا زولفت لە کوڵمت
دەڵێم: یا (ماهە) یا (خورشیدە) ئەنگووت
٤- شکاندت لەشکری عەقڵ و شەکیبم
بەطابووری موژە و، شمشێری ئەبرووت
٥- لە نێو چاهی زەنەخدانت ئەسیرن
هەزارێکی وەکو (هاڕووت) و (ماڕووت)
٦- مەهە، یا ڕۆژە، یا ڕووی تۆیە، دەرکەوت؟
شەوە یا زوڵفە یاخۆ موویی دڵجووت؟
٧- فەمە یا نوقڵە، یاخۆ خونچەیی کام؟
ئەوە دندانە، یا دوڕ یانە یاقووت؟
٨- بڵێم باڵاتە، یا سەرووی خەرامان؟
ترنجە، یا مەمانی تازە (قوت) بوون؟
٩- فیدای دەست و کەمانت بێت (کوردی)
دەپێکێ سێ و دوو هەم تاق و هەم جووت

---

١- سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/٣، گل/٩، ن، جلی، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لەمانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەم.
(زوڵف) لە (گ/٢، س)دا: (ڕووت)ە.

**هەڵسەنگاندن:**

وەستایی و جوانی لەم تاکەدا (داو)ی واتە مووی گێسوو و، (دانە) واتە دەنکی خاڵی سەرڕووە

لەگەڵ گرفتاری (بەداوەوەبوونی) دڵ وەک مەل لە (داو)دا، جگە لە جیناس ئارایی (ڕووت = ڕوخسارت) و (ڕووت = ڕووتوقووت، بێ بەرگ) و (خاڵی) واتە دانەپۆشرابێ بەزولف، کە وتوویە (سەر ڕووت) واتە سەری خاکە ڕووتە و بەسەر ڕووەوەیە لەگەڵ (ڕووت)ی ڕووی (تۆ) و (ڕووت)ی (عاشق)ەکە.

٢- نیمە خواب: خەواڵوو، (بەخومار) کە جوانییەک دەدا بەچاو. چاوی بەخومار، چاوی نەرم.

٣- خورشید: خۆر.

ئەنگووت: هەڵات، وەک مانگ یا ڕۆژ هەڵهاتن.

(کوڵمت) لە (گ/٢، س، گ/٣، جلی)دا: (کوڵمەت)ە.

مەبەست لە سپێتی و تیشکدەریی ڕوومەتی و ڕەشیی زولفەکەیەتی کە بەدەم شنەی بادی دەشتەوە بشنێتەوە، بەلای (کوردی)یەوە وەک کاتی هەڵاتنی خۆر یا مانگە.

٤- شەکیب: خۆڕاگرتن.

طابوور: بەشێکە لە سوپا (لەشکر).

شمشێر: چەکێکی بڕندەیە وەک شیر بەڵام لە شیر پانترە.

ئەبرووت: ئەم وشەیە دەبێ فارسی ئامێزانە بەشێوەی (نابووت)دا دەرببڕدرێت، ئەگەر نا سەروا (پاشبەند)ی هەڵبەستەکە دەکاتە (ئیقوا) بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

ئەم تاکە لە (جلی)دا شەشەمینە.

لەوانەیە لە سەرێنی (کوردی)دا (ئەبرووت)یش بەکارهێنرابێ بەواتای (ئەبرۆت)، مەگەر لەبەر (پاشبەند)ی هەڵبەستەکە بەشێوەی (ئەبرووت) هاتبێ.

٥- هاڕووت و ماڕووت: لە ئەفسانەدا ناوی دوو فریشتە (ملائیکە)ن لە کاتێکدا کە سلێمان پێغەمبەر دژی جادوو (سیحر) کاری بوو؛ خوا ناردنی لە شێوە و بەرگی مرۆڤدا بۆ هاریکاریی سلێمان کە خراپیی جادووکاری لە خەڵک بگەیەنن و ئامۆژگارییان بکەن، بەڵام ئەم دوو فریشتەیە ئافرەتێکی جوان هەڵی فریوانن و خستنیە خراپکاری و لەسەر ئەوە خوا لێیان ڕەنجا و گوایە لە چاڵێکدا سەرەوخوار هەڵی واسیون (گوایە جادووگەریش بوون لە وڵاتی بابل و لەوێش کراون بەدارا) و کوردی خۆی بەوان چواندووە لە بەندکراویدا.

(ئەسیرن) لە (ف)دا: (أسیرە)یە.

هەزارێکی (کم، جلی، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا: (هەزارانی)یە.

نیو باڵی یەکەم لە (جلی)دا بەم جۆرەیە (لە چاهی ژیری لێوت دا اسیرن).

ئەم تاکە لە (جلی)دا پێنجەمینە.

سەرچاوەکان شوێنی ئەم دوو فریشتەیەیان بەم شوێنانە ناونووس کردووە لە (بابل) یا (عیراق) یا نێوان (نصێبین) و (ڕەئسلعەین)دا کە چاویان بەئافرەتێکی جوان کەوتووە و شێفتەی بوون و ئافرەتەکەش خۆی بۆ شل کردوون بەو مەرجەی کە:

یا پەنا بۆ ئەو (بت)ە بەرن، یا بادە (مـەی) بخـۆنەوە تا لە گـەڵیـدا ڕێک بکەون، ئەوانیش (بتپەرستی)یەکەیان پێ گوناهێکی گەورە بووە و بادە خواردنەوەکەیان لە لاوە گوناهی کەمتر بووە.

کاتی (خـواردیانەوە) مـەست بوون کەوتنە کـوڕنوش بۆ بتەکـە، کە خـەریک بـوون دەس لەگەڵ ئافـرەتەکـە تێکەڵ کـەن، کـابرایەک هـات بەسـەریاندا و سـەرزەنشـتی کـردن کـەوا خـۆیان بەپەروەردەکار دادەنێن و لەو بارەشدا دەژین، ژنەکەش لەو دوو فریشتەیەی گەیاند ئەگەر ئەو کـابرایە لـە ناو نەدەن، هەرسـێکیـان ئابڕوویان دەچێ و ئەوانیش گـورج کـابرا دەکـوژن و کـە دەگەڕێنەوە ژنەکە نەماوە.

ئەمجا خـوا لەسەر ئەوە ئافەرۆزی کردوون. بەتاوانی (هاوتا بۆ خـوا پەیاکردن) و (خواردنەوەی مەی) و (داوێن پیسی) و (پیاوێکیشیان کوشتووە)، بۆیە خوا سـەرپشکی کردن لە هەڵبژاردنی (سـزای جیـهانی) یا (سـزای ئەوە جیـهان)دا و ئـەوان سـزای (ئەم جیـهانیـان) بەخـۆیان ڕەوا بینیـوە و ئیـتـر کـەوتوونەتە خـەڵک فـێـری (جـادووگـەری) و (ئاشـووب نانەوە) و، یـا بە (هەڵواسـراوی لە سـزادان) و، (زنجیـر) و (پالەهـەنگ کراون) و، یـا لە ناو یەکێ لە بیـرەکـانی بابلدا سەرەوخوار هەڵواسراون بەسزاوە.

(کـوردی)ش خـۆی بەیەکێ لـەو هەزارانەی وەک هـاڕووت و مـاڕووت داناوە کـە بەو هەمـوو سـیـحـرزانیـیـەوە و فـریشـتـەش بوون و کـەچی ئەو ژنـە جـوانە تەنیـا بەجـوانیـی چاڵی سـەر چەناگەی، ئەو هەمووەی لە خشـتەبردن و ئاراسـتـەی ناو ئەو چاڵەی کردوون و لە سـزای وەک (هاڕووت) و (ماڕووت)دان.

٦- دڵجوو: یا دڵجـۆ بەواتە دڵڕفێن. کە مـەبەسـتیش لەو مـووانەیە کە لـەگەڵ (دڵ)ەکەی کوردیدا، جووتن و دڵەکەیان تیا بەندە.

٧- کام: هیوا، دەم.

یاقـووت: یا خـواردن و، بەردێکی بەنرخ (گـەوهەر)ە لەبەر نایابی و سـەخـتی و ڕەنگ تـەڵخ نەبوونی، لە کـەرەسـتـەی خشڵ و ئارایشت و پیـشـەسـازیدا بەکار دەهێنرێ و ڕەنگی پەسـەند سوور و پەمەییە وەک لێو، کە لەپێشترا لەسەریم نووسیوە.

(فەمە یا نوقڵە) لە (ف، جلی)دا: (دەمە یا نوقڵە)یە.

(خونچەیی) لە (جلی)دا: خونچیە.

(دندانە) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (دەندانە)یە.

٨- سەروو: دارێکی باڵا بەرز و جوانە، مەبەست لە باڵای بەرزییە.

خەرامان: لەنجەولاری بەنازەوە.

ترنج: یەکێکە لە میوە ترشینەکان (حمضیات) و مەبەس لە خڕی و جوانی و بۆن خۆشی و پڕ چنگییە، وەک مەمکەکانی ئەوە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل/٣، گل/٩)دایە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لەوانی تردا نییە.

٩- کـەمـان: کـەوان-مـەبـەست لە تیـروکـەوانە کـە چەکـێکی کـۆن بووە، هەرچەندە لە سـەرێنی (کـوردی)شـدا بـەکـار نـەهێنراوە کـە ئـەوسـا تـفـەنگ و تۆپ هەبـوو، بەڵام هـۆنەرانی دێرین لاساییەکیان کردووەتەوە.

سێ و دوو: وەک دوودڵ بوونێک، یەکێ بەیەکێ دەڵێ: سێ و دوو دەکا.

هەم: خەم، دیسان.

ئەم تاکە لـە (ف، نم/١، با، گ/٢، س، گ/٣)دا هەشتەمینە و لە هەموو سـەرچاوەکانیشدا دوا تاکە.

(بێت) لە (ف، جلی، گل/٣)دا (باد)ە.

(دەپێکێ) لە (جلی)دا: (دەبیکە)یە.

(دەپێکێ) لە (کم)دا: (دەپیلی)یە.

(سێ) لە (کم، با، نم/١)دا: (سیە)یە.

(سێ) لە (جلی)دا: (سە)یە.

**واتای ئەم تاکە:**

ئەم تاکـە، یەکێکە لـە هەڵبەسـتانـەی (کوردی) کە واتەیان ئاڵۆزکاوە و خۆشبەختانە مامـۆستـا عـەبدولڕەزاق بیـمـار لە گـۆڤـاری (نووسـەری کورد)ی ژمـارە (٣) سـاڵی ١٩٧١دا لە ژێر ناوی (دەسنـووسـێکی غـەزەلی کـورد)دا لە بـارەی ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـەوە کـە لە کـەشکۆڵێکی (خانەوادەی جەلیزادەی کۆیە)دایە، نووسیویە:

بەڕێککەوت لە بەرامبەر ئەم تاکە شیعرەی کوردیدا لە هەمان دەستنووس، مامـۆستـایەکی بێ ناو ئەو پەراوێزەی نووسیوە، کە ویستوویەتی مانای شیعرەکە لێ بداتەوە، جا بەپێویستم زانی وەکو خۆی لێرەدا بینووسمەوە، دەڵێ:

«ئەگەر یەکێک کەوان و تیر بەدەستەوە بگرێ، بۆ یەکێکی بهاوێژێ بۆ کوشـتنی، یەکێکیش بەو کەسـە بڵێ: فـلان کـەس ئەم جـارە (جـەب)ی بکە (وازی لێ بهـێنە، ڕزگـاری بکە) و کـەلیـمـەی (جەب)یش (جیم)ە و (بێ)یە (جیم)ەکەش تاقە کە (بەحیسابی ئەبجەدی) دەکاتە عەدەدی (٣) و (بێ)یەکەش جووتە کە دەکاتە عەدەدی (٢)».

کە بەلای ئێمەوە ئـەو مامـۆسـتـا بێ ناوەی بەر لە (٧٠-٨٠) سـاڵ پـتر ئـەمـەی نووسـیـوە جـوانی بۆچووە.

# تیٚ

١٣

## چێشتم ئەمڕۆ

١- چێشتم ئەمڕۆ ژەهری (مار) و، ڕۆحی شیرینم نەهات،
زەخمی کۆنەم هاتە ژان و، مەرهەمی برینم نەهات
٢- من غەمم خوارد و غەمیش خوێنی جگەرمی خواردەوە
بۆیە گریام چەند بەچەند فرمێسکی خوێنینم نەهات
٣- غەم سەری لێ دام و، یارم قەت سەرێکی لێ نەدام
صەبر و هۆشم ڕۆیوە، غارەتکەری دینم نەهات
٤- دڵ دەسووتێ چین بەچین دەشکێتە سەریەک وەک فەنەر
صاحێبی ڕووی ئاتەشین و زوڵفی چین چینم نەهات
٥- جەرگ و دڵ هەردوو لە نێو نافەی دەروونDا بوونە خوێن
شەممەیێ لەو مسکی (نافە)ی ئاسکەکەی چینم نەهات
٦- دیدە وەک هەوری بەهاران خوێن دەبارێنی و صەدای
پێکەنینی غونچەیی نەوسەبزە پەرژینم نەهات
٧- گۆی سەرم، چەوگانی میحنەت دایە بەر خۆی، ڕای فڕاند
ئەلعەجەب؟ بۆ شەهسواری خانەیی زینم نەهات؟؟
٨- بۆچمە؟ گیان و لەشی بێ دڵ؟ دڵیش بەندی ستەم
هێندە بێزارم بەزەهریش خاتیمەی ژینم نەهات
٩- کەوتمە وضعی نەزع و غەم خستمیە حاڵی غەرغەرە
(کوردی) بێکەس خۆم لە هیچ لایێ صەدای شینم نەهات

---

١- چێشتم: چێژتم، چێشکەم کرد، تامم کرد-وە بەڕێنووسی کۆن (چشتم)ە کە بەم دوو جۆرەی

تریش دەخوێندرێتەوە و لەگەڵ واتەی هەڵبەستەکەدا دەگونجێن. چێشتەکەم، شیوم، خواردنی چێشتم... شتومەکم، کە هەر مەبەست لە چێژتنی زەهرەکەیە (چشتم).

زەخم: برین، زام.

**جوانکاری لەم تاکەدا:**

لە وشەی چێشتم و یەکخستنی (مەرهەم) و (برین) و (مار) و (مەرهەم) و (زەهر) و (شیرین) و... هتد دایە.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە: (عن، گل/١، گل/٦، گل/٧، گل/٨، مد/١، گل/٩، ف، ر، عق، جلی، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، ژ، سا، و/١، و/٢ و لە دەمی چوار مامۆستای باوەڕ پێکراوەوەیە–هەرچەند (ر) بە هی (فیکری)ی داناوە بەڵام لە لاپەڕەیەکی ترا کردوویەتەوە بە هی (کوردی) و (عق) بەهەڵە بە هی (نالی)ی داناوە و من (کم)م کردە دەسکەلا و لە (و/١) و (و/٢)دا بەهەڵە بە هی (وەفایی) لە چاپ دراوە.

جگە لەوانەی لە بارەی ژەهر خواردنەوەی (کوردی)یەوە چاپ کراون، دیسان لە مامۆستایان (مەلا فەتحوڵڵای پاوەیی) ئیمام و مودەڕیسی مزگەوتی بن طەبەق (هەرمنی) لە سولەیمانی و لە (مەلا عەبدولڕەحمانی بیارە–چۆڕێ) کە مستعد بوو لەو مزگەوتە و من بۆ ئەم هەڵبەستە (کم)م کردە بنکە و دروستکەری لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە. لە (مەلا عەبدوڵڵای ڕەشەکانی)م (شالاّبەگی) لە سولەیمانی لە ساڵەکانی ٩٣٥–١٩٣٩دا و لە (عەلی کەمال باپیر آغا)لە ١٩٤٧دا لە هەڵەبجە بیستوومە کە (کوردی) وەک لە هەڵبەستەکانیدا دیارە، لە بارێکی دەروونی (نەفسی)ی ناهەمواردا ژیاوە، بۆیە جارێکیان ویستوویەتی بەخواردنەوەی پیاڵەیەک ژەهر خۆی بکوژێت و، ئەم پارچە هەڵبەستەشی لە دوای ژەهر خواردنەوەکەی داناوە کە پێی نەمردووە، گوایە خۆی وتوویەتی: (ئەم ژەهرەش دەخۆمەوە و نامکوژێ، چونکە ئەوەندە سەرسەختم و ئەبێ دەرد و جەخاری تر زۆر بنۆشم بۆیە ژەهر کارم لێ ناکا).

ئیتر لەم جۆرە وتووێژانەی بەدواوە زۆرن وەک ئەوەی دەڵێن گۆیا (وەلی) بووە، بۆیە ژەهر کاری لێ نەکردووە و... هتد.

(چێشتم) لە (گ/٣)دا: (چێژتم)ە.

(ئەمڕۆ) لە (ژ)دا: (امرو)یە.

(ئەمڕۆ) لە (عق)دا: (ئەمشەو)ە، (ژەهری) لە (عق)دا: (زهری)یە.

(مار و) لە (ف، جلی، ر، مدا)دا: (مەرگ و)ە.

(ڕۆحی) لە (و/١، و/٢)دا: (یاری)یە.

(زەخمی) لە (و/١، ژ، گ/٢، و/٢، س، گ/٣)دا: (زامی)یە.

(کۆنەم) لە (و/١، و/٢)دا: (کونم)ە.

(کۆنەم) لە (عق)دا: (کنم)ە.

(مەرهی) لە (مد/١)دا (مرهمی)یە.
(برینم) لە (کم)دا: (برنیم) دیارە هەڵەی چاپییە.
ئەگەر ئەو (ژەهر)ەی خواردوویەتەوە هی مار بووبێ، بۆیە کاری لێ نەکردووە کە لە ناو دەمییەوە هەتا ناو هەموو کۆئەندامی (هەرس = هەضم)ی بریندار نەبووە، چونکە ئەو زەهرە هەر بە(یەکسەر) چوونە ناو خوێنەوە وەک گەستن (پێوەدانی مار) یا بەدەرزی (شرینقە) لێدان دەکوژێ و تەنانەت لە پزیشکیدا ئەو ژەهرە بۆ چارەی گەلێ دەرد بەکار دەهێنرێ، بەخواردنەوە.
(مار) لە (ف) و (ر)دا: (مەرگ)ە.
ڕۆحی (وەفایی/١، گیو): یاری
لێرەدا تاڵیی زەهر و شیرینیی گیان یەکخستنی جوانییەکی وێژەییی کۆنە.
زەخم: برین، زام، کوڵک،...
زەخمی (و/٢، گ/١، ژ، گ/٢، و/١، ئۆفسێت، گ/٣)دا: زامی- لەوە دەچێ دەسکاری بێ.
کۆنەم: لە (و/١)دا: کۆنم.
ژان: ئازار، سوییی، سفت و سوێ.
مەرهەم: یا (مەلهەم) دەرمانێکی چەورییە کە لە چەورییەکی مەییوی وەک ڕۆنی دار، یا خەڵووزی بەرد، یا لە نەوتی خام (پارافین) یا ڕۆنی خوری (لانۆلین) و، یا مێو و ڕۆنی مەییو (پیو) دروست دەکرێ کە دەرمانی تایبەتی بەپێی پێویست تێکەڵ دەکرێ بۆ چارەی ئاوساوی و برینی ئاوەوە و، دەرەوەی لەش و چاو و نەخۆشیی پێست کە برین و ئاوساوییەکە چاک دەکاتەوە و شوێنەکەی بەنەرمی و هەڵنەقرچان دەهێڵێتەوە.
(برینم) لە (کم)دا: برنیم-و ئەمەش هەڵەی چاپییە.
لە دەربڕینی ئەم نیو باڵە هەڵبەستەدا قورسییەک هەیە کە دەبێ وشەی (مەرهەمی) گورج بەوشەی (برینم)وە بلکێنرێ هەتا لەنگ و قورس نەبی.
زەهر یا ژەهر یا زەهیر: بەکۆمەڵێکی گەورە و لە جۆرەها دەرمان دەڵێن کە بەخواردن یا خواردنەوە یا بەهەر هۆیەک بچێتە ناو زک یا خوێنەوە ئەو زیندەوەرەی کە ئەو زەهرەی تێ دەچێ یا دەیکوژێ یا تووشی برینداری و ڕزین و ئاوسان و ئازار و دەردی دەکات و گورجترین چارە (شیر)ی دەرخوارد بدەی بەڕشانەوە زەهرەکە فڕێ دەداتە دەرەوە.
کە دەوترێ زەهر، تاڵترین شتێک بەبیردا دێت هەرچەندە هەموو زەهرێک تاڵ نییە و بەپێی جۆری زەهرەکە تامی دەگۆڕدرێت وەک تیژ، تفت، تاڵ، ترش و... هتد و تەنانەت تامی زەهری ماریش شرینچکە.
٢- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر) و (عق) و (مد/١)دا سێیەمینە.
(غەمم) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (خەمم)ە.

(غەمیش) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (خەمیش)ە.

(خـوێنی) لـە (گ/٣)دا: (خـووێنی)یە. ئەمـەش لە نـەریتـە جـۆراوجـۆرە زمـانـیـیـەکانـی(تۆفـیق وەهبی)یە.

(جگەرمی) لە (و/١، و/٢)دا: (دەروونمی)یە.

(جگەرمی) لە (گ/٣)دا: (جیگەریی)یە. ئەمەش لەسەر نەریتی (تۆفیق وەهبی)یە کە بەهەڵە لە دوای بەکارهێنانی (ی) (موحتەلەمە) کەوتووەکەی ( گیو) پەیڕەویی دەکرد.

(جگەری) لە (مد/١)دا: (درونی)یە.

(بۆیە) لە (ر)دا: (بویی)یە.

(چەند بەچەند) لە (گل/١)دا: (دم بدم)ە.

(خوێنینم) لە (گ/٣)دا: (خووێنینم)ە.

(خواردەوە) لە (چاپەکانی گیو)دا: (خواردوە).

(خوێنینم) لە (چاپەکانی گیو)دا: (خووێنینم).

ئەم تـاکـە لە (سـا)دا نیـیـە وە لـە (ر) و (عق) و (مـد/١)دا دووەمـینـە و، لە (و/١، و/٢، ژ)دا شەشەمینە و دوا تاکە و، لە (گل/١)دا حەوتەمین و دوا تاکە.

(لێ دام) لە (گل/٧)دا: (لیدان)ە-دیارە هەڵەی نووسینە.

(یارم) لە (گل/١، جلی)دا: (کوردی).- واتە نازناوی (مستەفا بەگ) لێرەدایە، چونکی دوا تاکە لەم دوو سەرچاوەیەدا.

(یارم) لە (گ/٣)دا: (یاریش)ە.

(سەرێکی لێ نەدام) لە (عق)دا: (سری لی هلندام)ە.

(صەبر) لە (ر، عق، نم/١، و/١، ژ، و/٢)دا: (عەقل). ئەمەش دەسکارییەکی هەڵەیە.

(غارەتکەری) لە (ف، ر، نم/١، و/١، ژ، و/٢، گ/٢، س، گ/٣)دا: (غارەتگەری)یە کە فارسی ئامێزە.

ئەم تاکە لە (جلی)دا پێنجەمینە.

(قەت) لە (جلی)دا: (یار)ە.

(دینم) بەواتە (ئاین) و مەبەست لەبڕوا بەئاینی ئیسلامیش دەگرێتەوە لە هەمان کاتدا (دین) بەواتە شێت کە مەبەست لە دڵە شێتەکەی خۆی بووە کە (دینم) بەواتە (شێتم) دەگرێتەوە.

٤- فـەنەر: چرایەکی دەسکرد بوو لە کاغەز یا قوماشی سادەی چەورکراو کە بەجۆرێکی تایبەتی دەق دەکـرا و بەلێـواری مـقـەبایەکی خـڕدا دەلکێنرا و نـاوەندی مـقـەباکـە شـوێن بنە مـۆم چەسپاندنێکی لێ دەکرا و سەرەوەی کاغەز یا قوماشەکە جغزە مقەبایەکی تری پیا دەگیرا کە ناوەندەکەی کون بێ، بۆ جێگەی مۆم تیا داگیرساندن و قوڵفەیەکی پەت یا تەلی لێ بەند دەکرا و ئەو کاغەز یا قوماشە بەنیشاندن (قەدکردنی) دەقەکانی چین چین دەتەپین و بەڕاکێشانی

دەکرایەوە وەک بۆڕییەکی ئەستوور و ئەوەندەی مۆمێکی بەرز، مۆمەکەی تیا پێ دەکرا (دادەگیرسێنرا).

ئاتەشین: ئاگرین مەبەستی کە وەک ڕەنگی ئاگرە.

ئەم تاکە لە (سا)دا نییە و لە (و/١، و/٢، ژ)دا سێیەمینە. و لە (مد/١)دا پێنجەمینە و دوا تاکە.

دەسووتێ (ف، نم/١): ئەسووتێ.

چین بەچین (ر): دائما.

دەشکێتە (نم/١، ژ): ئەشکێتە.

فەنەر (ف): کمر.

فەنەر (نم/١): فەنار.

صاحێبی (ژ): خاوەنی.

صاحێبی (گ/٢، س، گ/٣): خاوەنی.

(زوڵفی) لە (مد/١)دا: (زلف)ە.

(چین چینم) لە (و/٢)دا: (چین حیینم)ە. دیارە هەڵەی چاپییە.

ئەو (فەنەر)ە جگە لە ڕووناککردنەوەی ڕێوبان لە شەوانی تاریکدا، وەک کەرەستەیەکی ڕازاندنەوە (دیکۆری) ئارایشتکار لە هەندێ شوێنی تایبەتی ناو ماڵدا بۆ جوانی هەڵدەواسرا کە ئەم نەریتە هەتا ساڵە سییەکانی چەرخی بیستەمیش لە سولەیمانیدا بەکار دەهێنرا و باو بوو.

ئاتەش: وشەیەکە فارس و تورک بەکاری دێنن بەواتە: (ئاگر، ئاور و لە ئاگر و ناوە کوردییەکانییەوە وەرگیراوە).

ئاتەشین-واتە: ئاگرین و مەبەست لە ڕەنگی سوور و پەمەییباوی (ڕوو)ی خۆشەویستەکەیەتی یا مەبەست لە ئاگرێنێتی واتە سووتێنەری یا لە جوانیدا تیشکدەریی ڕووی جوانەکەیەتی، کە وەک مۆمێکی داگیرساو، بێت و بچێتە ناو ئەو فەنەرەی دڵییەوە کەوا چین چین تەپێنراوەتە سەریەک و لە دووریی ئەو سووتاوە و ڕەش بووەتەوە، تاوەکو دیسان ڕووناکی بکاتەوە.

چین چینم (و/١، چاپەکانی گیو): چین حینم. ئەمەش هەڵەی چاپییە یا دەسنووس.

٥- نافە: ناوک و نیشانەیە بۆ ئەوە کە هەندێ لە (مسک) لە (ناوک)ی ئاسکدا پەیدا دەبێ.

شەممەیێ: کەمێک، پیچەک، هەندێک، تۆزێک. هەروەها ئەگەر مەبەست لە (شەمم = شَمَّ) و (شەممەهو = شَمَّهُ)ی عەرەبی بێ کە واتەی (بۆنکردن) دەدات و بۆ ئێرە دەگونجێ و! بە(بۆنێک) مسک، مشک، موشک = بۆنێکی خۆشە و لە ناوکی ئاسکی چیندا پەیا دەبێ.

طورە: ناوچەوان، لای هەر شتێک وەک: (کوڵم، ڕوومەت)، لای ڕووی جوانان، ئەگریجەی خاو بەسەر ڕوومەتەوە.

ئاسکی چین-بەئاسکی (مسک)یش ناو دەبرێت گیاندارێکی جوانە، تەرایییەکی ڕەشباو لە ناوکیدا پەیا دەبێ و ئەمەیێ و دەبێتە (مسک)ی بۆن خۆش.
ئەم تاکە هێشتا چاپ نەکراوە و تەنیا لە (عن) و (ر)دایە و لە (ر)دا بەجیاواز لە هەڵبەستەکە لە پەراوێزەوە بەفارسی نووسیویە:(مِنْ کَـلامْ مُـصْطَفی بیِكْ إِفْتِـراق شُـدَه ازْ بَحْـرْ) واتە: لە هەڵبەستی (کوردی)یە لە هەڵبەستەکانی پاشبەندی (ت)وە ئاوێتە بووە.
(بوونە) لە (ر)دا: (بویتە)یە.
نافە: لەم تاکە هەڵبەستەدا (دوان) بەواتە (ناوک)، کە یەکەمیان مەبەست لە ناو جەرگەی دەروون و دووەمیان مەبەست لە (ناوک)ی ڕاستین.
(نافە)ی دووەم لە (عن)دا بەیەو لە (ر)دا نووسراوە (طورە) کە ئەویش هەڵەیە، چونکە ئەو بۆنی (میسک) بەناوچەوان و ڕوومەتی ئاسکەکەوە نییە بەشکو وەک نووسیم لە (ناوک)ی دایە.
٦- نەوسەبزە پەرژین: ئەو پەڕە تەنک و ناسک و نوێی کەسکەیە، بەدەور و بنکی پەڕەی خونچە و گوڵەوەیە = (کَأسْ) کە مەبەستی لە (سمێڵ و ڕیش)ە بەدەوری لێوەوە.
ئەم تاکە لە (سا)دا نییە و جگە لە (عن) و (ر) لە هەموواندا پێنجەمینە.
(دیدە) لە (و/١، ژ، و/٢)دا: (چاو)ە.
(وەک) لە (و/١، ژ، و/٢)دا: (وەکوو)ە.
(بەهاران) لە (و/١، و/٢)دا: (بەهاری)یە.
(بەهاران) لە (ژ)دا: (بەهارە)یە.
(دەبارێنێ) لە (ف، کم، نم/١، گ/٢، س)دا: (دەگریێنێ)یە-ئەمەش هەڵەیە.
(دەبارێنێ) لە (ر)دا: (دەگرمێنێ)-ئەمیش هەڵەیە.
(دەبارێنێ) لە (ژ)دا: (دەرێژێتو). جوانە و ئەشێ کوردی وەهای فەرمووبێ.
(دەبارێنێ) لە (و/١، و/٢)دا: (دەگریێت و)-هەڵەیە.
(پێکەنینی) لە (کم)دا: (پیکەنین)ە.
(پێکەنینی) لە (گل/١)دا: (پیکنین و)ە.
(غونچەیی) لە (گل/١)دا: (غەنجەیی)یە واتە (نازی)-جوانە و دەگونجێ بەمەرجێ (پێکەنینی) بکرێتە (پێکەنین و).
ئەم نیو باڵی دووەمە لە (و/١) و (و/٢)دا بەم جۆرەیە: (خاوەنی ژین و حەیاتم ماهی کەنعانم نەهات)-ئەمەش ناشێ چونکە (ژین) و (حەیات) یەکن و خاوەنی حاجییە لە تاکی چوارەمدا بەو پاشبەندی (کەنعانم) لەگەڵ پاشبەندی هەڵبەستەکەدا ڕێک ناکەوێ و (ماهی کەنعان) نابێ بەشکو (تابان) دەبێ.
هەروەها ئەم نیو باڵە لە (ژ)دا وەک (و/١، و/٢) دایە تەنیا لە جێگەی (کەنعان) (تابان)ە.
ئەم تاکە لە (جلی)دا نییە.

٧- گۆ: ڕاهوول، تۆپێکی لە دار دروستکراوی ئەوەندەی دوو کوڵەمستەیە، یاری (شەقێن) یا (هۆلانێ) یا (گوێنی) یا (شاقوولانێ) یا (قاشوان) یا (حەچان)ی پێ دەکرێت، لە کۆنەوە گەلی کورد بەپێیان و بەسەر (دارشەق) و بەسەر سوارییەوە کردوویەتی.

چەوگان: گۆچان، هۆل، شاقووڵ، شەق، قاشۆ، حەچ (صەولەجان) کە ئەمیش گاڵۆکێکی ئەوەندەی باڵێک درێژ و سەرێکی نیوە چەماوەیە لە شێوەی ژمارە (٦)دا یا پیتی (L) ئێلی لاتینیدایە، هەر یەکێ لە دوو دەستەی یاریی (شەقێن)ی ناوبراو بەم (چەوگان)ە (گۆ)یەکە لەوانیدی تێ دەپەڕێنێ.

ئەلعەجەب: بەسەرسامییەوە پرسیاری: (ئایا بۆچ؟) دەربڕینە.

شەهسوار: سوارچاک.

خانەیی زین: ناو تاقی زین، ئەو شوێنەی سوار خۆی بەسەروە توند دەکا. کە مەبەست لە جۆری بەسەر (سواری)یەوەیە لەم یارییە.

وشەی (زینم) بەڕێنووسی کۆن بە(زەینم) واتە (هۆشم)یش دەخوێندرێتەوە کە مەبەست لە یارەکەیەتی کە هۆی بیر و هۆشی خۆیەتی.

**جوانکاری لەم تاکە هەڵبەستەدا:**

ئەو بیرە قووڵ و داڕشتنە بەهێزەیەتی، جگە لەوەی ئەم کەلەپووری (یاری شەقێن)ە کۆنەی وەک بەڵگەیەکی مێژوویی سەرێنی خۆی بۆ جێگیر کردووین و، دیارە بەر خۆشیی ئەم یارییە لە کوردستاندا هەبووە و، لە چیرۆکە (ئەفسانەیی)یەکانماندا ناوی هاتووە.

ئەم تاکە لە (سا)دا سێیەمین و دوا تاکە؛ چونکە تەنیا سێ تاکی بۆ وێنە لەم پارچە هەڵبەستە هێناوەتەوە.

بەڵام لە (و/١، ژ، و/٢)دا چوارەمینە، چونکە ئەم سێ سەرچاوەیە ناتەواو و، پاش و پێشن و لە (جلی)دا نییە.

هەروەها لە (کم، گل/١، گل/٦، گل/٧، گل/٨، گل/٩، ف، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە، چونکە لەماندا تاکێک ناتەواوە.

ئەم هەڵبەستە لە ڕۆژنامەی ژین (ژ)دا لە ژمارە: ١٠٧٩ی ڕۆژی ١٩٥١/١٢/٢٠دا (مامۆستا هاوار) لە ژێر ناوی (ڕاستکردنەوە)دا لە وەڵامی ئەم هەڵبەستەدا لە (و/١)دا بڵاوی کردووەتەوە.

(سەرم) لە (ر)دا: (سەری)یە.

(بەرخۆی) لە (ر)دا: (خۆی)یە.

(ڕای فڕاند) لە (و/١، و/٢)دا: (ڕایڕفاند)ە.

(ڕای فڕاند) لە (ر)دا: (ڕاوماند)ە؟.

(ئەلعەجەب) لە (ر، و/١، و/٢، ژ)دا: (ئەی عەجەب)ە.

(ئەلعەجەب) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (وای عەجەب)ە.

(شەهسواری) لە (و/١، و/٢)دا: (شەهسەواریی)یە.

(شەهسواری) لە (ژ)دا: (شەسواری)یە.

(شەهسواری) لە (گ/٢، س، گ/٣)دا: (شاسواری)یە کە ئەمەش دەسکارییە.

٨- ستەم: زۆر (غەدر).

ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە (عن، گل/٩)دایە و لەوانی ترا نییە بەم پێیە ئەمە دووەمین تاکە لەم هەڵبەستەدا کە هێشتا چاپ نەکراوە.

هەروەها ئەم تاکە و بەپشتیوانیی تاکی یەکەم ئاشکرای زەهر خواردنەوەکەی (کوردی) دەکات.

٩- نەزع: گیانەڵا. سەرەمەرگ.

غەرغەرە: مەبەست لە قرخە قرخی هەڕەتی مەرگە. (گیانەڵا)یە.

کوردی: جگە لەوەی نازناوی خودی هۆنەرە. بەواتە: (هەر کوردێکی بێکەس)یشە.

ئەم تاکە لە (و/١، ژ، و/٢، سا)دا نییە و لە (گل/١، گل/٧، گل/٨، گل/٩، کاکە، ر، ف)دا سێیەمینە و لە (عق)دا چوارەمینە و جگە لە (عن) و لەوانی تردا حەوتەمین و دوا تاکە.

(وەضعی) لە (عق)دا (تالە)یە و لە (مد/١)دا چوارەمینە.

ئەم نیو باڵی یەکەمەی سەرەوە بەپێی (گل/١ و عن) جێگیر کراوە، کە لەم سەرچاوانەی خوارەوەدا بەم جۆرەی دوابییە:

لە (گل/٦ و نم/١)دا بەم جۆرەیە: (کەوتمە وەضعی نەزع غەم خستمیە حاڵی غەرغەرە).

لە (کم)دا بەم جۆرەیە: (کەوتمە ناو نەزع و غەم خستمیە حالی غەرغەرە).

لە (مد/١)دا ئەم جۆرەیە: (کەوتمە حاڵی نزعو وا خستومیە حالی غرغرە).

لە (گ/٢، س، گ/٣)دا بەم جۆرەیە: (کەوتمە وەختی مردن و غەم خستمیە حاڵی غەرغەرە).

لە (گل/٩، ف، جلی)دا بەم جۆرەیە: (من ئەوا کەوتوومە حالی نەزع و حالی غەرغەرە).

لە (گل/٧، گل/٨، ر)دا: بەم جۆرەیە: (من ئەوا کەوتوومە حالی نەزع و گێژی غەرغەرە).

(کوردی بێکەس خۆم) لە (گل/١، گل/٧، گل/٨، گل/٩، ر، ف، جلی، عق)دا: (چونکە بێکەس بووم)ە.

(کوردی) لە (مد/١)دا: (چونکە)یە.

(خۆم) لە (مد/١)دا: (بوم)ە.

(هیچ) بەواتە: (چ نە)یە بەهەڵەی باو لە کوردەواریدا بەکار دەهێنرێ و جاری تر بەدرێژی لەسەر ئەم (هیچ)ەم نووسیوە.

١٤

## شکاندی قیمەتی شەککەر

١- شکاندی قیـمـەتی شـەککەر، نەباتـی لێـوی شـیـرینت
گـەیاندییـە مـەریەمـەی مـەریەم خـەیاڵی ڕووی نیگارینت
٢- لەسـەردا چین بەچین، داهاتو، چین؟ چینێ بەسـەریا چین
کـەچن، چینـی جـەبینو، تـا بەپای دوو گـۆیی چین چینت
٣- حـەنایی ڕەنگی ڕەنگ تـەڵخـە، بـەڕەنگێ ڕەنگی گـوڵ نادا
وەرە ڕەنگ کـە بەخـوێنـی ئاڵی دڵ ئەنگوشـتی ڕەنگینت
٤- کـە ئەهلـی دڵ بەچاوی من نەظـەر لەم شـێـوەتە ببـڕن
دەزانن هەرکـە قـیـمـەی دڵ دەکـا ڕیشـوویی پووشـینت
٥- لە لوطفی لێوی شیـرینت، زەمـانـێ خوسـرەوئاسـا بووم
درێغـا، تێکی دا سـەیر و صـەفـا، بەدکـاری بێ دینت
٦- قـەمـیـصـی یووسـفـە بۆ چاوی تاریکم وەکـو یەعـقـووب
صـەبا بێنێ، ئەگـەر جـارێ، بەلامـا بۆی عـەرەقـچـینت
٧- هەتاکەی بێوەفای شیرین، دە هەستە وەقتی شیوەنتە
لەسـەریا غـەرقـە وا تیشـەی جـەفـا فـەرهـادی مسکینت
٨- دەبێ چۆن ئـارەزووی وەصلت بکـەم عـەبدێکی بێـچـارەم
خـەراجی دەوڵەتـی ڕۆمـە ڕەواجی عـیـقـدی کـابینت
٩- بەڕیسـوایی و بەڕووتیی مـن ڕەقـیـب داناکـەوی باقڵ
هەتا تەسلیم نـەبێ (کـوردی) مـەظننە نایە تەسکینت

---

١- نەبات: جـۆرە کـوڵۆیەکی وردی ڕەنگ ئاویی سـپـیـات و تام شـیـرینە لە وشککردنەوە و پەروەردەکردنی لیمۆی شیرین دروست دەکرێ کە جاران لە جێی شەکر بووە.
مـەریەمـە: کێـژی ناو ڕووبار و دەریا، ناوی گیـاندارێکی ئەفسـانەییـە و (دایکـی ئاڵ)یشی پێ دەڵێن، گوایە وەزنگی بۆ زەیستانە، بۆیە شەوارە لە خۆی و مناڵەکەی دەگیرێ لە کوردەواریدا

کە دایکی ئاڵ لێیـان نەدا و (قـورئان) و چەند دەرزییـەک دەخـرێتـە دەور سـەری منداڵەکەوە بۆ ترساندنی.

سـەرچاوەی ئەم هەڵبـەسـتـە (عن، گل/٦، ر، لاپەڕەیەکی دەسنووسی نەجـمـەدین مـەلا) وە (ژ، گ/٣)یە و، من (عن)م کردە بنکەی ئەم هەڵبەستە.

شـیرین: جگە لە واتای چێژ و شـیرینەکەی مـەبەس لە چواندنی لێـوی خـۆشـەویسـتـەکەیەتی بەلێوی (شیرین)ی چیرۆکی شیرین و خوسرەو و فەرهاد.

(مریەمە) لە (ر)دا: (مریم)ە.

مریەمە (تۆربەیی): مریەم. دیارە ئەمەش هەڵە نووسین یا تێنەگەیشتنە.

-مـەریەم- مـەبەست لە مـەریەمی عەذرای کچی عیـمـران (یا یواکیم وەحەنە)یە و لـە فامـیلیـای داوود و لە شـاری ناصـرە ژیاوە، دایکی عـیـسـا پێـغـەمـبـەرە و لە ٣٤ ئایـەتی ١٢ سـوورەتی قورئاندا و لـە ئینجیلدا زۆر ناوی هاتووە و لە قـورئاندا سوورەتێکی تایبـەتی بەناوەوەیە، لە لای هەردوو ئاینی ئیـسـلام و مـەسـیـحـی ئافـرەتێکی پیـرۆز و پاکـداوێنە و بەپێی هەندێ ڕێبـازی (فەلەیی) دەگاتە ڕادەی پەرستن. (المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الكريم).

ئەمـجـا لـەم هەڵبـەسـتـەدا گـەیاندنی (مـەریەم) بە(گـێـژی مـەریـەمـە) یا بە(دایکی ئاڵ) ئەمـە دەسـتنیـشـانی ئەوەیە کە مـریەمی دایکی عیـسا کاتێ کە هاتە سـەر ئەوەی (عیـسـا)ی ببێ، لە شەرمەزاریی ئـەوەدا کە چی بەخەڵک بڵێ، کەوا بێ مێرد سکی پڕ بووە و چۆن بڕوای پێ بکەن کـە ئەوە لە گـیـانێکی پاکی خـواییـیـەوەیە و ئـەو پاک داوێنـە و، هەروەها لە تـاو ئازاری ژان گـرتنەکـەی ڕای کـردە قـەراغ ئاوایی لە دۆڵێکی (بیت اللحم)دا لـە تەریقـیـدا، لە پاڵ بنکە دار خورمایەکدا منداڵەکەی بوو. ئەوەبوو لە پاش منداڵبوونەکەش خەڵکی توانجیان تێ دەگرت کە ئەو سووکییەی بەسەردا هێناون و بێ مێرد منداڵی بووە... هتد.

دیارە ئەو بـارەی کـە (مـریەم)ی تـیـا بـووە لەو کـاتەدا ئازارێکی نەفـسـیـی ئەوتـۆ کـاریگەر بووە بەڕادەیەک وەک (گـێـژی مریەمـە) یا مـەترسی لە (دایکی ئاڵ)ەکـەی ئەم هەڵبـەسـتـە بووە کـە (کـوردی) بەبیـر لێکردنەوەی خـۆشـەویسـتـەکـەی گـەیشـتـووەتە باری (مـەریەم)ەوە، هەروەکـو (عیسا) (د.خ)یش لای دایکی خۆشەویست بووە و بەڵام لە پێناویدا لەو ئازارەدا بووە....

خەیاڵ (ع): بیر.

نیگارین: جوان، نەخشین.

٢- لەسـەردا: لە لای سـەرەوە و، یا «بەسـەری (کەڵلەی) خۆشەویستەکەیەوە».

چین بەچین: داو لەسـەر داوی قژ، بەخاوی و ئاڵۆزکاوی.

چین؟: (چ شتێکن)، کام چشتن؟؟

چینێ: چینێک، جارێک، ڕیزێک.

بەسـەریا چین: وەک خـوێندنەوەی نووسـینێک بەسـەر دێری تاوتاوی مـووە چین چینەکـاندا

بچینەوە، چاوی پێدا بخشێنینەوە.
بەسەریا چین: بەسەریا تێپەڕ بین، لە ناو داوی ئەو قژە خۆ ڕسگار کەین.
کەچن: چەوتن، لارن.
کەچن: کە ئایا چین؟ کە مەبەست لە (کەچێتی) یا (کەچایەتی)ی پەرچەمی بەرچاوە.
چینی: دەستەی پەرچەمی.
جەبین: ناوچەوان.
تا بەپای: تا پایینی گۆی مەمکی.
دوو گۆ: مەبەست لە جووتە مەمکۆڵە خڕەکانی خۆشەویستەکەیەتی، وەک دوو گۆی چینی (فەخفووری)ن کەوا لە وڵاتی چین دروست کرا بن.
لێرەدا مەمک کردن بە چینی نیشانەیە بۆ توندی و ڕەقی. چنگ تێگیر نەبوونیان لەبەر بچکۆڵەیی و ناشلکییان و تازەییان.
چین چینت: لە وڵاتی چین چنراوت، کە وەک گوڵە ئاوریشمێک چنرابێ کە مەبەست لە گۆی مەمکە (قوت)ەکەیەتی وەک نەخشی بەئاوریشم چنراو لە داوێنی زولفەوە لە بچووکیدا وەک نەخشی بەئاوریشم چنراو وەهان، لە ژێر سوخمەکەیەوە.
(چین) لە (گ/٣)دا: (بچین)ە،
بەسەریا چین (ر): سەرچین لا.
بەچین لە (ژ، نم): (بەچینی)یە،
بەسەریا چین (ژ، نم): سەرچیندا.
بەسەریا چین (گ/٣)دا: لەسەر چیندا.
کەچن لە (ر، ژ، نم)دا: (بەچین)ە.
کەچن لە (گ/٣)دا: (بچین)ە.
(جەبینو) لە (ژ، نم)دا: (جەبینت)ە.
(جەبینو) لە (ر)دا: (چینە چین)ە.
(جەبینو) لە (گ/٣)دا: (چین بچین چین)ە.
(تا بەپای) لە (ر، گ/٣)دا: (تا بەپا)یە.
(تا بەپای) لە (ژ، نم)دا: (تا بەپایەی)یە.
(دوو گۆی) لە (ژ، نم)دا: (گۆی)یە.
دوو گۆیی لە (ر، گ/٣)دا: (گێسوویی)یە.

**هەڵسەنگاندن:**

(کوردی) وەستایی لە دوو وشەدا کردووە لە بەکارهێنانی دووجار وشەی (سەر) هەریەکەی بەواتایەک جگە لە بەکارهێنانی (٨) جار وشەی چین هەریەکەی بەواتەیەک کە ئەمەش لە

وێژەی کلاسیکیدا جیناس ئارایی و پەسەند بووە هەرچەندە ئەوەش زۆر لە هۆنەرانی سەرێنی (کوردی) و بەر لەو و دوای ئەویش وتوویانە، پێم وایە کەمیان ئەوەندەی ئەم تاکەی (کوردی) هەڵبەستەکانیان پڕوچڕن.

داهاتوو: بەشانە (شە) داهێنراو، خاوکراوە.

٣- حەنایی: واتە ڕەنگی خەنەییە.

(حەنایی) لە (گ/٣)دا: (حەنا بێ)یە.

ڕەنگ: جۆری تەختی شتێک وەک ڕەش و سپی و سوورە... هتد. واتا جۆری ڕەنگی خەنە.

بەڕەنگێ: بەجۆرێ، بەچەشنێ، بەشێوەیێ.

ڕەنگی: جۆری ڕەنگە خەنەییە سوور نارنجییەکەی یا وەک خوێن، ڕەنگی گوڵە هەنار.

(ڕەنگێ) لە (ر)دا: (رنک و)، (رنکی)یە.

(ڕەنگێ) لە (گ/٣)دا: (ڕەنگ و)ە.

(ڕەنگی) لە (گ/٣)دا: (ساری)یە بەواتە (زەرد) کە ئەمیش تورکییە و ناگونجێ.

تەڵخ: هەر ڕەنگێک ڕەشباو بێ، پێی دەڵێن تەڵخ. وەک: شینی تەڵخ و سەوزی تەڵخ و... هتد.

(گوڵ نادا) لە (ر)دا: (کل نادا)یە.

(گوڵ نادا) لە (ژ، نم، گ/٣)دا: (گوڵنارا)یە.

(ئاڵی دڵ) لە (ر، ژ، نم، گ/٣)دا: (دل)ە.

ئەنگوشت: پەنجە، قامک، ئەموست، ئەنگوست، تبل، کلک، پل، پت.

(ئەنگوشتی) لە (ر، ژ، نم)دا: (دەسا پەنجەی).

**هەڵسەنگاندن:**

دیسان لەم تاکەشدا (کوردی) یاری بە وشە کردووە لە پاڵ دەربڕینی بیرەکەیدا کە وەستاییی نواندووە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

حەنایی (گ/٣): حەنا بێ.

ڕەنگی (ر): رنک و.

ڕەنگی (گ/٣): رەنگ و.

بەڕەنگێ: بەجۆرێ، بەچەشنێ.

ڕەنگی (ر): رەنکی.

گوڵ نادا (ر): کل نادا. هەڵەی نووسینە، ئەگەر لە (گوڵ)ەوە بێ و هەڵەی بیرە ئەگەر لە (کل)ەوە بێ.

گوڵ نادا (ژین، نم، گ/٣): گوڵنارا. دیسان ئەو وشەی گوڵنارە لەگەڵ مەبەستی هەڵبەستەکەدا ناگونجێ، چونکی ڕەنگی گوڵنار تەڵخ نییە و ئەگەر بشگونجێ دیسان دەبێ (گوڵنارە) بێ، نەک گوڵنارا، کەواتە ئەمە لە هەڵەی نووسینی (گوڵنادا)کەوە (دال)ە بووە بە(ری).

ئاڵی دڵ (ر، ژین، نم، گ/٣): دل.

ئەنگوشتی (ر، ژین، نم): دەسا پەنجەی. هەرچەندە ئەمەش لەگەڵ هەڵبەستەکەدا دەگونجێ بەڵام دەبێ پاشبەندەکەی (نیگارینت) بێ کە ئەمەش لە هۆنەرێکی توانای وەک (کوردی) ناوەشێتەوە کە لێرەشا و لە تاکی یەکەمیشدا وشەی (نیگارینت) لە پاشبەند (سەروا)دا دووبارە بکاتەوە کە بەپێی وێژەی کۆن ئەمە بەنەنگی و ناشیرینی و کەم هێزی هەڵبەستەکە و ناتوانی هۆنەرەکەی دائەنرێت.

ڕەنگینت: ڕەنگاوڕەنگ. مەبەست لە ڕەنگینیی پەنجەیەتی بەخەنە و خوێنی دڵدارانی تر.

٤- ئەم تاکە لە (گ/٣)دا پێنجەمینە.

(کە) لە (ر، گ/٣)دا: (گەر)ە.

(شێوەتە) لە (ر، ژ، نەجمەدین مەلا، گ/٣)دا: (شێوەیە)یە.

(دەزانن) لە (ر)دا: (دزانی)یە.

(دەزانن) لە (ژ، نم،)دا: (ئەزانن)ە.

(دەکا) لە (نم)دا: (ئەکا)یە.

لە (گ/٣)دا ئەم تاکە پێنجەمینە و پاش و پێش خراوە.

- کە (ر، گ/٣): گەر. ئەمە هەڵەیە، چونکی کێشی هەڵبەستەکە قورس دەکا، بەڕادەیەک دەبێ (ئـ)ی ئەهلییەکەی قووت بدرێ و بوترێ (گەرەهلی دڵ). ئەگەر نا لەنگی ئەکا.

ئەهل: کەس، خودان، بەرە، دەستە.

ئەهلی دڵ: دڵداران، بەڵام ئەم ناوی (ئەهلی دڵ)ە جۆرە دەربڕینێکی صۆفیگەریانەیە و دڵداریی جنسییان مەبەست نییە و لە ناو خۆیاندا یەکتری بە(ئەهلی دڵ) ناو دەبەن، چونکی ئەوان هەموو کۆشش و ئامانجیان بۆ پەیڕەوی فەرمایشتی خوا و بیرکردنەوە لە خوا و یەکگیربوونە لەگەڵیا بەگیان و دڵ، بۆیە خۆیان بەئەهلی دڵ ناوناوە.

بەچاوی من: لێرەدا (کوردی) خۆی بە لە سەروو ئەهلی دڵیشەوە داناوە کە دەڵێ ئەوان بەچاوی من تەماشا بکەن.

نەظەر: تەماشاکردن، ڕوانین، بەڵام لە کوردیدا بەتەماشاکردنی نامەحرەم بەچاوی خراپەوە دەڵێن (نەظەر) هەرچەندە هۆنەرمان (کوردی) ئەمەیانی مەبەست نییە.

شێوەتە (ر، ژین، نم، گ/٣): شێوەیە. ئەمەش ئەوەندە ڕاست نییە؛ چونکی هەڵبەستەکە تێکڕا ڕووی دەم کردنە خۆشەویستەکەیەتی و (شێوەتە)ش بەو پێیە (موخاطەب)ە بۆیە ڕاستترە.

ببڕن (ر): ببڕی. ئەمەش نابێ، چونکی ئەهلی دڵ گشتن (جەمع) و (ببڕی) بۆ تاکە و بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەشدا (دەزانن) بۆ گشت هاتووە.

دەزانن (ر): دەزانێ. وەک لە لێکدانەوەی پێش ئەمەدا دەرکەوت کە ئەمیش دیسان ناگونجێ و هەڵەیە بۆ ئەم هەڵبەستە.

دەزانن (ژین و نم): ئەزانن.
قیمە: جنینی گۆشت، گۆشتی جنراو. بەڵام وشەی (قیمە)ش لە زاراوەکانی صۆفیگەری یا ئەهلی دڵە، کە (بەزۆر لە دڵکردن) بۆ ڕوو لە باری جیهانی وەرگێڕان و ڕووکردنە خوا بەڕاستی و لێبوردوویی دەڵێن (قیمە) وە یا (قیمەی دڵکردن).
دەکا (نم): ئەکا.
ڕیشوو یا ڕێشوو: بەو داوە درێژە ڕێکانە دەوترێ کە بە بادراوی و سەر گرێدراوی بەلێواری کێش و دەسرۆکە و کۆڵوانە و پووشین و مشکی و چەفتە و جامانە و ئەمانەوە دەهێڵرێتەوە بۆ جوانی.
پووشین: چەشنە سەرپێچێکی ڕەشە ئافرەتی کورد دەیانبەست بەسەریانەوە کە ئەویش سێ جۆری هەبوو:
جۆری یەکەمیان: بادراو و قەف قەف و ئەوەندەی مەچەکێک ئەستوور و ٢ – ٣ باڵ درێژە و تەنیا هەردوو سەرەکەی گوڵەنکە (گوفک)دارە بۆ گرێدان.
جۆری دووەمیان: هەر تەنیا کێشێکی نزیکەی مەتر و نیوێک چوارگۆشەییە و قەراغ هەڵپێچراو و ڕیشوودارە و هەر چوارگۆشەکەی و هەندێ جار لە ناو کاریشدا گوڵنکەی تێ هەڵدەبەسترا و بە سیم دەرازێنرایەوە. کە (پووشینی جافی) بوو (کوردی) ئەمەیانی مەبەست بووە. بەڵام ئێستە، مەگەر لە گوندەاندا ئەگەر نا باوی نەماوە.
جۆری سێیەمیان: هەر ئەوەکەی دووەمە و وەک کۆڵوانە لە کۆڵ دەگیرا.
**تێبینی:** تا ئێستە کە جارجار لێکدانەوەکانم بردووەتەوە سەر سۆفییانە، ئەوە لەوەوەیە کە هۆنەرانی کۆن، زۆر جار (خوا) یا (پێغەمبەر) یا (مەزنێکی ئاینی) یا دۆستێکی خۆیان لە جوانییەتییەکی پیاو یا ئافرەتێکیشا بەیاد کردووەتەوە.
٥– خوسرەو: خوسرەوی پەروێز و مێردی شیرینە، پاشایەکی ساسانییانە کە لە (بەیتی خوسرەو و شیرین) یا (شیرین و فەرهاد)دا ناوی هاتووە، لە ڕیزی چیرۆکەکە گرنگ و ناودارە جیهانییەکانە و ڕووداوێکی ڕاستی بووە پاشماوەی دێرینی ماوە.
ئەم تاکە لە (ر، ژ، نم)دا نییە و لە (گ/٣)دا حەوتەمینە.
(لە لوطفی) لە (گ/٣)دا: (بەبەزمی)یە، دیارە دەسکاری کراوە.
درێغا: ئەی داخ، موخابن، داخەکەم، بەداخەوە.
سەیر: تەماشاکردن–لێرەدا مەبەست لە خۆش ڕابواردن بووە.
٦– قەمیصی یووسف: کراسی یووسف پێغەمبەر کە بۆ یەعقووبی باوکی نارد و کوێرییەکەی پێ چاک بووەوە.
عەرەقچین: ژێر کراس یا ژێر کڵاوە و، یا دەسەسرێک بووە لە بن کڵاوەوە دانراوە کە نم (ئارەق) بمژێ.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا چوارەمینە و لە (ر، ژ، نم)دا پێنجەمینە.
(یووسفە) لە (ر)دا: (یوسف)ە.
(وەکو) لە (ر)دا: (والی)یە.
(صەبا بێنێ) لە (ژ، نم)دا: (کە با بێنێ)یە.
(صەبا بێنێ) لە (گ/٣)دا: (صەبا جارێ)یە.
(بەلاما بۆی) لە (گ/٣)دا: (بەلامان بێنێ گەر بۆیی)یە.

**هەڵسەنگاندن:**

لێرەدا (بۆی) و (بێنێ) وەستایی زمانزانی و جیناس ئاراییە و، ئەم تاکە هەڵبەستە دیاردەیە بۆ چیرۆکی حەزرەتی یووسف کە براکانی بەمنداڵی خستیانە بیرێکەوە وتیان گورگ خواردوویەتی کە کاروانی دەریان هێنا لەو بیرەیان دەرهێنا و فرۆشتیان و ئەویش گەیشتە پایەی (عزیزی میصر)، واتە وەزیری (مەزن) و لەوێوە کراسەکەی بۆ باوکی نارد کە لە داخی ئەو کوێر بووبوو، بەبۆنی کراسەکە چاوی هەڵات.
وا دیارە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لە پیری و چاو کزبوونیدا، داناوە. وەک لە شوێنی تردا نووسیومە (کوردی) چیرۆک نووسیش بووە بەشیعر و بەپەخشان.
٧- تیشە: تەشوێ، قوڵنگ، کە فەرهاد بەبیستنی مردنی شیرین خۆی پێ کوشت، چونکە لە خۆشەویستیی ئەو، لە کێوی بێستوون سەنگتاشیی دەکرد کە ئێستەش دەسکردەکەی وەک دروشمی دڵداریی ڕاستی ماوە.
ئەم تاکە لە (ر، ژ، نم، گ/٣)دا شەشەمینە.
(بێوەفای) لە (گ/٣)دا: (بێوەفایی)یە.
(شیرین دە هەستە) لە (ر)دا: (هلسە لە شیرین)ە.
(وەقتێ) لە (نم)دا: (وەختی)یە.
(لەسەریا) لە (ر)دا: (لەسەرپا)یە.
(لەسەریا) لە (گ/٣)دا: (سەراپا)یە. دیارە هەڵەی چاپییە.
غەرقە: نوقومە.
فەرهاد: ئەو هونەرمەندە دەسڕەنگینە دڵ پڕ ئەڤینە، سەنگتەراشەیە کە بەئاواتی ئەوەی خوسرەوی مێردی شیرین دەستی لە شیرین بۆ هەڵگرێت، کەوتە چیا هەڵکۆڵین و داتاشین و تونێل دروستکردن و، ڕێگە پیابردنی و کۆشک تیا کێشانی نەخش و دواییش بەپیلانی خوسرەو بۆ ئەوەی شیرینی نەداتێ، فەرهاد لەناوچوو، ئیستە ئەو دەسکردە جوانە هونەرییانەی لای (قەسری شیرین) وەک پاشماوەیەکی کۆنینەی بەنرخ شوێن گەشتوگوزاری بەملیۆن گەڕۆکی خۆ و بێگانەیە لە هەر ساڵێکدا. وەک دروشمێکی ڕاستی و دڵدارییەکی ساغ و لێبوردووانە خۆی دەنوێنێ.
مسکین: بەستەزمان، بێ گوناه، بێچارە، ژێردەستە.

٨- کابین: مارەیی. عیقدی کابین: پەیماننامەی مارەکردنە.
ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە و، لە (ر، ژ، نم)دا حەوتەمین و دوا تاکە.
(دەبێ) لە (ژ، نم)دا: (ئەبێ)یە.
(بکەم) لە (ر)دا: (نەکا)یە.
(بکەم) لە (ژ، نم)دا: (بکا)یە.
(عەبدێکی بێچارەم) لە (ر)دا: (کوردی)یە.
(عەبدێکی بێچارەم) لە (ژ، نم)دا: (کوردی بێچارە)یە.
وەصل: یا مەبەست لە بەیەکگەیشتنیەتی بەبرادەرێک، دۆستێکی خۆشەویستی خۆی و، یا لە هەمان کاتدا زاراوەیەکی سۆفییانەیە کە مەبەست لە گەیشتن بەپەڕتەوی خوایی و پێ بەهرەمەند بوونی، کە لە دەربڕینێکی وەهادا بەوپەڕی خۆ بەبچووک و ناچیز و ناتوان دانانەوە بەرامبەر بەخوای مەزن.
خەراجی: بایی، نرخی.
دەوڵەتی ڕۆم: هەرچەندە لە مێژوودا بەفەرمانڕەوایی ڕۆمانییەکان دەوترێ: دەوڵەتی ڕۆم، یا ڕۆم، بەڵام لێرەدا و لە ناو وێژەی کوردیدا و، وەک باوە لە ناوماندا ڕۆم مەبەست عوسمانییەکانە.
ڕەواجی: برەوی، باوی.
عیقد: پەیمان.
عیقدی (تۆربەیی): عەهدی. کە عەهدیش ئەم جێگەی پێویستە ناگرێتەوە، ڕەنگە لە دەماودەمکردنا گۆڕابێ.
کابین: مارەیی.
٩- ئەم تاکە لە (تۆربەیی، ژین و نەجمەدین)دا نییە و لە (گیو/٣)دا هەشتەمین و دوا تاکە، چونکی ئەمیش لەگەڵ ئەو ناتەواوییانەی لێی دەرکەوت، تاکێکیشی ناتەواوە.
ڕیسوا: ئابڕووچوو.
بەڕیسوایی و بەڕووتیی من (گیو/٣): بەڕیسوایی یو ڕووتی من، کە ئەمەش هەڵە و لەنگییە.
ڕەقیب (ع): دژ، ناحەز، بەدخوا.
باقڵ: وشەیەکی لە عارەبییەوە سواوە کە لە پێشا: (بەعەقڵم) بووە بەواتە: (ڕەنگە)یە.
داناکەوی باقڵ (گیو/٣): تۆ کامەڕان نابی. لەوە دەچێ گۆڕابێ.
تەسلیم (ع): دەردەست بوون و، واتەی (مردن)یش دەدات.
مەظننە (ع): باقڵ، ڕەنگە، پێم وایە.
تەسکین (ع): دامرکان، ئارام.

# ڕێ

١٥

## وا؛ لە کانی ساوە

١- وا؛ لە کـانی سـاوە، وەک گـوڵ تۆقـەنێ کـیـژ دێنە خـوار
تاق و واز، پۆلی قـوڵنگ و قـاز، بەڕیز بەسـتـیـان قـەتار
٢- جـووتە بسکانیـان لە جـەولاندا بەسـەر مـەمکۆڵەوە
هەر دەڵێی گـەنجی تەلاوسـیم پاس ئـەکـەن دوو توولەمـار
٣- کیژ بەعام وا هاتنە سەر (جۆخین) و چاومیان کوێرە کرد،
ناسـکـە، کـاراسکەی، منیـان لە ناوا (نادیار)
٤- جـوانن و ئەمما بەمن چی جـوانی منیـان تیـا نەبێ
ئارێ، ئارام نـاگـەیەێنن بەم دەروونـەی بێ قـەرار
٥- من کە کـوشتـە و، شێفـتـە و سەودازەدەی یەک دولبەرم
(پەندی پێشین)، نەخشی بەردە؛ دڵ یەکـە، مـەیدە هەزار
٦- بۆ منی بێکەس، خـودا؛ ئەمـڕۆ، چ ڕۆژێکی ڕەشـە
ئاخـۆ کێ نەیهـێـشـتـووە، یا زیزە یار لە منی هەژار
٧- خـوا نەکـردە؛ دەردەدارە، داخـۆ چی قـەومـاوە لێی؟
یا (ڕەقـیب)، تاقـە گـوڵی لەم چەپکەدا کـردووم بژار
٨- تیـژڕەویـی (بینـا)م لە دووری یار لە تاو دایە بەتاو
دەم بەتانووتە لە حـانی ڕەوتی ڕوودی (سـەرچنار)
٩- (قـادر)ە (قـادر) بەچارەم ئەیپـەرسـتم (قـادری)م
بۆیە (کـوردی) قـەت لە ناو ئەم داوەدا نابێ قـوتار

---

١- سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستە: (گل/٢) و (ص) و (ق/٤)ن و من (ص)م کردە بنکە و دەسکەلای

ساخکردنەوە، کە هێشتا چاپ نەکراوە.
(کانی سا) و، یا (کانی ساوە)-زۆر کۆشاوم و بۆم ساغ نەبووەتەوە کە ئایا ئەمە (گوند) یا (کانی) بووە. بەڵام بەپێی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکە شوێنێکی نزیک (سەرچنار)ی لای شاری (سولەیمانی) بووە.
لە پەراوێزی سەرچاوە (ص)دا بەفارسی بەرامبەر بەم هەڵبەستە نووسراوە:
(مصطفي بيك كردي رحمة الله در يك مناسبتي گشت و گوزار، در كنار آب سرچنار إرتجالاً فرمودة). واتە (مستەفا بەگی کوردی خوا بیبەخشێ لە بۆنەی سەیرانێکی گوێ سەرچناردا بەکوتوپڕی فەرموویەتی).
لە سەرچاوەی (ق/٤)دا هەر ئەمەندەی خوارووی ئەم هەڵبەستە نووسراوە:
وا لە کانی، کۆمەڵێ کیژ هاتنە خوار
تاق و واز.................... بەستن قەتار
کیژ بەعام.......................................
کە کێشی ئەم دەقەیش جیاوازە لە کێشی هەڵبەستەکە.
تۆقەنێ = (ق/٤): کۆمەڵێ و
تاق و واز: تاق و جووت.
کانی ساوە = ق/٤: کانی.
وەک گوڵ = (گل/٢): کتکی.
وەک گوڵ (ص) لە پەراوێزدا نووسراوە: نوسخە: (چون مل) واتە: وەک (مەل).
پۆلی قولنگ و قاز بەڕیز (گل/٢): کەفتن وکو ریزی قلنگ.
(قولنگ) و (قاز) ناوی دوو جۆر باڵندەی گەرمیان و کوێستانکارن، کە پۆل پۆل لە (ئەسکەندناڤیا) و (ئەڵمان) و (تورکیا)وە دێنە کوردستانەوە و تا مانگی (نەورۆز) و (گوڵان)یش دەمێننەوە، لە پێدەشت و گوێ ئاوەکاندا دەژین. لای ئێمە (قاز)ی ماڵی (کەوی)یش هەیە کە لە گوێ ئاودا ئەژی.
بەستیان (گل/٢، ق/٤): بەستن.
قەتار: ڕیزبوونی مەل بەئاسمانەوە (قەتار)ی پێ دەوترێ و لەوەوە ڕیزە وڵاخی کاروانی بە(قەتار) ناوبراوە، جگە لەمانەش (قەتار) ناوی یەکێ لە گۆرانییە ڕەسەن و کۆنە کوردییەکانە و لەوانەیە ئەو (دەستە کچ)ەی ناو ئەم هەڵبەستە بەو گۆرانییەوە هاتبنە خوارێ.
دێنە خوار (گل/٢، ق/٤): هاتنە خوار.
٢- بەسەر مەمکۆڵەوە (گل/٢): لەسەر مەمکۆڵەیان.
نیو باڵی دووەمی سەرەوە لە (گل/٢)دا بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە:
(هەر وەکی گەنجی تەلا، پاسی بکا دوو توولەمار)، لە جێگەی کوژاوەی (چاو بکری درسنگژی

ممکولەی)دا نووسراوە.
بسک: پرچ، زوڵف، ئەگریجە، پەرچەم.
جووتە بسکانیان (گل/٢): جفتە بسکی هەر.
گەنج: مەبەست لە شوێنی تیا پاراستنی زێڕ و زیو و گەوهەرە، کە لە چیرۆکە ئەفسانەییەکانماندا هاتووە کە زۆر لەو (گەنج)انە ماری تایبەتی پاسەوانیان لەسەرن، بۆ ئەوەی دەست کەس نەکەون هەتا خاوەنی خۆیان پەیا دەبن ئەوسا (مار-هەژدیها)ی پاسەوان گەنجەکە بەجێ دەهێڵێ بۆ خاوەنی و هەر کەسێ بەو گەنجەی زانیبێ ئەو مارە بەپێوەدان ئەو کەسەی کوشتووە کە خاوەنەکەی خۆی نەبووە.
بۆ نموونە: ئەم ئەفسانەیە لە بەیتی (قەڵای دمدم)یشدا هاتووە کە (خانی لەب زێڕین) گەنجەکەی دۆزییەوە لەگەڵ ئەو هەموو زێڕ و گەوهەر و زێڕەی کە تیا بووە چەندین ئێسکی مرۆڤیشی تیا بووە کە ئەو هەژدیهای سەر گەنجەکە ئەنگاوتبوونی و گۆشتەکەیانی خواردبوو، بەڵام کە (خان) چووەتە گەنجەکەوە مارەکە گەنجەکەی جێ هێشتووە، چونکە خوا بۆ (خان)ی داناوە.
توولە مار: بێچووە مار.
٣- چاومیان کوێرە کرد (گل/٢): چاوم کۆر بی. هەروەها لە پەراوێزەوە نووسراوە: نوسخە: چاوان کورە بام.
لە جێگەی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گل/٢)دا نووسراوە:
نوسخە: (بو چ نیە آخر عریزی من لناو کیژان دیار).
هەروەک لە بەرامبەر وشەی (آخر)دا نووسراوە: نوسخە: (ایتر).
کاراسک: بێچووە ئاسک.
٤- ئارێ: بەڵێ و جوانێتیی، ڕاگەیانەکە جووتکردنیەتی لەگەڵ وشەی ئارامدا.
ئەم تاکە لە (ص) و (گل/٢)یشدا هەیە و چونیەکە.
٥- شیفتە: شەیدا، سەوداسەر.
سەودازەدە: ئەڤین لێ داو.
(کوردی) لەم نیو باڵی دووەمەدا دوو (پەندی پێشینان)ی ڕاگەیاندووە.
١- پەندی پێشینان نەخشی بەردە.
٢- دڵ هەر یەکێکە مەیدە بەهەزار، کە ئەم پەندەش لە هەڵبەستی فۆلکلۆری و گۆرانیماندا هەیە.
ئەم تاکە هەڵبەستەش لە هەردوو سەرچاوەی (ص، گل/٢)دا هەیە و چونیەکە.
٦- ئەم تاکە لە هەردوو سەرچاوەی (ص، گل/٢)دا هەیە.
کێ (گل/٢): داک.

له منی (گل/٢): لمن.

خودا (گل/٢): خولا.

ئەمڕۆ (گل/٢): ایرو. که ئەمەش بە(ئەی ڕۆ) دەخوێنرێتەوە و، دەگونجێ.

بووه (گل/٢): بیه.

٧- ئەم تاکەیش له (گل/٢)دا نییه.

داخۆ: ئاخۆ.

من لەم ژیان درێژ و ئاشنایەتییه قووڵ و فراوانەمدا لەگەڵ هەڵبەست و سەرگوزەشتەی ژیانی (کوردی)دا هێشتە نەمبیستووه، که کوردی کچێک یا ئافرەتێکی دەستگیرانی بووبێ و، ئەگەرچی هەڵبەستی دڵداریشی زۆرن، بەڵام بەلای منەوه هەموو له بینینی جوانێکەوەن که گورج هەستی ئەویان کێشاوه و هەڵبەستێکی لەسەر داناون.

لەم تاکەدا (کوردی) ڕایگەیاندووه لەو کچانەدا کەسیانی بەدڵ نەبووه.

٨- (بینا): هاناکردنی چاو.

یار له تاو دایه بەتاو (گل/٢): یاری جوانی مەستە چاو. نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوه له (گل/٢)دا بەم جۆرەیه:

(صەد هەزار تانووت دەدا ئێستا له ڕوودی سەرچنار). هەروەها بەپەراوێز نووسراوه: نوسخه (لروخ) واته: له ڕۆخی = له قەراغی.

له نیو باڵی یەکەمدا دووجار وشەی (تاو) هاتووه، یەکەمیان بەواته له گۆڕدایه له هێرشدایه و مەبەستی له گۆڕی (بیناکەیەتی) بۆ سۆراخکردنی یاره نادیارەکەی.

(تاو)ی دووەم گەرمی و لەسەر سووربوون دەگرێتەوه.

له حانی: له عاستی.

سەرچنار: کانییەکی گەورەیه له باکوری ڕۆژاوای شاری سولەیمانی و له پێکوڕی پیرەمەگرووندایه له سەردەمی (کوردی)دا و، ئێستە کەوتووەته ناو شار و زۆریی ئاوەکەی ڕووبارێک پێک دێنێ، مەگەر له وشکه ساڵاندا نەبی که کەمتره.

دیاره کوردی ڕۆژی دانانی هەڵبەستەکه له سەیرانی سەرچنار بووه و کاتی جۆخینان بووه، وەک گێچەڵی خۆشی و پێ ڕابواردن و بۆ پێکەنین بەو کچانه، ئەم هەڵبەستەی داناوه. که ئەو گوێ ئاوه ئێستەش سەیرانگایەکی هەمیشەیی پڕ له سەیرانکارانه.

٩- (قادر): بەواته توانا و مەبەست له خوای مەزن و کردگار و بەتوانا و یەکتایه.

قادره: خاوەن توانایه بۆ چارەی هەموو دەرد و ناخۆشییەک.

ئەیپەرستم: دیاره پەرستن هەر بۆ خوایه تەنانەت له لایەن (بت) پەرستەکانیشەوه، بۆ خوایەکانیان و، پەرستنەکەی کوردی بۆ خوای هەره گەورەترینه.

(قادری): بەواتا سەر بە(قادر)م کە لە پێشەوە ڕام گەیاند. هەرچەنده (قادری) ناوی (تەریقەت)ێکه که له شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوه کەوتووەتەوه و (کوردی) زۆر شەیدای بووه

و له سـەردەمی ژیانی (کوردی)دا لـە کوردسـتـاندا پێشـەوای ئەو (تەریقـەتی قـادری)یە شـێخ مارفی نۆدێیی بووە.

بەڵام پێم نەزانیوە کە وەک دەروێشێک یا مریدێکی تۆبە وەرگرتووی (تەریقـەتی قـادری) کەوا کـوردی (قـادری) بوو بێ و، هەرچەنـدە هەسـتم بەدژایەتیی نێـوان (کـوردی) و (شـێخ مـارف) نەکردووە، بەڵام تێ گەیشتووم کە کوردی زۆرتر دۆستی (مەولانا خالید)ی پێشەوای (تەریقەتی نەقشبەندی)ی ئەو سەردەمە بووە.

**هەڵسەنگاندن:**

کوردی لە دەربڕینی (نـاو)ی (قادر)دا لەم تاکەدا بەپێی دەسـتووری وێژەی کۆن جیناس ئارایی و وردەکاریی وێژەییی نواندووە، هەروەها لە ڕاگەیاندنی (ناو) و (داو)یشدا.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (گل/٢)دا بەم جۆرەیە:

(قادرە تەنیا عیلاجی کا، دڵی ئەم سەخڵەتە

وەرنە (کوردی) قەت ئەتۆ لەم داوە هەر نابی قوتار).

(کوردی) بەم تـاکـە هەڵبـەسـتـەیدا (ئەو ڕا دەربڕینـەم لە کۆتاییی تاکـە هەڵبـەسـتی ژمـارە (٦) جـێگیـر دەکـات، هەروەک لەم تاکـە هـەڵبـەسـتـەی پێـچـەوانـەی ڕای ئەو تێنـەگـەیشـتـوو، نەشـارەزایانەیەکە تـاوانی (قـادر) یا (قـالە) خـۆشـویسـتنیـان بـەناڕەوایی داوەتە پاڵ (کوردی)، بەوەدا کـە چەند جـارێ نـاوی (قـادر)ی لە هەڵبـەسـتـەکـانیـدا بردووە. کـە لە هەمـویـاندا ڕاستییەکانم شی کردوونەتەوە.

وەک لە باسێکی تایبەتیی ناو ئەم پەڕاوییەدا ئەم بابەتی تاوان پێکردن و پاکێتی کوردی و پاک داوێنی و صۆفییەتییە ڕاستەقینەیەم نووسیوە و کارەکەم تیا یەکلایی کردووەتەوە.

داو: ئەو کشـتـەکەیە، کـە لە مووی درێژی کلک و باڵـی ئەسپ و مـاین و، یا لە دەزوویەکی (زبر) واتە توند بادراوی مێـودار کـراوە کـە لەم سـەردەمـەی ئێمـەدا ئەو کـشـتـەکە لە (نـایلۆن)ە و بەشێوەیەکی تایبەتی چەند (کەڵەمە) واتە (قوڵفە) لەو کشتەکە لێ دەدرێ کە ئەگەر هەر شتێک لە یەکێ لەو قـوڵفـانە گیر بوو، گورج قـوڵفـەکە دێتـەوە یەک و بەدەوری ئەو شـتـەدا کە تێـی گیـر بووە بەری نادا.

(کـوردی) و زۆر لە شـاعیـران لە هەڵبـەسـتـدا خـۆیان بەمـەلی بەداوەوە بووی داوی جـوانی و ئەڤینی خۆشەویستەکانیان چواندووە کە (قوتار) نابن.

قوتار: ڕسگاری، ڕەهایی، دەربازی.

**تێبینی:**

کـاریگەریی تێکچـوون و گـۆڕانکاری لـەم هەڵبـەسـتەدا لـە ئاکـامی بەهەڵە وەرگـرتنیـەوە دیارە و، لەوانەیە ئەم هەڵبـەسـتـە لە هەڵبـەسـتـە هەرە کۆنەکانی (کوردی) بێ کە لاوازی و کـوڕدیی پێـوە دیارە، بەڵام ساز و سۆز و هەست و مۆرکی کوردیی پێوە ماوە.

## ١٦

## خەبەرێکم بدەنێ

"کارەساتی ڕووخاندنی مەحموود پاشای بابان"

١- خــەبــەرێکم بــدەنێ ئەهلی خــەبــەر حــەشــرە مــەگــەر
ڕۆژ کــەوا ئەمــرِۆ لە مــەغــریب ســەری هێناوەتە دەر

٢- نووری (مــەهدی) لە طەرەف مــەککەوە ظاهیــر بووە یا
(غــەلەبەی ڕۆم)ە لە بـۆ کـوشــتنی (مَنْ کــانَ کَـفَـرْ)

٣- ئەشکی خــوێنینە لە چاومــا بەگــرێ وەســتــاوە
یا، غـوباری ئەلەمــە باعــیــثی عـومـیــانی بەصــەر

٤- ثەبتی تـأریخی لە نیــو بەحــری حــوروفــا ئەلەمــە
ســەربەســەر ســەیری بکەن سەیرە هەتا ســەریەکەدەر

٥- خــەوە یان وەســوەســەیە یاکــە بە ڕەئیــولعــەینە
ئەم عــەلامــاتە کــەوا دێنە ئەبەمــەددی نەظەر؟

٦- ڕۆحی شــیــرینە کــە دەردێ لە تەنی مــەهجــوورم
یا مــەهی من نیــیــەتی ڕیحلەتە بۆ عــەزمی ســەفــەر

٧- بەســە تاکــەی بەصــەفای زەید و عــەمــر دەبنە شــمــر
(خوێنی کورد) جارییە هەر جارێ، بەجۆرێکە هەدەر

٨- بۆ ســەفــەر کــردەیی من لایقــە خــۆ، بەدری مــەلەک
بێتە ســەر دەستی و بۆ ڕەددی عەدو، بێ بە سوپەر

٩- باوجــوود تاکــو (ڕەقــیب) یاوەری ئەم دڵبــەرە بێ
هیچ تەفاوت نییە بۆ من لە (سەفەر) یا لە (حەضەر)

١٠- دائیــمــا دەســتی دوعــا بەندمــو شــایەد زوو زوو
(شا)ی سەفەرکردەیی من بێتەوە بێ عیجز و ضەرەر

١١- سۆزشی (کوردی)یە، یا جۆششی ئەییامی فیراق
ئاتەشی عەشقە مەگەر یا شەرەری ناری سەقەر

.............................................................................

١- حەشر: زاراوەیەکی ئیسلامییە و مەبەست لە دوا پرسینەوەی خوایە لە خەڵکی لە دوای مردنی هەمووان و زیندووکردنەوەیان. کە (کوردی) مەبەستی لە قەڵەباڵغیی شێوەی ئەو ڕۆژی کارەساتەی مەحموود پاشای بابانە کە ئای ڕووخاندنی بووە یا بۆ بەرێکردنی بووە لە دوای شکاننی بۆ هانابردنە بەر لایەکی یا (مەمالیکی بەغدا) یا (خەلیفەی عوسمانی) لە (ئەستەمبووڵ) یا (شای عەجەم) یا (والی)یەکانی کە (سلێمان پاشا)ی باوکی ئەحمەد پاشا جێگەی گرتەوە، بەپارێدەی (داوود پاشا) وەک لە تاکی دووەمدایە، کە لە ڕاستیشدا و بەپێی سەرچاوە وێژەییەکان شوێنی کۆبوونەوەی ئەوسایە لە ڕۆژاوای سولەیمانی کە تاکو ساڵی پەنجاکانیش هەر دەشتێکی چۆڵ بووا پێی دەوترا دەشتی (تەیارەخانە) چونکی شوێن نیشتنەوەی فڕۆکە و جێگە نومایش لێکردنی خوێندکاران بووە کە ئێستە ئاوەدانە و، گەڕەکی کانی ئاسکانی پێ دەڵێن و دەکەوێتە خوار کارێزی کانی ئاسکانەوە لە ناو شاری سولەیمانیدا:

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٧، گل/٨، جلی، ن، ف، ش، نم/١، با، ق/٤) وە (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە. لە هەموویاندا، (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە.

سەرە ناوی ئەم هەڵبەستە لە ناو (عن)دا بەفارسی نووسراوە: (قَصیدَهءِ مصطفی بِیك کُردي براي سفَر یەء فاجِعَهء مَحْمُودْ پادشاهْ بَبَه فَرمُودَه).

ئایا ئەم (سەفەر)ەی کە ئەم هەڵبەستەی بۆ دانراوە، هەڵاتن بوو لە دەست دوژمنەکانی و ئامادەکاری بوو بۆ سەفەری پەنابردنە بەر عەجەم یا ڕۆم بۆ یاریکاری دژی ئەو بەرەیەی پیلانیان لێ گێڕاوە؟ یا سەفەری ئەوە بووە کە زانیویەتی پیلانی دژ کراوە و خۆی ئامادەی سەفەری چوونە جەنگ کردووە، بەرامبەر بەو پیلانگێڕانە کە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە بەتەواوی لەم هەڵبەستەدا ڕوون نەکراوەتەوە، کە ئەمە ئاوتای مێژوو دەکەین. بەڵام بەهەرحاڵ هەڵبەستێکی گرنگە و دەتوانرێ یەکی پێ بگیرێتەوە لەگەڵ باری سەرێنی مەحموود پاشادا چونکی (کوردی) دژواری و نارەوایی کارەساتەکە و لایەنگریی خۆی بۆ ئەو پاشایە ڕاگەیاندووە و ئامۆژگارییەکی نهێنیشی کردووە کەوا لە نێوان دەربارەکانیا کەسانی ناپاک و دژ هەن و لە دواییدا خواستی قووڵی دەروونیی خۆی بۆ سەرکەوتنی پاشا و لێک جیابوونەوەیان دەربڕیوە. وەک لە دەقی هەڵبەستەکەدا ئەمانە و گەلێ شتی تر بەدرێژی دەردەکەون.

ئەم هەڵبەستە لە (١٠) سەرچاوەی دەسنووسدا کە لە نێوان ساڵانی ١٨٧٨ز تا ١٩٦٠ز.دا نووسراونەتەوە لەگەڵ (٤) سەرچاوەی چاپکراودا لەبەردەستدایە و لەبەر ئەوەی کە ئەوەکەی چاپکراوە و جیاوازییەکی سەرەکیی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو سەرچاوە دەسنووسە چاکانەدا نییە،

بۆیە کردمە (بنکە) = أصل بۆ ئەم هەڵبەستە.
واتە: (چامەی کۆچکردن کە مصطفی بەگی «کوردی» بۆ کارەساتی کۆچکردنی مەحموود پاشای بەبەی فەرمووە).
هەروەها لە (گل/١)دا ئەم هەڵبەستە لە ژێر ئەم سەرەناوە فارسییەدا نووسراوە کە: (قَصیدَۀِ کُردي براي مُسافَرَتْ پادشاهْ بابانْ رَحِمَهُما الله) واتە: (چامەی «کوردی» بۆ سەفەری پاشای بابان خوا لێیان خۆش بێ).
ئەمجا بەپێی مێژووەکان، ئەم مەحموود پاشایە کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای بابانە و لە ساڵانی ١٢٢٨-١٢٥٠ک بەرامبەر بە: ١٨١٣-١٨٣٤ز.دا فەرمانڕەواییی کردووە لە سولەیمانیدا و لەو ماوەیەدا زۆر گێچەڵ و کارەساتی ڕووخاندنی بەسەردا هاتووە و پیلانی لە دژ گێڕدراوە و جەنگی تووش بووە لە لایەن مەمالیکەکانی بەغدا و شای عەجەم و خەلیفەی عوسمانی و، میرانی سۆران و عەبد پاشای مامی و حەسەن بەگی برای و خزمانی تری و کێو کێوە.
کە (کوردی) لە یەکێ لەو هەرایانە دواوە لەم هەڵبەستەیدا و بەتایبەتی لە تاکی چوارەمینیدا. کلیلی گەنجینەی ئەو کارەساتەمان ئەداتە دەست.
ئەهلی (ش): اهل.
حەشرە (ش): حشر.
بەوەدا کە (کوردی) هانای بردووەتەبەر (ئەهلی خەبەر) بۆ ئەوەی کارەساتەکەی بۆ ڕوون بکرێتەوە، دیارە لە پاشایەتی باباندا بەڕەسمی دەزگای (ئەهلی خەبەر)ی وەک (ئاژانسی دەنگوباسی ئێستا هەبووە و ئەمەیشم بەدەمی لە شارەزایانی وەک (ئایشێی عەلان) و (کوێخا ڕەشان)ی گوندی (سپی دارە) بیستووە کە تەمەنیان لە سەروو ١٠٠ ساڵییەوە بوو بەتایبەتی (ئایشێی عەلان) کە ئافرەتێکی گەڕەکی سابوونکەرانی سولەیمانی و ناودرکی چوخمەکەی بەرامبەر بە(حەوزەکەی سابوونکەراندا بوو.
وەک دەرمەخست مێژووەکانی بابان و هاوپەیوەندەکانی بەبێ سێ و دوو، دان بەزۆر لە کارەساتەکانی سەرینی ئەم پادشایەدا دەنێن کە یەکێکیان ئەمەی هەڵبەستەکەی کوردییە کەوا لە توێی وێژە باڵا و دڵگیرەکەی خۆیدا بەهەڵبەست وەک یادگارێکی جگەرگۆشانە بۆی بەجێ هێشتووین و گومبوونی پاراستووە.
مەغریب: ڕۆژئاوا، بەڵام ئەم سەرهێنانە دەرەوەی ڕۆژە لە مەغریبەوە کە بەپێچەوانەی گەرد و خولی ئەستێرەی ڕۆژەوەیە بەپێی بڕوای ئیسلامی نیشانەی برانەوەی ژیان و کۆتاییی جیهان و بوونێتی و ڕۆژی حەشرە کە مەبەستی (کوردی) لەم نیشانەیە ئەو قڕکردن و کوشتارە زۆرەیە کە وەک کۆتاییهێنان بەژیان وایە بۆ هەڵهاتنی ڕۆژ لە (مەغریب)ە لە ئاکامی پیلانگێڕان و جەنگدا لە دژ مەحموود پاشا. دەشبێ بۆ بەرێکردنی مەحموود پاشا کەوا سوپاکەی شکاوە لە دەشتاییەکەی ئەوسای ڕۆژاوای شاری سولەیمانییەوە قەڵەباڵغییەکی زۆری وەک (حەشر)

لەو شوێنە (مەغریب)ە وا لێ کۆبووبنەوە کە لەوێوە سەرەتای ڕێگەی سەفەرەکەی بووە بۆ هانا بردنە بەر (مەمالیکەکانی بەغدا) یا (ئەستەمووڵ) یا (بۆ لای شای ئێران) بۆ یاریکاری دژی دوژمنەکانی کە بەفیتی شای عەجەم لێی هەستاون لە گەڕانیشدا، بەمێژووی فەرمانڕەواییی مەحموود پاشادا شتی وا ڕووی داوە.

٢- نوور: پەرتەو، ڕووناکییەکی پیرۆزە لە کەسانی ئاینییەوە دیاری دەدات.

مەهدی: (امام محمد المهدی المنتظر) لە نەوەی عەلی کوڕی ئەبی طالیبە بەلای (شیعە)وە ئەم ئیمامە خۆی شاردووەتەوە بەڵام لە (سامەڕا) یا شوێنێکی تر سەر هەڵدەداتەوە و ئاسوودەیی و ئاسایش و خواناسی بڵاو دەکاتەوە کە ئەمەش گوایە لە دوا دوای بڕانەوەی ژیانی جیهانی و سەرەتای (حەشر)دا دەبێ.

لە طەرەف: لە لایەن.

مەککە: کوردی کە ناوی ئەم شارە دەبا و دەڵێ (مەهدی) لە لای مەککەوە سەری هەڵداوە ئەمە لە چ سەرچاوەیەکدا نەهاتووە کە مەهدی لەوێوە سەر هەڵبدات هەرچەندە ناوی زۆر شوێنی تر لە سەرچاوەکاندا هاتووە جگە لە (مەککە).

ظاهیر: دەرکەوتن.

غەڵەبەی ڕۆم: سەرکەوتنی ڕۆم-هەرچەندە (غەلەبە) بەواتە سەرکەوتنە بەڵام مەبەستی ئەو ژێر کەوتن و شکانەی (ڕۆم)ە کە لە سەرەتای سورەتی (الروم)دا لە قورئاندا هاتووە دەڵێ: (أَلَم غُلِبَتِ الروم...) گوایە لە سەرەتای ئیسلام و سەرێنی پێغەمبەردا، فارسەکان بەسەر ڕۆمدا زاڵ بوون و شکاندیانن و (قودس)یان لێ داگیرکردن کە (کەعبە)ی مەسیحییەکان بووە و لەسەر ئەوە بتپەرستەکانی (مەککە) تانووتیان لە ئیسلامەکان دەدا و دەیانوت: هەر وەکو (فارس) کە ئێوە بەکافریان دادەنێن، چونکە ئەهلی کیتاب نین ئەوا بەسەر ڕۆمی (مەسیحی)دا زاڵ بوون کە ئەهلی کیتابن، هەروەها ئێمەش کە ئەهلی کیتاب نین بەسەر ئێوەی ئەهلی کیتابدا زاڵ دەبین. لەسەر ئەمە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە لە دواتریدا ڕۆم سەرکەوتنەوە بەسەر فارسدا.

(کوردی)یش ئەو هەرایەی مەحموود پاشای بەو ڕووداوەی نێوان عەجەم و عوسمانی و مەمالیک بەرامبەر بەبابانەکان داناوە کەوا هیوای خۆی بەسەرکەوتن ڕاگەیاندووە لە پەردەیەکی نهێنیدا.

غەلەبەی ڕۆمە (گ/٢، س، گ/٣): غەلەبەی کوردە کە ئەمەش دەسکارییی گیوە.

بۆ کوشتنی (گ/٢، س، گ/٣): کوژتنی.

مَنْ کانَ کَفَرْ (گ/٣): مەن کان کەفەرە. کە بەهەڵە (کانی کەفەر)ی بەشوێنێک داناوە.

مَنْ کانَ کَفَرْ: نیشانەیە بۆ ئایەتی ١٤ لە سوورەتی (الفجر) لە بارەی ئەوانەوەیە کە پەیڕەوی حەزرەتی (نووح)یان نەدەکرد و نەدەچوونە ناو کەشتییەکەیەوە و لە ئاکامدا بەئاوی لافاوی گەورەی جیهانییەکە خنکان، کە خوا فەرمووییەتی (جَزاءً لِمَنْ کانَ کَفَرْ): واتە ئەو پەیڕەوی نەکەرانەی حەزرەتی (نووح) کە بەکافر دانراون ئەمە سزای ئەوانە (کوردی)ش

لێهەڵگەڕاوەکانی مەحموود پاشای بەکافر داناون.
ئەمجا (کوردی)ش کە بەم ئایەتە بەڵگەی هێناوەتەوە نیشانە بۆ ئەو کارەساتەیە کە بەسەر پاشای باباندا هاتووە کە کوشتنی دوژمنەکانی ئەو وەک پاداشتی ئەو سپڵەیی و هەڵگەڕانەوەیە یان کە وەک کفر وایە بەرامبەر بەپاشایەکی کوردی ئاوا چاکی وەک مەحموود پاشادا کە (وەلی نیعمەتی هەندێک) و (چاکەکار) لەگەڵ هەندێکی کەیاندا بووە و کەچی ئەوانە لێیان هەڵگەڕاونەوە. بۆیە بەکافری داناون و ئەمەش لەوەوەیە کە فەرمانڕەوایی مەحموود پاشای بەرەوا بینیوە.

٣- ئەشک: فرمێسک، ڕۆنتک، ئەسرین.
غوبار: گەرد، تەپوتۆز.
ئەلەم: ئازار، ژان، سوێ، سفتوسوێ.
باعیث: هۆ.
عومیان: نابینابوون، کوێربوون.
بەصەر: چاو، بینایی، هەستی بینین.
خوێنینە (کم): خوینیە.
لە چاوما (ش): لچاوم.
ئەلەمە (ش): ئەلەمی.
باعیثی عومیانی (ش): باعث عمیان.
ئەم تاکە لە (ش) و (ق/٤)دا دوا تاکە، چونکی ئەم دوو سەرچاوەیە تەنیا سێ تاکی پێشووی ئەم هەڵبەستەیان تیایە و بەس.
لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) بەوپەڕی پێ ناخۆشی و گریان و ئازاری هەتا ڕادەی لە داخاندا کوێربوونی بەرامبەر بەو کارەساتە دەربڕیوە.

٤- ثەبتی تأریخی: جێگیرکردنی مێژوویی: واتە کاتی هەراکە.
بەحر: دەریا.
حوروف: پیت: مەبەستی پیتی هیجائییە کە مێژووی هەراکەی لە تاکی دووەمدا پێ دەرهێناوە.
ئەلەم: ئازار-لێرەدا (عن) لە پەراوێزەوە بەڕێنووسی کۆن و بەفارسی نووسیویە:
(اَگَرُ چی اَلَمْ بمعنی آزاراست اما مقصود اَزْ اَوَّلِ سُورَهء مبارکهء) (الف لام میم = اَلَمْ) اَسْتِ کە مُژْدهء نَصْرْ میدَهَدْ) واتە: (ئەگەرچی ئەلەم بەواتە ئازارە، بەڵام مەبەست لە سەرەتای سوورەتی پیرۆزی (ئەلیف لام میم = ألم)ە کە موژدەی سەرکەوتن دەدا).
ئەم تاکە تەنیا لە (عن، ن)دا نووسراوە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

**هەڵسەنگاندن:**

وردەکاری (کوردی) لە نیو باڵی دووەمدا (یەکڕوو) کردنەوەی وشەی (سەر) کە بەپێی وێژەی دێرین جوانی و وەستایی و پەسەندە.

٥- خەوە: نووستنە، خەوبینییە.

وەسوەسە: پەژارە، هەزارە، جێگیر نەبوونی بیر لەسەر شتێک.

ڕەئیولعەین: بینین بە چاو.

عەلامات: ڕواڵەت، نیشانە.

مەددی نەظەر: وزەی هانای چاو، هەتا بینینی چاو بڕ بکات.

بەرامبەر بەنیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە (عن) لە پەراوێزەوە بەفارسی نووسیویە: (كُرْدِيُ تَأْرِيْخْ فاجِعَهَ را دَرِينْ مَصْرَعُ بحساب أَبْجَدَى اِسْتُخراجْ كَرْدَهْ) واتە (کوردی مێژووی کارەساتەکەی لەم نیو باڵەدا بەژمێری ئەبجەدی دەرهێناوە). هەروەها هەڵبەستەکەشی بەڕێنووسی کۆن وەک ئەمەی خوارەوە نووسیوە و ئەگەر وەهاش نەنووسرێت مێژووی ساڵەکەی لێ پێک نایەت و ئەمەش ئەو ژمارە کارییە کە (عن) نووسیویەتی:

(خَوَهَ يانْ وَسْوَسَيه ياكَه بَه رَإيُ اَلْعَيْنَهْ) واتە:

(خ = ٦٠٠) + (و = ٦) + (ھ = ٥)............................................................ = خوە: ٦١١

(ی = ١٠) + (أ = ١) + (ن = ٥٠)............................................................ = یانە: ٦١

(و = ٦) + (س = ٦٠) + (و = ٦) + (س = ٦٠) + (ی = ١٠) + (ھ = ٥)...... = وسوسیە: ١٤٧

(ی = ١٠)+ (أ = ١) + (ک = ٢٠) + (ھ = ٥).................................. = یاکە: ٣٦

(ب = ٢) + (ھ = ٥) + (ر = ٢٠٠) + (إ = ١) + (ی = ١٠)........................ = بەرإی: ٢١٨

(أ = ١) + (ل = ٣٠) + (ع = ٧٠) + (ی = ١٠) + (ن = ٥٠) + (ھ = ٥).............. = العینە: ١٦٦

تێکڕای هەمووی ئەکاتە: ٦١١ + ٦١ + ١٤٧ + ٣٦ + ٢١٨ + ١٦٦ = ١٢٣٩.

کە ئەم ژمارەی: ١٢٣٩یە ژمارەی ساڵی کارەساتەکەیە بەپێی ساڵنامەی کۆچی و بەرامبەرە بە ١٨٢٣ تا ١٨٢٤ز. کە ئەم ساڵی مێژووە لە دەسنیشانکردنی هەموو مێژووەکانی تر بەنرخترە، چونکی کوردی خۆی لە کارەساتەکەدا و لە سولەیمانی ژیاوە.

یان (ف، کم، با، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا: یا.

یاکە بە(ف، کم، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا: یابە.

یاکە بە (با): یاخو بە.

عەلاماتە (کم): عەلامانە.

دێنە (کم، ف، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا: دێتە.

مەددی (س): مەدّی.

ئەم تاکە جگە لە (عن، ن) لە هەموو سەرچاوەکانی دیدا چوارەمینە.

نەظەر: بینین، هەستی بینین.

کوردی ئەوەندەی ئەم کارەساتە کە لە لا دژوار بووە و هەستی شێواندووە و سەرسام بووە لەوەی کە ئایا ئەوەی بەچاوی خۆی دەیبینێ ڕاستە یا درۆیە. جگە لەوەی زۆر بەوەستایانەوە

ساده و کاریگەرانە بیری ئەم تاکەی ڕاگەیاندووە و بەپاڵ ئەویشدا وەستاییيەکی تری نواندووە بەوەی کە ژمارەی ئەبجەدی پیتەکانی ڕستەی نیو باڵی یەکەمی ساڵی کارەساتەکەی تیا جێگیر کردووە و وەک ئەمانەتێکی مێژوویی بۆی پاراستووین.

بەڵام بەبیر و بۆچوونم ژمارەی تاکەکانی دەبێ لەم (۱۱) تاکەی ئێستەی پترێک بووبێت بەوەدا کە هۆنەران ئەم جۆرە ساڵە مێژووییيانە دیاری ئەکەن وا باوە کە یا لە تاکی دواییدا ساڵی مێژووەکەدا دەکەن یا لە تاکێکی پێش ئەودا ئەوە دەگەیەنن کەوا مێژووەکە دیاری دەکەن، بەڵام ئەم ڕواڵەتە پەیڕەوی نەکراوە و لەم هەڵبەستەدا نابینرێ و ئەگەر تێبینیی پەراوێزەکەی (عن) نەبووایە بەم نهێنییەی ساڵی کارەساتەکە نەدەزانرا کەواتە لە پێش ئەم تاکەدا تاکێک هەبووە. جا ئەگەر ئەو تاکە ناتەواو بوو دەبێ بەلای کەمەوە تاکێکی تری لە شوێنێکی هەڵبەستەکەدا دیســـان ناتەواو بێ؛ چونکە بەپێی نەریتی وێژەی کـــۆن (کـــلاســـیکی) دەبووایە ژمـــارەی (بەیت)ەکانی هەڵبەست هەمیشە تاک بن نەک جووت چونکی خوا تاکە وەک ژمارەی ئەم هەڵبەستە تاکە واتە: (۱۱) بەیت بووە و بێ گومان زۆرتر بووە کە ڕۆژگار ئەم نهێنییە ئاشکرا دەکات.

هەروەها ڕەنگە جێگەی ئەم تاکەش ئێرە نەبووبێ و لە پێش دوا تاکەوە بووبێ بەپێی نەریتی کـۆن، بەم پێـیـە وەک لە زنجـیـرەی تـاکـەکـانی ئەم هەڵبـەســتـەدا دەردەکـەوێ شـێـواوی لە زنجیرەکەیاندا ڕووی داوە.

٦- ڕۆح: گیان، ڕەوان، جان.

تەن: لەش، جەستە، قاڵب.

مەهجوور: چۆڵکراو، بە جێهێڵراو.

مەهی: مانگی و مەبەست لە مەحموود پاشایە کە لە خۆشەویستیدا وەک مانگی داناوە، یا هەر خۆی لە ڕاستییدا جوان بووە، یا چۆن مانگ ڕووناکیبەخشە، ئەویش ئاوا سوودی بۆ زۆر کەس هەبووە لە تریفەی ڕووناکی چاکەکارییەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە (کوردی) چاوی لە دەستی مەحموود پاشاوە نەبووە. چونکە خۆی ساماندار بووە.

نییەت: بڕیار، ئارەزووی بەجەخت.

ڕیحلەت: کۆچ، بەجێ هێشتنی شوێنێک.

عەزم: لەسەر سووربوون، ئارەزوویەکی بەهێز.

سەفەر: کۆچکردن.

ئەم تاکە جگە لە (عن، ن) لە هەموو سەرچاوەکانی تردا پێنجەمینە.

مەهی من (ن): یاری من.

نییەتی ڕیحلەتە بۆ (ف): نیّت بو رحلە یا.

نییەتی (نم/۱): ینتی.

بۆ (گل/٨): یا.
(کوردی) ئەو سەفەرە یا ئەو کارەساتەی ئەوەندە بەلاوە گران و ناخۆش بووە کە بەگیانەڵاو دەرچوونی گیانی شیرینی داناوە.
٧- صەفا: خۆشی، کام، ئارەزوو.
زەید و عەمر: ئەم و ئەو کە دوو ناوی دوو کەسی عەرەبن.
شمر: ئەو کابرایە بوو کە حسێنی کوڕی عەلیی کوشت (ذی لجەوشەن). کە لەمەوبەری ئەم تاکەدا (ژیننامە)ی ئەو کابرایەم ڕوون کردووەتەوە.
جاری: ڕەوانە.
هەدەر: پووچ بوو، لە بەرد دراو، بەفیڕۆ.
ئەم تاکەش دیسان لە (عن، ن)دایە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
هەر (ن): بو.

**هەڵسەنگاندن:**

دیسان (کوردی) هونەرمەندی وێژەیی و زمانی نواندووە بەو جیناس ئاراییەی لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەدا کردوویەتی. جگە لەوەی لە بەرزی ئەم هەستە بەرز و پیرۆزەی کوردی ئەم تاکەی شایانی ئەوە کردووە کە بەزێڕ بنووسرێتەوە. دەسگا باڵایەکانی حکومەتی کوردستاندا هەڵواسرێت.

٨- سەفەر کردەیی من: مەبەستی لە مەحموود پاشای بابانە و وای داناوە کە گوایە هەر لەو ئەڕوا و بەس، چونکە ئەوەندە بەندیواری بووە.
لایقە: شایانە.
بەدر: مانگی چواردە -مەبەست لەوەی کە ئەو مانگی چواردەیە وەک قەڵغانێک بدرێتە دەست مەحموود پاشا وەک پاڵەوانێک و بەرگری لە خۆی بکات. ئەوە نیشانەیە بۆ (شق القمر)ی پێغەمبەر (د.خ) کە مەحموود پاشای بەوە شایان دیوە... هتد.
ڕەدد: بەپاشەوەدان.
عەدو: دوژمن.
ئەم تاکە جگە لە (عن، ن) لە هەموو سەرچاوەکانی تردا شەشەمینە.
لایقە خۆ (کم، نم/١، ف): لایقە.
بێتە (کم): پیتە.
هەروەها وشەی (بەدری) کە بەرێنووسی کۆن لە شێوەی (بدری)دا دەنووسرا و ئەوەش بە(بدرێ)یش دەخوێندرێتەوە و ئەوسایە (لایقە خۆ بدرێ فەلەک) کە پاشای بەلاوە وەها بووە کە شایانی ئەوە بووە لە داخی ئەو کارەساتە (فەلەک) سنگی خۆی دادرێ و ئەوسایە پاشا بەهەر پارچەیەکی دادڕاوی (فەلەک = گەردوون) خۆی پێ بەرگری، بکات بەرامبەر بەو

دوژمنانەی ئەو کارەساتە سەختەیان بەرپا کردووە واتە ڕۆژگارێکی ئەوەندە ناهەموار بووە.

عەدو: دوژمن، نەیار، دژ.

٩- باوجوود: لەگەڵ ئەوەشدا.

تەفاوت: جیاوازی.

حەضەر: کۆچ نەکردن، مانەوە، نیشتەجێیی...

ئەم تاکە جگە لە (عن، ن)دا هەشتەمینە.

تاکە (ف): تاکو.

تاکە (گ/٢، س، گ/٣): تاکی.

یاوەری (ف): همسری ئەو.

تەفاوت (گ/٢، س، گ/٣): تەفاوەت.

لە (کم): بە.

یا (نم/١): بە.

حەضەر: جگە لە (عن) و (ن) لە هەمووان‌دا (سەفەر)ە.

تێبینی:

لێرەدا کوردی وەک دەردێکی فەرمانڕەوایی بابانی دیاری کردبێ و دڵی بە(مەحموود پاشا) سووتابێ دەری خستووە ئەوەی لەگەڵیایە دژ و ناپاکیان تیایە و بۆیە پڕکێشیی نەکرد و خۆیشی لەگەڵیا بچێ زۆرترەکەی وای بۆ دەچم کە گلەیی لە سەرەڕۆیی و زوو هەڵچوون و خێرایی کردنی عوسمان پاشای بابان و برای مەحموود پاشا بووە.

١٠- دوعا: پاڕانەوە، تکا، نزا، داخوازی، خواست.

شایەد: بەشکو، بەشکم، قەمی.

شا: مەبەستی لە (پاشا) یا مەحموود پاشای بابانە کە جوانیی جیناس لە نێوان (سا) و (شایەد) دایە.

ئەم تاکە جگە لە (عن) و (ن) لە سەرچاوەکانی ترا هەشتەمین تاکە.

بەندمو (گ/٢، س، گ/٣): دەگرم.

کردەیی (گ/٢، س، گ/٣): کەردەیی.

بێتەوە (س): بهێتەوە.

لە نیو باڵی یەکەمدا و بەتایبەتی لە (بەندمو)ەکەیە ناسوارییەک لە کێشەکەیدا هەیە.

١١- سۆزش: دڵسووتان، سووتان، ئاوازێکی گۆرانیشە.

جۆشش: کوڵان.

ئەییام: ڕۆژان.

فیراق: جیایی.

ئاتەش: ئاگر.
شەرەر: كڵپە و گڕ، كڵپە كڵپ، نێڵە نێڵ.
ئەم تاكە لە هەمووواندا دوا تاكە بەڵام جگە لە (عن، ن) لەوانی تردا نۆیەمینە.
كوردییە (كم): كوردیە.
ئەییامی (كم): ایّام.
عەشقە (گ/٢، س، گ/٣): عیشقە.
شەرەری (گ/٣): سەرەڕی. ئەمەش دەسكارییە.
مەگەر (س): مەگە.

١٧

## قەوسی ئەبرۆ و موژەت

١- قـەوسـی (ئەبرۆ) و (مـوژە)ت، (تیـر) و (کـەوان)ە بە(عـومـەر)
(نیگە)هـت (قــەید)ی دڵ و (ئافــە)ی جــانە بەعــومــەر
٢- تیـــــرەبارانی نیگـاهت لـە دڵی عـــــاشــــــقی زار
تیــژ و ســـۆهان زەدە وەک نووکی ســـەنانە بەعــومــەر
٣- پـەرتـەوی عــــاریضی یـار و دڵی صــــــەد پارەیی من
قــیــصــەیی شــەوقی مــەهـوو چاکی کــەتانە بەعــومـەر
٤- بـەگــــڕی ئاگـــری دووریت (نـەخـل)ی مـــرادم ســـووتا
باغی شــادیم هەمــەدەم، فــەصلی (خــەزان)ە، بەعــومــەر
٥- تیـــغی ئەبرۆیی خــەمت صـــوورەتی ســەیفی (عــەلی)یە،
باعــیــشی زەمــزەمــەیی شــوری جــیــهــانە، بەعــومــەر
٦- بە(عەلی) من سوێندت ئەدەم (شیعە)ی ئەگەر، ڕەحمت بێ!!
خـۆ ئەگەر (سوننی)یی، مـەی (شـۆخی زەمانە)، بەعومـەر
٧- باری خـــوێنی من گـــرانە، مـــەیکە گـــەردانەی ملت!!
ڕەنجــەکــە حــۆ، (نە) ڕەهـی کــاهکەشــانە، بەعــومــەر
٨- حــــەســـــرەتی نماوە، ئەگـــەر کـــۆهکەنی بیــــمــــارم
دولبــەرم هـەروەکــو (شــیــرین)ی زەمــانە بـەعــومــەر

---

١- ئەم هەڵبەستە بەپێی بڕیاردان لەسەر خاوەنەکەی سەرچاوەکان دەبن بە سێ بەشەوە کە ئەوانیش:

**بەشی یەکەم:**

ئەم بەشەیان هەڵبەستەکەیان بە هی (کوردی) داناوە ئەوانیش:
(عن، گل/١، مس، کو، ف، نم/١، کم، گ/١، گ/٢، س)ن.
منیش؛ بەپێی ئاشنایەتیم لەگەڵ هەڵبەستی (کوردی)دا، (شێوە) و (سۆز) و (مۆرک)ی ئەوی تیا ڕەچاو دەکەم.

هەر بۆیە (عن)م کردە بنکە و دەسکەلای لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ئەم هەڵبەستە کە ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا یەکەمینە.

**بەتایبەتی دوو کەس**

یەکەمیان: مامۆستا مەلا فەتحوڵڵای پاوەیی پێش نوێژ و مامۆستای مزگەوتی (بن تەبەق)ی حاجی مەلا ئەحمەدی مەلا صالحی هەرمنی-پشت سەرا و پۆلیسخانەی سولەیمانی.

دووەمیان: مامۆستا مەلا عەبدولڕەحمانی (بیارە) یا (چۆڕی)ی (دەستڕەنگین) کە ماوەیەک لە هەمان مزگەوتدا نیشتەجێ و وانەبێژ بوو.

ئەو دوو مامۆستایەم پێیان ڕاگەیاندووم ئەم هەڵبەستە هی خودی (کوردی)یە و بۆ هاواڵێکی (مەلا عومەر) ناوی نووسیوە کە گوایە ئەو مەلا عومەرە نازناوی (حەسرەتی) بووە و هەردووکیان دەیانفەرموو ئەو (حەسرەتی)یە وەڵامی ئەم هەڵبەستەی بەهەڵبەستێک داوەتەوە.

بەداخەوە لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی ئەو بیستنەمەوە کە لە سەرەتای ساڵە سییەکانی چەرخی بیستەمدا بوو، کۆشاوم بۆ بەدەستهێنانی ئەو هەڵبەستە و تا ئێستەی (٢٠٠٤ز) دەستم نەکەوتووە.

هەر ئەو دوو مامۆستایەم دەیانفەرموو کە کاتێ ئەو (مەلا عومەر)ە ئەم هەڵبەستەی (کوردی)ی پێ گەیشتووە، سەردانی (کوردی)ی کردووە و لەوێ وەڵامەکەی بۆ (کوردی) خوێندووەتەوە.

هەروەها ئەو دوو مامۆستایەم نیشانەیان بۆ ئەوەش دەکرد کە ئەم هەڵبەستەی (کوردی) ئەگەرچی نامەیەکی یادکردنەوەی دۆستانە و ئارەزووی چاوپێکەوتنی (کوردی)یە بۆ (مەلا عومەر)ی هاواڵی بەڵام ئەم هەڵبەستەی (کوردی) لە (ڕەدیف) واتە (لەسەر کێش و پاشبەند)ی هەڵبەستێکی پێشووتری (مەلا عومەر)دا هەڵبەستووە بۆ ڕاستی ئەم ڕایەی ئەو دوو مامۆستایەم لە ساڵە حەفتاکانی (چەرخی بیستەمی زاینی)دا، لە پەڕاویخانەی (کۆڕی زانیاری عیراق-دەستەی کورد)دا لە کەشکۆڵی ژمارە (٢٤١)دا کە لە ناو و هێما (ڕەمزی)یەکانی سەرەوەدا بە(کۆ) نیشانەم بۆ کردووە لەو کەشکۆڵەدا ئەم هەڵبەستەم دۆزییەوە کە لە سەرەتای هەڵبەستەکەدا بە(فارسی) وەک سەر و (ناو)ی هەڵبەستەکە نووسراوە: (ردیف این حسرتی جوابداده) واتە (هاوچەشنی ئەمە حەسرەتی وەڵامی داوەتەوە)، کە ئەم دەقە (فارسی)یە وەها دەگەیەنێت کە (کوردی) یا (حەسرەتی) لە شێوەی (ڕەدیف)ی یەکتری واتە هاوچەشندا دایان ناوە، دەقەکە ڕوون نییە.

لێرەدا ئەو ئاگەدارییەش دەخەمە سەر ئەوی لەو سەرچاوە چاپی و دەستنووس و لە دەمی ئەو دوو مامۆستایەمەوە بیستوومە لە سەرەتاوە ئەوەندە شارەزای شاعیری ناوبراو نەبووم و پاشتر بۆم دەرکەوت کە هۆنەرێک بەناوی (مەلا عومەر)ەوە هەبووە کە نازناوی (ڕەنجووری) بووە، هەرچەندە ئێستە نایەتە یادم کە ئایا نازناوی (حەسرەتی)یشی هەبووە یان نە، بەڵام ئەوەم لە لا ڕوونە کە (کوردی) و (ڕەنجووری) هاواڵ و خۆشەویستی یەکتری بوون و بەتایبەتی

هەردووکیان لە گۆرانی و مۆسیقادا پسپۆڕ بوون، وەک لە سەرەتای هەڵبەستی دوایی (پیتی ر)دا ئەم ڕاستییە دەردەکەوێ.
هەرکە سەرچاوەی (عن)م دەستکەوت و ئەم هەڵبەستەم تێدا دیتەوە و لەو تاکە هەڵبەستەیدا کە لێرەدا حەوتەمین تاکە گومانم نەما کە ئەم تاکە هەڵبەستە هی (کوردی)یە.

**بەشی دووەم:**

لە سەرچاوەکاندا ئەم بەشەیان هەڵبەستەکەیان بەهی (بیمار) یا (سالم) داوەتە قەڵەم، ئەویش بەوەدا کە لە هەشتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەدا وشەی (بیمار) هەیە، دەبێ ئەوەش دیاری بکەم لە (بیمار) نازناوی سەرەتێکی ژیانی (سالم) بووە، بەم پێیە هەڵبەستەکەیان بەلاوە یا هی (سالم) و، یا هی (بیمار)ێکی تر بووە و، ئەوانیش (ن، س/٢)ن کە من پشتگیریی ئەم خاوەن دیاریکردنی هەڵبەستەکەیان ناکەم.

**بەشی سێیەم:**

لە سەرچاوەکانی ئەم بەشەدا هەڵبەستەکە هی (حەسرەتی)یە؛ چونکە لەو (هەشتەمین) تاکە ناوبراوەدا، (ناو)ی حەسرەتی هاتووە، ئەوانیش (گل/٨، گل/٩) وە پەراوێزی (کم و س/١)ە کە لەو پەراوێزەدا نووسراوە: (ئەم غەزەلە بەناوی -(حەسرەتی)یەوە لە یەک دوو جێگادا نووسراوە).
من کە هەتا ئێستەش لەسەر ئەو ڕایەم کە ئەم هەڵبەستە هی (کوردی)یە و بەدووری نازانم کە بەپێی ئەو (هەشتەمین تاک)ە سەرچاوە بووبێ کە هەڵبەستەکەیان بە هی (کۆهکەن) دانابێ و، یا وەهای دابنێن، چونکە وشەی (کۆهکەن)یش لەو تاکە ناوبراوەدا هاتووە.
سا ئەم هەڵبەستە هی هەر کەسێک بێ هەتا یەکلایی بوونەوەیەکی بێ (بەربەرەکانێ) ئەم هەڵبەستە با لێرەدا بەناوی (کوردی)یەوە بێت کە من بەبەراورد و شیکردنەوەیەکی زۆر بە هی (کوردی)م زانیوە و ئەگەر بەڵگەی بەهێزتر پەیا بوو کە هی ئەو نییە، دیسان نووسینەوەی ئەم پوختەیەی کارێکی بەسوودە کە وەک سەرچاوەیەکی زانیارییە لە بەردەم لێکۆڵەرەوەی دوای خۆمدا.

(قەوس): لە ڕووی زمانییەوە بەواتە: کەوان، خەم، کەمانی، پێچ.
(ئەبرۆ): برۆ.
ئەبرۆ (ف): برۆت.
(موژە): برژانگ، موژگ، موژیلان.
(تیروکەوان): ناوی چەکێکی جەنگیی زۆر کۆنی مرۆڤە کە لە کوردستانیشدا لە کۆنەوە بەکارهێنراوە کە لە جێگەی (تفەنگ و گولله) یا (مەترەلۆز = ڕەشەشاش و گولله) وە یا (دەمانچە و گولله) بەشکو لە شوێنی (تۆپ و گوللەتۆپی) ئێستامان بووە.

**هەڵسەنگاندن:**

بەپێی (دەستووری وێژە)ی کۆن لە نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا (لەف و نەشر)ی

(موشەوەش) هەیە کە یەکەم جار (قەوس)ی ئەبرۆی ناو بردووە و یەکەم جار (تیر)ی ناو بردووە کە لە (قەوس) مەبەستی (برۆ)یە دووەم جار هەروەک لە باسی خۆشەویستەکەیدا واتە دوای (برۆ) ئەمجا (موژە)ی ناو بردووە و ئەوەتە لە چەکەکەدا یەکەم جار بەواتە ڕووی خۆشەویستەکە کە برۆیە لە چەکەکەدا (تیرە) واتە (مورەتەب) نییە واتە (ڕێکوپێک نییە) و بە(موشەوەش) دادەنرێ.

ئەم پارچە هەڵبەستە هەموو تاکەکانی بەپاشبەندی (بەعومەر) واتە سوێندخواردن (بەعومەر) کۆتاییان هاتووە، ئەوەش هەم لەوەوە کە هەڵبەستەکەی بۆ (مەلا عومەر)ی هاواڵی داناوە و هەم نیشانەیە بۆ ڕێز و خۆشەویستی (مەلا عومەر) لە دڵی (کوردی)دا وەک لە کوردەواریدا باوە دەڵێن: (سوێند بەسەری دەخورێ) کە ئەوەتا لە زۆری خۆشەویستی و ڕێزگرتن لە (مەلا عومەر)ەوە دەبینرێ لەم هەڵبەستەدا (مەلا عومەر)ی وەک دڵخوازێکی زۆر خۆشەویستی خۆی دەرخستووە و بە سەر جوانێتییەکەیدا هەڵی داوە کە ئەمەش لە هەمان کاتدا جۆرە ڕێگەیەکی (سۆفیانە)یە و هەڵنانی نێرینە یان لە هەڵنانی خوا و پێغەمبەرەوەیە (بەپێی وێژەی کۆن نەک لە (نێربازییەوە). کە ئەوەتا جوانیی کەوانی برۆی (مەلا عومەر) و برژانگەکانی وەک تیروکەوان ناو بردووە و دڵی (کوردی)یان پێکاوە.

کەمان (کم، س، نم/١، گ/٢، گ/٣): کەوان.

مەبەستی (کوردی) لە (ناو)ی (عومەر)دا دوو (عومەر)ە.

یەکەمیان:

خودی (مەلا عومەر ڕەنجووری) هاواڵ و خۆشەویستی بووە کە ئەم هەڵبەستەی وەک (یادکردنەوەی) بەنامەیەک بۆ (مەلا عومەر) ناردووە.

دووەمیان:

بەپێی بڕوای ئاینی مەبەست لە (عومەری کوڕی خەطابیش) بووە. کە (دووەمین خەلیفەی ڕاشیدین) بووە لە ئاینی ئیسلامدا. فەرمانڕەواییی ئەم خەلیفە لە نێوان ساڵانی (١٣ تا ٣٢)ی کۆچیدا بووە.

(عومەر) یەکێ بووە لە مەزنترین پیاوانی عەرەبی ئەوسا و ئیسلامەتی، کە لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچیدا ئیسلام بووە و، ئەوەندە پیاوێکی ناودار بووە پێغەمبەر (د.خ) بۆ ئیسلام بوونی (عومەر) زۆر جار لە خوا پاڕاوەتەوە کە خوا یەکێ لە (دوو عومەرەکە) ببەخشێ بەئیسلام ئەوی کەیان (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)ی خەلیفەیەکی (ئەمەوی) بووە. هەر لەبەر ئەوە کە (عومەری کوڕی خەطاب) بووە بەئیسلام پێغەمبەر (د.خ) نازناوی (فاروق)ی پێ بەخشیوە.

لە (غەزەوات)ەکاندا ئەم (عومەر)ەیان بەشداری لە جەنگی (بەدر) و (ئوحود)یشدا کردووە و پیاوێکی زۆر ئازا و دادپەروەر و ڕاستگۆ بووە و هەرگیز خۆی بەگەورە نەزانیوە و زۆر

خواپەرست و بەوردی پەیڕەوی ئاینی ئیسلامی کردووە.
(حەفصە)ی کچی خۆی لە پێغەمبەر (د.خ) مارە کردووە. دوا بەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ)، عومەر یەکسەر (بەیعەت)ی بەخەلیفەیەتی (ئەبوبەکری صدیق) کردووە و (ئەبووبەکر)یش لە نێوان هەموو ئیسلامە ناودارەکاندا ئەوی بەشوێنگری خۆی هەڵبژاردووە و پێشنیازی ئەوەی کردووە.
لە سەرێنی خەلیفەیەتیی (عومەر)دا (شام) و (عیراق) و (کوردستان) و (فارس) داگیر کراون. یەکەمین نازناوی (امیر المؤمنین) بەم (عومەر)ە بەخشراوە و دامەزرێنەری (ئیمپراتۆریی) ئیسلام بووە.
(ئەبوولوئلوئی فەیرۆزی فارسی) لە مزگەوتدا ئەم (عومەر)ەی کوشتووە.
لەبەر ئەوەی لە پەیڕەویکردنی چەند دەقێکی ئاینی ئیسلامدا هاوبیری (ئیمامی عەلی) نەبووە و عەلییش نەک هەر بۆ خەلیفەیەتیی (ئەبووبەکر) بەشکو بۆ خەلیفەیەتیی لە (عومەر) و (عوسمان)یش خۆی بەشایانتر داناوە و بەڵام (سەحابە) و ئیسلامەکان لە هەر کەسێ شارەزاتر بوون و ئەو هەر چوار خەلیفەیەیان ناسیوە و لە ئیسلام پاکییانەوە بووە کە (عەلی)یان نەکردووەتە جێگەی سێیانەکەی تر، بۆیە پەیڕەویکارانی (عەلی) واتە (شیعە) لەوەوە ڕقیان لە هەرسێ خەلیفەکەی ترە و تەنانەت جنێوی پیسیان پێ دەدەن و تاوانی ناڕەوایان دەدەنە پاڵ.
بۆ ئەوەی کە ڕام گەیاند مەبەستێکی تری (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا ئەم (عومەری خەطاب)ە بووە، ئەوەیە (کوردی) بەپێی هامشۆی زۆری بۆ ناوچە (شیعەنشین)ەکانی (ئێران) کە خراپکاری و ناڕەوایی نائیسلامانەی لێ دیون، بۆیە ئەم مەبەستەی لەم عومەرە بووە لەم هەڵبەستەیدا، کە بەوردی ڕاگەیاندنی ئەم ڕاستییانە شوێنیان ئێرە نییە.
(نیگەه): کاریگەریی تێڕوانین، ئای تەماشاکردنی (کوردی) بۆ (مەلا عومەر)ی هاواڵی وە یا کاریگەری تەماشاکردنی (مەلا عومەر) بۆ هەر کەسێ بەلای (کوردی)یەوە زۆر دڵگیر بووە.
(قەید): بەند، ئەوەی هەر شتێکی پێ بەند دەکرێ یا پێی دەبەسترێتەوە وەک (تەوقی گەردن)، (زنجیری دەست) و (کۆت) و (پێوەند)ی پێ.
کە ئەمان (بەندی، یا بەندکراو)یان لە بەندیخانەدا پێ دەبەسترێتەوە و بەند دەکرێن. کە مەبەستی (کوردی) لە کاریگەریی (نیگەه) (نیگا)، (تەماشاکردن)، ڕوانینی (مەلا عومەر) بووە. کە دڵی (کوردی)ی بەند کردووە (بەستوویەتەوە).
(دڵ) (عن) لە پەراوێزدا نووسیویە: نوسخە–دین–واتە لە هەندێ نوسخەی ئەم هەڵبەستەدا لە جێگەی ئەم وشەی (دڵ)ە وشەی (دین)یش هاتووە.
(ئافەت): دەرد، یا هەر شتێک یا هەر کەسێکی خراپ و ئۆف لێکراو، بەواتە ئەو نیگایەی ئەوەندە دڵ و دەروونی هەر کەسێکی ئاوا تووشی (ئافەت) کردووە.

جان: گیان، ڕەوان.

جـان (گ/٢، س): گـیـان. ئەمـیش لە دەسـتكارییـەكـانی (گـیـو)ە. لە پێناوی پاككردنەوەی هەڵبـەسـتی شـاعـیـران لە وشـەی بێگانە، كـە ئەم وشـەی (جـان)ە (فـارس) بەكـاری هێناوە و دەهێنێ.

٢- ئەم تاكەیش وەك درێژەپێدانی تاكی پێشووی وەهایە و لە سەرچاوەكاندا دووەمینە.

تیرەباران: دەست درێژ، شێلگی، گوللەباران.

سۆهان: بڕبەند، هەسان، ئەوی تیغ و (سەنان) و ئەمانەی پێ تیژ دەكرێ.

سۆهان زەدە: لە هەساندراو، (بڕبەند) لێدراوە، تیژكراوە، تیژ.

زەدە: لێدراو.

ئەم تاكە لە (نم/١، كم، گ/٢، س، گ/٣)دا نییە لـە (س/١، س/٢)دا شـەشـەمـینە و لە (عن)دا دووەمینە كە ئەمیانم بەڕاستتر زانی.

لەم تاكە هەڵبـەسـتـەدا (كوردی) ئارەزووی چاوپێكەوتنـی (مـەلا عومـەر)ی كردووە، بەڕادەیەك خـۆشی ویسـتـووە وەك دڵخـوازێكی بەتیـری نیگای پێكراوە. عـاشـقی زار (جگە لە -عن-) لە هەموو سـەرچاوەكانی تردا (عاشق دا)یە كە ئەمیش لەنگە و بڕگەیەكی ناتەواوە. كە لە (عن)دا وەك دەقی سەرەوەی ئەم تاكەیە و جێگیرم كرد و لەنگیی نامێنێ.

سـەنان: وشـەیەكی (عـارەبی)یە و (سـینان)یشـی پێ دەڵێن، بەواتە (سـەری) یا (نووكی) (ڕم) و (نێزە) و (تیـر) كـە پێیـانەوە چـەسپ كراوە، بۆ ئەوەی لەبەر تیـژییـەكەی بەزوویـی بچـەقـێنرێتـە لەشـەوە، كـە لە كاتی جەنگدا بەكارهـاتووە، بەڵام سـەرەڕای ئەو تیژییەشـی لێرەدا (كوردی) ئەو سـەرە (سەنـان)ە تیژەشـی بـەبڕبەند و بەهەسـان تیژتر كراو ناوبردووە كە مـەبەسـتی لەوە بووە یەكجـار بەزوویی ئەو تیری نیگا: (ڕوانینەی) یارەكەی كە (ڕەنجووری) بووە لەسـەری (سەنان) تیژتر چەقیوەتە ناو دڵی عاشقێكی وەك (كوردی)یەوە...

٣- ئەم تاكەش درێژەپێدانی دوو تاكەكەی پێشووە و یەكێتییەكی بابەتی لەم هەڵبەستەدایە.

پەڕتەوی: تیشكی، ڕووناكی، پڕشنگی، تریسكانەوەی.

عاریض: ڕوومەت، كوڵم، لای كوڵم، ڕوو.

پارە: پارچە، لەت لەت، چاك (چاك چاك)، دڕاو.

قیصە: سەرگوزەشتە، چیرۆك، سەربەهورد، سەرگوزەشتەیەكی ئەفسانەییە.

شەوقی: ڕووناكی، تریفەی مانگ.

مەه: مانگ.

چاك: داوێن، شەق بردوویی. لەت لەتی، شەق بردن كە مەبەست لەمەیانە، پارچە پارچە.

كـەتان: ڕووەكـێكی جـوانە و لە بەرەی (كـەتانی)یەكـانە، باڵا بەرز و ڕاسـتـە و گوڵی شـینە، لە كۆنەوە لە كوردستاندا دەچێنرێ، لاسكەكەی بەوشكی و كوتاننی داوی (كەتان)ی لێ پێك دێ

و دەڕێسرێ و دەکرێتە (کر) تۆوەکەی دەگوشرێ ڕۆنێکی لێ دێتە دەرێ کە پێشوونیان کردوویانە بەچراوە لەباتی نەوت، تۆوەکەی بەکولاوی (برین) دەردەکات و ئاوساوی دەنیشێنێتەوە ئەفسانەییەکەی ئەوەیە گوایە (گوڵی) ئەم ڕووەکە وەک لفکەشایی یا (گوڵخەندەران) وایە بەتیشکی مانگی شەو شەق دەبات کە هۆنەران زۆریان ناو بردووە و ئەمەش کەلەپوورێکی ئەفسانەییمانە.

**هەڵسەنگاندن:**

لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتەب) هەیە و جوانییەکی وێژەییە، ئەم تاکە لە (عن، س/١، س/٢)دا سێیەمینە و لە (کم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە.

مەهو (ک/١، گ/٢، گ/٣، کم، س): مەو.

مەهو (نم/١): مهو.

٤- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (گ/٢، گ/٣، س)دا دووەمین و لە (س/١، س/٢)دا شەشەمین و لە (عن)دا چوارەمینە و بەپێی (یەکێتیی بابەت) من چوارەمەکەیم بەجێگیرتر زانی.

بەگڕی ئاگری دووریت (لە هەموو سەرچاوەکاندا): بەشەرارەی غەمی تۆ.

هەمە (لە هەموو سەرچاوەکاندا): (هەموو) نووسراوە کە لە کێشدا گرانترە و بۆیە (هەمە)کەی (عن)م پەسند کرد کە لە کێشدا سووک و گورجترە و هەڵبەستەکە لەنگ ناکات و سوارە.

هەمەدەم: هەموو کاتێ من ئەوی (عن)م لە سەرەتای نیو تاکی یەکەمی هەڵبەستەکەدا بەپڕ واتاتر و جوانتر زانی.

نەخل: دارخورما، دارێکی زۆر بەرز و (قنج)ە کە ڕاست هەڵدەچێ. ئەو درێژییەی دارەکەی چواندووە بەدرێژیی خۆی و کە لە دووری (مەلا عومەر)دا ئەو هیوا و ئاواتەی سووتاوە.

فەصلی خەزان: وەرزی پایز کە وەرزێکی پڕ لە گژەگژ و گێژەڵووکە و ئاڵۆز و گەڵاڕێزان و ناخۆشە و بەزۆری دار و درەخت ڕووت دەبن (جگە لەو درەختانەی هەمیشە سەوزن) ئەم چواندنی باغی هەمیشە سەوز و خۆش و پڕ گوڵ و گوڵزارەی خۆی لە دووریی (ڕەنجووری)ی هاواڵی بەو (وەرزی پایز)ە داناوە.

٥- تیغ: هەر ئامێرێکی بڕندەی وەک، قەڵەمبڕ، چەقۆ، کێرد، خەنجەر، شیر، قەمە، سونگی، قەیارە، کە لە کاریگەریی برۆی خۆشەویستەکەیدا چواندوویەتی بە(تیغ) وەک شیر (سەیف)ی (عەلی کوڕی ئەبی طالیب).

تیغ (ف): تیر، کە ئەمەش هەڵەیە و (تیر) کەوانی نییە.

خەم: کەوانی، پێچدار، شەت، وەک کەوانی برۆی (مەلا عومەر)ی هاواڵی و خۆشەویستی کە بەبینینی ئەو برۆیە وەک شیرەکەی ئیمامی عەلی کاریگەر بووە لە دەروون و هەستی کوردیدا.

صوورەت: وێنە.

ئەم تاکە لە (نم/١، کم، گ/١، گ/٢، گ/٣، ف...)دا سێیەمینە و تەنیا لە (عن)دا پێنجەمینە.

(سەیف): شیر، کە لە (ف)دا بەشێوەی (صیف) نووسراوە کە هەڵەی ڕێنووسە.
مەبەست لەم (شیر)ە ئەو شیرە بووە کە ناوی (ذولفەقار) بووە کە لە تالانی (غەزا)ی (بەدر)دا هی یەکێ لە دوژمنەکانی ئیسلام (مونەبیە کوڕی حەجام) ناو بووە و کوژراوە و کەوتووەتە دەست پێغەمبەر (د.خ) و بۆیە (ذولفەقار)ی پێ وتراوە، نووکی ئەو شیرە دوو فاقی نووک تیژ بووە.
ئەو شیرە پاش کۆچی دوایی (پێغەمبەر-د.خ) بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی ئامۆزا و زاوای براوە.
لەبەر ئەوە ئەوەتا لێرەدا (کوردی) لە دڵشکاوی خۆیەوە لە (شیعە) لەم تاکە هەڵبەستە ناوی (عومەر) و (عەلی)ی بەیەکسانی بە(ڕاستە ناو)ەکە ڕووتەکەیانەوە بردووە و سەرەڕای ئەوە سوێندی بە(عومەر) خواردووە نەک بە(عەلی)یش.
زەمزەمە: ئەم وشەیە لە سەرەتاوە ناوی جۆرە نزا و لە خودا پاڕانەوە و سوپاسی خواکردنی (زەردەشتی)یەکان بووە لە کاتی خۆشتن و، یا (خۆرشت) خواردن و نۆشکردندا کە لەسەرخۆ و بەدەنگی نزم، یا وەک بڵێی لە ژێر لێوەوە ئەو نزایەیان لە شێوەی ستران (گۆرانی)یەکی ورتە ورت ئاساییدا چڕیون. کە لە پاشترا (زەمزەمە) بەواتای (هەراوهوریا) و (دەنگەدەنگ) و (ناوبانگێتی)یش هاتووە.
زەمزەمەیی (گ/١، گ/٢، گ/٣، س/١): زەمزەمە و.
شۆر: دیسان بەهەمان واتایەکانی (زەمزەمە) واتە: هەرا، هەراوزەنا، هەراوهوریا، دەنگەدەنگ، ئاشووب و، (پشێوی)یش هاتووە، جگە لەوەی کە (شۆر) ناوی یەکێکە لە ئاوازە (مەقام)ە کوردییەکان.
لێرەدا من پێم وایە ساز (لەحن، نەغمە)ی ئەو جۆرە سترانەی کە (زەردەشتی)یەکان لە ژێر لێوەوە بەورتەورت وتوویانە هەمان ئەم ئاوازی (شۆر)ەی ئێستا و پاشماوەی ئەو زەمزەمە کوردییە (زەردەشتی)یە بێت.
(جیهان): گێتی.
**مەبەست لەم تاکە:** ئەوەیە کە کردنی بڕۆی وەک (تیغ)ی (شیر)ی ڕەنجووری بەوێنەی (شیر)ە (ذولفەقار)ەکەی (عەلی) وایە کە ئەو بڕۆیە وەک ئەو (شیر)ە هۆ و مایەی ئاشووبەی جیهان بووە بەلای (کوردی)یەوە کە بۆ ڕاستی و باوەڕپێکردنی ئەو واتایەی کە (کوردی) مەبەستی بووە، ئەوەتا سوێندی بەعومەر خواردووە.
ئەم تاکە لە (کم، نم/١، ف، گ/١، گ/٢، گ/٣، س/١)دا سێیەمینە.
٦- ئەم تاکە هەڵبەستەش جگە لە (بابەتییانەیی) و بەدواداچوونی باسی (عەلی)یەکەی تاکی پێشوویش، لە (ف، نم/١، کم، گ/١، گ/٢، گ/٣، س)دا چوارەمینە و، تەنیا لە (عن)دا شەشەمینە.

بە(عـەلی) مـن: (لە هەمـوو سـەرچاوەکـاندا جگە لـە (عن) نووسـراوە (بەعـەلی) کـە ئەمـەش برگەیەکی لە کێشـدا کەمـە و لەنگییە و لە (عن)دا لـەنگ نییـە، هەرچەندە وشـەی (سـوننی)یش جۆرە قورسییەکی تیایە.

(کوردی) لە تاکی پێشـوودا ڕازی بە(عەلی) دادا و ئەوا لێرەدا لەسـەر (بابەتی) عەلی دەڕوات کە جگە لەوەی لە پاشـبەندی تاکـەکانی ئەم هـەڵبەسـتەدا (مـەلا عـومـەر ڕەنجـووری) هـاواڵی بە(عومەر) سـوێند داوە، ئەوا لێرەدا بە(عەلی)یش سوێندی ئەدا و لە تاکە هەڵبەستی دوای ئەم تاکـەشـدا ئاشکرای کـردووە کـە سـوێند دانەکـەی بە(عـەلی) بۆ ئـەوە بووە کـە (مـەلا عـومـەر) سـەردانێکی بکات.

سـوێندت دەدەم ئەگەر (شـیعەی): کوردی چاک زانیـویەتی کە (مەلا عومەر ڕەنجـووری شـیعە نیـیـە و سـوننەیە، لـەگـەڵ ئەوەشـدا و بـۆ ئەوە ڕێگە لە (ڕەنجـووری) ببـڕێتـەوە لە پێناوی خۆشـەویسـتیی (ڕەنجووری)شدا بە(عـەلی) سوێندی داوە کە دەبێ هـەر دیدەنییـەکەی خـۆی بۆ (کوردی) بکات.

ڕەحـمت بی: کـوردی لە پاڵ (گـریمـانە)ی ئەوەدا کـە (مـەلا عـومـەر)ی بەشـیـعـە دانـاوە لەم دانانەیشیدا (ڕەحمت بێ)ی لە (مەلا عومەر) کردووەتە مـەرجێکی بە(شیعە) کردنەکەی، چونکە مەبەستی لەوە بووە کە (شیعە) بێ بەزەییانە (ڕەحم ناکەن) بەسێ خەلیفە ڕاشیدینەکەی تر و جنێـویان پێ داون و پێیـان دەدەن و بەتـاوانی زۆر گـەورە تاوانبـاریان دەکـەن دژایەتی لەگـەڵ سوننەدا (بەبێ ڕەحمانە) دەکەن.

ڕەحمت بێ (نم/١): رحمت ببی.

ڕەحمت بێ (س): رەحمت هەبی.

کوردی هـەر بەوەندە لە (مـەلا عـومـەر)ی هـاواڵی نەوەسـتـاوە و دیسـان ئەوەتا لە نیـوەی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەیدا پێی وتووە:

خـۆ وەک دەزانم کـە شـیـعـە نیت و جا کـە سـوننەیت، ئەوا بە(عومـەری کوڕی خـەطاب) و، یا (بەسـەری خۆت) سوێندت دەدەم بۆ ئەوەی تکایەکەی بکرێت کە دیدەنیم بکەیت.

(کـوردی) هـەر لەم سـوێنددانەی دووەمی (مـەلا عـومـەر)دا ئەوی بە(ئەی شـۆخی زەمـانە) ناوبردووە، بەرامـبـەر بەدانـانی (مـەلا عـومـەر)ەوە بە(شـۆخی زەمـانـە)یە ئەوە دەگـەیەنم کـە ئەم هەڵنـانەی لە ڕووی (نەوازش) واتە (مـوجـامـەلە)وە نەبووە بەشکو وەک لە پیـاوە پیـرەوێژەوانە شـارەزایەکـانم بیـسـتـووە کـە مـەلا عـومـەر بەڕاسـتـی زۆر قـۆز و باڵابەرز و هەیکـەلی بووە و هـەرچەنـد لاوازیش نەبووە، بەڵام زۆر قـەڵەویش نـەبووە و پیـاوێکی چاو جـوانی بـرۆ پەیوەسـتی برژانگ درێژ و قەلەمرێک و جوان و دڵگیر بووە سەرەڕای ڕەوشت بەرزییەکەی بۆیە بە(شۆخی زەمانە) ناوی بردووە.

٧- ئەم تاکە تەنیـا لە (عن)دا هـەیە لە نێوان تاکی شـەشـەم و حـەوتەمی تاکەکانی سـەرچاوەکاندا

نووسراوه و ئەم تاکەیش هێشتا چاپ نەکراوه.

لەم (نیو باڵی)ی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی)دا بەڕەوانی ئەوه ئاشکرا دەبێ کە ئەم هەڵبەستە بۆ (ڕەنجووری) دانراوه، بەبەڵگەوه بۆ (ڕەنجووری)یەکەی لەم نیو باڵییەدا (ڕەنجەکە) هاتووه کە لە (کوردەواری)دا (باوه) ئەگەر لە ڕووی ڕێز لێ گرتنەوه و، یا لە خۆشەویستییەوه کەسێک بانگ بکرێ یا ناو ببرێ ناوی ئەو کەسە یا (نازناو)ەکەی کورت دەکرێتەوه وەک لێرەدا ئەو (ڕەنجووری)یە بە(ڕەنجە) یا (ڕەنجەکە) ناوبراوه کە ئەگەر (ڕەنجە) بێ ئەوه شێوەی بانگکردن یا ناوبردنیەتی و خۆ ئەگەر (ڕەکەکە)یش بێت ئەوه دیسان یا بانگکردن و، یا ناوبردنە و هەروەها (ڕەنجەکە) واتای (خۆ ماندوو بکە) یا (قەدەم ڕەنجە) واتا پێی خۆت ماندوو بکە بە هاتن، کە بەواتا (فەرموو)ە (کوردی)یش لە سەرەتای ئەم تاکەدا وەک پێشەکی بە(ڕەنجووری)ی ڕاگەیاندووه کەوا لە دووری ڕەنجوورییەوه لەوانەیە (کوردی) بمرێت و (ڕەنجووری)ی وریا کردۆتەوه بەو مردنە خوێنی (کوردی)ی لەسەر بەگران دەکەوێ یا دەیکاتە گەردانەی (واتە تەوقی ئەستۆ) و ئەمجا بەنازناوەکەی ڕەنجوورییە و ئەو (فەرموو)ەی لێ دەکات تێی دەگەیەنێ کە هاتنەکەت ئەوەندەی خوێنەکەم یا ئەوەندەی بڕینی ڕێگای (کاکێشانی ئاسمان) سەخت و گران نییە.

لە ڕووی بەڵگەوه ئەم ناوی (کاکێشان) بردنەش بەڵگەی هەرە گرنگە؛ چونکە مامۆستا (مەلا عومەر) سەرەڕای ئەوەی مەلا چاکێکی زانا بووه هەروەها زانایەکی پسپۆڕ بووه لە زانیاریی (چەقمینی) واتە (گەردوون و ئەستێرەشوناسی)دا لەم زانیارییەشییەوه هەم بەرهەمی (ڕەنجووری) لەمەڕ دیاریکردنی شوێنی دۆزینەوەی سەری مانگی کۆچی (هیجری)یە عەرەبییەکان، وەک لە ناوچەی پشت خورماڵەوه هەیەتی کە دەسکردی خۆیەتی و هەروەها بەرهەمی نووسراویشی لەم زانیارییەدا هەیە کە من نامیلکەیەکی (فارسی)ی ئەوم بەناوی (ڕۆژنامەی مەلا عومەر ڕەنجووری)یەوه لا هەیە کە (محەمەدئەمین هەورامی) لە ڕۆژی هەینی یەکی مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٢٣٤ک. بەرامبەر بەساڵی ١٨١٨ز.دا نووسیویەتەوه.

٨- ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە، منیش کە شارەزای هەڵبەستەکانی (کوردی)م کە هەموویان بەتێکڕایی تاکەکانیان ژمارەیان تاکە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن و ئەم هەڵبەستەش کە تا ئێرەی واتە ئەم هەشت تاکەیم دەست کەوتووه، کەواتە ئەم هەڵبەستە ناتەواوه، چونکە (جووت)ە و ئەوەش لە وێژەی کۆندا ڕێگە نەدراوه و بەتایبەتی شاعیرێکی شارەزا و گەورەی وەک (کوردی) پەیڕەوی ئەو دەستوورەی کردووه. چونکە خوای مەزن (تاک)ە دەبێ ژمارەی (بەیت)ی پارچە هەڵبەستیش (تاک) بێ، کەواتە چەندێتی ناتەواویی ئەم پارچە هەڵبەستە نازانرێ.

تاکو بزانرێ خاوەنەکەی کێیە، چونکە (نازناو) بەتێکڕایی لە دوا تاکدایە ئەم تاکە هەڵبەستە وەها لێک دەدەمەوه کە ئەگەر دڵدارێکی وەک (کۆهکەن)ی هونەرمەند کە بەو چیایەی لای

کرماشانەوە ئەو هەموو ڕێگە و کۆشک و نەخش و نیگارەی تاشیوە؛ چونکە بەئاواتی خۆی نەگەیشت کە (شیرین) بووە ئەوا وەک لەم تاکەدا هاتووە ئەشێ ئەو کۆهکەنە ناوی حەسرەتی بێ نەک ناوی شیعر کە ئەویش بەلای شاعیری ئەم تاکەوە بە(بیمار) ناوبراوە نەک (بیمار)ی شاعیر و بە(شیرینی زەمانە) ناونووسی کردووە کە من ئەم (شیرینی زەمانە)یەش وەها دادەنێم کە (شیرینیی زمان) بێ، واتە (شیرینیی زوبان) یا (زوبان شیرین)، چونکە پاشبەندی شیرین زەمانە دووبارەیە.

سا هەرچییەک بێ چونکە هەڵبەستەکە ناتەواوە، وەک لە کۆتاییی بەشی سێیەمی سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستەوە نووسیومە، دەبێ چاوەڕوانی دۆزینەوەی سەرچاوەی دەسنووسی تری ئەم هەڵبەستە بین، هەتا خاوەنەکەی یەکلا دەبێتەوە.

حەسرەت: خەفەت کە بۆ هەر کاروبار و شتێکی ئاهی خەفەت بۆ هەڵکێشان بەکار دێت وەک لە دووریی (مەلا عومەر) کوردی ئاهی حەسرەتی کێشاوە و بەحەسرەتی ناوبردووە.

کۆهکەن: کێوهەڵکەن و، یا چیاتاش و نازناوی دڵدارەکەی (شیرین) بووە کە لە خۆشەویستی ئەوەوە کەوتووەتە هونەر نواندن لە کێوتاشیدا.

بیمار: بەواتە خەستە، نەخۆش.

شیرین: کە ژنی خوسرەو پەروێز بووە، کچە ئەرمەنییەک بووە، بەناوی (سیرۆن)ەوە کە بەیتی شیرین و فەرهادیش بەزمانی ئەرمەنی هەیە، گوایە خوسرەوی مێردی مەرجی ئەو هونەر نواندنەی کۆهکەنی کردووە کە بەرامبەر بەوە واز لە (شیرین)ی ژنی بهێنێ بۆ (کۆهکەن) و بڕوای وا بووە، کۆهکەن ئەو کارەی بۆ ناکرێ کاتێ کە زانییە ئەوا (کۆهکەن) زۆر بەجوانی و چاکی و هونەرمەندانە کارەکەی لە کۆتاییدایە، خوسرەو لە بەڵێنەکەی پەشیمان دەبێتەوە هانای بۆ پیرێژنێک بردووە کە چۆن لە دەست کۆهکەن ڕسگار ببێ، ئەو پیرێژنە لە دامێنی چیایەکەوە دەکەوێتە شیوەن و هاوار و گریان و کە (کۆهکەن) هۆی ئەو (شەپۆڕ)ەی لێ پرسیوە، پیرێژن وتوویە شیرین مردووە، ئیتر کۆهکەن گورج قوڵیگێکی بەردتاشیی لە ناوچەوانی خۆی داوە و لە چیایەکەوە بەربووەتە خوارێ و بەناکامی مردووە.

لە جێگەی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە، لە (س/١، س/٢)دا نووسراوە:

(زۆر نییە (سالم)ی بێ چارە ئەگەر کۆهکەنە) کە ئەمانە بە هی (سالم)یان داناوە.

# مۆسیقا و ئاوازی کوردی

١٨

## دڵ لە میحنەت کەیلە

١- دڵ لە مــیــحنەت کـەیلە ئەی (پیــری مـوغــان)ی بەزمــســاز
هەر ئـەتۆی بـۆ بارەگــای عــەیشــوطەرەب مــەسنەد طیــراز

٢- دەی، ئەتۆی خــەرمــانی عــومــری غــەم بـەبادی، بادە، دەی
دا بزانین، مــەشــغــەڵەتمان چۆن دەخــەیتــە گــیــر و گــاز

٣- جــان، فــیــدای ســروەی دەم و، دەســتــانە، ئێــوەش بێنەوە
(چاوەش) و یارانی (جــان)، مــۆســیــقــە ســازان و نەواز

٤- (سـمکە) تۆش دەستەی (سەما)و(سوورِ)ت بسوورێنە بەسۆز
با، لە بەزمی ئێــمــەدا، هی ئێــوە بێ دەســتی دراز

٥- ئەی بەرەی (داوودی) نۆرەی نەغــمــەخــوانی ئێــوەشــە
هەر لە مــاه، تاکــو بەمــاهی بێننە لەرزە و تەکــووتاز

٦- گــەرچی فــەیضی ئێوە تەعطیــری دڵ و گــوێ و چاو دەکا
بۆ دەماغ و جــانــە نەشــئــە و قــووتــی ئاســمــانی فــیراز

٧- بانگ کــەنە (زاهیــد)، نەمــان ڕەندانی گــۆشــەی (خــانەقا)
بێن کــەوازە دەرکی مــەیخــانان و خــەڵوەتگاهی ڕاز

٨- خوابی غەفڵەت (نازلە) بۆ چاوی (شــەحنە) و (موحتەسیب)
فــرصــەتە، جــامێ ئەســەر کــێشین بەلا، بێ ئیحــتــیراز

٩- مــەی حــەرامــە گــەر بەفتــوای (مـوفتی)ی و (قــەولی جــەدید)
(پیــر)ی من جــار جــار بە(قــەولێکی قــەدیم) داویە (جــەواز)

١٠- با لە شــەرتی بادە، مــەرد ئەفگەن بێ ســاقی نەوجــوان
دیدە ســێــوەنگی و کــڵاو کــەچ کــاتو دوگــمــەی ســینە واز

١١- (زوڵف) و (کـاکـۆڵ) و (غـولامـانه)ی هـەمـوو ئەفـشـان بکا
بێ بەزانوودا بدا جـامێ بـەعـیـشـوە و شـەرم و ناز
١٢- با هـەمـوو، خـۆمـان بکەینە (خـوم) له هەسـتـیـدا هـەتا
خـەم بەپێچ و خـەم وەکو سـەگ شـەق ئەکا صـۆفـیی بەراز
١٣- فـرصـەتـه یاران شـەوێکه و ئەمـشـەوە سـا وەرنەوە
بێنه جـۆش، دەرچن لـه طەوری پیـسـی دونیـای حـوقـقـەباز
١٤- دەسـتـی (یار) و گـەردنی قـەڕڕابە لێـوی جـامـی مـەی
فـێس و تەرلک بگرێ دەوری دیدەکـانـی مـیـثلی باز
١٥- (ئاغـه زەنـنوون) لێ بدا (سـینەکـەمـان) (فـارس) (گـرفت)،
(ئەلکه) (تەنبـوور) و (دەف) و (ئەسعـەد) بدا دەستی (بەساز)
١٦- با (ڕەسـوولّ) هەڵداته (ڕاست)، (صـالح) بلّێ (نیـوەشـەوی)
(مـحییەدین)، (چوارگا) و (قـەرە) دەنگی بلّند کا بۆ (قـەزاز)
١٧- (خاوکەر)ەی (خانم)ه (قەتار)ەی (صۆل)و(سۆزە)ی (نەسمەجان)
(ڕەقص)ی(سمکه)،(ناز)ی(شـەهر ئاشووب)و(غەمزەی)(سەروی ناز)
١٨- (سووڕ)و(بستە)ی گورجی (گورجیی) و سوبک خێزیی (شاپەسەن)
بۆڕ ئەدەن ئەفـسـوونی جـوملـەی جـادوکـار و حـیلەباز
١٩- (دائیرەی میصری)و(چەقانه)ی (گەوهەر)و(لەنجه)ی (سەمەن)
دەنگی (چاوش) بێ و (بەڵا) تا دێ لـه گـیـانم بێنێ واز
٢٠- (نـازەنـین) بـۆ (نـازەنین) و (دڵـگوشـا) بـۆ (دڵـگوشـا)
لایقن، گـەر تێ چڕێ (خـوسـرەو) له دوویان (شـاهناز)
٢١- چنگی ئەصـغـەر با بکاتە (چەنگ) و صـەد دەنگ لێ بدا
پێ بـەپێی ئـەو دەربچێ ئاوازی (سـاز)ی (گـوڵبـەیاز)
٢٢- (مستۆ) (ئیبراهیمی)(ئەوڕەحمان) (نەوا)و (فەتحی) (حەزین)
(مصطەفا) (ناری)و(سێ گا)، (یوونس)و(شەهری) و (حیجاز)
٢٣- هەر له خـۆیان دێ (خلـه) و (پیـرۆت) و (ئـەوڵای مـامـەسـەن)
(ساز)ی (عوشاق)و(ئەسیری)و(سۆز)ی (کوردی)و(شەهری ناز)

٢٤- (بەربەت)ی (عیسا) و (نەقارە)ی (خاڵ) و شمشاڵی (سەلیم)
ڕەونەق ئارای ئایینەی قەلبن لە تۆز و گەردی شاز
٢٥- مەرهەمی زەخمی دڵانە (سۆزناک)ی (کاکەباس)
(نەوئەثەر) بۆ (شێخە)، (ماهوور) بۆ (عەزیزی یایە ناز)
٢٦- جاربەجار بە(کزێکەوە) هەستێ لە (پەردەی) (طاهری)
(یارە)کەی عاشق کوژەی مەعشووقەکەی دوشمن نەواز
٢٧- با (فەرەج) (بوسلیک) بەجێ بێڵی و بچێتە سەر (عیراق)
(کورسی ریحلەت) لێ بدا، دەرچی لە مەنزڵگای (نیاز)
٢٨- با، لە (خەتم)ا (ناله) (دەف) کون کا (دەهۆڵ) شەق پێ بەرێ
(نەی) یەکالا کا بە(ناڵەی داوودی) و ئاوازی (ناز)
٢٩- با (تەپڵخانە) بەجارێ مۆر کرێ و (دۆندار)ی قڕ
قۆڵی (سەڵتە)ن بۆ ئەم و ئەو (ئەفسەر)ە گەر (باڵباز)
٣٠- (تەپڵ) و (دەف) بۆ جاهی (شێخ)ە با نەمێنن دەنگ بدەن
بێنەوە بۆ بەزمی ئێمە و با ببێتە ڕێگەباز
٣١- (جاه) و (سوڵتە)ی (شێخ) و (میر) دێنێ دەمێ لەم مەجلیسە
تا بەگەردی پێشیا ناگەن بەپەرواز و بەباز
٣٢- (مەجلیس) ئەر وابێ، هەزا (جەمشیدی جەم) فەڕاشییە
مەی ئەگەر وا بێ، بەهای جامێکی (ئیران)ە و (حیجاز)
٣٣- (موطریب) ئەر وا بن، فیدایان بێ (نەکیسا) و (بارەبود)
(ساقی) گەر وابێ، بەقوربانی دوو دیدەی بێ (ئەیاز)
٣٤- (ڕەقص) ئەگەر وا بێت و (مۆسیقە)ش وەها بێ؟ بۆ... نەبن
ڕاقیصەی عەبباسی و (فارابی) دەم واز و گوداز
٣٥- ڕۆزگار ئاشۆفتەیە و چەپگەردە چەرخی نەیلەگوون
بێخودانە هەر کەسێ مایل بەبەزمی وایە باز
٣٦- ڕێ مەدەن لەم (بەزم)ە (شێخی) (تەکیە)، (صۆفی)ی (خانەقا)
کۆنە لۆتی جنە پەروەر سوفلەیی بەچچە نەواز

٣٧- وە نییــە (کــوردی) مــائیلی ئەم جــۆرە ئەطوارانە بێ،
لازمــە شــاعــیــر لە هەر نەوعێ بلّێ بۆ ئیــمــتــیــاز

..........................................................................

١- ئەم هەڵبەستەم لە (١٣) سەرچاوەی دەسنووسی کۆن و (٤) سەرچاوەی چاپکراودا، لەبەردەستایە و ئەوانیش (عن) و کەشکۆڵە گەلاّلەییەکان و مس، ص، ف، نم/١، ع، کم و چاپەکانی گیو)ن.

لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا ئەوەکەی (عن، کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و بەراورد؛ چونکی لە هەمووانیان پتر و ڕێکوپێکترن هەرچەندە (پێنج تاکی) ئەم هەڵبەستە لە (عن)دا نین و (دە تاکی)شی لە (کم)دا نین؛ بەڵام من لەوانی ترەوە لە شوێنی خۆیاندا ئاوێتەم کردن.

ئەوی شایانی وتنە تاکو ئێستە (١٨) تاکی ئەم هەڵبەستە بەر چاپ کەوتووە کە لێرەدا (٣٧) تاکە و لەوانەیە پتریش بن و پاشتر دەست بکەون.

**(پێشبێژی)**

ئەم هەڵبەستە هەرچەندە تا ئێستا وەک یەکێک لە هەر پارچە هەڵبەستێکی ئاسایی تری (کوردی) هاتووەتە بەرچاو، بەڵام لەم پەڕاوییەدا دەبینرێ کەوا بەلێکدانەوەکەیەوە پەڕاوییەکی سەربەخۆ و، لەوپەڕی گرنگی و بایەخی مێژوویی و هونەری و وێژەییدا لە بۆنەیەکی زانستیی بەرز و وردی مۆسیقا و گۆرانیدا داڕێژراوە، کە لەم بابەتەوە سەرێنییەکی تاریکی کوردستان بۆمان ڕوون دەکاتەوە بەوەی کە ناوی (٢٨) گۆرانیبێژ و توانایی هەریەکەیان لە کام گۆرانیدا بووە و ناوی (٣١) گۆرانیی ئەو سەردەمەی لەگەڵ ناوی (١١) مۆسیقاژەن بە(١٥) ئامێری مۆسیقییانەوە و ئاوازەکانیان بەپاڵ ناوبردنی بەلای کەمەوە (٥) سوور و سەمادەرەوە، جگە لە دەسنیشانکردنی (تەپڵخانە)ی میرەکان و (تەپڵ و دەف)ی شێخەکان و ئەوی پەیوەندیی بەمانەوە ببێ، بۆی دیاری کردووین و، دیارە ئەوساش ئەمانە لەمەندە زۆرتر بوون. جگە لە لێدواننی بەزمی بادەو و کەرەستە و پێویستییەکانی بەوردی.

لە ڕووی ناوەڕۆکی ئەم هەڵبەستەوە، وە نەبێ (کوردی) تاقە سوارە و سووری بەلەشکری ئەم مەیدانە بێ و تەنیا ئەو و، دەمی لەم بابەتەوە دابێ، بەشکو ئەوەی لەبەردەستاندایە لە بەرهەمی هۆنەرانی ئەو سەردەمەمان بەزمانی کوردی و فارسی و عارەبی و تورکی؛ ئەوەمان تێ دەگەیەنن کەوا هەموویان و بە(کوردی)شەوە لێرە و لەوێ، لە زۆربەی هەڵبەستی یا (بەیت)ە جیاجیاکانیاندا کەم و زۆر نووکی خامەی بەجەوهەری بیر ئاودراویان بۆ ئەم لایەنەش درێژ کردووە و بەجۆرەها دەربڕینی جوان، پڕپڕ بەرهەمیان بۆ جێ هێشتووین، بەڵام کەسیان و تەنانەت تاکوتەرا هەڵبەستەکانی تری (کوردی)ش ئاوا لە یەک پارچە هەڵبەستدا، بەڕێکوپێکی و لە چوارچێوەیەکی پتەوی زنجیرەداری زانستییانەی بەرز و تەڕ و پاراودا و بەوێژەیەکی هونەرمەندانەی پەسەندەوە لە هەموو پەلوپۆکانی ئەم بابەتە وەک ئەم هەڵبەستەی (کوردی)

نەدواون. بۆیە لەم ڕووەوە گۆی پێشکەوتنی لێ فڕاندوون و بەر هەموویان کەوتووە، هەر وەک چۆن (حاجی قادری کۆیی: ١٨١٥-١٨٩٤ز) و (ڕەنجووری ١١٦٤-١٢٢٥) بەوتنی شاکارە باڵاکەیان لەمەڕ ناو و ناسینی هۆنەرانی کوردەوە، هەریەکەیان لە بارەی خۆیانەوە پێشڕەوییان سەندووە ئەمیش ئاوا.

لەبەر ئەوە (کوردی) ئەگەر هەموو بەرهەمی تەنیا بریتی بێ لەم پارچە هەڵبەستە شاکارەی، ئەوە دیسان هەڵدەگرێ کە پێوەی، جاویدانێکی بەڕێزی هەتا هەتایی بێت.

دوا وتەم ئەوەیە چونکی من نە گۆرانیبێژ و نە مامۆستای مۆسیقام، لەوانەیە لێکدانەوەی هەندێ لە گۆرانییەکان پڕ بەپڕی دەقی سەرچاوەکانیان نەگۆڕدرابنە سەر کوردی، بۆیە چاوەڕوانی ڕاستکردنەوەم لە لایەن تایبەتیکارانی ئەم بابەتەوە، ئەگەر شتی وا ڕووی دابێ. ئەم پێشبێژییە درێژتریش هەڵدەگرێ، بەڵام با جێگەی هەندێکی بکەمە شوێنی بەراورد و هەندێکیشی ئاوێتەی لێکدانەوەکان بکەم.

میحنەت (ع): چورتم، باری گران، ناخۆشی.

کەیلە: پڕە، مەستە، سەرڕێژە.

سەرەتای هەڵبەست بە: (دڵ لە میحنەت کەیلە) هەر لە سەرێنی (کوردی)یەوە تا ناوەندی ئەم چەرخی بیستەمەیش لە ناو هۆنەراندا باو بووە کە بەم سەرەتایە دەسیان پێ کردووە.

موغ: وشەیەکی کۆنی (ئێرانی-ئاریانیی)یە؛ واتە هی کورد و فارسیشە بەواتە: (پاسەوانی ئاگری پیرۆز) یا (موژدە)یە. هەر لە کاریگەریی زەردەشتییەکانەوەیە کە (ئینجیل) واتە (موژدە)، بەم ناوەوە ناونراوە کە (موغ) پێشەوای زەردەشتی بەواتا (موغ). بەڵام ناوی (موغ) مەبەست لە گەورەپیاوی ئاینی (زەردەشتی)یەکانە کە وشەی (مەجووس) لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ (موغ) و دەبینرێ نزیکایەتیی زمانیشیان لەگەڵ وشەی (موژدە)دا هەیە، کە ئەم ئاینە یەکێکە لە پەلوپۆی ئاینەکانی (ئاسیای ناوەند) کە کوردیش گەلێکی ئەم ناوچەیەیە کە لە کۆندا پەیرەوی ئەم ئاینەیان پەیرەوی کردووە.

(پیری موغان): بەواتە سەرۆکی (موغ)ەکان و، لەبەر ئەوەی بەلای بادە نۆشانەوە مەیدەر (ساقی) یا گەورەی مەیدەران ڕێزێکی تایبەتی هەبووە، هەروەک بەپێی ئاینی (زەردەشتی)ش (پیری موغان) پیرۆز و ڕێزدار بووە، بۆیە لە کۆڕی مەینۆشیدا بە(بادەدەر) یا سەرۆکی بادەدەرانیان وتووە: (پیری موغان) و ئەمە بووەتە ناو یا نازناو یا زاراوەیەکی تایبەتی پەیرەویکراو، لە نێوان هۆنەرانی ناوچەکەدا و لە صۆفیگەریدا (ڕەمز)ە بۆ سەرچاوەی خۆشەویستی و هۆی خواناسی و... هتد؛ چونکە لە ئاینی زەردەشتی و خواردنەوەی (مەی) تا ڕادەیەکی بەدمەستی نەکردن، ڕێگە دراوە.

بەزمساز: بەزم و ئاهەنگ و کۆڕی ڕابواردنی خۆش ڕێکخەر. بڕوانە پەراوێزەکان لە بارەی (ساز)ەوە.

عەیش: ژیان، گوزەران، ڕابواردن، ژین.
طەرەب: ئاهەنگ، گۆرانی، پێخۆشی. بەڵام لێرەدا مەبەست لە خۆش ڕابواردنە.
مەسنەد طیراز (ع): پشتیوان، بارەگای مەزنی شوێن ئاوات و بەهرەوەری.
(کوردی) ئەم تاکەی وەک پێشەکییەکی ڕاز دادانی هەڵبەستەکەی داناوە و شێوەی (ڕوخسار)ی ناوەڕۆکەکەی پێ جوان و بەهێز کردووە.
٢- ئەم تاکە تەنیا لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا هەیە و، دووەمینە و، لەوانیکەیدا نییە و، هێشتا چاپ نەکراوە.
دەی: ئادەی، دادەی، دەسادەی.
دەی ئەتۆی (کۆن): هەر ئەتۆی.
دەی ئەتۆی (مس): تۆی دەدەی.
خەرمانی (مس): فەرمان.
عومری: تەمەنی-ئەم وشەیە لە سەرچاوەکاندا لە شێوەی (عمری)دا بەڕێنووسی کۆن نووسراوە کە بە(عەمری) و (عومری)ش دەخوێنرێتەوە، هەردووکیان عارەبی و بەواتەی (تەمەن)ن. بەڵام لە زاراوەی (سولەیمانی)دا (عەمری)یەکەیان لە جێگەی وشەی (ئەمری) بەواتە (فەرمانی) و (تەمەنی)ش دەوترێ.
لەم تاکەشدا هەردوو واتەکە دەدات، کە ئەمەش جوانییەکی وێژەییە و (جیناس ئارایی) و وەستاییەکی (کوردی)یە لە زمانزانی و یاری بە وشە کردن و وردەکاریدا. هەرچەندە (کوردی) و کەسیش ئەوەندەی (نالی) خۆیان بەم جۆرە وردەکارییەوە، نەبەستووە و نەگەیونەتە ئەو بەڵام (کوردی) جاروبار دەستی بۆ بردووە.
باد: با، (بەبادی = بەبای) و مەبەسیش لە: هەوای (نەشئەی) بادەیەکی گیانی و سەرخۆشییەکی خوایی و ئاسمانییە.
بادە: مەی، خواردنەوەی سەرخۆشکارەکان.
بەبادی بادە (مس): بەباری بادە.
دەی: بدەیت.
بە، بادی، بادە، دەی (کۆن): بباد باددی.
جوانی لەم هەڵبەستەدا یەکخستنی (دەی، بادی، بادە، دەی)یە کە لە دەنگ و ڕەنگدا وێکچوو و لە واتادا جیاوازن و ئەمەش توانایەکی تایبەتی ئەوێ لە زمانزانیدا کە (کوردی) وەستایانە جیناس ئارایی تێدا نواندووە.
دابزانین: تابزانین.
مەشغەڵەت: خەریکی، گیرۆدەیی بەبیروباوەڕێکەوە، ناخۆشی، خەمباری، پەژارە، پەشێوی.
دەخەیتە: دەخەیتە-بەڵام وەکو باوترێکە (دەهێنیە) بۆ ئێرە جێگیرتر و بەجێتر بوو، دیارە لەبەر

نەگونجانی کێشی هەڵبەستەکە وەهای وتووە.
گیر و گاز: بەگیر هێنان و هاوار پێخستن یا هاوار پێ کردن، ناخۆشی، تووش کردن.
مەبەست لە خەرکەماندانی ئەو خەم و خەفەت و گیرۆدەییی خۆیانە کە بەو بادەی خوایی و سەرخۆشیی گیانییە، لەناوبچێت، نەک بادە و سەرخۆشییەکی ڕاستی لە ژیان و تەندروستی لە ناو ببات.
واتا ئەو بەزمی بادەیەی کە چەند (عومەر خەیام) بەو هەموو لە بادە دواننەیەوە فڕی بەسەر مەینۆشییەوە هەبووە (کوردی)ش ئەوەندە. بەشکو هەردووکیان و هەموو هۆنەرە صۆفییەکانیش دەم و دڵیان یەک نەبووە و مەبەستیان ڕۆچوونە بیری لە خوا نزیکبوونەوەی صۆفیانە بووە.
کە دەڵێن دەم و دڵیان یەک نەبووە لەوەوەیە کە وتەکانیان بەسەر زاری واتەیەک دەگەیەنێ و لە ژێرەوەش و دڵیاندا شتێکی کەیان مەبەست بووە هەرچەندە ئەوەی کە بەسەر زاریش بە جیا لە هی دڵ دەنوێنێ بەپێی دەربڕینی صۆفیانە بەپێچەوانەوەیە.
٣- ئەم تاکە لە (ص) و (گەلاڵەییی بەرباخەڵ)دا دووەمینە و لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا، سێیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە.
جان: گیان، ڕەوان.
فیدا: بالاگەردان، لە پێناوی شتێکا، یا کەسێکا، یا بیرێکا خۆبەخت کردن.
سروەی (مس): کردەی.
سروە: ورتە (بۆ دەنگ)، وە بەلەرەی فێنکیی بای شەماڵ و هەر بایەک دەوترێ. بەڵام لێرەدا مەبەستی لە هەردوو وانەکەی سەرەوەیە کە:
سروە: بەواتە (ورتەی دەنگ) بۆ ئێرە مەبەست لە بچووکترین بڕگەی دەنگی مۆسیقییە کە بەفوو پیاکردن یا بەلێدانی ئامێرە مۆسیقییەکان کە بەدەم یا بەدەست پەیا دەبێ و، بەوێستانی کورت کورت لە نێوان ئەو بڕگەیانەدا و بەیەک بەدوای یەکداچوونیان بەپێی ئاهەنگی فوو پیاکردنەکە یا لێدانەکە ئاوازێکی مۆسیقیی تایبەتی دەدات.
بەڵام (سروە) بەواتە شنە یا لەرەی بایە، کە مەبەست لە فووی دەم یا (بای دەست)ە واتە جووڵەیەکی وەک شنەی یا لەرەی بای شەماڵ ئاسایی، وەک دەڵێن: بەبای شان بیجووڵێنە. کە لێرەدا (شان) بای نییە هەروەک (دەستەکەش) بای نییە بەڵام جووڵەیەکی بچووک ئەگرێتەوە کە ئەو (بچووکترین بڕگەیەی مۆسیقییە) دەردەبڕێ و ئەمیش بنچینەی ئاوازەکانە بەلێدانی دەست و، یا بەفوو پیاکردن واتە سروەی (دەم)یش دەگرێتەوە کە ئەو (فووە) لەسەرخۆ پیاکردنەی (دەم)ە بەو ئامێرە مۆسیقایانەدا کە بەفوو پیاکردن دەنگ دەدەن بۆ دەربڕینی ئەو بچووکترین بڕگەیەی کە ماکی ئاوازەکانە.
کەواتە ئەم سروەیە مەبەستیش لە هەمان (نەغمە)ی (داوودی) واتا هەناسەی داوود

پێغەمبەری بەناوبانگە لەبەر خۆشیی دەنگەکەی یا نیشانەیە بۆ فووکردن (نەفخ)ی ئیسرافیل بەصوور (کەڕەنا)دا لە ڕۆژی حەشردا. کە ئەم وشەی فووکردن (نەفخ)ە لە ١٧ سوورەتی (السجدة، الحجر، ص، الأنبیاء، التحریم، آل عمران، المائدة، الکهف (٢ جار)، المؤمنون، یس، زُمرُ (٢ جار)، ق، الحاقّة (٢ جار)، الانعام، طه، النمل، النباء)دا (٢ جار) ناوی هاتووە لە بابەت ئەو فوو بە(کەڕەنا) داکردنەی ڕۆژی حەشردا.

هەروەها (کوردی) لەبەر ئەمانە و لەبەر ناسکیی دەنگی مۆسیقەیەکەدا وشەی (سروە)ی وەک زاراوەیەکی مۆسیقی لەخۆوە بەکارهێناوە هەروەک زۆر زاراوەی مۆسیقیی تریشی بۆ یەکەم جار لە کوردیدا بەکارهێناوە کە لە شوێنی خۆیدا دەیگەیەنم.

دەم: زار، کات-و (کوردی) کە گیانی خۆی فیدای (دەم)یان کردووە لەوەوەیە کە بەدەم فوو دەکەن بەو ئامێرە مۆسیقییانەدا کە بەسروەی فوو پیاکردن دەنگ دەدەن و، بەفووی دەمیان سروەی (ورتەی) ساز و ئاوازی دڵگیریان لێ پێک دێنێ و، یا لە هەمان کاتیشدا کە مۆسیقە لێ ئەدەن (وەک باوە) گۆرانیشی بەدەمەوە دەڵێن و هاوبەشی لەگەڵ گۆرانیبێژاندا ئەکەن.

دەم: وەک لێکم دایەوە، جگە لەوانەی (زار) واتەی (کات)یش دەدات و (کوردی)ش لە هەمان کاتدا مەبەستی لە (کات)یش بووە، چونکە مۆسیقا لە دوو توخم (عنصر)ی کاریگەر پێک دێت کە یەکەمیان (دەنگ) و دووەمیان (کات-زەمەن)ە کە دەنگەکەش بریتییە لە لەرینەوەی گەردیلکە (ذرات)ەکانی، تەنەکانی (ئەجسام) و دەنگیش چەند چنێ کە، کە ئای دەنگی گیاندارێک یا ئامێرێکی مۆسیقی یا هی هەر شتێ بێ، کە لە زانیاریی مۆسیقەشدا حەوت دەنگ هەن کە هەریەکەیان ناوی یەکێک لە پیتە مۆسیقییەکانیان لێ ناوە وەک لە دەنگی نزمییەوە بۆ دەنگی بەرزی ئەمانەن و لە چەپەوە ئەخوێندرێنەوە بەچەپەوە:

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧

سی لا صۆل فا می ڕێ دۆ

بڕوانە پەراوێزی لەسەر تاکی ١٧ لە بارەی (صۆل)ەوە.

بەڵام هەرچی وەکو (کات)ەکەیە وەک گرنگییەکی کاریگەری هەیە لە زانستی مۆسیقادا، ئای لە خودی دەنگەکە و یا لەو بێ دەنگی (لەسەر ڕاوێستان-پچڕانەوە) کورت کورتەی لە نێوان دەنگێک و دەنگێکدا هەیە و، ئەم کاتەش کراوە بەحەوت بەشەوە کە هەرە گەورەکەیان ئەوەندەی ماوەی کاتی چوار جار سەری خامەیەک یا هەشتێک بەشتێکی تردا بماڵرێ، واتە (چوار لێدان) = (چوار-نەقرە) کە لە زانستی مۆسیقادا (دەنگی تەواو)ی پێ دەڵێن و، چوار جار قوچاندنی دەست و، یا چوار جار نووکی پەنجەی پێ لە کاتێکدا پاژنەی پێ لە زەوی بووندا بەزەوییەکەدا بکێشرێ و هەر حەوت بەشەکەی (کاتی تەواو)یش یەک لەوی کە کەمترە واتە (کاتی تەواو لە چوار جار لێدان یا پیاماڵین = نەقرە)ی تەواوە و ئەوە بەشی یەکەمە و، بەشی دووەمینیش نیو ئەوەندەی بەشی یەکەمین واتە (دوو کات یا نیو کاتی تەواوە) و، بەشی

سێیەمین چواریەکی یەکەمینە و، بەشی چوارەمین هەشتیەکی یەکەمینە و، بەشی پێنجەمین شانزەیەکی یەکەمینە و، بەشی شەشەمین سی و دوویەکی بەشی یەکەمینە و، بەشی حەوتەمین کە دوا بەشە بریتییە لە شەست و چواریەکی بەشی یەکەمین، واتە (شەست و چوار کات).
ئەمجا ئەم (کاتی تەواوە) بریتییە لە (کاتی یەکەم) لەو حەوت کاتە لە دەنگدا و، هەر ئەم حەوت کاتەش بۆ لە کاتی بێ دەنگییەکانی نێوان بڕگەی دەنگ و ئاوازەکاندا هەمان حەوت بەش هەن و، بۆ کاتی (دەنگ) و کاتی (تیاڕاویستان-بێ دەنگی)ش؛ (ناو) و (نیشانە)ی تایبەتی لەم زانستی مۆسیقییادا دانراوە.
ئەمجا (کوردی) وەک نووسیم ئەوەندە زانایانە و قووڵ شارەزای زانستی (مۆسیقا) و هونەرەکانی بووە کە ئەم وردترین شتانەی لە بیر نەکردوون و لە دەربڕینیاندا وریایان بووە کە مەبەستی لە (دەم) بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە (زار)ی (دەنگدەر) و لە هەمان کاتیشدا (کات)ی تیا دەربڕینی (دەنگ) و کاتی (ماوەی) تیا (وەستان) لە نێوانی دەنگێک و دەنگێکدا بووە.
لەگەڵ ئەوەشدا نامەوێ لێکدانەوەکان ئەوەندە درێژە بکێشن کە هۆش بەلای ئەو تاکە هەڵبەستەوە نەمێنێ کە لە پەیکاری لێکدانەوەی ناوەرۆکەکەیدام. بەڵام ئەم ناوەڕۆکانە ئەوەندە خەستوخۆڵ و پڕ واتان ناچارم لەگەڵ بەکورتی بڕانەوەی لێکدانەوەکانیشدا، کە بەسەر گەلێ بابەتی گرنگی ئەو ناوەڕۆکانەوە نەڕۆم. وەک: هاتنی وشەی (دەم) لەم تاکەدا کە لە پێشەوە بەدوو مەبەستی (زار) و (کات) لێکم دایەوە، بەڵام هەر ئەم وشەی (دەم)ە واتایەکی تری زۆر گرنگی مۆسیقی دەدات کە بەجێهێشتنی لە نرخی ئەم تاکە هەڵبەستە کەم دەکاتەوە وەک لێکدانەوەشی شارەزاییەکی پسپۆڕانەی (کوردی) دەگەیەنێ لە زانستی مۆسیقادا واتەی تاکە هەڵبەستەکەش لە بارەی مۆسیقییەوە بەهێزتر و نرخدارتر دەکات؛ چونکی وشەی (دەم)ەکە، بەرێنووسی کۆن لە شێوەی (دم)دا دەنووسرێ کە ئەم شێوەیە دەتوانرێ بە(دوم)یش بخوێنرێتەوە کە (کوردی) لە هەمان کاتا ئەمەشیانی مەبەست بووە.
ئەم شێوەی وشەی (دوم) (لەسەر ئاهەنگی دەنگی «خوم» و «قوم»ی ئاو) لە زانستی مۆسیقادا هاوسەری وشەیەکی ترە کە (تک)ی پێ دەڵێن واتە ئەم (دوم) و (تک)ە جووتێ زاراوەی مۆسیقین و، لە مۆسیقادا بەرامبەرن بەبەشە بێ کێشەکانی زانستی (عوروض) لە کێشی هەڵبەست زانیندا. کە بەم (دەم و تک)ەش مۆسیقا دەکێشرێن.
ئەم دوو زاراوەی مۆسیقیی (دوم) و (تک)ە شوێنی دیاریکردنی دەنگی (بەهێز) و (خاو) دەگرنەوە، کە دەربڕینی ئەم جووتە دەنگە و پێکهێنانی (بێ دەنگی-یا- لەسەر ڕاوەستان لە پێش و پاش و ناوەند یا ناو دووبارەکردنەوەیان بەپێی ئاهەنگی تایبەتی؛ (ئاواز و سازی پێویست) دێتە دی لە هەموو ساز و ئاوازە ڕۆژهەڵاتییەکان و هەندێ لە ئاوازە ڕۆژاواییەکانیشدا.
زاراوە یا وشەی (دوم) وەک ناوی خۆی بەخۆیەوە بێ، وایە، واتە دەنگێکی بەهێز دەدات؛

چونکی خـودی دەربڕینی وشــەی (دوم) وەک گرمـە، یا دەنگێکی بەهـێزە و بۆیە کـراوەتە ناوی دەنگی (بەهێز).

وشـە یا زاراوەی (تک)یش دەربڕینەکـەی خـاوییـەک (دەنگی تکەی ئاوێک) دەگـەیەنـێ کە واتای خـۆیەتی و لە زانستی مـۆسیـقەدا ئەمیش کراوە بـەناوی (دەنگی بێ هێز-یا-خـاو). بەڵام لەبەر نەگونجاندنی هـەندێ لـە ساز و ئاوازە ڕۆژاوایییەکان زانا مـۆسیقییـەکانیان ناچاری ئەوە بوون کــە لە نێـوان ئەم دوو دەنگی (بەهێــز) و (خــاو)ی (دم) و (تک)ەدا دەنگێکی مــام ناوەنـدیتــر دەسنیشان بکەن و کردوویانە بە سێ دەنگ لە جێگەی دوو دەنگ.

ئەوی لێـرەدا مـەبەسـتـە بـۆ لێکدانەوەی وشــەی (دەم) کە بەشـێـوەی نـووسـینی کـۆن (دوم)یش دەخـوێنـدرێتـەوە ئەوەیە کـە (کوردی) گـیـانی خـۆی فـیـدای سـروەی ئـەم (دوم)ەش واتە: دەنگی بەهێــزی (دوم) کـردووە کـە نـیـشـانـەیە بۆ بەرز و بەهـێـزکـردنی دەنگی (دوم)ی مـۆسـیــقـای جـووتەکەی (جـان چاوەش) واتە سـەرۆکی ئەو جـووتە مـۆسـیـقـیـیـە کە گـەرمـوگوڕ و بەجـۆش و خورۆشـەوە لێی بدەن و کەواتە هەر لە واتەی ئەم تاکە هـەڵبەستـەشدا (دوم) دێتە ئاراوە.

لە کێشـانی (وەزنـی) سـاز و ئاوازی مـۆسـیـقـیدا بەو مـاوەیەی کە دەنگی (دوم) یا (تک)ی تیـا دەردەبڕدرێت دەوترێ (لێــدان-یا-پیــامــاڵین-یا ترپـە) بەواتـە (نەقــرە-یا-ضــــەربـە) وەک لە لێکدانەوەی کاتدا ڕوونم کردەوە وە هـەریەکێ لەم (لێدان = ضـەربە، نەقرە)یەیانە دەکرێن بەسـێ بەش یا جۆری (بەهێز) و (خاو) و (مام ناوەندی)یەوە کە ئەمە بناغـەی پێکهێنانی هـەمـوو ساز و ئاوازێکە لە جیـهـانـدا، یا هـی ڕۆژهـەڵات یا هـی ڕۆژئاوا و پێکهـێـنەری هـەمـوو گۆرانییـەکـانی گەلانی جیهانیشن. بەڵام جیاوازییان تەنیا بریتییە لە جیاوازی لە ماوە و شوێن و جۆری دەنگ و لەسـەر وێستانەکەیدا بەپێی ئەو ئاهەنگە، کە دەویسترێ بێتە دی.

(کوردی) لـەم هـەڵبەسـتەیدا و لە هـەڵبـەسـتـەکانی تریدا کـە جێ جێ لە مۆسـیقا دواوە بەتەواوی دەری دەخـات کە زۆر چاک ئاگـەداری ئەم وردیلکەی زانسـتی مـۆسیقـا و هـونەرمـەندییەکانی و گۆرانییەکان بووە.

(کوردی) وەک لێرەدا لە خودی دەنگی (دوم) دوا هـەروەها لە شوێنی تری هـەڵبـەستەکانیدا لەم (لێدان، پیاماڵین، ترپە) واتە (ضـەربە، نەقرە)یەش دواوە و بەئاشکرایـی لە هەڵبەستێکی تریدا ئەمەی زۆر زانایانە دەربڕیوە کە وتوویە:

وەزنی، ضـەربی پەنجەت ئەمڕۆ، صـەرفی ڕووی جانانە کرد

ئەی موعەللیم؛ بۆ؟ کزت کـــرد، دەک لە جەرگــت چێ کزە

لێرەدا (کوردی) لە کێشـان (وەزن)ی مـۆسـیقا، وەک مـامـۆسـتـایـەکی مامـۆسـتـایان، بەوردی و زانایانە دواوە، کە وەزنی (کێشی) لێدان (ضـەربە)ی دەست و پەنجەی خـۆشـەویستـەکەی یا لە ئیشارەت کردنا بۆ خۆشـەویسـتی یا لە هاندانـدا بۆ خراپکاری لەگەڵ دڵدارەکانی ناو بردووە و، وتوویە: ئەمڕۆ ئەو کێشی لێدانەی صەرفی (تەرخانی) و، یا ئاوقای ڕووی جانانـە (دۆستەکان)

کردووە کە مەبەست لە توند لێدانی دەنگی (دوم)ەکەیە.
هەروەها مەبەستی ئەوەیە ئەو کێشی لێدانەی ئاراستەی ڕووی (جان = لەش وەک دەڵێن گیانم (جانم) واتە لەشم ژان دەکا) کردووە یا ئەو کێشیی لێدانەی ئاراستەی (جان = گیان) کردووە بەهێز وە یا صەرفی ڕووی (جان) واتە لەش و گیانی نەکرد و... هتد کە مەبەسی لێرەدا لە دەنگە بێ هێز و خاوەکەی (دوم) و (تک)ەکەیە بەوەی وتوویە (نەکرد) و دوای ئەوە وەک مامۆستای مامۆستایان ڕووی کردووەتە مامۆستای (مۆسیقا) یا فێرکەر و هاندەری ئەو جوانە خۆشەویستەی و خودی خۆشەویستەکە و پێی وتووە: مامۆستا بۆچی کێشی لێدانەکەت کز (خاو) کرد و یا بۆچی وات فێر کرد کە کێشی لێدانەکەی کز (خاو) واتە (تک) لێ بدا و نەتهێشت بەتوندی (دوم) لێم بدا و یەکجارەکی بمکوژێ. ئەمجا ئەڵێ کەواتە هەی کزەی ئاگرت لە جەرگ چێ و لێرەشدا کوردی خۆی زاراوەی (کز)ی لە جێگەی (تک) یا (خاو) داناوە، وەک زانایەکی دەسکاری کاری بەخۆدا ڕاپەرموو.
دەستان: دەستی ئێوەو...، دەست تان.
دەستان: لە زانستی مۆسیقیدا وشەی (دەستان) زاراوەیەکی تایبەت، بەواتە ڕێکخستنی تەلی ئامێرە مۆسیقییەکان و هەر مۆسیقەیەکی تر، کە لە کۆنەوە ئەم زاراوەیە لە ئارادا بووە و بۆ ئەم ئامانجە بەکار براوە.
ئەمجا (کوردی)ش کە گیانی خۆی (فیدای) (دەست تان) یا (دەستان) کردووە مەبەستی لە (دەست)ی مۆسیقەژەنەکان و (دەستان)کردن واتە ڕێکخستنی ئامێرە مۆسیقییەکانیان بووە کەوا بەدەست مۆسیقا لێ دەدەن و بە(دەستان)ەکەشی سازی دەکەن وەک لەم سازکردنەی تەلی بەربەت (عوود)دا لە باسی (عوود)دا دواوم.
بەڵام وەک ئەم ناوە (کوردی)یەی (دەستان) زاراوەیەکی مۆسیقیی جیهانی بووە و ئێستەش هەر بەکار دەبرێ لە ئەوروپا و کۆڕە مۆسیقییە ڕۆژاواییەکاندا بەرامبەر بەم زاراوەیە (دۆزان)یشی لە جێ بەکار دەهێنن، بەو هۆیەوە کە بەدەس، مۆسیقییە (ایقاعی) = ئەوانەی بەپیامالین دەنگ دەدەن لێ دەدرێن لەگەڵ جۆری تەلیەکاندا دیسان بەدەس لێ دەدرێن و ئەو مۆسیقەژەنانەش (دەستان)یان دەکەن تاکو دەنگی ساز و (نانەشاز) بدەن بۆیە (کوردی) خۆی فیدا کردوون.
جگە لەم دوو واتەی (دەم) و (دەستان)ەش، بەجیاجیا دیسان ڕستەی (دەمودەستان) بەجیاواز لە زمانی کوردیدا واتەی (کوتوپڕتان، گورجوگۆڵتان، خێراتان، بەلەزتان...) دەدات کە وەک لە لێکدانەوەی (کات)دا گرنگی کات، بەش بەش بوونی (کاتێک)مان زانی کە دەکرێ بەشەست و چوار بەشەوە واتە ماوەی درێژاییی دەنگی ترپەی پەنجەی پێیەک ئەبێتە شانزە بەشەوە ئەو شانزەیە کە لە مۆسیقە لێداندا، لەوە گەلێ گەلێ کەمتریش گرنگیی هەیە و دێتە ژمارە و بایەخ پێدان و چاودێریکردن، کەواتە لە زانستی مۆسیقادا (گورجوگۆڵی، خێرایی، کوتوپڕی) وە یا

وەک (کـوردی) خـۆی وتوویە (دەمـودەسـتی) بایەخ و گـرنگیـیـەکی زۆری هەیە و بۆیە وەک وەسـتـایەکی شـارەزای مـۆسـیـقـا، خـۆی فـیـدای ئەو (دەمـودەسـتی) و گـورجـوگـۆڵـیـیـەی مۆسیقەژەنەکان کردووە. کە لە هەمان کاتا (سروەی دەمودەستان) بەواتە ئەوپەڕی خێراییە و ئەمـە نیشـانەی وریاییی ئەو مـۆسـیـقـاژەنانەیە لە ئاگاداریکردن و پەیڕەویکردنی کـاتی و، یا مـاوەی درێژی هەر دەنگ تیـا دەربڕینێک و، مـاوەی کـاتی کوتوپڕ و وەسـتـاندن لە نێـوان هەر دەنگێک و دەنگێکی کەدا. چونکی ئەو خێـراییە کە لە یەک بەدوای یەکیـی (تتابع)ی دەنگ و ڕاویسـتـاندا بەشـێـوەیەکی تایبەتی جۆرەها ئاوازی بەسـاز و لەحن و نەغـمـەکان دێنێتـە دی و ئەمـەشـە گـرنگیی کـات لە مـۆسـیـقـەدا ڕوون دەکـاتەوە، ئەمـە جگە لەوەی (کـوردی) ئەوەشی مەبەست بوو کە ئامێرە مۆسیقییەکان یا بە(دەم) یا بە(دەست) لەو سەردەمەیدا لێ دراون.

(کوردی) وەک لە پێشـەوە لێکم دایەوە وەسـتـایی لە دوو وشـەی (دەم) و (دەسـتـان)دا کـردبوو، کەوا بەلێکدانی ئەم دوو وشەیە بەشێوەی (دەمودەستان) لێرەدا جارێکی تر وەستایی دەکاتەوە و ئەم لێکدانەوەیەی پێ مەبەست (بەلەزتان)ە کە ئەمە وەنەبی هەر وەستاییەک بێ لە زمانزانی و یاری بەوشـەکـردندا و وردەکـاری تیـاکـردنیـا بەشـکوو وەک زۆربەی زانـاکـانی گـەلە ئیسلامییەکان بەپاڵ زانستی ئاینیشیاندا زانای ریاضیات و، فەلەک و مۆسیقا و فەلسەفە و... هتدیش بوون (کوردی)شمان بەم وردی و پسپۆرییەی لە هونەر و زانستی مۆسیقادا خۆی بۆ بردوونیـەتە هاوشـانی (کیندی) و (فارابی) و (ئیبنوسینا) و (عـەبدول مـؤمـینی ئەرمـەوی = ورمـێی) و... هتدەوە کە لەم بارەیەوە پایەی بڵندیان بووە و، بەرهەمی مـۆسـیـقـیـیـان بۆ بەجێ هێشـتـووین بەڵام (کـوردی) لەم پارچە هەڵبـەسـتـەی و تاکـە تاکـە هەڵبـەسـتی تری بەولاوە بەداخـەوە هـی کـەیمـان پێ نـەگـەییـوە، هـەرچەنـدە بەدووری نـازانم بووبێـتـی و لە دواڕۆژا دەربکەوێ.

ئایا (کوردی) لای کێ فێری ئەم زانستی و هونەرە وردە بووە، ئەم جۆرە فێربوونانەش ئەگەر بەکردەوەش تیـا ڕاهاتبێ نـایەتە فێربوون و، ئایا تا چ ڕادەیەک بەندیواری ئەم بارەیە بووە و... هتـد، ئەم پرسـیـارانە وەڵامـیـان جـارێ نادیارە. هەر ئـەوەندەی لێ دەزانرێ کـە هەرە وردترین (بەند)ەکـانی هونەر و زانسـتی مـۆسـیـقـای لەم هەڵبـەسـتـە و لـەو چەند تاکـەی تریدا پێ ڕاگەیاندووین.

دەمودەستانە (ص): دەس و دەمتانە–ئەمەش هەڵەی وەرگرتنە.

چاوەش و (مس): چاوشی–ئەمە ناشبێت و هەڵەیشە.

چاوەش و (کۆن): چاوش.

چاوەش: وشـەیەکی کـوردییـە و بـە(چاوش)یش دەردەبڕدرێت و بەفـارسی (چاووش)ە–بەپێی تێگەیشتنی کۆن و نوێمان و وەک لە فەرهەنگە کوردییەکاندا هاتووە ئەم واتانە دەدات:

چاوەش: شایەر، گۆرانیبێژ، گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەن، دەهۆڵ و زوڕنا و مـۆسـیـقاژەن (لۆتی)،

سەرەکی (جووقە)ی مۆسیقاژەنان، چەنەباز، زۆرەو، لێبووک (مُهَّرِج)، پنتی، سەرەکی کاروان، کەسێ خۆی لە زۆر شت هەڵقورتێنێ، کەسێ لە پایەی سەربازی یا پۆلیسی یا (دۆندار)یدا (٢٠) کەسی بەدەست بێ، پەردەداری مەزنە کۆمەڵایەتییەکان و هاورازییان و... هتد.

ئەمە لە بارەی واتەی وشەکەوە، بەڵام لە بارەی سەرچاوەیەوە ئەشێ ئەم ناوی (چاوەش)ە لە (چاک وەش) واتە چاکبێژ، یا (چاکوەز) وەک نێرەوەز، یا (چاو، وەش) واتە چاو جوان، یا (چاوەش) واتە جێگە چاک، یا پایە بڵند، یا (چاوبەش) واتە چاوکراوە مەبەس لە وریا و چاوگەش و... هتدەوە هاتبێ کە هەموو ئەم بۆچوونانەش واتەکانی دەگرنەوە.

ئەم ناوی (چاوەش)ە لە سەرێنی عوسمانییەکانەوە کراوە بەناوی پایەی (ڕەسمی)ی کەسێک کە (٣) خەتی لە پلەی بەرزی سەرەتاییی سەربازی (ڕەدیف) و، یا پۆلیسی (زەفتیە) یا باڵبازی (دونداری)دا بووبێ و ئەشێ ئەم پایە و ناوەش لەوەوە وەرگیرابێ کە ئەم جۆرە کەسانە (چاوەش) لە دیواخانە و دیوانی سەرۆک و فەرمانڕەوایان و پاشا و میرەکاندا سەرپەرشتی (تەپڵخانە) بوون و، لە کاتی ئاهەنگی (ڕەسمی) و بۆنەی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و جەنگ و گەشتوگوزار و ڕاووشکار و... هتددا لەگەڵ ئەو فەرمانڕەوا مەزنانەدا بوون و بەپێی سەرپەرشتیارێتیی (تەپڵخانە)کەیان پلەی (ڕەسمی)ی تایبەتیان هەبووە کە لەوێدا هەرە بچووکیان (باڵباز) بووە، هەتا ئەفسەر (دۆندار)ی سەرەک یا سەرپەرشتیاری هەرە مەزنی (تەپڵخانە)کە لەوانەشدا (چاوەش) هەبووە کەوا سێ پلە لە (باڵباز) بەرزتر بووە و (چاوەش)یان پێ وتووە.

(کوردی) لێرەدا و لە نێوان ئەو هەموو واتەیانەدا مەبەستی تەنیا لە (چاوەش)ی سەرۆکی ئەو دەستە (جووق) مۆسیقییەیە کەوا لەم هەڵبەستەیدا ناوی ئەندامەکانی بردوون و دووجاریش تیایا ناوی (چاوەش)ی دووبارە کردووەتەوە و (بەئێوەش وەرنەوە) بانگەواز لە خۆی و جووقەکەی دەکات بۆ بەشداری لە بەزمەکەیدا. جاری دووەمیش ناوی (چاوەش)ی هێناوە، بڕوانە پەراوێزەکەی هەروەها (کوردی) جاری تریش لە هەڵبەستەکەیدا ناوی (چاوەش)ی بردووە وەک:

ترنگەی تەپڵی بارئاتلانی (چاوەش) دەنگی جارچی دێ

بەتیپی غەم دەڵێ: نامەرد، ئەسەر دڵ ئەمڕۆ یەلغارە

یارانی: دۆستەکانی (جان)، واتە دۆستەکانی گیان، ئەمجا (جان) ناوی کابرای (چاوەش) بووە کەواتە: (یارانی جان) مەبەست لە دۆستەکانی (جان چاوەش) یا دەستەکانی گیانی خودی (کوردی) دەدا، کە وا (کوردی) هانای بردوونەتە بەر و گیانی خۆی فیدای سروەی (دەمەودەستان)یان کردووە کە (بێنەوە) بۆ هونەرمەندی نواندن لەو بەزمەدا کە لەم هەڵبەستەیدا بۆی گێڕاوینەتەوە و ناوی (١١) کەسی لەو (مۆسیقار)انەی ئەو سای تیا بردووە کە: (ئاغە زەننوون و فارس و ئەلکە و ئەسعەد و ئەصغەر و عیسا و ڕۆستەم و سەلیم و فەرەج

و ناله و جان چاوەش)ن و ئەمانەی بەناوی (١٥) ئامێری مۆسیقییەوە لەو بەزمەدا ناو بردوون کە تیایانا وەستا بوون و بەکاریان هێناون کە ئەوانیش (دائرەی میصری، جەقانە (جغانە)، سینەکەمان، گرفت، سەمتوور، دەف، ساز، چەنگ، دەهۆڵ، نای، نەقارە، پستە، بەربەت، تەپڵ و کووس) کە ئەم ئامێرانە لە هەرسێ جۆرە ئامێرەکانی مۆسیقین کەوا تەلی و فوویی و لێدانن... و هەندێ لەم مۆسیقارانەش گۆرانیبێژیش بوون وەک فەرەج و ناله و... هتد و هەر لەم هەڵبەستەدا ناوی هەوای (بوسلیک) و (کووسی ڕیحلەت) و (ساز)یشی تیا هێناوە.

جان: گیان. هەرچەندە لە پەراوێزی ژمارە سەر ئەم تاکەدا لە پێشەوە (یارانی جان)م بەدۆستەکانی گیانی خودی (کوردی) وە یا بەدەستە و دۆستەکانی (جان چاوەش) لێکدایەوە کە ئەم (جان چاوەش)ە لەوەوە هاتووە کە لە کەشکۆڵەکەی (عن)دا بەرامبەر بەوشەی جان لە پەراوێزەوە بەفارسی نووسیویە: (جان مقصود أز (جان چاوەش) شاعر مشهور است) واتە (جان مەبەست لە (جان چاوەش)ی شاعیری بەناوبانگە). کەواتە جان وەک بەواتە (گیان)ە ناوی چاوەشە سەرۆکەکەی ئەو جووقی مۆسیقییە بووە و ئەندامەکانی ئەو (جووقە)یە یارانی (جان چاوەش) و گیانی (کوردی)ش بوون چونکی لە خۆرشتی گیاندا کە مۆسیقایە (دەستا) بوون هەروەک مەبەست لەو بەهرە گیانییەیە کە ئەوانە پیشەیانە و دەیگەیەنن بەگیانی خەڵک و بیستنی ساز و ئاوازی مۆسیقاش هەست بێدار دەکا و جۆش بەزیندەوەری دەسێنێ و ئاراستەکاری سۆز (عاطیفە)یە بەرەو بەرزبوونەوە و پاڵ پێوەنەری ژیرێتی بەرەو بیرکردنەوە لە ئاسۆگەیەکی گیانی بەرز و پیرۆزدا کە مرۆڤایەتی ڕاستی و ڕێخۆشکەری خواناسییەکی پتەوی پڕ لە خۆشەویستییە و ئەمەشیان زۆر لە مەبەستی (کوردی) ئەچێ کە لە زۆر جێدا و لە هەڵبەستی تریشیا صۆفیانە دواوە.

سازان و (کۆن): سازان.

ساز: لەبارو، (سازان) بەواتە (سازکەران) و (ساز) دژی (نەشاز)ە کە عەرەب لە (ساز)ی کوردییەوە وەری گرتووە.

ساز: ناوی جۆرە ئاوازێکە.

ساز: ناوی جۆرە گۆرانییەکە.

ساز: ناوێکی تری (سینەکەمان)ە.

ساز: ناوێکی تری (نەی، نای)یە.

ساز: ناوێکی تری (چەنگ)ە.

ساز: ناوێکی تری (سەمتوور)ە.

ساز: دروستکردن-کە مەبەست لەوەیە لە سەرێنی (کوردی) و لە دوا ئیشیدا ئامێرە مۆسیقییەکان و بەتایبەتی ئەوانەی لەم هەڵبەستەدا ناویان هاتووە، دەسکردی (مۆسیقاسازەکان)ی خۆمان و خۆجێیی بوون لە دروستکردنیاندا.

ساز: ڕێکخستن-واتە ڕێکخستنی (دەستان = دۆزان) کردنی ئامێرە مۆسیقییەکان هەروەک مەبەست لە ڕێکخستنی (ساز)ی ئاوازەکانی گۆرانی و مۆسیقەکان خۆیانن. ب
نەواز: گۆرانی وتن.
نەواز: ئاواز دەربڕین بەئامرازە مۆسیقییەکان.
نەواز: لاواندنەوە، چاودێریکردن.
نەواز: بەجوانی و دڵسۆزی و خۆشەویستییەوە و جوولاندنەوەوە-جا ئای ئەو مۆسیقەژەنانە لەگەڵ خەڵک، یا لەگەڵ مۆسیقەکانیاندا و، بەدەم مۆسیقە لێدانەکەیانەوە گۆرانییان وتووە، وە یا ئاوازی مۆسیقەسازەکانیان خەڵکەکەی (نەواز = لاواندووەتەوە).
(کوردی) مەبەستی وەستایانە و زمانی شیرینیی مۆسیقاژەنەکانە بۆ هاوبەشی لەو بەزمەدا و گەیاندنی ئەوی لە باریاندایە.
لە لایەکی ترەوە کە ئەم تاکە و تاکە سەرەتاییەکانی ئەم هەڵبەستەی وەک سەرەتا گەیاندنێکی دەستووره گرنگەکانی زانیاری مۆسیقی داناوە و ئەوەتا ئەوی پێویست بێ تیا ڕاگەیاندووە لەم بارەیەوە کە دەتوانرێ ئەم هەڵبەستەی بەپەڕاوییەکی گرنگ و یەکەمی مۆسیقی دابنرێ لە کوردیدا و، یا ئەگەر پەڕاوییەکی مۆسیقی بەکوردی دانرا دەتوانرێ لەسەر هەرشت یا زاراوە یا باسێکی ئەو پەڕاوییە لە تاکە هەڵبەستەکانی ئەم پارچە هەڵبەستە یا هەڵبەستە مۆسیقییەکانی تری (کوردی) بەنیشانە بهێنرێنەوە.
٤- ئەم تاکە لە (گەلاڵەیی بەرباخەڵ) و (صەدباری)دا سێیەمینە و لە (نەوتچی) و (کۆن) و (سەیدە)دا چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و جارێ لە چاپیش نەدراوە.
سمکە: ناوی کەسێکە، لەوە دەچێ ئەم ناوەی کورتکراوەی (سمایل-یا-ئیسماعیل) یا (سەمین) یا (سامان) و... هتد بێ کە زۆرترەکەی بۆ (ئیسماعیل)ەکە، ڕێی تێ دەچێ کە لە پیرۆزی ئیسماعیل پێغەمبەرەوە، ئەو ناوەی لێ نراوە و، کوردەکانیش لە خۆشەویستیدا پێی دەڵێن (سمە، سمۆ، سمکە، سمکۆ).
هەروەها ئەشێ لە سووکی و گورجییەوە لە هەڵپەڕکێ و لە سەما و سووڕدا ئەم ناوی (سمکە)یەی لە (سووکەڵە)وە پێ بڕابێ کە لە ڕاپەڕینەکانی ئەم جۆرە جووڵانەوە گەلییانەدا زۆر چوست و سووک و لەبار بووە.
هەرچەندە ئەمانەش بەتێکڕایی نادیارین و جێگیر نەکراون و تەنیا بۆچوونی پەتین و ڕێیان تێ دەچێ و لەگەڵ سروشتی کوردانە و پیشەکەی (سمکە)دا دەگونجێن.
بەلام ئەوی دیارە (کوردی) دووجار ناوی (سمکە)ی لەم هەڵبەستەیدا بردووە، لێرەدا بەناوی سەرەکی یا وەستای یا سەرپەرشتیاری دەستەی سووڕوسەما و هەڵپەڕکێوە، ڕووی دەمی تێ کردووە؛ کە بەم جۆرە هونەرە گەلییانە کۆڕەکەی بۆ خۆشتر بکەن، بەڕادەیەک کە دەستی درێژی بەزمەکەی بۆ ئەوان خواستووە و لە جێگەیەکی تریشدا ناوی (سمکە)ی بردووە.

تۆش (صـەدباری): سـا–ڕەنگە ئەم گـۆرانیـیـە لەوەوە بێ کـە لەم تاکـەدا (٧) جـار پیـتـی (س) هـاتووە کە بەم (سا)یەشەو ببێتە هەشت جار و پتر جوانتری بکا.
مـەبەست لـە (تۆش)ەکە ئەوەیە کـە ئەی سـمکە ئەتۆش وەک: (پیـری مـوغـان) و (جـان چاوەش) نۆرەتە و دابزانین...
دەستەی : تیپی – ئەو دەستەی سوور و سەماکارانەی کە (سمکە) گەورەیان بووە لە سەرێنی (کوردی)دا، هەروەک لە تاکی (١٩)یەمینی ئەم هەڵبەستەدا هاتووە؛ لەوە دەچێ کە ئەم تیپە ناوی (دائیرەی میصری) بووبێ کەوا ناوی (٥) کەسی لێ بردوون و تەنیا (سمکە)یان تیا پیاو و دەروێش نییە، هەموانیان ئەندامی خێزانی (سمکە) بووبن لە دایکی و ژنی و خوشکی کە ئەوانیش (گورجی و سەمەن، گەوهەر و شاپەسەن و سمکە) بوون، لەوەش دەچێ کەوا (سەمەن و شـاپەسـەن) یا جـووتە خـوشک، یـا دایک و کچ بووبن، چونکی کـورد لـە (ناو) لێنـاندا چاودێرییەک ئاهەنگی و وێکچوویی ناوی کەسانی خێزانێک دەکا وەک: گورچی و گەوهەر، یا شـاپەسـەن و سـەمـەن و بەتایبـەتی ناوی (سـمکە)ش وێکچـوویی لەگـەڵ (سـەمـەن و شاپەسەن)یشدا بەپیتی (س) هەیە... و هتد... هەرچەند (شەهر ئاشووب) و (سەرووی ناز)یش بەسوور و سەماکاری ئەم تیپە و ئەندامی ئەم خێزانەی دەزانین، بڕوانە پەراوێزی (١٧٥ و ١٧٧ لەسەر تاکی ١٧).
هەروەها (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا ناوی (ڕەقص، ڕاقیصە، سووڕ، سەما، بستە، چەقانە، لەنجە، سووڕانەوەی بەسۆز، دەستی دراز، سوبوک خێزی و ناز و... هتد بردووە کـە هەموو ئەمانەش پەیوەندییان بەکردەوەی ئەم دەستەیەوە هەیە. (بڕوانە پەراوێزی سەر تاکەکانی «٣ و ٤» لە بارەی دائیرەی میصریەوە کە بەناوی تیپی مۆسیقا و سووڕمان داناوە).
دەبینرێ (کوردی) پیری موغانی بە(بەزمساز) ناوبردووە و مۆسیقاسازەکانی بە(یارانی گیانی جان چاوەش) بانگ لێ کردووە و بەگۆرانیبێژەکانیشی وتووە (بەرەی داوودی)، بەڵام ئەم تیپی (دائیرەی میصری)یەی بەدەستە ناوبردووە چونکە بێ گومان ئەو پەیوەندییەی بەهۆی زانایی و هونەرمەندییەکەوە لە زانستی و هونەری مۆسیقا و گۆرانیدا، لەگەڵ جووقەی مۆسیقی و تیپی گۆرانیبێژاندا بوویەتی، لەگەڵ ئەم دەستەی (دائیرەی میصری)یەدا نەیبووە مەگەر بەبۆنەیەکی وەک ئەم بەزمەوە کە لەم هەڵبەستەیدا بۆی گێڕاوینەتەوە، پێیان گەیشتبێ، هەرچەندە بەهۆی بینینی جووڵەی هونەرمەندانەی سووڕ و سەماکەیانەوە ئەو ماتەمینی و تاریکییەی بەری چاوی دەروونی گـرتبـوو، ڕووناک بووەتەوە بەشـێـوەی جـوانیـیـەکـەشـیـان جلیـوەی خـوایی بەیادکردووەتەوە و لەسەر پێودانی صۆفییانە جوانیی خوایی لە هەر جوانییەکدا و بەتایبەتی لە جوانیی مرۆڤدا ڕەچاو کردووە و بەلایەوە ڕەوا بووە کە هەر جوانییەک جوانیی خودی خوا خۆیەتی و بۆیە ڕێگەی بەخۆی داوە بۆ بینینی کردەوەکانی ئەم دەستەیە لەو کۆڕەدا.
دەسـتـەی (کـۆن): دسـتی – هەرچەنـدە بەڕێنووسـی کـۆن (دەسـتـەی) بەشـێـوەی (دسـتی)

نووســـراوە، بەڵام بە(دەســتێ) دەخــوێنرێتــەوە کــە ئەمــیش واتە هەدات بۆ ئەم شــوێنە وەک بە(سمکە)ی وتبێ تۆ خۆشت دەس پێ بکە و لە سەما و سوورەکەدا و دەستی هونەرمەندانە بسووڕێنە. بەڵام (دەستە)کە جێگیرترە لە (دەس).

سەما : سووڕ، چەرخە و خول، سووڕدانی ناوقەد و هەڵتەکاندنی سنگ و مەمک و شان و لارەکەکردن و لەرزاندنەوەی سەر و دەست و قاچ و بستە و چەقەنە لێدان، جۆرە هەڵپەرکێیەکی گەلییە، خولدان، بەچەقەنەوە بستە لێدان و لەنجەولار و خۆ چەماندنەوە و جۆرەها جووڵەی هونەرمەندانە بەلەش، پێ بەپێی ساز و ئاوازێکی مۆسیقی و خۆ قنجکردنەوە و خۆبادان و... هتد.

کە تێکڕای جوولانەوەکانی سەما و سووڕدان لە ئاکامی بەسەرهاتی دێرینەی هەزاران ساڵەی ژیانی گەلەوە هەڵقوڵاون لە خۆشی و ناخۆشی و ئازایی و کەساسی و ژێردەستەیی و تۆڵەسەندنەوە و دەستەوخواری و سەربەرزی و شکاندن و هێرشبردن و هەڵاتن و دووکەوتن و سواری و ئەرکی ژیان و لەخۆبایی بوون و چەندان باری تری کۆمەڵایەتی و ڕەگەزی (جنسی) و... هتد. کە بەکردنیان هەمان هەستی لێ هەڵقوڵاوییەکە لە دەروونی تەماشاکەرانیدا زیندوو دەکەنەوە و حەسانەوە و تەنایی و فەرامۆشییەک دەگەیەنن، جۆشی پێ دەسێنێ و تاسەی نوێ دەکەنەوە... هتد. بڕوانە پەراوێز لە دواوە لەسەر تاکی ٣٤ و تاکی ١٨.

سوور: وەک لێکم دایەوە و بەپێی فەرهەنگە کوردییەکان و لە تێگەیشتنی کورداندا (سووڕ)یش هەر (سەما)یە. بەڵام ئەشێ لە سەرەتادا جیاوازییان بووبێ، هەرچەندە ناون بۆ ئەو جۆرە جوولانەوەگەلیانە و لەوانەیە لە کۆندا جیایی لە سنووری جۆری جوولانەوەکاندا بووبێ و هەریەکەی بەجیا ناوێکی (سووڕ) و ئەویتر (سەما)ی بووبێ کەوا ئێستە ئاڵۆزکاوە.

سوور: بەڕێنووسی کۆن بەشێوەی (سور) نووسراوە کەوا بەواتە (سوور = ڕەنگی سوور) وە یا (سوور = شایی) دەگرێتەوە، کە (سووڕ)یش لە شاییدا دەکرێ و ڕەنگی (سوور)یش وەک (سووڕ)دانەکە جۆش بە(هەست) ئەدا و ئەیبزوێنێ. جگە لەمانەش (سوور)بوون لەسەر شتێک، پێ لەسەرداگرتنی و دەس لێ بەرنەدانیەتی، کە دوور نییە (سووڕ) لەم (سوور)ەیانیشەوە هاتبێ، جگە لەوەی لە (سووڕ) خواردن (خول) خواردنە و، ئەمەش زۆر نزیکە لە (سووڕ)ەکەوە کە ئەمانە ئەو ڕایەمان بەهێز دەکەن کە دەبێ جۆری (سووڕ) و (سەما) لێک جیا بوون و پێویستە سنووریان بۆ دابنرێ لە بەکارهێنانی زمانیدا و هەریەکێ، واتەیەکی لەویتر جیاواز بدەن. بڕوانە پەراوێزی سەرەوە لەگەڵ پەراوێز لەسەر تاکی ٣٤ لەسەر تاکی ١٨.

بسووڕێنە: بچەرخێنە، خولی پێ بدە، بجووڵێنە، بخە کار،... بسووڕێنە (مس) بجووڵێنە. ئەمەش ناگونجێ.

بەسۆز: بەجۆش، بەخرۆشەوە، بەتاوەوە، بە(عاطیفە)وە...

بەسۆز (ص): بەجۆش.

با: تاكو، بەشكو، فەمی، دەبا... بەڵام دیسان واتەی (هەوا)ش دەدا كە ئەم واتەیەشی لەگەڵ هەڵبەستەكە دەگونجێ، وەک: لە هەوای بەزمی ئێمە.

بەزم: یەكێ بەیەكێ بڵێ بەزمت پێ دەكەم واتە: گۆبەنگت پێ دەگێڕم، بەڵام لێرەدا (بەزم) بۆ ئەو خۆش ڕابواردنی بەزمی بادە و خۆشیی گۆرانی و ئاهەنگی مۆسیقا و جوانیی سووڕ و سەمایەیە كە لەم هەڵبەستەدا (كوردی) ناوی بردووە و بە(بەزم)ی داناوە.

بۆیە ئێمەش هەر بە(بەزم)ی ناو دەبەین. هەرچەندە لە دواترا بە(مەجلیس) ناوی بردووە.

بڕوانە پەراوێزی تاكی ٣٠ (بەزم) پەراوێزی تاكی ٣١ و تاكی ٣٢ (مەجلیس)، پەڕاوێزی تاكی ٣٥ (بەزم) و پەڕاوێزی تاكی ٣٦ (بەزم) و پەراوێزی تاكی ٣٧ (ئەطوار).

دراز: درێژ مەبەستی (كوردی) لە دەستی درێژ (ید الطولی)یە لە بەزمەكەدا و سەركەوتنە بەسەر تیپی گۆرانیبێژان و جووقی مۆسیقەدا... هەروەكو مەبەستی درێژكردنی دەستی تەماشاكەرانە یا بۆ دیاری بوونی ئەم دەستەیە لە ناو هەمووواندا یا درێژكردنی دەستی خودی سەماكارەكانە لە سووڕاندا. یا كە دەستیان باڵادەستی هەمووان بێ.

جوانی لەم تاكەدا یەكخستنی (دەست) و (دوستە) و گردكردنەوەی (٧) پیتی (س) و هاتنی وشەی (سووڕ) و (سووڕاندن)ە كە وەستایی وێژەییی تیایە.

دەستی دراز (مس) دوستی دراز – كە دۆستایەتیی درێژیش دەگونجێ

٥– ئەم تاكە لە (گەڵاڵەیی بەرباخەڵ) و (ص)دا چوارەمینە و لە (گەڵاڵەیی سەركارێز)دا دووەمینە و لە (عن) و (كۆن) و (مس)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەكراوە.

بەرە: دەستە، تاقم – دیسان مەبەست لەو تیپی گۆرانیبێژانەیە كە (كوردی) لەم چامە (قەصیدە)یەیدا خۆیان و ئەو گۆرانییانەی كە چاكی دەزانن ،ناوی بردوون. هەروەک لەبەر دەنگ خۆشییەكەیان بەبەرەی (داوودی)ی ناو هێناون كە مەبەستی لە (داوود) پێغەمبەری دەنگ خۆشە. هەروەها بەناوی (سەرۆكی تیپەكەیانەوە كە ناوی داوود بووە) بەبەرەی واتە دەستەی (نەوەكانی) لای... داوودی دەربڕیون كە لەم چامەیەیدا ناوی ٢٩ كەسی لێ هێناون لەوانە (٧)یان ئافرەت و ٢٢یان پیاو بوون و ئەوانیش: (خانمە، نەسمەجان، نازەنین، دڵگوشا، شەهر ئاشووب، سەروی ناز، گوڵبەیاز، لەگەڵ مستۆ، صۆل، حگە، پیرۆت، ئەوڵای مامەسەن، ئەوڕەحمان، فەتحی، مستەفا، یونس، خوسرەو، ڕەسووڵ، ساڵح، محیەدین، قەرە، كاكەباس، شێخە، عەزیزی یایەناز، یارە، نالە و فەرەج و داوودی سەرۆكی تیپەكە)ن ئەمە جگە لەوەی كە گومان لەوەدا نییە كە مۆسیقاژەنەكانیش و سووڕ و سەمادەرەكان هەموو گۆرانیبێژ بوون، جگە لە ئەندامەكانی كۆڕی بادەنۆشی و سەیركەرانیش.

ئەو گۆرانییانەش كە ئەم تیپە وتوویانە و ناویان لەم چامەیەدا هاتووە (٣١) گۆرانی و مەقام و ئاوازن كە ئەو گۆرانیبێژانە دەستی باڵایان تیایانا بووە و چاكیان زانیون ئەوانیش ئەمانەن: (خاوكەر، قەتار، سۆزە، ناز، غەمزە، ساز، عوشاق، ئەسیری، كوردی، شەهری ناز،

ئیبراهیمی، نەوا، حەزین، سێگا، شەهری، حیجاز، نازەنین، دڵگوشا، شاهناز، ڕاست، نیوەشەوێ، چوارگا، قەزاز، سۆزناک، نەوئەثەر، ماهوور، پەردەی طاهری، بوسلیک، عێراق، ناری و نیاز)، کە ناوی هەموویان بەکوردین جگە لە ١٢یان کە نیمچە کوردین.
گومانیش لەوەدا نییە کە لەم سێ تیپی (هەڵپەڕکێ و سوور و سەما) و (مۆسیقا) و (گۆرانی)یە، پتریک لە سولەیمانیدا بووبێ و لەو ناوانەی کە (کوردی) ناوی بردوون زۆرتر بووبن و ژمارەی ناوی گۆرانی و مەقام و ئامێرە مۆسیقییە ناوبراوەکانیش گەلێ لەوە پتر بووبن و ئەوەتا زۆربەی هۆنەرانی ئەو سەرێنییەمان جێ جێ ناویان بردوون. لەو سەرێنییەدا گۆرانی و مۆسیقا زۆر لە باودا بووە، چونکی ئێستە هۆی ڕابواردن گەلێ زۆرتر و فراوانتر و ئاسانترن لەوسا، و هەروەک (کوردی) بۆ خۆی وتوویە:
منم و جەفا و فیراق و ئومێدی ویصالی یار
کاغەز ڕەفیقی ڕۆژمە، شەمعیش ئەنیسی شەو
کە بەڕۆژ بەخوێندنەوەوە و بەشەویش لەبەر مۆمێک بەلادا هاتوون.
(مستەر ریچ)یش لە گەشتەکەی ساڵی١٨٢٠یدا بۆ سولەیمانی لە یادداشتەکانیدا، گۆرانی و مۆسیقا و مۆسیقاژەنیی ئەوسامان بۆ دەگێڕێتەوە، وەک لە شوێنی تری لێکدانەوەی ئەم هەڵبەستەدا دەسنیشانی هەندێکی دەکەم.
(کوردی) لە پاش سازکردنی بەزمی (پیری موغان) و ڕێکخستنی جووقەی مۆسیقیی (جان چاوەش) و شەتلکردنی بەزمەکە بەسوور و سەمای (دائیرەی میصری)، ئەوا لەم تاکەیدا دەیەوێ بەئاوێتەکردنی تیپی گۆرانیی (داوودی)، بەزمەکە تەواو بکا، کە هەریەکەی بەساز و ئاواز و جۆرە هونەر و خۆشییەکەوە بەزمەکە بڕازێننەوە.
بەرەی (کۆن): بری.
داوودی: هی داوود و ئەمەش ناوی ئەو تیپە گۆرانییە بووە کە (کوردی) لێی دواوە، چونکی لە کەشکۆڵە دەسنووسەکەی (عن)دا لەو پەراوێزەدا دیسان بەرامبەر بەم (بەرەی داوودی)یە بەفارسی نووسیویە:
«برەء داودی مقصود از فرقەی داود شایری مشهوراست – عەلی» واتە: (بەرەی داوودی مەبەست لە تیپی داودی شایەری بەناوبانگە – عەلی – ).
کەواتە داود شایەرێکی بەناوبانگ و سەرۆکی ئەو تیپ (فیرقە)ی گۆرانیبێژە بووە کە (کوردی) بە(بەرەی داوودی) ناویبردووە.
داوود: مەبەس لە داوود پێغەمبەرە کە (کوردی) ئەو تیپە دەنگ خۆشەی (داوود شایەر)ی پێوە ناوبردووە کە ئەندامەکانی لە تاکەکانی ئەم هەڵبەستەدا لەسەر ئەو بەزمە ناویان هاتووە، کە گوایە دەنگیان وەک دەنگی داوود پێغەمبەر، خۆش بووە.
ئەمجا (کوردی) جگە لە لایەنی صۆفیگەرییەکەی، لەبەر دەنگە خۆشەکەی (داوود) (تیپی

داوودی)ی گۆرانی لەمەڕ (مام داوودی شایەر)ی بانگی نەغمەخوانی کۆڕەکەی کردووە بۆ بەشداری لە بەزمەکە.
نۆرەی: گەڕەدی، سەرەی، کاتی، دەمی، هەڕەتی...
نۆرەی (کۆن): نوری.
نەغمە: دەنگی خۆشی گۆرانی یا مۆسیقا یا هەر شتێکی وەک (مەل): نەغمەی بولبول، من وشەی (نەغمە) لە (ناخمەوە)ی زمانی کورد ڕەچاو دەکەم.
(کوردی) ئەوەندە قووڵ ڕۆ چووەتە زانینی مۆسیقا و گۆرانی و هونەرەکانیانەوە، ئەوەتا دەستی بۆ وردترین زاراوەی ئەم بابەتە کێشاوە و ناوی ئەوەی بردووە کە پەیوەندیی پێیانەوە بووبێ تا ڕادەیەکی زۆر وەک ناوی (نەغمە) بردن کە لە شوێنی تری هەڵبەستی کەیدا دیسان ناوی هێناوە و بەدەمی خۆی پێی لێ دەنێ کە:
ئەگەرچی ڕۆژ و شەو مەشغووڵی نەغمەی موطریبم ئەمما
لە غەم خاڵی نییە ساتێ دڵی مەفتوون و غەمگینم
نەغمەخوانی: نەغمەبێژی، گۆرانیبێژی، دەربڕینی دەنگ بەسۆز و ساز و هەستی ناخەوە.
ئێوەشە: کە مەبەستی سەرەڕای پێڕی (پیری موغان) و جووقەی (جان وەش) و (دەستەی سەمای «سمکە» واتە «دائیرەی میصری») نۆرەی ئێوەشە:
(ئەی تیپی داوودی کە ئێوەش بێنە بەزمەکەمانەوە وەک ئەوان).
ماھ = مانگ.
ماهی = ماسی – ناوبردنی ئەم (مانگ) و (ماسی)یە لەو بیرە کۆنە ئەفسانەییەوە هاتووە کە جاران بڕوایان وابووە یا بەلایانەوە وا بووە کە گوایە ئەم گۆی زەوییە لەسەر شاخی گایەکەوە بەندە و گایەکەش لەسەر پشتی (ماسییەکە) و ماسییەکەش لە ناو دەریایەکی تاریکستانی بێ بن و بێ پایاندایە... و ئیتر لەم جۆرە کەڵەکە.
(کوردی)ش لەسەر ئەم بیروبڕوایە کە ئای بڕوای پێی بووە یان نا و، ئەشێ هەر لەسەر پێودانی وێژەی کلاسیکی چاولێکەری و دوا بەدوای ئەوان ئەمەی وتبێ، چونکی ئەوەتە زۆر جار لە باسی برۆدا (کەوان = تیروکەوان) بەنیشانە و هاوچەشن دەهێنێتەوە کە لە سەرێنی (کورد)یشدا (تیروکەوان) بەکار نەهێنراوە و بەڵام هەر دوا بەدوای وێژە کۆنەکەی، ئەویش تیروکەوانی دووبارە کردووەتەوە، کە (کوردی)ش لەسەر ئەو بیری ئەفسانەی (زەوی و شاخی گا و ماسییە) لەم تاکەیدا لە (تیپی داوودی)ی گۆرانیبێژی خواستووە بەگۆرانییە بەجۆش و خرۆشەکانیان هەر لەو ماسییەی ژێر پێی گایەکەی بن زەوییەوە. هەتاکو مانگ هەمووی بلەرێننەوە ئەوا مانگیش ئەو مانگە نەما کە جاران بەجۆرێکی تر تێی دەڕوانرا و کەچی ئێستە بەهۆی زانستییەوە، مرۆڤیشی گەیشتێ و کەرەستەی مرۆڤی تیایە و پتر و پتریش.
تەکووتاز : جووڵە جووڵ، لەراننەوە، هەژاندن، هێنانە لەرزە.

٦- ئەم تاکە لە (گەلاڵەیی سەرکارێز)دا، سێیەمینە و لە (گەلاڵەی بەرباخەڵ) و (ص)دا پێنجەمینە و لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە.

فەیض: سەرڕێژکردنی شتێک و مەبەس لە بەهرەوەرییە لە پیرۆزی، سوودی کۆڕی بادە و تیپی گۆرانی و دەستەی سەما و جووقەی مۆسیقاکە.

تەعطیر: عەتراوی، بۆن خۆشی، گوڵاواوی.

دەماغ: مێشک – مەبەستی لە هۆش و بیرە، کە ئەو چێژی خۆشی و بەهرەیە وەردەگرن.

جان: گیان، ڕەوان.

نەشئە: خۆشی – یا وەک جۆرە چێژێکی سەرخۆشیانە وەرگرتن، کە بیر و هۆش و گیان وەری گرن لە بەهرەی ئەو کەسانەوە ئەو بەزم و ساز و ئاوازانە.

قووت: خۆرشت، ئەوی تێر دەکا. مەبەست لەو تێشووی ئامێزیی مۆسیقا و گۆرانی و جوانیی هونەرمەندانەیە کە لە ڕێگەی گیان و بەهرەوەربوون و بەرزبوونەوەدا بۆ ئاسمانێکی جوانی و خۆشەویستی ڕاستی، کە لە ئەندێشەی سۆفیاندایە.

فیراز: بەرز، باڵا...

(کوردی) لە وتنی ئەم (ئاسمانی فیراز = ئاسمانی باڵا)یەیدا، نیشانە بۆ سەرەتای سوورەتی (طه) دەکا لە قورئاندا کە چوارەمین ئایەتی ئەم سوورەتە لەو (ئاسمانی فیراز) = (السموات العُلی)یە دواوە کە دەڵێ:

طه، ما انزلنا علیك لتشقی، إلاّ تذکرة لمن یخشی، تنزیلاً ممّن خلق السموات العُلی). واتە: (ئەی «طه» (بەواتەی پیاو و مەبەستی لە پێغەمبەرە «د.خ») ئەو هاوتا بۆ خوا پەیاکار و خوا نەناسانەی کە بەتۆ دەڵێن تۆ سزاواری، ئەوە ڕاست نییە و ئێمە قورئانمان بۆ ئەوە بۆ نەناردووی کە سزاوار ببی، بەشکو بۆ ئەوانەیە کە لە خوا ناترسن، چونکی قورئان هاتنە خوارەوەیە کە لەوەوە کە ئاسمانە بەرزەکانی دروست کردووە).

(کوردی) لە (ئاسمانی فیراز) و وتنەکە مەبەستی گەیشتنە ئەو ئاسمان (ژیانە گیانی)یە بەرزانەیە کە گیانی تیا ئەگاتە ئەوپەڕی ئاوات و جوانی و پڕ لە خۆشەویستی و دوور لە جەخاری باری گەلەکەی و پەژارەی خۆی و ڕسگاربوون لە ئێش و ئازار.

چونکە ڕەوشی فەرمانڕەواییی (بابانی ئەوسا) لە دۆخێکی ناهەموار و ڕۆژگارێکی پڕ لە بگرە و بەردە و بکوژ و ببڕ و پیلانگێڕانی مەمالیک و عەجەم و عوسمانیدا بووە، لە لایەکی تریشەوە شەکە شەکی خۆ بەخۆیی نێوان بابانیان و... هتد ئەم ڕواڵەتانە کە هەموو هاندەری ئەوە بوون کە ئەو گەلەی (کوردی) ئەوسا و بەخودی (کوردی)شەوە ئاواتەخوازی دەرفەتێک بوون کە تۆزێ باری مێشکیان سووکتر ببێ و ئەوەش بووەتە بەڵگەی بەندیواریی هەمووان بەگۆرانی و مۆسیقا و برەو پێدانی هۆی دڵخۆشکردن بۆ لابردنی ئەو بارە گرانە لەسەر دڵیان، تاکو چاو و گوێی

خۆیان لە دیتن و بیستنی دیمەنی جەرگبڕ و کووکەی ناخۆش دوورخەنەوە، وەک (کوردی) لەم چامەیەیدا بەندیواریی خۆی بەگۆرانی و مۆسیقا و بەزم دەربڕیوە و دیارە کوردیش هۆنەرێک بووە، هۆنەریش ئاوێنەی گەل و نیشتمانە وەک لە دوا تاکی ئەم چامەیدا ئەم بیرەی گەیاندووە.

لەوانەشە کە هەر ئەو هۆیانە پاڵیان بە(کوردی)یەوە نابێ بۆ وتنی ئەم هەڵبەستەی کە بەجۆرێکی تر خۆشیهێن و باری دەروون سووککەرە. چونکە لە تێکڕای هەڵبەستەکانی تریدا (کوردی) هەمیشە لە بەرگێکی ماتەم و خەم و پیش خواردنەوە و لە خۆئاڵاوی و شێواویدا خۆی لێ ئاشکرا کردووین و بەهەر بۆنەیەکەوە گازندەی لە ژیان بۆ کردووین، کەچی ئەوەتا لەم پارچە هەڵبەستەیدا، بەپێچەوانەی ئەو دۆخە تێکراییەی خۆیەوە دەبینرێ کەسێکی تری جیاواز لەو (کوردی)یەیە و بەجارێ خۆی بەرداوە و نەک بەحەوت بەرد بەشکو حەفتا بەردی داوە بەپشتی هاوبەشەکانی کۆڕ و بەزم و ئاهەنگە خۆش ڕابواردنە مێژووییەکانی (هارون الرشید) و (سوڵتان عەبدولحەمید) و (سۆکارنو) و... هتددا....

ئەمەش لەوەوەیە کە بەلای کۆمەڵی ئەو سامانەوە {(کوردی)یش یەکێ بووە لەوان} وا بووە کە ساز و ئاوازی خۆش لە بەهەشتەوە هاتووە و، مشتومالّی مێشک و دەروون دەکا و گیان پاک دەکاتەوە بۆ دوورکەوتنەوە لە بیری ئەو بارە ناخۆشەی کە تیا ژیاون و یاریکارییان دەکا بۆ بەندیواری پەیداکردن لەگەڵ خوا. هەر لەمەشەوە بووە کە کۆڕە ئاینییەکان نەک هەر لە کوردا بەشکو لە هەموو گەلانی جیهان و تێکڕای ئاین و ڕێڕەوە ئاینەکانیشدا ئامێرە مۆسیقییەکانیان تێکەڵ بەکۆڕی (زیکر) و (مەراسیم)ە ئاینەکانیان کردووە لە بەجێگەیاندنی خواناسییەکەیاندا. هەروەک فەرمانڕەواکانیش ئامێرە مۆسیقییەکانیان لە کارکردنە سەر خەڵکیدا لە ڕێگەی پاراستنی پایەکانیاندا بەکار هێناوە.

هۆنەرمان (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا وەک بادەنۆشێک، (خەیام) ئاسایی دەستەودامێنی (پیری موغان) بووە بۆ سازکردنی دەستە و کەرەستە و پێویستی و ڕێگەشی بەخۆی داوە بۆ ڕەواییی خواردنەوەی مەی و بانگەوازی لە خەڵک کردووە بۆ بەشداربوون لەگەڵیدا لەو بەزمەیدا و بەزمەکەی بەبێ تیپی گۆرانی و جووقەی مۆسیقاش ناتەواو دیوە ئەوانیشی کێشاوەتە ناوەوە و ئەمجا دژێتیی خۆی لە سەرەتا و دوا دوای ئەم هەڵبەستەیدا بەرامبەر بەصۆفی و زاهید و شێخە درۆزنەکانی تەکیە و خانەقا و میر و کورسی پەرستەکانی ئەوسا دیاری کردووە و دلێرانە ئاڵای شۆڕشگێڕانەی لە دژ هەڵکردوون و یاخیگەرانە چاوی ناوەتە چاویانەوە کە ئەوان هەموو ڕێگەی چەوتیان گرتووە و دوورن لە ڕاستییەوە و ئامێرە مۆسیقییە پیرۆزەکانیان لە پێویستییە ڕاستییەگەلییەکانیان قەتیس کردووە و تەرخانیان کردوون بۆ دەنگدان لە (جاه) و (سوڵتە)ی جیهانی خۆیان و دوور لە (جاه) و (سوڵتە)ی گیانیی جاویدانی و ئاسمانی بەرز وەک لەم تاکەیدا بەئاشکرا ئەو بیری (ئاسمانی بەرز) خوازییەی دەربڕیوە بەسەرخۆشییەکی گیانی و ئاسمانییەوە بەبادەی خۆشەویستی و ڕێڕەوی ئاینی.

کە ئەم ڕاگەیاندن و ڕواڵەتەی (کوردی) ڕەمزێکی صۆفیانەی ڕاست و پاکە لە بەندیوارێتیی بەخوا و بەخۆبەختکردنەوە لەو ڕێگەیەدا و بۆ پتر ڕێ خۆشکردنی ئەم ڕێڕەوەی کە لە سایەی ساز و ئاوازی بەهەشتی خۆشدا زاخاوی گیانی خۆی بداتەوە لە ژەنگ و خشت و خاڵی جیهانی و بۆ توانایی پەیداکردن و گەیشتنە بیرکردنەوە (تەئەممول)ەوە لە پەیوەندیی بەهێز و پتەوکردندا بەجوانی و جوانی پەرستی و خۆشەویستیی ڕاستی و لە ڕێگەی خۆشەویستیی ڕاستی خوادا خۆبەختکردن و خۆ گەیاندنە ئەو (ئاسمانی فیراز – السموات العلی)یەی کە لەم تاکە هەڵبەستەیدا ناوی بردووە کە بەتێشووی ئاوازی ئەو مۆسیقە و گۆرانی و چێژ وەرگرتن لە جوانیی هونەرمەندانەی خۆشکەرانی بەزمەکەیەوە ئەم بەهرەیەی دەست بکەوێ، نەک وەک هەندێ خەڵک لە مۆسیقا و گۆرانی دەگەن و بۆیە لە دوا تاکی ئەم هەڵبەستەیدا وتوویە: (وەنەبێ مایلی ئەو نەوعە ئەطوارە جیهانیانە بێ) بەشکو چونکی شاعیرە و شاعیریش پێویستە پەل بهاوێ بۆ هەر بارەیەک و لێی بدوێ، بۆیە ئەم هەڵبەستەی داناوە، ئەگەر نا ئەو (کوردی) سەر بەو چەشنە بابەتە جیهانییانە و بۆ جیهان نییە).
لەمەدا (کوردی) ڕێگەی بۆ خۆی پاک کردووەتەوە کە، مەبادا، کەسانێک ئەم هەڵبەستەی بەئامانجێکی جیهانییەوە لێ لێک بدەنەوە و بەبەندیوارێت جیهانی (کوردی) دابنێن و، بەوە ڕیسوا و بەدناوی بکەن، هەروەکو (کوردی) خۆی لەو لەکەدارکردنەش، سڵی کردووەتەوە کە ئەوەتا وتوویە:

لە ئەشکی بێ گوناهی گەر بشۆم صەد جار تەن و ڕەختم،
لە گــەردی توهمــەتی دوشــمن مــونەززەه نابێ دامــانم

بەڵام وردیی ئەم چامەیەی (کوردی) لە دەربڕینی هەرە وردترین و دوورترین سووچ و قوژبنی زانیاری و هونەری مۆسیقا و گۆرانیدا، نزیکایەتییەکی تری بەهێزی ئەو دەگەیەنێ بەکۆڕە مۆسیقا و گۆرانیبێژەکانەوە و دیارە ئەوەشی هەر بۆ چێژ وەرگرتنەکەی بووە بۆ گەیشتنە ئاسمانە بەرزەکە، وەک: زۆربەی زانا زۆر ئایندارە بەناوبانگەکانی ئیسلام مامۆستا و پسپۆڕی مۆسیقا و گۆرانیش بوون، لێرەدا (کوردی) لەگەڵ ئەو زانایەشدا یەکانگیر دەبێتەوە لەو پسپۆڕییەیدا.
هەر ئەم پسپۆڕییەی (کوردی)یش لە مۆسیقا و گۆرانیدا بووەتە هۆی دۆستایەتی لەگەڵ گۆرانیبێژ و مۆسیقاراندا و چونکە (هۆنەر)ێکی بەسۆز و سادە و ڕەوانیش بووە، دیارە هەڵبەستی خۆیشی داونەتێ کە بیکەن بەگۆرانی، چونکی هەڵبەست وەک دەربڕینێکی زمانییە، هەروەها ماک و کرۆکی گۆرانییە و گۆرانییش دەربڕینێکی مۆسیقیی شیعرە و مۆسیقا و گۆرانییش دەنگدانەوەی دەروونی و بۆ دەروونی بوونە...
لێرەدا جێگەیەتی کە نیشانە بۆ ئەوە بکەم کەوا دوورنییە ئەم هەڵبەستە گۆرانییە فۆلکلۆرانەی ئێستەمان لە هەوێنەکانیان هەڵبەستەکانی (کوردی)ش بن کە دەماودەم و ساڵەهای ساڵ

بەسەرا تێپەڕین، سواندبنی و خستنیە ئەم شێوە فۆلکلۆرییەی ئێستەیانەوە.

(کوردی) لەم ڕێگەی هەڵبەست و گۆرانیدانانەیشیدا وەک بەچاوگ ئاگری ئەو عەشقە ئاسمانییە بەرزەی خۆش کردبێ وایە، کە تاکو خۆی و کەسانی تری تیا بگەنە ئەوێ، کە دوا ئاواتی بووە. بەتایبەتی هەڵبەستی کوردی لە هی نالی و سالم و... کێ و کێ سادەتر بووە کە نزیکترە لە گەلییەوە لە هی ئەوانی تر. هەر ئەم ڕێبازە تایبەتیەی خۆی وەیا قوتابخانە تایبەتیە شیعرییەکەی خۆی بەسادەیی و بەسۆزی بەگورجی هەست بزوێن موتوربە کردووە، کە هەڵبەستەکانی ئەم زووتر لە هی ئەو جۆرە شاعیرانە بچنە ناخی بیستەر و خوێنەرەوەی شیعرەکانیان لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕووی ناوەڕۆک و کارامەیی و وەستاییدا لە هی ئەوان کەمتر نین.

هەر لەبەر ئەوەیە ژمارەی چێژ وەرگر لە شیعری (کوردی) گەلێ گەلێ زۆرترە لە چێژ وەرگران لە شیعری (نالی)ی وەستای پسپۆڕانەی شیعر، ئەمەش تواناییەکی تایبەتی (کوردی)یە لە شیعردا کە زۆربەی شیعری شاعیرانی وەک (نالی) دەمێ ساڵە باوی خۆیان لە ناو کۆڕە وێژەییەکانماندا نەماوە، بەڵام هێشتە دوای ساڵەهای ساڵی تریش زۆر لە هەڵبەستەکانی (کوردی) هی ئێستە و ئایندەیەکی دووری کۆڕە وێژەییەکانمان دەبێ.

٧- ئەم تاکە تەنیا لە (گەلاڵەیی ١٣٠٠)دا نییە و لە (گەلاڵەییەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠) و (نم/١، ع، کم و چاپەکانی (گیوی)دا سێیەمین تاکە و لە (گەلاڵەیی سەرکارێز) و (ف)دا چوارەمین و لە (گەلاڵەیی بەرباخەڵ) و (ص)دا شەشەمین و لە (عن و کۆن) و (مس)دا حەوتەمین تاکە، واتە سێیەمین تاکی چاپکراوی ئەم هەڵبەستەیە.

زاهید: ڕەند، لە خواترس و لە جیهان بووردوو، لەبەر خۆشەویستیی ئەوە جیهان و خۆبەختکاری لە ڕێگەی خوا و، گەیشتن بەحەقیقەت و، بەهرەوەربوون بەجوانیی پەرتەوی (جیلوە)ی خوایی و گۆشەگیریی خانەقا و تەکیە.

هۆنەرانی ئەو سەردەمەی ناوچەکە و هەتا ئەوانی ناوەڕاستی چەرخی بیستەمیش زۆر بەگەرمییەوە لە سەر و پۆتەڵاکی زاهیدیان داوە و مەبەستیان لەو (بەناو) و (سەرزارییەی) زاهیدانە بووە کە درۆزن بوون و (کردەوە) و (دەروون)یان، (وتە) و (بیریان) لێک جیا و (ڕەوشتیان) بەپێچەوانەی سروشتی زاهیدایەتیی ڕاستەقینەوە بووە.

(کوردی)ش لەو هێرشەدا دژە ئەو جۆرە زاهیدە ناپاکانە ئەوەتا؛ ڕوو دەکاتە خەڵکەکە و دەڵێ بەزاهید ڕابگەیەنن کە (ئەوانەی بەڕاستی ڕەند و گۆشەگیری تەکیە و خانەقا بوون نەمان)، چونکی دەرگای مەیخانەکان کراونەوەوە و پەردە لەسەر خەڵوەتگای ڕاز هەڵدراوەتەوە و دەسا ئێوەش ئەگەر ڕاست دەکەن، زاهیدی ساغن وەرنەوە بۆ بەشداریی لەم بەزمەماندا و لێرەدا لایەنی ڕێککەوتن و ئاشووب نەبوونی گرتووە کە مەبەستی لەوانەی نەماون کەسانی وەک (مەولانا خالید) بووە.

وەنەبێ (کوردی) هەر بەمەندە لەو زاهیدانە گەڕابێ، بەشکو لە شوێنێکی تردا پێی وتوون:

لە من بەدتر دەبی، زاهید ئەگەر تۆش!!

شەرابی دەستی مەحبوبێ بنۆشی

دیسان لە چەند هەڵبەستی تریشیا، یەخەی زاهیدی گرتووەتەوە وەک لە یەکێکیاندا پێی دەڵێ:

حەیای بردی شەراب، بیللاهی، با مەنعت بکەم زاهید

(هەوا، باری) خراپە!! حەقتە وا بەدگۆیو بەدناکی!!

نەمان: (ف) و چاپی گیو/٢، ئۆفسێت، (ع): نەماوە.

نەمان: (نم/١، کم، مەریوانی): نەما. کە ئەمەش لەنگی دەدا بەهەڵبەستەکە.

نەمان: (گیو/٣): نومای. هەڵە و ناڕاستە و دەسکاری.

زاهید نەمان (ص): زاهیدانمان – دیسان ئەمیش لەنگە.

ڕەندانی: (زاهیدانی) بەڵام بەتێکڕایی زاهیدان جۆرە، ڕووساردی، یا بێ ڕووییەکیان هەیە و، هەرچی وەکو (ڕەند)ە کەسێکی زمان شیرین و ڕوو خۆش و گۆشەگیر بۆ خواپەرستی و دوورەپەرێز لە خەڵک بووە و کە گەیشتووەتە خەڵک چونکی هیوا و ئامانجێکی جیهانی بەکەس نەبووە، هەموو کەسی خۆش ویستووە و بۆیە لەگەڵیاندا دەم بەپێکەنین و شارەزای ئەدەبیاتیش و ڕەوشنبیریش بووە و گوایە (زاهید)ە ڕاستەقینەکان وەها بوون.

ڕەندانی: (نم، کم، چاپی گیو/٢، ئۆفسێت): وەرنە.

ڕەندانی: (بەرباخەڵ، با (ع) و (عن): نسخە) ڕەننە:

ڕەننە: بێباک، بێعار، قەللاش.

گۆشە: سووچ، کەناری شتێک، ناوبردنی گۆشەی خانەقا لێرەدا مەبەست لەو دەستە یا ڕیزە ژوورەیە کە هەریەکەی بۆ یەکێک یا پتر لە (زاهید) و (صۆفی)یەکان، تەرخان دەکرێ کە تیا ئەژین و خواپەرستی و پێویستییەکانی ئاینی و ڕێگە (طریقەت)ەکەیانی تیا دەگەیەنن و گۆشەگیری لە کەسانی تر دەکەن و پێم وایە مەبەستی لێرەدا کەسانی وەک (مەحوی) بوو.

ئەو دەستە زۆرەش لە کەنارێکی خانەقا یا تەکیەدان کە هاتوچۆی کەسانی تریان بەسەرەوە کەمە و بە جیان و، بەو (زاهید) و (صۆفی)یانە ئەوترێ (گۆشەگیر). بەڵام ساختەچی و درۆزنیشیان تیا بووە، کەوا هۆنەرانی وەک (کوردی) هەمیشە بەخراپ لێیان دواون، وەک (نالی، سالم، مەحوی، شێخ ڕەزا و... هتد).

خانەقا: وشەیەکی کوردی و فارسییە و لە: (حانە = خانوو) و (قا = گا = گاه = شوێن)ەوە دروست بووە و عەرەب و تورک و گەلە ئیسلامییەکانی تریش بەهۆی ئاینی و بەندیواری بەڕێڕەو (طریقە) ئاینییەکانەوە بەکاریان هێناوە.

مەبەست لە (خانەقا) ئەو بارەگایەیە کە بۆ شوێنی تیا ژیانی صۆفی و دەروێش و زاهید و مورید و هەوادارانی ڕێگەی (طەریقە)ی نەقشبەندی تەرخان کراوە بۆ ئەوەی خواپەرستی تیا

بکەن و ئەو صۆفی و دەروێش و زاهید و موریدانەش (بەناو) تاقمێک بوون لە پیاوانی خوا و، دڵ لە جیهان بەرداو، کە ئامانجیان بە(جیلوە) و خوا گەیشتنە و، بەپێی زارگوت (ئیصطلاح)ی صۆفیانە؛ هەڵسووڕاندنی جیهان بەکەسانێکی پایە بڵند لە خۆیان وەک (رجال الغیب) و (ئەوتاد) و (ئەولیا) سپێرراوە. کە لە سەرێنی (کوردی)دا، سەرەکی ڕێگەی نەقشبەندی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی ١٧٧٩ – ١٨٢٦ز) بووە.

واز: کراوە (بۆ دەرگا)، لەسەر پشت بوون، بەش.

مەیخانان (نم/١، بم): مەیخانە و. شوێنی مەیخواردنەوە و فرۆشتنی.

مەیخانان (کم): مەیخا ان: دیارە هەڵەی چاپییە و سەرە (نـ)کەی پەڕیوە.

خەڵوەتگاهی: (خەڵوەت (ع)) و (گاهی) واتە شوێنی (خەڵوەت) خەڵوەت بەنهێنی یا (خۆ بەخۆ) بەیەکگەیشتن و مەبەست لەو کۆڕی بەزمەی ناو ئەم هەڵبەستەیە یا(چوونە بەجێگەیاندنی (ذیکر)ی (تەریقەت)ەوە.

خەڵوەتگاهی (نم/١، مەریوانی): خەڵوەتگاه.

خەڵوەتگاهی (بم/١): خەڵوەتگای. کە ئەمەش لەنگی دەکا.

ڕاز: وتن، گفتوگۆ، ڕاز و نیاز.

٨– ئەم تاکە لە (گەلاڵەیی ١٣٠٠) و (ف)دا دووەمین و لە (گەلاڵەییەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠) و (بم/١، ع، کم) و چاپی (گیو/٢) و (ئوفسێت) و (گیو/٣)دا چوارەمینە و لە (گل/سەرکارێز)دا پێنجەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ) و (ص)دا حەوتەمینە و لە (عن، مس، کۆن)دا هەشتەمینە و لە چاپەکاندا چوارەمینە.

خواب: خەو، خەوتن.

خوابی: (ف، نم/١، کم): جواب.

غەفڵەت: بێ ئاگایی، ئاگا لابران.

ناز ل (ع): هاتنە خوارەوە، هاتنە سەر، دابەزین، داگرتن.

ناز لە بۆ چاوی (ف): با لەسەرچاو.

ناز لە بۆ چاوی (کم): نازە لە بۆ چاوی.

ناز لە بۆ چاوی (ع): نازِ لَە بو چاوی.

شەحنە: گزیر، بەردەستی کوێخا لە ئاوایی (گوند) یا گەڕەکدا.

شەحنەو (ف): شیخو.

شەهنەو (نم/١)دا: سحنە.

موحتەسیب: دەربار، دەستوپێوەند (قەلەودەلە، عەلەوجەلە، چێشتە، چڵکاوخۆر، کاسەلێس... کە لە سەرچاوەکاندا بەهەڵە بە(موصتەسەب) نووسراون.

فرصەت: دەرفەت، هەل.

فرصەتە: (چاپەکانی گیو): دەرفەتە – کە لە گۆڕینێکی نوێی دەچێ.
جام: بادی، پیاڵە، پەرداخ – مەبەست لە پیاڵەی پڕ لە مەیە، کەرەستەیەکی بادەخۆریی ئەوسا بووە و ئێستاشە.
ئەسەر: بەسەردا. (ئەسەرکەین): بیخۆینەوە.
ئەسەر (ف): بەسەر. لەگەڵ هەڵبەستەکەدا ناگونجێ.
کێشین: بکێشین. ئەسەرکێشین: بخۆینەوە. واتە: بادەکەی ئەو جامە بکێشینە سەرمانەوە با (خۆی) پێ مەست بکەین.
کێشین: (چاپی گیو/٢، ئۆفسێت): کیشێ – ئەمەش هەڵەیە.
کێشین (گیو/٣): کێشێ – ئەمەش هەڵەیە.
بەڵا (ف): بلا.
بەڵا: بەشکو، قەمی، با، بلا.
ئیحتیراز: مەترسی، سڵەمینەوە، کۆکردنەوە.
ئیحتیراز (ف): إعتراز – ئەمەش هەڵەیە و واتەکەی دوور خستووەتەوە کە (إعتراز) مەبەست لە (ئیعتیراض) بەواتا ڕەخنەیە.

٩- ئەم تاکە لە (نم/١، ع، کم و چاپەکانی گیو)دا دووەمین تاکە و لە (گەلاڵەیی ١٣٠٠) و (ف)دا سێیەمین و لە (گەلاڵەیی ١٣٠٨) و (گەلاڵەیی ١٣٠٩) و (گەلاڵەیی ١٣١٠)دا پێنجەمینە و لە (گل/ سەرکارێز)دا شەشەمینە و لە (گل/ بەرباخەڵ) و (ص)دا هەشتەمینە و لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا نۆیەمین تاکە.
مەی: بادە، خواردنەوەی سەرخۆشکار، ئەو خواردنەوەیەی مەستی دەکا.
حەرام: قەدەغە، ڕێ نەدراو لە ئایندا، ئەوی (شەرع) نەی لێ بکا.
فتوا: فەرمانێکی (شەرعی) و بەپێی قورئان و سوننە و ڕاستترین ڕا و بەبەهێزترین بەڵگە و گونجاوترین بڕیاری (مەزهەب)ەکان بێ کە کار بکاتە سەر خەڵکی و حەرام و حەڵاڵ بگۆڕێ و خەڵکان سوودمەندترین بکا.
موفتی: ئەو زانا دڵسۆزە نیاز پاکە ئاینییەیە کە (فتوا) دەردەکا و لە دەرکردنیا لە هەموو ڕوویەکی وردبێتەوە و تێی بگا. لە کاریگەریی بڕیارەکە بکۆڵێتەوە کە زیانکاریی بۆ خەڵکی نەبێ و ئەگەر (موجتەهید) بوو دەبێ بەپێی قورئان و سوننە و ڕاستترین (ڕا) فرمان بکا و ئەگەر (مەزهەب)ێکیشی گرت دەبێ بەهێزتر و کەڵکدارتریان بوو بۆ خەڵک وەرگرێ لە (فتوا)یەکەیدا و بەپیاوچاک و خواناسی ڕاست ناسرا بێ.
هەر کاتێ (موفتی) ڕیسوا و پنتی و داوێن پیس و خراپکار و برەودەر بەبڕیاری نەشاز بوو و، خەڵکی خستە سەر ڕێگەی فێڵ و خۆ لە فەرمانە شەرعییەکان ڕسگارکردن و پووچی کردن، ئەوا دەبێ (بەند) و (دەسبەسەر) بکرێ و ئەم جۆرەش بەزۆری لە (دەربار)ی فەرمانڕەواکان بوون.

موفتی و: (ف، نم/١، کم و چاپی گیو/٢ و ئۆفسێت): زاهید.

قەول: وتە، گوتە، بڕیار، فەرمووده، فەرمایشت.

جەدید: نوێ، نۆ، تازە.

قـەولی جەدید: وتەی نوێ – وەها بـاوە کە بە(تەورات) دەوترێ (العـهد القدیم) = واتە سـەرێنی، یا ڕێی کـۆن) وە بە(ئینجـیل) دەوترێ (العهـد الجدید) = واتـە سـەرینی یا ڕێگەی نوێ). بەڵام (کوردی) مەبەسی لـە (قەولی جـەدید) ئەوەیە کـە گوایـە هەرچی وەکو (تەورات) و (ئـینجیل)ەکە بوونە (قـەولی کـۆن) و بڕاونەتەوە و چـونکی (ئیـسـلام)یان بـەسـەرا هـاتووە و جـێگەی ئەوانی گرتووەتـەوە و بووەتە (قەولی جـەدید) و بەپێچـەوانەی ئەوانەوە مەیخـۆری قەدەغـە کردووە، بەڵام بیرەکەی (کوردی) بەقەولی کۆن ڕێگەی داوە.

پیر: واتە سـەررزارییەکەی (بەساڵاچوو)ە بەڵام (پیـر) زاراوەیەکی صـۆفیگەری ڕێگە (طـەریقە)تە ئاینەکانە کە (شـێخ)ەکانیان بە(پیر) ناو دەبەن و، یا هـۆنەران (دڵخواز)یش بە(پیـر) دەردەبڕن وە یا (پیـر)ەکانیـان وەک (دڵخـواز) لە هەڵبـەستـەکانیـاندا پیـشان دەدەن وە یـا مەبەس لە (پیـر) هـەر ڕێگە نیـشـاندەرێکە، کـە ئەم (پیـر)ەش هـەر لـە سـەرینی زەردەشـتـیـیـەوە و لە ئاینی (ئێزدی)شدا (باد)ە و (بادە)یشی پێ دەوترێ.

(کـوردی) وەک زۆربەی هـۆنـەرە (کـلاسـیکی)یەکـان لـە شـوێنی تریـشـا بەنـدیوارێتـیی خـۆی بە(پیر)ەوە ڕاگەیاندووە وەک لە هـەڵبەستێکی تریدا وتوویە:

چاوەکەم دەرحـەق بەمن بەقسـەی بەدی بێ (پیـر) مـەکە

بێ خـەتا و سـووچ و قـەباحەت خـۆت لە من دڵگیر مـەکە

قـەولێکی قـەدیم (ع): وتەیەکی یا بڕیـارێکی کـۆن. مـەبەست لە ڕێبـازی ڕێگە (طەریقـەتی) پیرەکەیە کە وەک بادەیـەک، پەیڕەویکارانی سـەرخـۆش دەکا. بەواتە پیـرەکـەی ڕێگەی قـەدەغـە نەبوونی مـەیخـۆریی بۆ داوە لـە سـەرخـۆشـێکی (مـەعنەوی) ببێ بەو ڕێگەیە، وە لە کـۆڕ و ئاینییـەکاندا (قـەولی قـەدیم) مـەبەست لە (الکتـاب القدیم) یا (العـهد القدیم) واتە (تەورات)ی پەڕاوی پیـرۆزی ئاینی (مـووسـا)یە کـە لەو ئاینەدا ڕێگە بەخـواردنەوەی (بادە) دراوە و لێرەدا (کوردی) ئەو (پیر)ەی بە(مووسا) چواندووە.

داویە: دەیدا – ئەمەش دیارە هەڵەیە.

جەواز: ڕێگەدان، قەدەغە نەکردن.

بیری فـەلسـەفی ئەم تاکە هـەڵبـەسـتـە لە نـاو هۆنەرانی ناوچەکەدا (بـاو)ە و زۆربەیان لە دەمی یەکـتریان قـۆزتووەتەوە و بەدەربـڕین و شـێـوەی تایبـەتی خـۆیانـەوە و یەکاڵایەکی نوێوە ڕایان گـەیاندووەتەوە و جـۆرەها هـەڵبـەستی جوان و دڵگیـر و بەهێـزیان لەسـەر بۆ بەجێ هێـشتـووین، لەوانە:

١– هۆنەر و زانا و فەیلەسووفی فارسی (عومەر خەیام) کە لە سەرێنی سەلجووقییەکاندا ژیاوە

و له ١١٣٢ی ز.دا مـردووه له یەکێ له چوار باڵیـەکـانیـدا کـه گـۆڕدراونـەته سـەر زۆربەی زمـانەکانی جـیـهـان و (شـێخ سـەلام: ١٨٩٢ – ١٩٥٩ز)یشـمـان گـۆڕیـویەته سـەر کـوردی و دەڵێ:

پێم ئـەڵێن دۆزەخ هـەر لـه بۆ مـەسـتـه
زینـهـار بـەم وته قـەت دڵ مـەبـەسـتـه
گـەر عاشق و مـەست بچنه جەهەننەم
بەهەشت چۆڵوهۆڵ وەک بـەری دەستـه

٢– (ئەحـمەد حـەمدی بەگی صـاحـیبقڕان ١٨٧٨ – ١٩٣٦ز) لەم بارەیەوە زۆر جـوانی فەرمـووە کە:

مەی، دوژمنی ئیمانه ئەفـەرموون کە مـەلاکان،
بیــخــۆمــەوە ئەو دوژمـنی ئـیـمــانه؛ حــەڵاڵه
و... هتد.

١٠– ئەم تاکە لە (گەڵاڵەیی ١٣٠٠) و (ف)، (نم/١)، (ع)، (کم و دیوانە چاپەکانـی گیو/٢، گیو/٣)، (ئۆفسـێت)دا پێنجـەمـینە و پێنـجـەمین تاکی چاپ کـراوە و. لە (گەڵاڵەیی ١٣٠٨) و (گـەڵاڵەیی ١٣٠٩) و (گـەڵاڵەیـی ١٣١٠)دا شــەشــەمــینە و لە (گل/ســەرکــارێز)دا حــەوتـەمــینە و لە (گل/بەرباخەڵ) و (ص)دا نۆیەمینە و لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا دەیەمین تاکە.

شەرت: مەرج.

با لە شەرتی (چاپی گیو/٣): با بەشەرتی.

بادە: بڕوانە بادە لە تاکی دووەمی ئەم هەڵبەستەدا.

مەرد: پیاو، مرۆ، مرۆڤ، مێر، زەلام...

ئەفگەن: بخەر، برمێن – مـەرد ئەفگەن = پیاوخەر، گلێن، ئەنگێو – و مـەبەستی لە مەرجی بادە ئەوەیە کـە پیـاو بەخـواردنـەوەی دەخـا، ئەمـجـا لێـرەدا دەڵێ: سـاقـیـش بـەو مـەرجـەی وەک مـەرجـەکـەی بادە کە بـەجوانی و نازی خـۆی ئاوەها پیـاو ئەخـات و دەیئـەنگێـوێ و وەک پیـاو خستنەکـە بەهێزی سـەرخـۆشـییـە. ئـەم بەهێزی جـوانی و بە(سـوخـمـەوار)یدا لەوە دەچێ کە (ساقی)یەکە ئافرەت بووبێ بۆ دەرکەوتنی مەمکی، یا مەبەست لە نێرینەیشـە.

سـاقی: مـەیدەر، بادەدەر. بەڵام سـاقـییـەکـەی سـاغ نەکردووەتەوە کـە نێرە یان مـێیـە و چونکی ئەگـەر بوترێ بەوەدا کـڵاوی لەسـەردا بـووە دەبێ نێـرینە بێ و سنگی دەرپـەڕاندووە، بەڵام ئەی دوگـمـەی سـینە کـردنـەوەکـەی لە چی؟ کە هـەر مـێییـنە دەیکاتەوە بۆ ئەوەی جوانی و دڵگیـری مـەمکەکانی بەدەربخـا و لێرەدا شـێواوییـەک هـەیە و ئەشێ دەقی هەڵبـەسـتـەکە لە خـۆ یا دەست نەکــەوتووە وەها نـەبووبێ وە یا لـە دواترا پتــر ڕوونی دەکــەینەوە لە پەراوێزی ئەم تاکــە و لە پەراوێزی تاکی دواییدا لەسەر (کاکۆڵ).

نەوجوان (گیو/٢، گیو/٣، ئۆفسێت): نەوجەوان.
سـێـوەنـگی: برۆی پەیوەست، چاوی ڕەش – ئەشێ ئەم وشـەی (سـێـوەنگی)یـە لە دوو وشـەی (سـیـاهـ بـەواتە ڕەش) و (نیگا بەواتە ڕوانین)ەوە هـاتـبێ کە مـەبەست لـە ڕوانینی چاوی ڕەش و برۆی پەیوەستە.
سـێوەنـگی (دیوانی کوردی چاپی گیو/٢): دیدە مـەست بی و. – ئەمـیش بەگۆڕانەکانی (گیـو) دەزانم.
سێوەنگی (ئۆفسێت): دیدە مەست بی تو. دیسان گۆڕانی (گیو)ە.
سێوەنگی (گیو/٣): دیدە مەست بێت و. دیسان گۆڕانی (گیو)ە.
کڵاو: ئەو پۆشـاکـەیە کـە بەچنینی یا لە (کر) دروست دەکرێ لە شـێوەی جـامێکا و، دەکرێتـە سـەر و، بسگوڕێکی خـۆجێییە و پێـویسـتە لە مـێژووی بەرگی کوردیدا و بۆ سـەرێنی (کـوردی) دیاری بکرێ کـەوا تیا بەکارهـێنراوە. وەک وتمان (کڵاو) تێکرا بۆ نێرینەیە. هـەرچەندە بە هـی ژنیش دەوتـرێ (کـڵاوەسـەر) یا (تاس کـڵاو)، وە بە هـی کـچـانیش دەوترێ (کـڵاوقـۆچکە). جـا ئەگەر (سـاقی)یەکە مـێیینە بووبێ ئەوا دیارە ئەوسایە ئافرەتیش کڵاوی لەسەر کردووە و لەگەڵ دوگمەی سینە ترازاندنەکەیدا ڕێک دەکەوێ و لە تاکی دواییدا ئەگەڕێینەوە سەر ئەمە.
کـەچ کـا = کـەچ بکا، لار دابنێ، کـڵاوەکـەی بنێ بەلایـەکی سـەرییـەوە، کە جـۆرە فـیـزو ناز و لەخۆباییبوونێکە و لە جوانان دێ و (پۆز) لێدانە.
دوگمە: کەرەستەیەکی کۆنی پۆشاکی کوردییە کە لە جێگەی قۆپچەی ئێستە دەبوو لە بەرگدا و بریتیی بوو لە چەند گرێیەک بەشێوەیەکی وەستایانە لە کشتەکێکی ئەستوور و گرێکان لە یەک جێگەی کشتەکەکە دەدران بەمەرجێ تۆپەڵۆکەیەکی خڕی ڕێکوپێکی ئەوەندەی دەنکە نۆکێک لێ پێک دەهات و بەوە دەوترێ (دوگمـە). جا ئەو دوگمـەیە دەگیرێ بەلێواری لای ڕاسـتی بەرۆکی کـراس یا سـوخـمـە یا... هـتـدەوە و بـەرامـبـەر بـەو لێـوارە، بەبەرۆکـەکـەی تریـەوە قـوڵفـەیەکی ئەوەندەی دوگمەکەی پیا بچێ لە هەمان جۆر و ڕەنگە، کشـتەک بەند دەکرێ و کە دوگمەکە کرا بەناو قوڵفەکەی بەرامبەر یا بەرۆکی کراس یا سوخمەکە دێنیتەوە یەک و ئیتر هەر لە سەرەوە هـەتا خـوارەوە، بـەڕیزە ئەوەندەی سێ چوار پەنجـە یا کـەمـتر بەگـوێکە (دوگمـە) و (قـوڵفـە)دا دەدووررێ و بەمە دەوترێ (دوگمە و قەیتان). کە کەرەستەیەکی خۆجێیی بووە.
دوگـمـە و قـەیتـان هەتا سـاڵە چـلەکـانی چەرخی بیـسـتـەم لە سـولەیمانیـدا هـەر بـاو بوو، بەکاردەهات و بەزۆری ڕەنگی ڕەش بوو.
(کوردی) کـە لەم هـەڵبـەستەیدا نـاوی بردووە بەڵگەی ئەوەیە کە لە سـەرێنی ئەویشدا هـەبـووە کە ئەمیش کەرەستەیەکی پێویست و ئەوەی لە مێژووی بەرگی کوردی بگەڕێ نابێ لە بیری بکا.
وەنەبێ هەر (کوردی) ناوی (دوگمـە)ی هێنابێ، بەشکو زۆربەی هۆنەرانمان لە هەڵبەستیاندا بەکاریان هێناوە ئەوەتا (نالی) کە هاوچەرخی (کوردی) بووە وتوویە:

له دوگمه‌ی سوخمه دوێنێ نوێژی شێوان
به‌یانی دا سفیده‌ی باغی سێوان
دوگمه‌ی (کم): دوگمه.
سینه: سنگ.
واز: کراوه، به‌ره‌ڵڵا، ڕووت.

١١- ئه‌م تاکه له (گه‌لاڵه‌یی ١٣٠٠) و (ف، نم، ع، کم، چاپی گیو/٢) و (ئوفسێت) و (گیو/٣) شه‌شه‌مینه و شه‌شه‌مین تاکی چاپکراویشه و، له (گل/١٣٠٨)دا نییه و له (گه‌لاڵه‌یی ١٣٠٩) و (گه‌لاڵه‌یی ١٣١٠)دا حه‌وته‌مینه و له (گل/سه‌رکارێز)دا هه‌شته‌مینه و له (گل/به‌رباخه‌ڵ) و (ص)دا ده‌یه‌مینه و له (عن) و (مس) و (کۆن)دا یانزه‌هه‌مین تاکه.

سه‌یره له کوێیه: ئه‌م تاکه‌ش دیسان هه‌ر له‌سه‌ر مه‌یده‌ر = (ساقی) ده‌ڕوات، به‌ڵام (ساقی)یه‌کی دیمه‌ن سه‌یر و سه‌رسامکار، چونکی وه‌ک له تاکی پێشوودا به‌ته‌واوه‌تی ساغ نه‌بووه‌وه که (ساقی)یه‌که (نێر) یا (مێ) بووه، هه‌رچه‌نده له لای مێیینه‌که‌شدا پتر چه‌سپا، که‌چی ئه‌وه‌تا لێره‌دا دیسان نووسه‌رانی هه‌ڵبه‌سته‌که دیمه‌نه‌که‌یان لێی شێواندینه‌وه، چونکی لێره‌دا (ساقی) وه‌ک (زلف)ی هه‌بووه‌که هی ئافره‌ته بووه له هه‌مان کاتدا (کاکۆڵ)یشی هه‌بووه که به هی نێرینه‌یه. که‌واته ئه‌م (ساقی)یه زۆرتر له گه‌نجی بسک درێژ و کچی قژ کوڕانیی ئه‌م سه‌رێنییه‌ی ئێستامانی کردووه، تۆ بڵێی له‌و سه‌رده‌مه‌ی (کوردی)دا شتێکی یا ڕواڵه‌تێکی ئاوا بووبێ، که ئه‌وه‌ش سه‌یر نییه ئه‌گه‌ر وا بووبێ و چونکی مێژووی جۆری چاککردنی قژی سه‌ری نێر و مێ له جیهاندا چه‌ند گۆڕانێکی ئاواییمان لێ ده‌رئه‌خات و جا ئه‌گه‌ر ئه‌م ڕواڵه‌ته‌ی ئێسته له سه‌رێنی (کوردی)دا بووبێ، ئه‌وا ئه‌و (ساقی)یه‌ی له‌مه‌ڕ ئه‌م هه‌ڵبه‌سته مێیینه بووه. هه‌رچه‌ند وه‌ک له دواتریش ئه‌وه ده‌چه‌سپێنێ که مێیینه بووه. بڕوانه په‌راوێز له‌سه‌ر تاکی پێشوو.

زولف: مه‌به‌س له قژی هه‌ردوو لاجانگی ئافره‌ته که ئای درێژ بێ یا کورت، هه‌روه‌ک (گێسوو)شی پێ ده‌ڵێن و، ئه‌گه‌ر کورتیش کرابووه‌وه (ئه‌گریجه)ی ناو ده‌به‌ن.

هه‌روه‌ها له ناوی قژی مێینه (ئافره‌تان)دا په‌رچه‌م، قژ، پرچ، که‌زی، بسک و... هتدیش هاتووه. وه‌ک ناوی (کاکۆڵ)یش له هه‌ندێ جاردا به‌ئافره‌ته‌وه براوه که گوایه (کاکۆڵ) جۆره قژێکی ئافره‌ت و له هه‌مان کاتیشا ئه‌گریجه و زولف و گیسوو و... هتدیش بۆ نێرینه وتراوه، ئایا ئه‌مانه گۆڕانکاریی نووسه‌ری نه‌شاره‌زان، یا چی؟؟

دیسانه‌وه (زولف) به‌و تووکه‌ی لاجانگی پیاو (نێرینه)ش ده‌وترێ که ئێسته (هه‌شتاو نه‌وه‌ده‌کانی چه‌رخی ٢٠)ه‌ درێژی ده‌که‌ن و جاران له پیاواندا ته‌نیا (جووله‌که) زولفیان درێژ ده‌کرد، ئه‌ویش بۆ ئه‌وه‌ی که دیاریی بن که‌وا نه‌ژادپه‌رستی عه‌ره‌ب ئه‌وه‌ی به‌سه‌ر سه‌پاندوون وه‌ک له خواره‌وه له‌مانه ده‌دوێمه‌وه.

کاکۆڵ: بەو قژە درێژکراوەی پیاو (نێرینە) دەوترێ کە لە ڕێکی سەرشانیدا دەقرتێنرێ. گەلێ ناوانی تریش هەن کە لە قژی نێرینەدا ناوبراون. وەک: قژ، تووک، گودلە، ساچ و پەرچەم، هەورامییانە، پرچی دەروێشی، گیسوو، ئەگریجە، زولف و... هتد.
بەڵام لە پێناوی دیاریکردنی ناوانی ئەم جۆرە قژانەی پیاو و ئەوانی تری کە لە سەرەوە لە لێکدانەوەی (زولف)دا ناوم بردن کە بەشێوەیەکی بڕیار لەسەر دراوی چەسپاو، کامەیان هی نێرینە و کامەیان هی مێیینەیە بەداخەوە هێشتە لێکۆڵینەوەیەکی یەکلاییکەرەوەی نووسراو (پەخشان)ی چەسپێنەر لە کوردیدا نەکراوە، بۆیە ئەم باسە وەک گرێ کوێرەیەکی شێواو، هەر بەکاڵ و خاوی ماوەتەوە کە چارەکردنیشی باری پێویستی سەرشانی پسپۆڕە زمانییەکانمانە.
بەڵام خۆشبەختانە هەندێ بەڵگەی هۆنراوم لە هۆنەرانمانەوە بۆ ماوەتەوە کە دەتوانرێ بکرێنە بناغەی لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانە، بۆ دیاریکردن و جێگیرکردنی هەر یەکێ لەو ناوی قژی سەری نێر و مێی (مرۆڤ). هەرچەندە ئەو هەڵبەستانەش ئەوەندە شێواون کە وەک هەر هۆنەرەی لە هەر جێگاییێکا وەک لە ئاشێکی کردبێ، ئاوا دێنە بەرچاو و هەتا قۆناغێکی دووریش دژوارییی دەخەنە ڕێگەی لێکۆڵەرەوەی ئەم باسەوە، بەڵام بەلامەوە وایە کە چاکترین و ڕاستترین و مێژووییترین و زانستیترین بەڵگەن و لێکۆڵەرەوە لە ئاکامدا دەگەیەننە یەکالاکردنەوەی باسەکە و خواستی پێویست.
لە دەستنیشانکردنی ئەو بەڵگە هۆنراوەییانەدا، وەک بناغەی لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی لەسەر کاکۆڵ، دەبینرێن بەتێکڕایی دەبن بەچەند جۆرێکی جیا جیاوە؛ وەک:
أ- ئەو جۆرەی کە هۆنەرەکە ناوی (کاکۆڵ)یان لە هەڵبەستەکانیاندا بردووە و بەڵام (کاکۆڵدار)ەکانیان دیاری نەکردووە کە ئایا هی (نێرینە) یا (مێیینە)یە، لەوانە (کوردی)مان کە لەم تاکە هەڵبەستانەی خوارەوەدا وتوویە:

یەکەم: تورکی دیدەت بەو دوو قەوسی حاجیب و تیری موژەت
بۆ گرفتی دڵ لە (کاکۆڵ)ت عەلەم بەرپا دەکا.

دووەم: تاڵانی سەر و ماڵم چاوی ڕەشی فەتتانت
پابەندی دڵ و دینم (کاکۆڵ)ی پەرێشانت

سێیەم: نەوجوان ئەبرۆ کەمان شیرین زوبان و نیکتەدان
تورک ڕەفتار و پەری ڕوخسار و (کاکۆڵ)دارەکەم.

چوارەم: وێڵ و سەرگەردان و خوار و عاجز و ئاشوفتە حاڵ
دڵ بەتاڵانچووی سوپای (کاکۆڵ)ی تێکئاڵاوی تۆم.

پێنجەم: تا کەی ئاخر حەسرەتی (کاکۆڵ)ەکەت پەنهان بکەم
هیجری ئاشوفتە دڵ و، (کاکۆڵ) پەرستی کارییە.

شەشەم: تاری (کاکۆڵ)ت کە ئەفشانە لەسەر مەتیتەنی ئاڵ

ڕوشتەیی گیان و دڵ و دین دەپسێنێ بەعەلی،... هتد.

ئەم جۆرە هەڵبەستانە و گەلێکی تری وەک ئەمانەی زۆر لە هۆنەرانی تریشمان ڕوونی ناکەنەوە کە ئایا بەنێرینەی (کاکۆڵ)دارياندا هەڵداوە یا مێیینەی (کاکۆڵدار)دا، چونکی هەڵبەستەکانیان هەردووکیان (نێر و مێ) بە(کاکۆڵ)ەوە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان تیا لێ ناگیرێ کە مەبەستیان کام لایان بووە، لەوە بەولاوە کە ئێستە بەلامەوە وایە، گوایە (کاکۆڵ) بۆ نێرینەیە و ئەم بەلاوەبوونەش ناتوانرێ پشتی تەواوی پێ ببەسترێ، چونکی بەڵگەی هۆنراوەیی تری پێچەوانەی ئەم بەلاوەبوونەشم زۆرن و وەک:

ب: جۆرێکی تر ئەو بەڵگە هۆنراوانەن کە هۆنەرەکانیان تیایانا دیارییان کردووە (کاکۆڵ) هی نێرینەیە و دەشتوانرێ هەڵبەستەکانیان وەها لێک بدرێنەوە کە (کاکۆڵ) هی مێیینەیە وەک ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) کە وتوویە:

تاری (کاکۆڵ)ت لەسەر صەفحەی ڕوخت تاتارییە
خەطی دەوری لێوی ئاڵت جەدوەلی ژەنگارییە

لە لێکدانەوەی واتەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا لە لایەک دەتوانرێ بوترێ مەبەس لە (خەطی دەوری لێوی ئاڵ) سمێڵی ئەو (لاو)ە جوانە (کاکۆڵ)دارەیە کە (کوردی) هەڵبەستەکەی بەسەرا هەڵداوە و سمێڵداریش دیارە (نێرینە)یە و کەواتە بەم پێیە (کاکۆڵ) بەقژی سەری (نێرینە) وتراوە.

بەڵام وەستاییی ئەم هۆنەرانەمان بەوەندەوە ڕاناوەستێ کەوا هەڵبەستەکانیان ئەوەندە وا ئاسان و سادە بن بەشکو لە هەمان کاتا دەتوانرێ ئەم تاکە وا لێک بدرێتەوە کە مەبەست لەو (خەطی دەوری لێوی ئاڵ)ە ئەو گەندەمووی دەوری لێوی ئاڵ و ناسکی ئەو کیژۆڵەیەیە کە هێشتە تووکی دەموچاوی (یا گەندەمووی) ڕووی هەڵنەگرتووە و کاکۆڵیشی هەبووە و یا قژی سەری وەک (کاکۆڵ) وابووە، کەواتە ئەم تاکە هەڵبەستە و ئەوی وەک ئەمیش وەهان کەڵکی دیاریکردنی (کاکۆڵ)مان نادەن کە ئایا بۆ نێرینە یا بۆ مێیینە بووە.

ج- لە جۆرە هەڵبەستێکی تردا کە ناوی (ئەگریجە) و (کاکۆڵ)یشیان پێکەوە تیا هاتووە، بەڵام دیسان هۆنەرانیان یەک لایەنە دواون و ناتوانرێ ئەو (ئەگریجە) یا ئەو (کاکۆڵ)ی ناو ئەو هەڵبەستانە بە هی مێ یا بە هی نێر، بچەسپێنرێ چونکە ئەمانیش وەک ئەو جۆرەکەی پێشەوە بەدوو سەرا لێک دەدرێنەوە وەک (ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران: ١٨٧٨ - ١٩٣٦ز)یش لە تاکە هەڵبەستێکیدا وتوویە:

عاشقی (ئەگریجە) وەک مەفتوونی (کاکۆڵ) قەت نییە
وەصڵی ئەم پشتگوێی خراوە و هەمدەمی لێوانە ئەو

واتە عاشقی (ئەگریجە) کە مەبەست لە (مێباز)ە و بەعاشقی داناوە (وەصڵ)ە، لەگەڵ یەکدا دروستبووی ژن و پیاو لای (پێشەوە) دەبێ و ئەو کارەش ئەوەندە خۆڕسکییە و هەمیشە

بەسەر لێوی عاشقانەوەیە وەک (ئەگریجە)کە وەهایە کە لە لێوەکانی ئەو دڵخوازە (مێیینە)یە جیا نابێتەوە، کەچی مەفتوونی (کاکۆڵ) (نێرباز)ەکە ئەمیشی بە(مەفتوون) = (گێچەڵاوی - نەک عاشق) داناوە و ڕاستە کە وەصڵی لە (دواوە)یە و ناخۆڕسکییە و بۆیە پشتگوێ خراوە وەک شتێکی نائاسایی (ئیهمال) کرابێ، وایە چونکە (وەصڵ)کە لە دواوەیە.

بەم لێکدانەوەیە (ئەگریجە) بۆ مێیینە و (کاکۆڵ) بۆ نێرینە دەچەسپێ و هەندێ پەردەی لەسەر (شێلەوی)ی بابەتەکە لاداوە.

بەڵام دەتوانرێ ئەم تاکە هەڵبەستە بەجۆرێکی تریش لێک بدرێتەوە کە ئەم واتەیەی سەرەوە نەگەیەنێ، کە گوایە حەمدی لەم تاکەیدا لەگەڵ (نێرینە) و (مێیینە)ی نییە و تەنیا لە شوێنی جۆرەکانی قژی (سەر)دا باسی لە دوو جۆری (ئەگریجە) و (کاکۆڵ)ی کردووە و، وتوویە:

(عاشقی ئەگریجە) وەکو (مەفتوونی کاکۆڵ) قەت نییە و دیاریی نەکردووە کە (ئەگریجە) و (کاکۆڵ)ەکان هی نێر وەیا هی مێ و یا کامەیان هی کامەیانە و دانی بەوەدا نەناوە کە لە (ئەگریجە) و (کاکۆڵ)دا کامیانی لا باشتر بووە و بەشکو کە (ئەم)ی بۆ (کاکۆڵ) و (ئەو)ی بۆ (ئەگریجە) دەربڕیوە کە لەبەر باری هاتن و پاشبەند (سەروا)ی هەڵبەستەکە بووە و وەیا هەر تەنیا مەبەستی لە دیاریکردنی شوێنی ئەو دوو جۆرە قژە بووە کە (کاکۆڵ) شوێنی بەپشت گوێیەوەیە و (ئەگریجە)ش هەمدەمی (لێو)، وە لە ڕاستیشدا ئەو دوو شوێنەی کە (حەمدی) بۆ ئەم دوو جۆرە قژەی دیاری کردوون شوێنی سروشتی خۆیانە، کەواتە بەم لێکدانەوەیان لەم تاکەش بەدڵنیاییەوە بۆمان ساغ نەبووەوە کە ئایا (کاکۆڵ) و (ئەگریجە) کامیان هی نێر و کامیان هی مێیە.

د- جۆرێکی تر لەو هەڵبەستانەی لەبەردەستان، لە (کاکۆڵ) و (زولف) و (پەرچەم) لە یەک کەسدا دواون وەک (نالی) کە لە هەمان چەرخی (کوردی)دا ژیاوە و لە هەڵبەستێکیا وتوویە:

بەحەققی تاری (کاکۆڵ)ی سەراپا کۆڵی ئەو شۆخە

ئەگەرچی پەشمە ئەمما دڵ لە طوڕەی (زولفی) سەودایە

هۆنەرێکی تریشمان وتوویەتی:

هەموو کەس شێفتەی (کاکۆڵ) و (پەرچەم)

بە تاڵی (زوڵفی) تۆ بوون شێت و شەیدا

کە ئەم دوو کەسەی تر لێیان دواون؛ جوانەکەی (نالی) (کاکۆڵ و زولف) و ئەوەکەی کە (کاکۆڵ و زولف و پەرچەم)یشی هەبووە، بەبێ ئەوەی ڕێگە دەستێکی دیاریکارییان تیا بێ کە ئایا ئەو (زولف و کاکۆڵ و پەرچەم)دارانە نێر بوون یا مێ.

هەروەها (کوردی)ش لە هەڵبەستێکی تریدا لە ئەگریجەدارێک دەدوێ و باوی ئەوی داوە بەسەر (کاکۆڵدارێکا) یا باوی ئەگریجەکەی بەسەر کاکۆڵەکەدا داوە، کە وتوویە:

لەسەر تەعریفی (ئەگریجە)ت ئەگەر بێم وەصفی (کاکۆڵ) کەم
بەضەربەی تیغی ئەبرۆی تۆ، ئەمن مەقتوولی بێ سەر بم

کە ئەمیش دیاریی نەکردووە ئەو خاوەن (ئەگریجە) یا ئەو خاوەن (کاکۆڵ)ە کامیان نێر و کامیان مێ تاکو جۆری قژەکە دیاری بکرێ کە ئایا هی کام لا بووە.

لێرەدا گازندە دەخرێتە سەر نەبوونی جیاوازی نێر و مێ (تذکیر و تأنیث)یش لە زمانی کوردیدا، هەرچەند شتێکی ئاشکرایە ئەو هۆنەرانەمان هەموو شارەزای زمان و لە بابەتی نێر و مێ جیاکردنەوەی زمانییەوە زانا و تیا مامۆستا بوون و ئاگەداری واتای ناوەکانی قژی سەری نێر و مێ بوون، دەستی باڵایان لە وردەکاریی پەلوپۆکانی زماندا و جگە لە زمانەکەی خۆشیان سێ زمانی تری عارەبی و فارسی و تورکییان زانیوە و کەچی ئەم ئاڵۆزکاوییە لە بەرهەم و هۆنراوەکانیاندا لەم بارەیەوە هەیە.

هـ- جۆرێکی تری بەڵگەی هۆنراوی ئەوەیە کە بەڕاستی سەرسامیهێن و سەیرە و بەتەواوی لەم جۆرەدا کاکۆڵ بە هی ئافرەت یا کچ (مێیینە) دیاری کراوە و گومان لەم جۆرە هەڵبەستە ناکرێ و بەلایەکی تردا لێک نادرێتەوە وەک لە هەردوو بەندی (ب)، (ج)دا لە پێشەوە کە لەسەر ئەو دوو جۆرەی تری بەڵگەی هۆنراوەیی دواوم کە تیایاندا هۆنراوە بەڵگەییەکانم بەدوو لای قژی (نێرینە) و (مێیینە)شدا لێک دا ئەوەم دەرخست کە دەتوانرێ بەتەنیا بۆ لایەکیان بەمەبەست وەربگرێن.

بەڵام ئەم جۆرەی کەوا لێرەدا لێی دەدوێم وەها نییە و پڕ بەپڕ (کاکۆڵی) بە هی مێیینە جێگیر کردووە وەک (نالی) لە هەڵبەستێکیدا وتوویە:

بەحەقی جەڕی (هەیاسە)ی زەڕ و (کاکۆڵ)ی سەری
دڵی گومگەشتەیی من کوشتەیی پشت و کەمەرە

چونکە وەک دەزانین هەیاسە، جۆرە پشتێنێکی کوردانەی ئافرەتە کە لە زێڕ یا لە زیو دروست کراوە، وەک جۆرە خشڵێک ئافرەت بەستوویەتە پشتی و بەو بەرگە فشوفۆڵی کوردانەی پێ کۆکردووەتەوە و هێناویەتەوە یەک و کەمەریشی بەباریک پیشان داوە بەوە جوانێتی و کێششی لەشی پتر کاری کردووەتە سەر تەماشاکەرانی ئەو هەیاسە لە پشتەی کەوا دڵی (نالی)ی تیا گومگەشتەی پشت و کەمەر و پاشەڵی خۆی کردووە. کە هەیاسە لە پشتەکەش ئافرەت بووە هەرچەندە پیاویش (شۆرتکە) و کەمەرەی بەستووە و هەندێ جاریش بەمەلا و ئەولای جەمسەری (شۆرتکە) و کەمەرەکەیەوە گۆی وەک هەیاسەی یا وەک هی کەمەرەی پێوە کراوە و، یەکێ لە وێنە پیاوە (بابانی)یەکان کە لە پەڕاوییەکەی گەشتنامەی (١٨٢٠ز)ی (مستەیچ)دا کەمەرەی زێڕ یا زیوی بەستووە. بەڵام هەیاسە هی ئافرەت بوو، کە ئەشێ بەهۆی سەر ڕووتاندنەوەی کەچەڵی یا نەخۆشی یا کەمیی خۆرشتەوە، ئافرەت سەری تاشرابێ بۆ ئەوەی تووکەکەی بەهێز بێتەوە یا ئەشێ لەبەر ڕشک و ئەسپێ تاشرابێ و لەسەرەتێکا شێوەی

کاکۆڵی بوویێ لە کورتیدا کە ئەوە لە ئافرەتا، چونکە باو نەبووە جوانییەکی داوە و هەڵبەستی پیا هەڵدراوە لەبەر دڵکێشییەکەی کە لەبەر هەر هۆیەک بوویێ یا ئەو جۆرە سەرەی ئافرەت، کورتکردنەوە باو بوویێ. (کاکۆڵ) بەقژی سەری ئافرەتیش وتراوە وەک (کوردی) بە هی بادەکەی داناوە.

هـ- جۆرێکی تر لەو بەڵگە هۆنراوەیانەی کە لەم بابەتەوە لە بەر دەستانن، ئەوانەن کە بەپێچەوانەی ئەوەوە کە دەزانرێ (گیسوو) هی مێیینەیە کەچی لەواندا بە هی نێرینە هاتووە وەک: هۆنەرێک لە حەوت بەندێکی فارسییدا، بەسەر پێغەمبەردا هەڵی داوە و لە دوای هەریەکێ لە (بەند)ەکانەوە دەگەڕێتەوە سەر:

بەر گوڵی عاریضی جان پەروەری ئەحمەد صەڵەوات

بە دوو گێسوویی فەرەح بەخشی محەمەد صەڵەوات

کە بەئاشکرایی جووتێ گێسووی ئافرەتانەی (مێیینە)ی بەسەری پێغەمبەر (د.خ) نێرینەوە ناوە هەرچەند ئەوەش دەزانین کە پێغەمبەر قژێکی وەک کاکۆڵیشی هەبووە بەڵام و گێسوو وشەیەکی ڕەسەنی کوردییە کە سەردەمی ئاخاوتنی باپیرەماندا کە لە پەهلەوی بووە؛ وشەی (گیسووک) و (گیس)یان بۆ ئەم جۆرە قژەی پشت گەردنی ژن بەکارهێناوە.

و- جۆرێکی تریش لەو هەڵبەستە بەڵگەییانە ئەوەیە کە هۆنەرێکمان (کۆشکی)ی گوندێکی ناوچەی (قەرەداغی) کە ئەویش هاوچاخی (کوردی) بووە لە هەڵبەستێکیدا ناوی (زولف) و (کاکۆڵ)ی بردووە، بەڵام لەوە نەدواوە کەوا (زولف) و (کاکۆڵ) هی نێر یا هی مێن یا هی کامیانن، بەشکو ئەوەی دیاری کردووە کە کام لە هۆنەرەکان وەک (کوردی) ناوی (کاکۆڵ)یان زۆر لە هەڵبەستەکانیان بردووە و کامەیان لە (زولف) دواوە، لێرەدا نیشانە بۆ ئەوە دەکەم کە خودی (کوردی) کاکۆڵی هەبووە.

(کۆشکی) وتوویەتی:

(نالی) و (زولفی) عەنبەری

(کوردی) و (کاکۆڵی) سەری

(حاجی) و (گەردی) عەنبەری

(کۆشکی) مەیلی (ڕوو) دەکا

کە گوایە ئەو چوار هۆنەرەمان لە لێدوانی ئەو چوار شتەدا بەناوبانگ بوون.

ئیتر لەم جۆرە بەڵگە هەڵبەستانە و جۆری تریشیان زۆرن بەم جۆرەی دوایی کە تا ڕادەیەک دەمانگەنێتە ئاکام، کۆتایی دێنین.

و- دوا جۆرێک لەو بەڵگە هۆنراوەییانەی کە هەڵم بژاردوون، ئەو جۆرەن کەوا بەتەواوی گومانیان نەهێشتووەتەوە کە (کاکۆڵ) هی نێرینە و (زولف) هی مێیینەیە، وەک (نالی) لە چامە گرنگەکەیدا کە بۆ (سولەیمانی) ناردووە؛ ڕووی کردووەتە (بای شەماڵ) و وتوویە:

داخل مـــەبە بەعـــەنبـــەری ســـارای خـــاک و خـــۆڵ
هەتتـــا نەکـــەی بەخـــاکی (ســـولەیمانی)یا عـــوبوور
یەعنی ڕیاضی ڕەوضــــە، کـــە تێـــدایە چەند دەمێ
موشکین دەبی بە(کاکۆڵی) غیلمان و (زولفی) (حوور)

کە لێرەدا بەبێ سێ و دوو (کـاکۆڵ)ی بۆ نێـرینە (غیلمـان)ە و (زولف)ی بۆ مـێیینـە (حـوور) داناوە و وەک جۆرەکانی کە واتایەکی ئاوەژووی ئەمە هەڵناگرێ.

بەڵام ئایا هەر (نالی) خۆی نەبوو وەک لە پێشەوە نموونەم هێناوە کە ئەویش وەک هۆنەرانی نەک (کـــورد) بەشکو هـی ناوچەکـــە و بەتایبـــەتی (فـــارس) و (تـورک)یش لە گـێـــژاوی ئەم ساغبوونەوەیەی ناوانی جۆری قژی سەری نێر و مێدا (پەلەکوتێ)یان بووە؟ وە وەک بـڵێی ئەم گـرێیـــەیان بۆ نەکراوەتەوە کە ئەمـیش باسێکە، هێـشـتـا بەتەواوی ســاغ نەکـراوەتەوە و ئاڵۆزکاوییەکە، لە ئەدەبی کۆمەڵایەتیماندا.

ئەمجا (کوردی) کە لەم تاکی (۱۱)ەمی ئەم چامەیەی سەرەوەیدا کە لە پەیکاری لێکدانەوەیدام کە (زولف و کاکۆڵ)ی بەو (ساقی)یەوە ناوە و وە زۆرترەکەی ساقییەکە (مێ) بووە، بەوەی کە دوگمەی سینەی ترازاندووە و زولفی بووە، کاکۆڵیش بۆ مێیینە وتراوە، یا قژی وەک (کاکۆڵ) وا بووە بۆیە پێی وتراوە (کـاکۆڵ) و ئەشێ ئافرەتیش کـڵاوی لەسـەر کـردبێ وەک ئێـسـتـە (فیست)یشی پێ دەوترێ. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی پێشوو.

دیسان ئەو ئافرەتە (ساقی)یەش ئەوەندە جوان بووە، بەجوانییەکەی پیاوی سەرخۆش کردووە و، بەعیشوە و ناز بووە و شەرمیشی کردووە، کە عیشوە و ناز و شەرمیش زۆرترەکەی بۆ ئافرەتە چونکی نێرینەیەک ئەبێ چ شەرمێ بکا لە پیاوان کە خۆی وەک ئەوان پیاوە و بادەیان دەدا بەدەمەوە کە وەک ئافرەتیش هەست بەجیایی خۆی ناکا لە پیاوان، کەواتە (ساقی)یەکە ئافـرەتێکی (کـاکـۆڵ)داری وەک (کـوڕانی) واتە (مـوسـتـەرجـیلە)کـانی ئێـسـتـە وابـووە، بۆیە بەپیاوێکی سەرسوڕهێن ناوم برد.

غولامـانە: بەواتە کـوڕانە، بەندەیی، خزمـەتکاری، مـناڵانە کە لە وشـەی (غُلام)ی عارەبییـەوە، هاتووە بەڵام (غولامانە) لەسەر زاریدا بەواتە (وەک هی غولامەکان)ە هەرچەندە لێرە غولامـانە مەبەس لەم لێدوانەی خوارەوەیە:

یەکەم (غولامانە): ئەو پۆشاکەیە وەک سوخمەیەکی بێ قۆڵی ئەوتۆیە کە درێژاییەکەی لە نێوان درێژایی (سوخمە) و (تەکمە)دا بێ، چونکی تەکمە درێژ و سوخمە کورت و ئەم مام ناوەندییە.

ئەم پۆشاکە لە لباد، یا لە هەر جۆر (کر) = (شاڵ) یا (چنراو) و (قوماشێک) دروست کراوە و ناوەکەی لۆکەی تێ خراوە (ناودار) بووە لە دروونیدا ئەوەندەی پەنجەیەک و پەنجەیەک سغ و لوولەیی تەریبێکی (سەرەوخوار) دراوە وەک پەستەک وا بووە بەڵام ئەم بەر بەرەڵڵا نەبووە

بەشکو جگە لە ملیوانە خڕەکەی دوگمە و قەیتانێ خراوە و داخراوە و پیاو و ژن لە بەریان کردووە بەتایبەتی لە وەرزە ساردەکان یا بۆ کەسانی سەرمابردەڵە بەکارهاتووە.

دووەم (غـولامـانە): ئەو جـۆرە کـاکـۆڵەیە کـە منـاڵ، یا بەنـدە (خـزمــەتکار) و بەردەس بـۆیان هێشتراوەتەوە یا هێشتوویانەتەوە و بۆیە لە کاکۆڵ کورتتر بووە کە ئەوەندە بۆیان نەکراوە یا نەپەرژاون وەک کـاکــۆڵ خــزمــەتی بکەن و بەبەریا بێن و، بۆیە کـورت بووە کــە ئەوەندەی چاودێریکردنی وەک (کاکۆڵ)ی نەوێت.

بەڵام چونکە (کوردی) ناوی (کاکۆڵ)ی بردووە، ئەمەیانی مەبەست نەبووە و هەر لەگەڵ جۆرە سوخمەکەی بووە کە لە دوای سینە وازکردنی سوخمەکەوە، غولامانەکەشی ئەفشان والا کردووەتەوە کە ڕێ لە بینینی مەمکەکانی نەگرێ و جوانییەکی تریش بدات لە بەزمەکەدا.

ئەفشان: بڵاوکردنەوە، پەخشکردن، پەخشان، واتە کردنەوەی، خاوکراوە. دوگمەکانی (غولامانەکەی) بەر سنگی.

ئەفشان (ف): پەخشان، خاوکراوەیی قژی سەر.

زانوو: ئەژنۆ، چۆک.

بێ بەزانوودا: بێ بەچۆکدا، چۆک دابدا. ئەمەش بۆ جۆرە ڕێزگرتنێک بووە لە چۆکدادانـدا و بەتایبەتی ئەوسا (کورسی) ئەوەندە زۆر و باو نەبووە و خەڵکی لەسەر ڕایەخ و مافوور و بەڕە و لباد و نەوگ و دۆشەک و ئەمانە دانیشتوون. جا ئەوی هەر خواردنەوەیەکی گێڕا بێ پێیان (ناشـیـرین) بووە کـە لە ناو خـەڵکیـدا بچـەمـێنەوە، کـە واش بووە بەچوار لای ژوورەکـەدا دانیـشـتـوون بۆیە وا جـوان بووە و بووەتە (باو) کـە ئەو خـواردنەوەدەرانە و تەنانەت با خـواردنەوەی سـەرخـۆش کـاریش نەبووبێ، هەر بەچۆکـا هاتوون ئەژنۆیان داداوە ئەمـجـا خواردنەوەکەیان پێشکەش کردووە کە ئەمە ئادابێکی کۆمەڵایەتی بووە و تا ئێستەش لە هەندێ جێ پەیڕەوی دەکرێ لە وڵاتماندا.

جام: (بادیە، پیاڵە، پەرداخ)ی مەی پێ خواردنەوە، کاسە.

عیشوە: لەنجە.

عیشوە و شەرم و ناز (ف): غەمزە و سەر و ناز.

شەرم: جۆرە ڕێز لێگرتنێک، ئەمەش بارێکی ڕێزگرتن یا حاڵەتێکی نەفسییە کە کەسێک بەرامبەر بەکەسێک بەڕێزو حورمەت دەنوێنێ، وە ئەوی ئەیەوێ یا ئەیکا وەک بەدزییەوە دەریببڕێ وایە و ئەوەش بۆ ئافرەتێکی مەیدەر، پێویستە کە وەک دانانی سنوورێکە لە نێوان خۆی و ئەوانەدا کە بادەیان دەداتێ و بەتایبەتی لە ئاکامی سەرخۆش بوونیاندا.

ناز: جۆرە عیشوە و نازداری و نازەنینییەک دەگرێتەوە بۆ ئێرە بڕوانە (ناز) لە پەراوێزی سەر تاکەکانی ١٧ و ٢٣ و ٢٥ و ٢٨دا.

تێبینی:

وەک لە شیکردنەوەی ئەو هەڵبەستانەدا کە زۆر لە شاعیرانمان ناوی (کاکۆڵ)یان تیا بردووە و، هەندێ لەو نووسەرانەی کە لە وێژەی (کۆن = کلاسیکی) تێ نەگەیشتوون و شارەزای سەرگوزەشتەی ژیانی (کوردی) نەبوون، بەناڕەوایی ئەو لە کاکۆڵ دواننەی ناو شیعرەکانی، (کوردی)یان کردووەتە مایەی تاوانبار کردن کە گوایە (نێرباز) بووە و کەچی ئەو تاوانبارییەیان نەداوەتە پاڵ ئەو چوار شاعیرانەی تر کە ئەوانیش وەک (کوردی) لە کاکۆڵ دواون لە شیعرەکانیاندا. ئەمە جگە لەوەی کە سۆفییەکان لە خۆشەویستییانەوە، بۆ (خوا)، کە لە جوانیی خوا دواون و وەک هەڵنانێک کە گوایە (پیاو) لە (ژن) شکۆمەندترە، بۆیە لە هەڵنانی خوا و جوانییەکەیدا، هەروەها جوانیی ژنیان داوەتە پاڵ (نێرینە) کە وەک: (خوای گەورە) بێ و ئەوەش نەریتێکی سۆفییانە بووە و زۆربەی شاعیرانمان بەو مەبەستە لە (کاکۆڵ) دواون کە دەتوانم ڕای بگەیەنم کاکۆڵیان بە هی ئەو پیاو جوانە داناوە و کەچی ئەو نووسەر و نەشارەزا و تێنەگەیشتووانە ئەو شاعیرانەیان تاوانبار نەکردووە و تاوانەکەیان داوەتە پاڵ (کوردی)ی کوڵۆڵ.

١٢- ئەم تاکە لە (گل/ ١٣٠٠) و (١٣٠٨) و (١٣٠٩) و (١٣١٠) و کم و (گل/ سەرکارێز) و (ف، نم/١، ع و دیوانەکانی چاپی (گیو/٢) و (ئۆفسێت) و (گیو/٣)دا نییە وە لە (عن) و (کۆن) و (مس)دا ١٢یەمینە و لە (گل/ بەرباخەڵ و ص)دا یازدەیەمینە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

هەموو: مەبەستی لە ئەندامەکانی (تیپی سوور و سەما) و بادەدەران و گۆرانیبێژان و تیپی مۆسیقا و ئامادەبووانی تر، بۆ ئەو کۆڕە وەک (کوردی) هەموو بانگ لێ دەکا بۆ خواردنەوە.

خوم: کووپە یا مەرکانەی بادە تیا گرتنەوە و مەبەستی لەم خومە (قەڕابە)یە، کە هەموو ئەوەندە بخۆنەوە نەک تا سەرخۆش دەبن بەشکو بەڕادەیەک خۆیان وەک (خوم)، پڕ بن لە بادە بکەن و ببنە قەڕابە.

مەستی: سەرخۆشی، گرتن بەبادە (مەی)، ژەهرالوود (تسّمُمُ) بوونی خوێن بەمادەی (ئالکول) واتە (ئیسپرتۆ).

خەم: خەفەت، ماتەمین، پیش خواردنەوە.

خەم: ئەمجارەیان مەبەست لە بێچوخوارییە.

سەگ: یەکێکە لە گیاندارە ماڵییەکان و لە سەرێنی ئیسلامەوە کەوا سەگ بەگڵاو دانراوە و نوێژی پێوە نییە، سروشتی کورد بەرامبەر بەسەگ گۆڕدراوە و سەگی بەلاوە شتێکی سووکە و کە کەسێکی بەناوەوە دەربڕرا، نیشانەی سووکیی ئەو کەسەیە وەک (کوردی) لێرەدا (صوفی)ی کە بەسەرزاری صۆفییە، کردوویەتیی سەگ یا (بەراز):

گەلەی صۆفی ئەوا هاتن کە میراتی فەقێ بەشکەن

بەڵێ مەعلوومە خۆ وەحشی کە مرد سەگ دەچنە سەر لاکی

هەروەک لە شوێنی تری ئەم هەڵبەستەشیا دیسان لەم جۆرە هێرشەی بردووەتە سەر صۆفی و

بڕوانە پەراوێز لەسەر تاكی حەوتەمی ئەم هەڵبەستە لە پێشترەوە (پەراوێزەكانی سەر تاكی ٣٠ و ٣١ و ٣٦).

شەق: لەت، (شەق ئەكا = لەت ئەكا، یەكالآ ئەكا) و شەق واتەی (شەلاق)یش ئەدات بەلآم بۆ ئێرە نییە.

صۆفی بڕوانە پەراوێزەكانی تاكی حەوت و ئەم تاكەی ئەم چامەیە لەگەڵ پەراوێزەكانی ٣٠ و ٣١ و ٣٦.

بەراز: گیاندارێكی دڕندە و لە ئاینی ئیسلامدا گۆشتی ناخورێ و، وەک سەگ گڵاوە (كوردی) صۆفیی كردووەتە بەرازیش. جگە لەوەی گیاندارێكی زۆر زیانكاری زەویوزار و باخ و ئاژەڵ و مرۆیە، بەلآم لە ئەوروپا ماڵی كراوە.

١٣- ئەم تاكە لە (گل ١٣٠٠) و (عن) و (ف) و (نم/١) و (ع) و (كم) و چاپەكانی (گیو)دا نییە. وە لە (گل/١٣٠٨) و (١٣٠٩) و (١٣١٠)دا دووەمینە و لە (گل/سەركارێز)دا نۆیەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ) و (ص)دا دوانزەیەمینە و لە (كۆن) و (مس)دا سێزدەیەمینە و هێشتە چاپیش نەكراوە و یەكەمین تاكیشە.

فرصەت: هەل، دەرفەت.

شەوێكە و ئەمشەو: مەبەس ئەوەیە كە: (لە شەوە ڕەش و ناخۆشەكانی ژیاندا، شەوێكی خۆش و شادی و بەئارەزوو گەیشتن هەیە و ئەویش ئەمشەوە، بەهۆی ئەم كۆڕە خۆشەوە كە یار و یارانی تیا كۆبووینەتەوە چاوی بەدیتنی دیمەنی جوانی هونەرمەندانەی سەمای كوردانە تیا ڕووناک بكەینەوە و بەهۆی بیستنی ئەم گۆرانی و مۆسیقا كوردییانەوە زەمینە قرچ هەڵهاتووی دڵ و دەروونمان تەڕ و پاراو بكەینەوە.

كۆڕی ئەو شەوەی كە (كوردی) لێی دواوە (٢٨) گۆرانیبێژی بەناو گۆرانیبێژی تیا بووە كە هەر بەگۆرانیبێژی ژیاون و بەناوبانگ بوون جگە لەوەی كە (١١) مۆسیقاژەنەكەش و (٥) سووڕ و سەما دەرەكەش كە گومانی تیا نییە ئەوانیش گۆرانیبێژ و هاوبەشكاری گۆرانییەكانیان تیا كردووە و لە بەستەكاندا بەلای كەمەوە بۆیان سەندوونەتەوە و ئەو شەوە (٣١) گۆرانییان تیا وتووە، بەپێی ئەوەندە تاكەی كە لەم هەڵبەستە دەستكەوتووە و ئەوەندەی تریش گۆرانییەكانیان بەلێدانی ١٥ جۆرە ئامێری مۆسیقا و سووڕ و سەما خۆش كردووە.

بەلێكدانەوەیەكی سەرزاری ئەگەر ئەو گۆرانییانە یەكێ لە دەوری (١٠) دەقیقەیەكیان ویستبێ، ئەوا بەلای كەمەوە هەر ئەوە ٥ - ٦ سەعاتێكی ئەو شەوەی ویستووە.

وەكو (كوردی)ش لەم تاكەدا وتوویە، شەوێكە و ئەمشەو كەواتە هەر لە ئێوارەوە بەزمەكە دامەزراوە و هەر كەسە لەو دەستە و جووتە و تیپانە چیی لە هونەرمەندیی دڵگیر و پەسەند لە بارا بووبێ، نواندوویەتی و (كوردی) كە یەكێ بووە لە دانیشتوانی كۆڕەكە وەک وێنەگرێكی سینەمایی شێوە و دیمەن و دەنگی ئەو بەزم و ئاهەنگەی گۆڕیوە، بەم هەڵبەستەی و دوور نییە

كە زادەی ئەو شەوەی بێ و لە هەر جووڵەیێ یا لە هەر ئاوازی گۆرانی و سازی مۆسیقایەی جۆرە هەست جوولاندنێکی پاک یەکێ لە تاکەکانی ئەم هەڵبەستەی پێ دەربڕیبێ لەو شەوەدا، چونکە وە بەزۆری لە (کوردی) گێڕدراوەتەوە (کوردی) هۆنەرێکی کتوپڕی بە(ئیرتیجالی) هەڵبەست دەربڕیوە و وەک لە زۆربەی ئەو بەسەراتانەی لە لێکدانەوەی گەلێ لە هەڵبەستەکانی تریدا دیاریمان کردووە، کە لە هەر بۆنەیەکدا و بەبێ لێ ڕاوەستان و یەکەندەر دوو هەڵبەستی لەسەر ئەو بۆنەیە بۆ هاتووە.

بۆ ئەوەی بزانین ئەو شەوە لە کام (دەرز)دا بووە دەگەڕێینەوە بۆ تاکی یازدەیەم کە (کوردی) لە باسی (ساقی)یەکەدا لە ئەفشانکردنی (غولامانە)کەی ئەو ساقییە دەدوێ و غولامانەش جۆرە سوخمەیەکی بێ قۆڵی ناوداری وەکو پەستەک وابووە، جا لە کاتێکا یەکێ لە کەسانی ئەو کۆڕە کە ساقی بووە و (غولامانە)ی لەبەرا بووە لە پۆشاکێکی وەرزە ساردەکانەوە بەوەدا کە دوگمە و قەیتانی بەرۆکەکەی ترازاندووە، دیارە ئەو شەوە لە وەرزێکدا بووە کە جیهان کەمێ تەشقی سەرمای تیا شکاوە، کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو شەوی ئاهەنگە لە شەوی (نەورۆز)دا بووە و سەیریش نییە ئەگەر بەبۆنەی ئەو جەژنە نیشتمانییە کۆنەی کوردانەوە یا بەهەر بۆنەیەکی تری نیشتمانیی مەزنەوە بووبێ، کەوا پاشا و میرە بابانەکان و گەورە پیاوانی شارەکەش تیا بەشدار بووبن وە یا بەبۆنەی سەرکەوتنێک یا وەرگرتنی ڕوتبەی یەکێ لە فەرمانڕەواکان وەک ڕوتبەی (میری میران) یا پاشایەتی یا هاتنی میوانێکی مەزن یا گەڕانەوەی گەورەیەکی خۆیان یا چاکبوونەوەی یەکێ لە ناودارەکان لە نەخۆشی یا ڕسگاری لە کارەساتێکی گرنگ و... هتدەوە ئەو بەزمە گێڕدرابێ و یا شایی و ئاهەنگێکی مەزن یا شەوارە بووبێ.

وەک لە لێکدانەوەی تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەدا لەمەڕ بادەنۆشییەوە کە (کوردی) ئەم پێشەکییە بادەنۆشی ئەم هەڵبەستەی تەنیا وەک ڕازاندنەوەیەک داناوە کە بۆ هەڵبەستەکە وەک سەرەتای ڕاز دادانێکی وێژەیی و جوان بێت. ئەگەر نا کۆڕێکی وا گەورە لە شارێکی وا کورپەی وەک سلێمانیدا و لە سەرێنییەکی ئاینیی وەک ئەوسادا ڕێی تێ ناچێ کە ئاوا بەئاشکرایی، خواردنەوەی تیا خورابێتەوە. بەڵام وەک هۆنەرە عەرەبەکان کە لە پێشا باو بووە سەرەتای هەر جۆر و بابەتە هۆنەرێکیان بەپیاهەڵدانی شوێنەوار (ئەطلال)ەوە دەس پێ بکەن هەروەها لە ناو تورک و فارس و ناوچەکەشدا ئەو باوە هەبووە، کە سەرەتای هەڵبەستەکانیان بەبابەتێکی خۆش دەست پێ بکەن و (کوردی)یش بۆ چوارچێوە بەندییەکی ئەم هەڵبەستەی لەسەر ئەو پێودانە، بەسەرەتای باسی بادەنۆشی ئارایش داوە وەک شتێک (کۆڕی مۆسیقا و گۆرانی و سووڕدانەکە) کە (ئیلهام)دەری گیانی بووە بەو سەرەتایە هەڵبەستەکەی لەسەر ئەو کۆڕە پێ تەواو کردووە کە بادەنۆشیش گوایە هۆیەکی تری پێ ڕابواردن بووە، هەروەک بەلای کۆڕە ئاینییەکانەوە بادەخۆری ڕەمزی سەرخۆشییەکی گیانی بووە و ئەمیش وەک هەریەکێ لە هۆنەرە کلاسیکییەکان هەمان ڕێڕەوی گرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا (کوردی) خۆی پێ

نەگیراوە و ئەوەتا دوا تاکی هەڵبەستەکەی بەم جۆرە کۆتایی هێناوە:

وەنییە کوردی مایلی ئەو جۆرە ئەطوارانە بێ

لازمە شاعیر لە هەر نەوعێ بڵێ بۆ ئیمتیاز

دیارە مەبەستێکی (لەو جۆرە ئەطوارانە) بادەنۆشییەکە بووە، چونکی هەروەک لەم تاکی (١٣)هەمەی سەرەوەدا دەری بڕیوە کە خۆشیی ئەو کۆڕەی بۆیە ویستووە کە تیا دەرچن لە (طەوری دنیای پیس) و بێ گومان بەلای کۆمەڵی ئەو سەردەمە و ئیسلامەکانیشەوە (خواردنەوە) پیسیی دنیایە و بەڵام هەمیشەش لە خواردنەوە و سەرخۆشییەکی (مەعنەوی) و گیانی و خوایی و ئاسمانی و جاویدانی دواون. وەک (کوردی) لەو شەوەدا لێی دواوە و هەرچی لە بارەی گۆرانی و گۆرانیبێژ و مۆسیقا و مۆسیقار و سووڕ و سەما و بادەنۆشییەوە بووە و (کوردی) بیری وا هاتووە لەم هەڵبەستەیدا گردی کردوونەتەوە. مەرجیش نییە لەو کۆڕەدا هەموو ئەوانەی تێدا بووبێ.

طەور بەواتە بار، جۆر، جۆرێک لە باری ژیان – بەڵام بەزمانی مۆسیقای (طەور) (پەردە) یا (پلە) یا (چینی) دەنگ و ئاوازێکەوە لێوەی دەردەچن بۆ سەر (جۆرێکی تر) و مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە ئەو کۆڕە بۆ پاککردنەوە و پشوو پێدانی گیان و بەرزبوونەوەیە بۆ ئاسمانێکی خوایی (مەعنەوی) ئەوە جیهانی. نەک بۆ پیسیەتیی ئەم جیهانییە لە سەرخۆشی ڕاستی و بادەنۆشی و لە داوێن پیسی و خراپکاری و... هتددا. هەروەها (طەور) مەبەستیشی لە دەرچوونی ژیانی صۆفی و زاهید و شێخانی تەکیە و خانەقایەشە کە لە چەند جێیەکی ئەم هەڵبەستە لە درۆزنییان دواوە.

دونیا: جیهان، گێتی، ڕۆژگار.

حوققەباز: ساختەچی، فێڵباز، خراپ، بەدرۆ ژیان بەسەربردن.

١٤- ئەم تاکە لە (عن) و (کۆن)دا نییە و لە (گل ١٣٠٠)دا چوارەمینە و لە (ف، نم/١، ع، کم) و (گل ١٣٠٨) و چاپەکانی (گیو/٢) و (ئۆفسێت) و (گیو/٣)دا حەوتەمینە و لە (گل ١٣٠٩) و (١٣١٠)دا هەشتەمینە و لە (گل/سەرکارێز)دا دەیەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ) و (ص)دا ١٣هەمینە و لە (مس)دا چواردەیەمین تاکە و حەوتەمین تاکی چاپکراویشە و ئەمەش دووەمین تاکە لە نەوتچی دا.

یار: دۆست، خۆشەویست، دڵخواز.

بەڵام زۆرتر بیر بۆ ئەوە دەچێ کە ئەم (یار)ە خاوەنی ئاهەنگە و بەزمەکە وە یا گەورەی (فەرمانڕەوای) ئەو سەرینییە بووبێ، کەوا یەکەم بەر لە هەموانەوە و بەر لە دەسپێکردن بەمۆسیقا و گۆرانی لەسەر دەستەوە ناوی بردووە و دووەم وەک ڕێز لێگرتنێکی کەوا هەموان لە (فەیض) = بەهرە و پیرۆزی و سایەی ئەوەوە سەرخۆشی بادەی (خۆشی) ئەو قەڕابەی (بەهرەدەر)یەی ئەون کە لە کۆڕەکەدا هاوبەشی ئەو خۆشی وەرگرتنەی کردووە و (بەفێس و

تەلک)ەکـەیدا نێـرینەش بووە یا کـوڕە پاشـایەک بووە، ئەگـەر ئـەم هەڵبـەسـتـە هـی سـەرێنی (مەحموود پاشای بابان بووبێ ئەوا ئەو کوڕ و پاشایە (ئەحمەد پاشـا) دوا پاشای بابان بووە کە (کوردی) زۆر پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ هەردووکیاندا بووە و، جێی خۆیەتی کە بە(یار) لەو کـۆڕەدا ناوی بردبن، بەڵام بەوەدا بە چاوجـوانی (چاوباز) ناویبـردووە، لەوە دەچـێ کـە عوسمـان پـاشـای برای مـەحمـوود پاشـا و مـامی ئەو ئەحمـەد پاشـا بـووبـێ کە وەک (ڕیچ) لە ڕۆژی ١٠ی بەخـتـەبارانی ١٨٢٠دا لە جـوانی و چاوە شـینە تۆخ و گـەشـەبازییـەکـانی ئەم عوسمان پاشایە دواوە و، یا مەزنێکی تری ئەم خێزانە بووە.

قـەڕڕابە: خـوم، ئەو کـووپە یا مـەرکـانەیەی خـواردنەوەی سـەرخـۆشکار (بادە = مـەی)ی تیـا دەگیرێتەوە و تیا دەمێنێتەوە هەتا دەخورێتەوە.

قەڕڕابە: لەوە ئەچێ کە چونکی (مەی) بریتییە لە سرکەی گەڕاوە و ئەم قەڕڕابەیەش شـوێنی ئەو سـرکـە گەڕاوەیە (مـەی – بادە)یەیە لەوەوە پێی وترابـێ (شـوێن گـەڕاوە) و بە(گـەڕاوە)ش ناوی برابێ و پاشـتر بووبێ بە(قـەڕابە) و بەتایبەتی کـە عەرەبەکانیش پیتی (گ)یان نییە و لەو وشـەیەدا کردبێتیانەتە (ق) و بە(قەڕابە)یان ناوبردبێ.

جامی مەی: بادیی یا پیاڵەی مەی و...

فێس: ئەو جۆرە پۆشاکی سەرەیە کە بنکەکەی (یا تەپڵە سـەرەکەی) جغزێکی خشتـە و لەسەر ئەو بنکە لێوارێک بەقـووڵاییی بستـێک هەیە و بەزۆریش بەقوتکەکەیەوە گوڵەنکە (گوفک)ێکی درێژ و تاو تاو بەلایەکیدا شـۆڕ دەبێتـەوە کە (عشکوول یا پسکوول)ی پـێ ئەڵێن و ئەمـەیان پیاو لە سـەری دەکـا ڕەنگەکـەی جگەرییـە و تەنانەت ئـەوەندە بووەتە بـاو ڕەنگەکـەی بووەتـە ناو بۆ جۆرە ڕەنگێک کە پێی دەڵێن فێست ڕەنگی. لە هەمان کاتیشدا فـێست لە شێوەی کڵاودا وەک نیوەخـڕێک وایە کە ئـەمەیان ژن لە سـەری ئەکا و لە دیوی دەرەوەی دەزووی ئاوریشـمـی شـینی خومـیی بەپاڵ یەکدا پیا دەدووررێ و ڕیشووەکانی ئەوەندەی پانایی پەنجەیەک بەلێوارەکانیدا شـۆڕ ئەبنەوە.

کەواتە ئەم پۆشـاکـە نێر و مێ لـەسـەری دەکـەن و لە کۆنەوە ئیسـلام و گاور و جـوو لە سـەریان کـردووە و بەتـایبـەتی لە سـەرێنی عوسـمـانییـەکـاندا بەرگێکی نیشـتـمـانیی تورکـەکان بووە، بەڕەسـمـی لە دەزگـا مـیـرییـەکـاندا بـووە و بۆیە بـەسـەر عـیـراقـیـشـا سـەپێنراوە. منـاڵی ماڵەگەورەکانی کوردیش پۆشیویانە.

فێس لە تووکی کەروێشک یا لە خوری یا لـە تووکی وشتر و لە لۆکەش وەک لباد دەسـوورێتەوە و بەتـەنکی و، ڕەنگ دەکـرێ و لـە قـالـب دەدرێ و جـاران پـسکوولەکـەی وەک ئـەم دوایـیـە لە دەزووی بادراوی ڕەش نەبووە، بەشکو لە ئاوریشمی خـاوی شین بووە، هـەرچەندە ئـەم پۆشـاکـە لە لایەنی تەندروسـتییـەوە یا بـۆ کاروبـار و شـتێکی (کردەنی) واتە (عـەمـەلی) کـەڵکدار نییـە، هـەرچەندە لە سـەرێنی (کوردی)دا گـەڕۆکی فەرەنسی (اولیفیە) کـە لە ١٨٢٤دا مردووە لە بەغدا

ژنی فێست پۆشی دیوە کە فێستەکانیان لە قەیفە بووە و پسکوولی ئاوریشـمیشی بەئاوێتەی سیمەوەی بپێوە بووە و فێستەکە بەتووڵی زێڕ داپۆشراو بووە و... هتد.
دیسـان (فـرەیزەر)یش لە گـەشـتـەکـەیدا لە فـێـسـتی بەمـرواری چینی ناوچەکـە دواوە کـە لە ١٨٢٤ز.دا بووە.
هەروەها (فـۆک)ی گـەرۆکی ئـەمـریکی لە ١٨٧٥دا لە خـوارووی عـیـراق فـێـسـتـی بەبـەرگـێکی ڕەسمی داناوە، وتوویە تەنانەت لە خواردندا و لە ئاهەنگدا و لە مزگەوتیشدا دای ناکەنن. ئەم پۆشـاکە لە عیـراق (فینە) و لە ناو عـارەبەکانی تردا بە(طـەربووش) ناوی دەبەن کـە ئەم ناوەی دوایی (طەربووش)ە لە (سەرپۆش)ی (کوردی)یەوە کە (سەردەپۆشێ). لە مووصڵیش لە کۆنەوە ژن لە سـەری کـردووە و هـەروەک ناوچەی کوردەواری دراوە سـەر و خـشڵی پێوە بووە. کە ئەم بەرگە دەسی کردە نەمان تەنیا بازرگانە جووەکان مـابوونەوە دەیانپۆشی کە ئێستە لە نەمانە و لە (سولەیمانی)شدا تا ساڵە پەنجاکانی چەرخی بیستەم فەلەکان پۆشیویانە.
(کوردی)ش کە ناوی بردووە، ئـەوساش ئەم پۆشاکە لەسـەرکـراوەکە وەک ئەو (یار)ە بادەدەرە لە سـەریا بووە مەرجیش نییە بادەی وا بەشکو (خۆشاو).
فێس (ف): فێست ئەمەش جۆرە گرانییەک بەکێشی هەڵبەستەکە دەدا.
تەرلک: ئەو پارچە کەتانە بووە کە لە ژێر فێستـەوە لەسەر سەر دانراوە کە تەڕاییی نمـی گەرما (عـارەق) بمژێ و چـەورایی و چڵکی قـەراغی سـەر و ناوچەوان نەداتە فـێسـتـەکـە و زوو چڵکن نەبێ و بەتایبـەتی لە وەرزی هـاوین و دوا بەدوای بەهـاردا بەکارهێنراوە کە ئەو کـاتانە مـرۆڤ عارەق دەکاتەوە، ئەمەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە بەزمی ئەم هەڵبەستە لەو کاتانەدا بووە.
تەرلک (گیو/٣): تەرلگ – ئەمەش دەسکارییەکی نوێیە.
بگرێ (کم): بگەری – ئەمەش هەڵەیە.
بگرێ (ف): بکری – ئەشێ ئەمە هەڵەی نووسین بێ.
دەوری (چاپی گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣، کم): دەورەی – ئەمیش هەڵەیە.
دەوری (ف): دو ئەمیش هەڵە و لەنگییە.
دیدەکانی (کم): دیدەکان – ڕەنگە هەڵەی چاپی بێ.
دیدەکانی (گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): دیدەی – هەڵە و لەنگییە.
میثلی: چەشنی، وەک، چۆن، هەروەکو.
میثلی (گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): وەک – هەڵە و لەنگییە و دەسکاری (گیو)ە.
مـەبـەست لە شـۆڕبـوونەوەی گـۆشـەی کـەتانی (تـەڕلکە)کـەیە کـە وەک باڵی (باز) و (بـاز)ەکـەش فێستـەکـەیە، بەسـەرییەوە شـۆڕ بووەتەوە جگە لەوەی مـەبەستی لـە جوانیی چاوییـە وەک چاوی (باز).
باز: مـەلێکی دەنووک قـولاپی و تیژ و بەنـاوبانگە لە زۆر شوێنـەکانی جیـهاندا ئدەژی و گـورج و

توانایه و بەئازا بەناوبانگە و گۆشتخۆر و درندەیە و لە مەلە كۆچكەرەكانە كە زستان لە شوێنێك و هاوین لە شوێنێك دەبێ و ئەو جۆرەی كە لە كوردستاندا لە چیا زۆر بەرز و ناو ئەشكەوتە سەختەكاندا و بەسەر درەختانەوە دەژی بەقەبارە لە جۆرەكانی تری ناوچەی ناوەند و خوارووی عیراق مەزنترە، درێژاییی لەشی لە نێوان ٦٥ – ٧٣سم دا و قولەپێی ٩ – ١٠سم بەرزە، دەنووكی ڕەش و بنكی شین و ٣,٢سم تا ٣,٦سم درێژە و باڵەكانی هەریەكە ٤٦ – ٥٣,٣سم و پەنجەكانی و قاچی قاوەیییەكی زەردباوە و پەنجەی ناوەندیشی لەوانی كە درێژترە و، بەبێ نینۆكەكەی دەگاتە ٥سم. مێیینەی لە نێرینەی گەورەترە.

ڕەنگی قاوەیییەكی تۆخ و هەتا بۆ بەرەو ژووری لەشی ئاڵتوونی و بەرەو سپیواشی دەڕوات لەگەڵ تێكەڵی هێڵی ڕەشدا كە سەرنووك و لێواری پەڕەكانی ڕەش و هێڵی سپی بەلاملیەوەیە، سەر گووپی هێڵی قاوەیی پیا كشاوە و ڕەنگی سەری كاڵترە و چاوی زەرد و گەش و جوانە و هۆنەران لە جوانی و گەشیی چاوی خۆشەویستەكانیاندا لە هەڵبەستەكانیاندا ناوی دەبەن، كلكی قاوەیییەكی خاڵخاڵاوی خۆڵەمێشییە و سەر نووكەكەی ڕەش و هەنگوینی باوە.

هەرچەندە لە ناو كوردیشدا وا باوە كە بازی سپی پەسەندترە، بەڵام ئەو ڕەنگەی نیشانەی پیرییەتی، چونكی لە ٣ساڵی بەرەو ژوورەوەی ڕەنگی بەرەو سپی دەچێ و كاڵ ئەبێتەوە، ئەم مەلەش توانای فێربوونی پەروەردە، بۆ ڕاوكردنی هەیە و دیارە كە تا گەورەتریش بێ، ژیرترە ئەمجا گەورە سپییەكان لەوەوە پەسەند كراون.

(كوردی) لێرەدا كە ناوی (باز)ی لە پاڵ (تەرلك)دا بردووە مەبەستی لەو كڵاوە بووە كە كراوەتە سەر بازەوە بۆ چاو داپۆشینی لە كاتی پەروەردەكردندا و (بانگی جلغوو) بانگی خواردن پێدان و (قوو قوو) بۆ كردنیدا كە بەو جۆرە بانگە فێرە ڕاو دەكرێ و ئەو كڵاوی بازەی بە(تەرلك)ی (ساقی)یەكە بەراورد كردووە كە چۆن دەوری دوو چاوی جوانی وەك بازێ، دڵی (كوردی) ڕاو كردووە.

(ئەم باسە لە نووسراوێكی چاپ نەكراومدایە كە هێشتە چاپ نەكراوە).

١٥– ئەم تاكە لە (گل ١٣٠٠) و (١٣٠٨)دا هەشتەمین و لە (گل ١٣٠٩) و (١٣١٠)دا نۆیەمین تاك و لە (باپیر ئاغا)، (ف، نم/١، ع، كم)، (چاپەكانی گیو/٢) و (ئۆفسێت) و (گیو/٣)دا دەیەمین و (گل/سەركارێز)دا پانزەیەمین تاكە و لە (عن)دا (١٣)یەمین و لە (گل/بەرباخەڵ) و (كۆن) و (ص)دا (١٤)یەمین و لە (مس)دا پانزەیەمین تاكە و دەیەمین تاكی چاپكراوە.

ئاغە (نم): ئاغا – و بەم شێوەیەش بۆ كێشی هەڵبەستەكە گرانە.

ئاغا = ئاغە = نازناوێكە بەواتە: بەرزیی پلەی كۆمەڵایەتی كە ئەم وشەیە لە ناوی (مۆغ) سەرینی (زەرەدەشتی)یەوە ماوە.

ئاغە زەننوون: ناوی یەكێ لە مۆسیقاژەنەكانی پێرەكەی لەمەڕ (كوردی) و تایبەت بووە بەلێدانی ئامرازێكی مۆسیقیی كۆن كە ئەوسایە لە ئارادا بووە بەناوی (سینەكەمان)ەوە.

سینەکەمان: ئامرازێکی مۆسیقیی کۆنە و ئێستە بەکار ناهێنرێ و لە ئامرازە مۆسیقییە (تەلی)یەکانە، جۆرێکی بچووکی (کەمان یا کەمانچە)ی ئێستایە و، ڕاستترەکەی کە هەر خۆی خودی (کەمانچە) بووە هەرچەندە لە سەرچاوە مۆسیقییەکانیشیا (ساز)یشی پێ وتراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە وشە یا ناوی (ساز) ناوی ئاوازێکی گۆرانی و لە هەمان کاتدا ناوی (سەمتوور)یشە، بەڵام ئێمە ناوی (سەمتوور)ەکەی بەڕاست نازانین، چونکە (ساز) بەجیاواز لەگەڵ (سەمتوور)دا لێ دراون...

بۆ بەڵگەی ڕاستیی ڕایەکەم، لەسەر ناوی (ساز) و (سەمتوور) ئەوەتا هەر خودی (کوردی) وتوویەتی:

شەهەنشاهی خەیاڵت مەجلیسی بەزمی لە تەن دانا

دڵم ڕەققاصە سینەم، چەنگە ناڵەم ساز و سەمتوورە

کە ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) (ساز) و (سەمتوور)ی وتووە نەک سازی سەمتوور و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە (ساز) شتێک و (سەمتوور) شتێکە، (دەنگی ناڵە)ش جۆرەهایە جارێ بەساز و جارێ بەسەمتوور دەچێ.

وەک لە شوێنی تری ئەم پەڕاوەییەدا پتر لەسەر ئەمە دەڕۆم؛ کە (ساز) (سینەکەمان) نییە و ئەو سەرچاوانەی وایان داناوە هەڵەن. بڕوانە پەراوێزەکانی («٥، ٣١، ١٤٧، ٢١٩، ٢٣٨» لەسەر تاکەکانی «١ و ٣ و ٢١ و ٢٣» لە بارەی «ساز»ەوە) دیکەم لەسەر (فارس): ناوی مۆسیقارێکی کوردی سەرێنی (کوردی)یە کە فارس لە لێدانی (گرفت)دا وەستا بووە.

فارس (چاپی گیو/٣): حارس. ئەمەش دەسکاری (گیو)ە.

گرفت: بەسەرزاری و لە لایەن زمانییەوە، بەواتە (گیراوێی) یا ناوی بارێکی نەخۆشییە کە زگ لە (چوون) بکەوێ و نەڕوا.

بەڵام هەر (گرفت) واتە (دەنگێکی لەسەرخۆ و نەرمی تەلی ئامێرە مۆسیقییە تەلییەکانە).

هەرچەندە ئەوی بۆ ئەم شوێنە و (کوردی) مەبەسیەتی (گرفت) ناوی ئامێرێکی مۆسیقییە لەو جۆرەی کە بەفوو پیاکردن دەنگ دەدا و درێژییەکەی پێنج قولەمست و پانییەکەی پێنج قولەمستە و هەردوو لای دەمەکەی بەرەڵلایە لە زارکی لێوە فووپیاکردنیدا شتێکی تری ئەوتۆی پێوە نییە، کە دەنگی لێوە بێ، بەشکو ئەوەی لێی دەدا وەک شمشاڵژەن دەبێ بەوەستاییی خۆی فیکەی لێوە بێنێ، ئەمیش کە (گرفت)ە هەروەهایە، بەڵام لە سەری لای فوو پیاکردنی (گرفت)دا چەن کونێک هەن کە بەپێی گرتن و بەردانی ئەو (کونانە)ی کە لە گەروونەکەیدان جۆری ئەو ئاوازە دەگۆڕێ کە دەویسترێ لێ بدرێ وەک شمشاڵ و نای و.

ئەلکە: ناوێکە لە کوردیدا هەیە و سووککراوەی ناوی (عەلی)یە کە کوردان (ئەلی) و (ئەلە) و (عەلە) و... هتدیشی پێ دەڵێن لەبەر خۆشەویستی هەروەک لە عارەبیشدا ئەمە ناوی (عەلی)یە ئەکەنە (عەللاوی) و... هتد.

ئەمجا (ئەلکە)ی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە، ناوی مۆسیقاژەنێکی کوردی تری ئەو سەرێنییەی (کوردی) بوو کە بەتایبەتی لە ژەندنی ئامێری مۆسیقای (تەنبوور)دا و لە لێدانی (دەف)دا دەستێکی باڵای بووە و، واتە لە هەمان کاتا لەو ئاهەنگەدا تەمبووریش و دەفیشی لێ داوە و، یەکێ بووە لە هونەرمەندە پسپۆڕەکانمان.

گومانیش لەوەدا نییە کە هی تر زۆر هەبوون کە لەم دوو جۆر و مۆسیقایەدا وەستابوون، بەڵام ئەم لە هەمووان پتر تایبەتمەندیی لێدانی هەردووکیان بووە وە هەر خۆی وەستای مۆسیقا لێدەرانی ئەو دوو ئامێرە بوو لە کاتی لێداندا واتە بەردەستی یا خواردەستی (جان چاوەش)ی سەرتیپی جووقەکە بووە. کە لە ئەلکە پسپۆڕتر بووە. ئەمەش ئاشکرایە لە تیپی مۆسیقادا ئەوی کە دەف یا تەپڵ لێ دەدا ئەو وەستایە لە کاتی لێداندا (ضابط ایقاع)ی پێ دەڵێن،چونکی ئەو لە کاتی لێدانی تەپڵ یا دەفدا، پاشکەوتن و پێشکەوتن و بەرز و نزمی و نەشازیی هەر مۆسیقەژەنێک دادەپۆشێ لە کاتی لێدانەکەدا و هۆشی بەلایانەوەیە و ئاگەداریان دەکا بەچاو و بەسەر، هەڵەکانیان تێ دەگەیەنێ.

تەنبوور: (تەمبوورە، تەمبوورە، طەنبوور، ئەم ناوانە هەموو ناوی یەک ئامێری مۆسیقان لە جۆرە تەلییە کۆنەکان و لە سەرچاوە کۆنەکاندا (دریج)یشی پێ وتراوە و ئەم ناوی (تەموورە)یە لە ناوی دەنگەکەیەوە هاتووە کە منگەمنگ و هاژەهاژێکی لێگالێگای بێ پچڕانەوە و گرمە و دەنگێکی پێکاچووی خۆشە و یەکێکە لە جۆرەکانی (عوود) و گەردنی درێژە و ئەو پەڕەکەی وە یا بەزۆری چوار تاکو هەشت تەلی ئاسنی لێ دەبەستریێ کە هەریەکەیان لەسەر جۆرە ئاوازێکی تایبەتی ڕێک دەخرێن واتە (دەستان یا دۆزان یا ڕێکخستن)کارییان تێدا دەکرێ و ئەم ئامێرە زۆرتر لە عوود دەکاو جۆری دوو تەلیشی هەیە و هەندێ جاریش (٣) تەلییە، بەڵام بەناوبانگتریان دوو تەلییەکانیانن کە کەمێک لە (بوزوق) بچووکترە، هەرچەندە جۆری تەلبەستنەکەی بۆ لێدان هەروەک جۆری بەستنی تەلی (بوزوق) وایە، بەڵام تەلی (بوزوق) لە (مس)دا یەک پشتێندەی لە گەردنە دارینەکەیدا پێوە دەبەستریێ، وە بەپارچە شاخێکی ڕەشەوڵاخ یا (باغە) لێ دەدرێ و ئەوی لێی دەدا بەعارەبی (طەنبووری) و لێدانیشی (طەنبەرە)ی پێ دەڵێن .

تورکەکانیش بە(طەنبوور) ئەڵێن (بوزوق) کە ئەمیان کەمێ گەورەتر و تەلی مسە نەک ئاسن.

دەف: ئامێرێکی مۆسیقی کۆنە و لە جۆری (ئیقاعی)یە واتە بەپیامالێن دەنگ ئەدات دەنگەکەی بەپێی گورجی و خاویی لێدانەکە و ماوە لە نێوان لێدانێک و پیامالینێکدا ئاوازی خواستراو پێک دێنێ.

دەف و (ف): دەف – ئەمیش لەنگ دەبێ.

ئەسعەد: ناوی لێدەری ئامێری مۆسیقییە کە بەناوی (ساز)ەوە لەو کۆڕە مۆسیقییەدا کە لەم تاکەدا هاتووە.

ساز: وەک لە پەراوێزێکی پێشووی ئەم تاکەدا لە بابەت (سینەکەمان)ەوە نووسیومە، گوایە ساز وەک ناوی (سینەکەمان)یشە هەروەها ناوی (سەمتوور)یشە کە ئەوە بوو ڕام گەیاند ئەو ناولێنانی ئەو دوو ئامێرە مۆسیقییەی تر هەڵەیە. هەروەها لە هەندێ سەرچاوەی تردا هاتووە کە ساز واتە (نەی) یا (نای) و لە هەندێ جێی تردا هاتووە کە (ساز) ناوی (جەنگیشە) کە دیسان ئەم دوو ناوەش ڕاست نین، بەڵام لە ڕووی زمانییەوە (ساز) ناوی جۆرە گۆرانییەکە وە یا بەواتە دژی (ناساز)ە بەشکو (ساز) جۆرە ئامێرێکی تری سەربەخۆی مۆسیقا وەک (کوردی) وتوویە کە جیایە لە سەمتوور:

صەدای (سەمتووری) کەللەم گەرمە ئەمشەو

چریکە و بانگی دڵ بێ شەرمە، ئەمشەو

کەواتە سەمتووریش وەک لە پێشتردا ساغم کردەوە، جیایە لە ساز و دەڵێن (ساز) ئامێرێکی مۆسیقیی تەلییە بەپیاهێنانی کەوان وەک (کەمان - کەمانچە - سینەکەمان) دەنگ دەدات، نەک وەک عوود بەلێدانی تەلەکان و بەڵام (ساز) تەلی لە تەلی کەمان کەمترە و لە شوێنی تریشدا دیسان دەچینەوە سەر (ساز). بڕوانە پەراوێزەکانی سەر تاکەکانی (١ و ٣ و ٢١ و ٢٣ لە بارەی «ساز»ەوە).

بەساز (ف، چاپی گیو/٣، عن و (گل-ەکان): کە ساز.

١٦- ئەم تاکە لە (گل/١٣٠٠) و (گل/١٣٠٨)دا نۆیەمین و لە (گل/١٣٠٩) و (گل/١٣١٠)دا دەیەمین و لە (گل/سەرکارێز) و (نم) و (ع) و (کم) و چاپەکانی (گیو)دا دوانزەیەمین و لە (ف) سیانزەیەمین و لە (عن)دا چواردەیەمین و لە (گل/بەرباخەڵ) و (کۆن)دا پانزەیەمین و لە (مس) و (ص)دا شانزەیەمین تاکە و دوانزەیەمین تاکی چاپ کراوە.

ڕەسووڵ: ناوی پیاوێکی گۆرانیبێژ و مەقامی (ڕاست)زان بووە لە سەرێنی (کوردی)دا و هاوبەشی ئەو کۆڕە گۆرانیبێژەی کردووە کە ئەم هەڵبەستەی لەسەر دانراوە.

هەڵداتە: تێ چڕێ، تێ هەڵکا، تێ هەڵچێ، گۆرانی بڵێ، بۆی هەستێ، کە هەموو ئەمانە مەبەست لە دەست بەگۆرانی کردنە لە نۆرەی خۆیدا.

ڕاست: وشەیەکی کوردییە و فارس بەکاری دێنێ و بەواتە (ڕێک)، (ناخوار)، (دووخ)، (ڕێکوپێک) و... هتد.

بەڵام لەم تاکەدا مەبەست لە ناوی (مەقامێکی کۆن)ی کوردییە کە ئەم مەقامە لە سەرێنی گەرمەی باویدا، فەرمانڕەوایی عوسمانی (تورک) لە ناوچەکەدا دەسەڵاتدار بووە، بۆیە هەر شتێک وە یا وەک زۆربەی مەقامەکانی تریش کە بەناوی (تورک)ەوە ناوبراوە و بەهەڵە وتراوە (مەقامێکی تورکییە) کە لەگەڵ ئەوەشدا وشەی ناوی مەقامەکە (ڕاست) تورکی نییە و ناشێ تورکێک کە خۆی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدار بووبێ و لە خاکی خۆیدا گۆرانییەک بەوشەیەک ناو بنێ کە ئەو وشەیە هی گەلێکی ژێردەستەی خۆی بووبێ، لە خاکێکی تردا بەڵام چونکی لە

کۆڕی سیاسیدا (کورد) ژێردەستەی تورک بووە، وتوویانە (تورکییە) هەروەک زۆر زۆر جار لە شتی تری کوردا عەرەبەکان وتوویانە هی (فارس) و هی (عەجەم)ە. بۆ ئەوەی لە هی کوردی لابدەن.

ڕاست = مەبەست لە کۆمەڵە (لەحن)ێکی هەندێ لە نەغمە بنچینەییەکانی مۆسیقایە، عەرەبیش بە(کۆمەڵی ڕاست)ی ناودەبا و بەبناغەی مۆسیقای خۆی دەزانێت و، ئەم نەغمەیە بەنەغمەی بنچینەی کۆمەڵەی (یەکاە یا بەگاە یا یەک گا) ناودەبرێ و لە ڕەگەزی (ڕاست).

ڕاست و (ئوفسێت): ڕات – دیارە هەڵەی چاپییە.

صالح: ناوی پیاوێکی کەی گۆرانیبێژی ئەو کۆڕەی لەمەڕ (کوردی) و، وەستا و شارەزای گۆرانی (نیوەشەوێ) یا (نیوەشەوی)یە کە ناوی گۆرانییەکی ئەو سەردەمەمان بووە.

نیوەشەوی یا نیوەشەوێ: بۆم ساغ نەبووەتەوە کە ئایا گۆرانی یا بەستە بووە، بەڵام زۆرترەکەی بەلای ئەوەدا دەچم کە گۆرانی یا مەقامێکی کوردی بووبێ کە سەرەتاکەی یان لە ناوەڕۆکەکەیدا وشەی (نیوەشەوی)یی تیا بووە، یا ئەم ناوەی خۆی تیا دووبارە کراوەتەوە بۆیە وای پێ وتراوە.

(محییەدین): ناوی پیاوێکی کوردی مەقامبێژ و گۆرانیزان و مەقامی (چوار گا)ی لە زۆربەی مەقامبێژەکانی تر، تەواوتر و خۆشتر وتووە لە سەرینی (کوردی)دا و، یەکێکە لەوانەی بەپاڵ ئەم مەقامی (چوار گا)یەوە ناوی بردوون.

چوار گا: فارسەکان و عەرەبەکان و تورکیش (چەهار گاە)ی پێ دەڵێن بەواتە چوارەمین دەنگ یا چوارەمین گۆرانی لە بەرەو بەرزبوونەوەدا یاخود نەغمەی چوارەمینە بەدوای نەغمەی بنچینەیی (یەگاە یا ڕاست)دا دێ، لە چینی ناوەندا و دەنگی ئەم مەقامە لە تەلی سێیەمی (عوود) دەبەسترێ کە بەو تەلە ئەوترێ (دوو گاە) بۆ لێدانی تەلەکە و بۆ دەربڕینی ئەم دەنگە لەو تەلە دەبێ لە شوێنی ٥/٦ی ئەو تەلە بدرێ ئەمجا دەنگی چوار گا دێتە دی.

قەرە: وشەیەکی (تورکی)یە بەواتا (ڕەش) ئەم وشەیەش بۆ ئێرە ناو یا نازناوی پیاوێکی (لەوانەیە ڕەش بووبێ) یا لە شتێکەوە پێی وتراوە قەرە واتە ڕەش، قەرەش بەکوردی بەواتەی (ئاهی سوێند) دێ، وەک یەکێ دەڵێ (بۆ قەرە) یا قەرە دواییش دەگرێتەوە وەک (قرە).

سا ئەم ناوە لە هەرچییەکەوە بووبێ ئەو پیاوە گۆرانیبێژ و شارەزای مەقامی (حیجاز) بووە و ئەشێ لەبەر ڕەشکەڵەییی پێی وترابێ قەرە یا یەکسەر ناوی خۆی بووە و لەوانەیە ئەم ناوەش کورتکراوەی ناوی (قەرەنی) بێ و بەهەرحاڵ (کوردی) بۆی نەمر کردووین، بەم هەڵبەستەی.

قەزاز: ناوی یەکێکە لە مەقامەکان بەواتە (کەژ) ئاوریشم یا کرمی ئاوریشم و لەوەوە بەکرمەکە وتراوە (قز) کە (عەرەب) و (تورک) کردوویانە بەوشەیەکی زمانی خۆیان هەر لە ناسکی و نەرمونۆڵی ئاوریشمەوە (تورک کردوویەتە ناوی (قز) واتە (کچ) کە لە هەمان کاتدا هەر وشەی (کچ)ەکەی خۆمانە کە تورک کردوویەتە وشەیەکی زمانەکەی خۆی کە لە لاوازترین زمانە لە

هەموو زمانەکانی جیهان بەپێی ڕاگەیاندنی زانا (جورجی زەیدان).

١٧- ئەم تاکە لە (گل/سەرکاریز) و (گل/بەرباخەڵ) و (کۆن) و (مس) و (گل ١٣٠٩)دا نییە وە لە (ف) و (نم)، (ع) و (کم) و (چاپەکانی (گیو/٢) و (ئوفسێت) و (گیو/٣)دا هەشتەمینە وە لە (گل١٣٠٠) و (گل ١٣٠٨) دەیەمینە وە لە (گل ١٣١٠)دا دوانزەیەمینە وە لە (عن) و (ص)دا پانزەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هەشتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە چاپ کراوە.

خاوکەر: گۆرانییەکە و ئاوازەکەی کوردییەکی پەتییە و لەو چەند گۆرانییە هەرە ڕەسەنەیە کە هەر تەنیا تایبەتین بەکوردەوە و لە هەست و سۆزێکی دەروونیی قووڵ و بەسەرهاتی هەزاران ساڵەی کوردەوە هەڵقوڵان و ئەم گۆرانییە ئافرەتیش و پیاویش وتوویانە و دەیڵێن و یەک کەس دەیڵێ و بۆ سەندنەوەی نییە و، مەگەر گۆرانیبێژی توانا بتوانێ بەستەی لێ گونجاوی بەدواوە ببەستێ و ئەگەر نا بەزۆری بەستەی لەگەڵا نییە.

بەڵام (کوردی) لە (ناو)ی ئەم گۆرانییەدا وتوویە (خاوکەرە) و ئێستەش (خاوکەر) دەڵێن ئەمەش ورد و قووڵبوونەوە و لێرامانی پێ دەوێ بۆ یەکانگیرکردنەوەی.

خاوکەرەی (ف): خاوکری.

خانمە: ئەم ناوە ئێستە بە(خانم) لە ئارادایە، بەڵام ئەشێ کە (خانمە) لە جێی «هی خانم»ە - یا - لە «خانم»ەوە - یا لە - «خانم»ەکەوە بێ و دەشێ ناوی ئەو ئافرەتە گۆرانیبێژەی کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا دەری بڕیوە (خانمە) بووبێ کە ئەمیش ئافرەتێکی کورد بووە و لە زەمانی کوردیشدا بەشێوەی (خانم و خانمە)ش وترابێ و لە (بادینی)شدا (خانما) و سۆرانیش (خانمێ)ی ناو دەبەن.

جا ئایا ئەم ئافرەتە گۆرانیبێژەمان کە (کوردی) بۆی نەمر کردووین (خانم)ی پێ وتراوە یا (خانمە)، ئەو (ە)ی دوای (خانم)ە نیشانەیە بۆ (ئەوە) یا کێ و کوێندەری و ژیانی و... هتد چی بووە؟ ئەمانە چییان لە بارەوە نازانم.

لەمەندە پترەی کە (کوردی) بەشارەزاییەکی سەردەستەی چڕینی (خاوکەر - یا - خاوکەرە)بێژانی ناوبردووە و یا ئەم گۆرانییە لە خاوکردنەوەی ئاوازەکەیەوە ناوبراوە یا لەوەوە بوو کە دانەرەکەی یا ئەوانەی زۆریان وتووە، پێستە خۆشکەران (دەباغچی) بوون (چونکە ئەوی پێستە خۆش دەکات لە زمانی کوردی (خاوکەر)ی پێ دەوترێ و... ئەمانە نازانرێن.

خانمە لە (نم/١)دا: خانم.

قەتار: ئێستە ناوی گۆرانییەکی ڕەسەنی وەک (خاوکەر) و (ئەڵڵاوەیسی) و (ئای ئای) و (هۆرە) و (لاوک) و (حەیران) و... هتدمانە و لەو چەند گۆرانییە کوردییە پەتییەیە کە لە ناوچەی (بادینان) و سۆراندا، بەتێکڕایی پیاو دەیڵێ و هی یەک کەسە و بۆ سەندنەوەی نییە و وەستای ئەم گۆرانییە نەبێ هەر وا بەئاسانی ناتوانرێ بەستەی پێوە گونجاوی دوا بەدوایەوە بڵێ.

ئەم گۆرانییە بەناوەکەیدا لەوە ئەچێ کە هی (کاروانچی) و (کۆچکەران) بێ کە لە هەستێکی

دووره دیاری و دەر و دەشـتی و شـەپۆڵ بە(دەنگدانەوە)یەکی تایبـەتی و هەست بە(غـەریبی) کـردن و ئاواتەخـوازییـەوە هەڵقـوڵابێ. کە لـە کوردیدا بـەکاروانی مـەزن یا بەڕیزە (زنجیـرە) ولاخـێکی بارکراو دەوترێ (قـەتار) و ئەوەش بـەبیردا دێنێتـەوە کە لە یەکێ لە مـەقـامـەکـانی (عەجەم عوشەیران)دا بەناوی (کاروانـی - یا - کردانی)یەوە هەیە و بەڵام هێشتە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەیەک لەسـەر بناغەی زانستی و بەراوردی مۆسیقا لەم بارەیەوە و لەسـەر ئەم گۆرانییە و مێژووەکە نەکراوە.

دیسـان (کـوردی) ناوی ئەم گـۆرانیـیـەشی بە(قـەتارە) وتووە نەک (قـەتار) کـە ئێسـتـە لە بەکاربردنایە کە ئایا (قەتارە) ناوی ئەوسـای بووە یا مەبەس لە ناوی بەستەیەک بووە بەڕووی (قەتار)ەوە، ئەمەش هێشتا یەکلا نەکراوەتەوە و تۆژینەوە دەخوازێ.

قەتارەی (نم/١): قطارەی.

صـۆل یـا سـۆل یا صـۆڵ یـا صـول یا صـوول یا سـوول، سـووڵ یا صـووڵ یا سـووڵ: کـە جـێگیـرکـردنـی ناوی دەنگێکی کـە ئەوسـای سـەرێنی (کـوردی) بۆ ئەم ناوە هـێـشـتـە سـاغ نەبووەتـەوە و بێ گـومـان ئەم ناوە یـا ئەم وشـەیـە بەیەکێ لـەم جـۆرانەی سـەرەوە دەربڕدراوە، چونکە ڕێنووسی کۆن ئەوەندە وردەکاری وەک ئێستە تیا نەبووە، کە دەنگی زۆر لە وشەکانمان بۆ جێگیر بکا، بـۆیە لە جێگیرکردنی دەنگی دەقی ئەوسای ئەم ناوە ئـاگەدارییـەکم بەدەستـەوە نییە و ئەوەندە هەیە بەپێی هەڵبەستەکە ناوی (قەتار) یا (قەتارە)بێژێکی بەناوبانگی سەردەمی (کوردی)یە و ئەشێ لـە نێوان ئەو هەمـوو گۆرانـیـبـێژانەدا، کـە ناوی بردوون، ئەم لە هەمـووان شـارەزاتری وتنی ئەم گۆرانی یا بەستەیەمان بووبێ و تیا وەستاتر بووبێ.

دوای ئەم نومـایشـە با ئاوڕێک لەم ناوە بێ هاوتایەی ئەم پیـاوە بدەمـەوە و بیـرم دەچێ بەلای ئەوەدا کە لـە یەکێ لە ناوانی وەک (سـەلیم، سلێمـان، ڕەسـووڵ، سـاڵح) و... هـتـدەوە کـە بووبێ بە(سڵە و ساڵە) و... هتد.

چونکە لە نەریتی ناو و، نازناوی کوردەواریدا لەبەر خـۆشەویستی یا لەبەر هەر هۆیەکی تر ئەم جـۆرە سـووککاری و داتاشـینە لـە ناو، وە لە نـازناودا دەکـرێ، بەڵام هێـشـتـەش لـە دەق یا سەرچاوەی ئەم ناوی گۆرانیبێژە لەم بۆچوونانە بەولاوە چیترم بەیادا نایەت.

ئەم ناوی (صـول)ەی کە (کـوردی) پێی ڕاگەیـاندووین ناچاری ئەوەمـان دەکا کـە هەر بەوەندە بۆچوونەوە لەسـەری نەوەسـتین بـەشکو ناچارین و لە ڕێگەی فـراوانکردنی تۆژینەوەکەیدا تاکو شتێکی ئەوتۆی بەهێـز دەسگیر ببێ و باسەکە خۆگرتووتر بکا بۆیە ئەوە دیاری دەکەم کە وەک چۆن نووسـین لە پیتە هیـجاییەکان پێک دێ هـەروەها مـۆسیقاش پیتی هیجـاییی تایبەتی خۆی هەیە و ئەوانیش تەنیـا لە حەوت دەنگی مـۆسیقی و لێداودا پێک دێن کە وەک پیت لە نووسیندا ئەمـانیش ئاوەهـا لـە نووسـینی مـۆسـیـقا (نۆتە)دا جێگەی پیت ئەگرنەوە ئەمـانیش لە بنەوە بۆ سـەرەوە بریتین لـە ناو یا لە دەنگەکـانی (دۆ)، (ڕێ)، (می)، (فـا)، (صـۆل)، (لا)، (سـی)ن. یا

بەپیتەکانی مۆسیقی ئاوا دەڵێن و بەم پیتانە لە مۆسیقادا هەرچی ئاواز لە جیهاندایە لێ دەدرێن و دەنووسرێن کە بەو نووسینە دەوترێ (نۆتە) و ئەمەش لە هەموو مۆسیقای جیهاندا پەیڕەوی دەکەن و ئەم ناوانە یا ئەم (حەوت) دەنگە یا ئەم حەوت پیتە مۆسیقییە بریتین لەو دەنگانەی کە بەگەرووی مرۆڤدا دێنە دەرێ یاخود لە ئامێرە مۆسیقییەکانەوە، هەڵدەستن و بەتێکەڵبوون و ڕیز بەستنی تایبەتییان بەملیۆن ملیۆنەها ساز و ئاوازیان لە هەر گەلێکی جیهاندا لێ پێک دێ. بڕوانە پەراوێزی پێشەوە لەسەر تاکی ۳ی ئەم هەڵبەستە کە جارێکی تر لەسەرم نووسیوە بەپێی شوێنەکە.

لەم پیتە مۆسیقییانەدا و هۆی هێنانە ئارایان مەبەست ئەوەیە کە ئەوی هەستمان ڕادەکێشێ پیتی (صۆل)ەکەیانە و ئەمانبەستێتەوە ناوی ئەم گۆرانیبێژەمانەوە کە هاوچەشنی ناوی ئەم پیتەیانە کە (صۆل)ە جا ئایا ئەم گۆرانیبێژەمان ئەوەندە بەشێوەیەکی زانیاری پسپۆڕی مۆسیقا بووە کە ئەم ناوی پیتی مۆسیقەیە بووە بەناوی خۆی و پێوەی ناسراوە؟ یا هەر گۆرانیبێژییەکەی بەلەیەکترەوە بەبیستن فێر بووە و دەماودەمییەکی دووبارەکردنەوە یا لە مامۆستا وەرگرتنەوە، بووەتە گۆرانیبێژ و لە (قەتار یا قەتارەدا سەردەستەییی وەرگرتووە یاخود ئەو کابرایە ناوێکی تری بووە و ئەمە هەر ناوی گۆرانیبێژیی بووە سا لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، وەک ئێستە دەڵێن (ناوی هونەری) ئەمانەیشم دیسان لێ شاردراوەن.

بۆ ئەوەی بەتەواوی ئەوی لە بارەی ناوی (صۆل)ەوەیە هەمووی بینینە کایەوە کە وەک کەرەستەیەک بۆ ساغکردنەوەی ناوی ئەم گۆرانیبێژەمان دیسان دەس بۆ ئەو دەستوورە مۆسیقییەش درێژ دەکەم کە پیتی (صۆل) لە مۆسیقادا نیشانەیەکە یا کلیلی دەستپێکردنی نۆتەی هەر ئاوازێکی مۆسیقایە کە لەوەوە هەرچی ئاوازی مۆسیقای جیهانە دەس پێ دەکا و لە نووسینی مۆسیقادا بەم جۆرەی دوایی (نۆتە)ی لەسەر هەر چوار تەلەکەی بابڵێین (عوود) دەنووسرێ: جا ئیتر ئایا (صول)ی ناوی ئەم گۆرانیبێژە لە کامەیانەوەیەوە.

سۆزەی لە چاپەکانی (گیو/۲، ئوفسێت، گیو/۳): سەوزەی – ئەمەش هەڵەیە و، واتا نادا، وەک لە لێکدانەوەی دوایدا دەردەکەوێ.

سۆزەی (مس) و (عن): بستەی – ئەمیش هەرچەند بەجێیە و دەگونجێ، بەڵام لە تاکە هەڵبەستی تری ئەم پارچە (چامەیە)دا ناوی (بەستە) هاتووە، بەواتە جۆر و چەقەنەیەک کە بەپەنجەی شایەتی هەردوو دەست لێ دەدرێ و تەقەیەک پەیا دەبێ و پێی دەڵێن (پل تەقاندن) وەک لە شوێنی خۆیدا لەمەش دەدوێم لە پەراوێزی (۱۸۰)ی تاکی دوایی.

سۆزە: جۆشێکی دەروونییە و بەشێوەی دەنگێکی بەئاهەنگی لەسەرخۆ سەر هەڵدەدا لە زمانی کوردیدا و بەو دەنگە ئاهەنگدارە لەسەرخۆ و نزمەش دەوترێ وەک سەرەتای بۆ هەستانی گۆرانی وەهایە، یا جۆرە ورتە ورتێک یا ورە ورێکی سازدارە.

وە گۆرانی (هۆرە)ش بە(سۆزە) دەچێ بەڵام وەک شتێ لەو زبرترە وەک (هۆرە) کە بەهاتوهاوار

نییە. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی ٤ و ٢٣ لەسەر سۆز.
وشەی (سۆز) کورتکراوەی ناوی سێ جۆرە مەقامی سەرەکی یاخود سێ ڕێگەی مەقامە، لە مەیدانی گۆرانیبێژی و مۆسیقادا وە یا ناوی ئەو سێ گۆرانییە لە (سۆز)ەوە هاتوون کە ئەوانیش:
یەکەم: سۆزناک – کە ئەمە مەقامێکە لە جۆری (ڕاست) و بەدووبارەکردنەوەی ١٤ دەنگ بەشێوەیەکی تایبەتی پێک دێ و لە (پلە)ی مۆسیقادا (سۆزناک) لە (پلە)ی دەنگی پیتی (سی)ی مۆسیقیدایە و ئەمیش وەک (سۆزە)ی کە ناوم برد هەر بەدەنگ لەراننەوە ئاهەنگێک و ئاهەنگێک لە گۆرانییەکە یا لە مەقامەکە دەبەستێ، بەیەکەوە و (بلا زەڕ کولاه)یشی پێ دەڵێن، چونکی لە هەمان (پلە)ی (زەڕ کولاهدا) دەوترێ بڕوانە لێکدانەوەم لەسەر تاکی (٢٥)ی ئەم هەڵبەستە، پەراوێز لە بارەی (سۆزناک)ەوە.
دووەم: سۆز دلارا – یا – (سۆز دل ئارا) – کە ئەمیش لە خودی خۆیدا هەر لە جۆری (ڕاست)ە، بەڵام لەسەر بەیاتی (دوو گا) و (چوار گا)، کە بریتییە لە چەند مەقامێک و بەڕاوەستانی کورت کورت لە نێوانیاندا و بەشێوەیەکی هونەری پێکەوە دەبەسترێنەوە و، وای لێ دێ کە لەوە بچێ لە (ڕاست) دوورکەوتووەتەوە، بەڵام ئەگەر لە وتنیدا مەقامی (حوسەینی) لەسەر (دوو گا)ی تیا دەربڕێ ئەوە هەر (ڕاست)ێکی ڕووتە کە ئەم جۆری دووەمە وەستایی و شارەزاییەکی وردی پێویستە لە دەربڕینیدا.
ئەمجا جیاوازی لە نێوان ئەم دوو جۆرەی سەرەوەدا ئەوەیە کە لە (سۆز دلارا) وە دەنگی (عەجەم) لە جێی (ئەوج) بەکار دەهێنرێ کە دەنگی سەرەکیی مەقامی (ڕاست)ە و دەنگی (حجاز) لەگەڵ (چوار گا)ی تیا دەردەبڕدرێ، بەڵام (سۆزناک) لە مەقامی (حجازکار)ەوە تورکەکان دەسی پێ دەکەن و عەرەبەکانیش لە (حیجاز) لەسەر (نەوا)وە.
سێیەم: سۆز دڵ کە ئەم لە مەقامی (حجاز) جیا دەبێتەوە، لە پلەکانیدا گەلێ مەقام هەن لەوانە (زیر کولاه یا زەر کولاه) و (کوردی) و (عوشەیران)ن کە ئەمیش بریتییە لە مەقامی (حەسار) لەسەر (پلە)ی (دوو گاه) و لە (حیجاز) لەسەر (پلە)ی (عوشەیران)ەوە وتراوە. کە سۆفی لە ئاکامی ئەندێشەوە لەبەرخۆیەوە (سۆزە) دەکات.
نەسمەجان: ناوی کەسێکی گۆرانیبێژی ئەو کۆڕە بوو کە (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا هێناویەتە مەیدانی نەمرییەوە، بەڵام ئایا ئەم (نەسمەجان)ە کە شارەزای (سۆزە) بووە کە ئەشێ (سۆزە) لەو سەردەمەدا گۆرانی یا مەقامێکی سەربەخۆ بووبێ ئایا ئەو کەسە نێرینە بوو یا مێیینە، هەرچەندە کە بەپێی ناسکیی ناوەکەدا کە گەلی کورد ناوی ناسک لە ئافرەت دەنێ لەوانەیە مێیینە بووبێ، بەڵام هێشتا بەتەواوی بۆم ڕوون نەبووەتەوە.
نەسمەجان (ف): نیم جان.
ڕەقص (ع): هەرچەندە بەواتە (هەڵپەڕین) و (سەما)ش دەگرێتەوە، بەڵام مەبەست لێرەدا

(سووڕ)دان = (دانس)کردنە چونکە کۆڕی ئاوا هەڵپەڕکێی تیا ناکرێ و هەڵپەڕین بۆ شایی و زەماوەند و بەبۆنەی ترەوە ئەبێ. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی/٤.

(رەقص) وەک نووسیم (سەما)ش دەگرێتەوە، ئەمە لە تاکی دواییدا بەدرێژتر لێی دەدوێم. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی ١٨ و ٣٤.

سمکە: ئەم وشەیە کورتکراوەی ناوی (ئیسماعیل، سمایل) یا (سەمین) یا (سامان) یا... هتد و کە لە خۆشەویستیدا (سمکە) یا (سمکۆ) یا (سمە)ی پێ وتراوە کە ئەشێ لەبەر سووکی لە هەڵپەڕیندا و گورجیی لە سەما و سووڕدا لە گورج ڕاگەیاندنی جووڵانەوەکانی سەما و سووڕدا ئەوەندە سووکەڵە و خێرا بووبێ ئەم ناوی (سمکە)یەی لە (سووک)یی ڕاپەڕینە چوستەکانییەوە پێ برابێ، کە ئەمانە هەموو نادیاری و بۆچوونن و هێشتە جێگیر نەکراون لەوە بەولاوە کە ناوی (ڕەقاص)ێک بوو لە ناو کوردەکانی سەردەمی (کوردی)دا. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی/٤، ١٨، ٣٤.

سمکە (نم/١): سمک.

ناز: بەواتە نازکردن لە لایەن ئەو ئافرەتەوە کە گوایە (شەهر ئاشووب)ی سووڕ و سەماکار، کە ئافرەتێک بووە کردوویەتی یا ئەم (شەهر ئاشووب)ە لە نێوان هەموو سووڕدەرەکانی تردا بە(ناز)کارتر بووبێ و پێی بەناوبانگ بووبێ کە ئەمەش هەر لێکدانەوەیەکی بۆچوونە.

ناز: ناوی یەکێکە لە مەقامەکان کە لە سەرچاوەکاندا بە(مەقامێکی تورکی) ناوبراوە کە ناوی مەقامەکە هاوار دەکات ئەو ناوبردنە لە ڕاستییەوە دوورە و چونکە تورک فەرمانڕەوایی عوسمانی بوونە و ئەویش لای بێگانە ناسراو بووە، هەرچی بەرهەمێک یا مەقامێک هی گەلەکانی ژێردەستی بووبێ بە هی تورک دانراوە و ئیتر با مەقامەکە – (کوردی)، (عارەبی) یا (فارسی)ش بووبێ، هەر وتراوە (تورکی)

ئەم مەقامە لەم سەردەمەی (٢١)ز.دا وەک دەستی لێ هەڵگیرابێ وەهایە و نایڵێنەوە؛ چونکی مەقامی (ناز) لە پتر لە دوو مەقام پێک هاتووە و کەمێکیش لەو مەقامانە لای داوە و بۆیە ئێستە لە نێوان مەقاماندا پەسەندی ناکەن و بۆیە نەماوە.

کە ئەم مەقامە ئەو (شەهر ئاشووب)ی سەرێنی (کوردی) چاکی زانیوە و یا خۆی تیایا وەستای هەمووان بووە و ئەمەش زۆر پسپۆڕی و شارەزاییی ئەو (شەهر ئاشووب)ەمان بۆ دەردەخا کە توانیویە گۆرانییەکی ئاوا ئاڵۆزکاو بڵێ.

شەهر ئاشووب: مەقامی (ناز)بێژێکی کورد یا (سووڕ)دەرێکی سەردەمی (کوردی) بووە کە لەو بەزمەدا بۆی گێڕاوینەوە و ناوی بردووە کە وەک نووسیم وتنی ئەو جۆرە مەقامەش نەک شارەزاییی بەشکو دەسەڵاتدارییەکی تایبەتی پێویست بووە، بەسەر مەقامەکانی تردا، تاکو بتوانرێ مەقامێکی ئاوا گێژی ئاڵۆزکاویان لێ دەربهێنرێ کە ئێستە لەبەر ئەو دژواری وتنەی وازی لێ هێنراوە، بەڵام (شەهر ئاشووب) وەک بە(ناز) ناوی دەرکردووە و بەناوی ئافرەت

وەردەگیرێ لەوانەشە (ناز) ناوی پیاوێک بووبێ و زۆرترەکەی لەوە ناچێ کە ئەمە دەقی (ناوی) ئەو کەسە بووبێ بەشکو لە (نازناو) یا ناوی (هونەری)ی = (الاسم الفنی) بووە.
هەروەها کە (نازی شەهر ئاشووب) و (غەمزەی سەرووی ناز)یش لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە، لەوانەیە ناوی دوو ئافرەتی جوانی بەنازی غەمزەکاری کاریگەر و باڵابەرزی وەک (سەروی ناز) بووبێ کە دیسان ئەمەش هەر بۆچوونە ساغ نەبووەتەوە، هەرچەندە ئەمەیان لەوە پتر جێگیرە کە ئەو دوو کەسە (پیاو) نەبووبن. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی/٤.
شەهر ئاشووب (چاپی گیو/٣): شەهر ئاشووب. ئەمیش دەسکاریی (گیو)ە.
غەمزە: چاو داگرتن یا چاو هەڵتەکاندن یا جۆرە نیگایەکی کاریگەری بەنازونووزی دڵگری جوانان. (غەمزە یا غەمماز)یش دەنگی پێنجەمینە لە دوای دەنگی یەکەمی هەر مەقامێکەوە، وەک ئەگەر ڕەنگی یەکەم (ڕاست) بوو (غەمز یا غەمماز)ەکەی (نەوا)یە و... هتد.
سەروی ناز: داری سەروی گوێی ئاو کە نازاو بێ و مەبەست لە بەرزیی باڵای جوانانە و لەرانەوەی بەنازی وەک لەنجە و نازی ئەوان. ئەشێ (سەروی ناز) ناوی یا نازناوی گۆرانیبێژێکی دەنگی غەمزەهێن بی و لەم تاکەدا نازی گۆرانی و نازکردنی سەرووی ناز...
جیناس ئارایی و جوانییە. بڕوانە (ناز) لە پەراوێز لەسەر تاکەکانی ١١ و ٢٣ و ٢٥ و ٢٨.
١٨- ئەم تاکە لە (گل/سەرکارێز) و (بەرباخەڵ) و (مس، ص، ف، ع، کم و چاپەکانی گیو)دا نییە. لە (گل ١٣٠٠) و (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠)دا یانزەیەمین تاکە و لە (عن) و (کۆن)دا شانزەیەمینە و هێشتە چاپ نەکراوە.
سوور: بڕوانە پەراوێزی تاکی چوارەمی ئەم هەڵبەستە و لێکدانەوەکانی ترم لەسەر هەمان تاک و تاکی ٣٤.
بستە: وەک وتمان جۆرە چەقەنەیەکە، بەڵام چەقەنە یا لە دوو پەنجەی گەورە و شایەتیی یەک دەست وە یا بەئامێرێکی مۆسیقا لێ دەدرێ کە دیسان وەک بنکە پیاڵەیەک وایە لە مس و زەرد و ئاسن و... هتد دروست دەکرێتە هەمان هەردوو پەنجەوە، لە هەردوو دەستا بەپێکادانیا لێ دەدرێ، دەنگەکەی تەقەکە بەزرنگاننەوە و چەقەنەش دەنگی تەقەیەکی لێوە دێ.
بەڵام بستە دیسان بەهەردوو پەنجەی شایەتی هەردوو دەس لێ دەدرێ کە بە لەیەک توندکردنی سەرەکانیان و لەپڕ لێک ترازاندییان تەقەیەک دەدا کە ئاوێتەی گۆرانی و مۆسیقە و سوور و سەما دەکرێ، بەپێی ئاهەنگەکانیان و خۆشییەک دەدا و دیارە لە بستە لێدانیشدا بەدەم سوورەوە (گورجی) خاتوون جوانترین و دەنگ بەرزترین و بەئاهەنگترین و ڕێککەوتووترین بستەی پێ بەپێی سووردانەکەی خۆی هونەرمەندانە لێ داوە بەڕادەیەک بەلای کەمەوە لەو کۆڕەدا کە (کوردی) ناوی بردووە کەسێکی تر نەبوو، لە بستە لێداندا هاوتایی ئەو بکا. بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی ١٧ و پەراوێزی ١٩ چەقانە.
بستە: کە بەڕێنووسی کۆن بنووسرێ بە(بەستە)ش دەخوێنرێتەوە کە دوور نییە لە جیناس و

کینایەئاراییدا (کوردی) مەبەستیشی بەستەی گۆرانی بووبێ کەوا سروشتی بەستە لە سروشتی گۆرانی گورجترە، وەک وتوویە (بەستەی گورجی) واتە (بەستەی خێرای) وە (بستەی گورجی) واتە (جۆرە چەقەنە لێدانە گورجەکەی) کە لە ڕاستیشا پێویستە ئەو بستەیەی بەدەم سووڕدانەوە زۆر گورج و خێرا بێ، چونکی دەبێ شان بەشانی جوولانەوە و خۆبادان و خۆهەڵسووڕاندن و لەرزاندنەوە و خۆهەڵتەکاندن و لەنجە گورجەکانی سووڕ و سەماکە بڕوا بەڕێوە (ایقاع) کەواتە ئەو (گورجی)یە لە کاتی سووڕ و سەماکەیدا هەم بەستەی وتووە کە دیارە لە بەستەشدا دەستێکی باڵای بووە و لە (بەستە)ی ئەوانی تر (دڵگیرتر) بووە و هەم (بستە)شی بەپەنجەی بەگورجی (خێرایی) لێ داوە.

گورج: خێرا، بەلەز، چوست...

گورجی: ناوی ئافرەتە، لە کورددا بەتایبەتی ئەو ئافرەتانەی کە هەر لە ساوایی و کاتی ناولێنانیانەوە جوانێتییان پێوە دیار بێ و سپیکەڵە بن، ناویان لێ دەنێن گورجی، واتە وەک خەڵکی (گورجستان)ی سەر بەیەکێتیی سۆڤێتی جاران (گورجستان) لە سەرچاوە نووسراوەکاندا عارەبەکان بە(جۆرجیا) یا (جورجستان)ی ناو دەبەن کە پانتاییەکەی ٧ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیی و پتر لە پێنج ملیۆن کەسی تیا دەژی کۆمارێکە لە (١٥) کۆمارەکەی سەر بەو (یەکێتی)یەی (سۆڤیەتی پێشوو) و ئەم (گورجستان)ە پایتەختەکەی (تفلیس)ە، ئەسکەلەی سەر دەریاشی شاری (باتووم)ە و زمانیشیان ڕووسی، کوردیشی تیایە و ئاینیان ئیسلامە و بەتێکڕایی ئاووهەوایەکی «دەشتی هاوین گەرم و زستان ساردی هەیە».

لە ناو کورداندا بەناوبانگە کە ئافرەتێ جوان بێ پێی دەڵێن دەڵێی گورجییە و ئەشێ ئەم (گورجی)یەی کە (کوردی) ناوی بردووە نازناوەکەی یا ناوە هونەریەکەی (گورجی) بووبێ و پێی ناسرابێ و ناوی خۆی شتێکی تر بووبێ. بڕوانە پەراوێزی سەر ئەم هەڵبەستە.

سوبوک: سووک. سووکەڵە لە جووڵانەوەدا.

خێز: هەڵسان یا ڕاپەڕینە و (سوبوک خێزی) بەواتە گورج یا سووک خۆچەماندنەوە و سووک هەڵسانەوە و ڕاپەڕین و سووک جووڵە واتە ئەوەندە جووڵانەوەکانی سووڕدانەکەی سووک و گورج و کتوپڕی بووە پێی بەناوبانگی وا بووە کە گوایە هامتای کەم بووە ئەویش کە:

شاپەسەن: واتە ئەم شاپەسەنە بووە ئەوەندە (سوبوک خێز) واتە گورجهەستەرەوە بووە لە سووڕ و سەماکەیدا و جا ئەم ئافرەتەش یا ناوی (شاپەسەن) بوو کە لە کوردیدا و لە سولەیمانییش ئەم ناوە زۆر هەبووە و هەیە یا ئەم ناوە نازناوی هونەرمەندیی بووە کە لە سووڕ و سەماکەیدا یەکجار سووکەڵە و گورج و ڕاپەڕ و جووڵانەوەکانی وەک (موفاجەئە)یەک وا بووە کاری لە دڵ کردووە و بۆیە پێوە بەناوبانگ بووە. بڕوانە پەراوێزی سەر ئەم هەڵبەستە و لەناو نەتەوەکاندا هندییەکان بەم گورجیی سەمایە بەناوبانگن.

بۆڕدان: ژێر خستن، بەسەردا زاڵبوون کە گوایە بستە و بستەی گوجی (گورجی) و جووڵانەوە

و ڕاپەڕینە گورجەکانی شاپەسەن کە شتێکی واقیعی و بەچاو دیتراو بوون، هەموو ئەفسوون و ئەفسانە و جادووی ئەو حیلەبازانەیان ژێر خستووە و خستوویەتە دوای خۆیانەوە کە ئەوانە، هەر بیستراون و، وەک هینەکانی (گورجی) و (شاپەسەن) بەبێ حیلە نین و بەبەر چاوەوە نین.
ئەفسوون: ئەو شتانە کە بەچییر دروست دەکرین. و لە سەرگوزشتە و چیرۆکە کۆنەکانماندا، هەن وەک جادوو، واتە بڕوایان پێ ناکرێ (ئەفسوونی) پێ دەڵێن.
جوملە (ع): گشت، هەموو، سەرپاک.
جادو: سیحر.
حیلە: فێڵ، ساختە، تەڵەکە... حیلەباز: فێڵکەر... و ئەم ئەفسوونی جادووکار و حیلەبازە نیشانەیە بۆ ئەوانەی لایەنی فیرعەون بوون دژی مووسا و مووساش بە عەساکەی هەموویانی بۆڕ دا.
١٩- ئەم تاکە لە (گل/سەرکارێز) و (کۆن) و (ص)دا نییە و لە (گل ١٣٠٠)دا دوانزەهەمین تاکە و لە (ف، نم/١، ع، چاپەکانی گیو)دا نۆیەمینە و لە (گلەکان ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا چواردەیەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ)دا شانزەیەمین و لە (عن) و (مس)دا حەڤدەیەمین تاکە و نۆیەمینی چاپ کراوە.
دائیرەی میصری: دائیرە یا دەور یا مودەووەر کە هەرسێکیان لە زانستی مۆسیقادا لە جێگەی یەکتری و بەواتای یەکتری بەکارهاتوون و بەکاردێن، هەرچەندە لەم هەڵبەستەدا تەنیا ناوی (دائرە)کەیان هاتووە و (دەور) و (مودەووەر) نەهاتووە، بەڵام کە لە (دائرە) دەدوێم و لە خوارەوە شی دەکەمەوە وەک: ئەو دوو ناوەکەی ترم شی کردبێتەوە وایە. (دائرە)ش جگە لە واتەی مۆسیقییەکەی بەزۆر واتەی تریش دێ و چونکی من لە پەیکاری مۆسیقییەکەیاندام بۆیە هەر لەم ڕووەیانەوە (دائرە) ورد دەکەمەوە، بەتایبەتی کە لەم تاکەی سەرەوەشدا (دائرە) لەگەڵ (میصری) پێکەوە هاتوون، کەوا بێ (دائرەی میصری) بەپێی سەرچاوە مۆسیقییەکان گەلێ واتە هەڵدەگرێ لەوانە ئەم (چوار) واتەیەی دوایی ئەنووسم:
أ- دائیرەی میصری: مەبەست لە ناوی ئەو جووقە یا تیپی مۆسیقایەیە کە لە سەرێنی (کوردی)دا لە سولەیمانیدا بووە و هاوبەشیی ئەو بەزمەشی کردووە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەرا هەڵدراوە، یا ناوی دەستەی سوور و سەمادەرەکەی لەمەڕ (سمکە)یە، لە ساڵە (سی و چلەکانی چەرخی بیستەم)دا (شێخ لەتیفی حەفید) لە دیواخانەکەیدا تیپێکی گۆرانیبێژی هەبوو، بەناوی (پۆست و ئیدارە)وە. هەروەک جارێکی تریش لە تاکی سێیەمی ئەم هەڵبەستەدا بەیارانی (جان چاوەشی) ناوبردوون کە ئەو (جان چاوەش)ە سەرۆکیان بووە بڕوانە لێکدانەوەکانی ئەو تاکە لەوەی کە پەیوەندی بێرەوە هەیە بەتایبەتی پەراوێزی سەر هەمان تاک و تاکی/٤ کە لەوانەیە (کوردی) مەبەستی بووبێ.
خۆ ئەگەر چاوێک بەهەڵبەستەکانی هۆنەرانی ئەو سەردەمەی (کوردی) پاش ئەودا و بەتایبەتی

بە هی مەولانا خالید و سالمدا بخشێنین، دەبینین کە ناوی (دائرە)یان لە بارەی ئاهەنگ و خۆشیدا بردووە هەرچەندە (ناوی دەستەی سوور و سەماکاریش)مان بەدائرەی میصری ناوبردووە، بەڵام ئەگەر ناوی (جووقی مۆسیقی) لەوانەیە ناوی (تەپڵخانە)ی بابانییەکان بووبێ و ئەم ئاهەنگە ئەوان گێڕابێتیان بە بۆنەیەکەوە.

ب- دائیرەی میصری یا (المدور المصري): ئەمە بریتییە لە ١٢ (نەوار) کە ئەوانیش نیشانەی چواریەکی ماوەیەکی کات (المسافة الزمنية)یە لە مۆسیقادا و ئەم نیشانەی (نەوار)انەش لەسەر نۆتە دەنووسرێ و بەپێی (توندی و خاوی) هەر بڕگەیەکی ئەو نۆتە مۆسیقییە لە (دوم) و (تک) و لەسەر ڕاوێستانن، (سەکەنات)ەکان (لەحنی) تایبەتی و ویستراو دەردەبڕدرێ.

بەڵام سەیر ئەوەیە ئەم ناوی (میصری)یەش بەم دائرەوەیە و کەچی لە ڕاستیشدا ئەم دانانی نیشانەی نەوار و پێکهێنانی دەنگەی ناوم برد، پێی دەڵێن «دائیرەی میصری» لە بنەڕەت (اصل)دا (میصری) نییە و میصرییەکان لە (ئەلحان)ەکانی ئەندەلووسی (ئیسپانی ئێستە) و سووری و تورکییان وەرگرتووە و بەشکو زۆریشیان لە مۆسیقای کورد وەرگرتووە وەک لە گۆرانیبێژی مەزنی بادینانیمان (فەخری بامەڕنی)م بیستووە، زۆربەی گۆرانی و مۆسیقاکانی مامۆستای گەورەی گۆرانی و مۆسیقای میصری، محەمەد عەبدولوەهاب لە ئاوازی گۆرانییەکانی (مەلا کەریم)ی خۆمانەوە وەرگیراون کە هونەرمەند بادینی بەئیستگەی قاهیرەوە لە (محەمەد عەبدولوەهاب)ی بیستووە.

جگە لەم (دائیرەی میصری)یە، جۆرێکی تریش هەیە کە دەور ڕوباعی یا (المُحَّجر المصري) پێ دەڵێن، ئەویش لە (١٤) (نەوار) پێک دێت.

هەروەها لە زانستی مۆسیقیدا گەلێ (دائیرە) یا (مدەوەر) یا (دەور)ی تریش هەن وەکو: (مدەووەر عەرەبی) و (مدەووەر حەلەبی) و (مدەووەر شامی) و (آغر دویر هندی) و (دەور ڕەوان مەولەوی) و (دوور ڕەوان تورکی) و (دەور ڕەوان مەولەویی تورکی) و (اصول دەور کەبیر) و (اصول دەور کەبیر حەلەبی).

وە لەم لێکدانەوەی دووەمەی (دائیرەی میصری)مدا وای بۆ دەچم کە دوور نییە (کوردی) لەگەڵ ئەوەدا مەبەستی لە ناوی ئەو تیپی جووقە مۆسیقییە بووبێ کە لە بەندی (أ)دا لە پێشەوە لێکم دایەوە دوور نییە لە هەمان کاتا کە مەبەستی ئەم (دائیرەی میصری)یەش بووبێ کە لەم بەندی (ب)یەدا لێکم دایەوە کە هەرچەندە ئەو دوو بەندەی دواییش لەم بابەتەوە دەخەمە ڕوو کە:

ج- (دائیرەی میصری) ناوی جۆرە دەفێکی بچکۆلەیە کە؛ تیرە (قطر)ەکەی نزیکەی دوو لەپە دەستێکە و بریتییە لە پێستێکی تەنک بەسەر کەوانەیەکی جغزی (دائیرەیی)دا گیراوە و لە دیویی ناوەوەی چەمەرەی دەفەکەوە پێنج جووت وەک پوولەکەی مسی بەنزیک یا پاڵ پێستەکەوە بەچەمەرەکە بەندکراوە و بەپیاماڵین و لەراننەوەی دەفەکە ئەو پوولەکە (صەنج یا صەننووج)انە دەنگێکی، تریش دێننە گۆڕێ. بڕوانە پەراوێزی ٢٩١ لەسەر تاکی ٢٨ و

پەراوێزی ٣١٣ لەسەر تاکی ٣٠ لە بارەی دەفەوە.
لێرەدا لەوانەیە مەبەستی (کوردی) لەوە بووبێ کە ئەو خاتوو (گەوهەر)ە سوورِ و سەماکەرەی ئەم بەزمە، بەدەستێک (دەف) یا ئەم (دائیرەی میصری)یە و بەدەستەکەی تر (چەقەنە) یا (بستە)ی لێ داوە و پێ بەپێی ئاهەنگی کۆڕەکە دەنگی هەردووکیان لەگەڵ سووڕِداندا سازاندووە و هەرچەندە ئەوەش لێک دەدەمەوە بەوەدا کە (کوردی) لە تاکی پازدەیەمی ڕابووردوودا بەپەراوێزی لێکم دایەوە ناوی (دەف)ی بردووە، ڕەنگ بێ مەبەستی لەم جۆرە (دەف)ە نەبووبێ هەرچەندە لێکدانەوەی تری بەر لە ئێستەش لەسەر ئەم هەڵبەستە نییە، بۆیە ئەم لێکدانەوەیە وەک بۆچوونێک دانا بوونی لە نەبوونی چاکترە.
د- (دائیرەی میصری) دوا واتە یا دوا جۆرێک کە لەسەر (دائیرەی میصری) لێکی دەدەمەوە ئەوەیە کە ئەو (دائیرەی میصری)یە، بەواتە (چەقەنە)ش لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە ئەم (چەقەنە)یەش بەوەدا هەر لەم تاکە هەڵبەستەدا (ناوی) هاتووە وەک لە دواوە لێکی دەدەمەوە، بۆیە وای بۆ دەچم کە بەزۆری و بەشکو هەر لە بن (کوردی) مەبەستی لەم جۆرە (دائیرەی میصری)یە، واتە (چەقەنە)یە نەبووبێ و مەبەستی تەنیا لە لێکدانەوەی واتەی (دائیرەی میصری) جۆری یەکەم و دووەم بووبێ کە لە بەندی (أ) و (ب)دا شیم کردنەوە. بڕوانە پەراوێزی تاکی ٢٧ لەسەر کووس.
چەقانە: بەواتە (بستە)یە کە (بستە) جۆرە تەقە هەڵساندنێکە، بەلێک توندکردنی هەردوو پەنجەی شایەتی (دۆشاوەژە) و لەپڕ لێک ترازاندنیان وەک لە پێشەوە لە پەراوێزی تاکی (١٨)دایە، بەڵام بێ گومان مەبەستی (کوردی) لێرەدا لە (بستە) نییە و، چونکی لە تاکی ناوبراودا بە(ناو) ناوی بستەی بردووە کەواتە:
چەقانە: دەنگێکی (تەقە)ی وەک دەنگی بستە هەڵساندنە بەلێک توندکردنی هەردوو پەنجەی شایەتی (دۆشاوەژە) و (پەنجە گەورە) و لەپڕ بەهێزەوە لێک ترازاندنیانە کە ئەمە بەیەک دەست ناکرێ نەک وەک بستە بە دوو دەست بەشکو ئەم جۆرە چەقەنە لێدانە لە هەمان کاتدا بەدوو دەستی هەریەکەی لە لایەک و بەجیا چەقەنە لێ دەدەی کە دوور نییە (کوردی) لە (چەقانە) وە یا (چەقەنە) مەبەستی لەم جۆرە بووبێ کە ئەمەیان جۆرێکی زۆر کۆن و سەرەتاییە لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا لە هەموو جیهاندا وەک بڵێی بەپێکهێنانی ئەم جۆرە (چەقەنە)یە وەک هەست بەخۆشی و سەرکەوتن و بە کام گەیشتنێکە و ئەمجا هەر ئەمەش لە کۆڕی ئاهەنگ و بەزم و خۆشی و گۆرانی و مۆسیقەکاندا بەکارهێنراوە و دەهێنرێت، هەروەک جۆرێکی تریش لە (چەقەنە یا چەقانە) هەیە کە:
چەقانە: دوو پارچە مس یا زەرد یا ئاسنی خڕی بچووکی تەنکە کە تیرە (قطر)ی هەریەکەیان تا شەش سانتیمێک دەبێ و ناوەندەکەی قۆقزە و هەریەکەی قوڵفەیەکیان بەدیوی دەرەوەی (قۆقزی)یەکەیانەوە هەیە کە یەکێکیان دەکرێتە دوو پەنجە گەورەی شایەتی هەر دەستێکەوە

واتە دوو پەنجــەی چەقـەنـە لێـدانەوە و (ئـەو دوو پارچەیە) بـەپێی ئاهـەنـگ و دەنگی گـۆرانی یا مـۆسـیـقـای تـر یا پاڵ بەپاڵ جـوولانەوەکـانی سـوور و سـەمـا ئەو دوو پارچەیە پێکا دەدرێن و دەنگێکی چەکچەکەییی خۆش و ساز و لەباریان لێ هەڵدەسێ و ئەمەش هەر لە یەک دەستدا نابێ، بەشکو لە هەردوو دەستا بەکار دەبرێن و لەوانەیە کە (کوردی) مەبەسی ئەمەیان بووبێ، چونکە ئەم جۆرە ئامێرە مۆسیقییە کۆنە و بەر لە سەرێنی ئەویشە، کە لە عارەبیدا (صەنج یا صەنووج)ی پێ دەڵێن وەک لە شوێنی تری لێکدانەوە لەسەر ئەم هەڵبەستەدا دێمەوە سەر ئەم (صەنج)ە. بڕوانە پەراوێزی تاکی ٢٧ لە بارەی (کووس)دا.

چەقـانـە (ف) و (گل/بەربـاخـەڵ): چەغـانـە - هـەرچەندە کـە بەوەش دەچێ کـە هـەردوو ناوی (چەقـانە) و (چەغـانـە) یەک بن وە یا لە یەکـەوە هاتبن بەڵام لەوانەدا جیـان، چونکە (چەغـانـە) جۆرە ئامـێرێکی مۆسـیقییە لـە بەشـە تەلدارەکانیـان و بەم پێیـە جێی خـۆیەتی کـە بنووسـم (کوردی) ڕەنگە مەبەستی لێرەدا یا دەقی وتنەکەی (چەغانە)ش بووبێ نەک (چەقانە) و بەڵام، چونکە زۆربەی سـەرچاوە دەستنووسـەکان (چەغانە)یان نەنووسیوە و بەشکو تەنیا ئەو دوو سەرچاوەیەی دیاریمان کردن (چەغانە)یان نووسیوە بۆیە لە سەرەوە جێگیرم نەکرد بە(بنکە) بۆ ئەم تاکە.

هەروەها (فـەرهـەنگی طەلائی) دەڵێ (چەغـانە) ناوی جـۆرە ئاوازێکی خـۆشیی مـۆسـیقـیشـە. ئەمجا بۆ مۆسیقا و ئاواز دۆستێکی وەک (کوردی) کە زۆریش شارەزا و پسپۆڕ بووە تیایا بەدووری نازانم کە مەبەستی لەم جۆرە ئاواز یا ئامێرەی مۆسیقییای (چەغانە)ش بووبێ.

دائیـرەی مـیـصـری و چـەقانەی (ف، کم، نم/١، دیوانی کوردییـەکـانی چاپی گـیو): دائیـرەی میصری چەقانە - بەڵام لە هەموو سەرچاوەکانی تراد وەک لە سەرەوە جێگیرم کردووە وایە و ئەمـەی ئـەم سـەرچاوانەش لـە هەڵەی دەسـتـی و چاو لەیەک کـردن و لـەبەریەک نووسـینەوەوە، هـاتوون کە (واو)ی دوای (مـیصری) و (یی)ی دوای (چەقانەی)یـان نەنووسیوە و لە کاگردەڵێدا (چەغانە)یە.

گـەوهـەر: ناوی ئەو ئافـرەتە هونەرمـەندە دەفژەن و چەقـەنە لێـدەرە بووە لەو کۆڕی بەزمـەدا کـە (کـوردی) لەم هەڵبـەسـتـەیدا ناوی بردووە، دیارە ئەم هونـەرمـەندەشـمـان تایبـەتی بـووە لە بەکارهێنانی ئەو دوو جـۆرە ئامێرە مـۆسیـقـییەی (دەف) و (چەقـانە یا چەغانە)دا وە هەروەها چەقـەنە و سووریشی زۆر جـوان و چاک و دڵگیرانە بەشـارەزاییـەوە زانیوە و بۆیە لەو بـەزمەدا هەڵبـژێردراوە. بڕوانە پـەراوێز لەسـەر تـاکی چوارەمی ئەم هـەڵبـەسـتـە لە پێـشـەوە لە بارەی فامیلیای ئەم خـاتوو (گەوهـەر)ەوە.

لەنجـە: خـۆبادان و لارەکـەکـردنی بەناز لە سـوور و سـەمـاکـەدا، یا لـە ڕۆیشتن و جـووڵانەوەی ئاسـاییـدا کـە ئەم (لەنجـە)یە لە ناو هەمـوواندا هونـەرمـەند (خـاتوو سـەمـەن) سـەردەسـتـە و لێهاتووتر بووە.

سەمەن: ناوی ئافرەتێکی هونەرمەندی سوور و سەمادەری ئەو بەزمە بووە کە لەم هەڵبەستەدا ناوی هاتووە و گومان لەوەدا نییە کە لە سوور و سەماکردنەکەیدا لەو (لەنجە)یەی ئەم کردوویەتی کەسی تر لە ئەندامەکانی ئەو تیپی سەما و سوورە نەیانگەیاندووەتە ئەم و، هاوتاییان نەکردووە و (لەنجە) ڕواڵەتێکی زۆر دیاری بووە لە سوور و سەماکردنەکەیدا کە ئەمەش هونەرمەندییەکی تایبەتی و بەتەواوی ڕۆچوونی هونەرەکەیە کەوا توانیویە لەشولاری خۆی و جوانییەکەی خۆی لەگەڵ ئەو جۆرە جووڵانەوە (لەنجە)یەدا لە سوور و سەماکەیدا بەو جۆرە بگونجێ و چەندی لەسەرە.
چاوش: وە یا چاوەش بڕوانە پەراوێزی تاکە هەڵبەستی سێیەمینی ئەم هەڵبەستە. وە ڕەنگە لێرەدا کە ناوی بردووە مەبەس لە سەرەکی ئەو دەستەی سوور و سەماکارەش بێ کە لەسەر پەراوێزی تاکی چوارەم لێکم دایەوە و، گوایە ئەم چاوەشەی پێ مەبەست لە (سمکە) بێت وە یا ئەشێ چاوەش ناو یا نازناوی کەسێک بووبێ گۆرانیبێژ و دەنگخۆش کە (کوردی) ئاواتی خواستوو، بەدەنگی ئەو (بەڵا) تاوێک واز لە گیانی (کوردی) بهێنێ و، یا دەنگی ئەم چاوەشە مەبەست لە دەنگی سەرەکیی سەماکارەکان بێ کە دەنگیان لێ بکا، بۆ پتر هونەرمەندی نواندن و گەرمکردنی بەزمەکەیە واتە بەو دەنگی چاوەشە بەڵا وازی لە گیانی (کوردی) هێناوە.
بێو: بابێتو، ئەو بێت.
بێو (ف، کم، نم/١ و چاپەکانی دیوانی کوردی گیو: کە ئەمەش هەڵەیە و لە هەموو سەرچاوە دەستنووسەکانی تردا (بێو) نووسراوە.
بەڵا: ئەگەر ئەم وشەی (بەڵا)یە بەوشەیەکی زمانی کوردی وەربگرین ئەوا واتەی (بەڵام) دەدا وە ئەگەر وەک ڕێنووسی کۆن کە بەشێوەی (بلا) دەنووسرێ وەری بگرین ئەوا واتەی (دەبا) دەدا جگە لەم دووانەیەش (بەڵا) ئەگەر بەوشەیەکی زمانی عارەبی وەربگرین، ئەوا چورتم و گێچەڵدا، تووشبوونی دەر و دەشتی خراپی و لێقەومان دەگەیەنێ و بەهەریەکێ لەم وشانەش ئەم تاکە هەڵبەستە واتەی تەواوی و جوان و گونجاوی خۆی دەدا کە ئەمەش وەستایی و وردەکاریی (کوردی) لە هونەرمەندی هەڵبەستدانانەدا و شارەزاییەتیی لە زماندا و دەربڕینی کەمیەتیی وشە بەگەیاندنی واتەی زۆر لە دوو وشەکەیە.
تاوێ: دەمێ، واتەی گوڕسەندنیش دەدا کە بۆ ئێرە ناگونجێ.
تاوێ (کم، نم، چاپەکانی گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): هاوێتە – کە ئەمەش وەک واتا نادات و لە سەرچاوە دەستنووسە کۆنەکانی تردا هاتووە و ڕاستە.
تاوێ (ف): هادێتە – ئەمیش دیسان هەر ناڕاستە.
بێ نێ واز: واز بهێنێ، لێی بگەڕێ، دەستی لێ هەڵگرێ.
بێ نێ واز: بەبێ نازونووز، (نەواز = نازونووز)ە کە ئەو واتایانە هەموو بۆ ئەم تاکە دەگونجێن، بەڵام واز بێنەکە (پتر) دەگونجێ.

بێ نێ واز (کم، نم، چاپی گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): بێ نەواز = نەواز: ناوی جۆرە (صەبا)یێکە و یەکێکە لەو مەقامانەی کە بەسەر (دوو گا)وە دەگیرسێنەوە.

بێ نێ واز (ف): بێ بواز – ئەمیش دیارە هەڵەی نووسینە.

تێبینی:

هەرچەندە شێوازییەک لەم تاکە هەڵبەستەدا ڕەچاو دەکرێت، بەڵام بەهۆی زۆری سەرچاوەوە توانیم وەک لە دوا دوای پەراوێزی ئەم تاکە هەڵبەستەدا وردم کردەوە، توانیم بە(واو) و (یێ)یەک دەقێکی ڕاستتر و گونجاوتر بەدەست بهێنم وەک لە سەرەوە لە نیو باڵی یەکەمدا جێگیرم کردووە کە بەلامەوە وایە ئەگەر وەک خودی دەقی وتنەکەی (کوردی) نەبێ لێوەی نزیک بووەتەوە، یا هیچ نەبێ واتایەک دەدات کە لەگەڵ تێکڕای هەڵبەستەکەدا بگونجێ.

بەڵام نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرم هەوڵ لەگەڵ دا، لەسەر تیشکی ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستدان کەچی هێشتە وەک جێی خۆی نەبێ یا جێی خۆی نەگرتبێتەوە یا ئەم دوو نیو باڵە وەک هەریەکە نیو باڵی تاکێکی تر بووبن، لێرەدا وای لێ هاتووە هاکا بڵێم لە وتنی (کوردی) ناچێ و ئەم نیو باڵی دووەمە لەوە دەچێ کە ئەو چاوەشە پیرە گۆرانیبێژێکی دەنگ هەوتووی گەپەگەپکاری ناخۆش بووبێ بۆیە (کوردی) وتوویە با دەنگی ئەو بێ بۆ گەرمکردنی ئاهەنگەکە کە ئەوی تیا وەستاکار و شارەزای ڕێکخستنی بووە و دیسان (کوردی) ئاواتی ئەوە بووە کە دەنگی گڕی کەوتووی ئەو تاوێ واز لە گیانی بهێنێ، چونکی لەبەر پیری دەنگەکەی نەشاز بووە. ئیتر ئەم تاکە یەکێکە لە چەند تاکێکی تری ئەم هەڵبەستە وەک بڵێی لە هی (کوردی) ناکەن.

٢٠– ئەم تاکە لە (مس)، (ص)، (ف)، (نم/١)، (ع)، (کم و چاپەکانی گیو)دا نییە وە لە (گل ١٣٠٠) و (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠) و (گل/سەرکاریز)دا سیانزەیەمین تاک و لە (گل/بەرباخەڵ) و (کۆن)دا حەڤدەیەمینە و لە (عن)دا هەژدەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هێشتە چاپ نەکراوە.

نازەنین: نازدار، لەبەر جوانی وای لێ هاتووە کە نازی بکێشرێ، جوان.

نازەنین: ناوی مەقامێکی تایبەتە و زۆر لە مەقامی (بەیاتی عوریان) دەکات و لەسەر (پلە)ی (دوو گا) دەگیرسێتەوە.

بەڵام (بەیاتی عوریان)یش ناو یا زاراوەیەکی تایبەتیە بەجۆرە مەقامێکەوە کە ئەویش هەر لەسەر (پلە)ی (دوو گا) دەگێرسێتەوە. بەئاوێتەکردنی ئاوازێک لە ڕەگەزی مەقامی (کورد).

هەرچی وەک ئەم مەقامی (نازەنین)ەیە، مەقامێکی زۆر زۆر کۆنە و سەرچاوەکان بەبێ ئەوەی تەنیا لە ناوەکەی بیرێک وەربگرن کە دەبێ هی کام گەل بێ کەچی وتوویانە مەقامێکی تورکە و ئەو وتنەشیان دیارە هەڵەیە چونکی هی (کورد) و (فارس)ە و ئێستە ناوترێ و هەر تەنیا (ناوی) لە هەندێ پەڕاوی مۆسیقیدا ماوەتەوە و تورکیش وتوویەتی.

دیارە ئەم مـەقـامـە لە سـەرێنی (کوردی)دا یـا هەتا ئەو سـەردەمـەش هەر باو بووە کـە (خـاتوو نازەنین) وەسـتا و شـارەزای وتنی ئەم مەقـامە بووە و ئەشـێ لەبەر ئاڵۆزی یا ئەوەندە وەسـتـایی ویسـتـووە لە وتنیـدا لەبەر نزیکایەتی لە مـەقـامـەکانی ترەوە ئێسـتـە ناوترێ. کە ئـەمـەش زۆر پسـپۆڕیـی ئەو خـاتوو نازەنینەمـان بۆ دیاری دەکا کە توانیـویەتی گۆرانی یا مـەقـامـێکی ئاوا ئاڵۆز و ناسک بڵێ.

نازەنین: ئەم (نازەنین)ە لە واتەدا جیایە لەگەڵ ئەو دوو لێکدانەوەیەی تر، چونکی ئەمیان ناوی ئافـرەتێک بووە لە دەنگخـۆشـەکـانی ئەو سـەردەمـەوە ئەشـێ لـەبەر جـوانییـەکەی پێی وترابێ نازەنین کـە ئەوەندە نازدار بووە وە یا نازناوی هـونەریی ئەو ئافرەتە بـووە سـا ئیتـر لەبەر هەر شتێ بێ نازەنینی پـێ وتراوە وەک (کوردی) لێرەدا ناوی بردووە و گۆرانیبێژێکی ناو ئەو کۆڕە بووە کە لێی دواوە و بەتایبـەتی وەک لـە لێکدانەوەی (نازەنین)ی سـەرەوەدا نووسـیـومـە لە وتنی مـەقامـێکدا شـارەزا بووە کە هاوناوی  ناوی خـۆی (نازەنین)ە و لەوانەیە هـەر خـۆیشـی تایبـەتی بووبێ بەوتنی ئەو مەقامە دانسقەیەوە کە ئێستە نەماوە و لەبەر ئەوە پێی وترابێ نازەنین.

لێرەدا جـوانی لە ڕێکەوتی هەردوو ناوی مەقـامی (نازەنین) و خـاتوو (نازەنین)ی گۆرانیبـێژدا و لەگـەڵ نازەنینی جـوانیـدا کـە (کـوردی) وەسـتـایی نـواندووە، وەک لە گـورج و گـورجی و... هتدیشدا...

دڵگوشا: بەواتە دڵکەرەوە یا ئەوی دڵی پێ خۆش دەبێ یا دڵخۆشکەر.

دڵگوشـا: جگە لەم واتانەشی نـاوی، یەکـێکە لە مـەقـامـە تایبـەتیـیـەکـان کـە زۆر لە مـەقـامی (سۆزناک) دەکا و بەهەمان ڕێگەی مەقامی (سۆزناک) دەوترێ.

ئەم (دڵگوشـا)یە، یەکێکە لە مـەقـامـەکانی سـەرێنی (کوردی) کە ئەمـیش بەهەڵە بە(مـەقـامی تورکی) لە ناو سەرچاوەکاندا ناوبراوە و ئێستە ئەم مەقامە ناوترێ و باوی نەماوە و ناوەکەی هـاوار دەکا لە کـوردییـە و هـەتا سـەرێنی (کـوردی)ش هـەر باوی هەبووە. بەڵام مـەقـامـێک بووە لەبەر گرانـی و پێویسـتـی شـارەزایی لە وتنیدا هـەمـوو کەس لە گۆرانیـبـێژان یا مـەقـامـزانان پرکێشـیـی وتنی ئەم مـەقامەی نەکردووە و ئەمـەش وەسـتـاییی ئەو (خـاتوو دڵگوشـا)یەمـان پێ ڕادەگەیەنێ کە (کوردی) لەگەڵ یەکدا ناوی بردوون، و شـارەزای داناون، من پێم وایە کـە وەک بناغەیەک بۆ مێژووی مەقامە کوردییەکانی بۆ تۆمار کردووین.

دڵگوشـا: جگە لەو دوو جـۆرە لێکدانـەوەیەی کە لە سـەرەوەن، ئەم نـاوی (دڵگوشـا)یە بەجـۆرێکی تریش لەم تاکە هەڵبـەستەدا هاتووە کەوا لێرەدا جیا لەو لێکدانانەوەمان لێکی دەدەمەوە، کە ئەمیش ناوی ئافـرەتێکی تری هونەرمەندی سـەرێنی (کوردی)مان بووە، کە ئەمەش ڕێکەوتێکی جـوانە کـە هـەردوو نـاو لە یەک تاکـدا و هـەریەکـەی بەجـۆرە واتەیـەک هـاتوون، بەڵام لێـرەدا ئەو (خـاتوو دڵگوشـا)یەیە کـە (کـوردی) بـۆی نـەمـر کـردووین، کـەوا وەسـتـای ئەم مـەقـامـە کـۆنە دانسقەیە بووە، وەک لە لێکدانەوەی پێشوودا وەستایی و پسپۆڕیی ئەمم گەیاند.

هەرچەندە ئەشێ وشەی دڵگوشا (نازناو)ی ئەم ئافرەتەش بووبێ (ناوی هونەری) کە لەبەر هەر هۆیەکی وەک شارەزایی لە وتنی ئەم گۆرانییەدا یا لەبەر جوانێتی و یا... هتد وای پێ وتراوە یا لەبەر چاک چڕینی ئەو مەقامە ناوی مەقامەکەی دراوەتێ.
لایق: شایان، شایستە، (لایقن = شایانن)... واتە ئەو دوو گۆرانی (نازەنین) و (دڵگوشا)یە یا ئەو دوو ئافرەتە گۆرانیبێژی (نازەنین) و (دڵگوشا)یە، شایستەی ئەوەن کەوا دوا بەدوای ئەوان خوسرەو تێ هەڵکاتە مەقامی (شاهناز) ئەمەش (مەدحە) بۆ ئەو خوسرەوە و مەزنییە بۆ ئەو لەگەڵ (مەدحی) ئەم دوو ئافرەتە.
گەر تێ چڕێ: ئەگەر تێ هەڵکا، دەسکاتە گۆرانی وتن، تێ هەڵچێ.
خوسرەو: ناوی گۆرانیبێژێکی پیاوی سەردەمی (کوردی) بووە، کە لەم هەڵبەستەدا ناوی پارێزراوە لەبەر شایانێتیی خۆی کە ئەوەندە وەستا و پسپۆڕ بووە لە وتنی ئاوا گۆرانی یا مەقامێکی زۆر ورد و دانسقەی وەک (شاهناز)دا کە لە ناو ئەو هەموو گۆرانیبێژانەدا ئەمی بەبێژەری سەردەستەی ئەم گۆرانییە داناوە و ئەمەندە بەڕێز بووە کە مەگەر یەکێکی وەک ئەم لایقی تێچڕین بووە بەدوای نازەنین و دڵگوشاوە.
شاهناز: ئەگەر لە ڕووی زمانییەوە بڕوانینە ئەم وشەیە ئەوا واتەی پاشای نازدار یا نازی پاشا وە یا پاشای نازەنین ئەدا، بەڵام لە ڕاستیدا (شاهناز) ناوی مەقامێکە کە ئەویش مەبەستی لە مەقامی ئەم تاکە هەڵبەستەیە و ئەشێ ناوی ئافرەتێکی مەقامبێژ بێ.
لە (نۆتە)ی مۆسیقیدا، ئەم مەقامە بەرامبەرە بە(دوو دییز) کە وەک لە لێکدانەوەی مەقامی (حیجاز)دا لەسەر تاکی (٢٢)هەمی ئەم هەڵبەستە لە دواوە لێکی دەدەینەوە، ئەم مەقامە بەدەربڕینی ڕەگەزی دەنگی (ڕاست) لەسەر (پلە)ی (نەوا) و (سێگا) پێک دێ، بەڵام بەجۆرە دەربڕینێکی تایبەتی وەستایانە کە لانەدا، بەملا و ئەولادا و بێژەرەکەی هەر تەنیا لەسەر ڕاستە ڕێگەی ئەم (شاهناز)ە بڕوات.
کەواتە (شاهناز) مەقامێکی تایبەتە، بەڵام وەک (حیجاز) لە (موحەییەر) و (بوسلیک) لەو دوو (پلە)یەدا بەسەر شوێنەکانی خۆیەوە ناگیرسێتەوە.
ئەم مەقامی (شاهناز) یا (شاناز)ە لە هەمان کاتا وەڵامی دەنگی مەقامی (زەر کولاه)ە و عارەبەکانیش هەر ئەم مەقامەیان بەناوی (شەهناز)ەوە وەرگرتووە، کە ئەم مەقامە بەتەلی پێنجەمی عوود دەرئەبڕدرێت و بەدوای دەنگی (گەردان)دا دێت.
دەنگی (شەهناز) بریتییە لە هاوارێکی ئەو نەغمەیەی کە پێی ئەوترێ (زەر کولاه) و لە ناوەندی هەردوو نەغمەی (یەک گا = یەگا) و (دوو گا)دایە.
ئەم مەقامی (شەهناز)ە بەنەرمییەکی (نارێک = غیر منظم)ی حیجاز ئامێزی و لەسەر نەغمەی (حوسەینی) دەڕوات وەک نەغمەی پەتی (دوو گا)ش وایە چونکی لەسەر (دوو گا) دەگیرسێتەوە.

٢١- ئەم تاکە لە (کۆن) و (مس)، (ص)، (ف)، (نم/١)، (کم) و چاپەکانی (گیو/٢) و (ئۆفسێت) و (گیو/٣)دا نییە وە لە (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠)دا دوانزەیەمین تاکە لە (گل/بەرباخەڵ)دا هەژدەیەمین و لە (عن)دا نۆزدەیەمینە و هێشتە چاپ نەکراوە.

چنگی: واتە دەس و پەنجەی و (کوردی) جیناس ئارایی نواندووە، بەناوبردنی (چنگی) و (چەنگ) و (دەنگ)دا کە لە وێژەی کۆندا وەستاییە.

ئەصغەر: ناوی مۆسیقاژەنێکی ئەو کۆڕە بوو کە لەم هەڵبەستەدا ڕوون کراوەتەوە و ئەمیش تایبەت بوو بەلێدانی ئامێرێکی مۆسیقاوە کە (چەنگ) و کە (صەد دەنگ) لێ بدای لەگەڵدا وتووە، مەبەستی ئەو (صەد دەنگ)ە هەڵبژێردراوەیە لە گۆرانییەکاندا کە گوایە (باربود)ی گۆرانیبێژ لە ناو هەموو گۆرانییەکاندا لە سەرێنی (خوسرەوی پەروێز)دا صەد گۆرانی یا صەد دەنگ یا صەد لەحنی هەڵبژاردووە لەو صەد لەحنەش (٣٠) دەنگ یا لەحنیانی هەڵبژاردووە کە بەتایبەتی بۆ خوسرەوی وتوون بەمۆسیقەوە و ئەو (صەد) یا (٣٠) لەحنەی لە مەجلیسەکەیدا لێ داوە بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی سی وسێیەمین لە بارەی (باربود)ەوە کە (کوردی) لێرەدا، نیشانەی بۆ ئەو صەد ئاوازە کردووە (ئەصغەر)ی هاوتا کردووە بەو (باربود)ە، بەناوبانگەی ئەمیش لە شارەزایی (ئەصغەر)ەوە بووە دووریش نییە کە (سەید عەلی ئەصغەر)ی گۆرانیبێژ لە بەرەی ئەم بلیمەتە بووبێ؛ چونکی وەکو دەزانرێ کە سەید عەلی ئەصغەر بەبەرە دەنگخۆش بوون و ڕەنگە شوێنێکی لە باپیرەکانی خۆی بە(ناو) گرتبێتەوە.

چەنگ: واتە چنگ. بەڵام مەبەس لە ناوی ئامێرێکی مۆسیقی کۆنە لە جۆر و تەلییەکان کە بەچنگ (دەس و پەنجە) لێ ئەدرێ و بۆیە ناوی (چەنگ)ی لێ نراوە. هەروەها بەهەڵە لە هەندێ سەرچاوەشدا هاتووە کە (چەنگ) واتە (دەف) و ئەو هەڵەیەش ڕەنگە لەوەوە بێ کە (دەف)یش بەچنگ دەگیرێ و بەچنگیش لێ دەدرێ. بڕوانە پەراوێز لە تاکی پازدەیەمیندا لەسەر (چەنگ).

صەد دەنگ: بنواڕە پەراوێز لەسەر ئەم تاکە لە پێشەوە کە صەد جۆرە دەنگی مەبەست نییە، بەشکو مەبەستی لە صەد ئاوازەکەی (گۆرانیبێژی کۆن باربود)ە.

دەنگ (گل/بەرباخەڵ): ڕەنگ.

پێ بەپێی: پاڵ بەپاڵ، شان بەشانی وە تا لەگەڵیا ڕاست بێتەوە.

دەربچێ: واتە وەک ئەو بڕوات بەڕێوە گوایە دەنگی (ساز) و (چەنگ)ەکە.

ئاواز: دەنگی خۆش، دەنگ.

ساز: ناوی جۆرە ئامێرێکی مۆسیقی و جۆرە گۆرانییەکیشە و بڕوانە پەراوێزی تاکی سێیەمی ئەم هەڵبەستە لە پێشەوە لەگەڵ پەراوێزەکانی لەسەر تاکەکانی (١ و ١٥ و ٢٣) لە بارەی (ساز)ەوە.

گوڵبەیاز: ناوی ئافرەتێکی هونەرمەندی سەرێنی (کوردی) و شارەزای ئاوازی (ساز) وتن یا لە لێدانی ئامێری مۆسیقای (ساز)دا وەستا بووە. وە یا ئاوازەکەی ساز بووە، بۆ هەر گۆرانییەک

بەتایبەتی لە هەر ١٠٠ گۆرانییەکەی (باربود)دا کە توانیویە لەگەڵ لێدانی چەنگی ئەصغەردا لەسەر هەریەکێ لەو صەد دەنگە ئەویش بەئاوازی سازی خۆی لەگەڵیدا دەرچێ.

٢٢- ئەم تاکە لە (گل ١٣٠٠)دا نییە و لە (ف) و (مینا) و (ع) و (کم) و چاپەکانی (گیو)دا یانزەهەمینە و لە (گل/سەرکارێز)دا چواردەیەمینە و لە (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠)دا پانزەهەمینە و لە (ص)دا حەڤدەیەمین تاکە و لە (کۆن) و (گل/بەرباخەڵ) و (مس)دا هەژدەیەمینە و لە (عن)دا بیستەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و یانزەمینی چاپ کراوە وە لە دەربڕینی نیو باڵی دووەمیدا، ئەگەر بەشارەزایی نەبێ، لەنگ دیارە، هەر لە نزیک واتای ئەم تاکە هەڵبەستەشەوە (حەریق ١٢٨٢ - ١٣٢٧ک) وتوویە:

(نەوا)ی ناڵەی (حەزین)م (ڕاست)ە وەکو قافڵەی (حیجاز)ی دێ

وەرە سەر سەیری بەزمی سۆزش و (شۆر)ی مەقاماتم

کە ئەگەر لە هۆنراوەکانی هۆنەرانمان بتۆژینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە بەزۆری شارەزای مەقامە کوردییەکان و ئاواز و مۆسیقاکان بوون.

مستۆ: سووککراوەی ناوی (مستەفا)یە کە لەبەر خۆشەویستی لە کوردیدا دەکرێ و ئەم (مستۆ)یە گۆرانیبێژێکی سەردەمی (کوردی) بووە، کە زۆر شارەزای وتنی مەقامی (ئیبراهیمی) نەبووایە، (کوردی) پێکەوە ناوی نەدەبردن.

ئیبراهیمی: ناوی یەکێکە لە مەقامەکان.

تێبینی:

من وەهای بۆ دەچم (کوردی) لەناوبردنی (گۆرانی) یا (مەقام)ەکاندا بەستنیانەوە بەشارەزاییی ئەم یا ئەو گۆرانیبێژیانەوە کە ئەو گۆرانی یا مەقامبێژە لەوەیاندا شارەزا و (وەستا)تر بووە ئەگەر نا ڕواڵەتێکی ئاشکرایە کە هەر گۆرانیبێژێک گەلێ لە مەقام و بەستە و جۆرەها گۆرانی و تەنانەت هی زمانی بێگانەیشی زانیوە و دەزانێ، بەڵام توانای زۆرتری لەوەیاندا بووە کە (کوردی) لێی دواوە و بەو کارەی هەم ناوی چەندین گۆرانی و بەستە و مەقام و سروودبێژی کورد و هەم زۆرترین ناوی ئەم ستران و سروود و گۆرانی و مەقاماتەکەیشی ڕاگەیاندووە کە لە کوردەواریدا باو بوون؛ وەک هەر مشتەی لە خەرواری.

ئەوڕەحمان: سووککراوەی ناوی (عەبدولڕەحمان)ە و ئەمیش گۆرانیبێژێکی (نەوا)زانی ناو کۆڕەکە بووە.

ئەوڕەحمان (گیوەکان): ئاوڕەحمان - لە کوردیدا ئاوڕەحمان ناودەبرێ و دەسکارییە و ویستوویە هەر چۆنێ بێ لە ناوە (عەرەبی)یەکەی دوور بخاتەوە.

نەوا: ناوی مەقامێکی کۆنە و لە نەزانینەوە هەندێ لە سەرچاوەکان بەمەقامێکی (تورکی)یان ناوبردووە، بەبێ ئەوەی بزانن ئایا تەنانەت ناوەکەی تورکییە؟ و ئەم مەقامە ئێستەش دەوترێ، لە هەمان کاتیشا (نەوا) کە عارەبەکان (نەواه)ی پێ دەڵێن، ئەم وشە یا ناوی تەلی چوارەمی

عووده، هەروەک ناوی نەغمەیەکی تایبەتیە کە لە نێوان نەغمەکاندا پێنجەمین دەنگە کە لە ناوەڕاستییەوە بەرەو بەرزبوونەوە هەڵدەسێ کەوا لە پێشدا لە (یەک گا) یا (ڕاست)ەوە دەس پێ دەکات. وە دەنگی ئەم نەغمەی (نەوا)یە لەسەر (دوو گا) جێگیر دەبێ و پێی دەڵێن (مەقامی نەوا) و ئەمیش یەکێکە لە مەقامە تێکەڵ و ئاوێتەکان کە لە سەرەتاوە بە(حیجاز)ی (نەوا)وە بەرەو تیژی و لە هەڵسانێکی دەنگی ڕەگەزی (ڕاست یا یەک گا)وە بەرەو (دوو گا) دەبێتەوە و (تەسلیم)ەکەی بەڕەگەزی دەنگی (بەیات) دەبێ کەواتە هەر بەناوەکەیدا کوردی بووە.

فەتحی: ناوی گۆرانیبێژێکی ئەوسایە و ئەو پیاوە هونەرمەندە لە وتنی گۆرانیی (حەزین)دا دەستدار و بەناوبانگ بووە.

حەزین: ناوی گۆرانییەکە یا مەقامێکە.

مستەفا: ناوی پیاوێکی گۆرانیی (ناری)زانی ئەو کۆڕە بووە (سێگا)شی باش زانیوە و بەوەدا (کوردی) دوو گۆرانی پێوە ناوبردووە دیارە هونەرمەندێکی وریا بووە.

ناری: ناوی یەکێکە لە مەقامەکان، جۆرێکی ئەم مەقامە پێی ئەڵێن (ناری عیراق) کە ئەم جۆرە خودی (مەقامی بەیات)ە.

سێگا: ناوی مەقامێکی کۆنە دیسان سەرچاوەکان بەهەڵە وە یا لەبەر فەرمانڕەوایی عوسمانییان لە ناوچەکەدا بە هی (تورک)یان داناوە. ئەم مەقامە لەسەر دەربڕینی دەنگێک لە ڕەگەزی (ڕاست) و (بوسلیک)ەوە پەیا دەبێ، کە ئەم دوو ڕەگەزە دەنگە لەسەر (نەوا)وە هەڵدەسن.

(سێگا) بەواتە لە ڕیزی ئاوازەکاندا سێیەمین و لە مۆسیقای عارەبیشدا بەسێیەمین نەغمەیان داناوە. کە لەسەر بناغەیەکی ڕەگەزی (ڕاست)ەوە هەڵدەسێ. وە لە لێدانی (عوود)دا بەپەنجە تووتەدانان لەسەر تەلی سێیەم کە تەلی (دوو گا)ی پێ دەڵێن بەنیسبەتی شوێنی (١١/١٠)ی درێژاییی تەلەکە کە عەرەبەکان لە پێشدا بەم دەنگەیان وتووە (وسطی زلزل) وە یا (سێگا) و ئەویش ئەو لەحنەیە کە مۆسیقەزان و گۆرانیبێژەکانی ناوچەکە (مەقام)ی (سێگا)ی پێ دەڵێن و بەجێگیربوونی لەسەر ئەم نەغمەی مەقامەوە و بەهێزتربوونی بەشێوەیەکی تایبەتی لە نزمییەوە بۆ بەرزتر و ئەم بەرزبوونەوەیەشی وەنەبێ، بەڕێکوپێکی بێ و ئەوسایە دەبێتە (حیجاز) لەسەر (نەوا) کە لەم کاتەدا دەنگێکی (سێگا)ی پەتییە و، لە تەلی چوارەمی (عوود)ەوە هەڵدەسێ و لە کۆندا لە (عیراق) بەم مەقامە وتراوە مەقامی (قۆریات) و ئێستەش ئەم ناوە هەر باوە کەواتە ئەم (قۆریات یا خۆریات)ەی کە ئێستە لە ناوچەی تورکمان نشینەکاندا بەزاراوەی تورکمانی دەیڵێن ئەوسایەی کە کوردی ئەم هەڵبەستەی داناوە قۆریات گۆرانییەکی کوردی بووە و دوور نییە کە تورکمانەکان وەریان گرتبێ و لە ناوچەکەدا زۆر وترابێتەوە. بۆیە پێی وتراوە مەقامێکی (تورکی)یە. تەنانەت هاندانی تورکێتی و بڵاوبوونەوەشی دراوە.

یوونس: ناوی پیاوێکی گۆرانیبێژی ئەو کۆڕەی کە (کوردی) لێی دواوە، بووە و، لە دوو گۆرانیی (شەهری) و (حیجاز)دا، وەستاترین بووە (کوردی) بیستنی ئەو دوو گۆرانییەی لەو (یوونس)ە خواستووە.

یوونس و شەهری و حیجاز (ف، نم/١، کم، گیو) یوونس بلێ.

شەهری (گیوەکان): شاری – ئەمەش دەسکارییەکی نوێیە و لە پەڕاوییە مۆسیقییەکاندا و لە ناو کۆڕ و گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنەکاندا (شاری) نەهاتووە.

حیجاز: ناوی (عەرەبستانی سعوودی)یە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە جۆرە گۆرانی یا مەقامێکی کۆنی عیراقییە.

حیجاز: یەکێکە لە گۆرانییەکان یا نەغمەیەکی سەربەخۆیە، لە گۆرانیدا وە یا ناوی مەقامێکی عیراقییە و زۆر جۆری هەیە لەوانە:

حیجاز ئاچوغ، حیجاز دیوان، شەیتانی، کە ئەمانە هەریەکە مەقامێکی عیراقین.

هەروەها (حیحاز غیەریب و حیجاز مەدمی)ش هەیە کە ئەم دووانە پارچە ئاوازی پێکەوە بەستنەوەی مەقامە عیراقییەکانن.

دیسان مەقامی (حیجاز کورد) هەیە کە ئەمە خودی مەقامی (زوهەیری) عیراقییە. مەقامی حیجاز خۆی (پلە)ی چوارەمینە لە نێوان (چوار گا)دایە وە یا دەنگی چوارەمینە و بۆیە (حیجاز)یش و (چوار گا)شی پێ دەڵێن وە، بەپەنجەی (باڵا بەرزە) ئەگەر لە کاتی عوود لێداندا تەلی سێیەمی عوودەکە کپ بکرێ (دەنگی حیجاز) یا (حیجاز) دەردەبڕدرێ و دەنگێکی ناوەندییە و لەسەر نەغمەی بناغەیی (دوو گا)وە هەڵدەسێ، واتە دەنگێکی پەتیی تەلی سێیەمینی عوودە.

لە جۆرەکانی تری حیجاز جۆری (حیجازکار کورد) هەیە کە بریتییە لە سەروتای مەقامی تورکی حیجازی لەسەر ڕاست و ئەمیش یەکێکە لەو مەقامانەی کە جاران باو بووە و ئێستە کەمتر. وە بەدەربڕینی ڕەگەزی دەنگی (ڕاست) لەسەر دوو (پلە)ی (نەوا) و (سێگا) پێک دێ، کە ئالەم ڕوودانەیدا لە مەقامی (شاهناز) دەچێ.

٢٣– ئەم تاکە لە (ف، ١/٢، کم، چاپەکانی گیو) و (گل ١٣٠٠)دا نییە. هەروەها لە (کۆن)یشدا نییە و، لە (گل/سەرکارێز)دا پانزەهەمینە و لە (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠)دا شانزەیەمینە و لە (ص)دا هەژدەیەمین تاکە و لە (مس)دا نۆزدەیەمین و لە (بەرباخەڵ)دا بیستەم و لە (عن)دا بیست و یەکەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هێشتە چاپ نەکراوە.

خلە: ناوی گۆرانیبێژێکی سەرێنی (کوردی) و هاوبەشی ئەو بەزمەی بووە کە لەم هەڵبەستەیدا لێیان دواوە. بەڵام ناتوانرێ دەست بخرێتە سەر ئەوەی کە ئایا لە کام یەکێ لەم چوار گۆرانییەی ئەم تاکەدا بەناوبانگ و وەستاتر بووە، یا ئایا ناوی گۆرانیبێژەکانی ناو ئەم تاکە بەڕیزی ناوی ئەو گۆرانییانەن کە تیایا هاتووە یا پاش و پێش و تێکەڵن، واتە بەپێی زاراوەی

وێژەیی، ئایا ئەم تاکە (لەف و نەشر)ی (مورەتەب) و یا (مشەوەش) و چۆن (مشەوەشێکە؟ ئەمە هەر کەسانی ئەو سەردەمە ئەمەیان بۆ لێکدراوەتەوە کە بەداخەوە ئەو لێکدانەوەیەش لە بەردەستدا نییە و بەرچاوم نەکەوتووە و ئەوەندە هەیە ئەشێ هەموو گۆرانیبێژەکانی ناو ئەم تاکە لەوانەیە لە هەموو گۆرانییە ناوبراوەکانی ئەم تاکەدا وەستا بووبن، بۆیە جیای نەکردوونەتەوە و بەیەکەوە وتوونی، ئەگەر نا وەک گۆرانیبێژەکانی تر، یەکێ گۆرانی خۆی دەداتێ.

ئەم (خلە)یە سووککراوەی ناوی (خضر)ە یا (خەلیل) یا (خالید)ە کە لەبەر خۆشەویستی بە(خلە)ی ناو دەبەن.

پیرۆت: ناوێکی کوردانەی کۆنە و مەبەست لەو گۆرانیبێژە هونەرمەندەیە هاوبەشی بەزمی ئەم هەڵبەستەی کردووە و شارەزا بووە لە یەکێ لەم گۆرانییانەی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە یا لە هەموویاندا و پیرۆت ناوی پیاوە.

ئەولای مامەسەن: ناوی پیاوێک بووە کە خۆی (عەبدوڵلا) و کوڕی (مام حەسەن) بووە و ناوی خۆی و باوکی بەپێودانی سووککردنی ناوان لە زمانی کوردیدا لە خۆشەویستییاندا گۆڕدراون و خۆیشی گۆرانیبێژێکی یەکێ یا هەموو لە گۆرانییەکانی ناو ئەم تاکە هەڵبەستە بووە، لە کاتی دانانی هەڵبەستەکەدا. بێ گومان نەک وەک هەر گۆرانیبێژێک وتوونی بەشکو جیاوازی وەستایی بووە تیایاندا.

سازی: ڕێکخستنی، ئاهەنگی، سۆزی - بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی سێیەمی ئەم هەڵبەستە و پەراوێز لەسەر تاکی دوازدەیەمی پێشەوە لەگەڵ پەراوێزی سەر تاکی (١ و ١٥) کە لە بارەی (ساز)ەوە.

عوشاق: واتە دڵداران. بەڵام لێرەدا مەبەست لە ناوی مەقامێکی کۆنی ناوچەکەیە و وتراویشە، مەقامێکی تورکییە چونکی لە شارێکی ئاسیای بچووک (تورکییەی ئێستە)وە، کە لە ناوی (عوشاق)ەوە پەیدا بووە کە ئەو شارە لە سەدەی ١٦ و ١٧ و ١٨ی زاینیدا زۆر بەناوبانگ بووە، بۆ شوێنی تیا دروستکردنی جۆرە مافورێکی تورکی کە بەڕەنگی سوور نەخش و نیگاری نایاب و شێوەی پەلکی گەلا و گژوگیای ناوچەکەی تیا کێشراو بووە.

ئەم گۆرانییە کە لەو شاری خەڵک دەستڕەنگین و هونەرمەندییەوە پەیا بووە، بەناوی شارەکەوە ناسراوە کە لە پێشدا زۆر لە ناوا بووە و ئێستەکە کەمتر.

گۆرانیی (عوشاق) لەسەر پلەی (دوو گا) خۆی دەگرێ و جۆرێکی ئەم مەقامەش پێی دەڵێن (عوشاقی تورک) کە ئەمەیان لە لای عارەبەکان، سەرەتای (مەقامی بەیات)ە، بەڵام لەبەر دەسەڵاتی عوسمانی بە هی تورک دانراوە.

هەروەها (عوشاق) ناوی مەقامێکە لە مۆسیقای عارەبیدا (بوسلیک)ی پێ دەڵێن و ئەمیش لە ناوەند نەغمەی (دوو گا)دا دەگیرسێتەوە و لە مۆسیقاشدا نەغمەی تەلی سێیەمینە (عوود)دا و

ئەم (بوسلیک)ە، مـەقـامـی (عـوشـشـاقـی مـیـصـری) پێ دەڵێن، بەڵام ئەمـیش وەک هەمـان (عوشـشـاقی تـورک) زۆرتر لە (بەیات) دەچێ، ئەویش بەهۆی دەسـەڵاتی عـوسـمـانییـەوە بووە لەسـەر (مـیـصـر) کـە مـیـصـرییـەکـان لێـیـان وەرگـرتوون. بڕوانە پەراوێزی ٢٧ لـە بارەی (بۆسلیک)ەوە.

ئەسیری: چەند ئـاوازێک هەن لە (نەغمـە)کانی (ئەوراق الخـەریف) وە لـەوانە (ئەسـیری)یە کـە هەمـوو لە یەک ڕەگـەزە نەغـمـەن بەڵام هەریەکێ لەو ئاوازانە لـەسـەر (پلە)یـەک لە (پلە)کـانی مەقامی (عێراق) دەگیرسێننەوە وەک (عیراق ١/٤، ١) و (زەر کولاه: ١/٢) و (دوو گا ١/٢) و کورد و... هتد کە هەموویان جۆرە نەغمەیەکی زۆر کۆنن و ڕەگەزەکانیان لەم سەردەمەی ئێمەدا بەکارنابرێن وە یا ئەگەر (ڕکەی) ڕەگەزیشیان مابێ بەناوی ترەوەن.

ئەسیری: یەکێکە لە (ئەدوار) و، یا ناوی (١٢) لە مەقامـە بەناوبانگەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆندا، و هەریەکەیان ئێستە یەکێکە لە (ئەلحان)ە عارەبییەکان کە شـوێنی ئەو ١٢ مەقامە کۆنەیان لە عـارەبیدا گرتووەتەوە وەک (عوششـاق، نەوا، بوسلیک، ڕاست، عێراق، ئیسفـەهان، زیرفگەند، بوزورگ، زەنکولاە یا زەر کـولاه، ڕاهەوی وە یا رەهاوی، حوسـەینی و حیجـازی) کـە دیسـان دەبینرێ ناوی ئەمـانەش زۆربەیان کـوردین و گـەلانی تریش بە هی خـۆیانیـان دانـاون. بڕوانە پەراوێزی تاکی ١٩ لە بارەی (دائیـرەی مـیـصـری) و پەراوێزی سـەر تـاکی ٢٣ لـە بارەی (ئەسیری)یەوە.

سۆز: ساز (بڕوانە ساز لە پەراوێزەکانی پێشەوە لەسەر ئەم هەڵبەستە).

هەروەها (سـۆز) ناوی جۆرە گۆرانییـەکیشـە و، واتای کاریگەریش دەدا، گـوایە دڵسـووتێن. بڕوانە پەراوێزی تاکی ٤ و ١٧ لەسەر سۆز.

کوردی: دووەمین مـەنزڵگای نێوان مـەقـامی (دوو گا) و (سێ گا)یە و، گۆرانییـەکە (پلە)کەی لەسـەر (پلـە)ی (می بۆل)ە و ئەو (پلە)یە کـە مـەقـامی (تورک)ی لە مـەقـامی (نەهـاوەند)ی پێ وەردەگیرێ.

(مـەقـامی کـوردی) عـارەبەکـان زۆر شـێـفـتـە و ئالوودەین و ئەوەنـدەی دەڵێنەوە، هاکـا بووە بەمەقامێکی عارەبی.

هەر لەم مـەقامی (کوردی)یە، مەقامەکانی (حیجاز، نەوئەثەر، وە (نەگریز)یش جیا دەبنەوە، بەڵام خودی (مـەقامی کوردی)یەکە وا ڕێک خراوە کە لەسەر (ڕاست)یش بەنـدە و لە سەرەتادا (حیجاز) لەسـەر (ڕاست) و بـەڵام لە گەڵێ شـوێنیدا لێیان جیا دەبێتـەوە و جێگۆڕکێ دەکا لەسەر (دوو گا) و (ڕاست) ئەم مەقامی (کوردی)یە، ئێستەش وەک سەرێنی (کوردی) هەر باوە و، بەچەند ناوێک لە ئارادایە وەک (مـەقـامی نـەوای کـوردی) و (مـەقـامی عـەجـەم کـوردی) و (مـەقـامی موحـەیەر کـوردی) و (مـەقامی حیـجـازکـار کـورد) کـە ئەمـانەیان زۆر بەنـاوبانگن و ئێسـتـەش لە باودان و لە نـاواندا دەوترێنەوە، بەڵام (مـەقـامی کوردی) ڕووت لەسـەر (دوو گا)

دەگیرسێنەوە و ئاوازی (کوردی)یەوە، ڕووت (پەتی)یەکەی خۆی لە (مەقامی دوو گا)دا لەسەر (چوار گا) ئاشکرا دەبێ.
شەهری ناز: بەواتا شاری ناز و عارەبەکانیش هەر ئەم ناوەیان لە لا بەناوبانگە و ئەمەش ناوی مەقامێکە لەسەر (پلە)ی (حوسەینی) جێگیر دەبێ و لە عەرەبیدا بەساز و ئاوازەوە دەوترێ و لە تیژییەوە دەست پێ دەکا (بەڕاست) لەسەر (نەوا) و بە(بەیات) کۆتاییی پێ دەهێنرێ، بەڵام هەر لەسەر (حوسەینی) بەند دەبێ و بەگۆڕانی یا مەقامێکی بەهێزی کورت دەناسرێ. بڕوانە (ناز) لە پەراوێزەکانی سەر تاکەکانی ١١ و ١٧ و ٢٥ و ٢٨.
٢٤– ئەم تاکە لە (عن، گل ١٢٠٠، گل/سەرکارێز، مس، ص، ف، نم، ع، کم، گیوەکان)دا نییە و تەنیا لە (گل ١٣٠٨) و (گل ١٣٠٩) و (گل ١٣١٠)دا حەڤدەیەمین و لە (گل/بەرباخەڵ)دا بیست ویەکەمینە کە ئەمە سێیەمین تاکە لە (عن)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.
بەربەت: ناوی ئامێرێکی مۆسیقیی هەرە کۆن و سەرەتایی (کورد) و (فارس)ە کە لە دوو وشەی (بەر) و (بەت) پێک هاتووە کە (بەر = پێش، سنگ وەک دەڵێن: سینە و بەرۆک، بەر و پشت، بەروانکە، بەرەی زین، سینە بەرۆک...) و (بەت = مراوی یا سۆنە) چونکە شێوەی ئەم ئامێرە لە سنگی مراوی دەچێ.
مێژوو کۆنێتیی ئەم ئامێرە دەباتەوە بۆ (نەوە)ی یا بەرەی شەشەمی مرۆڤ لە دوای باوکە (ئادەم)ەوە و گوایە (لامک) ناوێکی مەزنی ئەو بەرەی شەشەمە دروستی کردووە و دیارە ئەو سایە بەشێوەیەکی سەرەتایی بووە تا گەیوەتە ئەم شێوە جوان و پەسەند و لەبارەی ئێستەی کە (عوود)ە.
ئەم ئامێرە مۆسیقییە بەر لە سەرێنی (کوردی)دا لە سولەیمانی و لە ناوچەکەدا باو بووە و هەر بەناوی (بەربەت)ەوە ناسراوە کە زۆربەی هۆنەرانی تریشمان لە هەڵبەستەکانیاندا ناومان بردووە و لە سەردەمی (کوردی) شارەزایەکی وەک (عیسا)ی هەبووە.
عیسا: ناوی پیاوێکی ئەو سەرێنییەی (کوردی) و بەربەت ژەنێکی پسپۆڕ و، وەستا و شارەزا بووە، ئەم ناوی (عیسا)یە ئیسلامەکانیش و مەسیحییەکانیش لەبەر خۆشەویستیی عیسا پێغەمبەر، بەکوڕی خۆیانی دەنێن، لەوانەیە ئەم عیسایە (فەلە) یا (ئیسلام) بووبێ و بەهەرحاڵ کوردێکی ئەو ناوە و ئەگەر (مەسیحی)ش بووبێ، هەر تەنیا ئاینی جیا بووە ئەگەر نا، بەنەژادەکەی کورد بووە، وەک فەلەکانی ئێستەی کوردستان کە هەر تەنیا جیاوازییان ئاینە و لە ڕەگەزا یەکن لە گەڵ و نیشتماندا.
نەقارە: یەکێکە لە ئامێر و مۆسیقییە کۆنەکان کە بەپیامالین (ایقاع) دەنگ دەدات و (نەقارییە)شی پێ وتراوە. جاران ئەم ئامێرە لە ناو پێڕی (چالغی بەغداد)دا و، لە (جووقە)دا هاوبەشیی پێ کراوە و ئێستە وازی لێ هێنراوە.
لە ناو عارەبەکانیشدا لە کۆندا جۆرە (نەقارە)یەکی مەزن هەبووە کە بەسواریی حوشترەوە لە

(مەوکیب)ی تایبەتیدا لێ دراوە و بۆیە پێی وتراوە (نقارية الجمل).
نەقارە – لە کۆندا بەبۆنەی بەرێکردن وەیا بەپیرەوەچوونی حاجییاندا یا هی کەسانی مەزنی ئاینی یا فەرمانڕەوایاندا و، یا لە جەنگدا بۆ تیژکردنی جەنگاوەران و بەجۆش هێنانیان، یا لە جەژنان و جۆرەها بۆنەی کۆمەڵایەتیی تردا بەکاربراوە ئەم ئامێرە لە پاشتردا بووە بەئامێرێکی مۆسیقیی پێ ڕابواردن و خۆشی و بەزم و تەنانەت لە ئەوروپاشدا هەر بەم ناوەوە ناوی دەبەن هەرچەندە لە ئیتاڵیادا، جۆرێکی مەزنی دروست کراوە (تەمپانی) پێ دەڵێن.
ڕۆستەم: ناوی پیاوێکی مۆسیقاژەن و بەتایبەتی هونەرمەند بووە لە نەقارەلێداندا بەپێی ئەم هەڵبەستە.
تەپڵ: ناوی ئامێرێکی مۆسیقی و لە (تەپ)، (تەپەتەپ) و پیامالینەوە ئەم ناوەی دراوەتێ، کەواتە ناوێکی کوردییە و عارەبەکانیش قەبەیان کردووە و(طەبل)ی پێ دەڵێن و، وەک وشەیەکی عارەبی لە بارەی زمانەوانییەوە لەگەڵیدا دەجووڵێنەوە کە (طبال، طبول و،...) هتدیان لێ داڕنیوە.
تەپڵ، هەرە کۆنترین مێژووی هەیە، چونکی لە نێوان ئامێرە مۆسیقییەکاندا، ئەوانەیان کە بەپیامالین وەک تەپڵ دەنگ دەدەن، کۆنتریانن لەگەڵ مرۆڤدا. مرۆڤ بەر لە هەر ئامێرێکی تری مۆسیقا، ئەم جۆرەی ناسیوە کە بەپیامالین دەنگ دەدات.
تەپڵ بەتێکڕایی لە کاتی لێدانی ئامێرە مۆسیقییەکاندا هاوبەشی پێ ئەکرێ و لە جۆرەها بۆنەی ئاینی و کۆمەڵایەتی و ڕەسمی و... هتد بەکار دەبرێ. تەپڵ لە ڕۆژهەڵاتەوە، بەڕێگەی دورگەی (صقلیە) و ئیسپانیادا گەیوەتە ئەوروپا.
لێرەدا جێگەی خۆیەتی بۆ وێنە بەسەرهاتێکی (کوردی) بگێڕمەوە لە بارەی ئەو بۆنە مانگ گیرانەوە:
ئەگێڕنەوە (کوردی) یەکێک بووە لە ئەندامانی ئەنجومەنی ئەدیبانی ئێرانی سەرێنی خۆی و لە لای پاشای ئێران زۆر ڕێز و پایەی مەزنی هەبووە و تەنانەت مامۆستا و (مؤدیب)ی مناڵەکانی شاهیش بووە لە تاران.
پاشاش جار جار کۆڕی وێژەیی لە ماڵی خۆیدا گرتووە و جارێکیان لەو کۆڕەدا (کوردی) و (قائانی)ی، کوردی زەنگیی بەفارسی شیعربێژ، ئەکەونە شەڕە شیعر (موشیعرانێ)وە، گوایە جوانێک لە کۆڕەکەدا دەبێ کە ئەو سایەش پاشاکان لەو کۆڕانەدا ئافرەتی (جاریە)یان بووە سووڕ و سەمای بۆ داون و بادەی بەدمەوە داون و بەردەستی کردوون و لەوانەیە کە یەکێک لەوانە وێنەی لەو حەوزی ئاوەدا کە لە ناوەندی کۆڕەکەدا بووە دیار بووە لە (کوردی)یەوە، (قائانی) هەرچی ئەکا لە هەڵبەست داناندا بەکوتوپڕی خۆی یا لە وتنی هەڵبەستدا وەکو (کوردی) کە بەپێی مەرجی شەڕە شیعرەکە بێ بۆ نایەت (قائانی) وا هەست دەکا یا بەلایەوە وا دەبێ کە (کوردی) لە کاتێکدا بەناو ئاوەکەدا دەڕوانێتە وێنەی ئەو جوانە ئیتر کوتوپڕ

شیعری بۆ دێت و دانامێنێ و (قائانی) لەوەدا ئەبێ کە بۆر بخوا لە تاواندا بەگالۆکەکەی دەستی ئاوەکە تێک دەدات لە کاتێکا (کوردی) خەریکە شیعر بڵێ (کوردی)ش هەست بەوە دەکا کە (قائانی) بەتێکدانی ئاوەکە وێنەکەی لێ شێلو بکا، بۆیە کوتوپڕ هەڵدەکوتێتە سەر (قائانی) و بەپەنجە لە سەرە کەچەڵە رووتەکەی یا رووتاوەکەی (اصلع)ی (قائانی) دەدات وەک تەپڵ لێدان، (قائانی)ش ئەوەی پێ دەسدرێژی دەبێ و (کوردی)ش ئەڵێ (ئاغا) لای ئێمە کە مانگ دەگیرێ لە تەپڵ و مس و تەنەکە دەدەن تۆش کە مانگەکەت وەک جنۆکە لە ناو ئاوەکەدا وەک رووی جوانەکە بێ لە من گرت، ئەوا منیش لەسەری تۆ دەدەم کە بەمس و تەنەکە یا تەپڵی خاڵیی دەزانم بۆ بەربوونی مانگەکە.

ئیتر لەسەر تەپڵ زۆری ماوە لە باسی (تەپڵخانە)شدا کەوا (کوردی) وەک لێرەدا ناوی (تەپڵ)ی هێناوە کە ئەو سایە لەو کۆڕەدا بەکاربراوە، هەروەها لە دوا تاکەکانیشدا لە (تەپڵخانە) دواوە کە لەویش دەدوێم لە شوێنی خۆیدا. بەڵام بەر لەوەی کە لەم لێکدانەوەیە لادەم، بەجوانی دەزانم کە (کوردی) لە چەند شوێنێکی تری هەڵبەستەکانیدا ناوی (تەپڵ)ی هێناوە کە هەندێ لەوانەش بخەمە روو تاکو بەندیواری و شیفتەیی ئەومان بەمۆسیقا و گۆرانییەوە پتر بۆ دەربکەوێ کە وتوویە:

ترنگەی (تەپڵی) باز ئاتڵانی چاوش دەنگی جارچی دێ
بەتیپی غەم دەڵێن نامەرد ئەسەردڵ ئەمرۆ یەلغارە

وە لە شوێنێکی تریدا وتوویە:

دەڵێی ئەسپی فیراق سمکۆڵ ئەکا وا لێڵە بینایيم
دەڵێی (تەپڵی) تفاقیان ژەند کەوا گوێم پڕ لە هاوارە

وە یا وتوویە:

صەدای (تەپڵی) فیراقم دێتە گوێوە
سەعاتی نەحسی بێدارانە ئەمشەو.

سەلیم: ناوی هونەرمەندێکی تەپڵ لێدەری سەرینی (کوردی) بووە و تەپڵ لێدانیش هەموو کەس دەتوانێ لێی دا، بەڵام لێدان و زانینی لێک جیان و دیارە سەلیم زانای لێدانی تەپڵ بووە و بەزانینەوە لێی داوە بۆیە ناوی هێناوە.

ڕەونەق: ئەم وشەیە هەرچەندە لە فەرهەنگە عارەبییەکانیشدا هاتووە، بەڵام بەلای منەوە لە روون، رووناک و روونەک و... هتدەوە، هاتووە بەواتە بریسکەدار، تیشکدار، رووناک، بێگەرد، پەرتەو... هتد.

ڕەونەق ئارا: پاککەرەوە، تیشکدەر، رووناکی یا بریسک و باک پێدەر و جوانکەر، ڕازێنەرەوە یا گەرد و پیسی لەسەر لابەر...

ئایینە: ئاوێنە، قۆدیک، باڵەبان، باڵابین. هەرچەندە (باڵەبان) ئەگەر لەگەڵ ناوی (ئێستر)دا

بەکـاربـبـرێ، وەک (ئێـسـتـری باڵەبان) مـەبەس لە زۆر زەلامـەکـانیـانە و (باڵەبـان)یش ناوی ئامێرێکی مۆسیقییە کە دەڵێن (دوک دوکو باڵەبان).

قەلب: دڵ. وە (قەڵب) مەبەست لە خراپیشە و بێ نرخی یا هەڵگەڕاوەیی، ئاوەژوو.

شـاز: شـتێکی نائـاسـایی و ناوبردنی (شـاز) مـەبەست لـەوەیە کـە ئەم مـۆسـیـقـایـانەی ناو ئەم تاکەن (ئیقاعی)ن و لەو جووقەدا شازیی مۆسیقاکانی تر، دادەپۆشن.

٢٥- ئەم تاکـە لە (گل/سـەرکـارێز، گل/بـەرباخـەڵ، کـۆن، مس، ص، ف، نم/١، ع، کم و چاپەکـانی گیـو/٢، ئۆفـسـێت و گـیـو/٣)دا نیـیـە و لە (گل/١٣٠٠)دا پانزەیەمین و لە (گلەکـانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا هەژدەیەمینە و لە (عن)دا بیست و دوویەمین تاکە و هێشتە چاپ نەکراوە.

مـەرهـەم: دەرمـانێکی رۆنیی مـەیـیـوە کـە لە بنکە (قـاعـدە)یەکی رۆنی مـەییـوە وە بەگـوێرەی پێویسـتی و جۆری مـەرهـەمەکە جـۆرەها دەرمانی تری تێکەڵ دەکرێ، بۆ نیشـتنەوەی ئاوساوی یا چـارەکـردن و چاککردنەوە (گـۆشــتــەوزوون) پـێ هێنـانـەوەی بـرین و کــولـکـی و بەنـەرمی هێشتنەوەی برین بەکار دەهێنرێ.

زەخم: زام، برین، کولکی، برینداری...

سـۆزناک: بڕوانە لێکدانەوەم لە پەراوێزی سەر تاکی هەڤدەیەم و پـەراوێزی بیسـتـەمی لە سـەر تاکی ٢٠هەمی ئەم هەڵبەستە لە پێشەوە لەسەر ئەم مەقامی (سۆزناک)ە.

سـۆزناک: لە لایەنی زمـانیـیـەوە بـەواتە سـووتێنەر، مـەبەست لە دڵسـووتێنیـی ئەو مـەقـامـەیە، هـەروەها (سـۆزناک)، بـەواتە مەقامی (بلازەڕ کولاھ) کە ئەم ناوەیشی پێ دەڵێن، چونکە هـەمان (پلـە)ی (ســـۆزناک) و (زەڕ کــولاھ) وەک یـەکن و لە هـەمـــان (پلـە)دا دەوترێن و (ســـۆزناک) مەقـامێکی تایبـەتییە و زۆرترەکەی لە مەقـامی (ڕاست) دەکات و بەسەر دەنگی (ڕاست)یشەوە دەگیرسێتەوە، لە ناو (تورک)دا باو بووە بەدەسپێکردنی لە (نەوا)وە و لەسەر بناغەی دەربڕینی (حـیـجـاز) و لـە (پلە)ی (نەوا)دا خـۆی دەنوێنێ، واتە تورکـەکـان لە مـەقـامـی (حیـجـازکـاری)یەوە دەستی پێ دەکەن و عەرەبەکان لە (حیجاز)ەوە لەسەر (نەوا).

کـاکـەباس: ناوی پیاوێکی گۆرانیبێژی ناو ئەم هەڵبـەسـتـەیە و لە وتـنی مەقـامی (سـۆزناک)دا، شارەزاییەکی ئەوتۆی بووە کە وتنەکەی وەک مەرهەمی دڵان وەها بووە.

نەوئەثەر: بەواتە شوێنەوار یا بەڵگە یا بەرهەمی یا پاشمـاوەی نوێ و، ئەمیش ناوی مەقـامێکی تایبـەتییـە لەسـەر دەنگی (ڕاست) جێگیر دەبێ و زۆرترەکەی لە مـەقـامی (نەهاوەند دەچێ و لە ناو تورکیشدا زۆر باو بووە و تا ئێستەش ئەم مەقامە لە ناوچەکانی کوردەواریدا باوە.

شێخە: ناوی پیاوێکی گۆرانیبێژ بووە کە ئەم هەڵبەستە پێی گەیاندووین و ئەشێ ناوی ڕاستیی (شێخە) نەبووبێ و بەشکو نازناوی بووبێ،بەوەی کە (شێخ زادە) بووە یا بەوەی کە لە شتێکەوە وای پێ وتراوە، ئـەمـانـەش هـەر تەنیـا بۆچوونـن و ئەوەندە هـەیە دەزانـرێ کـە، لـە وتنی مـەقـامی (نەوئەسەر)دا توانایییەکی تایبەتی هەبووە و بۆیە (کوردی) ناوی ئەم مەقامەی بەیەکێکی کەوە

نەوتووە و تەنیا بەمیەوە ناو بردووە، وتوویە بۆ شێخە کە شێخە ئەوەندەی باش زانیوە، لەوانەیشە شێخ بووبێ و لە کوردەواریدا باوە (باوک) شێخ نییە و منداڵەکەی بەشێخە ناودەنێ.

ماهوور: لە ڕووی زمانییەوە (ماهوور) بەواتە مانگی یەکشەوە و ئەمیش ناوی ئاواز یا گۆرانی یا نەغمەیەکی تایبەتی ئەو سەرێنەییەی (کوردی) و ئێستەش هەر باوە، بەڵام جۆرێکی هەیە، پێی دەڵێن (ماهووری بچووک) ئێستە باو نییە و ناوترێ و پسپۆڕ نەبێ نایزانێ.

عەزیزی یایە ناز: ئەم پیاوە هونەرمەندە ناوی عەزیز و کوڕی ئافرەتێک بووە (ناز) یا (نازەنین) ناو بووە و بە(یایە ناز) بەناوبانگ بووە و (یایە) نازناوێکی ڕێزە لە زمانی کوردیدا لە ئافرەت دەنرێ و ئەشێ ئەم عەزیزە یا تاقانە بووبێ بۆیە بەناوی دایکەوە بەناوبانگە وە یا دایکی بەخێوی کردووە، لەبەر نەمانی باوکی یا لەبەر تەڵاقدانی دایکی عەزیز و... هتد و لەوەوە ناوی دایکی بەخۆیەوە وەرگرتووە و بە(عەزیزی یایە ناز) ناسراوە لە هەمان کاتیشدا لە وتنی گۆرانی یا لە مەقامی (ماهوور)دا بەناوبانگ بووە وەک (کوردی) لە مەقامەکاندا تەنیا ئەم مەقامەی پێوە دیاری کردووە، دیارە زۆرتر و لە کەسانی تر تیا وەستاتر بووە.

٢٦- ئەم تاکە لە (ف) دوانزەمین و لە (نم/١، ع، کم و چاپەکانی گیو)دا سێزدەیەمین و لە (گل/١٣٠٠) و (گل/سەرکارێز)دا حەڤدەمینە و لە (گل/ ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠) و (کۆن) و (ص)دا نۆزدەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ)دا بیست ودووەمینە و لە (عن)دا بیست وسێیەمینە و لە (مس)دا بیستەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و سیازدەیەمین چاپ کراوە.

جاربەجار: ناوبەناو - لێرەدا پرسیارێک بەبیردا دێ کە ئایا بۆچی تەنیا ئەمیان (ناوبەناو) و ئەوانی تر هەر یەکجارن؟ وا دیارە لەبەر خۆشبێژیی ئەم بووە و هەر ناوە ناوێک تێ هەڵچووەتەوە.

بەکزێکەوە: مەبەس لە کەمدەنگ بەرزکردنەوەیە کە لە شێوەی غەمباری یا شەرمدا و لەبەرخۆوە گۆرانی بوترێ کە لێرەدا بەزمەکەی هی خۆشییە و، ئەم کزی وتووە، ئەمە وەستاییەکی وێژەیی کۆنە کە (کوردی) بەکاری هێناوە لەو خۆشییەدا کزیی وتووە کە مەبەست لە زەبوونیی دەردەداری و کەساسییەوە بووە بەشکو مەبەست لە خاوییی گۆرانییەکەیە وەک لە پەراوێزی تاکی سێیەمی ئەم هەڵبەستەدا، لە پێشەوە بۆ وێنە ئەم هۆنراوەی دواییی (کوردی)م هێنایەوە کە وتوویە:

وەزنی ضەربی پەنجەت ئەمرۆ صەرفی ڕووی جانانە کرد

ئەی موعەللیم بۆ (کز)ت کرد؟ دەک لە جەرگت چێ کزە

کە وەک لە پێشەوە نووسیومە (کز) بەواتە خاوکردنەوە یا خاوی یا لەسەرخۆییە ئەگەر نا، بۆ ئەم بەزمەی کە (کوردی) باسی کردووە کە هێرشی تیا بردووەتەوە سەر زاهید و سۆفی و شێخ و میر و خانەقا و تەکیە و سەرەڕای ئەوەش ئاڵای بادەنۆشی و ئاوێتەکردنی سووڕوسەما، چەقەنە، بستە گۆرانی، مۆسیقا و ژیانی خۆشی لە کۆڕێکی وادا هەڵکردووە کە

هەموو شتێکی تیا لە ڕوو و، بەئاشکرا و بێ شەرمی و بەئەوپەڕی ئازادی و سەربەخۆییەوە، بەکوێرایی چاوی شەحنە و موحتەسیبەوە وتووە کەچی لێرەدا (کز)ی وتووە ئەمە تەنیا ئەو وەستایی وێژەییەیە، نەک بەپێچەوانەی سروشتی بەزمەکەوە (کزیی) ناخۆشی ویستبێ کە لە پێشتر بۆ گەرمی هان داون.

ئەمە جگە لەوەی کە دەستپێکردنی هەموو گۆرانی و مەقامێک بەلەسەرخۆیی و کزی دەس پێ دەکا.

هەستێ (نم/١٠) و (گیوەکان): هەڵسێ.

پەردە: بەواتە ئەو پارچە چنراوە (قوماش) یا (کر) و... هتد وایە کە لە نێوان بەشێک و بەشێکی تری ژوورێک و ژوورێک یا لە ناو خانوودایە، بەڵام لێرەدا پەردە مەبەست لە زاراوەیەکی گۆرانیبێژی و مۆسیقاگەرییە. عارەبیش هەر ئەم وشە کوردییەی وەرگرتووە و بەکاری دەهێنن و تەنانەت وەک هەر وشەیەکی تری عارەبی لە زمانەوانیدا لەگەڵی دەجووڵێتەوە (ئەوەتا) دەیکەن بەکۆ (جەمع) و دەڵێن (بەرەدە، بەردات...) و مەبەست لە کۆمەڵە (پلە) یا کۆمەڵە (دەنگێ)کە، لە سروشت (طەبیعەت)دا و بەواتە دەنگ، نەغمە، دەور، لەحن، مەقام و... هتد.

طاهری: ئەم وشەیە لە (گ/٢، گ/٣) و (ئۆفسێت)ەکەیاندا بە(ظاهری) هاتووە، نەک (طاهری) کە لە کام سەرچاوەی دەستنووس و چاپیدا بە(ظاهری) نەهاتووە، هەروەک بەشێوەی (ظاهری) لێرەدا (واتا نادات جگە لەوەی کە لە زاراوەی مۆسیقا و گۆرانیدا بەناوی (ظاهری)یەوە، جۆرە ئاواز یا گۆرانی یا مەقامێک نییە و لە هەمووواندا بەناوی (طاهری)یەوە هەیە کەواتە (ظاهری) نەک هەڵەی چاپی، بەشکو دەسکارییەکی تێنەگەیشتووانە و بێ جێ و نەگونجاوە و سەرچاوەی ئەوانیش هەڵەیە کە بە(ظاهری) نووسیویانە.

طاهری: لە ڕاستیدا مەقامێک بەم ناوەوە هەبووە کە لە کۆنەوە و تا ئێستەش باوە و، بەڵام ئێستە کەمتر لە ئارادایە و مەقامی (بابا طاهر)یشی پێ دەڵێن و گوایە هونەرمەندێکی (تورک) ئەم مەقامەی داناوە کە ناوی (طاهر) بووە لەپێشدا لەسەر (دوو گا)یەکی پەتی و لە دوامین جارا لەسەر (سێ گا)یەکی تورکی جێگیر دەبێ و من بەدانراوێکی هۆنەری مەزنمان (بابە تاهیری هەمەدانی) دەزانم.

(پەردەی طاهری) کە لە هەڵبەستەکەدای هاتووە مەبەست لە مەقامی (طاهری) بووە کە ئەمیش هەر لە دەنگەکانی ئەو (١٢) پەردەیەوە هەڵدەستێ و، وتنی وەستاییی تایبەتی دەوێت کەوا (یارە) یا (یارەکەی کوردی) شارەزای ئەم مەقامە بووە و ئەشێ لەبەر نایابییەکەی بووە کە جار جار دووبارە کراوەتەوە یا (کوردی) زۆر ئەم مەقامەی پێ خۆش بووە و دووبارەی ویستووە وەک لە هەڵبەستی تریشیدا ئەم ناوەی بردووەتەوە کە:

لە (پەردەی طاهیری) گەر بێ صەدای ئەو عاشقی یارەم
ئیتر حاجەت نییە بێن مەلا بۆ وەعظ و تەلقینم

هەروەها گومان بۆ ئەوە دەچێ کە لە سەرێنی (کوردی)دا مەقامێک یا گۆرانییەک بووبێ ناوی (پەردەی طاهری) بووبێ و ئێستە نەماوە و هەر هی ناوچەکەش بووبێ، بۆیە کەوتووەتە سەرچاوەی مۆسیقییەوە.

(یار)ەکەی یا (یارەکەی): کە دوو مەبەس دەدات واتە (یارە) ناوی کەسێک بووە وە یا (یارەکەی) بەواتە خۆشەویستەکەی، دۆستەکەی، دڵخوازەکەی... هتد. کە لێرەدا (کوردی) وەستایی نواندووە ئەو گۆرانیبێژەی ناو ئەو کۆڕە، کە لە وتنی (پەردەی طاهری)دا پسپۆڕ بووە و ناوی (یارە) بووە و (کوردی) بەئەو (یارەیەی)، واتە (یارەکەی) دەربڕیوە کە کابرای لە هەمان کاتدا کردووە، بە(یار) ئەمەش لە وێژەی کۆندا وەستاییەکی تایبەتییە.

عاشق: دڵدار.

عاشق کوژەی (چاپەکان): کوژو

عاشق کوژەی (ف): کشی.

وە کە بەعاشقکوژی داناوە، ئەوە وەنەبێ ئەو (یارە)یە خۆی (مەعشووقە)کە بووە بەڵام بەتائیری گۆرانییەکەی عاشقی وەک کوشتن کاری تێ کردووە. کە ئەمەش دوو واتا دەدات و هونەرمەندیانەیە، لە وێژەی کۆندا.

مەعشوقە: دڵخواز و ئەمە گومان ئەگەیەنێ کە (مەعشووقە) بۆ مێیینەیە لە عارەبیدا و بەڵام لە کوردیدا بۆ مێیینە و نێرینەیە، کە ئەم گومان گەیاندنە، بەم وەستاییەی (کوردی) جوانە کە لە وێژەی کۆندا و مەبەسی لە (یارە) یا (یارەکەی) واتە ئەو (یارەیەی) بووە و بەم گۆرانی وتنەی خۆشەویستی (مەعشووقە)ی هەمووان بوو.

دوشمن (گیوەکان): دوژمن.

دوشمن نەواز: دوشمن لاوین. واتە ئەوەندە گۆرانییەکەی خۆش بووە، ئەو (یارە)یە مرۆڤێکی چاک بووە بەگۆرانییەکەی یا بەخووی چاکی خۆی تەنانەت دوشمنیشی لاواندووەتەوە نەک دۆست و ئەمیش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەم کابرایە (دڵخواز)ی دڵداری لەگەڵاکردنی (کوردی) نەبوو و هەر لەبەر جوانیی وێژەیی وای وتووە.

٢٧- ئەم تاکە لە (ص)، (ف)، (نم/١)، (ع)، (کم «کۆن» و چاپەکانی گیو)دا نییە و لە (گل/ ١٣٠٠) و (گل/سەرکارێز)دا شانزەمین و لە (گیو/٣)دا حەڤدەمینە و حەڤدەمینی چاپ کراوە و لە (گەڵاڵەییەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیستەمین تاکە و لە (مس)دا بیست و یەکەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ) و (عن)دا بیست و چوارەمین تاکە لەم هەڵبەستەدا، بەڵام تەنیا لە (گیو/٣)دا بەم جۆرە شێوازەی دواییە، و چاپکراویدا حەڤدەیەمین تاکی ئەم سەرچاوەیە:

«وا فەرەج بۆ نێک بەختی بێ بچێتە سەر حەقیق
کورسی ریحلەت لێ بدا دەرچێ لە مەنزڵگای حیجاز»

فەرەج: ناوی پیاوێکی مۆسیقازان و گۆرانیبێژی ئەو سەردەمە بووە کە لە (بۆسلیک)دا شارەزا

بووە، وەک شارەزایەتیی لە مەقامی (عیراق)یشدا وە ئەم ناودارەشمان کە دوو وەستایی پێوە ناوبردووە دیارە بالاّ دەستێکی ناو کۆڕەکە بووە چونکە ئەمیش یەکێکە لەو کەسانەی کە لە یەک زانایی پتری پێوە ناوبردوون هەرچەندە لێرەشدا ئەوە دەسەلمێنێ، هەر تەنیا گۆرانییەک یا دووان بزانێ، بەشکو لە هەموو گۆرانی و بەستە و مەقام و ئاوازەکاندا بەزۆری زانا بووە و بەتایبەتی هی زمانی زگماکیی خۆی و بگرە هی زمانی تریش کەواتە سەیر نییە، یا شتێکی نائاسایی نییە کە ئەمانەی (کوردی) ناوی بردوون، تەنیا ئەو گۆرانییانەیان زانیوە کە پێوەی ناو هێناون، بەلاّم گرنگیی ئەوەیە کە ئەو گۆرانییانەی لەگەڵیاندا ناوی هێناوە کە ئەوان لەو گۆرانییانەدا دەستێکی ئەوەندە بالاّیان هەبووە تیانا لە چاو هاواڵەکانیاندا کە بتوانرێ پێوەندیی دیاری و دەسنیشان بێ و ئەم (فەرەج)ەش یەکێ بوو، لەوانە.

دیارە هەر ئەم (فەرەج)ە لە مۆسیقەشی چاک زانیوە، چونکی (بۆسلیک) ئاوازێکی مۆسیقییە و ئەمجا (فەرەج) هەر خۆی گۆرانی بۆسلیکی وتووە و بەوەستایەتیی خۆی خۆیشی مۆسیقای پێ بەپێی گۆرانییەکە بۆ خۆی لێ داوە یا لە جێیەک ئاوازی بۆسلیکی لێ داوە و ئەمجا چووەتە سەر وتنی مەقامی (عێراق) وە یا بەگۆرانییەوە کە بۆسلیکی وتووە ئەوەندە وەستا بووە، توانیویە ئەو نەغمە و لەحنی بۆسلیکە بەئاوازێکی تایبەتی ببەستێ بەمەقامی عێراقەوە. هەر بەوەندەشەوە نەوەستاوە کە هەر خۆیشی (کووس)ی لێ داوە لە لکاندنی بۆسلیک بە(عێراق) و دەرچوون بەرەو مەنزڵگای مەقامی (نیاز) کە ئەمیشی زانیوە و ئەمانەی کە لەم تاکەدا هاتوون و بەتایبەتی کە (کوردی) تەنیا یەک تاکی تایبەتی بەتەنیا لەسەر (فەرەج) وتووە، وە دیارە بلیمەتێکی هونەرمەند بووە لەو کۆڕەدا کە ئەمانە هەروا بەئاسانی نایەنە دی.

بۆسلیک: سێیەمین (تەلە) لە دەنگەکاندا کە دەکەوێتە نێوان (سێ گا) و (چوار گا)وە وە یا خۆی (دوو گا)یە یا وەک ئەو وایە.

وە وشەی (بۆسلیک) بەواتە (ماچۆکە) یا ماچی بچووک یا (ماچیلە) و تا ئێستە وەهام لێکدایەوە کە (بۆسلیک) ئاوازێکی مۆسیقییە، کە ئەوا بەڕوویەکی کەشدا لێکی ئەدەمەوە:

هەر ئەم (بۆسلیک)ە لە هەمان کاتیشا مەبەستی لە مەقامێکە کە لە فەرمانڕەواییی عوسمانی باو بووە و بۆیە لە ناوی ڕەگەزی فەرمانڕەوایییەکەوە پێی وتراوە، مەقامێکی تورکییە و ئەم مەقامەش لەسەر دەربڕینی (پلە)ی (بۆسلیک) وە (ڕەگەزی بۆسلیک) دەرخستنی دادەمەزرێ. بەمەرجێ ئەو دەرخستنە لەسەر (پلە)ی (نەوا) و ڕەگەزی (حیجاز) لەسەر (حوسەینی) وە ڕەگەزی (بەیات) لەسەر (حوسەینی) بێ. بڕوانە پەراوێزی تاکی ٢٣ لە بارەی (عُشاق)ەوە.

بەجێ بێڵێ: مەبەس لە (بۆسلیک)ەوە بڕواتە سەر (عێراق) بەجۆرێ کە لە لەیەکدانی ئەم دوو گۆرانییەدا نەشارەزایییەک لە بیستنیدا هەست پێ دەکرێ و هەمان جۆش و خرۆش بگەیەنێ و بەشکو پتریش بەهۆی تازەکردنەوەی دەنگەکەوە لە کاتی وتنیدا لە (بۆسلیک)ەوە بۆ چوونە سەر (عیراق) وتن.

بچێتە: مەبەسی لەوەیە کە لە بۆسلیکەکەوە کە (ئای مۆسیقا) و (ئای گۆرانییە) بچێتە سەر مەقامێکی تر و بەرە بەرەو هونەرمەندانە هونەر و پسپۆڕیی خۆی تیا دەربخا تاکو بەبێ ئەوەی هەستێکی کتوپڕی بدا، بەبیستەر کە گوایە چووەتە سەر مەقامێکی نوێ بەشکو هەر وەک یەک مەقامی وتبێ وا بووبێ.

کەواتە (عێراق) لێرەدا مەبەست لە زاراوەیەکی (گۆرانیبێژی)یەوە وە ناوی مەقامێکی تایبەتە و دەنگەکەی لە (نۆتە)ی (مۆسیقی)دا بەرامبەرە بە(سی نیو بێمۆول) واتە پیتی مۆسیقای (سی) و نیوە (بێمۆول) کە (بێمۆول)یش یەکێکە لە نیشانە مۆسیقییەکان لە نۆتەدا لە شێوەی (b) پیتی (بی)ی دەستیی لاتینیدا، ئەنووسرێ و نیشانەیە بۆ ئەوەی (چینی دەنگ) نیو (پلە) بەرزتر بکرێتەوە. بەم پێیە لە نۆتەکەدا کە (سی نیو بێمۆول)ە دەنگەکەی گڕ و توندە.

تێبینی:

ئەگەر سەرنجێکی تری لێکدانەوەکەم لەسەر (بۆسلیک) و (عیراق) بدرێ دەبینرێ (کوردی) وەک مۆسیقا و گۆرانی زانێکی زۆر شارەزا و بەشێوەیەکی زانایانە (بۆسلیکی مۆسیقا) و مەقامی نەرم و لەسەرخۆی بە(فەرەج) وتووە و پێی بەجێ هێشتووە و خستوویەتەتە سەر مۆسیقا و مەقامی (عیراق) کە بەرز و تیژە و لە نزمترین دەنگەوە گەیاندوویەتە ئەوپەڕی (پلە) و (چینی بەرزایی) لەو دەنگەدا و بۆ ناخـــۆش نەبوونی کـــۆڕەکـــە بەو دەنگە بەرزە و بۆ پشوودانێک، چ بەگوێگران و، چ بەخودی (فەرەج) و زۆر وەستایانە و بێ ئەوەی هەستی پێ بکرێ، بردوویەتە سەر نەغمەیەکی مالاوایی (کورسی ریحلەت) و بابزانین (کورس) چییە و ئەم دەستووری لە نزمی و (کزیکەو) ڕازی ئاوازی (گۆرانی) و سازی (مۆسیقا) لە مەرجە هونەرییەکانە.

کووس: واتە کاسە و مەبەس لە دوو جۆرە ئامێری مۆسیقییە، کە یەکێکی (کووس) لە جێی ناوی (تەپڵ)یش هاتووە ئەو تەپڵە گەورەیەی کە لە ماوەی ڕێگەی (فرسەخێک) دوورەوە دەنگی دەبیسترێ و لە ناوچەکانی خۆراساندا بەواتەی ناوی (تەپڵ) هاتووە.

ئەویتریان کە واتەی ڕاستییەکەیەتی، بریتییە لە دوو پارچە مسی بچووکی خڕی ناو کەمێک چاڵ و ئەوەندەی دەمی پیاڵە یا پەرداغێک و دیوە قۆقزەکەیەوە، (قولفە) یا (بەندک) یا (چەرمێکی) تێ دەخرێ کە دەکرێ بەپەنجەی شایەتیدا و یەکێک کەش دەکرێ بەپەنجەی گەورەدا و ئەمجا بە لە یەک دوور و نزیک خستنەوەی ئەم دوو پەنجەیە و لەیەک کەوتنی ئەو دوو پارچە مسە دەنگێکی زیل و زرنگەی تایبەتی بەپێی ئاهەنگی جوولانی پەنجەکان دەنگ دەدەن و، دەکرێنە هەردوو دەستەوە و بەکوردی (چەقەنە)ی پێ دەڵێن و لەم هەڵبەستەدا مەبەست لەمەیانە. (بڕوانە لێکدانەوەم لەسەر (چەقانە) لە پەراوێزی سەر نۆزدەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستە) لە نارەی چەقانە و دائیرەی میصریدا.

چەقەنە یا (کووس) کەواتە یەکێک لە ئامێرە مۆسیقییەکان کە بەلێدان (نەقر) یا (ایقاع)

دەنگدارەدەن و (کـووسـات) و (کـاسـات) و (صـەحنان)یشی پێ دەڵێن جـۆرە زەنگێکە یا (صەننووج = صنّوج)یشی ناودەبەن.
کۆنتـرین بەڵگەیەکی مـێژوویی کە تا ئێستـە دەرکـەوتبێ لەسەر ئـەمە ئەوەیە کە لە سـەرێنی بابلیـیـەکـاندا و لـە نێـوان سـاڵانی ١٩٥٠ – ١٥٣٠ی پێش زاییـدا و هـەروەهـا لە سـەرێنی سـوومەرییـەکانی باپیرانماندا لە نێوان ساڵی ٢٠٥٠ پێش زاییندا ئەم ئامێرە لە کوردستاندا بەکاربراوە وە لە سەرێنی ئاشوورییەکانیشا لە ٦١٢ی پێش زایندا بەکارهاتووە ئەمە لە عیراق یا کوردستاندا.
(کـوردی) کـە ناوی بردووە بـێ گـومـان لە سـەرێنی ئەویشـدا و لە لایەن ئـەو کـۆڕەوە کـە لەم هەڵبەسـتەیدا ناوی بردوون بەکاربراوە و ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەمە کۆنترین مـێژووی ئەم ئامـێرەیە لە کوردسـتـاندا بەشکو بەڵگە مێژووییـەکانی (بـابلی) و (سوومـەری) و (ئاشـووری) نیـشـانەی بوونی ئـەم ئامـێرەن لـەو هـەرە کـۆنە و بەر لەویشـەوە لە نیـشـتـمـانی ئێـمـەدا و لە باپیرانمان و لە کوردستانەوە بەجیهاندا بڵاو بووەتەوە.
(کوردی) وەنەبێ هەر تەنیا لەم تاکە هەڵبەستەیدا ناوی (کووس)ی بردبێ بەشکو لە هەڵبەستی تریشیدا وتوویە:

چونکە هاوچەشنت لە ئیـقلیـمـی مـەلاحـەتدا کـەمـە
سـا وەکـو خـوسـرەو هەمـیـشـە لێ دە (کووس)ی نادری

بەڵام (کوردی) لە خـاوکردنەوەی دەنگی (بەرز) و (گڕ)ی مـەقـامی (عێـراق)ەوە، ئەوا (کووسی ڕیحلـەت) دەداتە دەست (فـەرەج) و گـوایە مـالاوایی پێ دەکـا لـە مـەجلیس (کـۆڕ)ەکـەدا و بەمـەقـامی (نیـاز) کـۆتایی هونەرمـەندی پیـشـاندانـی (فـەرەج) دەهێنـێ، وەک لە دواترا دیاری دەکەم.
هـاتنی نـاوی (کوسی ڕیحلـەت)یش، لێـرەدا دیسـان نیـشـانـەیە بۆ ئەوە کـۆڕی بەزمـەکـە لە دوا دواییـیـەدا بووە کە وەک ئاوازێکی هەسـتـان و بڵاوەکردن و ڕۆیشـتنەوە و، یا وەک بانگەوازی و وریاکردنەوەی ئامادەبووانی کۆڕەکە بۆ کۆتاییهاتنی مەجلیسەکە بێ، وەهایە، چونکە: لە کۆندا ئەم (کووسی ڕیحلـەت)ە کە لێ درابێ نیشـانەی ئەوە بووە کە سەفـەرکردنێک بەدەسـتەوە هـەیە، بەتایبـەتی ئەگـەر فەرمـانڕەوایەک لێی دابێ ئـەوەی گەیاندووە یا مـیـوانێکیـان کە ڕۆیشـتبـێتـەوە ئەوسا (کووسی ڕیحلـەت) لێ دراوە کە بەم کووسە ئاوازێکی تایبەتی (ڕیحلـەت) واتە کۆچکردن (سـەفـەر) لێ دراوە و یەکێ لـە فـەرمـانڕەواکـانی کـوردیش (نادر شـا) لـە نێـوان هەمـوواندا بە(کووسی) چاک و (کووس زەنی) شارەزا و بەناوبانگ بووە و ئەوەتا دەوترێ (کووسی نادری) چونکە مـاوەی فەرمـانڕەواییـیـەکەی بـەتێکڕایی لە کۆچکردنی هـێرشـبردن و هـەڵکوتنەسـەر، ئەم لایانە و لادا بووە، بۆیە ئەو ناوە دراوە بەم ئامێرە مۆسیقییە.
ڕیحلەت: کۆچکردن.

کووسی ڕیحلەت: جۆرە ئاوازێکە بە(کووس) لێ دەدرێ کۆچکردن دەگەیەنێ وەک لەشکرێک بڕوا بۆ جەنگ یا پادشایەک لە شوێنێکەوە بچێ بۆ شوێنێک، ئەو جۆرە ئاوازە لێ دراوە، بەم کاسانە.

دەرچی: (کوردی) مەبەستی ئەوەیە کە (فەرەج) لە دەنگی نزمەوە گەیشتە هەرە بەرزترین، دەنگ بەگۆرانی و مۆسیقا ئەمجا خاوی بکاتەوە، بەلێدانی کاسەکان و بەئاوازی ماڵاواییکردنی (فەرەج) و بەر لەوەی کۆتاییی پێ بهێنێ لەو ماڵاواییەوە دەرچێ (بچێتە) سەر دوا ئاوازی خۆشی کە مەقامی (نیاز)ە.

مەنزڵگا: شوێنەوار، بارەگا و لێرەدا مەبەست لەو پەردانەوە بچێتە سەر پەردەیەکی تر کە (نیاز)ەکەیە.

نیاز: وشەیەکی کوردی و فارسیشە مەبەست ئارەزوو یا جۆرە نیازێک. بەڵام لێرەدا ناوی مەقامێکی مەبەستە کە لە سەرێنی تورکی عوسمانی و ئەوسای (کوردی)شدا باو بووە و بۆیە پێی وتراوە (مەقامی تورکی) و مەقامێکی تایبەتی خۆش و ناسکە و لە عەرەبیدا بە(مەقامی دەلەع) واتا (ئاوازی نازونووز) بەناوبانگە و، ئەم مەقامە لەسەر (پلە)ی (دوو گا) دەگیرسێتەوە بەڵام ئێستە ناوترێ و لە ئارادا نییە و باوی نەماوە و (کوردی) بەو مەقامە غەریبە نایابە کەوتنیشی وەستاییەکی تایبەتی پێویست بووە بەتایبەتی لەو هەموو لەم ئاوازەوە بۆ ئەو ئاواز، چوونەی (فەرەج) و دەرخستنی وەستایی و هونەرمەندیی (فەرەج) لە (فەرەج) لای داوە، چووەتە سەر هونەرمەندێکی تری بلیمەتی وەک ئەم کە (ناڵە)یە وەک بڵێی هەرە وەستا و بلیمەتەکانی خستوونەتە دوای مەجلیسەکەوە. بۆیە من لەمێژە لەسەر ئەو باوەڕەم کە کوردی بەدەسنگە ئەو هەموو کەسانی گۆرانیبێژی و دەنگخۆش و گۆرانییەکانیان و هۆزان و ئامێرەکانیان و سازەکانیان هونەری سووڕ و سەمای لە هەڵبەستەیدا ڕاگەیاندووە.

٢٨- ئەم تاکە لە سەرچاوەکانی (کۆن) و (مس) و (ص) و (ف) و (نم/١) و (ع) و (کم) و چاپەکانی گیودا: نییە و لە (گل/١٣٠٠) و (گل/بەرباخاڵ)دا هەژدەمینە و لە (گەلاڵەییەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست و یەکەمین تاکە و لە (گل/سەرکاریز)دا بیست و سێیەمینە و لە (عن)دا بیست و پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

خەتم: کۆتایی، وە ئەمیش یەکێکە لە زاراوە ئیسلامییەکان کە کەوتووەتە ناو گەلە ئیسلامەکانەوە و بەکاری دەهێنن وەک خەتمی قورئانی پیرۆز واتا خوێندنی یا خوێندنەوەی هەموو قورئان یا لە کۆڕی زیکرکردنی دەروێشی و ڕێگە (طریقە)تە ئاینییەکاندا دەڵێن: (خەتمی تەهلیلە و) و (خەتمی زیکر) و... هتد.

کە (کوردی) هەمان زاراوەی لێرەدا بۆ (خەتم) یا کۆتاییهێنا بەکردەوەکانی ئەو کۆڕی بەزمەی بەکارهێناوە و واتا یان بەهەڵبەست چۆنێتیی ڕووداوەکانی بەزمەکەی یەک لە دوای یەک بۆ گێڕاوینەتەوەو، یا ویستوویەتی کۆتایی بەهەڵبەستەکەی بهێنێ بەکۆتاییهێنان بەلێدوانی

ئەندامانی بەزمی کۆڕەکە (مەجلیسەکە) و جا نازانرێ چەند تاکە هەڵبەستی تریش لە ناوی گۆرانی و مۆسیقە و گۆرانیبێژ و سەوور و سەمادا و مۆسیقاژەنان هێشتە دەست من نەکەوتووە، چونکە وەکو لە سەرەتای هەر تاکێکەوە سەرچاوە و زنجیرەی یەک لە دوای یەکی هەر تاکێکە نووسیوە دەردەکەوێ کە چۆن ئەم هەڵبەستە پەرتەوازە بووە و پاش و پێش کراوە و دەسکارییان تیا ڕوودراوە. کە هۆی ئەوانەش پێیوەندیی بەپشێوی و ئاڵۆزی ئاخۆران بخۆرانی ئاری ناوچەکەوە بووە.

نالە: ئەگەر ئەم وشەی (نالە)یە بە(نال)ی بچووک واتە (لاواز) بێ ئەوا مەبەست لە ناوی کەسێکە و کورتکراوەی ناوی (نادر) بووە و لە کوردیشدا ئەم ناوە لە خۆشەویستیدا سووک ئەکەنەوە و بەداتاشین دەیکەنە (نالە).

لەبەر ئەوەی سەرچاوەی ئەم تاک (بەیت) تەنیا دەسنووسە کۆنەکانە کە زۆرتر پشتیان پێ ببەسترێ و ئەوانیش بەڕێنووسی کۆن نووسراون و لەوانەیە کە بوترێ (ناڵە) بە(ڵ = لام)ی قەڵەو و (دووبارە)یە و بەواتە (ناڵە = دەنگ و ئاوازێکی بەرزی گەرووەو واتە بەداخ و شەوق و ئاوات و هیواوە).

جا ئەگەر (نالە) یا (ناڵە) بێ، هەردوویان بۆ ئەم شوێنە دەگونجێن و بەڵام زۆرترەکەی بەلای (نالە = نادر)ەکەیاندا دەچێ کە ئەویش یەکێک بووە لە ئەندامەکانی کۆڕەکە و زۆر وەستا بووە لە هونەرمەندی مۆسیقاژەنی و گۆرانیبێژایدا کە کاریگەری و جوولانەوەی خۆی و مۆسیقا و گۆرانیی خستووەتە دوای هەموانەوە وەک لە ئایەتی ٢٦ لە سوورەتی (المُطففین)ی قورئاندا هاتووە: (ختامُهُ مِسك وفي ذلك فليتنافسِ المُتنافسون) واتە: (کۆتاییەکەی یا سەر قەپاتەکەی لە بۆنی خۆشی میسکە و دەبا ئەوی دەیەوێ بەربەرەکانێ بکا لە ڕێی خواناسی پاداشی بەهەشت وەرگرتنا با ئەو بەربەرەکانێیە بکا و ئەم ئایەتەش لە لێدواننی بەهەشتییەکان و پاداشی چاکەی خوادا وتراوە.

ئەمجا (کوردی)یش وەک نیشانەکردن بۆ ئەو ئایەتە جموجۆڵی (نالە)ی خستووەتە دواوە کە وەک ئەو (میسکە) بۆن خۆشەی وایە بەڵام ئەم دەنگ خۆشییە. وە یا لەبەر ئەوەی ئەم (نالە)یە لە (پلە)ی گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنەکانی تردا بەزانایی و پسپۆڕی بەرزتر بووە یا لەوانەیە لەبەر پیری لە دوای هەموانەوە کۆتاییی بەجووڵانەوەکانی کۆڕەکە هێناوە بەو وەستاییەی کەوا لە لێدانیدا (دەف) کونکا و (دەهۆڵ) بدڕێنێ، وانەی یەکاڵا بکاتەوە، ئەویش بەجۆشی لێدانەکەی بەپاڵ ئەوانەشەوە بەئاواز و دەنگە خۆشەکەی خۆی بەمەقامی (ناز) کۆتاییی بەهەموو (جموجۆڵ) واتە فەعالیاتێکی ئەندامانی کۆڕەکە بهێنێ بەڕادەیەک چۆن بۆنی میسک تا ماوەیەکی درەنگ و (زۆر) دەمێنێتەوە، هەروەها خۆشیی کردەوەکانی نالەش ئاوا زۆر بکێشێ لە پاش بەزمەکەش و هەر کەس کە بڵاوەی لێ بکا، وا بزانی تازە سەرەتای بەزمەکە بووە و بەزرنگانەوەی دەنگی ئەوەوە لە گوێیاندا لە یەکتری جیا ببنەوە.

دەف: بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی پازدەیەم لە پێشەوە لەسەر (دەف) لەگەڵ پەراوێز لەسەر تاکی بیستوهەشتەمین لە دواوە و هەندێ جێگەی تری لێکدانەوەی ئەم هەڵبەستەدا کە ناوی (دەف) هاتووە و پەراوێز لەسەر تاکی ١٩ (دائرەی میصری و پەراوێز لەسەر تاکی ٣٠ لە بارەی دەفەوە).

کون کا: مەبەستی لەوەیە کە بەهۆی بەجۆشی و گەرمی لێدانەکەیەوە گەرمبوونەوەی دەفەکە بەدەس (ناڵە)ی وەستای دەفژەنەوە کون ببێ و بدڕێ و لەو جۆشەدا، بکەوێتە بارێکی واوە کە ئیتر هۆشی بەسەرباری تیابووی خۆیەوە نەمێنێ و بکەوێتە حاڵێکی دەروونیی پێوەند بەخۆرشتێکی گیانی باڵاوە کە تێکەڵاوبوونە بەئاهەنگ و ئاوازەکانی نەغمە خۆشەکان کە ئەم حاڵە لە زۆر گۆرانیبێژ و مۆسیقاردا ڕووی داوە و ڕوو دەدات وە ئاگایان لە خۆیان نامێنێ وە یا مەبەستی لەوەیە کە ئیتر دوای (ناڵە) با دەف بدڕێنرێ، چونکە کەسێکی تر نییە، وەک (ناڵە) لێی بدا یا بگاتە ئەو، کەواتە نەمانی چاکترە نەک خراپ لێدانی و نەگەیشتنە پایەی لێدانی (ناڵە).

(کوردی) لێرەدا و لە هەر تاکە هەڵبەستێکی ئەم چامە نایابەدا، وێنەیەکی زمانداری پێشکەش بەنەتەوەکەی کردووە و چاک و پەسەندترین ئاوا کۆڕێکی بۆ وێنەگرتووین کە بەو بارە ناهەموارەشەوە چەند پێشکەوتوو بووین؟

دەهۆڵ: بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی بیستوچوارەمی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (تەپڵ)ەوە و هەندێ شوێنی تر کە تیایانا وەک نەقارە و... هتد لە لێکدانەوەی ئەم هەڵبەستەدا لەسەر (دەهۆڵ) نووسیومە. (دەهۆڵ) هەروەک لە باسی (تەپڵ)دا ڕام گەیاند (دهل) = (دەوهول)یشی پێ دەڵێن و ئەمیش جۆرە تەپڵێکی هەرە گەورەیە بەهەردوو دیویدا پێست دەگیرێ کە لە (چەمەرە)کەی پشتێنەیەک بەند دەکرێ و ئەو پشتێنەیە دەکرێتە شانەوە (ڕاست و چەپ) واتە دەکرێ بەمل و قۆڵێکا و بەهەردوو دەست لێی دەدرێ کە بەدەستێک میکوتێکی تایبەتی سەر بەپەڕۆ یا بەدەزووی چنراوەوە، نەرم کراوە و بەدەسەکەی تری بەشووڵێک و بەهەر دەسەی لە دیوێک دەدا، دەنگی لە نزمەوە تا باریک و گڕی لێ پێک دێ و بەپێی ئەو ئاوازەی دەردەبڕدرێ وەک (تک) و (دوم) دەنگی لێ دێ و لەگەڵ ئامێرە مۆسیقییەکانی تریشا دەبێتە هۆی شاردنەوەی دەنگی نەشاز و بەرز و نزم و پاش و پێش و دەنگە نابەجێکانیان کە هەڵەیان تیا ڕوودا بێ.

شەق پێ بەرێ: بدڕێنی واتە بەهەمان جۆشی دەف کونکردنەوە، لە بێ هۆشی و جۆش و خرۆشدا ئەمیش شەق پێ بەرێ.

نەی: یەکێکە لەو ئامێر و مۆسیقایانەی کە بەفوو پیاکردن لێ دەدرێ و بریتییە لە بۆڕییەکی دار یا قامیش یا ئاسن کە هەردوو سەری بەرەڵڵا و کونە و لە لا تەنشتێکییەوە (٦ تا ٧) کونی بچووکی تێ دەکرێ کە ئەوەندەی پێشی سەر پەنجە بیگرێتەوە و کونێکیش دەکرێتە

لاتەنەشتەکەی ترییەوە، بەرامبەر بەو ڕیزە کونە وردانەی تر و ئەمجا بۆ لێدان سەرێکی بەلاری دەگیرێ بەلای لێوەوە و بەلێو قووچاوییەوە نەرم فووی پیا دەکرێ و ئەو فوو پیاکردنەش شارەزاییی دەوێ ئەگەرنا هەموو فووپیاکردنێک دەنگی لێ ناهێنێ و ئەمجا بەو فووە شارەزاییە فیکەیەکی خۆش دەدات و بەدانانی پەنجەکان و لابردنیان لەسەر کونەکانی هەردوو لاتەنشتەکانییەوە، بەجۆرێکی تایبەتی ڕێکوپێک ئەوسا فوو پیاکردنەکە دەنگی خۆشی جۆراوجۆر و لە خۆشییەکەوە بۆ خۆشییەکی تری ئاهەنگداری مۆسیقی دەگۆڕدرێ و بەپێی فوو بەتوندی و بەخاوی پیاکردنەکەی دەنگ دەدا.

لە ئەوروپاش (فلووت)ی پێ دەڵێن. هەروەها لە جۆرەکانی (نای) زۆرن وەک (دوونای)، (دووزەلە) یا (جووزەلە) کە بەعارەبی (مطبەگ)ی ناو دەبەن.

(زوڕنا)ش جۆرێکی تری ئەم چەشنە ئامێرەیە کە بەفوو دەنگ دەدات بەڵام جیاوازیی (زوڕنا) و (دووزەلە) لەگەڵ ئەوانی تردا کە ناوم بردن ئەوەیە کەوا (شمشاڵ) و (نای) بەوەستایانە دەنگ دەدەن وە لە بەشوێن فوو پیاکردنەکەیاندا شتێکی ئەوتۆ نییە کە دەنگ بدات وەک ئەوی کە بەشوێن فوو پیاکردنی (دووزەلە) و (زوڕنا)وەیە کە بەبێ وەستایی هەرکە فوویان پیا کرا دەنگ دەدەن و ئیتر ئاواز بەڕاستی لێدانیان وەستایی دەوێ.

(زوڕنا)ش چەند ناوێکی تری وەک (سرِنای) و (صورِنای) وە (سرِنایی) وە (سورِنا) و... هتدی هەیە.

هەروەها (کەڕەنا) کە بریتییە لە شاخی ڕەشەوڵاخ و سەر نووکەکەی کون دەکرێ وەک نای ئەمیش وەستایانە فووی پیا دەکرێ و دەنگێکی گڕی بۆڕەیی دەدات و لە هەرە ئامێرێکی دێرینەی سەرەتایی مرۆڤە.

مۆزیقە (بووق)یش هەر لە جۆری (نای)یە و بەجۆرێکی (کەڕەنا)ش دەوترێ (کورنیتە)، بەڵام ئەم جۆرە نووکەکەی زۆر باریکە. کە (کەڕەنا) بەهەموو جۆرەکانییەوە لە هەرە کۆنترین ئامێری مۆسیقیی بەفوو دەنگدەرن لە جیهان و کوردستاندا و ئامێرێکی مرۆڤی کۆنە. (نای) بەناڵەی غەمگین بەناوبانگە بۆیە (کوردی) لە هەڵبەستەکاندا زۆر جار ناوی بردووە چونکە کوردی بەتێکڕایی سروشتێکی غەمباری بووە، لێرەشدا کە ناوی بردووە لەوەوەیە لەو جووقەدا ئەمیش هەبووە و (نای زەنی) وەک (نالە) هەبووە کە ئەو (نالە)یە ئەوەندە بینی بەهێز و درێژ بووە کە (کوردی) بە(نەی یەکالاکار)ی ناوبردووە.

(کوردی) وەنەبێ هەر لێرەشا ناوی نایی بردبێ بەشکو لە هەڵبەستی تریشیا وتوویە:

عیللەتی ناڵاندنی دڵ پێت بڵێم وەجهی چییە؟؟

بەو فیراقی ڕووی حەبیبان دائیما هاوارییە

یەکالاکا: هەڵدڕێ، شەق پێ بەرێ، داقڵیشێنێ، ئەویش بەبینی تیژ و توانایی و هێز لە نەیژەنیدا و ئەمەش ئەوپەڕی لێدوانەنە لە وەستایەکی نەیژەنی پسپۆڕی وەک (نالە) وەک لە

پەراوێزی پێشەوە لەسەر ئەم تاکە هەڵبەستە هاتووە و، ئەم کونکردن و یەکالاکاکردن و شەق پێ بردنە ئەشێ لە خەفەتی برانەوەی کۆڕەکەوە بووە.

ناڵە: وەک لە لێکدانەوەی ناوی (ناڵە)دا ڕام گەیاند لەوانەیە کە مەبەس لە (ناله) یا (ناڵە) بێ و هەردووکیشیان ئەگرێتەوە بەڵام لێرەدا ئەو گومانە لادەبات کە لەوانەیە لەوێدا مەبەسی (ناله) بێت چونکی لێرەدا (ناڵە) هاتووە.

ناڵە: بەواتە دەنگ بەبەرزی لە قوڕگەوە بەدەم خەفەت و ئاواتەوە و، جوانی لێرەدا هاتنی ناوی ناله (نادر) و ناڵە. لەم تاکەدا و مەبەست لەو ناڵە بەهێزەیەتی کە بەوتنی مەقامی (ناز) وەک (دەف) کون کا و (دەهۆڵ) شەق پێ بەرێ و ناوی یەکالا کات وەهایە، چونکە هەناسەی سەرڕێژ کرد و پۆنگخواردووە داوودییەکەی ئەو جۆرە ئامێرە مۆسیقییانەی بۆڕ داوە و سەروو ئەوان کەوتووە لە هەر ڕوویەکی پەسەندەوە.

داوودی: واتە وەک هی داوود – بڕوانە لێکدانەوەی سەر داوود لە پەراوێزی تاکی پێنجەم لەم هەڵبەستەدا.

ئاواز: دەنگ و ساز و سۆز – بەڵام لێرەدا مەبەستی یا بۆ ئاوازی (دەف و دەهۆڵ و نای)یە کە (ناله) = (نادر) لێی داوە، یا مەبەستی لە ئاوازی خودی (ناله) بووە کە گۆرانی یا مەقامی (ناز)ی وتووە.

ناز: بەواتەی زمانی؛ جۆرە عیشوە و خۆ تەسککردنەوەیە نازاندنەوەیەکە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە مەقامێکی زۆر کۆنە کە بێ گومان لە سەرێنی (کوردی)شدا وتراوە و بەتایبەتی گۆرانیبێژێکی وەک (ناله)ی مۆسیقاریش کەوا چاکی لەم مەقامە زانیوە کە ئەوەتا (کوردی) دەری بڕیوە کە بەوتنی ئەم ئاوازە لە لایەن (ناله)وە، دەنگی ئامێرە مۆسیقییەکانی کپ کردووە و بۆڕی داون بەڵام ئێستە ئەم مەقامە ناوترێ و لە ناواندا نییە.

ئەم مەقامە لەسەر (پلە)ی (ڕاست) دەگیرسێتەوە کە دەزانرێ گرنگترین ئاواز، ئاوازی (ڕاست)ە هەرچەندە (ناز)یش لە مەقامێک یا دوو یا پتر مەقام پێک دێ، بەڵام لە وتنیدا لەو مەقامە سەرچاوەییانە لادەدا و بێژەرەکەی هەر دەیباتەوە سەر گیرساننەوە، بەسەر (پلە)ی (ڕاست)ەوە. بڕوانە پەراوێزەکان لەسەر (ناز) لە تاکەکانی ١١ و ١٧ و ٢٣ و ٢٥دا.

٢٩- ئەم تاکە لە (عن) و (گەلاڵەیی ١٣٠٠) و (بەرباخەڵ) و (مس) و (ص) و (ف) و (نم/١) و (ع) و (کم) و (گیوەکان)دا نییە و لە (سەرکارێز)دا نۆزدەەمین تاکە و لە (کۆن)دا بیستەمین و لە گەلاڵەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠دا بیست و سێیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هێشتە چاپ نەکراوە.

تەپڵخانە: ئەو بەڕێوەبەرایەتی یا ئەو سەرپەرشتیارێتییەیە لە جێگەی (جووقەی عەسکەری و پۆلیسی) ئێستەیە کە جاران هەر فەرمانڕەواییەکی کۆن یا هەر پاشا و والییەک بوویەتی لە کاتی جووڵانەوەکانی ئەو سەرۆکەدا دەستەیەکی (تەپڵخانە)ی لەگەڵ بووە و بەبۆنەی تایبەتەوە

بۆ ئەو مەزنە خراوەتەوە کارەوە.

مۆرکرێ: داخرێ، هەڵگیرێ، نەمێنێ. (کوردی) بێزاری لە هەندێ هەڵوێستی فەرمانڕەوا دەربڕیوە و لایەنی (گەل) گرتنی لەم هەڵبەستەیدا دەربڕیوە.

دۆندار: بڕوانە پەراوێزی سەر ئەم تاکە هەڵبەستە کە لە لێکدانەوەی تەپڵخانەدا لە پێشەوە کەمێک لە (چییەتی) دۆندار دواوم و لێرەشدا ئەوا شتێکی تری دەخەمە سەر کە عارەبەکان (دەبەندار)یان پێ وتووە بەواتە ئەوەی کە لە تەپڵخانەدا لە تەپڵ دەدا و یا (الطَّبال) یا خاوەنی تەپڵ و لێدەرانی واتە (طەببالە = الطبّالة) بەمەبەستی ئەوەی تەپڵی بچووک لێ دەدا، وە یا تەپڵچییەتی (تەپڵبازی) دەکا.

هەروەها لە هەندێ سەرچاوەدا بەرامبەر بە«دۆندار»ە عارەبەکان وتوویانە (الدورو) و بەوەیان لێک داوەتەوە کە (کاس – یا – کووس) لێ دەدا لە قەڵای فەرمانڕەوادا لە هەر شەوێکدا کە چەند جار بەدەوری قەڵاکەدا بەئامێرە مۆسیقییەکەیەوە لە پاش بانگی (شێوان) جارێک و جارێکی تریش لە دوای بانگی خەوتنان... هتد. لە بەراوردی سەرچاوەکاندا بۆم دەرکەوتووە کەوا (دۆندار) لە (باڵباز) مەزنترە وە بۆ (الدورە)کەی سەرەوە دیسان بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی نۆزدیەمی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (دائیرەی میصری)یەوە و بڕوا ناکەم (دائیرەی میصری) ناو تەپڵخانەی بابان بوونی و خودی (کورد) لەو هەڵبەستە گرنگە مێژووییەیدا کە بۆ کۆچکردنەکەی ئەحمەد پاشای دوا پاشای بابان و دوای تێکچوونی فەرمانڕەواییەکەی هەڵی بەستووە وتوویە:

ترنگەی تەپڵی باز ئاتلانی چاوەش دەنگی جارچی دێ
بەتیپی غەم دەڵێ نامەرد، ئەسەردڵ ئەمڕۆ یەلغارە
دەڵێی ئەسپی فیراق سمکۆڵ دەکا وا لێڵە بینایم
دەڵێی تەپڵی تفاقیان ژەند کەوا گوێم پڕ لە هاوارە
لە پێش بەیداخی شادی یار ئەوا ئەسپی دەئاژێوێ
لە پشت تیپی سوپاسالار و هەم پێش بەند و (دۆندار)ە

کە هۆنەرانی تریشمان جار جار ئەم وشەی (دۆندار)ەیان لە هەڵبەستیاندا دووبارە کردووەتەوە.

قڕ: نەهێشتن و لەناوبردن و بنەبڕکردن و قەڵاچۆکردن.

قۆڵ: بەواتە باڵ و پەل و لە ڕێکخستنی سوپاییشدا بەبەشێک لە سوپا دەوترێ (قۆڵ) و بەتایبەتی لە سەرێنی عوسمانی و بابانەکاندا (قۆڵ هۆردو) هەبووە کە (کوردی) مەبەستی لە هەردوو لێکدانەوەکە بووە کەوا (تەپڵخانە) بەشێکی (قۆڵێکی) سوپا بووە و، یا وەک قۆڵی سەڵتەی (پۆشاکێکی) پاشا وا بووە کە خۆی پێوە نواندووە یا مۆسیقای (تەپڵخانە) هەر بارێکی پاشای ڕاگەیاندووە نەک باری گەل و گشتی و... هتد.

سەڵتە: جۆرە پۆشاکێکی کۆنی کوردانەیە و وەک نیوە چاکەتی ئێستە، وایە بەڵام لەو کورتترە و چاکەت گیرفانی لە دەرەوەیە بەڵام سەڵتە گیرفانی بەدیوی ناوەوەیەتی و درێژاییی سەڵتە ئەوەندەی تا کەلەکە پتر بەرەوخوار نییە و جاران لە جۆرەها چۆغەی یەک ڕەنگی ڕەش و شین و سوور و... هتد دەکرا بەنەخش و نیگار بەسوورمە ملیوان و بەرۆک و بەرسنگ و ناو پشت و سەرقۆڵ و... هتدی دەچنرا و بەر و پەراوێزی پیا دەگیرا.

(کوردی) لە هەمان کاتا ئەم سەڵتەیەی لێرەدا بەمەبەستی (سەڵتە) واتە (سوڵتە = سلطە) = دەسەڵاتداریەتیی فەرمانڕەواکانە و ئەمجا ئەو (دۆندار) و (ئەفسەر) و (باڵباز) و کارکەرانەی (تەپڵخانە)ی بەقۆڵی (بەشێک) لە سەڵتە = دەسەڵاتی پاشا و فەرمانڕەواکان داناوە، نەک هی زۆربەی گەل و گەل لە دەنگی ناخۆشی (تەپڵخانە) و هونەرمەندی (دۆندار) بەهرەوەریی تەواوی نەبووە و بەئارەزووی ئەویش نەبووە و لە بەرگوێیدا گران و بێزارکار بووە.

ئەم و ئەو: مەبەستی لە فەرمانڕەواکانە نەک زۆربەی گەل کە (کوردی) لێرەدا هەروەک بڵێ – (بێگانە بەگەل).

ئەفسەر: گەورە و سەرۆکی یا پایەداری سەربازان و بەڕێوەبەری یا سەرپەرشتیاری تەپڵخانە بۆ ئێرە مەبەستە.

باڵباز: (سەربازی تەپڵخانە) وە یا (تەپڵ) و مۆسیقا لێدەری (تەپڵخانە) کە سەرباز لێرەدا لە (دۆندار) بچووکتر و لە پایەی کارگوزاری فەرمانبەرێتی ناو (تەپڵخانە)ی مەبەست بووە.

٣٠– ئەم تاکە لە (گەلاڵەیی ١٣٠٠) و (عن) و (مس) و (ص) و (ف) و (نم/١) و (بەرباخەڵ) و (ع) و (کم) و (چاپەکانی گیو)دا نییە و، لە (سەرکارێز) و (کۆن)دا بیست و یەکەمین تاکە و لە هەرسێ (گەلاڵەیی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست و چوارەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە. کە ئەم تاکە پێنجەمینە لە (عن)ی بنکەی ئەم هەڵبەستەدا نییە و چاپیش نەکراوە.

تەپڵ: بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی ٢٤ لە بارەی تەپڵەوە و، پەراوێزی سەر تاکی ٢٨ لە بارەی دەهۆڵەوە و پەراوێزی سەر تاکی ٢٩ لە بارەی تەپڵخانەوە.

دەف: بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی پازدەیەم و پەراوێزی سەر تاکی بیست وهەشتەم لە بارەی (دەف)ەوە.

تەپڵ و دەف: لەو چوار تاکەی (١٥ و ٢٤ و ٢٨ و ٢٩)دا کە تییایاندا لە بارەی (تەپڵ و دەف)ەوەن و لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە (کوردی) مەبەستی ئەم دوو ئامێرە مۆسیقییە بووە کەوا شێخەکان کە بەهۆی دەروێشەکانیانەوە بەکاریان هێناوە، میرەکانیش بەهۆی باڵباز و دۆندار و ئەفسەری تەپڵخانەوە بەکاریان هێناوە و زۆربەی گەل ئەوەندەی ئەوان کەڵکی لێ وەرنەگرتووە، چونکە مۆسیقا لە ڕاستیدا خۆرشتێکی گیانی هەموو مرۆڤە نەک دەست بەسەراگرتنی لە لایەن چەند بەرەیەکی وەک (شێخ) و (میر) و... کەوا (کوردی) دووبارە ناوی ئەم دوو ئامێرە مۆسیقا (تەپڵ و دەف)ەی بردووە بەو بۆنەیەوە کەوا شێخەکان تەپڵ و دەفیان

هەیە و دەروێشــەکـانیــان بۆیان لێ داون و لـە جـێی کـەڵکی زۆربەی گـەل ئەم تـەپڵ و دەفـە بانگەوازێکە بۆ سـوود بەشـێخـەکـان و (جاه)یان پێی بەهێز بوون بـەناوی ئاینەوە بەتایبـەتی یەکێ لە ڕێگە (طـەریقــە)تەکـان کـە (مــەولـەوی) چووە، ڕێگەی تەواوی تێکەڵکردنـی ئامـێـرە مۆسـیـقـییـەکانیدا و لە کـۆڕی زیکر و تەهلیلـەکانیـان هەرچەند ئەم طەریقەیە (مـەولەوی) لە کوردستانی عیراق و قەڵەمڕەوی باباندا نەبووە بەڵام لە کوردستانی تورکیادا زۆر بڵاوبووەتەوە لە جێگەی ئەو طەریقـەی نـەقشی و قـادری لای ئێـمـە تەپڵ و دەفـیـان بەکـارهێناوە کـە مـێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە هـۆنراوەی زۆربەی هۆنەرانمان لە دژ ئەو شێخ و صـۆفی و دەروێش و زاهید و واعیـز و...هتدە درۆزنە خـراپکارانە بوون کەوا جـۆرەها خیانەتیـان لە گەل و نیشـتـمـان و ئاین کردووە، بۆیە (کوردی)ش لێرەدا توانجی لێ دوان و پلاری تێ گرتوون وەک لە پێشەوە تانەی لە ئامێرە مـۆسـیـقـییەکان و دۆندار و باڵبـاز و ئەفسـەری تەپڵـخـانەش داوە کـەوا  هەندێ لەبەرە ئاینی و فـەرمانڕەوا سـیاسـییـەکان بۆ سـوودی خۆیان بەکاریان هێناوە نەک بۆ سـوودی گەل و خـۆشی پێدانیان. بڕوانە پەراوێزی سـەر تاکی ١٩ (دائیـرەی میـصـری) و پەراوێزی سـەر تاکی ٢٨ لە بارەی (دەف)ەوە کـە لە ڕاسـتـیـشـدا مـۆسـیـقـا بۆ کۆڕی ئاینی خـراپ نییـە، سـەر دەق شکاندنی دژایەتی قەدەغەکردنی مۆسیقا و گۆرانی بووە لە لای ئیسلامەوە.

جاه: پایە بڵندی، شوێنەواری مەزن.

شـێخ: نـازناوێکی کـۆمــەڵایەتـیــە و مــەبەسـت لە پیـاوی مــەزنـی ئاینـی یا ســەرۆکی ڕێگە (طەریقە)یەکی (نەقشی) یا (قادری) و... هتدە کە دەروێش و مرید و صـۆفییان هەن.

هـەروەها شـێخ نازنـاوە بۆ ئەوەی مـەزنی خـێڵ یا کـۆمـەڵێ لە کەسـان بێ لـە لایەنی تەمـەن یا دەسـەڵات یا زانسـتی و... کە ئـەمـەیان عـەرەب پەیڕەوی دەکـەن کـورد، ناگـرێتـەوە (الموسـوعـە العـربیــە المیـســرە) بڕوانە پـەراوێز لەســەر تاکی ٣١ و پەراوێزی ســەر تاکی ٣٦ لـە بارەی شێخەوە...

بانەمـێنن: ئەم تـێ ڕۆچوونەی (کـوردی) جـۆرە شـۆڕشـێکە لـەو سـەرێنیـیـەدا گـێـڕاوێتی کـەوا بەئاشکرا بانگەوازی مۆرکردنی تەپڵخانە و قڕکردنی دۆندار توانج گرتن لە ئەفسەر و باڵباز و نەمانی تەپڵ و دەفی شـێخی درۆزنی هەڵداوە کە ئەو ئامێرە مـۆسیقییـانەی بەکاریان هێناوە بۆ گشت نین و تاک تاکی کەسانێکن لە ڕێی سوودی خـۆیاندا بەکاریان هێناوە ئەگەر نا ئەگەر لە شوێنی خۆیاندا بەڕاستی و بەدڵپاکی و ساغی لەگەڵ گشتدا بن خراپ نین.

دەنگ بدەن: (کـوردی) وەک خۆی بانگەوازە شـۆڕشگێڕییەکەی هەڵداوە لە هەمان کاتیشـا ڕای گەیاندووە کە گەل لە ناو خۆیاندا یەک بن.

وە یا (دەنگ بدەن) لێرەدا مەبەس لەوەیە کە (دەف و تـەپڵ) بانەمێنن نەوەک دەنگدەری دەستەی دژی گەل بن.

بێنەوە: بـەهـەرحـاڵ ئەم (بانەمـێنن)ە بانگەوازی شـۆڕشگێڕی دەگـەیـەنێ لە پشـتگیـری زۆربەی

گەلدا بۆ نەمانی دەروێشیگەری و سۆفیگەری و زاهیدی و کارگوزارانی تەپڵخانەکەدا ناڕاست بوون، دیارە لەگەڵ ڕاستەکانیانی نەبووە چونکە خۆیشی سۆفی مەشرەب بووە و بۆیە پێیان دەڵێ ئەی گەل سابێنەوە، تێکەڵ بەکۆڕی مۆسیقایەک بن کە بۆ گەل بێ نەک بۆ چەند کەسێکی پایە بڵند، چونکە ئەگەر بۆ فەرمانڕەوایی و دڵسۆز و شێخی بەڕاستی بێ، وەک هی گەل بێ وایە.

بەزمی: مەبەست لەو بەزمەیە کە هەڵبەستەکەی بەسەرا هەڵداوە هەمووان بانگی بەزمی وەها دەکا. بۆ بەشداری لەو کۆڕەدا، بۆیە لەو ڕایەدام ئەم (چامە) گرنگەی کوردی کارێکی هێما (ڕەمزی)یە.

بابێتە: بۆ ئەوەی ببێ، واتە بەزمەکە ببێتە هی گەل زۆربەی گەل.

ڕێگەباز: ببێتە ڕێڕەوێکی ئاسایی بۆ هەمووان (هەمووان) = هەموو گەل. کەڵک لە مۆسیقا وەربگرن نەک هۆی سوودی ماددی و مەعنەوی (سەرزاریی)، شێخ و میر و هۆی جاه و سوڵتەی ئەوان و ببێتە هۆی یا ڕێگەبازی گشتی و سوودمەندیی گەل.

٣١- ئەم تاکە لە (گل ١٣٠٠) و (گل/بەرباخەڵ) و (مس) و (ف) و (نم/١) و (کم) و چاپە (گیوەکان)دا نییە و لە (گل/سەرکارێز) و (کۆن)دا بیست و یەکەمین و لە هەرسێ (گل ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست و چوارەمینە و لە (عن)دا بیست و شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە چاپیش نەکراوە.

جاه: شوێنەوار، پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی، بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی ٣٠ی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (جاه)ەوە.

سوڵتە: بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی بیست ونۆیەمی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (سەڵتە)وە.

شێخ: بڕوانە پەراوێز لەسەر تاکی پێشوو (٣١) لە بارەی شێخەوە کە لێرەدا مەبەسی شێخە تەریقەتە درۆزنەکانی ئەو سەرێنییە بووە کە بەدەستێکی نهێنی لە ڕێگەی سوودی بێگانەی وەک مەمالیکی ئەوسای بەغدا و فەرمانڕەوایی ئێران و خەلافەتی عوسمانی و لە سەروو هەمووانەوە پەنجە ژەهراوییەکەی ئینگلیز بەهۆی (مستەر ڕیچ)ەوە و... هتد ئەجوولانەوە و کەسایەتییەکی وەک مەولا خالیدی نەقشبەندیان ئاوارە کرد و ئەمجا بابانیان ڕووخاند.

میر: فەرمانڕەوا، ئەم وشەیە سووککراوەی (ئەمیر) کە عەرەب لە (مێر) مرۆڤی کوردییەوە، دزیویە و ئەو فەرمانڕەوایانەی بابانی مەبەستە کە خۆپەرست بوون لە ڕێی پایەی خۆیاندا نەک لە دڵسۆزییان بۆ گەلەوە و ئەم ناوی (میر)ش لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەوە وەریان دەگرت و لەمیش گەورەتر (میری میران) بووە کە پاشاکانی بابان هەموویان لەم دوو نازناوەیان وەرگرتووە بۆ ئەوەی پشتیوانیی تورکە دڕندەکانی عوسمانی بکەن.

دوور نییە مەبەستی کوردی لە یەکێکی گێرە شێوێنی وەک (عەبدوڵڵا پاشای بابان) بووبێ کە ژیانی هەر تێکدان بووە و مێژووی ڕەش.

دێنێ: دەهێنێ، ئەیەنێ، نرخی ئەوی هەیە...
دەمێ: کاتێ، تۆزێ، کەمێ، گاوێ، گاڤێ...
مەجلیس: شوێن ڕۆنیشتین، شوێن کۆبوونەوەی چەند کەسێ و مەبەستی لەو کۆڕی ڕابواردنی بەزمەی خۆیان بووە کە ئەم چامەیەی بەسەرا هەڵداوە و بەلایەوە کە تۆزێک (کەمێک) لە کاتی ئەو مەجلیسە هەموو جاه و سوڵتەی شێخ و میری هێناوە؛ چونکە (کوردی) کەسێ بووە چی بەسەر ئەم یا ئەوەوە نەبووە و لە فەرمانڕەوایی یا پەیوەندییەکی تەواوی بە(طەریقەت)ێکی تایبەتییەوە نەبووە لەگەڵ سۆفێتیشدا.
تا: تاکو، تەنانەت.
گەرد: تۆز، بای پێ، تۆزی پێ.
پێشیانا: قاچیانا. ئەمەش وتەیەکی وەک ڕستە ئامادەکانی پێشینانە یەکێ بەیەکێ دەڵێ بەتۆزی پێیا ناگات، واتە ئەو ئەوەندە تیژە یا لەو لە پێشتر و بالاتر و مەزنتر و جوانترە.
پەرواز: فڕین، باڵگرتن.
باز: بازدان، قەڵەمباز، خۆهەڵدان بەگوڕ بە شتەوە.
٣٢- ئەم تاکە لە (ف) و (نم/١) و (ع) و (کم) و چاپە (گیوەکان)دا پانزەمینە و لە (ص)دا بیستەمینە و لە (گل ١٣٠٠)دا نۆزدەمینە و لە (گل/سەرکارێز) و (کۆن) و (مس)دا بیست ودووهەمین و لە هەرسێ (گل ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست و پێنجەمین و لە (عن) و (گل/بەرباخەڵ)دا بیست وحەوتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و پانزەمین تاکی چاپ کراوە.
مەجلیس: مەبەستی ئەو کۆڕەیە کە لەم هەڵبەستەدا لێی دواوە، بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی ٣٠ و پەراوێز لەسەر تاکی ٣١ی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (بەزم) و (مەجلیس)ەوە.
ئەر: ئەگەر، خۆ.
وابێ: وەها بێ، ئاوەها بێ، ئاوا بێ.
جەمشیدی جەم: ناوی یەکێکە لە شاکانی بەرەی پێشدادیان و بنەچەی ئەم پاشایە دەگەڕێتەوە بۆ سەر (هۆشەنگ) و لەسەر ئەم پادشایە (جەمشید) ئەوەندە (شتی سەیر) هەن، هەندێکیان کەوتوونەتە قاڵبی ئەفسانەییەوە، بۆیە بەپاڵەوانێکی ئەفسانەیی فارسیش دانراوە و گوایە لەگەڵ ئەوەشدا کە پاشاش بووە، خەڵکیشی فێری دەستووری ئاینی و ڕەوشتی چاکەکردن کردووە. هەروەها توانیویەتی هۆیەکی ئەوتۆی پاراستن، لە گەرما و سەرما بدۆزێتەوە تا گەلەکەی لەم دوو ڕواڵەتە سروشتییە بپارێزێ و دەڵێن سەرۆکی شەیتانەکان (ضحاک) بەسەریا زاڵ بووە و کوشتوویەتی و لە پادشایەتیدا گوایە ٧٠٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە وە دەشڵێن (ضحاک = ئاستیاگ) نەیکوشتووە بەشکو لە دەسی هەلاتووە بۆ (سیستان) و ئەو پاڵەوانە مەزنەی ئێرانیش (ڕۆستەمی زاڵ) لە نەوەی ئەمە کە لە بەرەی باپیرانمان بووە.
ئەم جەمشیدە لە لای فارسەکانیش بەپاشای دادپەرست، بەناوبانگە و خاوەنی فەلسەفەیەکی

تایبـەتی گرنگ و مـەزنـی مرۆڤـایەتی بـووە و تەنانەت نامـیلکەیەکی لەو بارەیەوە لـە پاش بەجێ ماوە کە تێدا ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ ئەشرەفی هەموو بوونییەکە لە جیهاندا.

وەها قـاوە کـە بـەهۆی پاڕانەوەی ئـەوەوە لە خـوا، تـاکـو مـاوەی ٣٠٠ سـاڵ کـەس لە ئێـراندا نەمـردووە و دەڵێن ئەویش یەکەم کـەسە کـەوا سـوپای ڕێکوپێکی پێکەوە ناوە و، چەکی دروست کردووە و هـەروەها دروستکەری (بادە – مەی) و بەخۆش ڕابواردن بەناوبانگە.

(کـوردی) کە ناوی ئەمی هێنـاوە، وەک زۆربەی هۆنەرانی ناوچەکەش ناویان هێناوە، لەبەر ئەم ڕەوشـتـانە و بەتایبـەتی لەبەر خـۆش ڕابواردن و بادە دروسـتکردنـەکەیەوە بووە کـە ئەو کۆڕەی (کوردی) لە چاو کۆڕەکانی جەمشیددا هەڵی گرتووە کە خودی جەمشید تیایا فەڕاش بێ.

فەڕاش: جێ ڕاخەر، بەردەس، خزمەتکار.

مەی – بادە: خواردنەوەی سەرخۆشکار.

بەها: نرخ، بایی.

جام: ئەو ئامـان یا بادیەیە یا دەفرەیە کە مەیی پێ دەخـورێتەوە. بەڵام ئەم جامـەی (کوردی) کە لەم کـۆڕەدا لێی دواوە بەلایەوە وابووە، هـەر بەتەنیـا یەک جامی پڕ لە بادە (مـەی)ی ئەو کـۆڕە هـەموو وڵاتی (ئێران) و (حیجاز)ی هێناوە.

ئێـران: ئەم وشـەیە لە سـەرەتـادا ناوی (هۆشـەنگ) کـوڕی سـیـامـەک بووە و بەنـاوی ئەوەوە فـەرمـانڕەواییـیـەکەی بریتی بووە لە نیشـتمانـی فارس و خـۆراسـان و ئازەربایجـان و ئەهواز و طەبەرسـتـان هەتا سنووری عیراق دێت کە سـەرچاوەکان بۆ ئەوەی ڕای نەگەیەنی (کوردسـتـان وەها بەپێچوپەنا و بەدرێژی ناویان بردوون وەک (فارس) بە(ئێران) ناوی ئەبا و عەرەبی عیراق بە(شیمال) و بە(مەنطیگە = مەنطقە) و تورک بەتورکیا ناویان بردووە و دەیبەن.

حیجـاز: وەک لە پێشـەوە نووسیـومـە ناوی مەقـامێکی گۆرانییـە و بڕوانە پەراوێزی سـەر تاکی بیست ودووەمی ئەو هەڵبەستە لە بارەی (حیجاز)ەوە.

حیجـاز: ناوی مـقاطـعەیـەکە لە سـەرووی ڕۆژاوای پاشـایەتیی عەرەبیی سـعودی ئێسـتـەوە کـە دەکـەوێتـە ناوچـەی (نەجد)ەوە و لەم مـوقـاطـەعـەیـەدا دوو شـاری پیـرۆزی ئیـسـلام (مـەککە) و (مـەدینە) هەڵکەوتوون، کەوا هـەمـوو سـاڵێ حاجییەکانی ئیـسـلام بەملیۆن ڕوویان تێ دەکەن و ئەم مقاطعەیەش سەر بەپاشایەتیی عەرەبی سعوودییە و یاسایەکی پاشایەتی هەیە.

جێگەی سـەرسـامییـە کە (کوردی) لەم هـەڵبـەسـتـەیدا (ئێران) و (حـیـجاز)ی داوە بەیەک جـامی مەی یا نرخی ئەو دوو وڵاتەی بەنرخی بادیەیەکی پڕ بادەی ئەو کۆڕە داناوە.

بەڵام با بڵێین ئەوا ئێران هـەر هیچ، کـەوا لەو سـەرێنییەدا و تا ئێستـەش لەگەڵ (کورد)دا خراپ بووە و پیـلانی گێڕاوە و لە دژی و بـۆیە ئەو ئێرانە خـۆشـەی بەو جـامە مەیە داوە، بەڵام پێدانی وڵاتی (حیجاز) کە وەک ئاشکرایە شوێنی (مەککە) و (مەدینە)ی پیرۆز و شـوێنی شتـە پیرۆزە ئیـسلامییـەکانی وەک کـەعبـە (حجـر الاسود) و مـەزاری پێغـەمبـەر (د.خ) و زۆربـەی سـەحـابی و

عولەماکان و شوێنی هاتنە خوارەوەی وەحی و سەرچاوەی ئیسلامی و... هتد و کە ئایا (کوردی) چۆنی ڕەوا بینیوە (حیجاز) بەو هەموو تیابوونەیەوە، بدا بەیەک جامی مەیی ئەو کۆڕە؟ کە ئەگەر مەبەستی بادەیەکی ئاسمانی بەرزی گیانی و خوایی نەبووبێ.

ئەم پرسیارە وەڵامێکی نهێنیی هەیە کە (کوردی) لەگەڵ خۆیدا بردوویە گۆڕەکەیەوە لە گردی سەیوان نزیک گومەزەکەی شێخ مارف و پاشاکانی بابانەوە لە شاری سولەیمانی لە تەرمە پاکەکەی تیا نێژراوە. وای بۆ دەچم کە سەروا (قافیە)ی هەموو تاکە هەڵبەستەکانی لەسەر ئاهەنگی وشەی (حیجاز)ە و (کوردی)یش بەو وەستاییەی خۆیەوە تۆ بڵێی لەبەر ئەوە (حیجاز)ی دانابێ؟ وە یا وەک مەبەستی بادەی ئاسمانی و سەرخۆشی بەعەشقی پاکی خوایی مەعنەوییەوە بووبێ یا...؟

٣٣- ئەم تاکە لە (ف) و (نم/١) و (ع) و (کم) و چاپە (گیوەکان)دا چواردەمینە و لە (گل/١٣٠٠)دا بیستەمینە و لە (ص)دا بیست و یەکەمینە و لە (گل/سەرکارێز و کۆن و مس)دا بیست و سێیەمینە و لە هەرسێ گەڵاڵەیی (١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠ و بەرباخەڵ)دا بیست و شەشەمینە و لە (عن)دا بیست و هەشتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و چواردەمینی چاپ کراوە.

موطریب: واتە ئەوی گۆرانی دەڵێ: و یا خۆشی دێنێ وە یا مۆسیقاژەنە، وە یا سووڕ و سەماکارەکانە.

ئەر وا بن: ئەگەر وەها بن.

فیدا: باڵاگەردان بوون، خۆ لە ڕێی کەسێکا یا لە ڕێی بروایەکا یا لە ڕێی شتێکا بەختکردن.

نەکیسا: چەنگ ژەنێکی دەرباری خەسرەوی پەروێز بووە کە کوردێکی هونەرمەندی زۆر کۆنمان بووە.

بارەبود یا باربود: ناوی گۆرانیبێژێکی کوردی زۆر بەناوبانگی کیسرای پەروێز (خوسرەوی پەروێز)ە و لە هەمان کاتا (حاجیب)ی = پەردەداری ئەو پاشایەش بووە و زۆر شارەزای لێدانی (بەربەت) واتا (عوود) بووە و تیا وەستایەکی بێ هاوتا بووە و تا ئێستەش زۆر گۆرانی و ئاوازی مۆسیقای داهێنراوی (باربود) هەر ماونەتەوە. ئەم بلیمەتە خەلقی شاری (شیراز) بووە و گوایە (١٠٠) لەحنی هەبووە و لەوانە (٣٠)ییان زۆرتر بەناوبانگی هەڵبژاردن و بەناوبانگی هەموو کۆڕە گۆرانیبێژەکانی جیهانن کە ئەمانەن: (گەنجی باداوەر)، (گەنج گاه)، (گەنجی سووختە)، (شاد ڕەوان)، (مروارید)، (ئارایشی خورشید)، (تەختی تاقدیس)، (ناقووس)، (ئەورەنگی)، (حوقەی کاوس)، (بەرکوهان)، (موشکدانە)، (نیمروز)، (سەبزدەر سەبز)، (قفلی رۆمی)، (سەردەستان)، (سەردی سەهی)، (نوشین بادە)، (ئارایشی جان)، (مسگویە)، (تازە نەورۆز - یاساری نەورۆز)، (مهرگانی)، (مرواریی نێک)، (شەبدیز)، (شەبی فەڕوخ)، (خونچەی کەبک دەری)، (نەخچیرگان)، (کینی سیاوەش)، (کینی ئیرەج) وە (باغی شیرین). وە بۆ مەجلیسی خوسرەوی پەروێزی هەڵبژاردن. بڕوانە هەڵبژاردنێکی تری وەها

بەناوی پەردەوە لەسەر تاکی بیست وشەشەمین.
(باربود) جگە لەمانەش ڕێکخەری تەلی ئامێرە مۆسیقییەکانیش بووە کە تا ئێستەش لە کۆڕە زانستییە ئاکادیمییەکانی جیهاندا ئەو ڕێکخستنە بە(دەستانی باربود) ناو دەبرێ کە بەو (دەستان)انە (ئەلحان) دادەنرێ و بەبۆنەیەوە بەهەریەکێ لە ئەلحانەکانی (باربود) دەوترێ (دەستان).
(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا ئەم (باربود)ەی کردووەتە فیدای ئەو گۆرانیبێژ و مۆسیقار و سووڕ و سەماکارانەی ئەو کۆڕەی خۆی، چونکی بەلایەوە گەلێ پێش (باربود) کەوتوون لە شارەزایی و هونەرمەندیدا، ئەگەرچی ناوی (باربود) مردنەکەشی دەرخستنی شکۆمەندیی ئەو کەسایەتییەمانە.
ساقی: مەیدەر، بادەفرۆش، یا هەر پێشکەشکارێکی خواردنەکانی وەک (خۆت) و (چا) و… هتد.
ئەر وا بێ: ئەگەر وەها بێ.
ئەر وا بێ (ف): ئەر وا بن – ئەمەش نابێ، چونکی ساقی (مفرد) تاکە.
قوربان: خۆ بەقوربان کردن، بالآگەردان بوون. کە ئەم وشەیە (کوردی) زۆر جار دووبارەی کردووەتەوە لە هەڵبەستەکانیا.
دیدە: چاو.
گەر: لە سەرچاوەکانی جگە لە (عن)دا: (ئەر) نووسراوە، کە ئەمیش چونکە دووبارە دەبێ، پەسەند نییە.
ئەیاز: بەواتە بای بەربەیان وە یا بایەکی فێنک و خۆش، لە هەمان کاتیشا ناوی پیاوێکی زۆر قسەخۆش و نوکتەچی و هێژا بووە، لای (سوڵتان مەحموودی غەزنەوی) بووە کە کوردان (هەیاس) و یا (هەیاسی خاس)ی پێ ئەڵێن و کەسێکە وەک مەلای مەزبوورەی لێ هاتووە، هەرچی قسەی خۆش بێ، دەیدەنە پاڵ ئەو با لەوێشەوە نەبووبێ، لەبەر قسە خۆشیی ئەم ئەیازە بوو کە سوڵتان مەحموود لە خۆی نزیک کردووەتەوە و هەمیشە کردوویەتە هەمدەمی خۆی وەک سالم وتوویە:

پێچیدە بابێ دڵی عەشقت هەمیشە وەک
زولفی ئەیاز و گەردنی مەحموودی غەزنەوی

٣٤- ئەم تاکە لە (ف) و (نم/١) و (ع) و (چاپەکان)دا نییە و لە (گەلاڵەیی ١٣٠٠)دا بیست ویەکەمینە و لە (ص)دا بیست ودووەمینە و لە (سەرکارێز و کۆن و مس)دا بیست وچوارەمینە و لە هەرسێ گەلاڵەیی (١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست وحەوتەمینە و لە (گل/بەرباخەڵ)دا بیست وهەشتەمینە و لە (عن)دا بیست ونۆیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و چاپیش نەکراوە.
رەقص: سووڕ و سەما: بڕوانە پەراوێزی سەر تاکی چوارەمی ئەم هەڵبەستە لە بارەی (سەما

و سوورەوە) لەگەڵ پەراوێزی سەر تاکی ١٧ و سییەم لەم هەڵبەستەدا لە بارەی مۆسیقاوە.
بۆ نەبن: بۆچی نەبن، بۆچ ئەوان نەبن بە...
ڕاقیصە: ئەو ئافرەتەی سووڕ دەدا و سەما دەکا بەکوردی (کۆچەک)یشی پێ دەڵێن.
عەبباسی: ناوی سێیەمین فەرمانڕەواییە لە ئیسلامیدا کە یەکەمیان لە دوای مردنی پێغەمبەرەوە (د.خ) و، هەر چوار خەلیفەکەی (ڕاشدین) سەرۆکایەتییان کرد و ئەوە بوو لەسەر کێشەی نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالب چوارەمین خەلیفەی ڕاشیدین لەگەڵ معاویەدا فەرمانڕەواییەکەیان دوایی هات و لە شوێنی ئەوان (ئەمەوییەکان) دەسیان پێ کرد هەتا سێیەمین فەرمانڕەوایی لەسەر شوێنەواری ئەوان بەناوی (عەباسی)یەوە لە عیراقدا خەلیفەکانی ئەم فەرمانڕەواییە بەخەریکبوون بەخواردنەوەی بادە و ڕابواردن لە کۆڕی بەزمی گۆرانی و مۆسیقا و هەڵپەڕکێ و سووڕ و سەمادا و بەو بۆنەیەوە بەهەزاران سووڕ و سەما دەوریان بەناوی (جاریە)وە هەبووە،لە شێوەیەکی زۆر مێژوو بەبەناوبانگترینی دادەنێ لەم بارە بەدڕەوشتییەوە.
(کوردی) نیشانە بۆ ئەبوو ڕابواردن و سەماکار و سووڕدەرانە دەکا و بەهەموو هونەرمەندیانە کە لەوپەڕی باودا بوون هێشتا لە عاستی ئەو کۆڕەی کە (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا پێی گەیاندووین، دەمی هەمووانی کردووەتە تەڵەی تەقیو، واتە قوڕوقەپەی پێ کردوون و ڕایوەستاندوون، بەڵام ئەم لە سەرسامی و واق وڕماندا دەمی پێ بەش کردوونەتەوە لە چاو ئەم کۆڕەی خۆیدا.
فارابی: ناوی ئەو نەصر محەمەدە لە ساڵانی ٨٧٠ – ٩٥٠دا ژیاوە و خەلقی (فاریاب)ی تورکستان بووە، بۆیە بەناوی شارەکەییەوە ناوبانگی سەندووە،و یەکێکە لە فەیلەسووفە هەرە مەزنەکانی ئیسلام و لە بارەگای فەرمانڕەوایی (سەیفولدەولەی حەمدانی)دا کارگوزار و بەڕێز بوو.
لەسەر پەڕاویە (مەنطیق) و (سروشتی) و (ڕەوشتی)یەکانی (ئەرەستۆ) لێکدانەوەی فراوانی هەیە و خۆیشی گەلێ پەڕاوی داناوە لەوانە (احصاء العلوم) و (معانی العقل) و (آراء اهل المدینة الفاضلة) و (لێکدانی هەردوو ڕای (ئەفلاتوون) و (ئەرەستۆ) لە بارەی بوونی خواوە) و... هتد.
هەروەها فەلسەفەیەکی تایبەتی و بەهێزی لە بارەی بوونی خوا و ڕەوشت و سروشتەوە بوو، هەرچەندە زۆریش کارتێکراوی (ئەرەستۆ) و (ئیفلاتوون) و (قورئان) و (سوننە) بوو.
ئەوی بۆ ئەم لێکدانەوەیە مەبەس بێ ئەوەیە کە فارابی سەرەڕای ئەو بلیمەتییەی (سەر مامۆستایەتییەتی)یە لە مۆسیقەشدا کە پەڕاوی (الموسیقی الکبیر)ی لەسەر داناوە کە ئەم پەڕاوییە بەگرنگترین پەڕاویی عەرەبی دادەنرێ لەم بارەیەوە و، هەر بەهۆی مۆسیقازانییەوە دەورێکی گرنگی ڕێزداری بووە لە کۆڕی فەرمانڕەوا فەرمانبەرە مەزنەکانی سەرێنی خۆیدا.
هەر بەم هۆیەوە کە (کوردی) دەپرسێ و دەڵێ، ئەگەر مۆسیقازان ئاوا نەبن کە لە کۆڕەکەی ئەم

هەڵبەستەیدا لێیان دواوە، ئیتر بۆچی زانا و فەیلەسووفێکی پسپۆڕی مۆسیقاری وەک (فارابی) لێیان حەپەسێ و دەمی واڵا نەکات لە بەرامبەر باڵادەستیی ئەماندا.

واز: واڵا، کراوە، بەشی مەبەستی لە دەم کردنەوەی کاتی سەرسامییە.

گوداز: هەڵۆلی، توانەوە کە مەبەستی دەمیان وەک ئەشکەوتێک هەڵۆلی کراوەی سەرسامی و لە شەرماندا و کەوا هی لە خۆیان توانا و زاناتر دەبین و دەبەن.

٣٥- ئەم تاکە تەنیا لە (گەڵاڵەییەکانی ١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠)دا بیست وهەشتەمین تاکە و لە (عن)دا سیەمینە و لەوانی تردا نییە و چاپیش نەکراوە.

(کوردی) بەم تاکەی ئارەزوو لێبوونی گەل دەگەیەنێت، بەم جۆرە بەزمانە کەوا هەر بۆ زاخاوی دڵدانەوە و کەمێ لە دەرد و دوی کۆمەڵایەتی دوور بکەونەوە.

ڕۆزگار: مەبەستی ئەو بیرە فەلسەفییەیە کە ڕۆژگار کاریگەریی هەیە لە ڕوودانی باری کۆمەڵایەتی و هەر شتێکا و بەتایبەتی خراپەی دەدەنە پاڵ ئەو.

ئاشۆفتە: ڕقاوی، پەشێو، خراپکار.

چەپگەرد: ئەوی بەخراپ بسووڕێتەوە و یا بەچەپدا بگەڕێ کە مەبەست لە گەڕانی ئەوتۆیە دژی کەسان و ئارەزوویان بێ کە مەبەست لە خراپ گەڕانی چەرخی ڕۆژگارە.

چەرخ: مەبەست لە (فەلەک) (سروشت و طەبیعەت)ە، دیسان ئەمیش لەو بڕوایەوە هاتووە کە (فەلەک) کاریگەریی لەسەر بار و چارەنووسی هەر شتێکەوە هەیە لەسەر زەویدا و لە ڕاستیشدا بۆ زانست ساغ بووەتەوە کە ئەم بیرە تا ڕادەیەک ڕاستە کە ئەستێرەکان بار و شوێن و سوور و دیویان بەپێی زەوی کاریگەریی لەسەر ئەوی لەم زەوییەدا هەیە، وە پەیوەندییەک لە نێوان ژیان و ڕواڵەتە سروشتییەکاندا هەیە ئەمەیان ڕاستە بەڵام بڕوا بەڕۆژگار ناڕاستە.

نەیلەگوون: واتە نیلی ڕەنگ یا شینی و مەبەستی لە ئاسمانە و ڕەنگی (شین)یش نیشانە بۆ خەفەتە. (نیلی واتە خومی) = ڕەنگی وەک ڕەنگی خۆم شینی تۆخ بێ.

بێخود: بەبێ خۆ، بێ ئاگا،... بێ هۆش، دەبەنگ.

هەرکەسێ: مەبەستی لە گەلە و لە گشت.

مایل: مائل = سەر بە(شتێک) بوون و ئارەزووکردنی بەلای شتێکدا، گێز لێ بوون.

بەزم: مەبەستی ئەو کۆڕەیە لەم هەڵبەستەدا لێی دواوە.

باز: دیسان. هەروەها.

٣٦- ئەم تاکە لە (ص)دا نییە وە لە (ف) و (نم/١) و (ع) و (چاپەکان)دا شانزەیەمینە و لە (گل ١٣٠٠)دا بیست و دووەمینە وە لە (گل/سەرکارێز) و (کۆن) و (مس)دا بیست و پێنجەمینە و لە هەرسێ گەڵاڵەیی (١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠) و (گل/بەرباخەڵ)دا بیست و نۆیەمین و لە (نەوتچی)دا سی ویەکەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و شانزەمین تاکی چاپ کراوە.

ڕێی مەدەن: مەهێڵن، وا نەکەن، ڕێگە مەدەن...
ڕێی مـەدەن لـە (نم/١، گیـو/٢، ئۆفـسێت، ف)دا: ڕێی مـەدە و ئەمـەش نابێ. چونکە (کوردی) لێرەدا ڕووی دەمی لە گشت گەلە نەک لە یەکێک...
لەم (گیو/٣): لەو = ئەمیش هەڵەیە، چونکە (کوردی) باسی بەزمەکەی خۆی کردووە کە حاضر بووە و تیایا لێی دواوە نەک لە شتێ قسەی کردبێ کە دوور بووبێ.
بەزم: ئەم وشـەیە چەند جارێک لـەم هەڵبەسـتـەدا هاتووە مـەبەست لەو کۆڕەیە کـە لێی دواوە. بڕوانە تاکی سێزدەمین.
شـێخ: بڕوانە پەراوێز لەسـەر تاکی ٣٠ و ٣١ی ئەم هەڵبەسـتـە لـە بارەی (شـێخ)ەوە و هـەروەها چونکە (زاهـید)، (ڕەند)، (گۆشـە)، (خـانەقا)، (تەکیـە) و (صـۆفی) پەیوەندییان بەشـێخـەوەیە، بۆیە گەڕانەوە بۆ پەراوێزەکانی ٦٥ و ٦٦ لەسەر تاکی ٧ و ١٢ی ئەم هەڵبەستەش کەڵکدارە.
تەکیـە: بڕوانە پەراوێزەکانی تاکی (٧) و (١٢) و (٣٠) و (٣١) و پەراوێزی پێشـوو کـە هـەموو بەندیواری یەکترن.
سـەیر ئەوەیە لە شـێخی تەکیـە واتە (قادری) دواوە و باشـی شـێخی خانەقا واتە (نەخشی)ی نەکردووە.
صـۆفی: ئـەبدال = تاقـمێکن لە کەسـانی خـواناس و خـواپەرست و بەپێی زاراوە (اصطلاح)ی صۆفییەکان هەریەکێ لە کەسانی وەکو: (رجال الغیب) و (اوتاد) و (اولیا) کارگێڕانی گشتیان پێ سپێردراوە.
(کوردی) لە زۆر جێگەی تری هەڵبەستەکانیا بەتوندوتیژی لەو صۆفیە درۆزنانە دواوە.
خانەقا: دیسان بڕوانە ئەو پەراوێزانەی کەوا لەسەر ئەم تاکە نیشانەم بۆ کردوون.
شێخی تەکیە و صۆفی خانەقا (نم/١، کم): صۆفی تەکیە و شێخی خانەقا. لەنگن
شێخی تەکیە و صۆفی خانەقا (ف): صۆفیی تەکیە و شێخی خانەقا.
کۆنە: ئەوی زۆر کاتی بەسـەرا تێپەڕ ببێ و مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە ئەو شێخ و صـۆفیانە لەگەڵ ئەوەش کـە شێخ و صـۆفیی تەکیـە و خانەقـان بەسـەرزارەکی، بەڵام لە ڕەوشت و خـوودا ئەو کۆنە لۆتییـانەن کە خـراپکاری دەکەن و دەم و دڵ و سـەرزاری و ڕەوشـتی ناوەوەیان یەک نیـیـە وشـەی (لۆتی)، لێـرەدا وەنـەبێ، لە لۆتـی (مطرب) یا لـۆتی (دەهۆڵ و زوڕناژەن) یـا لۆتی مـۆسـیـقـار و گـۆرانیبێـژ و چاوش بێ. بەشکو ئەمـیـان، بەڕێکەوتـە کە لە شـێـوەدا لەو وشـەی (لۆتی)یـە دەکـا کـە لە بنچـینـەدا لە (لوطی)ی عـەرەبـیـیـەوە هاتووە کـە مـەبەست لە قـوندەر و نێربازە.
هـەروەها بڕوانە پـەراوێزەکانی سـەر تاکی سێیـەمی ئەم هەڵبەسـتـە لە بـارەی (مۆسـیـقـاژەن و چاوەش)ەوە.
لۆتی (کۆن، مس)دا: لوطی.

جنه (گیو/۲، ئۆفسێت): جندە.

جیننه: وشـەیەکی عارەبییە بەواتا سـەرەتای گەنجی کە مـەبەست لە (کوڕپەرست)ە هـەروەها لە هـەمـان سـەرچاوەدا بەواتە (جنۆکە)، (لەمە چێتر) کە ئەمیش دروستکراوێکی دەسـهـەڵبـەست (مەزعوم)ە لە نێوان (مرۆڤ) و (گیان)دایە و بۆیە وای پێ وتراوە کە لە بەرچاو گومـە و بەچاو نابینرێ، ئەمیش مەبەست لەوەیە ئەو دەستە نهێنی پەرستن.

جیننه: دیسان وشەیەکی کوردییە بەواتە: لەوەن، حـەشـەری، سۆزنایی، سۆزانی، گاندەر، حیز، سـازنە، قـەحـبـە، (جننەباز) کـە دیسـان (جننەپەروەر)ەکـەی، ناو ئەم هەڵبـەسـتـەی (کـوردی) دەگرێتەوە کە ئەمیش وشـەیەکی کوردی و فـارسیشـە بەواتە (خانم باز، ژنباز، (زانی = داوێن پیس) و (فـاجـر) و (فـاسق) کـە ئـەمـانەش هـەر نێـزیکن لە مـەبەسـتی بەخـراپ پیـا هـەڵدانی (کوردی)یە و بەو صۆفی و زاهید و شێخە درۆزنانەدا.

جینده: دیسان وشـەیەکی کوردی و فارسـییـە وەک لە سەرچاوەی گیـو/۲ و ئۆفسـێتدا هـاتووە بەواتە (جیننه).

جننه (مس): جەندە.

جـەنـدە: پارچەیەک لـە دراو (عـوملـە)ی کـۆنی لـە مس دروسـتـکراوی هەرزانە کـە لە سـەرێنی قـاجارییـەکاندا لـە باوا بووە ئەمیش واتەی هەڵبەستەکە دەدات واتە پارەپەرست یا کرێگرتەی بێگانە.

جیننه (کۆن): جەنە.

جـەنە: ڕق، پیشـخـواردنەوە، (حقد)، (شـحناء) کە ئەمـانە هـەر کامێکیـان بێ دەچنەوە لەسـەر خراپی و داوێن پیسی کەوا (کوردی) لەم هەڵبەستەیدا مەبەستی بووە.

پەروەر: پەرست و مـەبەسـتی (کوردی) کە جنەباز و خـراپیی ئەوانەیە لێیـان بە(بەدی) دواوە و بەشکو خـراپییـەکـانی دەرخسـتـوون. وەک زۆربەی هۆنەران ئەم ڕێگەیەیان گرتووە بەرامـبـەر بەوانە.

سوفلەی (گیو/۲، ئۆفسێت): سپڵەیی. ئەمەش دەسکاری لەنگییە لە کێشدا.

سوفله: وشـەیەکی عارەبییە و بەواتە پەست، چی لە بەرچاو نەبوو، پـێ نەزان، سووک، بێ نرخ، بێ بایەخ، بێ ڕێز کە هەموو مەبەستی لەو شێخ و صۆفییە سەرزارییانە بووە.

بەچچـە: بێـچـوو، مـەبەست لە بێـچـوو یا بچـووکی مـرۆڤـە، واتە (منال) و کـە دەڵـێ بەچچـە مەبەستی منالی (کوڕ) و بەس.

نەواز: لاوێنەر، پەروەر، پەرست، باز.

بەچچـەنـەواز: واتە منالبـاز، هـەتیـوباز، کـوڕباز، کـوڕپەروەر و کـوڕپەرسـت، کـوڕ لاوێنەر، کـە ئەمانە هـەمـوو ڕەوشتێکی (انحراف)ە لە هـەندێ مرۆڤدا و (کوردی) بەیەکێ لە خـوو و ڕەوشتـی ئەو شێخ و صۆفیانەی داناوە و بەوە تاوانباری کردوون.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی نیشانە بۆ ئەو وتووێژ و قاوە، بکەم کە بەنەشارەزایی وە یا لەبەر هەر هۆیەک بووە داویانەتە پاڵ (کوردی) کەوا گوایە حەزی لە (قادر) ناوێک کردووە و بەم پێیە (کوردی)یشیان کردۆتە یەکێ لەو هەتیوبازانە کە ئەگەر سەرنجێ لەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) بدەین کە ئاوا بەکوڵودڵ (شێخ و صۆفی بە(جنەپەروەر) و (بەچچەنەواز) واتە (هەتیوباز) تاوانبار کردووە، و دووبارەی دەکاتەوە، بێگومان تۆزقاڵێ لەم ڕەوشتە خراپەی بووبووایە نەیدەتوانی شتی وا بڵێ و لە دەروونیشەوە بۆی نەدەهات کە ئەمە گەورەترین گەواهی و پاکنامەیە بۆ (کوردی).

چونکە لێرەدا (کوردی) بەم تاوانبارکردنی کەسانی وەک (شێخ) و (صۆفی) بەم ڕەوشتە نامرۆڤییە، ئەم دەرگایەی لێ کردووینەتەوە. کە ئەم تاوانبارکردنەی بەڵگەی ڕاست و ڕەوان و بێ گرێی ئەوەیە کە خۆی یەکێ بووە لەوانەی کە پڕ بەدڵ بێزی هاتووەتەوە لە ڕەوشتی (هەتیوبازی)یەوە، پێی وابووە کە ئەوپەڕی خراپییە، بۆیە (شێخ و صۆفی) پێ تاوانبار کردووە و بەو ڕەوشتە ناشیرینەوە ناوی بردوون کەواتە ئەم دەربڕینەی (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا گومان لەوەدا نایەڵێتەوە کە(کوردی) لەم خووە ئەوەندەی زەوی و ئاسمان، دوور بوون لەیەکەوە.

بەڵام شتێکی تر هەیە کە لە زۆر جێگەی هەڵبەستەکانیدا (کوردی) ناوی (قادر) ناوێکی بردووە و یا لە (کاکۆڵ) دواوە یا بە(خەطی ڕوو، سەبزەی ڕوو)دا هەڵی داوە کە مەبەست لە ڕیش و سمێڵە و گوایە کاکۆڵیش بۆ نێرینەیە و قادریش کوڕێک بووە و... هتد کە ئەمانە تاوانێکی ناڕەوای گەورەیان لە دەوری ڕەوشتی (کوردی) گرد کردووەتەوە کە گوایە هەتیوباز بوو.

بەڵام ئەو تاوانبارکردنانە بۆ (کوردی) لە ڕووی نەشارەزاییەوە بوون، بەداخەوە ئەوی لەسەر (کوردی)یشیان نووسیوە بەبێ بیرکردنەوە و بەراورد هەمان تاوانیان یەک لە دەمی یەکەوە قۆزتووەتەوە و بێ ئەوەی کە لێکدانەوە و نووسینەکانیان وەک بیر و لێکدانەوەی سەرێنی کوردی بێت کە لە ڕەوشتی صۆفیانەدا کە (کوردی) گرتوویەتی باو بووە کە جوانی خوایان لە جوانی مرۆڤێکی جواندا، ڕەچاو کردووە وە لەبەر ئەوەی بەبیر و بڕوای کۆن نێرینە لەسەرروو مێیینەوە بووە و ئاینی ئیسلامیش دانی بەمەدا ناوە وەک لە ئایەتی ٣٤ی سورەتی (النساء)دا لە قورئاندا دەڵێ (الرجالُ قوامُونَ علی النساءِ) واتا (پیاوان دەسەڵاتدارتر و بەرزتر و لە پێشتر و باڵادەستر و (ئەفضەل)ترن بەسەر ژنانەوە... هتد) و لە دەیان شوێنی تری قورئانیشدا و لە حەدیثەکاندا و لە تۆژینەوەکانی زانایانی ئیسلامدا لەم جۆرە بیرە زۆرە، وە بۆیە کە لە هەموو زمانەکاندا بەتێکڕایی ناوی (خوا)ش ناوی نێرینەیە (نەک) ناوی مێیینە چونکی نێرینە بەڕێزترە بەپێی ئەو بیروبڕوایانە، هەر لەبەر ئەوە کە جوانی خوا لە مرۆڤێکدا ڕەچاو دەکەن ئەو صۆفیانە لە مرۆڤێکی نێردا لەبەر ڕێزەکەی ڕەچاوی دەکەن نەک لە جوانیی ئافرەتێکدا و ئەمجا ئەمە شتێکی ئاساییە کە لەو جوانیی نێرینەیەدا کاکۆڵ و ڕیش و سمێڵ و هەموو

شتێکی جوانی لێ دەربهێنێ و بەجوانی ناوی ببەن وەک زۆربەی هۆنەران نەک کورد بەشکو هی ناوچەکە ئەم ڕێڕەوەیان لە هەڵبەستەکانیاندا گرتووە، ئەوەتە یەکێکی وەک مەولانا خالیدی نەقشبەندی کە شێخێکی مەزن و ڕاست و ئایندار و بەڕاستی خواناس و نیشتمانپەروەرێکی پاک بووە لە هەڵبەستەکانیا لە جوانی خوادا نێرینەیەکی مرۆڤی بەیاد کردووەتەوە کە کەسیش بەهەتیوبازی ناو نەبردووە و (کوردی)یش لە هەمان جۆر هەڵبەستی هەن و کەچی وا بەناشیرین لێکیان داوەتەوە.

هەروەها بۆ ناوبردنی (قادر)یش، لە زۆر شوێنی ترا ڕوونم کردەوە کە (کوردی) زۆر بەندیواری (شێخ عەبدولقادری گەیلانی – غەوث) بووە وەک لە چەند هەڵبەستێکی تریدا کەواتە ئەو (قادر)ە کە (کوردی) ناوی بردووە و کاکۆڵدار بووە مەبەسی لەو هەتیوە نەبووە کە بە(کوردی)یەوە سەپێنراوە، بێ گومان هەتیوباز نەبووە جگە لەوەی کە لە زۆر شوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا کەوا بۆنی لە نێرینە دواننی لێ بێ بەڕاستی و پێ بەپێی سەرێنی کوردی پڕ بەپڕی خۆی لێکم داوەتەوە.

کە (کوردی) لەم ڕەوشتە پیسە دوور بووە و ستەمی لێ کراوە کە ئەوەی پێوە هەڵبەستراوە.

٣٧- ئەم تاکە لە (ف) و (نم/١) و (ع) و (کم) و چاپەکانی گیودا: حەڤدەمینە وە لە (گیو/٣)دا هەژدەمینە و لە (گل/١٣٠٠) و (ص)دا بیست و سێیەمینە و لە (گل/سەرکارێز، کۆن، مس)دا بیست و شەشەمینە و لە هەرسێ گەلاڵەییەکەی (١٣٠٨ و ١٣٠٩ و ١٣١٠ و بەرباخەڵ)دا سێیەمینە و لە (عن)دا (سیودووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەر حەڤدە سەرچاوەیەکدا دوا تاکە و دوا تاکی چاپ کراوە، بەحەڤدەمینی و لە گیو/٣دا و هەژدەمینی چاپ کراوە.

وە نییە (گیو/٣): وا نییە – ئەمەش دیارە دەسکارییە و لەنگییە.

مائیل: سەر بە شتێک بوون، گێز لە شتێک بوون، ئارەزووکردنی شتێک.

ئەم لە (ف) و (نم/١) و (ع) و دیوانە چاپەکانی گیودا: ئەو – ئەویش نابێ چونکی (کوردی) باسی شتی حازری کردووە کە بەزمەکەیە.

جۆرە لە (ف) و (نم/١) و (ع): نەوعە.

جۆرە (گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): جوورە.

بەپێی نۆ سەرچاوەی تری دەستی کۆن کە (جۆرە) جێی خۆشترە و لە دەقی وتنی کوردی دەکات، چونکی ناشێ لە هەردوو باڵی ئەم تاکەدا وشەی (نەوعە) دووبارە بکرێتەوە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

ئەطوار: جۆرەها، چەشنەکان، ڕەوشتەکان، خووەکان، بەندوباوەکان، ئەو شتانە، ئەو نەریتانە... بڕوانە پەراوێزی تاکی سێزدەیەمین.

لازم: پێویست. (لازمە): دەبێ، پێویستە.

شاعیر: هۆنەر و مەبەستی لە خۆیەتی یا لە هەر هۆنەرێک.
نەوعێ (گیو/٢، ئۆفسێت، گیو/٣): چەشنێ – ئەمەش لە دەسکاریی (گیو)ە.
إمتیاز: دیاریکراوی باڵادەستێتی، پێوە دیاربوویی، جیاکردنەوە، پێ ناسینی.
دوا تێبینی:
وا دیارە لەو سەرێنییەی (کوردی)شدا زارەترەک کردن و ترساندن و خراپکاری و دەسدرێژی بەئاشکرا و بەدزییەوە لە لایەن دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوایی عوسمانی و هەندێ لە بابانەکان و شێخەکانەوە، بۆ سەر دارایی و گیان و ژیانی هەموان هەبووە. بۆیە (کوردی) دوای ئەم تێڕۆچوونە خەستوخۆڵ و پڕ کوڵودڵەی وە بەم هەموو وردەکارییەیەوە، ئاوا لەم باسە ڕۆچووە و کەچی ئەوەتا لەم دوا تاکەیدا وەک پاشگەز بوویێتەوە، دوورەپەرێزی و لاتریسکەیی خۆی لەو جۆرە کۆڕانە دیاری کردووە و دەری خستووە کە گوایە، چونکی شاعیرە و شاعیریش پێویستە لە هەر جۆر و شتێ بڵێ و پەل بۆ هەموو لایەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕوشنبیری و ڕامیاری و ڕەوشتی و پەروەردەیی و فێرکردن و حەسانەوە و ڕەخنە و... هتد بهاوێ وەک دەڵێن ئەبێ ئاوێنەی نیشتمان بێ، بۆیە ئەویش لەم بابەتە دواوە ئەگەنا لە خۆیدا سەر بەو جۆرە ڕابواردنانە نەبووە. هەرچەندە ئەو وردەکاری زانینەی ئەو لەسەر ئەو جۆر و ڕابواردنانە نەبووە و پاکانەی بۆ خۆی کردووە (چونکە شاعیر دەبێ وا بێ) ئەوەی ئەوپەڕی پەسەند کرانە و بەهەرحاڵ ئەم هەڵبەستەی کەلێنێکی گەورەی سەردەمەکەی خۆی لە نیشتماندا بۆ پڕ کردووینەتەوە و کون و قوژبنی نادیاریی ئەو کەلێنەی لێ ئاشکرا کردووین بەڕادەیەک گەلی کورد ڕووی دێ لە ناو گەلانی جیهاندا و شانبەشانی ڕێڕەوی چوونە پێشەوەی مرۆڤایەتی پێوە بنازێ و با ئەویش لە ترسی ئەو خراپکارانە پاکانەی خۆی کردووە.
دە ئیتر ئەی گیانی پاکی (کوردی) هەرچی ئاوازی خۆشی گۆرانی و مۆسیقا هەیە، پێشکەشت بێ.

# ق

١٩

## کوللی عالەم

١- کوللی عالەم وا بوو، ون سەرگەشتەو و حەیرانی عەشق
هیچ کەسێ نازانێ ئەحواڵی سەر و سامانی عەشق

٢- بادە پەیمانانی ئیدراک و کەمالی عارفان
لەنگ و عاجز بوون لە ڕێی طەی کردنی مەیدانی عەشق

٣- گەرچی غەوواصانی فیکرەت غوططەوەر بوون موددەتێ
قەت نەبوون واقیف لە قەعری بەحری بێ پایانی عەشق

٤- (سامری) و (سەحبان) و (جارولڵاه) و(لوقمان) و (سەطیح)
موخبیری کوللی عولومێک بوون و سەرگەردانی عەشق

٥- (حافظ)و(سەعدی)و(نیظامی) و (قەیس)و(جامی)و(دەهلەوی)
فەیض خواه و مەعریفەتجۆ بوون لە شاگردانی عەشق

٦- (خوسرەو)و(مەحموود)و(فەرهاد) هەرسێ شا و شازادە بوون
ئاخری بووشن بەعەبد و چاکیری سوڵتانی عەشق

٧- (شەمس)و(مەولانا)و(مەنصوور)؛ کەی بەسیرِ مەحرەم دەبوون
تا نەیان خواردایە ڕیزەی نانی سفرە و خوانی عەشق

٨- (زاهید) ئەر خوێندووتە (تەفسیر)ی: (لِکُلٍ وِجْهَةٌ)
قەت مەدە طەعنە لە مەستی و بێخودی ڕەندانی عەشق

٩- مولتەجیء نابێ بەکەس (کوردی) لە دونیا و ئاخیرەت
ڕۆژی دیوانی خودا دەستی من و دامانی عەشق

---

١- کول: هەموو، گشت.

عالەم: جیهان. مەبەست لە خەڵکانە.

سەرگەشتە: سەرسام، سەرلێشێواو.

حەیران: سەرگەشتە.

حاڵ: بار، چۆنێتی، (ئەحواڵ) کۆی (حاڵ)ە.

سامان: چۆنێتی، دارایی.

ســەرچاوەی ئەم هەڵبەستـە: (عن، گل/١، گل/٣، گل/٦، گل/٨، ن، ف، دس، جلی، ش، کو، نم/١، با، ق/٤)ە لەگەڵ (ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣)دایە و، لە نێوان ئەمانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

سەرگەشتە و (کم): سەرگەشتە.

کەسێ (گ/٢، س، گ/٣): کەس.

نازانێ (دس): نایزانی.

(ئەحمەد حەمدی ساحێبقران ١٨٧٨ - ١٩٣٦ز) هاوچەشن (ڕەدیف)ێکی ئەم هەڵبەستەی هەیە کە تیایا وتوویە:

«... غەرقی مەوجی ئاورنگی گەوهەری عەشقە وجوود

گەوهەری دەریای لوطفی حەضرەتی یەزدانە عەشق...

... بۆ شەهادەت شەمع و گوڵ ئەندامیان بووەتە زوبان

ئاگری بەرداوەتە دڵ بولبول و، پەروانە عەشق...»

**هەڵسەنگاندن:**

وشەی (حەیران) و (سەرگەشتە) کە یەک واتا دەدەن لە ڕووی وێژەییەوە لە یەک تاکە هەڵبەستدا نادروست و ناشیرینە و لەوانەیە گۆڕان بەسەر ئەم تاکەدا هاتبێ.

٢- پەیمان: نۆشەران.

عارفان: ئاگەداران، تێگەیشتوان، بەڵام لە ڕووی فەلسەفەی سۆفێتییەوە مەبەست لە ئاگەدارانی حەقایقی نهێنییەکانی ئاینی و خواییە.

لەنگ: شەل.

عاجز: ناتوان، لە بارا نەبوو.

طەی: پێچانەوە، بڕینی ڕێگە، پەی پێ بردن.

مەیدان: مەبەست لە ڕێباز و کۆڕی عەشق و ژیانێکی گیانی (ڕۆحی)یە.

پەیمانانی (ف): پەیمانی.

لە ڕێی (کم): لەری.

لە ڕێی (ش، دس): لەبەر.

طەی (گل/٣): طهّء.

طەی (ن، گل/١): طیء.

٣- غـەوواص: ئەو کەسـەیە کە لە دەریادا بەفـووتا دەچێ بۆ دەرهێنانـی مـرواری و کـەفی دەریا و مـەرجـان و (ئەسـفـەنج) و... هتد. بەڵام لێرەدا مـەبەست لە دەریای بیـرە بۆ هەڵهێنانی سـیـڕڕی حەقیقەت.

فیکرەت یا فیکرە: بیر.

غوططە: بەفووتاچوون، (غوططەوەر) بەواتە پیشەی فووت خواردن.

واقیف: ئاگەدار.

قەعر: بنک، هەرە قووڵایی.

بەحر: دەریا، زەریا.

پایان: کۆتایی، دوایی،...

گەرچی (کم): گرچە.

غەوواصانی (گ/٣): غوصانی.

فیکرەت (ش، ق/٤، کو): فکرت.

غوططەدەر (ف): غوطەخور.

٤- سـامیری: ناوی زانایەکی گاپەرست بووە، کە مووسـا پێـغەمـبەر و هەنـدێ لە پەیڕەویکارانی لە دەست فـیـرعـەون هەڵاتن، ئەم ئەوانەی مـابوونەوە لە مـووسـاییـیـەکان بـەزانایی خـۆی هەڵی فـریواندن و گـوێرەکـەیەکی وای لە ئاڵتوون بـۆ دروست کـردن کە وەک زیندوو دەیبـۆڕاند و لە قورئانیشدا ناوی هاتووە.

سەحبان: پیاوێکی تەمەن درێژی جاهیلی عەرەب بووە و لە سەرێنی پێغەمبەردا ئیسلام بووە و لە ٥٤ی کۆچیدا مردووە بەبیری ورد و زمانی پاراو و ڕەوان و خۆشخوانی بەناوبانگ بووە.

جاروڵڵاه: زانا و گەورەپیاوانی بەم ناوە زۆرن، ئەوی لەگەڵ ئەم تاکە بگونجێ دووانە:

١- ولی الدین جاروڵڵای ڕۆمییـە، مامۆسـتا و ئیمـام و دانەری پەڕاویخانەیەکە لە ئەستەمبووڵ بەناوی خـۆیەوە گـەلێ پەڕاوی ئاینـی و مـەنطـیـقـی و لەسـەر فـەلەک داناوە لە ١١٥١ک = ١٧٣٨دا مردووە.

٢- ابوالفضل محـی الدین جـاروڵڵای نەوەی مـحـەمـەدی کوڕی حـەنیـفـە، کوڕی ئیـمـامی عـەلی گەلێ پەڕاوی ئاینی و زانستی و وێژەیی داناوە و لە ٩٥٤ک = ١٥٤٧دا مردووە.

لوقمان: قـولەڕەشـێکی حـەبەشی سـەرێنـی داوود پێغـەمـبەر بووە، بەزانـا و پیشـەسـاز و حەکیم بەناوبانگە و هەندێ لایان وایە، پێغەمـبەریش بووە قورئانیش لە سوڕەتی لوقمـاندا لە بلیمەتیی ئەم دواوە.

سەطیح: ناوی ڕەبەن (کاهین)ێکی تەمەن درێژی زانای عەرەب بووە پێشبین کردووە، بە ژیریی خۆی هەموو گیروگرفتی کۆمەڵەکەی خۆی لابردووە، لەبەر ئەوە بەڕێز ناسراوە لە ٥٧٢ز.دا مردووە.

موخبیر: ئاگاهیدەر، شارەزا، ڕاگەیەنەر.

عولووم: زانستەکان.

سەرگەردان: سەرگەشتە، سەراسیمە، پەشێو.

سەحبان (ق/٤): صحبان.

سەحبان (ش): صبحان.

سەطیح (ش): مەسیح.

سەطیح (ف): ستح.

علوومێ (ق/٤، کو): علومێک.

٥- حافظ: محمد شمس الدین، هۆنەرێکی زانای شیرازییە و لە ١٣٢٠دا لە دایک بووە و، باوکی خەڵکی مەلایری لوڕستانە و واتە (کورد) بووە. هەڵبەستەکانی لەوپەڕی پلەی دڵدارییی و صۆفیگەریدان و دیوانەکەی چەندان جار و بەگەلێ زمانی جیهان چاپ کراوە و بەرهەمی ئاینیشی لە پاش بەجێ ماوە. بە(غەزەلی عیرفانی) بەناوبانگە.

سەعدی: ئەمیش بەبنەچە کوردی زەنگەنە و بەشیرازی ناسراوە و لە هەرە بەناوبانگترین هۆنەر و صۆفی و زانا و تەمەن درێژە، لە ١١٨٤ز.دا لە دایک بووە لە دانراوەکانی (گوڵستان) و (بۆستان) ئێستەش بەپەڕاوی سەردەم دادەنرێن، جگە لە دیوانی (الطیبات) و (غەزەلیات) و (خەبیثات)ی کە بەهۆیانەوە بە(ئیمامی غەزەل) ناوی دەرکردووە تەنانەت ئێرانییەکان دەڵێن سێ کەس بەپێغەمبەری شیعر دادەنرێن:

(فیردەوسی) و (ئەنوەری) و (سەعدی). بەرهەمەکانی بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان گۆڕدراون.

نیظامی: چەند نیظامییەک هەن و ئەوی بەمەبەستی (کوردی) بزانرێ لێرەدا (جەمال لەدین ئەبوومحەمەدی (نیظامیی گەنجەویی)یە کە هۆنەرێکی دڵداری و صۆفییەکی گۆشەگیر بووە، بەرهەمەکانی هەڵبەستن و (پەنج گەنج) یا (خەمسەی نیظامی)یان پێ دەڵێن کە لە ١١٩٩ز.دا تەواوی کردووە.

قەیس: هۆنەرێکی دڵداری بووە لە دەوروبەری ٦٨٨ز.دا لە عەرەبستان مردووە بە(لەیلا)ی دڵخوازییەوە بەناوبانگە دیوانی چاپ کراوە.

جامی: مەولانا نوورەدین عەبدولڕەحمانە لە ساڵانی ١٤١٤ – ١٤٩٢ز.دا ژیاوە، بەناوبانگترین صۆفییە و خەلیفە و جێگری (بەهاءالدین)ی دامەزرێنەری ڕێگەی نەقشبەندی بووە، گەلێ پاشماوەی هۆنراوە و پەخشانی لێ ماوەتەوە.

دەهلەوی: قطب الدین ئەحمەد وەلییەکی ناسراوی هیندییە و لە ١١١٤ک.دا بەرامبەر بە١٧٠٢ز لە دایک بووە زانایەکی نەقشبەندی بووە بەرهەمی ئایینیی زۆرە.

شاه عەبدوڵڵای دەهلەوی، مامۆستای مەولانا خالید بووە.

٦- خوسرەو: پاشایەکی ساسانی و بە(کیسرای دووەم) یا (خوسرەوی پەروێز) بەناوبانگە و لە ٥٩٠ – ٦٢٨ز.دا فەرمانڕەوایی کردووە و ژیانی دەبەستریّ بەچیرۆکی دڵدارییە بەناوبانگەکەیەوە، بەرامبەر بە(شیرین) و مارەی کرد.

مەحموود: سوڵتان مەحموودی کوڕی سوبوکتەگینە و پاشایەکی بەناوبانگی غەزنەوی بووە کە لە ئەفغان هەتا تورکستان و هەتا هیندستانی گرتووە لە ٩٧٠ – ١٠٣٠دا ژیاوە ئەدەبدۆست و شیعرپەروەر و زانانەواز بووە و پەردەیەکی دڵداریش لە ژیانیدا ڕووی داوە.

فەرهاد: ئەمیش دڵداری شیرینی لەمەڕ (خوسرەو) بووە و لە ڕێگەی ئەوا بەردەکێوی تاشیوە و کونی کردووە و ڕازاندوویەتەوە کە بێ ئەوەی پێی بگات، بەپیلانێکی خوسرەو مرد، دڵدارییەکەی بەهێزترین چیرۆکی جیهانی پێک هێناوە.

عەبد: بەندە، زەرخریدە، کۆیلە.

چاکیر: خزمەتکار، خوڵام.

سوڵتان: خاوەن دەسەڵات، فەرمانڕەوا.

ئەم تاکە لە (ق/٤)دا حەوتەمینە، چونکە لەگەڵ تاکی دواییدا پاش و پێشە.

هەرسێ (کم): هەرسیە.

هەرسێ (گل/٣، گل/٦، گل/٨): هرسێ.

هەرسێ (ن): هرسیەه.

شا و (کم): شەو.

شازادە (گل/١، گل/٣، گل/٦، گل/٨، جلی): شهزادە.

شازادە (ن): شاهزادە.

بووشن (ش) و (ر): بویش.

بەعەبد و (گ/٢، س، گ/٣): بەبەندە و، ئاشکرایە کە ئەمە لە دەسکارییەکانی (گیو)ە.

چاکیری (گ/٣): چاکەی.

٧- شەمس: شەمسەدین محەمەد و بەشەمسی تەبریزی ناسراوە دەروێشێکی گەشتیار و صۆفییەکی پاک و زانایەکی توانا و هۆنەرێکی بەهێز بووە. لە ١٢٤٣دا لە دەوروبەری شای قونیە و لە دوای پەیوەندیی ئایینی و صۆفیگەریی بەهێزیا لەگەڵ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمییە گوم بووە و ئیتر ئەفسانەی زۆر لەسەر ژیانی و مردنی هەن دڵدارێکی خواییی مەزن بووە، دیوانی هەڵبەستی چاپ کراوە.

مەولانا: بەم ناوە کەسان زۆرن لەوانە (مەولانا جافی) و (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بەڵام ئەوی ڕێی تێ بچێ (کوردی) مەبەستی بووە (مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی)یە کە خاوەنی ڕێگە (طەریقە)ی (مەولەوی)یە و ئەمیش جۆرە صۆفیگەرییەکە و پەیڕەویکارانی بە(دەروێشانی خولانەوە بەدەوری خۆیاندا) ناو دەبەن چونکی مۆسیقای تێکەڵ بەکۆڕی ذیکرەکەیان کردووە، هۆنەرێکی بەدەسەڵات و بەرهەمی ئاینی و ئەدەبیی زۆرن و لە ١٢٧٣ز.دا لە (قۆنیە) مردووە.

مەنصوور: ئەبوو المغیث حسەین کوڕی مەنصور و بە(حەللاج) بەناوبانگە، هەر لە گەنجییەوە ڕێگەی صۆفیگەریی گرتووە و تیا پێ گەییوە و هەڵبەستی زۆرە و نزیکەی (٥٠) بەرهەمی فەلسەفی و ئاینی و صۆفیانەی هەن و لە ڕێگەی خۆشەویستییەکی ڕاست و پاکی خواییدا بەناشیرینترین شێوەی سزا لە ساڵی ٩٢٢ز.دا کوژرا و کوشتنەکەی بەڵگەی هەرە دڵداریّتی بوونی ئاینی بووە.

سیر: بەپێی لێکدانەوەی صۆفییەکان بەواتە بڕوا و دروشمی ئاینی ئەوتۆ کە تێکڕای خەڵکان نایزانن و لێیان شاردراوەیە ئەگەر بگەنە پلەیەکی تایبەتی لە خواناسیدا کە دڵ شوێنی سیر (نهێنی)یە وەک گیان شوێنی خۆشەویستیی مەعنەوییە.

٨- تەفسیر: دەرخستن، لێکدانەوە، وردکردنەوە، ئاشکراکردن و بەڵام مەبەست لە تێگەیاندن و، واتای پتر دەرخستنە بۆ (قورئان)ی پیرۆز.

لِکُلٍ وِجْـهَـةُ: نیشانەیە بۆ ئایەتی ١٤٨ی سوورەی (ئەلبەقەرە) لە قورئاندا لە بارەی ڕوونکردنەوەی (قیبلە - کەعبە یا شوێنی ڕووی نوێژکردن)ەوە هاتووە کە: (ولکُلٍ وِجْـهَةُ هُوَ مُوَلّیها فاستَبَقوا الخَیراتِ أیْنَما تَکونُوا یَأتِ بِکُمُ اللهُ جمیعاً إنَّ الله علی کُلّ شَيءٍ قَدیرٌ) واتە: (بۆ هەمووان شوێن ڕووتێکردن یا ڕێڕەوێک هەیە کە ڕووی تێ دەکەن و ئاراستەی دەبن و، کەواتە بەرەو چاکە ببنەوە لە هەر کوێیەک هەن و، لە هەر کوێیەک بمرن، هەر بەرەو مەحشەرن لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە خوا توانایی هەموو شتێکی هەیە).

مەبەستی (کوردی) لەوەیە کە (بەزاهید) دەڵێ هەرکەسە ڕێڕەوی خۆی هەیە و ئیتر واز بێنە.

طەعنە: توانج، بریندارکردن (تانە).

بێخود: بێ هۆش، بەپێی بڕوای صۆفییەکان، ئەمەش جۆرە بارێکی سەرخۆشیی خواییە.

زاهید ئەر (ن): زاهیدا.

تەفسیری (کم): تفسیری.

وجْهَةُ (کم): وَجْهَهُ.

وِجْهَةُ (گل/١، گل/٦، گل/٨): وجهة.

وِجْهَةُ (ن): وجهةً.

مەستی و (ف، نم/١): مستو.

٩- مولتەجیء: پەنابەر، ئاتاج.

ئاخیرەت: مەبەس لەوە جیهانە واتە ڕۆژی دیوانی خودا.
دامان: داوێن.
نابێ (گ/٣): نابم.
نابی (جلی): نابن.
کوردی (ئا): هیجری.
خودا (دس): خوا.
خودا (جلی): خوا.

**هەڵسەنگاندن:**

ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی)، ئەوپەڕی نەفس بەرزێتی دەگەیەنێ، هەروەک لە هەڵبەستێکی تریدا کە لە بەندیخانەی تارانەوە بۆ (سولەیمانی)ی نووسیوە:

نەفسی (کوردی) بەرزە بۆیە ڕازی خۆی ناڵێ بەغەیر
سکەیی صاحیبقرانی چون بەهای پاین نییە

ئەم هەڵبەستەی (کوردی) بەگەواهینامەیەکی گرنگ دادەنرێ لە بارەی ڕۆشنبیر فراوانی (کوردی) و شارەزایەتی لە بارەی زانینی سەرگوزەشتەی جۆرەها کەسانی ئاینی و زانستی و مێژوویی و وێژەیی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و... هتدە.

(جیاواز)ییەکی زۆر (زەق) لەم هەڵبەستەی (کوردی)دا دەبینرێ، ئەویش بەکارهێنانی چەندین وشەی ڕەقوتەقی عارەبی کە ئەم ڕواڵەتە لە هەڵبەستەکانی تریدا، بەم ڕادەیەی ئێرە نابینرێ، جگە لە قووڵیی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکە لە بارەی دڵداریی «ماددی» و «مەعنەوی»یەوە بەگشتی.

# ک

٢٠

## تاکەی بکێشم

١– تاکەی بکێشم ئەی صەنەما، ئاهی دەردناک؟
وەختە تەنم لە هیجر و فیراقت ببێ بە خاک
٢– نەشئەی فیراقی تۆیە کوڕەی سەخمە قرمزی
والی و بەبارم و، ڕەنگ زەرد و سینە چاک
٣– چاوم ئەگەرچی مەنظەرە بۆ کوللی طەلعەتێ
(وَاللّهِ مانَظَرْتُ بِقَلبِيَ إلی سِواكْ)
٤– دەستم لە تۆ نەشت و نەڕۆیم هەتا وەکو
خۆیشم گەیاندە قەتڵی سەروو مەرکەزی هیلاک
٥– مەجنوون ئەگەر لە جوانیی لەیلا بوو ناوی کرد
من شێتی تاکێ جوانیم و لاوی مەردی پاک
٦– (غوربەت)، (عەزیز)م، هەر ئەوەندەی چاکە؛ بێ ڕەقیب:
ناوت دەبەم، هەمەدەم، بێ باک و نا (خۆفناک)
٧– لێرەش دڵم لە (میصرە) لە دەرگەی (عەزیز)یە
یادت لە بۆ عیلاجی سەوادی فیراقە چاک
٨– عومرم ئەوەندە کافیە ساتێ بەبێ ڕەقیب
(أنْظُرْ إلی جَمالِكَ رُوحي تَكُنْ فِداكْ)
٩– شەرحی فیراقی (کوردی) بەکەس ناڵێم ئێستەکە
(أرْوِيُ جَمِيعَ حالَتِه حِينَما يَراكْ)

---

١– تاکەی: تاکوو کەی، تاکانەی و، وێنەت نییە.

صەنەم: بت، پەیکەر – مەبەست لە پەرستنی بتە لەبەر جوانییەکەی (صەنەما = ئەی صەنەم).

ئاه: هەناسەی ساردی ناخۆشی.

دەردناک: دەردین، ناخۆشی ئالوود.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/٦، ف، نم/١، نن، م)ە لەگەڵ (گ/٣) وە (گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە/٤ی ساڵی ١٩٧١ کە مامۆستا حسین نێرگسەجاڕی ئەم هەڵبەستەی تیا نووسیوە).

لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (م)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەم لەسەر ئەم هەڵبەستە ئەوی شایانی دیاریکردنە کە (عن) لەسەر ناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسیویە: (نامەء غربتیەء (کردی) برای عزیز بیکی ببە رحمهما الله بە سلیمانیە فرستادە در حالی کە بر أثری یک فتنە جویی خلافی میانشیان حاصل و (کردی) دلشکستا نە بە (سنندج) رفتە وبعد از وصول این نامە عزیز بیک باجمعی از سوارانش بە (سنندج) مسافرت کردە (کردی) را ترضیە و بە سلیمانیە ئاوردە).

واتە: (نامەی دوورە دیاری (کوردی) بۆ عەزیز بەگی بابان خوا لێیان خۆش بێ، بۆ سولەیمانیی ناردووە لە کاتێکدا کە لە ئاکامی دووزمانییەکدا ناکۆکییەک لە نێوانیاندا ڕووی داوە و (کوردی) بەدڵشکاوی چووەتە (سنە) و پاش گەیشتنی ئەم نامەیە عەزیز بەگ لەگەڵ دەستەیەک لە سوارەکانی خۆیا ڕۆیشتووەتە (سنە) و دڵی (کوردی)ی هێناوەتەوە جێ و گەڕانوویەتەوە سولەیمانی).

تا کەی بکێشم ئەی صەنەما (ف، گ/٣، گۆڤاری نووسەری کورد): تا کەی بکێشم. (کە ئەمانەش لەنگن).

وەختە تەنم لە هیجر و فیراقت (گل/٦): وختە تنم لهجر فراقت.

وەختە تەنم لە هیجر و فیراقت (ف): وختە تنم لە فراقت.

وەختە تەنم لە هیجر و فیراقت (نن): وەختە تەنم لە هیجری فیراقت.

وەختە تەنم لە هیجر و فیراقت (نووسەری کورد): وەختە تەنم بەفیراقت.

**تێبینی:** لە (گ/٣) لە نیشانە بۆ کردنی سەرچاوەدا لە جێگەی (نووسەری کورد) بەهەڵە نووسراوە (نووسەری نوێ).

٢– نەشئەء: بۆنی بادە، (نەشئە) = خۆشی وەرگرتن لە مەی یا هەر شتێ، بەڵام لێرەدا کە (نەشئەی فیراق) هاتووە، ئاشکرایە کە (فیراق) نەشئەی نییە بەشکو جۆرە هەستێکی مەستانەی ماتەمینیی هەیە کە (کوردی) مەبەستی بووە و بەتایبەتی (نەشئە)ی (تکیاک) و (بەنگ کێشان ماتەمینییە بەپێچەوانەی نەشئەی بادە. (مەی) نۆشینی خۆشی و شادی، کە نەشئەیە و مەبەستی (کوردی)یە (کورە) مەبەستی (عەزیز بەگی بابان)ە.

قرمز: سوور، ئاڵ. کە ڕەنگی سوخمەکەی عەزیز بەگ بووە.

لێو بەبار: لێو وشک هەڵگەڕان لە خەفەتا.

سینە: سنگ.

چاک: لەت، پارە پارە.

لەم تاکەدا یەکخستنی ڕەنگی (قرمزی) و (زەرد) بەپێی وێژەی کۆن جوانی و پەسەندە.

کوڕەی (گل/٦، عن، م) لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەرچاوانە (کُرَّەء)یان نووسیوە، دیسان لە پەراوێزەوە نووسیویانە (نسخە: گرەء) و ئەویش ئەگونجێ کەوان گڕی یا: وەک (گڕی) ئاگرە.

مەبەست لە دەنگ (گڕ)ی بووە، کە دەنگی عەزیز بەگ گڕ بووە یا پیاوێکی ئاگرین بووە.

کوڕەی (ف): کُرَّەء.

٣- مەنظەر: بینەر، ناوی زانستییەکەی چەنگوچۆنی شتومەک لە دوور و نزیک و ئەوی دەبینرێ پێی دیاری دەکرێ و مەبەستی لە چاوەنوارِیشە.

کل: گشت، هەموو.

طەلعەت: بینین، چار، هەڵهاتن یا دەرکەوتنی هەر شتێ وەک مانگ و ڕۆژ. واتە هەرچییەکم لێ دەرکەوێ.

والله: بەخوا.

مانظرت: نەمدی، چاوم پێی نەکەوتووە، نەم ڕوانیوە.

بقلبی: بەدڵی خۆم، پڕ بەدڵم، بەدڵ.

الی سواک: جگە لە تۆ، بەتەنیا هەر تۆ. وە ئەم (الی)یە، لە هەندێ لە سەرچاوەکاندا بەهەڵە (إلاّ)یە.

بقلبی: (نووسەر، گ/٣): بقلب.

نیو باڵی دووەم بەواتا:

(بەخوا جگە لە تۆ، بەدڵ بەکەسدا نەمڕوانیوە).

٤- دەستم لە تۆ نەششت و: لێت بێ هیوا نەبووم، هەر ئومێدم پێت هەبوو.

خۆیشم: تەنانەت خۆشم، وە یا خزمەکانیشم (خویشم) کە بەرێنووسی کۆن (خوشم) دەنووسرێ.

قەتل: کوشتن.

مەرکەز: ناوەند، ناوجەرگە.

هیلاک: لەناوچوون.

دەستم لە تۆ نەششتوو نەڕۆیم (گل/٦): دستم لتو نششت و رویم (ئەمەش دەسکارییە).

نەڕۆیم (ف): نەرویوم.

خۆیشم گەیاندە (ف): خۆیشم گەیانە.

خۆیشم گەیاندە (گ/٣) و (نووسەر): خۆشە گەیانە.

٥- ناوی کرد: ناوبانگی سەند.

تاکێ جوانی: لە جوانیا تاک کە مەبەستی عەزیز بەگی بابان بووە، کە گەنجێکی قۆز بووە.

ئەم تاکە لە (ف، نم/١، نن، گ/٣، نووسەر)دا نییە و هەر لە (عن) و (م)یە و، هێشتە چاپیش نەکراوە.

جوانی لەم تاکەدا هاتنی وشەی (مەجنوون) و (شێت)ە کە لە هەمان کاتا یەک واتا دەدەن و کەچی هەریەکەیان مەبەست لە شتێکی لەیەک جیاوازە. کە (مەجنوون)ەکەیان شێتی (لەیلای عامیری)یە و (شێت)ەکەش مەبەست لە (کوردی) خۆیەتی کە ئەم شێتی خۆشەویستیی (عەزیز بەگ) بووە کە لاوێکی مەرد و پاک بووە.

٦- غوربەت: مەبەستی لە دووره (یار) و لە دووی (یار)ەکەی بووە لە عەزیز بەگ بووە.

عەزیزم: سێ واتای تیا مەبەست بووە:

واتای یەکەم: ئەی عەزیز بەگی بابانم.

واتای دووەم: ئەی عەزیز واتە ئەی خۆشەویستەکەم.

واتای سێیەم: (ئەی عەزیز)ی میصر کە مەبەست لە حەزرەتی (یووسف)ی خەزانەداری وڵاتی میصر بووە کە (عەزیزی میصر) بووە، عەزیز بەگی بابانی چواندووە بەگەورەی (میصر) و کە لە هەمان کاتدا وشەی (میصر) بەواتە (شار)یشە کە ئەو شارەش مەبەستی لە شاری (سولەیمانی) بووە کە (کوردی) لە تاو چوغوڵیکردنی (خەڵکی) (سولەیمانی) بەجێی هێشتووە و ڕۆیشتووە بۆ (سنە) کە بە(غەریبایەتی)ی داناوە، هەرچەندە بنەماڵەی (صاحیبقران)ی (کوردی) بەبنەچە (سنە) بووە، لە ئەحمەد بەگی صاحیبقرانی باپیرییەوە کە بە(ئەحمەد بەگی گەورە) و یا بە(حاجی ئەحان) و بە(ئەحان)یش ناو براوە کە وەزیری بەرگری و جەنگی بابان و دروستکاری مزگەوتی (ئەحان) بووە لە (سولەیمانی)دا.

(ڕەقیب): نەیار، مەبەستی لەوانە بووە کە (نەیار)ی (کوردی) بوون، ئەوانیش (عەبدوڵڵا پاشای بابان) و دەستەکەی بوون و، ئەوان هۆی ئەو چوونە (سنە)یەی (کوردی) بوون و، هەر ئەو (عەبدوڵڵا پاشا)یە بەپشتیوانی هێزی تورکی دژ بەکوردی عوسمانی (فەرمانڕەوایی بابان)ی ڕووخاند و (کوردی)یش زۆر هەڵبەستی توانج و پلاری بەسەر (عەبدوڵڵا پاشا)دا هەڵداوە و تەنانەت ئەو (پاشا)یە گۆڕی (کوردی) و (سالم)ی ئامۆزایشی تێک داوە و هەڵبەستراوی بە(مەڕمەڕ)ی گۆڕەکەیانی شکاندووە، ئەوەندە دڕندە بووە.

ئەو نیشانە بۆ (میصر) و (عەزیزی میصر)ەی کە لێکم دایەوە لە تاکی (ئایندە) واتە (حەدثە)ی ئەم پارچە هەڵبەستەدا (کوردی) بەئاشکرایی ئەو لێکدانەوەیەمی دەربڕیوە.

(ناوت دەبەم هەمەدەم بێ باک و ناخۆفناک)ی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستە بەمەبەستی لە زۆر و ستەمی ئەو (پاشا) (بەدکردار)ە بووە کە (کوردی) ناوبردنی (عەزیز بەگ)یشی لێ قەدەغە کراوە و لە تاو گیانی خۆی بۆ (سنە) هەڵهاتووە.

وای بۆ دەچم ئەم هەڵبەستەی لە پاش ڕووخاندنی فەرمانڕەوایی بابان و کرانی ئەو (پاشا)یە بە(قائیمقام)ی (سولەیمانی) داناوە، کە ئەوە بوو دوا بەدوای ئەو ڕووخاندنەی (بابان) (عەزیز بەگ) و (مەحموود بەگ)ی باوکی (کوردی) شۆڕشێکیان دژی عوسمانی بەرپا کرد و لە ئاکامدا (مەحموود بەگ) کوژرا و شۆڕشەکە (پووچ) کرایەوە (عەبدوڵڵا پاشا) لە قەڵەمڕەوی باباندا دەسەڵاتی هەبووە و بەپیلانگێڕان بۆ تێکدانی پەیوەندیی (کوردی) و (عەزیز بەگ) بوونەتە هۆی هەڵهاتنی (کوردی) لە سلەیمانی و ڕۆیشتنی بۆ شاری (سنە). (کوردی) ئەو دوورکەوتنەوەیەی پێ ناخۆش بووە و ئەم هەڵبەستەی وەک نامەیەک بۆ عەزیز بەگ ناردووە.

دیارە (عەبدوڵڵا پاشا) نە دەسەڵاتی بەسەر (سنە)دا هەبووە و لەو کاتەدا لەگەڵ والیی سنە و دەسەڵاتدارانی (ئێران)دا نەبووە، بەهۆی بێ باری و هەلپەرستی و نامەردیی خۆیەوە.

هەر ئەوەنەی چاکە (نووسەر، گ/٣): هەر أوی چاوە. کە ئەمەش هەڵەیە.

نیو باڵی دووەم لە سەرچاوەکان جگە لە (عن، م)دا بەم جۆرەی دوایی نووسراوە:

(ناوت دەبەم هەمیشە بەبێ ترس و خۆفناک) – کە ئەمەیش هەڵە و لاوازە.

بە(سەرنج)دانی ئەم نیو باڵییە لە سەرەتاوە کە جێگیرم کردووە و لەگەڵ ئەم دەقەی ناو سەرچاوەکانی تر دەرئەکەوێ کە شێواوی دەسکاری لە هەڵبەستەکەدا پەیا بووە و بەدووری نازانم کە هەر ئەو عەبدوڵڵا پاشایە دەستی لە (لەناوبردنی) هەڵبەستی (کوردی) هەبووبێ، بۆیە شێواوی بەهەڵبەستەکانی (کوردی)یەوە دیارە.

ناوت دەبەم (نووسەر، گ/٣): ناوت دەهێنم.

بەبێ ترس (نم/١): بەترس.

بەبێ ترس و خۆفناک (ف، نووسەر، گ/٣): بەبێ ترس و باک.

هەر ئەوە نەبێ (نووسەر، گ/٣): ئاوی چاوە. ئەمەش ئاشکرایە کە هەڵەیە و شێواوە واتا نادات.

ئەم تاکە لە (ف، نم/١، نن، گ/٣، نووسەر)دا: پێنجەمین تاکە.

٧- ئەم تاکە درێژەدانە بەواتا و مەبەستی تاکی پێشوو.

لێرەش: مەبەستی لە سنە (سەنەندەج)ە.

میصر: وڵاتی میصر – مەبەستی سولەیمانییە، ئەگەرچی بە(ناو) ناوی نیشتمانی (میصر)ە لە ژووروی ئەفەریقایە.

عەزیز: جگە لە واتەی خۆشەویستی و ناوی عەزیز بەگی بابان، نیشانەیشە بۆ عەزیزی میصر کە خەزانەدار بووە لە سەرێنی فیرعەوندا.

دەرگەی عەزیز: مەبەستی لە ماڵی عەزیز بەگی بابانە لە (سولەیمانی).

عیلاجی سەواد: مەبەسی لە چارەی کوێرییەکەی حەزرەتی یەعقووبە کە لە خەفەتی گومبوونی یووسفی کوڕی و لە بۆنی کراسەکەی چاوی هەڵهێنا.

چاک: جاری پێشوو، مەبەست لە (لەت) و لێرەدا بەواتە (باشی)یە، کە ئەمەش بەپێی وێژەی کۆن جیناس ئاراییە.

ئەم تاکە لە (ف، نم/١، نن، گ/٣، نووسەر)دا نییە.

یادت (گل/٦): بادت.

لە جێگە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (عن) و (م)دا نووسراوە:

**نوسخە:**

(بۆ چاری تاری چاوم و ژاری فیراقە چاک).

ئەم دەقەیش بەجێیە و وا دیارە کە ئەم سەرچاوەیە، لە یەک سەرچاوەوە ئەم دەقەیان وەرگرتبێ. مەبەستی لەوە بووە کە ئەو (دڵەی) خۆی کە لە لای دەرگانەکەی (عەزیز بەگ)وە بووە لە (سولەیمانی) ئەو لە لا بوونەی بەچارەی (ڕەش داهاتنی چاوی خۆی) داناوە کە لە دووریی (عەزیز بەگ) و بۆ چارەی چاکی ژەهری لە عەزیز بەگ دووری بووە. وەک چۆن باوکی حەزرەتی (یووسف) لە دووریی یووسفی کوڕی چاوی کوێر بوو.

٨- عومر: تەمەن.

کافیە: بەش دەکات، تیایا دەبێ، بەسمە.

انظر: تەماشا بکەم.

الی جمالک: لە جوانیت، لە شیرینی و نازداریت.

ڕوحی: گیانم.

تکن: دەبێ، ببێ بە.

فداک: باڵاگەردانت، بەقوربانت.

ئەم تاکە لە (گل/٦)دا نییە وە لە (ف، نم/١، گ/٣، نن، نووسەر)دا: شەشەمینە.

انظر (نن): ینظر. ئەمەش هەڵەیە.

تکن (نم/١): یکن - دیسان ئەمیش ناڕاستە.

٩- شەرح: لێکدانەوە، ڕوونکردنەوە.

بەکەس: بە چ کەسێک = کە (کوردی) تۆراوە عەزیز بەگ چووە بەشوێنیا بۆ تێگەیشتنی هۆی دڵگرانییەکەی و هێنانەوەی.

اروی: دەڵێم، دەگێڕمەوە.

جمیع حالتە: هەموو بار و چۆنییەتییەکەی.

حینما یراک: لە کاتێکا دەتبینێ، ئەو سایەی چاوی پێت دەکەوێ.

ئەم تاکە لە (گل/٦)دا شەشەمینە و لە (ف، نم/١، نن، گ/٣، نووسەر)دا حەوتەمینە و لە هەموو سەرچاوەکانیشا دوا تاکە.

حالتە (گل/٦): حالە. ئەمەش دەسکاری تیا ئاشکرایە.

**هەڵسەنگاندن:**

(کوردی) لەم پارچە هەڵبەستەیدا، چەندین هونەرمەندی وێژەیی زۆر باڵا و پەسندی نواندووە، بەپێی دەستووری وێژەی کۆن و بەوردەکارییەوە لە ڕووی زمانی و ناوەڕۆکی بەهێزەوە. جگە لەوەی کە لاپەڕەیەکی شاردراوەی ئەو سەرێنییەی خۆی و باری ئاڵۆزی سولەیمانیی لێ ئاشکرا کردووین.

**تێبینی:**

ئەم هەڵبەستە لە بڵاوکردنەوەی (نووسەری کورد) و چاپەکانی (گیو) و بەتایبەتی و لە سەرچاوەکانی تردا بەگشتی هەڵەیەکی زۆری دەسکاری و لێ تێنەگەیشتنی زەق زەقیان تیایە و لێرەدا ئەوەندەی بۆم گونجا چاک ڕێم بەپێی سەرچاوەوە تیا کرد و هێشتەش بڕوام وایە بەتەواوی نەچووەتە سەر دەقی نزیک لە وتنەکەی (کوردی) خۆیەوە.

# ل

٢١

## تاکەی ئەم جەور و جەفایەت

١– تاکەی ئەم جەور و جەفایەت چاو خومارەی سوخمە ئاڵ؟؟
دڵ لە هیجر و فیرقەتت سووتاوە، ڕەش بوو، وەک زوخاڵ

٢– چاوی مەستت داپۆشیوە، وێڵ و وەحشی کردو، وم
قەت بەقەد ذەڕڕەم نەماوە عەقل و ایدراک و کەماڵ

٣– سەقفی چاوم بارشی غەم، وای لەسەر گۆل بەستوە
خوێن بەخوڕ لێی دادەچۆڕێ وەک تکەی وێرانە ماڵ

٤– وەصلی تو (یُحْیی العِظامَ)ەی قالبی فەرسوودەمە
سا مەیێڵە تووخودا شاد بێ بەگەردم بای شەماڵ

٥– ئاسکی صەحرایی چینی بۆ نیگا و وەستان و ڕەو
کەبکی کۆهی زابولستانی بەلەنجە و خەطط و خاڵ

٦– دولبەری وا بەکەماڵ و عەقڵ و دانش کەم هەیە
وام دەزانی بێ کەماڵە، چونکی طیفلە و خوردەساڵ

٧– ئەی طەبیب ئەر تۆ تەماتە زامی دەردم چارەکەی؟؟
تاکە گەرماوگەرمە بۆی پەیدا بکە، شەهدی ویصال

٨– عاشقی خۆشە، نەوەک بۆ منی غەریب و قوڕبەسەر
دولبەرم وەک دوژمن و، خۆم بێکەس و ئاشوفتە حاڵ

٩– قافڵەی فیکرم بەتاراجی غەمی (هیجری) چووە،
بۆیە (کوردی) وا دوکانی دڵ لە مەعنا بوو بەتاڵ

---

١– جەور: ستەم.
جەفا: ڕوو ساردی، دووری.

چاو خومار: چاو مەست، چاو نەرم.

زوخاڵ: خەڵووز.

وا پێ دەچێ لە سەرێنی (کوردی)دا، پیاوان بەرگی (سوور)یشیان پۆشیوە وەک (سوخمەی ئاڵ، جبەی قرمزی).

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/١، گل/٣، گل/٧، گل/٨، ص، ن، جلی، کم، ع، ف، ش، ر، نم/١)ە لەگەڵ (گ/٢، س، گ/٣)دا و لە هەموانیاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەی و ئەم تاکە لە هەموویاندا یەکەمین تاکە.

تێکڕای ئەم سەرچاوانە ئەم هەڵبەستەیان بە هی (کوردی) داناوە و تەنیا (ن) بە هی (میرزا غەریب)ی مراد آغا کە لە ١٩٠٥دا لە سلێمانی مردووە) داناوە کە ئەمەش بەشوێن بڕوا نازانم و من بە هی کوردیی تێ دەگەم و جگە لە مۆرکی (کوردی) هەڵبەستی پێشووی ژمارە (٢٠) لەم هەڵبەستەی دەکات.

جەفایەت (ر): جفایا.

جەفایەت (ما، جلی): جەفایە.

جەفایەت (ش): جفاتو – نسخە: جفای.

چاو خومارەی (جلی): چاو خومار.

چاو خومارەی (ش): چاخماری.

چاو خومارەی (عن، گل/١، گل/٣، گل/٧، گل/٨، ن، جلی): چاو خوماری.

لە هیجر و (ع، ف): لە هیجری – ئەمەش بەچاکی ناگونجێ و لاوازە.

لە هیجر و (ش): بەهجری.

لە هیجر و (ر): لە هجرانت.

لە هیجر و (ما، جلی): بەناری.

لە هیجر و (گ/٣): بەنازی. بێ گومان ئەمە دەسکاریی (گیو)ە و گوایە کردوویە بەکوردی.

سووتاوە (عن، گل/١، گل/٣، گل/٧، گل/٨): سوتاو.

ڕەش بوو (ص)، (ما): رشبی بوک.

ئەم پارچە هەڵبەستەش بەتێکڕایی بەڵگەی تەمەن پیری «کوردی»یە و بەتایبەتی تاکی سێیەم و چوارەمی ئەم ڕایە جێگیر ئەکات و بەم پێیە ئەم هەڵبەستەی لە پیریدا وتووە.

ڕاستیشە هەڵبەستەکانی سەرێنی گەنجێتیی «کوردی»مان کەمتر دەس کەوتوون، جگە لەوەی کە هەڵبەستی «کوردی» زۆر لە ناوچوون و کەم دەست کەوتوون.

تاکەی: تاکو کەی، بارە گرانەکەی، (تا)ی (لەرزوتا)یەکەی، (ڕێشاوی)، (تاکەی) بەواتای (تۆ تاقانە و یەکتای) ئەدا.

جەور: ستەم.

جەفا (ع): ماندوویێتی، نادڵنیایی، توندوتیژی، گرانایی، پشت لێ هەڵکردن، ڕوو پێ نەدان، لێ

دووركەوتنەوە، ڕوو ساردی و ڕوو وشكی.
جەفايەت (محمد اسود و گیو/٣): جەفایە.
سوخمە: پۆشاكێكی كوردانە و، وەك ئێلەكی ئێستە وەهایە و بەڵام گۆشەی هەردوو داوێنی بەر بەرۆكی گۆشەوارەیەكی/٩٠ پلەیی (زاویە قائمە)یە و لە جێگەی (قۆپچە) و (زنجیری ئێستە) جاران بەبەرۆكەكەیدا دوگمە و قەیتان دەدوررا و پێشەكەی لە دیوی دەرەوە لە قوماشی ئاڵوواڵا بووە ملیوانەكەشی خشتاوخشتی مل بووە، هەشبووە قوپچە دار وە یا ناودار و قۆڵداریش بێ. هەتا كۆتایی نیوەی یەكەمی چەرخی بیستەم بەكار دەهات.
هجر (ع): لێك بڕان، لێك جیایی، بەڵام وشەی (هجر) كە بەشێوە ڕێنووسی كۆن نووسراوە بۆیە دەتوانرێ بەسێ شێوەی تری وەك (هەجر) بەواتە زۆر گەرمایی قرچەی هەتاوی نیوەڕۆ، وە (هوجر) بەواتە قسەی تاڵ و توند و ناخۆش و گران و جنێو، وە (هیجر) بەواتە خوو و ڕەوشت بخوێنرێتەوە كە ئەم سێ جۆرە واتەیەش كە ئەم سێ جۆرە وشەیەوەن لەگەڵ مەبەستی ئەم تاكە هەڵبەستەدا دەگونجێنێ و (كوردی) مەبەستی ئەمانە بووە نەك لێك بڕان و جیاییەكە و، من هەر وشەكەی (هجر) بەڕێنووسی كۆن لە سەرەوە جێگیر كرد و بەسەر یەكێ لەو سێ وشەیەدا ساغم نەكردەوە.
فیرقەت: جیایی، لێك بڕان، دووری دوو شت یا دوو كەس لە تر. وەك لە لێكدانەوەی (هجر)دا وتم مەبەستی لێك بڕان و جیایی نییە و بەشكو مەبەسی سێ واتەكەی ترە، ئەوا لێرەدا (كوردی) بەم وشەی (فیرقەت)ە مەبەستی (جیایی و لێكدابڕاون)ەكەی گەیاندووە، چونكە دووبارەكردنەوەی یەك واتە لە وێژەی كۆندا و بۆ یەكێكی شارەزای وەك (كوردی) ناگونجێ.

٢- وێڵ: سەرگەردان.
وەحش: كێویی، سەرسام.
بەقەد: ئەوەندەی، هێندەی.
ذەرە: گەردیلكە، تۆزقاڵ، گەرد.
ئەم تاكە لە (ع)دا نییە و، لە (ما)دا هەشتەمینە و لە پەراوێزیشەوە، نیشانەی ئەوەی كردووە كە لە سێیەمین تاكە.
چاوی مەستت (جلی): چاوی وحشت.
چاوی مەستت (كم): چاوی مەستی.
چاوی مەستت (ما): چاوە مەستت (نسخە).
داپۆشیوە (كم): داپۆشی. ئەم وشەیە بەشێوەی (داپۆشیوە)، كێشی هەڵبەستەكە لەنگ دەكات و دیارە دەسكاریی بەسەرا هاتووە ئەشێ (چاوی مەستت و پەشێو) بووبێ.
داپۆشیوە (ن): دوینی پوشی.
داپوشیوە (ر): داپشیو.
داپوشیوە (ش، ص، گ/٣): داپشیوو.

داپوشیوه (ما): داپشیووی کرد و...

داپوشیوه وێڵ و (گ/٢، س): وێڵ و هەم شێواو و.

وێڵ و وەحشی (ر، ش، ص، ما، گ/٣): وەحشی و وێڵی.

ذەڕڕە (ما): زرّەء.

ذەڕڕە (گ/٢، س): تۆزێ.

ذەڕڕە (گ/٣): زەریک.

نەماوە عەقڵ (ما): نەم ماوە.

عەقڵ و ئیدراک (جلی) – نسخە: إدراک و.

جوانی لەم تاکەدا جیناس ئارایی (داپۆشیی) و (وەحشی)یە و، لەوە دەچێ کە (بەچاودا پاشای)دا خۆشەویستەکەی چاوی (یەشا بێ) و ئەم هەڵبەستەی بۆ وتبێ و، جگە لە چاو شاردنەوەشی و...

نەماوە عەقڵ و (محمد اسود): نەم ماوە – لەنگە.

عەقڵ: هەست، هۆش، تێگەیشتن، ژیری، پەرتەو (نوور)ێکی گیانییە کەوا بەهۆیەوە وەهانای دەروون (نەفس) ئەکرێت بەڕادەیەک کە هەستەکان (حەواس) ئەو هانایەیان لە وزەدا نییە و نایکەن کە (عەقڵ) لە بارییایە و پێی دەکرێت.

ئیدراک: تێگەیشتن، پێزانین، هەست، هەست پێکردن، هاناکردن، گەیشتن، بینین، هێزی هەستکار.

لە ڕووی فەلسەفییەوە (ئیدراک) بەواتە پەیابوونی وێنەی شتێک لە ژیری (عەقڵ)دا، کە ئەو وێنەیەش ڕاستی (حقیقە)تی بوونی شتەکە نییە بەشکو هاوچەشنی (میثال)ی ئەوە. کەواتە (ئیدراک) بەواتە زانینی شتێک یا هەست پێکردنی یا هاناکردنی جگە لەوەی کە ئەمە وشەیەکی صۆفیانەیشە.

کەماڵ: تەواوەتی، مەبەست لە ڕێکوپێکی و بەسەرخۆوەبوویی و توانایی و لێهاتوویی و ئیتر لە بارەی جۆرێتی و ڕواڵەتەوە لە چەند و چۆنێتیدا پڕ بەپڕ و مشت بێ... هەرچەندە وشەیەکی صۆفییانە و مەبەست خوایە بەلای صۆفییەکانەوە چونکە (الکمال لله وحدة) دروشمێکیانە.

٣- سەقف: بن میچ مەبەستی بن پێڵووی چاویەتی.

بارش: باران و باری گران و یا (بارەش)، ڕەشەبا کە هەردووکیان بۆ ئێرە دەگونجێن و واتای جوان دەدەن.

وای: ئاوەهای.

گۆل: ڕاوەستانی ئاو لە شوێنێکا – مەبەست لە قەتیس بوونی فرمێسکە لە چاویا و دوای ئەوە بە(خوڕ) کەوتووەتە لێ چۆڕاندن و دڵۆپەکردن و ئەمە وێنەی خانووی لە قوڕ دروستکراوی ئەو سەردەمەیە.

بەستووە: بەستوویەتییەوە، شەتەکی داوە، هەروەها بەستوویەتی (بۆتە سەهۆڵ)، بۆیە بەلێشاو

نەهاتووەتە خـوارێ و مـەبەست لە پەسـتـاوتنی فـرمـێسکەکـەیە بەسـەرمـای بـارەشـەکـە یا بەقورساییی غەمەکە.

بەخورِ: بەگورِ، بەتەوژم (کە بۆ ئاوە).

تکە: دڵۆپە.

وێران: کـاول، رووخـاو، تەنـانەت ئەو سـایە مـاڵی پاشـایەکـانی بـابانیش رێکوپێک نـەبوون و (مـسـتـەر ریچ) لە گـەشـتـەکـەیدا لـە پاشـای بابانی بیـسـتـووە، چونکـە بەنیـازی مـانەوەی لە خانووەکەدا نییە، بۆیە چاکی ناکات.

ماڵ: خانوو.

ئەم تاکە لە (گل/١)دا نییە وە لە (ما)دا، هەرچەندە سێیەمینە، بەڵام لە پەراوێزەوە نیشانەی بۆ ئەوە کردووە کە دووەمینە.

سەقفی (گ/٢، س): بانی.

بارِش (ن، ص): بارِّش – کە ئەمیش لەگەڵ هەڵبەستەکەدا دەگونجێ بەرێکخستنی با و باران و گۆلاوی ئاو و لێچۆرِانی.

بارِش (ر): بارس – بەواتە بارستایی (قەبارە) ئەمیش دەگونجێ.

غەم (گ/٢، س، گ/٣): خەم.

وای (جلی، ف، نم/١، کم، گ/٢، س): وا.

لەسەر (نم/١، کم، گ/٢، س): بەسەر.

گـۆل (ف، ش، نم/١، کم، گ/٢، س): کۆی. بـەواتە (تانە) کـە نەخـۆشـیـیـەکی چاوە و ئەمـیش دەگـونجێ و مـەبەسـتی لەوە بووە کـە (نەخـۆشی – کـۆ –) لە خـەمـدا بەسـەر رووی (مـینا)ی چاوییەوە بووە، کە بەمە دەنگی لە پیریش داوە.

گۆل (ر، مـا): کـول – بەواتە بـرینداری یا (چاوکولی) وە یا (کـۆل) کـە شـوێنی ئاو تێکردنە لە دارێکی هەڵۆڵ دروست دەکرێ و مەبەست لە چاوە پرِ لە فـرمـێسکی بـارشی غەمـەکـەیەتی و بۆ ئێرە دەگونجێ کە چاوی خـۆی بە(کۆل) چواندووە و ئەمـە نیشـانەی چاو کزی و بەڵگەی پیریی خۆیەتی.

(کوردی) ئەم هەموو واتایانەی لەم تاکە هەڵبەستەدا و بە وشەبازی راگەیاندووە.

بارِەش: جۆرە بایەکە لە ناوچەی شاری سولەیمانی ناو بەناوێک وە لە هەر وەرزێکا هەڵ دەکات و زۆر بەهـێـزە زیانیش دەدات لە دارایی و تۆز هێنانەکـەشی بۆ چـاو خـراپـە کـەوا زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە تووشی نەخۆشیی پێلۆ (تەراخوما) بوون بەو هۆیەوە ئەو بایە بەهۆی باری هـەڵکەوتنی سـروشـتـیی دەوروبەری شـارەکـەوە دروست دەبێ، بـەڵام ئەگـەر بەری لای سەرووی شارەکە کە بنار و لاپاڵی شاخی گۆیژەیە بکرێتە دارستان ئەو بایەی بەو توندوتیژییە نامێنێ چونکە ئەو داروبارە لە هێزی بایەکە دەشکێنێتەوە و ئەوسا کەڵکداریش دەبێ و چارەی (رەشەبا) و رێکنەخستنی تۆرِی ئاوەرِۆ زانیارانە دوو هۆی ناتەواوی شارەکەن.

کۆ: لەگەڵ ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەگونجێ، چونکی (کۆ) نەخۆشییەکە لە چاودا و بریتییە لە پەیابوونی تانەیەکی گەورە لەسەر چاو، کە بەپێی بڕوای کۆن ئەمە لە هەندێ کەسدا بەهۆی کاریگەریی هەڵهاتنی ئەستێرەی (کۆ) و تەرازووەوە ڕوو دەدا و لە ئاژەڵیشدا بەهۆی خواردنی جۆرە گیایەکی وەک (چەقەلۆ)وە پەیا دەبێ و ئەم نەخۆشییە وەک ئاوی سپیدا هاتنی چاو وایە یا هەر خودی خۆیەتی. کە دەڵێن کۆ لە چاوی داوە یا چاوی کۆی کەوتووەتە سەر، (کۆ) هەم (تانە) و هەم ئاوی سپییە بۆ چاو.

بەستوە: دوو جۆرە واتە بۆ ئەم تاکە هەڵبەستە دەدات یەکەمیان مەبەست لە (بەستن، بەستنەوە، هەڵبەستن) و دووەمیان مەبەست لە (بەستن، بوونە سەهۆڵ، بەستاوتنی ئاو، فرمێسکەکە وەک سەهۆڵبەندان و گوایە پێڵۆو (سەقف)ی چاوی ئاوا بەستوویەتی).

**هەڵسەنگاندن:**

جوانیی دەربڕین و وەستاییی جیناس ئاراییی لە هاتنی (خوێن) و (بەخوڕ) و بوونی دوو پیتی (خ) و نزیکایەتیی (خوێن و خوڕ) کە لێرەدا بەواتایەکی ترە لەگەڵ جیناسی (خوڕ) و (دەچۆڕێ)دا و کوڵکی چاوی پڕ فرمێسکی خۆکردن بەکاولە خانوویەک کە سەربانەکەی دڵۆپە بکات، پەسندییان داوە، بەم تاکە، هەرچەندە ئەم بیر و دەربڕینەش لە هەڵبەستی (سالم) و (نالی)دا هاتووە.

جیاوازیی سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستە لە زۆر شوێنیا بەڵگەی ئەوەیە کە گۆڕدران لە دەقی وتنەکەی (کوردی)دا پەیا بووبێ. بەڵام هەتا سەرچاوەی بەهێزتر دێتە ئاراوە، با وەها بێ.

٤- وەصڵ: پێکگەیشتن، ناوی دوا وشەی مانگی (قەمەری)یە کە شەوی پێکگەیشتنە.

ی□ح□ییَ الع□ظام□ : نیشانەیە بۆ ئەوەی کە (کافر)ێک ئێسکێکی پووکاوەی بردووەتە لای پێغەمبەر (د.خ) و وتوویە ئایا تۆ وتووتە کە خوا گیان دەکاتەوە بەبەر ئەم ئێسکەدا؟؟ ئەویش فەرموویە بەڵێ و ئیتر ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارێ کە: (وَضَرَبَ لَنا مَثَلاً ونَسِيَ خَلْقَهُ، قالَ: مَنْ يُحيي العِظام وَهِيَ رَميمْ) واتە (میثالی بۆ هێنایەوە و ئەو کەسە دروستکردنی خۆی لە بیر خۆی بردەوە و، وتی کێ ئێسکێک دەژێنێتەوە کە پووکابێتەوە).

(کوردی)ش بە یەکگەیشتنەکەی بەزیندووکردنەوەی ئەو ئێسکە پووکاوەیە داناوە: ئایەتی/٧٨ لە سوورەتی «یاسین».

قالب: جەستە، لەش.

فەرسوودە: ڕزیو، تێکشکاو، ئەمیش دیاردەیە بۆ پیربوونی خۆی کە ئێسکیشی پووکاوەتەوە.

بەگەردم: بەتۆزم مەبەسی لە تۆزی ئەو ئێسکە پووکاوەیەتی کە بەر لەوەی بای شەماڵ بیبا، با بە پێکگەیشتنەکە بژێیتەوە.

ئەم تاکە لە (ش)دا نییە وە لە (ما)دا دووەمینە وە لە (گل/١، ر)دا سێیەمینە.

(يُحْيي العِظامَ)ەی (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): يحی العظام و.

(يُحْيي العِظامَ) (ع، و، ما): يحی العظامه.

(يُحْيى العِظامَ) (عن، ن، گل/١، گل/٣، گل/٧، گل/٨): يحی العظامی.
فەرسوودەمە (ف، ما، نم/١): فرسودمە.
فەرسوودەمە (ع): فرسودمنە.
فەرسوودەمە (ر): فرسودهم.
سا مەیێڵە توو خودا (ر): میله سا تو بی خدا.
سا مەیێڵە توو خودا (گ/٣): بێڵە تۆ تۆ خودا بڵا.
٥- ئاسک: جەیران، ئاهوو.
چین: وڵاتی چین و مەبەست لە بوونی جۆرە ئاسکێکە لە بیابانەکانیا کە (مسک) یا (موشک)ی لێ وەردەگیرێ و لەبەر نایابییەکەی ئەوەندە ڕاو دەکرێ، لە ئاسکەکانی تر سڵتترە، بۆیە (کوردی) و هۆنەرانی کەش ناویان بردووە بە(سڵ) کە یارەکەیان لە (سڵ)یدا پێ چواندووە.
نیگا: تەماشا، نوارین.
وەستان: ڕاوەستان، هەڵوێستە.
ڕەو: هەڵاتنی گورج.
کەبک: کەو.
کۆ: کێو.
زابولستان: ناوچەیەکە لە نێوان (کابول) و (سەجستان) و دەریای (سەند) و (خوراسان)دایە و بەکەوی نایاب بەناوبانگە.
خەطط و خاڵ: خاڵ و میل کە بەبەر گەردن و سەر و لاتەنشتی کەوەوەیە و مەبەست لە گەندەموو و خاڵی سەر ڕووە بە(یار)ەکەیەوە.
ئەم تاکە لە (ف، جلی، ش، نم/١، کم، گ/٢، س)دا نییە و لە (گل/١)دا چوارەمینە وە لە (ما)دا پێنجەمینە و لە (ر)دا حەوتەمینە وە لە (جل – نوسخەدا) حەوتەمینە.
ئاسکی (ر): آهوی.
ئاسکی (ما): آسککەی.
ئاسکی (گ/٣): ڕەشکی؟؟ ئەم وشەیەش بێ واتایە بۆ ئێرە، ئەشێ هەڵەی چاپی بێت.
ئاسکی (جل – نوسخەدا): آسک.
چینی (ن، ما، گ/٣): چینە.
چینی (ر): تاتارە.
نیگا و (ما) نیگاه – ئەمەش کێشی هەڵبەستەکە گران دەکات.
وەستان و (ما): وستانوە.
ڕەو (ن): روت – کە ئەمیش (رەوت)ە.
وەستان و ڕەو (جل – نوسخە): وستانوە.
بۆ نیگا و وەستان و ڕەو (ر): برم کردن بنم، وە لە دوای (بنم)ەکەوە نووسیویە: نسخە = بناز

– که مەبەستی لە: (بەڕەم کردن بەناز)ە و نووسینەکە شێواوە.
بۆ نیگا و، وەستان و ڕەو (گ/٣): بۆ ڕەوت و نیگا و وەستانەوە.
کەبکی کۆهی زابولستان و (جل – نسخە): کبک کوه زابلستان.
زابولستانی (ما): ابلستانە.
بەلەنجە و (ما): بنغمو – کە (بەنەغمە و)ەیە بەڕێنووسی کۆن وەهایە.
بەلەنجە و (گ/٣، جل – نسخە): بەنەغمە و.
کەبکی کۆهی زابولستانی بەلەنجە و (ر): طاوسی هندوستانە هم بعشوە و.
**هەڵسەنگاندن:**
بیــر و دەربڕینــی ئەم تاکـــە خـــودی (کـــوردی) لە شـــوێنی تردا و هـۆنەرانـی تری (کــورد) و (ناوچەکە)ش زۆریان دووبارە کردووەتەوە و لە هەمووانیان بەناوبانگتر ئەم تاکە فارسییەیە:

آهوز تو آموخــت بهـنگام دویدن

رم کردن واستادن واپس نگریدن

واتا: (ئاسک لە کـاتی چەرینـا یا ڕەوتا لە تۆوە فـێـری ڕەوکـردن و هەڵوێسـتـانەوە و بۆ دواوە ڕوانین بووە).
کەبک: کەو – جۆرە مەلێکی کەژییە و لە کوردستـان و هەندێ ناوچەی ئێران و لە تونسیش دیومـە، بەڵام ئەوی تـونس لە هی کـوردسـتـان گچکەترێکە، ڕەنگی کـەوەیی و دەنگی خـۆش و ڕەوتی جـوان و بەنـاز و دەنووک و قـاچی سـوور و بەرگـەردن و لاتەنشـتی خـاڵ و مـێڵـی ڕەش و سـپی پێوەیە و ڕاوی پێ دەکەن کـەوی تری پێ دەکوژن بۆیە کـورد بەکەو دانراوە کە تـوخـمی خۆی دەخاتە داوەوە بەکوشتنی ئەوا ئەمەش هۆیەکی دواکەوتنمانە.
زابولستان: نیشتمانی زابول:
زابول: نیـشـتـمـانێکی کۆن و خـاوەن شـارسـتـانیی بەرز و مـێژوو و وێژەیە ئەکەوێتـە نێوان لە ڕۆژهەڵاتەوە نیشتمانی کابول (کابولستان) و لە ڕۆژاواوە (سیجستان) و لە لای خـوارووییەوە دەریای (سـەند) و لای سـەرووشـیـەوە شـاخـەکـانی (هەزارە) و (خـۆراسـان)ە کـە دەکـەوێتـە پانتاییەکەوە درێژییەکەی ٢٠ قۆناغ و پانایییەکەی ١٥ قۆناغەڕێیە و، لە کۆنیشەوە زابولستان مەبەست لە ناوچەیەکی شاخاوییە لە خۆراسان و بەکەوی جوان بەناوبانگە کەوا (کوردی) بۆی دەسنیشان کردووین.
خەت و خاڵ: مـەبەس لە میل و هێڵ هێڵـە ڕەش و سپی و کەوەیی بەرگەردن و سـەر و لاتەنشتی کەوەکە جوانی کردووە... و خـەت و خاڵ مـەبەسـتی یا لە گـەردانە (خـەت) و خاڵی سـەر گۆنە و لالێو و سـەر ڕوومـەت و بەرگـەردن و... هتدە وە یاخـود مـەبەسـتی لە خـەت گـەندەمـووی ڕووی خـۆشـەویسـتـەکـەیەتی، ئەمـجـا وەنەبێ کـە هەر نێـرینە ئەو گـەندەمـووەی هەبێ لە سـەرەتای پێگەیشـتنی یا بەشکو کچـۆلەش هەیەتی، وەک (گۆران) لە هەڵبەسـتێکیدا لە کـچێک دواوە و وتوویە:

کە هی ئافرەت هەڵدەگیرێ و هی نێرینە دەتاشرێ.

٦- دانش: زانست، ژیری.

بێ کەماڵ: بەبێ کەماڵ - بەڵام لە (عن)دا بەرامبەر بەم وشەیە ئەم پەراوێزە فارسییە هاتووە کە: (حکایتیست کە یکی بخانە ای رفتە، صاحب خانە منع او کردە وزنش گفتە: (بیکەمال) و این لفظ شائع است). واتە: (سەرگوزەشتەیەکە یەکێ چووەتە ماڵێکەوە و ئاوقای خاوەنی ماڵ هاتووە و نەیهێشتووە و ژنی خاوەن ماڵ وتوویە (بیکەرە ماڵەوە) و ئیتر ئەم وتنە قاوە). جا ئەگەر (کوردی) مەبەستی لەم سەرگوزەشتەیە بووبێ ئەوا داوێن پاکیی خۆشەویستەکەی گەیاندووە و ئەگەر نا بەخاوەن عەقڵ و کەماڵ دانشی کەم هاوتای دانەدەنا لەگەڵ مناڵیشیا و لە جۆری (بێ کەماڵ)ی جیا کردووەتەوە، کە ئەو جۆرە ژنی کابرایە لەوانە بووە کە ڕێگەی پیاوکردنە ناو ماڵی خۆی داوە.

طیفل: مناڵ.

خوردەساڵ: مناڵ، کەم تەمەن.

ئەم تاکە لە (ما، ش، جلی)دا نییە وە لە (ف، نم/١، گل/١، کم، گ/٢، س)دا پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە (جل - نوسخە)دا شەشەمینە.

دولبەری (جل): دلبری.

وا بە (ر، ما، گ/٢، گ/٣، س): وا پڕ.

وام دەزانی (ما، گ/٣): وا مەزانە.

وام دەزانی (ڕ): وا نەزانی.

وام دەزانی (نم/١، ف): وا دەزانی.

**هەڵسەنگاندن:**

جوانی لەم تاکە لە (بەکەماڵ و بێ کەماڵ)ی جیناس ئاراییدایە و ئەو چیرۆکی ئافرەتی (بێ کەماڵ)ەشی وەک کەلەپوورێک پێ گەیاندووین.

**هەڵسەنگاندن:**

تاکو ئێرەی ئەم پارچە هەڵبەستە، واتە هەر پێنج تاکەکەی پێشوو ڕووتێکردن (مخاطب)ە بەرامبەر بەخۆشەویستە جوانەکەی (کوردی) و ئەوا لێرەوە ئەو ڕێچکەی دەستووری زمانییە دەگۆڕدرێت و لێرەدا (کوردی) لەبەر خۆیەوە بۆ خۆی دەدوێ و لە سێ تاکەکەی دواییشدا دیسان ئەم شێوەیە دەگۆڕێ بەجۆرێ تر، ئەمەش بارێکی کۆنە و (تەداعی) پێ وتراوە.

٧- طەبیب: پزیشک.

ئەر تۆ: ئەگەر تۆ.

ئەم تاکە لە (ش)دا سێیەمینە و لە (ع)دا چوارەمینە و لە (ما)دا پێنجەمینە و لە (گل/١، ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا شەشەمینە و لە (ر)دا هەشتەمینە و لە (جلی)دا پێنجەمینە و لە (جل

– نوسخە)دا هەشتەمینە.

ئەر تۆ (ش): گەر تۆ.

ئەر (جلی): گر.

زامی دەردم (ف، جلی): زامی دووریم.

زامی دەردم (ما): دەردی دووریم.

زامی دەردم (ر): زامی دووری.

تاکە (گ/٢، س، گ/٣): تاکی.

تاکە (ش): تاکو.

گەرماوگەرمە (جلی): کرما و کرمە.

بۆی: ئەم وشەیە جگە لە (ع، ما) لە هەموو سەرچاوەکاندا (بوم) نووسراوە، بەم پێیە دەبوو (بۆم)مان لە سەرەوە جێگیر بکردایە، هەرچەندە هەردووکیشیان دەگونجێن.

**هەڵسەنگاندن:**

جوانییەکی وێژەیی لە وشەی (تاکە گەرما و گەرمە)دا هەیە کە (تا)ی لەرزوتاکە، یا (تاوەکو) دەگرێتەوە.

شەهد: هەنگوینی نەپاڵاوتە یا هەر بەمێوی شانەی پوورەکەیەوە، وەک چۆن لە پوورە یا لە دووبەرە دەردێ، ئاوەهایی کە لە ڕاستیدا ئەو هەنگوینەش بێ غەشترینە و دیارە فێڵ و دەسکاریی تیا نەکراوە، بۆیە (کوردی) پێککەیشتنی (ویصال)ەکەی کردووە بەو جۆرە هەنگوینە ساغە.

٨– ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ش، ما)دا چوارەمین و، لە (ر)دا پێنجەمین و لە (جل)دا شەشەمین و لە (کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمین و لە (ن، جل – نوسخە)دا هەشتەمین و دوا تاکە.

عاشق: دڵبەند بە شتێکەوە، یا بە کەسێکەوە، بەندیوارییەکی بەسۆز (عاطیفە) بەشتێکەوە یا بەکەسێکەوە لە ڕووی (ماددی)یەوە، هەروەها (عاشقی مەعنەوی)ش هەبووە و ئێستە لە کەمییە کە شەیدایی ڕەزامەندی خوا و شێفتەی گەیشتن بە(پەرتەو)ی خوا تاکو ڕادەی دەستبەردار بوون لە بەهەشتیش لەو ڕێگەیەدا، (دڵدار)، وە من هەردوو جۆری (ماددی) و (مەعنەوی)یە کە، بەچنۆکی و لە (سوود و خواستی خۆگەران)یان دادەنێم و، هەر سەوداسەرییەک لەو هەردوو ڕێگەیەدا هەر لە پێناوی ئەو گەیشتن بە(گێز) و (ئارەزوو) و (خواست) و (هیوابارى)یەی خودی خۆیدا بووە و، لەو جغزی خۆپەرستییە بەدوور نییە، ئەوەندە هەیە جۆرە (مەعنەوی)یەکەی لە سنووری ڕەوشتی چاک و، جوان و، پەسند دەرناچێ و جۆرەکەی تری، واتە (ماددی)یەکە تا ڕادەی (بەدڕەوشتی) و (بەڕەڵلایی) و گوێ بەبەند و باوە، یاسا و ڕێسای کۆمەڵایەتی بەبەرەوەیە، ئەوەی (خۆشەویستی) یا (دڵداری) بەهێز دەکات، گونجاوێتیی (بار) و (هەڵوێست) و (چۆنێتی)ی خۆشویستراوەکەی تیا کاریگەرە.

قوربەسەر: من بەکارهێنانی ئەم وشە لێکدراوە بەدەربڕینی گشتییانە (عامی) دەزانم و پێم

وایە (کوردی) لە جێگەی (قوڕبەسەر) وشەیەکی پەسندتری دانابێ، چونکە (قوڕبەسەر)ی باری ماوەیەکی (کەمە)، لە دوای کۆست کەوتنی گەورەوە و، بەدرێژایی تەمەن و (هەتا سەر) درێژە ناکێشی. بۆیە ئەمە بەوە دادەنێم کە لە گۆڕانکارییەوە بێ و بەهەڵە نووسرابێتەوە.

چونکە (کوردی) بەپێی تێکڕای هەڵبەستەکانی کەسێکی (ورد) و (زانا)ی ئەوتۆ بووە زۆر بە(وریایی) وشەی گونجاوی لە شوێنی گونجاودا بەکارهێناوە.

دولبەر: ئەو کەسە بووە کە (کوردی) خۆشی ویستووە، بەڵام هەڵوێست و باری ئەو دڵخوازەی لە شێوەی هاودڵیدا نەبووە بەرامبەر بە(کوردی) بۆیە بە(دوژمن)ی داناوە کە ئەمەش دیسان هەمان (چنۆکی و خۆپەرستی)یە کە لە وشەی (عاشق)دا لێکم دایەوە، چونکە ناشێ و مەرج نییە ئەوەی کەسێک خۆشی بوێت، ئەو کەسە خۆشویستراوەش کەسە خۆش ویستەکەی بەدڵ بووبێ و ئەویش مافی ڕەوای (خۆش ویستراوەکە)یە.

لێرەدا سێ هەڵوێستی (زەق)م دیوە، یەکەمین لە هەڵبەستی هۆنەرە کۆنەکانماندا کە هەر بەدوژمن، کافر، بەد ڕەفتار، بێ بەزەیی، (دۆست و گوێڕایەڵی نەیار) = (ڕەقیب) و لەم جۆرە ڕواڵەتانەیان بە(خۆشویستراوەکانیانەوە) ناوە و دەستیان درێژ نەکردووە بۆ ئازادی و خواستی خۆشویستراوەکە و بەزۆرداری کردن نەیانویستووە هاودڵیان بووبێ.

بەڵام هەڵوێستی دووەم لە هەڵبەستی (ئەگەر بشێم بەهۆنەری تازە)یان ناوبەرم – ئەویش نەک هەموویان –) کەوا لە هەڵبەستەکانیاندا یەکسەر خۆیان بەشاعیر دادەسەپێنن و، بە(منی شاعیر) خۆیان پیشان دەدەن و وەک ئەوەی شاعیر دەبێ هەرچی خواستبێ بۆی بێتە دی و، دەبێ دوای ئەوە (ورێنە) و (بزرکاندن)ی وەک (ئاسمان دێنمە خوارێ) بەهەگبەکەمەوە زەوی گڕ تێبەر ئەدەم چونکە تۆ منت ناوێ و، هەی (خائین) بۆچی شووت بە... کرد لە ناو دەریادا و لەگەڵ چۆلەکەکەمدا (نامۆ)م (زەمەن) زەمەنی زەمەن و... هەر دەبێ (بۆ) هەر بۆ بیت بۆ (شاعیر)، شاعیرێکی وەک من... و ئیتر بەجۆرەها دەربڕین ئاوا ناچێژ و نامرۆڤانە و... هتد، بەبێ ئەوەی ڕێز لە هەستی خۆشەویستەکەی بگرێ و، هەر بەزۆر دڵدارن، هەڵوێستی سێیەم لەم ڕووەوە لە هەڵبەستی گۆرانییە (کەلەپووری – فۆلکلۆری)یەکانماندا دڵدار بەجنێو دەستدرێژی دەکاتە سەر باوک، دایک، برا، وە یا خاڵ و... هتدی دڵخواز یا (نزا)ی خێریان بۆ ئەکات کە لەم هەرسێ هەڵوێستەدا ناوەندەکەیان  ترۆو (نەخۆشی) هەست بەناتەواوی کار و زۆردار و نامرۆڤانەیە...

بێکەس: ئەوەی کە زۆر سەرنج ڕادەکێشێ لە هەڵبەستەکانی کوردیدا ئەوەیە کە وشەی (بێکەس)ی زۆر بەکارهێناوە و ئەوەش دەرگای پرسیارکردن لەو خۆ بە(بێکەس) ناوبردنەی واڵا دەکاتەوە، چونکە: کەس؛ مەبەست لە تاکەی ئەندامانی خانەوادەیەکە، کە بەپەیوەند (باوک) و (کوڕ) و (برا) و (برازا) و (مام) و (ئامۆزا)یەوە پێکەوە بەستراون واتە (کەسایەتی)یەتییەوە نەک (کەسەتی = شخصیە) هاوخوێن بەو خۆمایەتییەوە وا بەش کراون.

ئەگەر سەرنجی سەرێنی (کوردی) و خانەوادەکەی بدەین گەورەترین خانەوادەیەکی بەلای

کەمەوە ٢٠٠ ساڵ بەر لە (کوردی) و ئەمەش (٣٠٠) ساڵێکی ترە، خانەوادەی (صاحیبقڕان) بووە کە کەڵە هۆنەر و جەنگاوەر و پاڵەوان و خاوەن گوند و زەویوزار و گەورەی کۆمەڵایەتی ناوچەیەکی هەر لە دەوروبەری شـــــاری (سنە) و خـــــاکی (ئەردەڵان)ەوە هەتا ناوچەی (سولەیمانی) و قەڵەمڕەوی (بابان) لە کەسە ناودارەکانی ئەو خانەوادەی (صاحیبقران)ی مستەفا بەگی (کوردی)مان پڕ بووە تیا بڵاوبوونەوە و هەر لە درێژەدانی ناوداری و گەورەییدان ئەوەتا، بەزۆربەی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە و مایەی شانازیی نەتەوەکەمانن.

کەچی وەک لە هەڵبەستەکانی (کوردی)یەوە (بەزۆری) دەردەکەوێ ئەوەیە (کوردی) خۆی بە(بێکەس) ناو بردووە و، ئەم (بۆچی؟؟)یە بەبێ وەڵام ماوەتەوە.

بەلای منەوە ئەم لایەنەی؛ کەسانی پسپۆڕ و، وێژەوانی ورد و شارەزا و خۆ تەرخان کردووی دەوێت، کە نامەی ماجستێر و دوکتۆری لەسەر دەرکەن و ئەم بارەیەش ئاوتای (زانکۆ)کانی کوردستان دەکەمەوە ئەگەر دەست نەبەم بۆ

ئاشوفتە حاڵ: باری پەشێوی و ئاڵۆزی، دەروونی و، شێواوی و بێ دەقییە.

نەوەک بۆ منی (ر، ش، ما): نوک بو من – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە و لەنگیشە.

نەوەک بۆ من (ر، گ/٣): نەوەک وەک من.

غەریب (ص): فەقیر. ئەمەش هەڵەیە و کوردی هەرگیز (هەژار) نەبووە.

قوڕ بەسەر (ما، ر): قر بسر. دیسان ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

دوژمن (ر): دژم.

دوژمن (ما): دوشمن.

(غەریب): ئەم وشەیە کە لەم تاکە هەڵبەستەدا هاتووە لە ڕووی زمانییەوە بەواتە: کەسێ دوور بێ لە نیشتمانەکەی خۆی و ئەگەرچی (کوردی)یش کە یەکێ بووە لەو کەسانەی زۆر ئارەزووی گەشتوگوزاریان هەبووە، چونکە لە ڕووی دەروونییەوە پیاوێکی بێ ئارام بووە ئەگەر هەڵبەستی تیا دانابن لەو کاتانەدا خۆی بە(غەریب) ناو بردووە لە هەڵبەستی زۆر لە هۆنەرانماندا هەیە.

هەرچی وەک (کوردی)یە ئەوەندە لە (غەریبی) بێزار بووە، ئەو هەڵبەستانەی کە لە دەرەوەی کوردستان دای ناون نازناوەکەی خۆی تیایاندا بە(هیجری) دیاری کردووە.

وای بۆ دەچم کـــە باری ناهەمـــواری ڕژێمی (بابان) هەم بەدەست دراوســـێی دڕندە و چنۆکەکانمانەوە و هەم لە نایەکێتی خۆ بەخۆیی خانەوادەی پاشاکانی بابانەوە، وەهایان کردووە کە (کوردی) دڵی بەمانەوەی ناو کوردستان و بەتایبەتی (سولەیمانی)یەوە نەبێت، ئەمەش بەیەکێ لە هۆی گەشتوگوزارەکانی (کوردی) دەزانم لێرەدا کە باس لە (غەریب) و (غەریبی)یە جێی خۆیەتی کە لە ڕووی خاوەنی ئەم هەڵبەستەوە لە (غەریب) بدوێم.

غـەریب: بەوەدا کـە لە ناو هەندێ لە ســەرچاوەکـانی ئەم هەڵبـەســتـەدا دەبینرێ، چونکە نووسەرەکانیان لەم هەشت تاکە هەڵبەستەی پێشوویان پتر دەست نەکەوتووە، و بەڕێکەوتیش لەم تاکە هەڵبەستی هەشتەمەشدا وشەی (غـەریب) هاتووە، بۆیە ئەم هەڵبەستەیان بە هی

(غەریب)ی شاعیرێکی کورد جێگیر کردووە لە کاتێکا کە زۆربەی سەرچاوەکانی تری ئەم هەڵبەستەیان بە هی کوردی داناوە و لەم دانانەیاندا ڕاستن، چونکە ئەم بەشە سەرچاوەیەیان تاکە هەڵبەستی (نۆیەم)یشیان تیا نووسراوە کە لەو تاکەی ئایندەدا نازناوی (کوردی) و تەنانەت (هیجری)یش هاتوون.

لێرەشدا چ (کوردی) و چ (غەریب) هەردووکیان شاعیری نەتەوەکەمان بوون و هەڵبەستیان (کەلەپووری) نەتەوەکەمانە و من لایەنگیری ئەم یا ئەویان ناگرم هەتا بیکەم بە هی (کوردی) یا بە هی (غەریب).

سا هی هەر کامێکیان بێت هەر هی نەتەوەی کوردە و ئەوەندەی کە من بەپێی بەڵگە (وێکەوتووم) بە هی (کوردی) واتە (هیجری)م بۆ ساغ بووەتەوە و ئەگەر سەرچاوە و بەڵگەی تر سەریان هەڵدا، کە هی (کوردی) نییە و هی (قوربەسەر) یا هی (بێکەس) وە یا هی (ئاشوفتە) یا هی (غەریب)ە کە ئەم (ناو) یا (نازناو)انەش لەم تاکە هەڵبەستەدان دەدرێتەوە پاڵ شاعیرەکەی خۆی.

٩- قافڵە: کاروان.

فیکر: بیر، لێ ڕامان.

تاراج: تاڵان.

مەعنا: واتا، مەبەست لە (ناوەڕۆک)ە.

بەتاڵ: چۆڵ، چی تیا نەماو کولۆر، پووچ.

ئەم تاکە لە (ن)دا نییە وە لە (ش)دا پێنجەمینە و لە (ما)دا هەرچەندە حەوتەمینە بەڵام بەپەراوێز نیشانەی بۆ ئەوە کردووە کە (شەشەمینە) وە لە (جل)دا حەوتەمینە و لە (گل/١، ن، نم/١، کم، گ/٢، س)دا هەشتەمینە و کە لە (جل - نوسخە)دا نۆیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

فیکر (گ/٢، س، گ/٣): بیر.

بەتاراجی غەم (جلی، جل - نوسخە): تاراج خم.

غەمی (ف): غم و.

غەمی (ما، ر): غم.

غەمی (گ/٢، س، گ/٣): خەمی.

بۆیە کوردی (ع): بۆیە هیجری.

بۆیە کوردی وا (ما، ر، گ/٣): بۆیە وا کوردی.

دوکانی (ف، ما، جلی، جل): دکان.

مەعنا (جل نوسخە): معنی.

بوو (ع، ف): بوی.

هیجری (عن، ع): دوری.

## م

٢٢

### موتاڵای مەصرەعی

١- موتاڵای مەصرەعی ..........................................................................
.................................................................................................. زانا بم
٢- بەهای............................................................................ لە بازارِا
.................................... شەرابی ناب.................................. نانم
٣- ........................................... ئەمرِۆ............................. بلّێم ئەمرِۆ
..................................................................................................
٤- مەڵێن عەبدێکی چەند سووک و دەنی طەبعە.............................
لە بۆ من فەخرە.............................................................................. بم
٥- ضەعیفیی دیدە مەنعی دیتنت ناکا، قوبانت بم
کە جێت (وێرانە)یی دڵ بێ، چ (لەملا) بێ و، چ (لەولا) بێ
٦- دەریشم کەیت و، سەد هێندەش، ڕەقیبم لێ لە کارا بێ
غولامی (حەڵقە دەر گۆش)م، دەبێ دەرباری دەرگا بم
٧- لە (عەشق)و(دووری)یە (کوردی)، وەکو بولبول غەزەل خوانە
گەدایی کوێی تۆ بم، نەک؛ بەشاهەنشاهی دونیا بم

..............................................................

١، ٢، ٣، ٤- وەک دەبینرێت ئەم چوار تاکە هەڵبەستەی سەرەوە پچرِ پچرِ و ناتەواون، چونکە هەردوو سەرچاوەی هەڵبەستەکە بەرێکەوت شێواو بوون کە:
سەرچاوەی یەکەمیان (عن) ئاو بەسەر لاپەرِەی تیا نووسینی هەڵبەستەکەدا رِژاوە و بووەتە هۆی لکاندنی مەرەکەب بەسەر لاپەرِەی بەرامبەریدا و هی ئەو لاپەرِەی بەرامبەرەش لکاوە بەسەر نووسینی ئەم هەڵبەستەدا، لەگەڵ ئەوەشدا چاک شارەزای خوێندنەوەی ئەم سەرچاوەیە بووم و زۆریشی لەگەڵا کۆشام و بەپشتیوانیی سەرچاوەی دووەم ئەمجا لەوەندەی نووسیومە

پترێکم بۆ نەخوێندرایەوە.

سەرچاوەی دووەم (ب) لاپەڕەی تیا نووسراوی ئەم هەڵبەستە پەڕپووت و بێ چاودێری و زەرد هەڵگەڕاوی دووکەڵ و، کاڵبوونەوەی نووسینەکەی وە ئاوێتەکردنی تاکەکانی (٣، ٤، ٥، ٧)ی بەهەڵبەستی (٢٧ – دڵم کەیلە) هەر ئەوەندەی سەرەوەیم بۆ ساغ کرایەوە. بۆیە هەردوو سەرچاوەکەم کردنە بنکەی ساغکردنەوەی کە هێشتە چاپ نەکراوە.

ئاواتەخوازم کە دۆزینەوەی سەرچاوەی دیکە، ئەم هەڵبەستە بەتەواوی بێتە دەست.

موتالاّ: خوێندنەوە، پیاچوونەوە...

مەصرەع: نیو باڵی تاکە هەڵبەستێک.

شەرابی ناب: شەرابی پوختەی بێ غەش، پالاّوتە.

عەبد: بەندە، کۆیلە، ئەو مرۆڤەی کە وەک ئاژەڵ بەپارە کڕدرا بێ، خولاّم.

دەنی طەبع: سروشت پەست، پنتی، ڕیسوا.

فەخر: شانازی، لە خۆباییبوون.

٥، ٦– ضەعیفی دیدە: کزیی چاو، هانا نەکردنی چاو، ئەمەش بەڵگەی پیرییەتی.

مەنع: بەربەست، ڕێ نەدان.

قوبانت بم: کورتکراوەی (بەقوربانت بم) و (کوردی) جاری تریش ئەم وشە لێکدراوەی لە هەڵبەستیدا بەکارهێناوە، هەروەها شاعیرانی تری ئەو سەردەمەی کوردی خستوویانەتە هەڵبەستەکانیانەوە و مەبەست لە (بالاّگەردانت بم) و (بکرێمە قوربانی بۆ تۆ)یە. مەبەست لەم تاکی پێنجەمە ئەوەیە ئەگەرچی چاوم هانای بینینی تۆ ناکات لەبەر کزی، بەلاّم تۆ جێگەت ناو دڵی منە ئیتر جیاوازی لەوەدا نییە کە (لەملا) واتە لە دڵی کاولدا بێت کە هەمیشە دەتبینم و، یا ئەگەر چاویشم کز بێ ئەو کریی چاوەم ڕێگە لە دیتنت ناگرێ، چونکە تۆ هەر دەبینرێیت لە لایەن منەوە، با (لەولا)ش واتە لێم دوور بی یا بەچاو نەتبینم.

حەلقە دەر گۆش: ئەڵقە لە گوێ. مەبەست لە (عەبد)ە کە لە تاکی چوارەمدا لێکم داوەتەوە بەلاّم لە ڕووی زمانییەوە؛ (حەلقە دەرگۆش) بەواتە (ئەڵقە لە گوێ)یە ئەمەش لەوەوەیە کە سەدان ساڵ لەمەوبەر، چەتە (دەریاوان)ەکان لە کەنارەکانی کیشوەری (ئەفەریقا)دا کەسانی نێرینە و مێیینەی ئەفەریقاییان کریون کە لە تاو برسێتی فرۆشتوویانن وە یا ئەو (چەتە گەلە) فڕاندوونیانن وە ئەو ئەفەریقاییانەش نەریتیان وەها بووە کە هەموان (ئەڵقەیان لە گوێچکەدا) بوو و لە کیشوەرەکانی تری جیهاندا فرۆشراون وەک بەندە (عەبد) چەوسێنراونەتەوە، وەک ئاژەڵ هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کراوە.

لەبەر ئەو ئەڵقەیە بە(ئەڵقە لە گوێ) ناو براون، هەروەها ئەوانەی کە لە جەنگدا بەدیل گیراون دیسان کراونەتە بەندە و، وەک ئەڵقە لە گوێیەکان لەگەڵیاندا جوولاّونەتەوە و فرۆشتووشیانن و بە(بەندە) و (کۆیلە) دانراون.

لە کوردەواریدا بەوانە وتراوە بەزێڕ کرِدرایە (زەڕ خریدە) و (ئەڵقە لە گوێ)یشیان پێ وتوون، وە ڕەش پێستەکانیان بە(قول) واتە (کەسی ڕەش پێست) و هەروەها بە(قولەڕەش)یش ناو براون.

لە کوردستانیشدا لە سەرێنی ئیسلامەوە هەر ئافرەتێکمان (کوڕ)ی نەبووبێ، چووەتە سەر گۆڕی پیاوچاکێک و لەوێ ئاهی کردووە کە بەهۆی تکا و پیرۆزی ئەو پیاوچاکەوە خوا کوڕێکی بداتێ، ئەوا (پەڕەکەی داوێنی گوێچکە)ی کوڕەکەی خۆی هەر بەمناڵی سمیوە و ئەڵقەیەکی زیوی گچکەی لەو کونی سماوییە کردووە بەنیشانەی ئەوەی کە ئەو کوڕەی (ئەڵقە لە گوێ) و (دەروێش)ی ئەو پیاو چاکە دەبێت.

من یەکێکم لەوانەی کە (ئاهی دایکم) لەسەر گۆڕی (حاجی کاک ئەحمەدی شێخ) لە (سولەیمانی) هاتووەتە دی و بەڵام چونکە (تاقانە) بووم دڵی نەهاتووە کە گوێچکەم بسمێت.

بەڵام ئەم چەشنە ئەڵقە لە گوێیەی ناو کوردەواری بەواتای (بەندە) و (کۆیلە)ی (بەپارە کڕدراوی) نەبووە و نەتەوەی کورد ئەوەندە کەسایەتییەکی لە ناخەوە ڕەوشتی (مرۆڤایەتییانە)ی هەبووە، بەدرێژاییی مێژوویدا (بەندە)ی نەبووە و نەیکڕیوە و تەنانەت بە(دیل گیراو)ی (جەنگ)ی زەبەنگەکانیدا وەک (بەندە) و (ئەڵقە لە گوێ) دانەناوە.

لەم هەڵبەستەدا شاعیرمان (کوردی) خۆی بە(بەندە) و (ئەڵقە لە گوێ) و (دەرگەوانی)ی خۆشەویستەکەی خۆی داناوە، کوردییش کەسایەتییەکی مەرایی کار نەبووە کە بەکەسانی گەورەی فەرمانڕەواییدا بۆ (چنۆکی) هەڵی دابێ بەشکو ئەو خۆشەویستییەی دۆستێکی گیانی بووە.

**هەڵسەنگاندن:**

لەم تاکە هەڵبەستەدا (جوانیی وێژەیی کۆن) هەیە کە لە توانایی (کوردی)یەوەیە بەوەی وشەی (دەر)ی (دەرکردن) و، (دەر)ی (دەر گۆش) و (دەر)ی (دەربار) و (دەر)ی (دەرگا)ی هەریەکەیانی بەواتایەکی جیا لەوانی تر، واتە بەیاریی بەوشەکردنی هونەرمەندانە گرد کردوونەتەوە لەم تاکە هەڵبەستەی شەشەمیدا و بەم ناوەڕۆکە پڕوچڕ و زانایانەوە.

٧- وشەی (دووری) بەتێکڕایی لەم هەڵبەستەدا و بەتایبەتی لەم بێزاری لە (دووری) دەربڕینەیدا دەردەکەوێ (کوردی) ئەم هەڵبەستەی وەک نامەیەکی بیرکردنەوە لە دۆستێکی، بۆ ئەو دۆستەی ناردووە. بەداخەوە، وێ نەکەوتووم کە ئەو (دۆستە) کێ بووە.

ئەوەتا چۆن لە (عەشقی) دەروونییەوە (بولبول) گۆرانیبێژە بەرامبەر بەگوڵ (کوردی)یش خۆی وەها داناوە و کە (غەزەلخوان) هەم چریکە و گۆرانیی بولبولە بۆ گوڵ خونچە، هەم خۆی بە(غەزەل خوان) واتە (غەزەل)ی (شیعربێژ) داناوە. (غەزەل) هەڵبەستی دڵدارییە کە ژمارەی تاکەکانی لە (٧) پتر نەبێ، ئەوەتا کە ژمارەی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە (حەوت)ن. بەپێی دەستووری وێژەی کۆن.

(گـەدا): هـەژار، مـەبەست لەوەیە کـە خـۆی بەهـەژاری بارەگـای ئـەو دۆسـتـەی داناوە، کـە ئەو (هـەژاری)یەی خۆی گەلێ لە پادشایەتیی پادشایانی هەموو جیهانی لە لا پەسندتر بووە.

لە عەشق و (ب): لە عەشقی.

کوردی (ب): قوربان.

تۆ بم نەک (ب): تۆم کوردی.

غەزەلخوانم (ب): غەزەلخوانە.

٢٣

## جانا وەرە...

جەژنە پیرۆزەی (کوردی) بۆ عوسمان بەگی بابان

١- جانا وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەضای چاوی حەسوودان سوپەرت بم

٢- شادن لە تەماشای نەظەرت مەحرەم و ئەغیار
مروەت نییە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم

٣- راضیم بەدەنم هەروەکو خاکی بەری پێت بێ
شایەد کە لە ڕێی مەدرەسەدا ڕەهگوزەرت بم

٤- تۆ بەو دوو (روخ)ی خۆتەوە وەک (شاه)ی و (فەرضە)
دائیم کە لە پێش ئەسپەکە تا وەک (نەفەر)ت بم

٥- وەک دۆزەخە جەننەتم و خەفەتباریە جەژنم
شانازییە پەروانەیی دەوری (فەنەر)ت بم

٦- وەک تاڵی ضەعیفم لە هەتیتەی غەمی دووریت
شایستەیە ئێستاکە کە حەلقەی کەمەرت بم

٧- بۆ قەتڵی منی خەستە موژەت هەروەکو تیرە
ئەی من بەفیدای تیری نیگای پڕ خەطەرت بم

٨- تۆماری حەیاتم شڕی مۆرانەیی هیجرە
با؛ توحفەیی دیوانی پڕ و پڕ ئەثەرت بم

٩- ئەر خەشمە وە گەر لوطفە بە(کوردی) نەظەرێکە
قوربانی غەضەب گرتن و گۆشەی نەظەرت بم

---

١- سوپەر: سپێر، قەڵغان، مەتاڵ.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، ن، گل/٧، ص، ما، ش، ح، جلی، جل - نوسخە، نم/١) وە (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و ئێمە (کم)مان کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

لە (عن)دا لە جێی سەرەتاو ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە، لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسراوە

(معایده کردی در قزلجه برای ناظری مدرسهء عسکریه در سلیمانیه عثمان بیک برادری محمود پادشاه ببه رحمهم الله فرستاده).

واته: (ئەم هەڵبەستە جەژنە پیرۆزەی «کوردی»یە کە لە قزلجەوە بۆ چاودێری کاری قوتابخانەی سەربازی لە سولەیمانی عوسمان بەگی برای مەحموود پاشای بابانی ناردووە خوا بیانبەخشێ). من لەم جەژنە پیرۆزەیە کۆنترم بەرچاو نەکەوتووە.

نیوەی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم هەڵبەستەی بەبۆنەی جەژنێکی قوربانەوە داناوە.

ئەم (ما، جلی): لەم.

ئەوی لە تێکڕای ئەم پارچە هەڵبەستەوە هەست پێ دەکرێ، ئەوەیە کە (کوردی) لەو جەژنی قوربانەدا لە شارۆچکەی (قزڵجە)ی بناری خوارووی دەشتی (پێنجوێن)ەوە و، بانگهێشتی ئەو دۆستەی خۆی کردووە کە لە (سولەیمانی)یەوە بچێتە لای بۆ (قزڵجە).

وەک لە پێشەوە ئاشکرا بوو، ئەو دۆستەش (عوسمان بەگی بابان) بووە. بۆ دەستنیشانکردنی کاتی ئەو (جەژنی قوربان)ە بەپێی ئەو شارەزاییەی کە لە ساڵنامەگەریدا هەمە سەرنجم دا، کە ئەو جەژنە کەوتووەتە نێوان مانگەکانی هەردوو وەرزی (بەهار) و (هاوین)ی ساڵەکانی ١٨٢٠ تاکو ١٨٣٠ زاینییەوە، کە ڕێکەوتی کۆتایی ساڵە کۆچییەکانیان تیا دەکات کە لە ١٢/ی هەریەکێ لەو مانگە کۆتاییانەدا، جەژنی قوربان بوون کە مانگی (ذیلحەججە)یە جێی خۆیەتی کە نیشانە بۆ ئەوەش بکەم کە لەو کاتانەدا ناوچەی (قزڵجە) بەیەکێ لە هەزارەها سەیرانگا و هاوینەهەواری کوێستانیی خۆش و دڵگیری کوردستان دادەنرێ.

هەروەک لەم دەیان ساڵەی ژیانمدا کە بەکوردی و بنەچە و هەڵبەست ژیننامەیەوە خەریکم، بۆم دەرکەوتووە کە ئەو کاتە (کوردی) سەرۆکێکی بەڕێوەبەر و بەرپرسیاری ڕژێمی (بابان) بووە لە (قزڵجە)، هەروەک شاعیر (سالم)ی ئامۆزای (کوردی)یش بە(وەها کارێک) لە (شیوەکەڵ) بووە.

ئەو بانگهێشتنەی (کوردی)یش بۆ سەردانی عوسمان بەگ بە(جانا وەرە ئەم جەژنە) بەبۆنەی پشووی جەژنەوە بووە.

خۆ ئەگەر ئەو (جەژنە)ش (جەژنی مانگی ڕۆژوو) بووبێ ئەوا هەر (دوو مانگێک) لە جەژنی (قوربان)ەوە دوورە و، نزیکی ساڵە ناوبراوەکان بووە.

٢- ئەم تاکە لە (ح)دا کراوەتە دوا تاکی هەڵبەستێکی چاپنەکراوی (مەلا حەسەنی قازی شائق یا شایق یا شاهۆ ١٨٨٢ - ١٩٧١) کە ئەمەیە:

ئەی سەروی دڵ ئارا بەفیدای خاکی دەرت بم
غیرەت نییە بۆ تۆ کە ئەمن دەربەدەرت بم
بێگانەیی صەد ساڵە کە دێ شادە لە وەصڵت
تەنها هەر ئەمن حەیفە کەوا دوور لە دەرت بم

نەورەستــە و گــوڵدەســتــە ئـەرێ ڕۆحی ڕەوانم
ئینصـافـە هەتا کـەی لە سزای مـەرگ ئەثەرت بم
دڵ، بەسـتـەیی گـێسـووتە، بڵێ: بەڵکی ڕەها بێ
قــوربانـی زڕەی لوولە و قــوبیــەی کــەمــەرت بم
خـاکی بەری پێت سورمـەیی دوو دیدەی کوێرمـە
قــوربانی کلی ئەکــحــەلی (زاغ والبـصــر)ت بم
گـەر بێـتـو لەبی خــەندە بکا (شــائق)ی شــەیدا
لاڵ بێ، بەفـیـدای گـەردەیی پووشـینی سـەرت بم
«شـادن لە تەمـاشـای نـەظەرت مـەحرەم و ئەغیـار
مـروەت نـیـیــە تەنهــا هـەر ئەمـن دەربەدەرت بم»

وە دوا بەدوای هـەڵبـەسـتـەکـە ئەم تـاکـە لـە ژێر (سـەرەناوی - ولِغَـیـرِە)دا نووسـراوە و لەم هەڵبەسـتەی (کوردی) تەنیا ئەم تاکە لەم سەرچاوەیەدایە گومانیش لەوەدا نییە هەڵبەستەکەی (شــاهـۆ) لە هاوچـەشن (ڕەدیف) ئـەم هـەڵبــەســتــەی (کـوردی)دایە و ئـەم تاکـەی تێـدا وەک (تەضمین) ئاوێتە کردووە.

٣- شایەد: بەشکو.

مـەدرەسـە: مـەبەسـتی ئەو قـوتابخـانە سـەربـازییـەی (ئەحـمـەد پاشـا)ی بابانە کـە (نالی)ش لە سـەرەتای هەڵبەستێکیدا وتوویە:

«ئەم طاقـمـە مومـتـازە کـەوا خـاصـەیی شـاهن،
ئاشـــووبی دڵـی مــەملەکـەت و قــەلبی سـوپـاهن»

کە لە دیوانە چاپکراوەکانی (نالی)دا نووسراوە، بەم پێیە (کوردی) دەبێ ئەم هەڵبـەسـتـەی لە جـەژنێکی قوربـانی سـاڵەکـانی دوایی بەر لـە ڕووخـاندنی باباندا وتبێ، چونکە ئـەوسـایە ئەم قوتابخانەیە هەبووە.

بەری پێت (ما، جلی): سەرەڕێت.

بەری پێت (ش): سەری پێت.

مەدرەسەدا (ش): مدرسە.

ڕەهگوزەرت بم (ن، ف، ش، ما): خاکی گوزەرت بم.

ئەو (مـەدرەسـە) یا (زانکۆی سـوپایی)یە کە دامـەزرێنەر و سـەرۆکەکەی (ئەحمـەد پاشـا)ی دوا پاشـای بـابان بووە، هەتا ڕۆژی ڕووخـانـدنـی (ڕژێمی بابان) بەپێـشکەوتنەوە لە کـاردا بووە کە ئەویش مایەی مـەترسـتی خەلافەتە بۆگـەنەکەی تورکی دڕندەی عوسـمانی بووە لەو زانکۆیە و لە ترسـی ئەنجام و پێگەیاندنی (بەهێزترین سوپای کوردی) کۆشاوە کە هەرچی زووتر (پاشایەتی بابان) بڕووخێنێ کە تەنانەت پسپۆڕانی بێگانە و (ئەوروپایی) مامۆستا بوون لەو زانکۆیەدا و کارگەی چەکسازی تۆپخانەی پێشکەوتوویش لە سولەیمانیدا هەبووە.

ماوەیەکیش (کوردی) لەو زانکۆیەدا، وانەی گۆرانی و مۆسیقای وتووەتەوە وەک مامۆستایەکی شارەزا، کە هەڵبەستە نالاّیەکەی کوردی (١٨ – دڵ لە میحنەت کەیلە) بەڵگەی ئەو پسپۆڕییەی (کوردی)یە.

٤– روخ: ڕوو، ڕوخسار – بەڵام مەبەسیت لە (ڕوخ) واتە (قەلاّ)ی یاری (شەترەنج)ە کە هەریەکێ لە بەرەی یاریکەری ئەم یارییە دوو (روخ)ی هەیە – لێرەشدا (عن) بەفارسی ئەم پەراوێزەی نووسیوە: (إضافە بر سایر معانی (رخ) مقصود از دو کاخیست یکی مسکونەء خود عثمان بیک و دیگری کوشک مدرسەء عسکریە است کە او ناظرش بودە). واتە: (جگە لە واتاکانی تری ئەم وشەیە کە (روخ) مەبەست لە دوو تەلارە یەکێکیان ئەوی کە عوسمان بەگ خۆی تیا نیشتەجێ بووە و ئەویتریان کۆشکی قوتابخانەی سەربازییە کە ئەو چاودێریکاری بووە).

شاه – پادشا –: بەڵام مەبەست لە (شا)ی (شەترەنج)ە کە خاوەنی دوو (روخ)ەکەیە و هەر یاریکەرەش لە (شەترەنج)دا (شا)یەکی هەیە.

فەرضە یا فەرزە: پێویستە – و لە هەمان کاتدا (فەرزە یا فەرزانە) کە ئەمیش یەکێکە لە بەردەکانی یاریی (شەترەنج) و (دامە)یە کە (وەزیر)ە و هەر یاریکەرەی (وەزیر) یا (فەرزە یا فەرزانە)ی خۆی هەیە.

ئەسپ: وەنەبێ تەنیا مەبەست لە (ولاّخ)ی بەرزەی سواری بێ بەشکو لە یاریی شەترەنجیشا (ئەسپ) هەیە کە ئەمەشی مەبەستە.

نەفەر: هەر تاکەیەک لە هەرە کەمترین پلەی سەربازییە. بەڵام لەم یارییەدا هەر (شا) و یاریکەرەی وەک قەلاّ و زێڕ و ئەسپی هەیە لەگەڵ چەند (نەفەر – سەرباز)ێکیشیدا کە (بەیدەق)یشی پێ دەڵێن و (کوردی) ئەمەشی مەبەستە.

**تێبینی:**

وەک دڵنیا بووم لەوەی کە (کوردی) شەترەنج زان و شارەزای ئەم یارییە بووە و تیایا بەناوبانگ بووە.

٥– جەننەت: بەهەشت و مەبەستی لە (قزڵجە) بووە کە ئەم هەڵبەستەی تیا ناردووە لەو جەژنەدا کە بە(دۆزەخ)ی داناوە، کە (قزڵجە)ی بەبەهەشت چواندووە.

پەروانە و فەنەر: نیشانەیە بۆ دڵداریی (پەروانە) بەرامبەر بە(مۆم و چرا)ی ناو (فەنەر) کە لە خۆشەویستییا خۆی پێ دەسووتێنێ.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، ن، ص)دا هەیە و پێنجەمینە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

فەنەر: لە یەکێ لە هەڵبەستەکانی پێشوودا بەدرێژی لەسەر (فەنەر) نووسیومە.

٦– تاڵ: داوێک یا تەڵێک لە تەڵ یا دەزوو یا قژ و، مەبەست لێرە تەلی باریکە.

هەتیتە: کەرەستەیەکی پۆلاّیی زەرنگەرییە و کونی باریکی تیایە و تەلی زێڕ و زیوی پیا ڕادەکێشن بۆ باریککردنەوەی ئەو تەلانە، واتا (ضەعیف – لاواز و زەبوونم) لە ناو ئەو هەتیتەیەدا.

حەلقەی کەمەر: مەبەستی لە قەدباریکی عوسمان بەگ وەک تەلی ناو هەتیتەکە، بۆیە کەمەرت شایانی پشتێنێکی باریکی وەک بالای منە.
ئەم تاکە لە (گل/٧، ما، ش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە و لە (ح)دا نییە، چونکی تەنیا تاکی دووەمینی تیایە.
وەک تالی ضەعیفم (کم): وەک تالی و ضەعیفم.
وەک تالی ضەعیفم (ن، ش): وا قالّ و ضەعیف بووم.
وەک تالی ضەعیفم (ن، نم/١، ما، گ/٢، س، گ/٣): (وا قالّ و ضەعیفم) ئەمیش بەجێیە.
غەمی (ش): غم.
دووریت تەنیا لە (ما)دایە و لەوانی تردا (دووری)یە کە (دووریت) گونجاوە.
شایستەیە ئێستاکە (ف، نم/١، کم): شایستەم أمیستاکە.
شایستەیە ئێستاکە (ش): شایستەم و ایستاکە.
شایستەیە ئێستاکە (ما): شایستە أمیستاکە.
کە حەلقەی (ما): لە حەلقی.
کە حەلقەی (ش): حەلقەیی.
کە حەلقەی (گ/٢، س، گ/٣): ئالقەی.
ئەم تاکە: مەبەستی ئەوەیە کە (کوردی) لە خەفەتی دووریی (وەسمان بەگ) وەها لاواز بووە، بۆ ئەوە ئەشێ کە ببێتە (کەمەرە) یا (پشتێن) بۆ کەمەرە باریکەکەی وەسمان بەگ کە (کەمەرە) و (پشتێن)ی لە من ئەستوورتر هەڵناگرێ و ئەمەش دەنگ لە کەمەر باریکی ئەو یەکە دەدات.
٧- ئەم تاکە لە (گل/٧، ما، ش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
تیری (گل/٧، ش، کم، نم/١): تیر و.
تیری (ن، ما): تیر.
لەم تاکە هەڵبەستەدا بە(وەسمان بەگ)ی ڕاگەیاندووە، فەرموو سەرێکم لێ بدە با چاوێکت پێم بکەوێ کە هەر ئەو نیگایەت بۆ ئەوە چاکە، من بە(فیدا)ی بم، چونکە برژانگەکانت وەک تیر (گوللە) وەهان لە کوشتنی منی لە دووریی تۆی نەخۆشدا.
٨- تۆمار: جۆرە پەڕاویەکی هەمەبابەت بووە کە بریتی بووە لە چەند پەڕەیەکی (نامە)ی پەخشان و هەڵبەست لە بارەی وێژەیی و کۆمەلایەتی و زانستی و ئاینی و شێوەی نامەنووسین و... هتدەوە، کە هەموو پەڕەکان لە یەک پاناییدا بەیەکەوە دەلکێنران و لەبەر زۆر درێژییەکەی لەسەر تووڵەدارێک وەک لوولە هەڵدەکرا وە قوتابی سەرەتایی دەیخوێند بۆ فێربوونی شێوەی نامەنووسین.
مۆرانە: جۆرە مێروویەکی بەوزنگە، بداتە هەر شتێ دەیخوا و شڕ و پەڕپووت و لەتوپەت و پووکاوە و کون کونی دەکا.
توحفە: شتی نایاب.

دیوان: دیوانخانه. یا دیوانی شیعری عوسمان بەگ کە شاعیر بووە، پەروانخانەیەکی مەزنیشی لە دیواخاندا هەبووە.

ئەثەر: شوێنەوار و شتی کۆنینە و دانسقە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، ن، ص)دا هەیە و هێشتە چاپ نەکراوە. هەروەها ئەم تاکە نیشانەی لەناوچوونی صەد هەزاران پەڕاوی و نووسراوی کۆنمان بەسووتان و دڵۆپە و پەڕپووتی بێ چاودێری و (مۆرانە) و... هتدە کە زۆربەی سەرچاوە دەسنووسەکانمان ئەم نیشانانەیان پێوە دیارن.

(کوردی) لەشی خۆی چواندووە بەتۆمارێکی کە مۆرانەی دووریی (وەسمان بەگ) شرو وڕی کردبێ و تکای لێ ئەکات با ئەو پاشماوەی تۆمارە مۆرانە لێ داوە ببێتە شتێکی نایاب لە لای تۆ، چونکە تۆ کەسێکی خاوەنی (دیوانی شیعر) و پەڕاویخانەی (دیوان)ی پڕ لە شتی دانسقە و نایابیت.

٩- خەشم: تووڕەیی، ڕق، قین، توندی (غەضەب) و لێ زویر بوون.

لوطف: نەوازش، لاواننەوە.

نەظەر: تەماشا بەڵام مەبەست لە (چاودێری)یە.

گۆشەی نەظەر: تیلاییی چاو، تەماشای لە لاوە... کە ئەم (نەظەر)ە لەوی پێشوو جیایە و مەبەستی چاوی نەوازش لێ بوونە بەرامبەر بە(کوردی).

نەظەرێکە: چاوێکت لێم بێ.

ئەم تاکە لە (ح)دا نییە و لە (گل/٧، ما، ش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: حەوتەمینە و لە هەمووانیدا دوا تاکە.

ئەر (ما): گەر.

خەشمە (ش، ن): لطفە.

خەشمە (ما): لطف.

وەگەر (ما): اگر.

لوطفە (ش، ما): خەشمە.

لوطفە (ن): جەورە.

کوردی (ش): هیجری - وە (کوردی) هەرچەندە نازناوی هۆنەریشمانە، بەڵام لێرەدا بەواتای (بەڕەوان)، (بەزمانی کوردی)یە.

غەضەب (ش): نەظەر.

غەضەب (ما): غظب.

گرتن و (ش، ما): کردنی.

گۆشەی (ما): خەشم و.

٢٤

## ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم

١- ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم؟ غەریبی کۆیی دولبەر بم،
وە گەر ساتێ لە یادم چی؟ هیلاکی ژەهری ئەژدەر بم
٢- بەغەیرەز، بۆسەیی چاوت، ئەگەر (قەصد)ی (ویصال)ت کەم،
بەشوعلەی قەهری تو!! یا (ڕەب)، سەراپا میثلی (ئەخگەر) بم
٣- ئەگەر؛ یەک لەحظە سستی کەم، لە ژێر باری غەمی عەشقت
بەمیثلی پەنجەرە قوربان، بە(تەن) سۆراخی (خەنجەر)تم
٤- لەسەر تەعریفی (ئەگریجە)ت، ئەگەر بێم وەصفی (کاکۆڵ) کەم؟؟
بەضەربی تیغی ئەبرۆی تۆ، ئەمن مەقتوولی بێ سەر بم
٥- ئەگەر یەک لەمحە غافڵ بم، لە شەوقی ماهی ڕوخسارت،
لە حەشرا؛ بێ (نەصیب)ی جەننەت و، ڕووباری کەوسەر بم
٦- (گەدایی)ی کۆیی جانانە، بەشاهی عالەمی نادەم،
گەدایی خۆشترە بۆ من، لە شاهی گەر (موخەییەر) بم
٧- ئەرێ یاران، بلا (کوردی) لە (بۆتە)ی فیرقەتا یەکجار
خولاسە و، بێ غەش و، مەقبووڵی عالەم، قاڵترین زەڕ بم

---

**١- (سەرچاوە):**

ئەم هەڵبەستەم لە: (ق/٤، ب، ع، عن، گل/٣، گل/٦، گل/٧، گل/٨، ن، ف، ح، جل، ش، نم/١، ئا، کم، گ/٢، مس، س، گ/٣) وەرگرتووە و لەوانەدا (کم)م کردە دەسکەلای جێگیرکردنی هەڵبەستەکە.

**(سەرەناو):**

لە (عن) - بەشی (کوللیاتی کوردی) واتە - سەرجەم هەڵبەستەکانی (کوردی)دا ئەم (پەراوێز)ە (فارسی)یەی دوایی وەک (سەرەناو) یا وەک (پێشەکی) نووسراوە:
(سالم، یک نامەء شعریە، از - طهران - برای - کردی - در - سلیمانیە - فرستادە، و - کردی - بەغزل زیر و ردیف آن نامە جواب دادە کەدر نهایت این شعر نامەء سالم درج میکنم - علی -).

واتە:

(سالم – نامەیەکی هەڵبەستی لە – تاران –ەوە بۆ – کوردی – لە – سلەیمانی – ناردووە – وە – کوردی – بەم هەڵبەستەی وەڵامی داوەتەوە، کە لە کۆتاییدا ئەو نامە – (هاوچەشن = رەدیف)ە دەنووسمەوە – عەلی – کە ئەم (عەلی)یە نووسەری (عن) بووە.

**(لێکدانەوە):**

ئەژدەر: هەژدیها، ماری گەورەی کوشندە – لە چیرۆکە ئەفسانەییە گوێ ئاگردانییەکانماندا، ناوی (مار)ی زەبەللاحی ئەوتۆ هاتووە، کە (ژار)ەکەیان بەر هەر شتێ کەوتبێ، پووکاندوویەتەوە، یا (ئاگر) لە دەمیانەوە (شاخە) و (کڵپە)ی کردووە و شاخدار و حەوت و هەشت سەر بوون، تیشکی چاویان هەر گیاندارێک دیبێتی، خەوی لێ کەوتووە و، عاشقی ئافرەتی زۆر جوان و شەیدا دەنگی خۆش بوون، وە بەزۆری پاسەوانی گەنجینەی گەوهەر و زێڕ و زیو بوون و، بەپەیابوونی خاوەنی ئەو گەنجینانە، ئەو شوێنەیان چۆڵ کردووە و، خاوەنەکەی دەستی بەسەر گەنجینەکەدا گرتووە.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

غەریبی (س): غریبی. دیارە ئەمە هەڵەی چاپییە.

کۆیی (ف، نم/١): کوی – ئەمە بەپێی ڕێنووسی کۆنە.

کۆیی (ن): کوهی – ئەمە بەپێی ڕێنووسی کۆنە.

کۆیی (ق/٤، ر): کوە.

کۆیی (ح): کوە.

دولبەر بم (گ/٢، س، گ/٣): دڵبەر بم – ئەمە لە دەسکارییەکانی (گیو)ە.

وە گەر (ب، ف، ش، نم/١، ئا، کم، گ/٢، گ/٣): ئەگەر.

ژەهری (ن): زهری.

ژەهری (ب، جل، ح، ف، ق/٤، ئا، کم): زخمی. بۆیە لێرەدا پەیڕەوی (کم)م نەکرد، چونکە برین (زەم)ی (هەژدیها، مار) کەس ناکوژێ (هیلاکی) ناکات وە ئەوی دەیکوژی (ژار)ەکەیەتی.

ئەژدەر (مس): هژدر – ئەمە (هەژدەر)ە و بەڕێنووسی کۆن.

**٢– (لێکدانەوە):**

بەغەیرەز: جگە لە، بەبێ، بێجگە، بلی.

بۆسە: ئەم وشەیە (عەرەب) لە وشەی (ماچ)ی کوردییەوە وەریانگرتووە، بەواتای (ماچ)، (ماچۆکە)، (مووچ).

قەصد: نیاز، ویستن، ئارەزوو، بەدووری نازانم (عەرەب) لە وشەی (ویستن)ی ئێمەوە کردبێتیانە هی خۆ.

ویصال: پێکگەیشتن – لێرەدا (کوردی) بۆ پێکەنین، ئەم وشەیەی بەرامبەر بە(ئامۆزای خۆی –

سـالم) بەکـارهێناوە و هەر بە(مـاچکردنی چاوی) لێی گـەڕاوە کـە (مـاچکردنی چاو) لە خۆشویستنی هەرە دۆستانە و خزمانەوە دەبێ و بەڵام (کوردی) وەک گەمەجارێ بە(سالم)ی ڕاگەیاندووە کە هەر بەماچەکە وازت لێ دێنم دەستت بۆ نابەم.

شـوعلە: هەرچەند واتای (ڕووناکی) و (تیشک) دەدات، بەڵام لێرەدا مـەبەست لە (کـڵـپـە) و (گڕ)ی ئاگرە.

قەهر: ڕق هەڵگرتن، قین.

ئەخگەر: وشەیەکی (کوردی) و (فارسی)یشە، بەواتە: پشکۆ، پەنگو، پۆڵوو، سکڵ.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

چاوت – (ب، ح، ف، ق/٤، ش، مس): لێوت – بەکارهێنانی وشەی (لێوت) لێرەدا ئەوەندەی وشەی (چاوت) گونجاو نییە، چونکە وەک لە لێکدانەوەی سەرەوەدا دەرکەوت کە ناوەڕۆکی هەڵبەستەکە، خۆشەویستییەکی دۆستانە و خزمانە و برادەریانەیە و (کوردی) وەک لێکم دایەوە دەستنیشانی کردووە کە ماچکردن و خۆشەویستییەکەی ڕەگەزی (جینسی) نەبووە، کە ئاشکرای ماچی لێو بەکوڵ و دڵترەوەیە لە ماچی چاو، کە ئەوپەڕی (پاکی)یە و ڕێزگرتنی تیایە.

ویصالت کەم (ح، ق/٤): ویصالت بم.

بەشوعلەی (ن): بەناری – ئەگەرچی وشەی (ناری) لێرەدا لەگەڵ وشەی (قەهر)یدا جیناس ئارایییە، بەڵام هەرچی وەک (شوعلە)یە مەبەس لە (پەڕتەو = جیلوە)ی خوایە کە سۆفییە ڕاستەقینەکان (ئاواتەخواز) بوون، کە ئاوێتەی ئەو پەڕتەوە ببن و لەو خۆشەویستییە (مەعنەوی)یەدا نەک لە ئارەزووی ڕەگەزیدا، بتوێتەوە. (فەنا فی للا) بین.

میثلی (گ/٢، س، گ/٣): قەتلی.

میثلی (ح): غرقی – ئەمە زۆر هەڵەیە، چونکە (غەرق – نوقوم بوون)، بۆ ناو ئاوە نەک لە ناو پشکۆ و ئاگردا. پێم وایە ئەم (غرقی)یە (حیرقی) واتە سووتاندنی بێت.

لە جێگەی نیو باڵی دووەم، لە (ب)دا: (بەمیثلی پنجرە قوربان کە، تن سوراخی خنجرتم)ە بۆ ئەمەش بڕوانە (تاکی دوای) ئێرە. کە لەوێدا نیو باڵی دووەمە.

**٣– (لێکدانەوە):**

یەک لەحظە: کاتێکی زۆر کەم.

بەتەن: بەلەش، بەلەشم، بەجەستەم.

سۆراخ: کون، کون کون، دادڕ دادڕ.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

ئەم تاکە لە (ح)دا نییە.

لەحظە (ن): لمحە – واتە لەمحە و ئەمیش ئەگونجێ.

سستی کەم (ب): غافڵ بم. چونکە ئەم (غافڵ)ە لە تاکی پێنجەمدایە، بۆ ئێرە ناشێت.
غەمی عەشقت (گ/٢، س، گ/٣): خەمی – ئەمە لە دەسکارییەکانی (گیو)ە.
لە ژێر باری غەمی عەشقت (ب): لفکرە ماە روخسارت = واتە لە فیکری ماهی ڕوخسارت.
بەتەن (ن): بدن.
سۆراخی (گ/٢، س، گ/٣): سووراخی. دەسکاریی (گیو)ە.
لە جێگەی نیو باڵی دووەم لە (ب)دا نووسراوە: لە جنت بی نصیب و خونتی حورانی کوثر بم...
ئەمەش بەڕێنووسی کۆنە و (نیو باڵی)ی تاکی پێنجەمی ئەم پارچە هەڵبەستەیە. جگە لەوەی هەڵەیەکی (پەتی)یە لەوەدا و: کە (حۆری = پەری) هی (کەوثەر) نییە و هی بەهەشتەکەیە.

**٤– (لێکدانەوە):**

تەعریف: لێ دوانن، باسکردن، ناساندن، (وەصفی).
ئەگریجە: ئەو جووتە لیسپە قژەی (کچ و ژن)ە کە بەهەردوو لای لاجانگدا شۆڕ دەبنەوە، لای خواروویان ئەگەر قرتێنران لە (زولف) جیایان دەکاتەوە کە زولف لێی ناقرتێنرێت و بەدرێژیی خۆی دەمێنێتەوە.
کاکۆڵ: درێژکردنی قژی سەری کوڕ و پیاو، هەتا نزیکی هەردوو سەرشان کە لە پێشتردا بەدرێژی لێکم داوەتەوە، لەوانەیە کە (سالم) کاکۆڵی بووبێت و بەنزیکیشی دەزانم کە هەیبووبێ.
بەضەربی: بەلێدانی.
مەقتوول: کوژراو. بەوردکردنەوەی ئەم وشە (عارەبییە) لەوانەیە، ببڕێنەوە، سەر وشەی (کوشتن، کوژتن) بەگۆڕینی پیتی (ک) بەپیتی (ق) و بوونی پیتی (ت) لە (کوشتن) و (قەتل) و (مەقتوول)دا و... لەوانەیە ئەم وشە عەرەبییە بەبنچینەی (کوردی)یەوە بێت.

**(جیاوازیی سەرچاوە):**

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ب)دا نییە و لە (ح)دا سێیەمینە.
وەصفی (ف): مدح.
کاکۆڵ (ن، ح): گیسوت.
کەم (ح، ق/٤): بم.
ضەربەی (ح): ضرب – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
ضەربەی (ق/٤، گ/٢، س، گ/٣): ضربی.
ئەبرۆی تۆ ئەمن (گل/٣، ن، ش، ح، ق/٤، ئا): سر پنجەء اجل = واتە: (سەر پەنجەی ئەجەل) و من ئەم دەقەی ئەم سەرچاوەیانەم پەسەند نەکرد و (ئەبرۆی تۆ ئەمن)ەکەم بە(جێگری) هێشتووەتەوە.
ناگونجێ و، وشەی (ئەجەل)ەکەش پێویست نییە بۆ ئەم تاکە، چونکە (مەقتوول) واتە (کوژراوی)یە هاتنی (ئەجەل) ئەگرێتەوە.

**(هەڵسەنگاندن):**

لە لێکدانەوەی واتا و ناوەڕۆکی نیـو باڵی یەکـەمی ئەم تاکـە هەڵبـەسـتـەدا و لە ڕوانگەی (ئێستـەمانەوە) هەڵە و شێواویی تیا دەردەکەوێت. چونکە دەبینرێت (ئەگریجە) کە بۆ (مێیینە) و (کـاکـۆڵ) بۆ (نێـرینە)یـە، (کـوردی) هەردووکـیـانـی داونەتە پاڵ (سـالم) وەک (سـالم) هەم (ئەگریجـە) و هەم (کاکـۆڵ)یشی هەبووبێ و (سـالم) کـە (کاکـۆڵ)ی هەبووە نێرینـە بووە نەک (مێ) و (کوردی) ئەو شاعیرە  توانای نەبووە کە هەڵەی وەها زەق بکا و ئەم تاکە هەڵبەستەش ئەوەندە سەرچاوەی زۆری هەیە کە لە شێواوی بەدەر بێ.

کەواتە لە لێکدانەوەی ئاوا هەڵبەستێکدا پێویستە لە ڕوانگەی شێوەی دەربڕینی وێژەی کۆنەوە سەرنج بدرێتێ و شی بکرێتەوە. ئەو سـایە دەبێ بزانرێت؛ (ئەگریجـە) لەم نیو باڵییـەدا وەک (هێما – ڕەمز)ێک بەکارهاتووە، کە مەبەست لە: ڕوو (پێشەوە)یە، چونکە خودی (ئەگریجە) لە ڕووی کەسەکەوەیە، نەک وەک (کاکۆڵ) کە بە(دواوەی) کەسەکەوە بێ.

لە خۆشەویستیی دۆستانە و برایانەدا، یا لە شەیداییی عەشقی ڕەگەزی (جینسی)دا، وە یا لە سـۆزی سـۆفـیگەریشـدا هەر (بینینی ڕوو) و (بەرەو ڕوویی) ویسـتـراوتر و، پەسـەندترە پێک گەیشتن لە ڕووەوەیە... شاعیری مەزنمان ئەحمەد حەمدی بەگی صاحیبقران چەند جوانی فەرمووە:

عاشقی ئەگریجە، وەک؛ مەفتوونی کاکۆڵ، قەت نییە،

وەصڵی ئەم، پشتگوێ خراوە و، هەمدەمی لێوانە ئەو

کە بەندیواری بە(ئەگریجە)وەی بە(عەشق) و، کووکە لێ هەڵسان (مەفتوونی)ی بۆ (کاکۆڵ) دیاری کردووە، کە (ئەم) هەمدەمی لێوان و (ئەو)یانی بەپشتگوێ خراو ناوبردووە و ئەم تاکە هەڵبەستەی (حەمدی) وەک تاکی دووەمی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)ی بەستۆتەوە بەم تاکەی (کـوردی)یەوە. هەروەها (سـالم)یش، ئەم نیـو باڵیـیـەی یەکـەمی ئەم تـاکەی (کـوردی) ئەوەندە بەلاوە پەسند و پڕوچڕی زانیوە کە لە هەڵبەستێکی خۆیدا بەکاری هێناوە کە وتوویە:

بەمیقرضی ئەجەل، کۆتا بێ، میثلی پەرچەمت عومرم،

«لەسەر تەعریفی ئەگریجەت، ئەگەر بێم وەصفی (کاکۆڵ) کەم»

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی) درێژەدانە بەهەمان تاکی دووەمی ئەم هەڵبەستەی خـۆی کـە لەوێدا لە پەیکاری مـاچکردنی (چاو سـالم)دا بـووە کـە ئەویش هەر لە (ڕووەوە و بەڕووەوەیە نەک لە دووەوە).

کەواتە کوردی ڕاستی وتووە و هەڵە و شێواوی لە دەربڕینەکەیدا نییە. دوا نووسینم لەسەری ئەوەیە کە ئەم تاکە هەڵبەستەی (کوردی) وەک بەڵگەیەکی بەهێز و قەڵغانێکە بەرامبەر بەو نووسەرە تێ نەگەیشتووانەی کە (کوردی)یان بە(کاکۆڵدار)باز ناوبردووە.

**٥– (لێکدانەوە):**

یەک لەمحە: دەمێک، تاوێک، کاتێکی کەم.

غافڵ: بێ ئاگا.

شەوق: تیشک، ڕووناکیی، ئەم وشەیەش بنەچەکەی هەڵگەڕاوەی (تیشک)ە.

حەشر: ئەو ڕۆژەی ژیان کۆتاییی دێت و لە نوێوە خوا هەموو مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە و لە چاکە و خراپەیان دەتۆژێتەوە و هەرکەسە لە ژیاندا بەپێی چاکی و خراپی (سزای خراپی)ی بە(دۆزەخ) و (پاداشتی چاکە)ی بە(بەهەشت) واتە (جەننەت) دەداتەوە.

نەصیب: بەش.

کەوسەر (کەوثەر): ناوی ڕووبارێکە لە بەهەشتدا و لە پێشتردا بەدرێژی لێکم داوەتەوە. کە پێغەمبەر (د.خ) بەڕووباری خۆی دانا و فەرموویەتی لە ڕۆژی (قیامەت – حەشر)دا ئەوەندەی ئەستێرەی ئاسمان جامی لەسەرە، تاکو ئیمانداران لەو ڕۆژەدا لێی بخۆنەوە.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ب)دا نییە و لە (ح)دا لە ژێر سەروناوی (پێنج خشتەکی)دا ئەم تاکە و سێ تاکی تری ئەم هەڵبەستە نووسراون کە (عەبابس ئاغا) ناوێک کردوونیەتە (پێنج خشتەکی) و سێ تاکی تری ئەم هەڵبەستەی تیا نییە، کە لە کۆتاییی ئەم هەڵبەستەدا دەینووسم.

لەمحە (ن، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): لەحطە.

لە شەوقی (گ/٢، س، گ/٣): لە شوعلەی.

ڕووباری (ن، ع، ف، ش، نم/١، کم، ئا، گ/٢، س، گ/٣): هەم حەوضی – ئەمەش هەڵەیە، چونکە (کەوثەر) (حەوض) نییە بەشکو (ڕووبار)ە.

**(هەڵسەنگاندن):**

(کوردی) لەم تاکەدا ئەوپەڕی (خۆشەویستی) و هەمیشە (دڵ لەلایی)ی خۆی بەرامبەر بە(سالم) دەربڕیوە.

**٦– (لێکدانەوە):**

گەدایی: هەژاری، کەم دەستی و بەواتای (سواڵکەر)یش هاتووە.

کۆیی: بارەگای.

جانانە: وشەیەکی (لێکدراوە) کە لە سێ کەرتی (جان) بەواتە (گیان)، (ڕەوان = وە لە ئامێری کۆی (ان)ەوە و لە (ە)ی پاشگری پێناسەیی پێک هاتووە و کەواتە وشەیەکی کۆن و ڕەسەنی کوردییە و لە سەرێنی (پەهلەو)ێتیی زمانەکەشماندا بەکارهاتووە، بەواتە دولبەر، دڵخواە، دڵگر، یەکجار زۆر خۆشەویست، دڵخواز، ئەم (وشە لێکدراوە) لەوەوە پەیا بووە کە خۆشەویستەکە ئەوەندەی گیانی ئەو کەسە بووە کە دڵی تێی چووە و چوویشەتە دڵییەوە.

جانانە: لە کوردەواریی ئێستەماندا جگە لەو واتا ناوبراوانەیش مەبەست لە دڵخوازێکی: دڵی

دڵدار شکێن و فێڵبازە.

شاهی عالەمی: پادشای جیهانی و بە(شاهی عالەمێ)یش دەخوێندرێتەوە.

موخەییەر: هەڵبژێر، سەرپشک ،ئەوەی بەئارەزووی خۆی چیی بووێ، بەدەستی بهێنێ، (موخەییەر بم) = بەدەست خۆم بێ، سەرپشک بم.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

ئەم تاکە لە (ب، ح)دا نییە.

**(هەڵسەنگاندن):**

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا بیروڕایەکی سۆفییانەی دەربڕیوە کە (شانازییان بەهەژارییەوە کردووە): (الفقر فخری) واتە: (هەژاری مایەی شانازیمە).

لە لایەکی ترەوە خۆی بە(گەدا) سواڵکەر و چاو لە دەسی (سالم)ی ئامۆزای داناوە کە ئەو (گەداییە)ی خۆشی بەپاشایەتیی هەموو جیهان نەگۆڕیوەتەوە، کە ئەوەش دەربڕینی برایەتییەکەیەتی بۆ (سالم) نەک چاو لەو دەکا کە بۆ (تاران)ی ناردووە.

**٧- (لێکدانەوە):**

بلا یا بڵا: دەبا، با (با-ی هەوا-ی مەبەست نەبووە).

بۆتە: کەرەستەیەکی پۆلاییە، زەرنگەر، زێڕ و زیوی تێدا دەتوێنێتەوە و مەبەست لە (قالب)یشە. ئەگەر (پۆلا) نەبووبێ ئەوا لە (سواڵەت) بووە.

فیرقەت: دووری لە خۆشەویست، کە هەردوو هەڵبەستەکەی (سالم) و (کوردی)یش بریتین لە گرانییەکەی لەسەر دڵیان و دەربڕینی خۆشەویستییان بۆ یەکترییە.

خولاسە: پوختە، قاڵ (قاڵکراو).

بێ غەش: بێگەرد، پاک، گزی تیا نەکراو.

مەقبووڵ: پەسەند، یەگەن، وەرگیراو، ویستراو.

زەڕ: زێڕ، تەلا، ئاڵتوون.

**(جیاوازی لە سەرچاوەکاندا):**

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ب، ح)دا نییە و لە (ب)دا بەم جۆرەیە و بەڕێنووسی کۆنە:

«لە عەسق روی تـو وکو بلـبل غزلخوانم

گدای کوە توم کردم لسر صد شاە کشور بم»

ئەمیش دوا تاکی هەڵبەستی (٢٢- موتالای مەصرەعی)یە کە لەوێدا بەڕێنووسی نوێ و بە(شیکراوەیی) نووسراوە.

ئەرێ (ئا): ایا. واتە (ئەیا = ئەی)، هۆ هۆ.

بلا یا بڵا (گ/٢، س، گ/٣): بەلا.

کوردی (ئا): هیجری - ئەمیش بەناڕاست دەزانم، چونکە (کوردی) لە کاتی دانانی ئەم

هەڵبەستەدا لە (سولەیمانی)دا بووە و تەنیا ئەو هەڵبەستانەی کە لە دەرەوەی (کوردستان) دای ناون (نازناو)ی (هیجر)ی واتە (دوورکەوتە)ی تیا داناون.

یەکجار (ش، ف، ئا): امجار.

یەکجار (ن): إمجار.

یەکجار (کم): یەگجار – ئەمیش دەشێت چونکە لە ڕێنووسی جاراندا زۆر جار هەردوو پیتی (ک) و (گ)یان هەر بە(ک) نووسیوە. وەک نووسینی (فارسی).

**(کۆتایی):**

تا ئێرە، هەڵبەستەکەی (کوردی) بوو، لە وەڵامی (سالم)دا، ئیتر نۆرەی هەڵبەستەکەی (سالم)ە، کە لە (تاران)ەوە بۆ (کوردی)ی نووسیوە لە (سولەیمانی).

**نامە هەڵبەستراوەکەی (سالم)**

طەریقی عەشقت ئەر (ون) کەم، تەریقی دەشتی (مەحشەر) بم،
قیامەت، نامەوێ جەننەت، بەبێ تۆ، گەر (موخەییەر) بم.
هەناسەی سەردی پڕ سۆزم، بەیادت گەر لە دڵ ببڕێ،
لە سۆزی فیرقەتا، یارەب!! سەراپا: میثلی (ئەخگەر) بم.
کە (شەیتان)یش، ستێزم دا، خەیاڵی (دانە) قەت ناکەم،
لە تاو (دەرد و جەفا)، ئەم دەفعەیە، لەم داوە گەر بەربم.
بە(پایز) هات، شەوی هیجر و نەسیمی صوبحی وەصل، ئەنگووت،
بەرمەدە: ئەی (تەب)ی غەم، وا (بەیان)ە، با (سوبوک) سەر بم.

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

زۆر بەداخەوە، ئەو لاپەڕەیەی ئەم پارچە هەڵبەستەم لە سەرەتای ساڵە هەشتاکانی چەرخی بیستەمەوە لەسەر نووسیوەتەوە، ئەوەندە ڕەنگی نووسینەکەی (کە بەقۆپێ = کاغەزی کاربۆن نووسراوە) کاڵ بووەتەوە، هەرچیم کرد، ئەو (دوو) دوا تاکە هەڵبەستەم بۆ نەخوێندرانەوە کە ئەوەتا شوێنەکانیانم بەو چوار ڕیزە خاڵە هێشتوونەتەوە.

لەملا و ئەولایش دیوانێکی (سالم)م دەست نەکەوت، هەتا ئەو دوو تاکەی لەبەر بنووسمەوە. خۆیشم تا ئەم دواییەی سەرەتای ئەم چەرخی بیست و یەکەمە هەموو دیوانەکانی (سالم)م هەبوون، بەڵام لە برساندا لەگەڵ دوا پاشماوەی (پەڕاویخانەکەمدا) فرۆشتمن بەبەڕێز (خاتوونی شکۆمەند – هێرۆ خانی، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد).

**پێنج خشتەکیی هەڵبەستەکەی (کوردی)**

له بابەتی (جیاوازیی سەرچاوەکان)ی تاکی پێنجەمی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)دا نووسیومە کە (عەبباس ئاغا) ناوێک سێ تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی)ی کردووەتە (پێنج خشتەکی) کە لە کەشکۆڵی (ح) وەرم گرتووە کە لە ساڵانی ١٣١٢ – ١٣٣٩ک، بەرامبەر بە ١٨٩٤ – ١٩٢٠ز.دا نووسراوەتەوە، ئەشێ ئەو شاعیرەمان لە١٩٢٠/ز. و پێشتریدا ژیابێ و لە کەشکۆڵەکەدا تەنیا تاکەکانی (١ و ٢ و ٤ و ٥)م بۆ خوێندرایەوە و بەڵێنم دابوو کە ئەو پێنج خشتەکییە پێشکەش بکەم، ئەگەرچی پێنج خشتەکییەکەش لاوازە و لەسەر نوسخەی زۆر شێواوی هەڵبەستەکەی (کوردی)یە و، پڕ لە هەڵە و ناڕێکییە و دەسنووسە ناخۆشەکەی و زەردبوویی ڕەنگی پەڕەی کەشکۆڵەکە و پەڕپووت بوونی، ئەوەتا زۆر شوێنی ئەو چوار تاکە بەپێنج خشتەکی کراوەیشم بۆ نەخوێندرایەوە، بەڵام لەبەر ئەم هۆیانەی دوایی لێرەدا جێگیرم کرد کە:

١– ئەم پێنج خشتەکییە، هێشتە ژێر چاپ نەکەوتووە.

٢– هۆنەرەکەی نەبیستراوە کە کێیە و بەرهەمی تر کامەیە و چ کەس و (نازناوی) چی بووە.

٣– وەک ئاگەدارییەک بۆ بەدواداچوون و بڵاوکردنەوەی ئەم پێنج خشتەکییە و هەڵبەستی تری پێناسەکردنی خۆی لێرەدا نووسیمەوە.

٤– ئاشکرایە، زۆر لە هۆنەرانمان کارتێکراوی (کوردی)ن لە دەستەی قوتابخانە تایبەتییەکەی ئەون بەهەڵبەستەکانیاندا، ئەم (عەبباس ئاغا)یەش یەکێک بووە لەوان، ئەمەی دوایی ئەوەندەی پێنج خشتەکییەکەیە کە بۆم خوێندراوەتەوە.

**پێنج خشتەکییەکە:**

ئەگەر سوڵتانی عالەم ئەمیری کوللی کیشوەر بم،
هومایی ڕیفعەتی (ئەوج) و بەهایی تەخت و ئەفسەر بم
......... داری جەننەت بم، ئەمینی ڕۆژی مەحشەر بم
«ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم، غەریبی کۆهی دولبەر بم»
ئەگەر ساتێ لە یادم چی هیلاکی زەخمی خەنجەر بم

لە حەسرەت چاوی مەخموورت... مەهجورم... بە دل غم
کوار... ئەبارێنێ لە دیدەم ئەشکی خوون نم نم
... من چی کەیخوسرەو نۆشی جامی جەم
بەغەیرەز بۆسەیی لێوت ئەگەر قەصدی ویصالت بم
بەشوعلەی قەهری تۆ یارەب سەراپا غەرقی ئەخگەر بم

خەیاڵم... شوعلەیی ڕووت لەگەڵ... جووت بم
... هەر بەچاوی دڵ... خاڵ و خەتی ڕووت بم
هەزاران مولکی دڵ قوربان... مووت بم

لەسەر تەعریفی ئەگریجەت، ئەگەر بێم وەصفی گێسووت بم
بەغەیرەز تیغی سەر پەنجەی ئەجەل، مەقتوولی بێ سەر بم
دڵ و دینت لە دەست کـردم بم بە ای چاوی مەخموورت
... کـردم... کـەمەندی زولفی تاتارت
بەخاڵانت قەسەم قوربان، خەیاڵم بووەتە دیدارت
ئەگەر یەک لەمحە غافڵ بم لە شەوقی ماهی ڕوخسارت
لە حەشرا بێ نەصیبی جەننەت و هەم ئاوی کەوسەر بم
.................. هتد........................

منیش بەوەندە کۆتایی بەم پێنج خشتەکییە دەهێنم کە:
نووسەری کەشکۆڵەکەش، کۆلکە خوێندەوارێکی سەرەتایی بووە و لە بەراوردکردنی تاکەکانی ئێرەیدا لەگەڵ (ئەوی لە پێشەوە نووسیومن) جیاوازی و لاوازیی زۆر سەیر دەردەکەون. کە من لە شوێنی خۆیاندا (لە پێشەوە) لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی تەسەلم لەسەر کـردوون و بەپێویستم نەزانی لەمە پتر لەسەر تاکە هەڵبەستەکانی (کوردی) بنووسم کە لەم پێنج خشتەکییەدان.

## نامۆیی کردنی (سالم) بۆ (کوردی)

لە بواری بابەتی نامە بەهەڵبەست بۆ یەکتر ناردنی شاعیرانماندا (کوردی) و (سالم) چەندین نامەیان بەهۆنراوەیی بۆ یەکتری ناردووە و ئەوی لە پێشەوە ڕام گەیاند دوو نامەی هەڵبەست گۆڕینەوەیان بوو. ناوەڕۆکی ئەو نامە هەڵبەستییانەش بابەتی ئەوەندە مێژوویی گرنگیان تیا بووە، بەپێی ئاگەداریی زۆرم لەسەریان، پێم وایە هەڵدەگرێ نامەی (ماجستێرێک) تەرخانی ئەوانە بکرێت.
نووسەری (عن) دوا بەدوای نووسینی دوو نامەکەی (سالم) و (کوردی) لە کەشکۆڵەکەیدا ئەم پەراوێزە فارسییەی دوایی نووسیوە:
(کردی، زمانی بە(شیوکل) بسر برده، (سالم) آرزوی دیدن او کرده و بقصیدهء زیر اشتیاقرا برای کردی بیان و خود سفر بسوی او وقصیده را تسلیم کرده.
شایع است کردی بەیک قصدهء (ردیف) غرّاً جوابش داده، متأسفانه آن جوابرا حاصل نکرده أم – علی –).
واتە:
(کوردی – سەردەمێکی لە (شیوەکەڵ) بەسەر بردووە و ئارەزوومەندی دیتنی (کوردی) بووە، وە بەم چامەیەی ئاینده بیرکردن و ئارەزووی خۆی بۆ (کوردی) تیا دەربڕیوە و خۆی بۆ نەگێراوە و چوویشەتە لای و بەدەستی چامە هەڵبەستەکەی پێشکەش بەو کردووە.
دەنگ وا بڵاوە کە (کوردی)یش بەچامەیەکی باڵای لە هاوچەشنی کێش و پاشبەندی ئەوەکەی (سالم)دا وەڵامی داوەتەوە کە جێگەی داخە ئەوەکەی (کوردی)م بەدەست نەهێناوە – عەلی –).

**جارێ ئەمەیش چامەکەی (سالم)ە بۆ (کوردی):**

**(سالم) فەرموویەتی:**

لە کــونجی مــیــحنەتا هەردەم، خــەیاڵی وەصلی دولبــەرکــەم،
وجــوودم، وا بەجــارێ دێتــە جــونبــوش، وەخــتــە پەڕ دەرکــەم.
لە (ئەووەڵ) حــەرفــیـا، وەک (دڵ)، لە (کــاغــەز) بەردەبێ (ئاگــر)،
ئەگــەر؛ شــەرحی شــەرارەی نــاری (هیــجریم)، ئەبتی دەفتــەرکەم.
تەڵاشــی طەییی ڕاهــی کــەعــبــەیی یارە کــە مــەقــصــوودم،
منــی بێ دەست و پــا، لازم؛ کــە (پا) بۆ ئەم ڕەهەم، (ســەر) کــەم.
لە ئەفــلاکی خــەیاڵا، (کــەوکــەب)ی ڕووی یارە تا (قــوطب)م،
بە(ظولمات)ی شــەوی هیــجــرا، ڕەهــی کــۆی ئەو ئەبێ دەرکــەم.
بەڵێ، (کــوردی) کــەمــەندکێــشم دەکــا بۆ (شــیــوەکــەڵ) ئیــتــر،
چ مــیننەت، بۆ پەیامــێکی؛ ئەگــەر مــەشــقی (کــەبووتەر) کــەم.
ســـەرەفگەندەی حـــوضـــووری ســـەر بڵندانی قـــیـــامـــەت بم،
(نەردێنی فـــــیـــــراقـــــا)، نەقـــــدی جـــــانم، تا نەدۆڕێنم
بەخــاڵی مــوهرەیی وەصلت دەبێ چۆن کــەســبی شــەشــدەر کــەم.
قـــوبــوولی نرخی بۆســـەی لەعلی ڕوممــانی لەبت چۆن کـــەم؟؟
لە ئەشکم پڕ بەدامــانت مــەگــەر، یاقـــووتی ئەحـــمـــەر کـــەم.
لەســەر ئەم مــەزهەبەم (سالم)، بەمــەحضی ڕووبەڕووی مــەطلەب،
وەکو (هیندوویی کەسوون)ی هەر سەحەر تەعظیمی (ئازەر) کەم.

**(وەڵامەکەی کوردی):**

بەپێی ناوەڕۆکی ئەم هەڵبەستەی (سالم) ئەو کاتەی کە (سالم) زۆر بیری (کوردی) و ئارەزووی دیدەنیی کردووە، دیارە باری قەڵەمڕەویی بابان لە ئاڵۆزی پشێوی و ئاخۆران و بخۆراندا بووە و هاتوچۆی ڕێگەوبانەکانیش مەترسیدار بووە.

بەڵام خۆشەویستیی نێوان جووتە ئامۆزا (کوردی) و (سالم) لە پلەیەکدا بووە کە (سالم) پێی ناوە بەجەرگی خۆیدا و، وەک لەم هەڵبەستەیدا ڕای گەیاندووە و خۆی داوەتە دەست (قەدەر) و لە (سولەیمانی)یەوە گەیشتووەتە (شیوەکەڵ) و دوای بەیەکتر شادبوون ،ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیشی پێشکەش بە(کوردی) کردووە.

ئاشکرایشە وەنەبێ خۆشەویستیی (کوردی)یش بەرامبەر بە(سالم) لە خۆشەویستیی (سالم) کەمتر بووبێ و بەو خۆ هاویشتنە ناو مەترسییەوەی (سالم)ی زانیوە و (کوردی)یش بەپارچە هەڵبەستێکی خۆی لەسەر هەمان کێش و پاشبەندی ئەم هەڵبەستەی (سالم) هەست و پێزانین و خۆشەویستی و شادمانیی خۆی بەو دیدارە تیا دەربڕیوە.

هەروەک نووسەری کەشکۆڵی (عن) لە سەرەتای ئەم هەڵبەستەی (سالم)ەوە ڕای گەیاندووە کە وەڵامەکەی (کوردی)ی دەست نەکەوتووە، بەداخەوە منیش دەستم نەکەوتووە و هەر بۆیەش ئەم هەڵبەستەی (سالم)م لێرەدا نووسی، تا وەک (دانەڕۆکە)یەک سۆراخی وەڵامەکەی (کوردی)ی پێ بکرێت.

**(سەرچاوە):**

ئەم هەڵبەستەی (سالم) لە: (س/٢، عن، عق، نم، س/١)دا جگە لە دیوانە چاپکراوەکانی (کم، گیو، ئێران)دایە.

**(جیاوازیی سەرچاوەکان):**

ئەم هەڵبەستەی (سالم) لە سەرچاوەکاندا ئەم جیاوازییانەم پێ زانیون:

هیجری (نم/١، س/١): هیجرت.

هیجری (س/٢): هیجرەت.

ئەدۆڕێنم (نم/١، س/١): ئەدۆرێنم.

کەسوون (نم/١، س/١، س/٢): گیسو. چونکە نووسەرەکانیان نەیانزانیوە (کەسوون) چییە.

**(لێکدانەوە):**

(کەسوون) ناوی زانایەکی زەردەشتیی هیندی بووە کە نووسەرە عەرەبەکان بە(ئازەری) ناویان بردووە و (ئازەری)شیان بە(مەجووسی) واتە ئاگرپەرست لێک داوەتەوە و مەبەستیان لە کورد و فارس و هیندی و ئەفغانی و ئەوانەیە کە لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون.

ئەو زانا هیندییە، بەلایەوە وابووە، کە: (ئەصلی بوونەوەری)یەکان لە سێ توخم (خاک، ئاو، ئاگر) پێک هاتوون، ئاگریش بەواتا (ئازەر)ە جگە لە (واتا) وە یا ناوەکانی تری وەک: ئاور، ئایر، ئاهیر، ئاتەر، ئاتێرا، ئاتییر، ئاهر و... هتد چونکە، ئاگری لە کوژانەوە نەهاتوو، یەکێک بووە لە (موعجیزە)کانی زەردەشت پێغەمبەر نەک (زەردەشتی) ئاگریان پەرستبێ بەشکو بەپیرۆزیان زانیوە.

ئەم پارچە هەڵبەستەی (سالم) ئەوەندە ڕێکوپێک و پڕ لە واتای قووڵ و ڕۆشنبیرییانە و هەستی ناسکە، هەتا زۆرتر سەرنجی بدرێ واتای سەرسامکارتری لێ هەڵدەهێنجرێت و چونکە پەڕاوییەکەی لەسەر ئەو نییە و لەسەر (کوردی)یە بۆیە بەم چەند لێکدانەوە کەمەی دوایی دەستی لێ هەڵدەگرم.

(سالم) لە دوا تاکی هەڵبەستەکەیدا (ئازەر)ی بەشکۆمەند و پیرۆز و شایانی (تەعظیم) ناو بردووە کە (سووری)ی ئاگرەکەی بەستووە بە(سووری)ی – لەعلی لەبی ڕوممانی)ی (کوردی) و بەیاقووتی سووری فرمێسکی خۆیەوە کە (کوردی) ماچ دەکات بە(ئاگر)ی سووری پڕ جۆشی ئارەزوومەندی تاکی یەکەمیشەوە گرێی داوە.

لە لێکۆڵینەوەمدا لەسەر (سالم) بۆم ڕوون بووەتەوە کە (سالم) زانایەکی کەم هاوتای سەرێنی

خـۆی بووه له (گەردووننـاس – فەلەک)دا وەک لە تـاکی چوارەمـیدا ئەم ڕاسـتـیـیـەنومـایانه و، خۆیشـم پەڕاوییـەکی گـەورەی دانراو، وه دەسنووسـی (سـالم – عـەبدولڕەحـمـان بێگ)م دیوه کـه مــێــژووی نووســـینـەکـــەیشـی ڕێکەوتـی مـــاوەی ژیانـی ســـالم دەکـــات له بارەی پـزیشـکـی و دەرمـانسـازی و بەسـتنـی نەخـۆشـیـیـەکـانی مـرۆڤـەوه بەباری گـەردوون و سـوورخـواردنی ئەستێرەکانه و بە(خاک) و (ئاو) و (ئاگر)ەکەی (کەسوونی)ی زانای هیندیی زەردەشتییەوه.

لە تاکی (پێنجەم)یشیدا مەبەستی له (کەبووتەر) بەواتا (کۆتر) و جۆری (پۆپنەدار)ەکانیانه که بەعەرەبی (حمام زاجل)یان پێ دەڵێن.

ئەمـیش جـۆره مـەلێکی یەکجـار هەسـتیاره و شـوێنی سـەرەتاییی ژیانی خـۆی لێ تێک ناچێ و بیـبـەنه هەر کـوێیـەکی جـیـهـان، هەرکـه بەردرا زۆر بەخـێـرایی دەگـەڕێتـەوه ئەو شـوێنه سـەرەتاییەی. لەبەر ئەوه (فەرمانڕەواکان)ی زوو، له جێگەی (ناردنی پۆسـتە) و (تەلەفۆن) و برووسکه و جۆره زۆرەکانی دیکەی هۆی بەیەکگەیشتن، ئەوسا، ئەو جۆره کۆتره بەکارهێنراوه بۆ گـەیاندنی (نامـە)ی گرنگ و پاشکەوتن هەڵنەگر، کـه نامـەکەیان له مـشـەممادا بـەبن باڵی کـۆترەکـەوه چەسپ کـرووه بەریانداوه و بـارتەقـای خـێـراییی (فـڕۆکـە)ی ئێـسـتـا نامـەکـەی گەیاندووه.

(سالم)یش خۆی چواندووه بەو کۆتره و هەڵبەستەکەی خۆی گەیاندووته کوردی.

(سالم) ئەوەنده (کوردی)ی خۆش ویستووه له دڵەڕاوکێی دووریی دابوو وه، له تاکی سێیەمیدا ڕای گەیاندووه لەباتی ئەوەی بە(پێ) بچێته لای (کوردی) بە(سەر سەر) دەچێ بۆ لای و (پێ)ی خۆی دەکاته سەر.

٢٥

## عەزیزم نووری عەینەینم

١- عـــەزیزم نـووری عـــەینـەینـم، غـــەریبـم
صـــەبووری بەخــشی جــانی ناشــەکــیــبم

٢- لـە کـــــووچـەی شـــــاری تـارانـا بـەبـێ نـاز
لـە هـەر بـاب و لـە ئـەربابـێ ســـــەلیــــبم

٣- وەرە ڕەحـــمـێ بە حـــاڵـم کـــە بەقـــوربـان
لە یـار دوور و لە مـــەسکەن بـێ نەصــیــبم

٤- دەسـا هیـمـمـەت عـیـلاجـێکی خـەڵاسی،
بـەمـــەرگی تۆ بـەمـــەرگ لـە دوای طەبیـــبم

٥- ڕەهەندەی دەسـتـی کـەس نیم خـۆت دەزانی
فــیــراری جـــەوری ئـەغــیـــار و ڕەقـــیــبم

٦- عـەجـەب مـەگـرە نە هەر ڕۆ ڕۆی عـەجـەممە
پـەشـــێـــوی ظـولـی ڕۆمی نـانـەجــیـــبم

٧- ئەگـەرچی کەسـبی عیلمـیـشم هەمـوو کرد
لـە لوطـفت چاوەڕێی فــــەتحـــولقــــەریبم

٨- دووشـــەش بوو داوی نـەگـبـەت هـەر لـە ڕێدا
لە بـەخــتی شـــەشــدەر و یاری عــەقــیــبم

٩- ئـومــــــێـــــدی زیـنـدەگـــــیـم نـاوە بـەلاوە
کـــە قـــاتـیل بوو بـەجــــەڕڕاح و طـەبیـــبم

١٠- عەجـوولی وەحشـەتی ئەو وەختە خۆم بووم
کـــــە دیدەت بوو بـەئوســــتـــاد و ئـەدیبم

١١- ئـەمـێـستـاکـەش دەڵێی یابـووی بەرەڵڵام،
لـە پاش ئێـــوە، ئەبێ ئـیـــتـــر بە چی بم؟؟

١٢- خــودا ئەم مــاجــەرايەت چۆن قــوبوولّە
لە زێد ناكــام و نـاشــادی حــەبیــبم
١٣- ئەمەی دەیڵێم ئەگەر ئیغراقە (هیجری)
هیـلاكی دۆســتی مــەیتــەن قــرمــزی بم

................................................................

١- عەزیز: خۆشەویست، دۆست، یار.
نوور: ڕووناكی.
عەینەین: هەردوو چاو.
غەریب: بیانی، دوورە دیار.
صەبووری بەخش: پشوودەر، ئارامدەر.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٧، ف، ر، جلی، مر، نم، با)یە لەگەڵ (كم، گ/٢، س، گ/٣)دا. لەمانەش (لم)م كردە بنكەی لێدوانن.
لە جێی سەروناوی ئەم هەڵبەستە لە (عن)دا بە(فارسی)ی نووسراوە (بعد از سقوط ببە و هجرت كردی رحمە الله بە طهران و شعور كردنش بەغربت این قصیدەء إشتیاق نە را برای یكی انە دوستانش از عائلە ببە بە سلیمانیە فرستادە - علی -) واتە: (لە دوای ڕووخاندنی فەرمانڕەواییی بابان و كۆچكردنی «كوردی» - خوالێخۆشبوو - بۆ تاران و هەست بەنامۆیی كردنی، ئەم چامە ئارەزوو نامەیەی بۆ یەكێ لە دۆستانی خۆی لە خانەوادەی بابان بۆ سلێمانی هەناردووە - عەلی -) كەواتە (كوردی) ئەم چامەیەی لە ساڵی ١٨٥١ز. هۆنیوەتەوە.
غەریبم (ف، جلی، نم/١، كم، گ/٢، س، گ/٣): حەبیبم. بڕوانە تاكی دوازدەمین كە حەبیبم لەوێدایە.
جانی ناشەكیبم (ف): جان ناشكیبم.
جانی ناشەكیبم (كم، نم/١): جاناە شكیبم.
جانی ناشەكیبم (گ/٢، س، گ/٣): جانانی شەكیبم.
٢- ئەم تاكە هەر لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دایە و هێشتە چاپیش نەكراوە.
باب: دەرگا. مەبەستی لە خانەی دۆستانە.
ئەرباب: دۆست، هاوەڵ.
سەلیب: لێ بوو، لێ سەندراو، مەبەستی لە بێ بەشییە.
شاری تارانا بەبێ ناز (مر): شاری تاران شاز و بێ ناز.
٣- ڕەحم: بەزەیی.
ئەم تاكە تەنیا لە: (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا سێیەمینە و لەوانی تردا دووەمینە.
بەقوربان (ف، گ/٢، س، گ/٣، نم/١، كم): عەزیزم.

دوور و (ف، گ/٢، س، گ/٣، نم/١، کم): زویر و.

دوور و (نم/١): زۆر برو.

دوور و (کم): زویر و.

٤- هیممەت: تێکۆشان، خەبات، بایەخ پێدان.

خەلاسی: ڕسگاری.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٧، مر)دا چواردەمین تاکە، جگە لە (گل/١) کە لەوێدا سێیەمین تاکە و لە سەرچاوەکانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە.

بەمەرگ لە دوای (مر): کە موحتاجی.

٥- ڕەهەندە: دەربەدەر، وێڵ.

فیرار: هەڵاتوو، ڕاکردوو، ئەم وشەی (فیرار)ە لە هەموو سەرچاوەکاندایە و جیاوازی لەسەر نییە. بەمەدا ئەشێ دوای ڕووخانی بابان کوردی هەڵاتبێ، چونکە ئەمە وتەی دووەمی خودی (کوردی) خۆیەتی، دیارە مەترسییەکی هەبووە.

ئەغیار: بێگانان، بیانانن.

دەزانی (نم/١، کم): دەزانی.

ئەم تاکە لە (ف، جلی، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: سێیەمینە و لە (گل/١)دا چوارەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا پێنجەمین تاکی ئەم چامەیەیە.

٦- عەجەب: سەرسامی، حەپەسان، وڕی.

عەجەم: مەبەست لە فەرمانڕەوایی قاجارەکانی ئێران بووە.

ظولم: جەور، ستەم.

ڕۆم: مەبەست لە فەرمانڕەوایی عوسمانی بووە.

نانەجیب: ناپەسەند، ناڕەسەن. هەرچیوپەرچی.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا شەشەمینە وە لە (گل/١)دا پێنجەمینە وە لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

نە هەر (مر): کە هەر.

ڕۆ ڕۆی (مر): ڕۆم و.

ظولمی (مر): دەستی.

٧- کەسبی عیلم: مەبەستی خوێندنی ئاینی و (بوونە مەلا)یەتییە.

فەتحولقەریب: بەواتە سەرکەوتنی نزیک و ئەمە ناوی پەڕاوییەکی ئاینی بەناوبانگ و سەرەتاییە لە (فیقهی شافیعی)دا. بەڵام (کوردی) مەبەستێکی تریشی هەیە، ئەویش هاندانە بۆ شۆڕش و سەرکەوتنێکی نزیک و گەڕانەوەی فەرمانڕەوایی کوردانەی بابان کە دەمێک نەبووە ڕووخاوە. کە لێرەدا (جیناس) و جوانییە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا حەوتەمینە و لە (گل/١)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە وە ئەشێ خواستی ئەو پەڕاوییەشی کردبێ.

لە لوطفت چاوەڕێی (گل/١): کەچی هێشتا لەدووی.

٨- دووشەش: لە یاری (تاوڵە) و (دۆمینە)دا ناوی زار، وە یا شوێنێکی پوولەکانە، کە دەسگیربوون (دووشەش) یا زۆر چاک وە یا زۆر خراپە لەو یارییانەدا.

شەشدەر: بارێکی ئەو یارییانەیە کە یارییەکە ڕێک هەموو سەرێکی یاریکەرەکەی بەرامبەری دەگرێ و دەردەستی دەکات.

یار: دۆست، خۆشەویست. وە (یاری) مەبەست لەو یارییەیە کە دووشەش و شەشدەرەکەی تیا هاتووە کە ئەمەش (جیناس) و جوانییە لە وێژەی دێریندا.

عەقیب: ئەوی لە دواییدا دێت.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا هەشتەمینە و لە (گل/١)یشدا هەر هەشتەمینە، چونکە لەگەڵ تاکی دواییدا پاش و پێشن و لە (ن)دا پێنجەمینە، چونکە ئەمیش لەگەڵ تاکی دواییدا پاش و پێش و لەوانی تردا چوارەمینە.

بوو (گ/٢، س، گ/٣): بۆ.

شەشدەر و (ف): ششدر.

شەشدەر و (نم/١): ششدر و.

عەقیبم (س): عنقیبم.

٩- ئومێد: هیوا، ئاوات.

زیندەگی: ژیان.

قاتیل: بکوژ، خوینکار.

جەڕڕاح: پزیشکی نەشتەرگەر.

طەبیب: پزیشک - هەرچەندە لە تاکی چوارەمیشدا دووبارەیە، بەڵام بەپێی وێژەی دێرین لە هەڵبەستی درێژ (چامە)دا ئەم دووبارەیە ڕێگەی دراوە.

ئەم تاکە لە (گل/١، ف)دا لەگەڵ ئەوی پێشوو پاش و پێشن و لە (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا نۆیەمینە لە (گل/١)دا حەوتەمینە و لە (ف)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە.

١٠- عەجوول: بزێو، زۆز.

وەحشەتی: کێوییەتی.

ئوستاد: مامۆستا.

ئەدیب: مەبەست لە پەروەردیارە، وێژەوان.

ئەم تاکە لە: (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا دەیەمینە و لە (گل/١)دا نۆیەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.

ئەو (گ/٢، س، گ/٣): ئەم – ئەمەش هەڵەیە.

نیو باڵی یەکەم لە (جل)دا بەم جۆرەیە: (عجولو وێڵ و وەحشی عالەمی بووم).

١١- یابوو: بارگیر، وڵاخی بەرزی نارەسەن کە دەخرێتە ژێر بارەوە (لە ئەسپ و ماین)دا.

بەرەڵڵا: کاتێ کە وڵاخێک (کەر، ئێستر، بارگیر) لەبەر پیری یا لەبەر ناتەواوی ئەندامی وە لە لاوازیدا پەکی دەکەوێ و هیوای کەڵک لێ وەرگرتنی لێ ناکرێ ئەو سایە بەرەڵڵا دەکرێ، بەڵام لەم دواییەدا لە ڕۆژئاوا ئەم وڵاخانە دەکوژن یەکەم بۆ لە ئازار ڕسگارکردنیان و دووەم لەبەر خواردنەکەیان لە ڕووی ئابوورییەوە، یا لە مەترسی لێ کردنیان نەوەک پیسی و نەخۆشییان لێ بکەوێتەوە.

ئێوە: مەبەستی لە (بابان)یەکانە و دیارە ئەو دۆستەی نامەکەی بۆ ناردووە لە (بابانەکان) بووە. ئەم تاکە لە: (عن، گل/٦، گل/٧، مر)دا یانزەمینە و لە (گل/١)دا دەیەمینە و لەوانی تردا نییە، چونکە هێشتە چاپ نەکراوە.

ئەمێستاکەش (گل/١، گل/٦، گل/٧): ئەوێستاکە.

یابووی (گل/١، مر): یەختەی. بەواتای وڵاخی بەرزەی خەساو.

لە پاش (عن): لدوی.

**هەستی کوردی:**

لەم تاکەیدا (کوردی) وەهای ڕاگەیاندووە کە ژیانی (بەند) بووە، بەبوونی (پاشایەتیی بابان)ەوە و دوای (بابان) بەبێ کەڵکی ماوە.

١٢- ماجەرا: مەبەستی لە ڕووداو و کارەساتی ڕووخانی بابان و دەربەدەرییەکەی خۆی.

زێد: نیشتمان.

حەبیب: دڵخواز، خۆشەویست، دۆست.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٧، مر)دا دوانزەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

١٣- ئیغراق: زۆر تێ ڕۆچوون، هەڵنانی لە ڕادەبەدەر (موبالەغە).

مەیتەن: پۆشاکێکی سەرەوەی قۆڵ و ناودارە، وەک لبادەیەکی کورت ژن و پیاوی کورد بەکاریان هێناوە.

قرمزی: سوور.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٧، مر)دا سیانزەمینە و لە (گل/١، گل/٦)دا دوانزەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە و لە هەموانیشدا دوا تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

ئەمەی (گل/١، گل/٦، گل/٧، عن، ف): امی. ئەمەش ڕێنووسی کۆن و مەبەست (ئەمەی)یە.

هیجری (جل): کردی.

(هیجری) نازناوی (کوردی)یە و، وا دەنگ بڵاوە کە (کوردی) ئەو هەڵبەستانەی لە دەرەوەی سولەیمانی و لە بیاباندا وتبێ بەنازناوی (هیجری) وتوونی و ئەم هەڵبەستەش بەڵگەی ئەوەیە.

**هەڵسەنگاندن:**

بەڕاستی لەم پارچە هەڵبەستەیدا سۆزی گەرموگوڕی نیشتمانی و شۆڕشگێڕانەی خەباتکارێکی دەربەدەری پاک ڕەچاو دەکرێت.

وەک لە هەڵبەستی تردا لە بەرگی (عوسمان بەگی بابان) دواوە. لێرەدا ئەم (مەیتەن قرمزی)یەیە دوور نییە ئەوەی (کوردی) ئەم نامە هەڵبەستەی بۆ داناوە دەبێ عوسمان بەگ بووبێ.

## عـەزیزم باعیثی عـەیش و نیشـاطم

١- عـــەزیزم باعـــیـــثی عـــەیش و نیـــشـــاطم!!
گـــوڵم، ســـەر چەپکەکـــەی باغی حـــەیاتم.
٢- دەزانـی خــــــۆ ئـەمن ســــــەودازەدەی تـۆم،
نەچیـــــری ئـاهوویی چاوی ســــــیـــــاتم.
٣- هەمـــیـــشـــە من لـە کـونجی دەرد و غـــەمـدا،
ئەسـیـــری شـــەرط و مـەحـــبـــووسی وەفـاتم.
٤- بەســـاڵی جـــارێ قـوربانی دەکـەن (حـــاج)،
ئـەمـن هـەردەم بـەقـــــــــوربانـی نـیـگـاتم.
٥- بـەجـــارووبی مـــوژەی چاوم هەمـــیـــشـــە،
خـــەریکی مـــشـــتـــومـــاڵی خـــاکی ڕاتم.
٦- لە زەوق و شـــەوقی عـــالـەم بوومـــە فـــارغ،
ئـەوەنـد هـەمـــــڕازی هیـــــجــــران و بەلاتم.
٧- لـەبـەرچـی وا لـە مـن ئـازوردە بـووی تـۆ؟
نیـــیـــە ڕەحـــمـت بەحـــاڵم؛ لەب نەباتم.
٨- ئەگـەر کـردوومـە تەقـصـیـر و گـوناهێ،
هـەزاران تـۆبە بـێ تـا ڕۆی مــــــەمـــــاتم.
٩- لە من عـــاجـــز مـــەبە ئیـــتـــر بەقـــوربان!!
خـــۆشـم، ئەر بمکوژی وەر کـــەی خـــەلاتم.
١٠- بەمـــەرگی تۆ وەها خـــەســـتـــە و زەبوونم،
نـەمـــــاوە زەرڕەیێ صـــــەبـر و ثـوباتم.
١١- ئەگەر، دڵ بوو، ئەوا چوو ئێستە (هیـجری)،
بـەڕۆحـم چاوەڕێی یـەک ئیلتـــیـــفـــاتم.

..................................................................

١- عەیش: ژیان.

نیشاط: چالاکی، چوستی، گورجی.

حەیات: ژین.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، ر، گ/٣)یە و (گ/٣)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەکەی.

گوڵم (ر): کلم.

سەر چەپکەکەی باغی (عن): سەرمایەیی ژین و.

حەیاتم (ر): مەماتم - ئەمە نابێت و دووبارەیشە بڕوانە تاکی هەشتەم.

٢- سەودازەدە: عاشق، دڵدار، شیفتە، دڵبەند، پێکراوی عەشق.

نەچیر: نێچیر، ڕاوکراوە.

سیا: ڕەش.

٣- شەرط: مەرج.

مەحبووس: بەندی، گرتوو، زیندانی.

وەفا: پێزانین، لەبەرچاوبوویی، ئەمەکداری.

کونجی (ر): کونج.

ئەسیری (ر): اسری.

٤- حاج: حاجییان (حاجی).

نیگاتم (ر، گ/٣): وەفاتم - ئەمەش نابێ و دووبارەشە - بڕوانە تاکی سێیەم.

٥- جارووب: گەسک، سپرگە.

مشتومالّ: پاککردنەوە، کە خەنجەرێک ژەنگ بگرێ و جەوهەرەکەی بەڵخاوی و تەڵخ بێ، بە زاخ و ترشی و بەشال دواتر بەپارچە دارێکی تورتی لووس دەیسوونەوە تاکو ژەنگەکەی پاک دەبێتەوە و تیشک پەیا دەکا و جەوهەرەکەی دەردەکەوێتەوە. بەوە دەوترێ مشتومالّ و (کوردی)ش ئەئاوا بەبرژانگ خاکی ڕێگوزاری خۆشەویستەکەی پاک کردۆتەوە.

بەجاروویی (ر): بەجاروی. کە هەڵەیە (چاڕوو) سواغی گەچ و قسڵە.

موژەی (گ/٣): موژە.

٦- زەوق: چەشکە، چێژ.

شەوق: مەبەس لە ئارەزووە.

فارغ: بەتالّ، بۆش.

هەمراز: هاوڕاز.

لە زەوق و (گ/٣): لە شەوق و.

لە زەوق و (ر): لە زوق.

شەوقی (گ/٣): زەوقی.
شەوقی (ر): شوق.
بوومە فارغ (ر): بوم.
ئەوەند هەمرازی (ر): کە چون هەمرازی...
ئەوەند هەمرازی (گ/٣): کە هەمزانوویی هەڵە و دەسکارییە.
٧- ئازوردە: زیز، دڵ یەشاو، دڵشکاو، زویر.
لەبەر چی (ر): لەسەر چی.
وا لە من (ر): تۆ لە من.
بووی تۆ (ر): نوی.
لەب (گ/٣): لێو.
٨- تەقصیر: سووچ، کەموکورتی، درێخی.
مەمات: مردن.
٩- عاجز: زیز، زویر.
وەر کەی: ئەگەر بکەی. کە ئەمەش (جیناس)ە.
ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە.
ئەر (ر): وەر، ئەگەر.
١٠- ثوبات: خۆڕاگرتن.
ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نۆیەمینە.
خەستە و (ر): خەستە.
١١- ئیلتیفات: چاودێری، ڕوو تێکردن، هاوڕ.
ئەم تاکە لە (ر، گ/٣)دا نییە.

٢٧

## لە شەوقی ئاتەشی

١- لە شەوقی ئاتەشی ڕوخساری یارم
وەکو پەروانە دایم بێ قەرارم
٢- لە هیجری تۆ دەروونم وا دەسووتێ،
هەمیشە دڵ تەنووری پڕ لە نارم.
٣- لە تاو ئێشی جگەر هاوار دەکێشم،
لەبەر دەردی دڵم گریانە کارم.
٤- لە سەرد مەیلی مەحبووبە ئەمێستە،
ضەعیف و زەرد ڕەنگی گوڵبەهارم.
٥- لە فیکری ماری کاکۆڵت عەزیزم،
دەڵێی زەهرە هەمیشە تامی زارم.
٦- عەجەب بێهۆشم ئەمڕۆ وا دەزانم،
کە مەستی چاوی مەستی پڕ خومارم.
٧- دەسووتێ دڵ لە عەشقی لالەیی ڕووت،
فتیلەی عەشقە بۆ شەمعی مەزارم.
٨- لە بۆ فەتحی قەڵای دڵ وا بەتاوی،
ئەبێ تەسلیم بم ناچارە چارم.
٩- بەتاو هات (کوردی) (قادر) دڵ فیدای بێ،
خودا مەحفوظی کەی چابوک سوارم.

.......................................................................

١- شەوق: پەڕتەر، تیشک، ڕووناکی.
ئاتەش: ئاگر.
ڕوخسار: ڕوو، چارە، دەموچاو.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (مس، عن، گل/٩، مر، م، ر، ص، ق/٤) و ڕۆژنامەی (عێراق) ژمارە (٢٥)ی مارت و نیسانی ٩٧٩ بەغدایە کە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی نووسیویە و

دەسنیشانی سەرچاوەکەی نەکردووە کەوا دیارە لە (ر)ی وەرگرتووە و ئەم سەرچاوانە هەموو بە هی (کوردی)یان داناوە.

هەروەها ئەم هەڵبەستە لە (نن، نم/١، کش٢)دایە وە لە گۆڤاری (بەیان) ژمارە (٣٥)ی نیسانی ١٩٧٦ بەغدا دایە کە مامۆستا جەمال محەمەد نووسیویە و دەسنیشانی سەرچاوەکەی نەکردووە کە ئەم سەرچاوانەش بە هی (فەتحی)یان داناوە و لەوە دەچێ کە مامۆستا جەمال لە بەر دەسنووسێکی (نجم الدین مەلا)ی وەرگرتبێ، دیسان مامۆستا جەماڵ لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (٥٢٢)ی نیسانی ٩٧٦ بەغدادا لە وەڵامی مامۆستا قەرەداغیدا لەسەر ئەوە سوور بووە کە ئەم هەڵبەستە هی (فەتحی)یە دەڵێ لە کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵەی وەری گرتووە کە لە ١٣ ربیع الاخر ١٣١٦ک.دا نووسراوە لە هەردوو جارەکەی مامۆستا جەمالدا ئەم هەڵبەستە لە یەکتر جیاوازن. من لەبەر زۆری و کۆنیی سەرچاوە و بەپێی چێژ بە هی (کوردی)ی ئەزانم (مس)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

لە (عن)دا بە(فارسی) بەرامبەر بەم هەڵبەستە نووسیویە (وقتی کە کردی مشغول نظم این قصیدەء در اشتیاق قادر بیگ یسر برادرش بووە ناگا قادر بیگ بدبدن عموش (کردی) امدە وبحضو او قصیدە را إکمال کردە – علی –). واتە: (لە کاتێکا (کوردی) خەریکی هەڵبەستنی ئەم چامەیەی بووە لە ئارەزوومەندیی دیداری قادر بەگی برازایدا کتوپڕ ،قادر بەگ هاتووەتە دیدەنی (کوردی)ی مامی و ئەمجا بەدیار ئەوەوە چامەکەی تەواو کردووە – عەلی –).

کە ئەم پەراوێزەش پشتگیریی ئەوە دەکات کە ئەم هەڵبەستە هی (کوردی)یە جگە لەو تێبینییانەم کە لەسەر تاکی (٨ و ٩)ی ئەم هەڵبەستە نووسیومە.

شەوقی (ر، نن، نم/١، ق/٤، عیراق، بەیان): عەشقی.

٢– تۆ دەروونم وا (ص، ر، عیراق): ئاتەشی تۆ دڵ.

دەسووتێ (نن، نم/١): دەسووتێ.

دڵ تەنووری (گل/٩، بەیان): میثلی شوری.

دڵ تەنووری (هاوکاری): وەک شۆری.

دڵ تەنووری (نن، نم/١، کش ٢، ق/٤): وەک تەنووری.

٣– لەم تاکەدا جوانی لە یەکخستنی دوو وشەی (ئێشی) (دەکێشم)دایە کە (جیناس)ە و، مامۆستا جەماڵ لە (هاوکاری)دا ئەم تاکەی نووسیوە کە جیاوازییەکانی سەرچاوەی خۆی و ئەوی قەرەداغی بخاتە بەرچاو کەچی نەیخستووەتە ڕوو.

دەردی (نن): درد.

٤– سەردی: ساردی. ئەم تاکە لە (ق/٤)دا سێیەمینە.

لە سەردی مەیلی (کش ٢): لە مەیلی سەردن.

مەحبووبە (ق/٤): مەحبوبانە.

ئەمێستە (ق/٤): ایستە.

گوڵبەهار: گوڵاڵە سوورە، لالە، چارە چەقیلە، مەشقە شوانانە، گوڵ نیسان.
ناوی گوڵێکی سووری کەم تەمەنە لە سەرەتای بەهاردا سەر هەڵدەدات.
لە سەردی (ر، عێراق): لە سەیری – دیسان لە (هاوکاری)دا بەو نیازەی جیاوازییەکانی لەمەڕ (قەرەداغی) بخاتە ڕوو لەسەر ئەم تاکە، ئەم تاکەی نووسیوەتەوە، بەبێ جیاوازی دەرخستنی.
مەحبووبە ئەمێستە (عیراق، بەیان): مەحبووبانە ئێستە.
مەحبووبە ئەمێستە (نن، نم/١، کش ٢): مەحبوبانە ئێستا.
مەحبووبە ئەمێستە (ر): محبوبا ایستە.
ضەعیف و (مر، م): کەسیس و.
ڕەنگی گوڵبەهارم (نن، نم/١، کش ٢، ر، بەیان، عیراق): وا ڕەنگی بەهارم.
بەڵام (ڕەنگی گوڵبەهارم) ڕاستترە کە سوورە چونکە (ڕەنگی بەهار)ە بەتێکڕایی سەوزە و ئەوە ناگرێتەوە کە (کوردی) لەم تاکەیدا وتوویە.
ڕەنگی گوڵبەهار (ق/٤): ڕەنگ بهارم.
٥– فیکری (نن، نم/١، بەیان، ق/٤): نەشئەی. وە لە (ق/٤)دا چوارەمینە.
فیکری (ر، عیراق): دووری – کەچی مامۆستا جەمال لە (هاوکاری)دا بۆ جیاوازی دەرخستن لە خۆیەوە بەهەڵە نووسیویە گوایە مامۆستا قەرەداغی لە (عیراق)دا (نەشئە)ی نووسیوە کە لە ڕاستیدا (دووری)یە و بەشکو خودی خۆی (نەشئە)ی لە بەیاندا نووسیوە نەک قەرەداغی.
کاکۆڵت (نن، نم/١، بەیان): زولفی تۆ.
کاکۆڵت (مد/٤): زلف تو.
دەڵێی (نن، نم/١): ئەڵێی.
تامی (عیراق): کامی.
تامی (نن): تام.
تامی (ر): کار.
٦– لەم تاکەدا دووپاتبوونەوەی (مەستی) جوانی و (جیناس)ە و ئەم تاکە لە (ر، عیراق) نییە.
ئەم تاکە لە (ق/٤)دا پێنجەمینە.
ئەمڕۆ (بەیان): ئیمڕۆ.
ئەمڕۆ (نن، نم/١): امرو.
کە مەستی چاوی مەستی (نن): کە مست چاو مستت.
٧– لالە: گوڵە و مەبەست لە چرایشە.
فتیلە: پەتکەکەی ناو مۆمەکە یاریدەی درێژەپێدانی گڕەکەی دەدات بۆ هەڵگیرسان.
شەمع: میوم، مەبەستی لە (مۆم)ە.
مەزار: گۆڕ، گوڵکۆ (قەبر).
ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا شەشەمینە، دە نیو باڵی یەکەمیش لە (ر، نن، ق/٤، نم/١، بەیان، هاوکاری، عێراق)دا بەم جۆرەیە: (وەها سووتاوی عەشقی گوڵ و خاڵم).

عەشقی (نن): عشق.
فتیلەی (ر): فتیلی.
عەشقە (کش٢، بەیان): داغە.
عەشقە (ر، عیراق): داغ بوو.
عەشقە (نن، نم/١): داغی (ق/٤): داغمە.
شەمعی (نن، ق/٤): شەمع.
مەزارم (نن، نم/١): شکارم.
مەزارم (کش ٢): قرارم.
٨- فەتح: گرتن، داگیرکردن.
تەسلیم: دەردەست، خۆبەدەستەوەدان.
ناچارە چارم: ڕستەیەکی باوی کوردانەیە: چارم ناچارە.
ئەم تاکە بەم شێوەیەی سەرەوە لە (عێراق، هاوکاری، بەیان، ر، نم/١، نن، کش٢)دا نییە، بەڵام نیو باڵی یەکەمیان لەگەڵ نیوەی دووەمی تاکی دواییدا تیا ئاوێتەن و لەبەر ئەوەی کە وشەی (فەتح) واتە (گرتن) بەشێوەی (فەتحی) واتە (گرتنی) لەو ئاوێتەییانەدا هاتووە، لەوانەیە لەمەوە ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یان بەناوی (فەتحی)یەوە نووسیبێ کە (فەتح)یش یەکێکە لە قوتابییەکانی قوتابخانەی وێژەی (کوردی) و ناوی (فەقێ محەمەد)ە و خەڵکی گوندی (وللانە)ی سروچکی سەر بەپارێزگای (سلێمانی) بوو لە کوردستانی عیراق و گەییوەتە پایەی (ئەفسەر)ی لە سوپای (عوسمانی)دا و لە ١٩٢٥دا مردووە، جگە لە (فەتحی)یەکی تری دۆڵانی و شێخی تەریقەت.
بەتاوی (مر، م، ص، نن، نم/١، بەیان، هاوکاری، ق/٤): بەتاو هات.
بەتاوی (کش ٢): بەتاوە.
مەحفوظی کەی (ق/٤): محفظ کی.
٩- قادر: قادر بەگی کوڕی حەمید بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی صاحیبقڕانە کە ئەو حەمید بەگە برای مستەفا بەگی (کوردی) بووە و ئەو قادر بەگی برازای (کوردی)یە، باوکی خانمی وەسمان پاشای جافە و باپیری (تاهیر بەگ) و ئەحمەد موختار بەگی جووتە شاعیری جافە.
فیدا: بالاگەردان، لەدەور گەڕان، خۆبەختکردن.
مەحفوظ: پاراستن.
هەروەک لە پەراوێزی تاکی پێشوودا نووسیم نیوەی دووەمی ئەم تاکە ئاوێتەی تاکی سەرەوە کراوە لەبەر ئەوەی نازناوی (کوردی) بەنیوەی یەکەمی ئەم تاکەوەیە، دەست هەندێ سەرچاوە نەکەوتووە، بۆیە بە هی (کوردی)یان نەزانیوە.
دڵ فیدای بێ (ر، عیراق، هاوکاری): بۆ فیدای دڵ.
مەحفوظی کەی (ر، عیراق، هاوکاری): محفوظ بکا.
مەحفوظی کەی (ص): حفظی بکەی.

٢٨

## عەزیزم وا لە دووریت

١- عـــەزیـزم وا لـە دووریت دڵفـــیگـارم،
کـە خـوێن دەڕژێ لە دیدەی ئینتـیظارم.
٢- وەها فـرمـێسکی خـوێنین دێ لە چاوم،
وەکـــو دامـــانـی ئـەلوەنـدە کـــەنـارم.
٣- لە (گردی قاصید)ی یەئسی ویصالت،
بەکـوللی کـوێرە دیدەی ئەشکبـارم.
٤- کـە ئومێـدی ویصـالی تۆم نەمـاوە،
بەمـــەرگی تۆ بـەمـەرگ ئومێـدەوارم.
٥- لە چاوی خـۆت بپـرســە ئـەو دەزانێ
کـە من بۆ وا عـەجـوول و بێ قـەرارم.
٦- مـەکەن مـەنعم کـە سەرگەردان و وێڵم،
بەدەس عـەشـقـە زەمامـی ئیخـتـیارم.
٧- لەگـەڵ عـەشـقت وەها یار و ئەنیـسم،
لە تۆش حـەتتـا بەکـوللی بەرکـەنارم.
٨- وەکو مەنصوور ئەگەر بیشم سووتێنن،
(انا القـادر) دەڵێ گـەرد و غـوبارم.
٩- ئەگـــەر طالـع ببێ (کـوردی) ســزایە
بەحـوقـقـە دوڕ و گەوهـەر کـەن نەثارم.

---

١- دڵفیگار: بریندار، بەئازار، غەمگین.
ئینتیظار: چاوەنوارِ.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/٣، گل/٦، گل/٧، گل/٨، گل/٩، ف، جلی، جل نوسخـە، ص، مر، م، نم/١، با، عق)ە لەگەڵ (کم، گ/٢، س، گ/٣) کە هەموو ئەم سەرچاوانەیان بە هـی

(کـوردی)یان داناوە، تـەنیـا لە (عق)دا لە ناو دیوانی (نـالی)دایە و بـە هـی (نالی)یـان داناوە – بەڵام لەبەر ئەوەی بە هـی (کوردی)م زانی، بۆیە (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە و بە(کوردی)ی دەزانم.

وە لە (عن)یشدا بە(فارسی) و لە پەراوێزدا نووسیویە: (کردی رحمە اللە در طریق مسافرت بە بغداد برای زیارت حضرت عبدالقادر گیلانی قدس سر□ە فرمودە – علی –). واتە: (کوردی خوا بیبەخشێ لە ڕێگەی چوونیا بۆ بەغدا، بۆ سەردانی بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی (نهێنییەکانی پیرۆز بێ)، ئەم هەڵبەستەی فەرمووە – عەلی –).

دەڕژێ (نم/١): ئەڕژێ.

دیدەی (گل/٣، گل/٦، گل/٧، گل/٨، گل/٩): چاوی.

ئینتیظارم (ف، جلی، جل – نوسخە، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): ئەشکبارم – کە ئەم وشەی (ئەشکبارم)ە هـی دوا تاکی سێیەمە و بۆ ئەوی بەجێترە.

٢– دامانی: قەراغی.

ئەلوەند: چیایەکە بەسەر هەمەدانەوە پڕ لە گوڵ و گوڵزارە، هەروەها یەککرتنی چەند ڕووبارێکە لە کوردستـانی ئێرانەوە ڕوو دەکاتە کوردستـانی عـیراق و بەخـانەقـیندا دەڕوات و لە سـەروو (جلەولا)وە تێکەڵ بەڕووباری (سیروان «دیالی») دەبێت.

کەنار: لێوار و مەبەستی داوێنە.

دیدەم (ف، نم/١، عق، کم، گ/٢، س، گ/٣): چاوم.

وەکو دامانی (عق): کەواکب دامەن و.

٣– گردی قـاصـید: بەرامـبەر بەم وشـەیە لە (عن)دا بە(فـارسـی) لە پەراوێزەوە نووسـراوە: (گردی قاصد دهکدەییست در کنار الوند شاید کردی در انجا این قصیدە را فرمودە – علی –) واتە: (گردی قاصید گوندە چکۆلەیەکە لە قەراغ ڕووباری ئەلوەند لەوانەیە کە (کوردی) ئەم چامەیەی لەوێ فەرمووبێت – عەلی –). جگە لەمەش (گردی قاصید) بەڕێنووسی کۆن (گەردی قاصید)ە: واتە تۆزی پێی تەتەر (نامەبەر)ە کە (کوردی) لێرەدا (جیناس)ی دەربڕیوە.

یەئس: هیوا بڕان، ناهومێد، پرزە بڕاو.

بەکوللی: بەیەکجاری، بەتەواوی.

گردی قاصیدی (گ/٢، س): گەردی قاصدی.

گردی قاصیدی (گ/٣): گەردی قاصیدی.

قاصدی (جلی): قاصدو.

یەئس ویصالت (عق): چابوک سواران.

یەئس ویصالت (جلی، جل نوسخە): یأس جمالت.

ئـەشکبـــارم (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، جلی، گ/٣): ئـینتـــیظارم بڕوانـە پەراوێز لـە تاکی یەکەمدا.

٤- ...........

٥- چاوی (کم): چاولی - دیارە هەڵەی چاپییە.

بێ قەرار: بێ ئارام.

بۆ (عق، جلی): بۆیە.

بێ قەرارم (عق): دڵ شکاوم - ئەمەش هەڵەیە و لەگەڵ پاشبەندەکەدا ناگونجێ.

**تێبینی:**

ئەم پارچە هەڵبەستە بەتێکڕایی زۆر لەوەکەی پێشوو دەکات کە وشە و ڕستە و بیری یەکتریان زۆر تیا دەربڕدراوە. بۆیە هی (کوردی)یە.

٦- مەنع: بەرگری، بەرهەڵست.

زەمام: دەستەجڵەو.

ئیختیار: ئارەزوو، هەڵبژاردن، سەرپشک.

سەرگەردان و وێڵم (عق): سەرگەردانە (نالی) - کە لەم سەرچاوەیەدا ئەم تاکە دوا تاکە و ئەشێ (وێڵم)ی بە(نالی) وەرگرتبێ و بۆیە کردوویە بە هی ئەو. کە هەرگیز مۆرکی وەستایی کردنی (نالی) بەم هەڵبەستەوە نییە.

زەمامی (نم/١): زەمانی.

٧- ئەنیس: ڕاهاتوو، هۆگر.

حەتتا: تەنانەت.

بەرکەنار: دوور، پەڕگرتوو، گۆشەگیر.

ئەم عەشقەی کە (کوردی) لێرەدا لێی دواوە گەیاندوویەتە ئەوپەڕی قووڵایی خۆشەویستی و لەیەکدا تواندنەوەی صۆفییانە.

٨- مەنصوور: حسێن کوڕی مەنصورە کە بە(هەلاج) بەناوبانگە لە ٨٥٨ - ٩٢٢ز.دا ژیاوە، صۆفییەکی فەیلەسووف و وێژەوانێکی بەدەم و زمان و نووسەرێکی بەرهەم زۆر بووە. زۆری خوێندووە و زۆر گەڕاوە بەجیهاندا. بەتاوانی ئەوەی کە دەیوت (انا الحق) دوای هەشت ساڵ بەندی و بەپیسترین سزادانی لە بەغدا کوژرا و گوایە ڕێچکەی خوێنەکەشی کە ڕژاوە (انا الحق)ی نووسیوە.

(کوردی)ش وەک مەنصوور (انا القادر) دەڵێ: واتا منیش وەک مەنصوور (توانام).

غوبار: تۆز و خۆڵ و مەبەست لە خۆڵەمێشی سووتانی لەشی خۆیەتی.

دەڵێ (نم/١، ف): ئەڵێ.

حوققە: جۆرە سەنگێکە کە بەپێی شوێن قورسایی دەگۆڕدرێت.

نەثار: پەخشکردن، بەسەرا هەڵدان وەک گوڵباران و نوقوڵ و زێڕ بەسەرا هەڵدان.

سزا: ئەم وشەیە کە ئێستە بەواتای (ئەشکەنجەدان) بەکار دێ، دیارە لە سەردەمی (کوردی)دا مەبەست لە (پاداش)یش بووە ئەمەش ڕاستە.

٢٩

## کێ دەڵێ دولبەر بەخیلە

١- کێ دەڵێ دولبـــەر بەخـــیلە ئەمـــڕۆ وەڵڵا دولبـــەرم،
بەردی ژێر پێی خـۆشی حـەتتـا هەر دەهـاوێ بۆ ســەرم.
٢- ئەو کـەسـەی صـەد سـاڵ جـەفـاکێـشـە لە هیـچی دەردەکـا،
وای بـەحــاڵی مـن کــە سێ صـــەد پـایـە نامــاقـــووڵتــرم.
٣- ئیلتـــیـــمـــاسی کــوشـــتنم لێ کــرد، وتی: نـازانی تۆ،
من چەپەڵ ناکـەم لە خــوێنی هـەر سـەگـێـدا خــەنجـەرم.
٤- پێم وت ئاخـــر تۆ دڵی من کـــوێی دەبەی تـوند بـوو وتـی:
های؟ بەتـۆ چی، ماڵـمـە خـواهیـشـتـمـە بۆ هەر کـوێی بەرم.
٥- بـۆچـی نەگـــرێم من ئـەوا بـەم قـــاڵبی فـــەرســـوودەوە؟؟
ظولم و نـازی یار، وە یاخـــۆ جـــەوری ئەغـــیـــار هـەڵگرم.
٦- دڵ لە کـوێدا خـۆی نیـهـان کـا دەیسـمێ، خـۆ تیـری غـەم،
کــون کـونی کــردووە وەکــو بێــژنگ جـەمـیـعی پەیکەرم.
٧- هێند وتت لاچۆ کـــە پشـــتت بابێ و پێـــشت کـــەندەڵان
بـای فـــیـــراق وا کــــەوتە دوام و کــــەندەڵان هـاتە بـەرم
٨- دین و لەش پێشکەش دەکا هەر کەس، منی بێ دەست خودا؟
سـا چلۆن ئەم لاشە فـەرتووت و ضـەعیفـەی بۆ بەرم
٩- شـــاهی ئیـــقلیـــمی وەفـــا زانی کـــە ئەی (کــوردی) منم
فـاقە تـەخت، تۆ مـار عـەسـای دەست و گـەدایی ئەفســەرم

---

١- بەخیل: ڕژد، چرووک، پیسکە، لەجەر.
حەتتا: تەنانەت، تاکو، تا، هەتا.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (عن، گل/٦، گل/٧، گل/٨، گل/٩، جلی، ف، نم/١) وە (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لەمانە (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

بەخیلە (کم، گ/٢، س، گ/٣): بەخیلن.
پێی (کم، نم/١): پای.
دەهاوێ (نم/١): ئەهاوێ.
حەتتا هەر دەهاوێ (جلی): خو آویی حتی.
٢- جەفا: ئازار، ناخۆشی، ئەرک...
پایە: پلە.
ناماقووڵتر: (نامەعقوولتر)، ناپەسەندتر.
ئەو کەسەی (ف): ئەو سەگ.
ئەو کەسەی (گ/٢، س، گ/٣): ئەو سەگەی.
کێشە (ف): کروە.
لە هیچی (ف): لە هیچ.
لە هیچی (جلی): لە دەرگای.
٣- ئیلتیماس: پاڕانەوە، پەنا بۆ بردن، دەستەودامێنی، لێ پاڕانەوە.
چەپەڵ: پیس.
کوشتنم (گ/٢، س، گ/٣): کوژتنم.
وتی (گ/٢، س): گوتی.
وتی ( گ/٣): کوتی.
خوێنی (کم): خوپنی - دیارە هەڵەی چاپییە.
هەر سەگێدا (نم/١): هەر سەگێکا.
هەر سەگێدا (کم): هەر سەگێکدا - ئەمەش قورسییەکی تیایە لە کێشدا.
٤- خواهیشتمە: ئارەزوومە، ئەمەوێ، گەرەکمە، ئاواتمە.
های (نم/١، جلی): هەی.
بۆ هەر کوێی (گ/٢، گ/٣): هەر کووێیی.
بۆ هەر کوێی (کم): هەر کویی.
بۆ هەر کوێی (س): کووێ کی.
بۆ هەر کوێی (نم/١): هەر کویء.
٥- فەرسوودە: لەناوچوو، ڕزیو، شێلراو، پووکاوە.
ظولم: ستەم.
ئەم تاکە لە (کم، نم/١)دا نییە و لە (ف)دا شەشەمینە وە لە (گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە.
بۆچی نەگریم (ف): بوچ نگریم.
ظولم و نازی یار وە یاخۆ (ف): ظلمی تو یا نازی یار یا.
ظولم و نازی یار وە یاخۆ (گ/٢، س، گ/٣): جەوری تۆ یا زوڵمی یار یا جەوری.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (گ/٢، س، گ/٣)دا بەم جۆرەیە:
(فەلەک مروەت کە تۆ بەو قالبی پڕ دەردەوە). ئەمەیش هەڵەیە.
٦- جەمیعی: گشتی، سەرپاکی، هەمووی، حەمگی.
پەیکەرم: کۆتەڵم و مەبەستی لە لەشی خۆیەتی.
ئەم تاکە لە (نم/١، کم، ف، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە.
دڵ (گ/٢، س، گ/٣): ڕۆح.
خۆی (نم/١، کم): خۆم.
کا (نم/١، کم): کەم.
دەیسمێ (ف، کم): در نیە.
دەیسمێ (گل/٩): دوور نیە.
دەیسمێ (نم/١): دونیە.
دەیسمێ (گ/٢، س، گ/٣): ئەر لەبەر.
غەم (گ/٢، س، گ/٣): موژەی.
٧- چاهی: چاڵی.
ئەم تاکە لە (نم/١، کم، ف)دا نییە و لە (گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە. ئەم تاکە لە (گ/٢، س، گ/٣)دا بەم جۆرەیە:
(هێند وتت لاچۆ کە پشتت بابێ پێشت کەندەڵان
بای فیراق وا کەوتە دوام و کەندەڵان هاتە بەرم) – ئەمەش هەڵە و شێواوییە.
٨- فەرتووت: پووکاوە، بەساڵاچوو، لەناوچوو، پیر، پەککەوتە.
ضەعیف: لاواز.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، کم)دا نییە.
دین و لەش (گ/٢، س، گ/٣): ڕۆح و دین.
ئەم (گ/٢، س، گ/٣): ئەو.
٩- زانی کە ئەی (کوردی) منم (نم/١، کم): پێمی وت ئەی کوردی ئەمن. ئەمەش لەنگە و، دوورە لە مەبەستی (کوردی)یەوە.
زانی کە ئەی (گ/٢، س، گ/٣): زانی ئەی.
تەخت و (گ/٢، س، گ/٣): تاج و – ئەمەش هەڵەیە.
نیو تاکی دووەم کە مەبەستی لە (الفقر فخری)ی صۆفییانەیە، کە لە (نم/١، کم، جلی)دا بەم جۆرەیە: (لایقی تەختی شەهەنشاهی و تاج و ئەفسەرم) ئەمیش جوانە و بەجێیە، بەڵام گرانییەکی کێشی تیایە لە دەربڕینی (شەهەنشاهیی و)ەکەیدا.
نیو باڵی دووەمی ئەم دوا تاکە لە (عن) وەرگیراوە کە ڕاست و جوان و گونجاوە.

٣٠

## فەلەک ڕەحمێ

١- فـــەلـەک ڕەحـــمێ بەحـــاڵم کــە، بـەغــایـەت دڵ پەرێشـــانم
ڕەهەندەی زێد و مەسکەن، دوور، لە یار و قەوم و خوێشانم

٢- دەڵێن مـیـهـمـان پـەزیر و دڵنـەواز و صـاحـیـب ئیکرامی
دەســا بـۆ کـێــتــە وا مـن بێ نەدا و، دووریش و مـهـمـانم

٣- چ مینەت؟ گەر نەوازشت و تەعاروف کەی لەگەڵ مونعیم
بەمن فەرضە کە ڕووت و موستەحەقی خەیر و ئیحسانم

٤- عـەزیز و خۆشـەویستی کوللی عالەم بووم ئەمێستاکە،
غــەریب و بێ کــەس و تەنهـا نوشـینی کـونجی ئەحـزانم.

٥- کـەسـەر داغـە لەسـەر داغان، گونەهبار نیم و دەشزانیت
گــونەهبــاریش لـە ئینعــامــدایە، هێـشــتــا من بەتاوانم

٦- بەئەشکی بێ گوناهی گەر بشۆم صەد جار تەن و ڕەختم،
لە گــەردی تـوهمــەتی دوشــمن مــونەززەه، نـابێ دامــانم.

٧- ئەگەر ببێت (موحتەسیب)بیشم کوژێ حەتتا وەکو یوسف
وەریدی عــەشـق و ڕێشی توهمـــەت و چاکی گـــرێبـــانم

٨- لەبەر جـەور و جـەفـا و هیـجران نییـە ناڵە و فیـغـانی من
هیـــلاکی لەوم و طەعنەی ناکــەس و خــەندەی ڕەقـیـبـانم

٩- ئەگـەرچی لۆنگی دەروێشـیم نیـیـە جـانـا بیـحـەمـدیللا
لە ئیـقلیـمی وەفـا و مـوڵکی مـوحـیـبـەت شـاهی شـاهانم

١٠- لە (جـەوهەر) گـەر تەماشـا کـەن، دەزانن، چۆنە ئەحـواڵم
«لە ژێر خـاشــاکــەوە چون گـەوهەرێک نوقـمی بن ئاوانم»

١١- ئەگـەر (هیـجری) دەپرسن مـەزهەب و پیری طەریقی من
(عـەلی) مـەولامــە (قـادر) پیـرمـە (مـەحـمـوود)ە سـوڵتـانم

.................................................................

١– فەلەک: گەردوون، چەرخ، ڕۆژگار، ئەم بڕوا بەفەلەک کردنەش (فەلسەفە)یەکە لە بارەی ڕوودانی کارێکەوە بەسەر مرۆڤدا.

بەغایەت: بەیەکجاری.

ڕەهەندە: دەربەدەر کراو. لە شوێنی خۆ دوورخراوە.

قەوم: کەسوکار، خۆ، خوێش، خزم.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، ن، یح، گل/١، گل/٣، گل/٦، گل/٧، جلی، ع، ص، ما، ف، ق/١، ق، ق/٤، نم/١، کش) وە (ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە، کە لەمانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

هەروەها لە (عن)دا لەسەر ئەم هەڵبەستە ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە نووسراوە کە بەڵگەیەکی مێژوویی ژیانی (کوردی) و باری بابانییانە:

(کردی با دل شکسته ار چندی ز کارگذاران ببە، سلیمانیە را ترک و بکرمنشاه اقامت داشتە و بعد از ان محمود پادشاه ببە بزیارت حاکم کرمنشاه محمد علی میرزا رفتە وآنجا طلب کردی رحمهم الله کرده و او با قصیدهء زیر کە بآن مناسبت نظم فرموده حاضر مجلس ومورد تلطف وتحسین همگی وبهمراه پادشاه بسلیمانیە برگشتە – علی –) واتە: («کوردی» بەدڵشکاوی لە چەند کارگوزارێکی بابانییان (سلێمانی)ی بەجێ هێشتووە و لە کرماشان جێگیر بووە و دوای ئەوە مەحموود پاشای بابان چووەتە سەردانی فەرمانڕەوای کرماشان محەمەد عەلی میرزا، و لەوێدا «کوردی»ی خواستووە خوا لێیان خۆش بێت و ئەویش «کوردی» ئەم چامەیەی دوایی کە (مەبەستی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە) کە بەو بۆنەیەوە هۆنیوەتەوە، چووەتە کۆڕەکەیانەوە کە ئاوقای ڕێز لێگرتنی و چاکە لەگەڵ کردن و بەگەل کردنی هەڵبەستەکەی لە لایانیانەوە بووە و بەهاوڕێیەتیی پاشا گەڕاوەتەوە سلێمانی – عەلی –).

دیسان لە (ن، ص)یشدا لە سەرەناوی ئەم هەڵبەستەدا نووسراوە (برای محمود پادشاه) واتە (بۆ مەحموود پاشا). هەروەک مێژووی ئەو سەرێنییەش لێمان ئاشکرا دەکات کە ئەو مەحموود پاشایە کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای بەبەو لە ساڵانی ١٢٢٨ – ١٢٥٠ک بەرامبەر بە(١٨١٣ – ١٨٣٤ز)دا فەرمانڕەواییەکی پچڕ پچڕی بەسەربردووە. کە پڕی لە ئاژاوەی دەستی بێگانە و دراوسێیەکان و لێ هەڵگەڕانەوەی خزمانی بووە، کە (کوردستان)یان گێڕاوە بەدەریایەکی ئاڵۆزی ئەوتۆ کە هەر دەمەی بەدەم شەپۆلی لافاوی هێرشی خوێناوی ئەستەموول و بەغدا و تاران و تەورێز و کرماشان و سنە و ڕەواندز و دیاربەکر و حەریر و کفری و سلێمانی و... هتدەوە لە گێژدا بووە. (کوردی)ش کە ناودار و ڕۆشنبیرێکی ئەو سەردەمە بووە لە پڕیشکی پیس و پڕیشکی ئاگری، ناوچەکە نەپارێزراوە وەک لەم هەڵبەستەدا و زۆربەی هەڵبەستەکانیدا ئەم ڕاستییەی بۆ دەربڕیوین.

بەحاڵم کە (ما): بەحاڵم کا.

زید و (ع): زید.

له ناو غەم و (ن): له دیدەی یار و.

٢- میهمان پەزیر: میوان دۆست، میوان پەروەر، میوان ڕاگر.

صاحیب: خاوەن.

ئیکرام: بەخشندەیی.

بێ ئەدا: بێ هیوا، بێ پەنا.

صاحب (گ/٢، س): خاوەند - دیارە ئەمەش له گۆڕانەکانی گیوە.

صاحیب (گ/٣): خاوەن.

بۆ کێتە (گ/٣): بۆ کەیتە - بەڕێنووسی کۆن ئەم هەردوو وشەی (بۆ کێتە) و (بۆ کەیتە)یە وەک یەک نووسراون: (بۆ کێتە)، کە ئەمەش دوو جۆر واتا دەدات و جوانییەکی وێژەییە.

٣- نەوازشت: لاواندنەوە، ڕێز لێ گرتن.

تەعاروف: ناسینکاری، ناسیاری.

مونعیم: دارا، بووە.

فەرضە: پێویستە.

موستەحەق: شایان.

خەیر و ئیحسان: چاکە.

ئەم تاکە له هەموو سەرچاوە دەسنووسەکاندا جگە له (نم/١) سێیەمینە و له هەموو سەرچاوە چاپییەکانیشدا و له (جلی)شدا چوارەمینە و له (نم/١)یشدا چوارەمینە.

کە ڕووت و موستەحەققی (ق/٤، ما): که روت مستحق.

ئەم تاکەی سەرەوە و ئەوی پێشووش هەردوو له ڕەوشت بەرزیی مەحموود پاشا دەدوێن مێژووەکان و تەنانەت (مستەر ڕیچ)یش کە لەگەڵیا ژیاوە هەموو پشتگیریی ئەم ڕایەی (کوردی) دەکەن.

٤- کونجی ئەحزان: گۆشەی غەمان.

ئەم تاکە له هەموو سەرچاوە دەسنووسەکاندا جگە له (نم/١) چوارەمینە و له (نم/١) و (جلی) و چاپییەکانیشدا سێیەمینە.

ئەمێستاکە (ئا): ئێستاکە.

نۆشینی (بح، ع، ما): نشین.

کونجی ئەحزانم (یح، ع، کش، ق، ف، ف١، ص): کنج هجرانم.

کونجی ئەحزانم (ما): کنج حجرانم.

٥- کەسەر: دڵشکاوی، لەسەر، (سەر).

داغە: خەفەتە، گەرمە، سووتێنراوە.

داغان: خەفەتەکان، تالآن، رووت کرانەوە.
ئینعام: دارایی، بەخشش، خۆشی.
ئەم تاکە لە (عن، ن، گل/٦، گل/٧، ص)دایە و هێشتە چاپیش نەکراوە، لەم سەرچاوانەشدا شوێنی ئەم تاکە لە دوای تاکی پێشوو (چوارەم)ەوەیە.
جوانیش لە دەربڕینی (کەسەر داغە لەسەر داغان)دایە کە جۆرەها واتەی جیا جیا دەدات، کە ئەوەش وەستایی نواندنە لە وێژە و زماندا.
٦- ڕەخت: بەرگ، شتومەک، زین.
توهمەت: تاوانباری.
مونەززەه: پاک.
ئەم تاکەش لە (عن، ن، گل/١، گل/٣، گل/٦، گل/٧، ص)دایە و هێشتە چاپ نەکراوە، وە لەم سەرچاوانەشدا شوێنەکەی لە دوای تاکی پێشوو (پێنجەم)ەوەیە.
بەئەشکی (ن، ص): لە ئەشکی.
٧- وەرید: ڕەوشت خراپ و مەبەست لە خراپی ڕەوشتی زولەیخایە بەرامبەر بەیووسف، وەلێ عاشقبوونی و پەلاماری یووسف دانی.
ڕێش: برین، ڕووشاوی.
گرێبان: بەرۆک و مەبەستی لە پشتەوەیە وەک کراسەکەی یووسف کە زولەیخا دڕاندی لە دواوە لە کاتێکدا یووسف لە دەستی هەڵات.
ئەم تاکە لە (ئا، جلی)دا نییە و لە (یح، ع، ما، کش، نم/١)دا پێنجەمینە و لە (گل/٣، گل/٦، ف، ف١، ق، ق٤، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لەوانی تردا حەوتەمینە.
موحتەسیب بیشم کوژێ حەتتا (بح، ع، کش، ف، ف١، ق، ق٤، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): بەناحەق خۆت بکەی پەنهان.
موحتەسیب بیشم کوژێ حەتتا (ما): بەناحق هم بکەء بهتان.
حەتتا (ن): حەقا.
حەتتا (ص): حقە.
وەریدی (یح): درید و.
وەریدی (ن، ما): درّید و.
وەریدی (ع): دریدی. واتە (دڕاوی) و مەبەست لە کراسەکەی یووسفە کە زولەیخا دڕاندوویە.
عەشق و (ع، ما): عشق.
ڕێشی (ع، ما، کش): ریش.
توهمەت و (یح، کش، ع، ما): تهمت.
چاکی (یح، ع، کش): چاک.

چاکی (ما): سینە.
گریبانم (یح، ع، کش): کریبانم.
٨- طەعنە: توانج.
خەندە: پێکەنین.
ئەم تاکە لە (ئا، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە و لە (کش، یح، ع، ما، ف، ف١، ق، ق٤)دا شەشەمینە و لە (گل/٣، گل/٦)دا حەوتەمینە و لەوانی تردا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
ناڵە و (ص، ع): ناڵەء.
فیغانی (ع، کش): فغان و لە (یح)دا بەر وێنەگرتنی ئۆفسێت نەکەوتووە.
هیلاکی (ما): هلاک.
لەوم و (ما، کش): لوم.
لەوم و (نم/١): لومە و. - لەنگە -
لەوم و (ع): لومە.
طەعنەی (ع، کش): طعنە.
ناکەس و (ع): ناکس.
ناکەس و (یح): ناکسی و.
ڕەقیبانم (یح): رەقیب... بەر وێنەگرتنی ئۆفسێت نەکەوتووە.
٩- لۆنگ: کەوڵی دەروێشی، پۆشاکێکی سەرەوەیە، پرچ، شتومەکی دەروێشی.
بیحەمدیللا: لەگەڵ سوپاس بۆ خوادا.
ئەم تاکە لە (ئا، کش، یح، ما، ع، ق، ق٤، ف، ف١، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە (ن)دا هەشتەمینە و دوا تاکە لەم هەڵبەستەدا و لە (گل/٣، گل/٦)دا هەشتەمینە و لەوانی تردا نۆیەمینە.
لۆنگی (ن، ص): پرچی.
جانا (ن): کوردی - وە لەبەر هاتنی ئەم نازناوەیە کە بەدوا تاک دانراوە.
شاهی شاهانم (ن): امرو سلطانم - ئەمیش نابێ، چونکی (سلطان) لە تاکی دوایی ئەم هەڵبەستەدا دووبارە دەبێتەوە بروانە ئەوێ.
١٠- جەوهەر: گەوهەر.
خاشاک: خشتوخاڵ، پووش و پەڵاش.
لە (عن)دا لەسەر ئەم تاکە ئەم پەراوێزە فارسییە نووسراوە:
(کردی در این بیت مقصدش از جوهر، حروفی منقطە است کە در مصرعی ثانی وارد است، زیرا مجموعی آنان بحساب ابجدی مطابق باسال نظم واین ملاقات است - علی -) واتە:

(«کوردی» لەم تاکەیدا مەبەستی لە وشەی «جەوهەر» ئەو پیتە نوقتە «خاڵ»دارانەیە کە لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە دان کە سەرپاکی ئەو پیتە خاڵدارانە دەکەنە ساڵی هەڵبەستنی ئەم هۆنراوە و بەیەکگەیشتنەکەی لەگەڵ مەحموود پاشای بەبەدا – عەلی –).

ئەمجا:

پیتی ژ = ٧ ی = ١٠ **لە وشەی (لە ژێر)دا**

وە پیتی خ = ٦٠٠ ش = ٣٠٠ **لە وشەی (خاشاکەوە)دا**

وە پیتی چ = ٣ ن = ٥٠ **لە وشەی (چون) یا (چۆن)دا**

وە پیتی یـــ = ١٠ **لە وشەی (گەوهەرێک)دا**

وە پیتی ن = ٥٠ ق = ١٠٠ **لە وشەی (نوقمی)دا**

وە پیتی بـــ = ٢ ن = ٥٠ **لە وشەی (بن)دا** وە پیتی ن = ٥٠ **لە وشەی (ئاوانم)دا**

هەمووی = ١٢٣٢ = کە ئەمەش ساڵی کۆچی ئەو یەکگرتن و هەڵبەست تیا دانانەی (کوردی)یە لە (کرماشان).

١٢٣٢ = ١٨١٦ز.

وە ئەم تاکەش لە (عن، ن، گل/٧)دایە و هێشتە چاپ نەکراوە و لەوانی تردا نییە.

١١- مەزهەب: ڕێڕەوێکی ئاینییە.

طەریق: ڕێڕەوێکی دەروێشی و صۆفیگەری فەلسەفییە.

مەولا: گەورە.

پیر: مەبەستی لە (شێخ)ی طەریقەتە.

عەلی: (محەمەد عەلی میرزا)ی فەرمانڕەوای (کرماشان)ە و حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی طالبیش دەگرێتەوە.

قادر: شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غەوس)ە.

مەحموود: مەحموود پاشای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای بابان کە هەڵبەستەکەی بۆ ئەوە، لەبارەگایی محەمەد عەلی میرزادا خوێندوویەتەوە لە کرماشان.

سوڵتان: پاشا. کە مەبەستی لە مەحموود پاشایە.

ئەم تاکە لە (ن)دا نییە و لە (ف، ف١، ق، ق٤، یح، کش، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە (ئا)دا شەشەمینە و لە (گل/١، گل/٦)دا دەیەمینە و لەوانی تردا یانزەمین تاکە.

هیجری: ئەم نازناوە لە هەموو سەرچاوە و دەسنووسەکاندا (هیجری) نییە و تەنیا لە (جلی) و (چاپییەکان و نم/١)دا (کوردی)یە.

عەلی (ما): ئەمین.

عەلی (ق، کش): عزیز.
قادر (ما): فتاح.
مەحموود (ما): معروف.
وە بەپێی پەراوێزی (عن) محەمەد عەلی میرزا، زۆر دڵخۆشیی (کوردی)ی داوەتەوە و لەگەڵی خەریک بووە بۆ مانەوەی لە کرماشان لە بارەگاکەی خۆیدا و مەحموود پاشا و (کوردی) نەیانویستووە.
**ئەم هەڵبەستە:** وەکو بیستوومە ئەم هەڵبەستەی لە زۆر کتوپڕیدا کە مەحموود پاشا ناردوویە بەدوایا، وتووە.

٣١

## دڵم کەیلە

١- دڵم کـــەیلە لە مـــیـــحـنەتدا، ڕەوانە خـــوێن لە دامـــانم
لە گـــێـــژاوی بەڵا، وا غـــەرقـــە ســـەر، هەر تا بەدامـــانم

٢- لە دەستـی کەچڕەوی گەردوون لە کوورەی فیرقەتی غەمدا
بەدایم هـەروەکـو قـەقنەس حـەریقی ناری حـیـرمـانم

٣- وەصـیـەت بێ مـەبن دوودڵ کـە نادا مـەنفـەعـەت پێـتـان
منیش دوودڵ بووم ئاخـر، ئێـسـتـە بۆیە وا پەشـیـمـانم

٤- خـودا تا دای بـەمن وای دا، بەجـارێ وەصلـی دوو دولبـەر
دە سەیر کەن چی بەسەر هێنام، فەلەک چۆن کردی تالانم

٥- هەتا ڕۆژی حـەشـر دەگـریم (حـەسـەن) داغم لە دڵدایە
وەکـو فـەرهادی کـۆهـئـەفگەن بەمـەهجـووری لە یارانم

٦- ...............................................................................................
...............................................................................................

٧- وەکو (کـوردی) لە دوو جەژنان، دریـغا، حـەسـرەتا، دەردا
ئەمـــیـــشـم چوو، ئەویشـم چوو، بەجـــارێ مـــاڵی وێرانم

---

١- سـەرچاوەی ئەم هەڵبـەسـتـە (گل/٦، گ/٣)یە و لەبەر شـێواویشـیان هەردوویانم کردنە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
لەو پەڕە پەڕپووتەی (گل/٦)دا ئەم هەڵبەستە لە ژێر ناوی:
(کردی برای حسن افندی رحمە الله) واتە: (هەڵبـەسـتی «کوردی» بۆ حـەسـەن ئەفەندی خـوا لێیخۆش بێ)دا نووسراوە. بەڵام کام (حـەسـەن ئەفەندی) بووە بە چ بۆنەیەکەوە بۆی وتووە؟ کە بە(حەسەن ئاغای مەسرەفی) دەزانم.
لە سـەرچاوەی (گ/٣)شـدا تاکی (١ و ٢)ی هـی (وەفـایی)یە و جگە لە شـێـواوی و جیـاوازیی زۆریشیان لەگەڵ ئەم هەڵبەستەدا، هەر خاوەنی ئەم سەرچاوەیەش مامۆستا (گیو مرکریانی)

له (دیوانی وەفـــایی) ل/١٠٥دا چاپی کـــردوون بۆیە هەڵم بواردن، بەڵام تەنیـــا تاکـــێک لە (گ/٣)دایە کە لە (گل/٦)دا بۆم ساغ نەکرایەوە، خستمەوە سەر ئەم هەڵبەستە.

ئەم تاکەی سەرەوە لە (گ/٣)دا سێیەمینە.

لە میحنەتدا (گ/٣): لە میحنەت وا.

بەڵا وا غەرقە (گ/٣): بەڵا دا غەرقە.

هەر تا (گ/٣): هەتا – ئەمیش لەنگە.

دامانم (گ/٣): دامانی – ئەمیش لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ.

٢– گەردوون: ڕۆژگار، چەرخ.

قەقنەس: مەلێکی ئەفسانەییە گوایە دوای چەند ساڵە ژیانێک دەسووتێ، و لە خۆڵەمێشەکەی قەقنەسێکی تر پەیدا دەبێ.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا چوارەمینە.

لە دەستی (گ/٣): لە دەس. – لەنگە –

کەچرەوی (گ/٣): کەچڕۆیی – دەسکارییە و لەنگە.

حەریقی (گل/٦): غریقی.

٣– مەنفەعەت: قازانج، سوود، کەڵک.

ئەم تاکە لە (گل/٦)دا بۆم سـاغ نەکرایەوە و کـوتومت لە (گ/٣)م وەرگـرت، وەک لە پەراوێزی تاکی یەکەمدا نیشانەم بۆ کرد. وە لە (گ/٣)دا تاکی پێنجەمینە.

٤– ئەم تاکـە لە (گ/٣)دا نیـوەی یەکـەمی باڵی دووەمی ناتەواوە و لە جـێگەی ئەوە چەند......... (خاڵێکی) داناوە و لە (فەلەک.........)ەوە دەس پێ دەکات وە بەپێی (گل/٦) پڕم کردەوە.

دولبەر (گ/٣): دڵبەر.

٥– حەسەن: حەسەن ئەو کەسەیە کە لە پەراوێزی تاکی یەکەمدا نیشانەم بۆ کرد.

ئەفگەن: برمێن، ڕووخێنەر، هەڵکەن.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە.

٦– ئەم تاکـەم لە (گل/٦)دا بۆ ســاغ نەکـرایەوە و لە (گ/٣)شــدا نەنووســراوە و، چاوەڕوانی بەدەنگەوە هاتنی ئەوانەیە کـە ســەرچاوەی تەواوی ئەم هـەڵبـەســتـەیان لایە و پڕکـردنەوەی شێواوییەکانیان لە وزەدایە.

٧– ئەم تاکـە لە (گل/٦)دا شـەشـەمـینە و لە (گ/٣)دا حـەوتەمـینە و دوا تـاکـە، چونکە نازناوی (کوردی)شی تیایە.

«کوردی له دوو جه‌ژنان»: په‌ندێکی پێشینانمانه.

درێغا: ئه‌ی موخابن، خه‌فه‌ت.

حه‌سره‌تا: ئه‌ی داخ، ئه‌ی خه‌فه‌ت.

ده‌ردا: ئه‌ی ده‌رد.

نیـو باڵی دووه‌می ئه‌م تاکـه (وه‌فـایی)ی له‌مـی وه‌رگـرتووه کـردوویه به‌(پێنج خـشتـه‌کی) بڕوانه (دیوانی وه‌فایی) هـه‌روه‌ها (مه‌حوی)یش ئه‌م دوا نیو باڵییه‌ی له (کوردی) وه‌رگرتووه.

٣٢

## تاكی دڵ مابێ

١- تاكی دڵ مابێ، مەكۆشە، قەت لە ئابڕوو بردنم
عەشق تا خۆش بێ، مەكێشە ڕەنجی ڕیسواكردنم
٢- پێشەوای كاروانی بێ ڕەحمی، هەتا ماوی ئەتۆی
هەڵگری باری جەفا و هیجران هەتا دەمرم منم
٣- هەر لە تۆم دیوە لە خۆم دڵسۆز و موشفیق تر بەخۆم
چونكە وا ساعی و عەجوول و طالیبی بۆ مردنم
٤- خۆ نواندن بەس بێ بەخوا ڕووی جیهان زانی كە تۆ
قادری بۆ كوشتن و تالآن و زەجر و گرتنم
٥- نازە، یاخۆ مەیلە، یا نەشئەت طلووعی كردووە
یا بەهوشیاری، دەكەی مەستیی، بەهانەی كوشتنم
٦- تینوویی نەزعی فیراق و یادی جوللابی لەبت
جبرەئیل یارم بێ، یاز ئیشكا لە ڕۆح دەربردنم
٧- بەخت یەكە، هیجرەت دووە، غوربەت سییان و دڵ چوار
من یەكم، چوار تەوقی ناحەق بۆچی چووەتە گەردنم؟؟
٨- گەر لە عەشقی سادە ڕوویان دڵ بگۆڕم؛ بێ گومان؛
مورتەدم، یەعنی ئەسیری زوڵف و پوستانی ژنم
٩- دڵ دەڵێ (كوردی)!! ڕەقیب دوشمنتە كۆنە لۆتییە
بۆیە وای گوت؛ تا، نەزانم كێیە دۆست و دوشمنم

---

١- سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە تەنیا لە (گ/٢، س، گ/٣)یە و (گ/٢)م كردە بنكەی لێكۆڵینەوە، چونكە یەكەمین سەرچاوەیە و ئەوانیتر لەویان وەرگرتووە.
عەشق (گ/٣): عیشق.
٢- ....................

٣- موشفیق: بەبەزەیی، میهرەبان، نەوازشتکار، لاوێنەر.

ساعی: تێکۆشەر، هەوڵدەر، کنەکار.

٤- قادر: توانا.

زەجر: ڕووشکاندن، تەمێکردن.

کوشتن (گ/٢، س، گ/٣): کوژتن.

٥- دەکەی (گ/٢، گ/٣): وەکی.

٦- جوللاب: شەربەتی هەنگوین و شەکر، کە بەگوڵاو بگیرێتەوە.

جوللاب (گ/٢، س): جەللاب، ناگونجێ و ئەم تاکەش شێواویی تیایە.

٧- یەکە: لە هەرسێ سەرچاوەکەدا: (یەک) نووسراوە، بەڵام بۆ گونجاندنی کێش کردم بە(یەکە). چونکی لە سەرچاوەکاندا لەنگە.

دووە: دیسان لە سەرچاوەکاندا: (دوو و)ە و لەبەر لەنگ نەبوون کردم بە(دووە) کە ئەوەتا ئێستە ئەم تاکە سوار و ڕەوانە.

تەوقی (گ/٢، س، گ/٣): تۆقی - ئەمەش دەسکارییە -.

٨- عەشقی (گ/٢، س، گ/٣): عیشقی.

مورتەد: پاشگەز.

پوستان: مەمک.

٩- دوشمنتە (گ/٢، س، گ/٣): دوژمنتە.

گوت (گ/٢، س، گ/٣): کوت.

دوشمنم (گ/٢، س، گ/٣): دوژمنم.

**تێبینی:**

ئەم پارچە هەڵبەستە بەتێکڕایی لەوە دەچێ «دەسکارییەکی گشتیی تیا کرابێ، وەک مۆرکە تایبەتییەکەی (کوردی)ی شێواندبێ وایە، بۆیە گومان لەوە دەکەم کە دەقی وتنی هەڵبەستەکە کوتومت وەک ئەم شێوەیەی سەرەوە بووبێ.

وەک لە میرانی تۆفیق بەگی فەتاح بەگی ئەرازی برای ئەحمەد حەمدی بەگم بیستووە، ئەم هەڵبەستەی وەک بێزاری دەربڕینێک وەها بووە بەرامبەر بەو خزمانەی کە ویستوویانە ژنی حەمید بەگی برای بهێنێ کە خۆی داشدیاری ئەو و قادر بەگی کوڕی برای کردوون و، ویستنەکەی بەر بەرپەرچ داوەتەوە.

٣٣

## ڕەفیقی کونجی میحنەت

١- ڕەفـیـقی کـونجی مـیـحنەت، عـاجـزن هـەر شـەو لە ناڵینم
گــورێزانن لـەبەر لێــشــاوی مـــەوجی بـەحــری ئـەســرینم
٢- ئەگـەرچی ڕۆژ و شـەو مـەشـغـوڵی نەغمـەی مـوطریبم ئەمما
لە (تەم) خــاڵی نیـیـە سـاتێ دڵەی مـەفـتـوون و غـەمگینم
٣- نـە هـەر دەردی مـنـە تـەنـیــا، ئـەمـــە دەردی هـەمـــوو لایـە،
بەجــارێ فـولکی شـێـواوە، لـە نەگـبـەت مــاه و پەروینم
٤- هـەزار خۆزگەم بەخۆت دووری لە شـاری پڕ بەڵا و میحنەت
لە فـرصــەتدا منیش هـەڵدێم لە تەڵـخـیی شـاری شـیـرینم
٥- طـەبـیـب دێـن دەوای دەردم بکا، خـــۆ مـن زەدەی دووریم
بـەبێ داڕوویـی وەصلـی تـۆ، نـیـــیـــە ئـارام و تـەسکیـنـم
٦- ئەگـەر مـومکین نەبوو وەصلت کـە من مـردم وەصیـەت بێ،
لەبـاتی قـــەوم و خـــوێشـــانم، لەســـەر قـــەبرم بکە شـیـنم.
٧- شـەهـیـدی عـەشـقم و مـەمـشـۆن و کـفنم بۆ مـەکـەن یاران
گـەواهـی حـەشـرە بـۆ دەعـوای شـەهـادەت بەرگی خـوێنینم.
٨- لە پەردەی (طاهیری) گـەر بێ صـەدای ئەو عاشـقەی یارەم
ئـیــتــر حــاجــەت نیـیــە بێن؛ مــەلا بـۆ وەعظ و تـەڵقـیـنـم
٩- عـەبـەث (کـوردی) مـەلائیک دێن دەپرسـن ئـیـعـتـیـقـاداتم
کە (سـالم) خـۆی دەزانێ من لـەسـەر کـام مـەزهـەب و دینم

---

١- گورێزانن: ڕائەکەن، هەڵدێن.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (ب، ن، عن، گل/١، گل/٣، گل/٦، گل/٧، جل، ق/١، نم/١، نسخە، کش، ف، ش، نن، نم/١، شک) وە (ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە هەمـــوواندا (کم)م کـــردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
هەر شەو (ب): هەر شەب.

مەوجی بەحری ئەسرینم (شک): مەوجی ئەشکی خوێنینم – نسخە: لە موجی بحری ئەسرینم.
مەوجی بەحری (کم): بەحری مەوجی – هەڵەیە.
لەبەر لێشاوی مەوجی بەحری (ف): نسخە – لەبەر لافاوی موجی ئەشکی.
ئەسرینم (ف، ب): خوێنینم.
٢– مەشغوڵی: خەریکی.
مەفتوون: شەیدا، گیرۆدەی ئاشووب، دێوانە.
لە تەم (کش، جلی، ف، ش، نن، نم/١، ئا، کم، شک، مد/١): لە غەم (کە واتای لە تەم)ە.
لە تەم (گ/٢، س، گ/٣): لە خەم.
مەفتوون و (کم، نم/١، نن، شک، ف، کش، گ/٢، س، گ/٣، مد/١، ش، ب، نم/١: نسخە، ئا):
محزون و...
غەمگینم (گ/٢، س، گ/٣): خەمگینم.
ئەم هەڵبەستە لە (مد/١)دا بەناوی (نالی)یەوەیە و نازناویشی هی (کوردی)یە.
**ڕوونکردنەوە:**
لە سەرەتای ئەم هەڵبەستەدا (عن) پەراوێزێکی فارسیی نووسیوە کە ئەمەیە:
(نامەء مصطفی بیک کردی در سلیمانیە برای سالم بە طهران فرستادە رحمهما الله در زیر جوابش بعد از این قصید مندرج است – علی –).
واتە: (نامەی مستەفا بەگی «کوردی» لە سلێمانییەوە بۆ سالمی ناردووە لە تاران – خوا لێیان خۆشبێ – کە وەڵامەکەی لە دوای ئەم چامەیەوە نووسراوە – عەلی –).
٣– فولک: ڕێڕەوی سووڕانەوەی ئەستێرەکان، وەک ڕێگەی سووڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا.
پەروین (ثورەییا): کۆمەڵە ئەستێرەیەکی چونیەک و ڕێکوپێکە و لەبەر دووری، وەک ئەستێرەیەکی جوان و (لالا)یی ئەنوێنن. هەروەها (پەروین) یەکێکە لە (مەنازل)ەکانی مانگ.
ئەم تاکە تەنیا لە (ن، عن، گل/٦، گل/٧)دایە و سێ بەیتە و لەوانی ترا نییە و چاپیش نەکراوە.
بەجارێ (ن): مەدار و – کە ئەمیش نوسخەیەکی گونجاوە لە ڕووی گەردوون ناسییەوە.
بەجارێ (عن): مەسار و.
٤– ئەم تاکەش لە (ن، عن، گل/٦، گل/٧، مد/١)دایە و چوارەمینە و لەوانی تردا نییە، هێشتە چاپ نەکراوە.
٥– ئەم تاکە لە (جلی، ئا)دا نییە و، جگە لە (ن، عن، گل/٦، گل/٧) و لە سەرچاوەکانی تردا سێیەمین تاکە.
طەبیب دێنن (کش – محمدامین): حبیب بی.
طەبیب دێنن (گ/٣): طبیب دینن.
دەوای دەردم بکا خۆ من (ش): عیلاجم کا کە ئازاری.

طەبیب دێنن (ف): طەبیب بینن.
خۆ من زەدەی دووریم (ن): بو چاوی سووتاوم.
بەبێ داڕوویی وەصلی تۆ نییە (گ/٣): بەبێ داڕوویی وەصلی نایە هیچ.
بەبێ داڕوویی وەصلی تۆ نییە (کش): بەبێ داڕوی وصلی نایە بەهیچ.
بەبێ داڕوویی وەصلی تۆ نییە (ب): بەبی داروی وصال نابی بەهیچ.
وەصلی تۆ نییە (ف): وصلت قط نییە.
تۆ نییە (مد/١): نابی بهیچ.
تۆ (ش، نن، نم/١، شک، گ/٢، س، کم): ئەو.
٦- ئەم تاکە لە (ئا)دا سێیەمینە و جگە لە (ن، عن، گل/٦، گل/٧) و لەوانی تردا چوارەمینە.
نەبوو (کش، نن، نم/١، شک، ش): نییە.
نەبوو (ئا): نەبێ.
وەصلت (نم/١، کم، گ/٢، س، ف: نسخە): ژینم؛ (وەصلت) مەبەستی لەوە بووە کە دیدەنی سالم بکا.
وەصلت (ب، ن، ش، ئا، گ/٣، مد/١): وەصلی.
وەصلت (ب، ئا): وصلم.
کە من مردم (نن، نم/١: نسخە، شک): لە پاش مردن.
بکە (ب): بکا.
قەبرم (ن): مەیتم.
٧- دەعوا: ویستن، داوا.
ئەم تاکە لە (ئا)دا چوارەمینە و لە (ب، کش، ف، ش، نن، نم/١، نم/١: نسخە، گل/١، گل/٦، شک، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە.
عەشقمو (گ/٣): عیشقم و.
یاران (ب): یارە.
گەواهی (مد/١): کوا.
بەرگی (کش): برکە.
بەرگی (مد/١): برک.
٨- ئەم تاکە لە (نم/١)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا جگە لە (ن، عن، گل/٦، گل/٧)دا شەشەمینە.
تەڵقین: ئەو ئامۆژگارییە تایبەتییەیە کە لەسەر تەرمی مردوو لە کاتی ناشتنیدا دەیخوێنن و ئەمەش نەریتێکی سەدان ساڵ بەر لە ئیسلامی کوردە لە ئاینی زەردەشتییەوە پەیا بووە.
لە پەردەی (کم، گ/٢، س، گ/٣): لە پەردەی.
طاهیری (نم/١، ف، گ/٢، س، گ/٣): ظاهری - ئەمەش هەڵەیە.
بڕوانە تاکی/٢٦ و پەراوێزەکەی هەڵبەستی (دڵ لە میحنەت کەیلە) ئەی پیری موغانی

بەزمسازارا.

ئەو (ف)دا.

عاشقەی یارم (مد/١): عاشق یارم.

ئیتر (کم): ایتر باکم/ دیارە هەڵەی چاپییە.

وا دەردەکەوێ کە (سالم) دەنگی خۆش بووە، و مەقامی (پەردەی طاهری)ی چاک زانیوە، بۆیە (کوردی) لێرەدا ئەو یارییەی کردووە لەو پەردەیەدا.

٩- عەبەث (عەبەس): ئەفسووس، موخابن، هەیهات.

ئیعتیقادات: بیروبڕوای ئاینی مەبەست بووە.

ئەم تاکە لە (ئا)دا شەشەمینە و لە (ب، گل/١، گل/٣، کش، ف، ش، نم/١: نسخە، تا، نن، نم/١، شک، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (ف، عن، گل/٦، گل/٧)دا نۆیەمین، تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و، لە هەمووانیشدا دوا تاکە.

عەبەث (ش): عەجەب.

کوردی (کش، عن، ن، گل/٧، ئا): هیجری – ئەمەش هەڵەیە، چونکە هەڵبەستەکەی لە شاری (سولەیمانی) داناوە و ئەگەر لە دەرەوەی کوردستان بووبێ، نازناوی (هیجری)ی داناوە.

دێن (ش): دی ین.

دێن دەپرسن (کش): بین بپرسن.

دەپرسن (ف، نم/١، نم/١: نسخە، شک، نن): دەپرسن.

ئیعتیقاداتم (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): مذهب و دینت.

ئیعتیقاداتم (ف، شک، نن، نم/١: نسخە): مذهب و دینم.

ئیعتیقاداتم (کش، مد/١): مذهب و پیرم.

سالم (کش، ش، شک، ف، نن، نم/١، نم/١: نسخە، ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣، مد/١): قادر – بێ گومان ئەم سەرچاوانە و ئەوانی لێیان وەرگرتوون ئاگەداری ئەوە نەبوون کە ئەم هەڵبەستە نامەیە کە بۆ (سالم) و، وشەی (سالم)یان لا غەریب بووە بۆ ئەم شوێنەوە و حەساسییەتێک بەرامبەر بە(قادر) و (کوردی) بەناڕەوایی دروست کراوە.

دەزانێ (نم/١، نم/١: نسخە، شک، نن): ئەزانی.

**(وەڵامەکەی سالم):**

ئەمجا با بچینە سەر وەڵامی ئەم هەڵبەستە لە لایەن (سالم)ەوە.

لە پەراوێزی سەر تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەدا نیشانەم بۆ ئەوە کرد کە (سالم) بەهەڵبەستێک وەڵامی داوەتەوە.

وە لە (عن)دا لە دوای ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی)یەوە بە(فارسی) ئەم پەراوێزە نووسراوە: (واین جواب سالم است در طهران برای کردی بەسلیمانیە فرستادە رحمهما الله – علی –). واتە: (وە ئەمەش وەڵامی سالمە لە تارانەوە بۆ (کوردی)ی ناردووە لە «سلێمانی»

خوا لێیان خۆش بێ – عەلی –).

**«وەڵامەکەی سالم»**

ڕەفــیــقی گــۆشـــەیی غــوربەت، هـەراســانن لە ناڵینم
لە ئەشکی دیدە ئەمــشــەو باز لە خــوێنا مــەوجــە باڵینم
عوروجی سەند لە (صەنعان) وەضعی ئەحواڵم لە ڕێی عەشقا
مــەگــەر ئوســتــادی تەرســایە، بەخــەصلەت یاری بێ دینم
چ جای دڵ، جـان لە شـەوقـا خوێن بەچاو دێنێ ئەگـەر جارێ
خــەفـا بێ، پێی ســەگی کـاتن حــەنایی، ئەشکی خــوێنینم
لـە غــەم ئێــســتــەم دەبینی وای دەزانن ئەووەڵی دەردمــە
دەمــــێکە بێ خــــودی هـیـــجــــری دیار و یاری دێرینم
ئەگــــــەر دوورم بەلەش، ئەمما بـەدڵ بیلـلا لەگــــەڵ تۆدام
لە ئەحـــــواڵی وڵات ئاگــــام و بووەتە مــــایەیی شــــینم
شــەهیدم من وەرن مــەمــشــۆن و دەفنم کـەن دەخـیل یاران
لە قــەبرا حـوجـجـەیی حــەشـرە سـەراپا بەرگی خــوێنینم
بڵـێن با (یار) لە وەختــی مـردنا، زوو بێـتـە سـەر شـیـوەن
قــبــووڵمــە گــەر صـــەدای ئەو بێ، لەباتی دەنگی یاســینم
خــەیاڵی وردی (کــوردی) هەرکــە دێتــە گــەردنم هەر شــەو
بەڕەنگــی گــــــۆشـــــەوارەی تۆ دەبـاری ئەشکی ئەبـرینم
لە کـۆی عـەشـقـا دوو صـەد کـێـوی جـەفـابارن لەسـەر شـانم
یەقین (ســالم) لە مــیــحنەتدا منیش فــەرهـادی شــیــرینم

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە وەڵامەی (سالم) دووانە ئەوانیش (عن، نم/١)ن و هێشتە چاپیش نەکراوە.

ئەم جیاوازییانەی خوارەوەش لەم هەڵبەستەدا هەیە لە نێوان ئەو دوو سەرچاوەیەیدا و (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

لە تاکی سێیەمدا – پێی سەگی کاتن (نم/١): پی سگی کەوت بی.

لە تاکی چوارەمدا – بێ خودی هیجری دیار و (نم/١): بی خودم یاران بیادی.

تاکی پێنجەم لە (نم/١)دا نییە.

لە تاکی هەشتەمدا – وردی (کوردی) هەر (نم/١): دەست لە هیجرانا.

گەردنم (نم/١): گردنت.

ئەشکی ئەبرینم (نم/١): اشکی پروینم.

بێ گـومـان وشـەی (کـوردی) لەم دوا تاکـەدا مـەبەست لـە خـودی (کوردی)یە وەک (کوردی)ش ناوی سالمی لە دوا تاکی هەڵبەستەکەیدا هێناوە.

٣٤

## چاوەکەم

١- چاوەکەم خۆ من برینداری خەدەنگی چاوی تۆم،<br>
زار و بیمار و گرفتاری کەمەند و داوی تۆم

٢- وێڵ و سەرگەردان و خوار و عاجز و ئاشوفتەحاڵ<br>
دڵ بەتاڵانچووی سوپای کاکۆڵی تێکئالاوی تۆم

٣- گەر دەپرسی داد و گریان و فیغانم بۆ چییە؟؟<br>
ڕاستە ئازیز مردەنیم، ئەمما جگەر سووتاوی تۆم

٤- صەد کە تۆ فیکری ئەسیری خۆت نییە ئەمما ئەمن<br>
خوا دەزانێ، خۆ کە ڕۆژ (بێ خورد) و شەو (بێ خاو)ی تۆم

٥- من لەبەر پیری قەدم خەم نەبووە گەر باوەڕ دەکەی<br>
قەد خەمیدەی فیرقەتی بالای وەکو لاولاوی تۆم

٦- قاتیلی من کەس نییە، بوختانی ناحەق بۆچ بکەم؟<br>
من شەهیدی خەنجەری موژگانی تازە ساوی تۆم

٧- هەر کەسە؛ عەبد و مورید‌ی مورشدێکە سا ئەمن<br>
هەر وەکو (هیجری) مرید و جانفیدای هەمناوی تۆم

........................................................................

١- خەدەنگ: برژانگ، موژگ، موژیلان، برژۆڵە.

زار: لاواز، ناتوان، گریاوی بەکوڵ و دڵ.

بیمار: خەستە، نەخۆش، دەردەدار، دەغەزار.

گرفتار: گیرۆدە، تووشبووی دووپاتە.

کەمەند: پەتێکی قوڵفە کراو بووە لە جەنگدا ئاڕاستەی دوشمن کراوە، بۆ بەیدەس بوون و بەدیل گرتنی - یا - هەمان پەت بۆ گرتنی ولاخی بەلەسەیە.

داو: جۆرە تۆڕێکە وەک (داو) بۆ مەل پێ گرتن و مەبەست لە مووی سەری خۆشەویستە.

**سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە:** (عن، گل/٦، گل/٩، کش، ف، ش، ر، ما، جل، ص، م، ق١، ق٢، ق٤، نم/١) و (گ/٢، س، گ/٣، ئا، کم) و (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە.

ئەم پارچە هەڵبەستە لە (عن)دا ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوەی لەسەر نووسراوە: (کلام مصطفی بیک کردی در بارگاه حضرت قطب العارفین شیخ عبدالقادر گیلانی رضی الله عنهما فرموده – علی –). واتە: (وتە «هەڵبەست»ی مستەفا بەگی «کوردی»یە لە بارەگای حەزرەتی قوتبولعاریفین شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غەوس)دا هۆنیوەتەوە خوا لێیان ڕازی بێ – عەلی –).

بریندارى (ش، ما): بریندار.

خەدەنگی (ر): غدنگ.

خەدەنگی (ش): خدنگ.

چاوی (ص): نسخە: روی.

گرفتاری (ئا، ش): گرفتار.

کەمەند و (کش، ر، ق١، ق٢، ق٤): کمندی.

کەمەند و (ش، ف): کمند.

کەمەند و (ما): کمندا.

٢– وێڵ: ڕەهەندە.

سەرگەردان: دەربەدەر.

خوار: چەوتاوە لە غەمدا، (کۆماوە).

عاجز: مات، پەست، ناتوان.

ئاشوفتەحاڵ: سەرسام، تەنگاو، دڵگران، پەرێشان، پەشێو، شێواو.

سوپا: لەشکر.

وێڵ و (ش، کم): ویل.

سەرگەردان و (ش): سرگردان.

خوار و (ش): خوار.

حاڵ (ش): دڵ.

٣– داد: هاوار.

فیغان: گریان، ڕۆڕۆ، هاوار، شیوەن.

ئازیز (عەزیز): خۆشەویست، دۆست.

مردە: مردووە.

ئەم تاکە لە (ر)دا نییە.

فیغانم (ئە، کش): فغانت.

ئازیز (کم، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): باوک.

ئازیز (ئا): عازیز.

مردە (گ/٢، س، گ/٣، ش): موردە.
جگەر (ف): نسخە: منم.
٤- بێ خورد: بێ خۆراک، دڵ لە خواردن گیراو.
بێ خاو: بێ خەو، خەو زڕاو، شەو بێدار.
ئەم تاکە لە (ر)دا سێیەمینە.
نییە (ص، گل/٦، ر): نەکەی.
خوا دەزانێ (ف، کش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): خۆ دەزانی.
خۆ کە (کش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): چونکە.
شەو (ر): شب.
بێ خاوی (ر): بیخواب.
لە (ش، ق١، ق٢، ق٤)دا نیـو باڵی دووەمی تاکی دوایی لە جێگەی نیو باڵی دووەمـی ئەم تاکی چوارەمینە دانراوە.
٥- قەد: باڵا.
خەم (خەمیدە): کۆماوە، چەماوە.
ئەم تاکە لە (ر)دا چوارەمینە.
نەبوە (ما): نبو.
نەبوە (نم/١، گ/٢، س، گ/٣): نەبووە.
ئەر (نم/١): گەر، ئەگەر.
فیرقەتی (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): قامەت و - ئەمەش ناگونجێ.
باڵای وەکو و(ما): بالای.
وەکو (ف، ر، ش): وک.
لە (ش، ق١، ق٢، ق٤)دا نیو باڵی دووەمی تاکی پێشـوو لە جێگەی نـیو بـاڵی دووەمی ئەم تاکی پێنجەمینە نووسراوە.
٦- تازەساو: تازە سووراو، تازە تیژکراو، تازە لە هەسان و برِبەنددراو.
ئەم تاکە لە (ر)دا پێنجەمینە.
بوختانی (ف): بهتان.
شەهیدی (ش): شهید.
خەنجەری (ش): خنجر.
موژگانی (ش): مژگان.
تازە ساوی (ر): نازە چاوی.
مـوژگانی تازە سـاوی (م): مـوژگان و نازی چاوی تۆم - ئەمـەش جـوانە، ئەگەر لە سـەرچاوەی

کۆنیشدا بووبووایە، بەبنکە جێگیرم دەکرد.

٧- عەبد: بەندە، خولام، کۆیلە.

مورید: هەواداری شێخێک یا طەریقەتێک، دەروێش، سۆفی.

مورشید: (ئیرشادکەر) و مەبەست لە شێخە، پیر.

جانفیدا: گیانفیدا، پێشمەرگە.

ئەم تاکە لە (ر)دا شەشەمینە و لە هەمووانیشدا دوا تاکە.

هەر کەسە (ر، ما، نم/١، ف، ئا): هەر کەسێ.

هیجری (جل): کردی.

موریدی (ش): مرید.

موریدی (ف): مرید و.

موریدی (ر): اسیری.

هەم ناوی (ما، کش، ئا): هاوناوی - مەبەست لە (قادر)ە کە ناوی خوایە کە لەگەڵ ناوی شێخ عەبدولقادرا هاوناوە. نەک وەک بە(کوردی)یانەوە، هەڵبەستووە کە گوایە ناوی (قادر) ناوێکی دڵخوازی (کوردی) بووە.

هەم ناوی (ر): ناوناوی.

هەم ناوی (ق١، ق٢، ق٤): سووتاوی.

جانفیدای هەمناوی (ف): جانفیدایی ناوی - نسخە: جانفدای همناوی.

٣٥

## توشنە لەب

١- توشنە لەب، تاکەی ڕەفیقیی وەحشیانی بەڕ بکەم،
تیغی خونڕێژت بکێشە، با گەرووی پێ تەڕ بکەم.
٢- تا، کە لێم دوورە خەطی ڕەیحانی ڕووی گوڵڕەنگی تۆ،
کوێر بم ئەر بێم سەیری ڕەیحانە و گوڵی شەست پەڕ بکەم.
٣- وا لە بۆتەی عەشقتا قاڵە ڕوخی زەردم ئیتر،
قەت لە خۆم ناگرم، لە کەس دەعوایی قەرزی زەڕ بکەم.
٤- ڕەنگی زەردیش چاکە بۆ کوێریی ڕەقیب و دوشمنان
چونکە دوشمن شادەبێ، گەر خۆم گەدا و موخطەڕ بکەم
٥- کیمیای وەصلت بەهیچ نایێتە دەستم بێ ئەوەی
بچمە (غاری مەغریب) و خۆم فێری عیلمی جەڕ بکەم
٦- من لە طەعنەی دوشمنی بێ پیر قوتار نابم مەگەر
یا خودا مەرگی بدا، یا هەردوو گوێی خۆم کەڕ بکەم
٧- قەت مەڵێن یاران لەگەڵ فیرقەت وەرە سازش بکە
شێت نەبووم وەک پەششە خۆم هاوتووشی بای سەرسەڕ بکەم
٨- من لەگەڵ جەور و جەفا، ئەر لافی ئولفەت لێ بدەم،
هەر وەکو ئاهوو، دەبێ خۆم جووتی شێری نەڕ بکەم
٩- پێم دەڵێن «کوردی» فلانکەس یادی دووریی تۆ دەکا،
من لە ئەو چاک شارەزام، بەخودا ئەگەر باوەڕ بکەم.

---

١- توشنە: تینوو.
لەب: لێو.
بەڕ: دەشت و بیابان.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/٤، ف، جلی، ش، نم/١، با)یە لەگەڵ (کم، گ/٢، س،

گ/٣)دا و (کم)م کرده بنکەی لێکۆڵینەوەی.

توشنه (ف، ش، نم/١): تشنه.

خونرێژت (گ/٢، س، گ/٣): خوێنرێژت – گۆڕینی (گیو)ە و لەنگی کردووە.

با گەرووی (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): تا دەمی.

با گەرووی (ش): تا گروی.

٢– ڕەیحان: ڕووەکێکی ڕەش و مۆر، یا کەسک ڕەنگ و بۆن خۆشە (ڕەیحانی) جۆرە نووسینێکە (خەططی ڕەیحانی) و مەبەست لە گەندەمووی ڕووە.

شەست پەڕ: گوڵێکی خەنەیی و زەرد و سوورە – مەبەست لە ڕووە گوڵڕەنگەکەیە.

تاکە (گ/٣): تاکی.

گوڵڕەنگی (نم/١): گلزاری.

بم ئەر بێم (ش): بیم گر.

ڕەیحانە و (یا – ڕێحانە و): (کم، جلی، ش، گ/٢، س، گ/٣): ڕیحان و.

شەست پەڕ (عن، گل/٤، ف، نم/١، با): شصت پر.

٣– قاڵ: تواوەی پوختە – گوایە ڕووی خۆی کردووەتە زێڕی قاڵکراو.

ئیتر (ف): ایدی.

دەعوای (جلی، ف، نم/١، کم، جل): مطلوبی.

دەعوای (گ/٢، س): داوای. – دەعوای (گ): داوایی – ئەمە دەسکاریی (گیو)ە.

٤– موخطەر: ناچار، بێ دەرەتان.

ڕەنگی زەردیش چاکە بۆ (ف): ڕنگی زردیمە لبو، واتە کوێریی ئەوان چاک دەکاتەوە.

دوشمنان (گ/٢، س، گ/٣): دوژمنان.

دوشمن (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): دوژمن.

شادەبێ (شاد دەبێ): (نم/١، کم، گ/٢، س): شاد ئەبێ.

شادەبێ (گ/٣): شاد دەبی – ئەمەش بۆ کێش قورسە و کەمێ لەنگی دەکات.

گەر (ف): هەر.

گەر (جلی): یار.

٥– کیمیا: هەرچەند ناوی زانستییەکە بەڵام مەبەس لەو هەوێنەیە کە زێڕی پێ دروست دەکەن، ئەمجا هۆی (وەصل)ەکەی بەو هەوێنە داناوە کە ئەویش کەم کەس زانیویە.

غاری مەغریب: ناوی ئەشکەوتێکی ئەفسانەییە، گوایە ئەوی لەوێدا مەشقی زانستی دڵخواز کێشکردن: (عیلمی جەڕ) فێربوونی جادووگەری بکا دەستی دەکەوێ.

بەڵام لە پەڕاوی و سەرچاوە پەڕاوییەکاندا باسی ئەم ئەشکەوتەم چنگ نەکەوت کە سەر تا خواری مەغریب گەڕاوم و لەم ئەشکەوتەم پرسیوە چیم لێ ئاشکرا نەبووە.

ئەوەی (ف، جلی، کم، گ/٢، س، گ/٣): ئەمە.
ئەوەی (نم/١): أمەی.
ئەوەی (ش): ایستکە – نسخە: امە.
٦- طەعنە: توانج، پلار.
پیر: مەبەستی شێخی تەریقەت، چاو سوورکەر، ئامۆژگاریکارە، گەورە.
قوتار: ڕسگار، ڕەها.
دوشمنی (گ/٢، س، گ/٣): دوژمنی.
بێ پیر (گ/٢، س، گ/٣): بێ بیر.
مەرگی (واتە مەرگی دوشمنەکە) (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): مەرگم.
٧- سازش: ڕێککەوتن، ئاشتی، گونجان، هاوئاهەنگی.
پەششە: مێشوولە، هووڕە (هوڕە).
سەڕسەڕ (صَرْصَرْ): بای زۆر بەهێز و سارد.
مەڵێن (ش): نلین.
خۆم هاو (نم/١، گ/٢، س، گ/٣): من خۆم.
تووشی (ش): هاوتوش. ئەمیش لەنگە.
٨- ئولفەت: هۆگری، دۆستی، ڕاهاتن.
نەڕ: نێر، شێری گەورە و غوباب.
ئەر (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): گەر.
جووتی (ف، ش): جفت.
شێری (ف): شیر.
٩- فلآن: بیڤان، فیسار.
بەخودا (نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): بالله (واتە: بیللا).

٣٦

## لەیلەکەی بێ مەیلەکە

١- لەیلەکەی بێ مەیلەکەی، مەحبووبەکەی، عەییارەکەم
شۆخەکەی، بەدبەختەکەی، بێ ڕەحمەکەی، غەددارەکەم.
٢- ظاڵمەی، لە خودا نەترسەی، کافرەی، بێ مروەتە،
قاتیلەی، عاشق کوژەی، جەللادەکەی، خونخوارەکەم.
٣- گوڵ بەدەن، سیمین زەقەن، خەط یاسەمەن، فندق دەهەن،
ئەسمەرەی، قەد عەرعەرەی، ناز و، نەزاکەت، دارەکەم.
٤- لەیلەکەی، چاو مەستەکەی، دڵ بەستەکەی، نەوڕەستەکەم،
حووریی (جەنناتو، تەجری تەحتەهالئەنهار)ەکەم.
٥- نەوجوان، ئەبرۆ کەمان، شیرین زوبان و، نوکتەدان،
تورک ڕەفتار و، پەری ڕوخسار و، پەرچەم دارەکەم.
٦- گەر ڕەقیب صەد جار دەرم کا یا جنێوم پێ بدا،
ناعیلاجم، هەر دەبێ بێم، بۆ صیلاحی کارەکەم.
٧- ژەهری دووری چەشتوە (هیجری) ئەمێستا بۆیەکە،
تەڵخ گوفتارە کەلامی لەعلی شەککەر بارەکەم.

..........

١- بەدبەخت: مەبەست لە (بێ ئامانی و دڕی و خراپی) کەسەکەیە نەک بەختەکەی بەد بووبێ.
غەددار: ستەمکار.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە: (عن، گل/٦، گل/٨، کش، ص، کو، ف، ف/١، جل، جل - نسخە، ش، ما، م، با، نم/١) وە (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لەمانە (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
عەییارەکەم (ما): غەددارەکەم - هەروەک (غەددارەکەم) لەم سەرچاوەیەدا پاش و پێشە.
بەدبەختەکەی بێ ڕەحمەکەی (جلی): بی رحمکەء بدبختەکی.
بەدبەختەکەی (گ/٣): پڕ خەمڵەکەی.
٢- لە خودا (ف، نم/١، کش، کو، کم، گ/٢، س، گ/٣): لە خوا.
کوژەی (کش، کو، ش): کشەء.

٣- ناز و (کو، ش، ما): نازک.

٤- نەورەستە: تازە هەڵچوو، تازە پێگەییو.

حوریی (جَنَّاتُ تَجْرِي تَحْتِها الأنهار) دیاردەی ئایەتی ١٣٦مینە لە سوورەتی (ئال عیمران) لە قورئاندا بەواتە: پەریی ئەو بەهەشتانەی کە ڕووباریان بەژێردا دەڕوات.

ئەم تاکە لە (عن، گل/٦، گل/٨، ف)دایە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٥- نوکتە: مەبەستی لە (بچووکی)ی دەم و زمان شیرینییە.

ئەم تاکە لە (جل - نسخە)دا سێیەمینە و لە (کش، کو، ف/١، ش، ما، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا چوارەمینە.

نەوجوان (جلی - نسخە) و... جوان - داراوە.

زوبان و (ف، ف/١، کو، ش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): دەهان و.

زوبان و (ما): دهان.

نوکتە (گ/٢، س، گ/٣): نیکتە.

پەرچەم (کو، ف، ف/١، ش، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): کاکۆڵ.

ڕەفتار (ما): ڕوخسار - هەروەها لە جێگەی (ڕوخسار)یش (ڕەفتار)ی نووسیوە.

٦- عیلاج: چاککردنەوە، ڕاپەڕاندن، ڕێکخستن، (عیلاج)ەکەی تر مەبەست لە (ناچاری)یە.

ئەم تاکە لە (جل - نسخە)دا نییە و لە (کش، کو، ف، با، ش، ما، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە.

گەر (کش، کو، ف، جلی، ف/١، ش، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): ئەی.

جار (ص): بار.

دەرمکا (ما): دەرم م کەیء.

دەرمکا (کش، کو، ف، ف/١، ش، نم/١، کم، گ/٢، جلی، س، گ/٣): درمکەی.

جنێوم (م، گل/٦): جوێنم.

جنێوم (گ/٣): جووێنم - نووسینی (گیو)ە.

بدەی (ما): بدەء.

ناعیلاجم (ما): بێ عیلاجم.

٧- ئەم تاکە لە (جل)دا پێنجەمینە و لە (کش، کو، ف/١، با، ش، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لە هەموو سەرچاوەکانیشدا دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

دووری (کو، کش): دوریم.

چەشتوە (نم، ف، ف/١): چشتووە.

چەشتوە (کو): چیشتوە.

چەشتوە (گ/٢، س، گ/٣): چەژتوە.

بۆیەکە (ف، ف/١): بویکا.

بۆیەکە (ما، کو، ش): بویکان.

بۆیەکە (کش): بویەمن.

بۆیەکە (گ/٢، س، گ/٣): بۆیەوا.

گوفتارە (ما): کفتار.

لەعلی (ما، نم/١): لعل – «لەعلی شەککەر بار لێوی ئاڵی و شیرینی خۆیەتی» –.

هیجری (جلی): کردی.

نازناوی (هیجری) لەم تاکەدا کە لە (دووری) دەدوێ ئەوە دەگەیەنێ کە (کوردی) لە گەڕۆکیدا نازناوی (هیجری)ی خستووەتە هۆنراوەیەوە.

## عەزیزا

١- عەزیزا! من ئەسیری قامەتی نەوتووڵ نەمامێکم
غولامی زوڵف و ئەگریجە و غولامانەی شەمامێکم

٢- گرفتاری کەمەندی، مەهوەشێکم، توند و، بێ ڕەحمە
خەریک و، وێڵ و وەحشی جادوویی، شیرین کەلامێکم

٣- جگەر خوێنین و چاو ئەسرین و غەمخوار و دڵ ئەفگارم
هیلاکی ناز و عیشوەی نیو نیگای ئاهو و خەرامێکم

٤- هەموو عومرم بەضایع چوو لە ڕێگەی عەشقدا ئامان
کە دووچاری سیهام و دامی عەشقی طیفل و خامێکم

٥- ڕەواجی سیککەیی صاحیبقرانی و فەخری میللەت بووم
ئەمێستا زار و سەرگەردانی گەرداوی عەوامێکم

٦- شەهی ئیقلیمی عەشقم، پیری ڕەندانی خەراباتم
ئەگەرچی ظاهیرا سادە و نەزان ئەبلە فامێکم

٧- ئومێدی وەصل و دیداری نەما (هیجری) لە داماوی
هەمیشە ئینتیظاری نامە و پەیک و سەلامێکم

---

١- عەزیزا: ئەی عەزیزم، ئەی خۆشەویست.
غولام: بەندە، کۆیلە.
نەوتووڵ: تازەتووڵ، نەونەمام، کچۆڵەی مەبەستە تازەپێگەییو.
غولامانە: کاکۆڵ، جۆرە سوخمەیەکی نێر و مێی کۆنی کوردانەیە، کە (کوردی) ئەمەیانی مەبەستە.
شەمام: شەمامۆکە، مەبەستی لە جوانی و بۆنخۆشی و ڕەنگینیی خۆشەویستەکەیەتی.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە (شح، عن، یح، مع، گل/٦، جل، جل: نسخە، ف، ما، ر، ص، م، با، نم/١) وە (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە کە لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە.
عەزیزا (ما، جلی: نسخە، ر، نم/١، ف، کم، گ/٢، س): عەزیزان.

عەزیزا (گ/٣): عەزیزم.
تووڵ (ف، ما): طول.
زوڵف و (ف): کاکۆڵ و.
ئەگریجە و (ص، با، یح): کاکۆڵ و.
ئەگریجە و (ما، ر): ئەگریجەء.
غوڵامانەی (ر): غلامانی.
شەمامێکم (یح، ف، ما، ر، ص، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): غوڵامێکم.
جوانی لەم تاکەدا جیناس ئارایی لە (غوڵام و غوڵامانە) دایە.
٢- مەهوەش: مانگ ڕوو، ماهڕوو.
کەلام: وتە، قسە.
کەمەندی (ر): کمند.
نیـو باڵی دووەمی ســەرەوە لە (ر، مـا، گ/٣)دا لەگـەڵ نیـو باڵی دووەمی تـاکی دوایـیدا پێش و پاش و ئاڵوگۆڕ کراون. بڕوانە ئەوێ.
مەهوەشێکم (جل، ما) و (جل: نسخە): معشوقێکم.
مەهوەشێکم توند و (یح): شێوەء هقکیکی؟؟
مەهوەشێکم توند و (ر): شقشقەی کم طفل.
مەهوەشێکم توند و (ما): شیعەیکی طفلی.
توند و (ف، جلی، جلی: نسخە، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): طفل و.
بێ ڕەحمە (یح): نادانم.
بێ ڕەحمە (ف، ما): بی رحمم.
وێڵ و (ف): دیل و.
جادوویی (یح، ف، گ/٣): مهوشی.
جادوویی (نم/١، کم، گ/٢، س): آهوی.
کەلامێکم (ف، نم/١، کم): خرامێکم.
کەلامێکم (گ/٢، س، گ): خەرامێکم.
نیـو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (جلی) و (جلی: نسـخـە)دا، بەم جۆرەیە «هلاک ناز و عشـوی نیم نگای آهو خرامیکم» ئەمیش نیو باڵی دووەمی تاکی دواییە و ئاوێتەی ئێرە بووە.
٣- ئەفگار: ماندوو، بەئازار، بریندار، زامار (زامدار)، دەردین.
هیلاک: مردوو، کوژراو، شەکەت.
عیشوە: لەنجە.
نیم نیگا: نیو نیگا.
خەرام: ڕۆیشتنی بەناز، (وەک هی ئاسک).

ئەم تاکە لە (ف، ر، نم/١، کم، گ/٢، س، یح)دا نییە و لەوانی تردا سێیەمینە، بەڵام لە (ما، گ/٣)دا نیو باڵی دووەمی تاکی پێشوو لە جێگەی نیو باڵی دووەمی سەرەوەیە.
غەمخوار و (ما، گ/٣): خوێنخوار و – ئەمەش هەڵەیە و واتا نادا.
٤– ضایع: گوم بوو، بەفیڕۆ چوو.
سیهام: تیرەکان.
ئەم تاکە لە (یح، ف، نم/١، ر، کم، گ/٢، س)دا: سێیەمینە.
لە ڕێگەی (ر): لە ڕێگای.
لە ڕێگەی (یح): لریکەء.
عەشقدا (ما، ر، جلی، جلی: نسخە)، جل، جل: نسخە)دا: عاشقی.
عەشقدا (گ/٢، س، گ/٣)دا: عیشقدا.
ئامان (یح، جل، جل/نسخە، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: چونکە.
کە دووچاری (یح، ما، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: گرفتار و – ئەمەش دووبارەیە و بڕوانە تاکی پێشوو (گرفتار).
سیهامو (یح): اسیر و.
سیهامو (ما): اسیر.
دامی (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): داوی.
دامی (یح): دام.
طیفل و خامێکم (یح، ما، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا: طفل فامیکم.
عەشقی (یح): عشق. لە جێگەی نیو باڵی دووەمی ئەم تاکی چوارەمینە لە (ر)دا نیو باڵی تاکی دووەم نووسراوە، بەڵام لە جێگەی (جادویی) ئەو نیو باڵە ئاوێتەیە (مهوش) نووسراوە. نیو باڵی دووەمی تاکی دووەم کراوە بەنیو باڵی ئەم تاکە لە (جل) و (جل: نسخە)دا.
٥– ڕەواج: برەو.
سیککەیی: نەخشی پارەی مەعدەنی (هی دراوی کانی).
صاحیبقران: فامیلیای (کوردی) و مەبەست لە بەرزێتیی چینی کۆمەڵایەتی و پلەی ڕۆشنبیریی خێزانەکەیەتی.
فەخری: شانازیی.
میللەت: گەل – مەبەس لە گەلی کوردە.
گەرداو: گێژ، گێژنگ.
عەوام: مەبەست، ڕەشەگەلی، نەخوێندەوار، مسکێن.
ئەم تاکە لە (یح، جل، ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا چوارەمینە و لە (جل: نسخە)دا نییە.
سیککەیی (یح): سکّەء.
سیککەیی (ما، ر): سکەی.

سیککەیی (کم): سکەی.

سیککەیی (ف، نم/١): سکەیی.

صاحیبقرانی و (یح، ر، ما): صاحب قران.

صاحیبقرانی و (ف): صاحب قرانُ.

صاحیبقرانی و (کم، گ/٢، گ/٣، س): صاحبقرانی.

فەخری (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س): ملک و.

فەخری (گ/٣): ملّک و.

فەخری (یح، ر): فخر.

ئەمێستا (ما): امیسته – نسخه: امیستاکه.

ئەمێستا (یح): اویسته.

زار و (یح، ما، نم، کم، گ/٢، س، گ/٣): ویل و.

زار و (ر): ویل. بڕوانە تاکی دووەمین کە (وێڵ) دووبارەیە.

زار و (ف): ویلی.

سەرگەردانی (یح، ما): سرکردان.

سەرگەردانی (ر): سرکردانی.

سەرگەردانی (ف): سرگردان و.

گەرداوی (ما): لرداوی.

گەرداوی (یح): کرداری.

گەرداوی (جل): کیرودی.

جوانی لەم تاکەدا جیناسی وشەی (عەوام) لەگەڵ گەرداو و صاحیبقرانەکەدا (لەف و نەشر)ە.

٦– شەھ: پاشا.

خەرابات: کاولانی، وێرانەیی.

ظاهیر: ئاشکرا.

ئەبلە: گەوج.

فام: تێگەیشتن.

ئەم تاکە لە (یح، ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا پێنجەمینە و لە (ر)دا چوارەمینە.

ئیقلیمی (یح، ما): اقلیم.

ئیقلیمی (ر): اقلیم و.

عەشقم (ر، جل، جل، نسخە): عشق و.

عەشقم (یح، ف، نم/١، ما، کم): عشقم.

عەشقم (گ/٢، س، گ/٣): عیشقم.

پیری (یح، ما، ر، جل، جل: نسخە): پیر.

ڕەندانی (یح، ما، جل، جل: نسخە): رندان.

ظاهیرا (یح، کم): ظاهراً.

ظاهیرا (جل: نسخە): ظاهران.

سادە و (ف، نم/١، ر، کم، گ/٢، س): طفل و.

سادە و (ما، یح): طفلی.

سادە و (گ/٣): طفڵ و.

سادە (جلی): طفل.

نەزان و (ر): ندان و.

٧- ئومێد: هیوا، ئاوات.

دیدار: بینین، دیدەنی.

ئینتیظار: چاوەنواڕ.

پەیک: تەتەر (نامەهێن). (پەیک) تیریش دەگرێتەوە.

سەلام: سڵاو، ئیکلام.

ئەم تاکە لە (یح، ف، نم/١، ر، کم، گ/٢، س)دا شەشەمینە.

وەصل و (یح، ر، ما): وصل.

دیداری (ما): دیدار.

دیداری (ر): دیدارم.

نەما (ر، ما): نماوە – ئەمیش لەنگە.

هیجری (جل): کردی.

لە داماوی (یح): امیستاکە.

لە داماوی (نم/١، ف، جلی، ما): امیستاکە.

لە داماوی (جل، کم، گ/٢، س، گ/٣): ئەمێستاکە.

لە داماوی (ر): ایستاکە – ئەمیش لەنگە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (یح)دا نییە و یا بەر وێنە ئۆفسێت نەکەوتووە کە لەوێدا تەنیا پێنج تاک و نیو باڵی یەکەمی سەرەوە هەیە.

هەمیشە (ما): بدایم.

ئینتیظاری (ما، ر): انتظار.

نامەو و (ر): نامەء و.

نامەو و (ما): نامو.

نامەو و (ف): نامەء.

نامەو و (نم/١، کم، گ/٢، س): نامەیی.

پەیک و (ما): پیک.

# ن

٣٨

## ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان

١- ڕەفـــیـــقـــان من ئـەوا ڕۆیم لە لاتـان
لە مـەظلوومـان، بلا چـۆڵ بێ (ویلا)تان

.................................................................

**١- ئەم تاکە هەڵبەستە:**

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە، هی (نالی)یە، بەبۆنەی ناچار کرانیەوە بۆ (ڕەهەندەبوون) لە (سولەیمانی) و بۆ دوا جار (ڕووکردنە بیانی)؛ دایناوە.

بەپێی دەستووری وێژەی کۆن؛ (کوردی) ئەم تاکەی کردووەتە سەرەتای هەڵبەستەکەی خۆی و ئەو کارەش بە(تەضمین) واتە (جێ تیاکردنەوە) ناوبراوە.

بەوەدا هەڵبەستەکەی (کوردی) لەسەر (کێش: وزن) و (پاشبەند: قافیە)ی هەڵبەستەکەی (نالی)یە، ئەو کارەش بەپێی هەمان دەستوور، بە(ڕەدیف) = (هاوچەشن) ناوبراوە و کارێکی (ڕەوا) و (باو)ی هۆنەرە کۆنەکان بووە.

**جیاوازییەکانی ئەم تاکە لە سەرچاوەکانیدا:**

ڕەفیقان (گل/٣، ر، نم/١، نم/٣، نم/٣: نسخە، کم، مد/١، عن): عزیزان.

ڕەفیقان (گ/٢، س، گ/٣، برایی، ڕۆشنبیری نوێ، بەیان، ئاسۆ): عەزیزان.

ڕەفیقان (یح): عزیزم.

ڕەفیقان (پەیام): ئەزیزان – ئەمە دەستکاریی (تۆفیق وەهبی)یە.

لە مەظلوومان بلا (مد/١): بلا مظلومان.

چۆڵ (عن): خۆش – ئەمەش بەجێیە و، دەگونجێ.

چۆڵ بێ (ف/١، نع: ٣ نسخە): چول بو.

ویلاتان (جگە لە: عن، ن، ص، حم): لەهەموو سەرچاوەکانی تردا: (ولاتان، وولآتان) نووسراوە. لەبەرئەوەی کە پاشبەندی (وولآتان) لە تاکە هەڵبەستی دووەمی هەڵبەستەکەی (نالی)دا دیسانەوە (وولآتان) دووبارە بووەتەوە، وە بەپێی دەستووری وێژەی کۆن، لە پارچە هەڵبەستێکی حەوت تاکی و کەمتریدا، وەک ئەم هەڵبەستەی (نالی)؛ نابێ (پاشبەندێک) دووبارە ببێتەوە، دووبارەبوونەوەی بەکارێکی لاواز دادەنرێ، مەگەر لەو جۆرە هەڵبەستانەدا کە هەموو پاشبەندەکانی (یەک وشە) بن ئەو سایەش وشەگەلی پێش ئەو (پاشبەندە یەک جۆرانە)

دەبنە پاشبەندی دووەم، کە نابێ ئەوانیش دووبارەبوونەوەیان تیا بێ.
(نالی)یش کـە مـامـۆسـتـای هـەڵبـەست و دەسـتـووری وێژەی کۆن بـووە، ناشێ ئەو پاشبـەندی (وولاَتان)ەی لە دوو تاکە هەڵبەستی یەک بەدوای یەکدا دووبارە کردبێتەوە.
بۆیە مـن بەپێی ئەو سـەرچاوە نیـشـانە بۆ کـراوانـە، لەم یەکـەمین تاکـەدا پاشـبـەندی وشـەی (ویلاتان – بەواتە: دەرباری و کۆیلەیەتییـان)م هەڵبژارد کە بەهێزترە، ئەوەتا (نالی) لـەم یەکەم تاکەیدا، ئەو ڕەفیـقانەی کە بەڕێیـان کـردووە بە(مـەظلومـان)ی دەستی ڕژێمـی عوسـمـانی و بە هاودەردی خۆی داناون.
ئەمـە جگە لەوەی کـە (نالی) لە یەک (وولاَت) چووەتە دەرێ کە هـەرێمی ئـەوسـای (سـولەیمانی) بووە، نەک لە چەند ولاَتێک و، هەروەهـا ئەو هاوالاَنەی (نالی) لە یەک ولاَتدا بوون کە قەڵەمڕەوە کـۆنـەکـەی (بابان) بـووە، نەک لە چەنـد ولاَتێکدا بـووبن، لەبەر ئـەمـانە نابـێ (نالی) لەم تـاکـەدا وشـــەی (وولاَتان)ی گــوتـبێ و، بێ گــومـــان وشـــەی (ویلاتـان)ەکــەی وتووە، بەشـکو وشـــەی (وولاَتان)ەکە لە تـاکی دووەمـدا پڕ بەپڕ و گـونجـاوە و، نەخـوازەلاَ (نالی) ئەو سـەفـەری (هـات و نەهـات)ەی بەرەو (وولاَتان) بووە نەک یەک (وولاَت).
لەم یەکەمین تاکەدا (نالی) ڕووی دەمی کـردووەتە ئەو هاواڵە بەڕێکارانەی و، پێی گوتوون: دەبا دڵ و دەروونی ئێوەی (مەظلوومان)، لە(ویلا = دەرباری)تان چۆڵ بێ، بەرامبەر بە(عوسمانی)ی (ظالم)، کە ئێوەی (مەظلووم) کردووە، وەک من (نالی).
لە جێگەی نیـو باڵی دووەمـی ئەم تاکە هەڵبـەسـتـەی سـەرەوە لە سـەرچاوەی (یح)دا، نیـو باڵی تاکی چوارەمی هەڵبەستەکەی (نالی) نووسراوە.
هـەروەک لە (ئـا)دا ئەم نیـو باڵی دووەمــەی ئێـرە لە تاکی چوارەمی هـەڵبـەسـتـەکـەی (نالی)دا، دووبارەیە.
هـەر ئەم نیو باڵییەی ئێرەش لە (ئاسۆ)دا لە تاکی نۆیەمی پارچە هەڵبەستەکەی (کوردی) دایە.

## هەڵبەستەکەی کوردی

١- ڕەفـــیـــقـــان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان
لە مـــەظلوومـــان، بلا چۆڵ بی (ویلا)تان
٢- کـە ئێـوەن پادشـــای لوطف و عـــەداڵەت
گـــەلێ حـــەیفـــە بڕەنجـــێنن گـــەداتان
٣- لەســـەر حـــەق نیگەهدارتان خـــودایە
مـــوبارەک بی هەزار دەفـــعـــە ســـەراتان
٤- وەرن بنوارنە چاوی پڕ لە خــــوێنم
بەتەفـــصـــیـــلات ببـــینن مـــاجـــەراتان
٥- لە بێگانە گــــەلی خـــــو چاترێکە
چ دادێکتـــان دەدا چقـــقـــەی کـــولاتان
٦- لە دوای قـــەبری ئەلی گـــێـــز و گـــوڵنگە
بەمـــــەرگی ئێـــــوە ســــا نادا دەواتان
٧- مـــەگـــەر خـۆتان بەگـورجێ بێنەوە دەست
ئەگـــەر نا تازە چوو حـــوکـــمی ڕەواتان
٨- نەســیـمی کـۆیتان خـاطر دەکا ســەرد
بەبۆی صـــوورەی پەشـــێـــوی ناتەباتان
٩- بە چی وا خـــوڕڕەمن، ئاخـــر لە بو کێ؟؟
نیکاحی باطیلە ســـــاز و ســــەواتان
١٠- منیش بۆ ئاخــــرە داد و فـــیـــغـــانم
مەکەن ئیخلافی ئەو وەعدەی کە داتان
١١- ئەگـــەرچی خـــاک و خـــۆڵی ڕەهگوزارم
بەســـەرمـــا خـــۆ گـــوزەر ناکـــا صـــەباتان
١٢- هەتا من بێ هەواتر بووم، بەصـــەد ڕەنگ
لە دەرحـــــــەق من زیاتر بوو هەواتان

١٣– هەتا دوێنێ لە مەجلیس تاقە گوڵ بووم
ئەوا (بووم)ە، لە جێی شێخ و مەلاتان
١٤– کە من ڕۆیم جەهەننەم پڕ مەکەن لێم
لە من خاڵی مەکەن کۆشک و سەراتان
١٥– موحەققەقمە، کە (هیجری)ی غوربەتیشم
ڕەهام ناکا، لە (تیـر)ی لابەلاتان

.................................................................

١– ئەم تاکە هەڵبەستە یەکەمین تاکە هەڵبەستەکەی (نالی)یە کە لە یەکەم لاپەڕەی (پیتی – ن) هەڵبەستی ژمارە (٣٨)دا لە ژێر سەرە ناوی: (ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان)دا نووسیومە و بەدرێژی لە هەموو لایەنێکەوە لەسەریم نووسیوە، لەبەرئەوە لێرەدا پێویستی دووبارەکردنەوەی نابینم.

٢– لوطف: دڵسۆزی، چاودێری کە مەبەستی لەوەیە پادشایەک بوون کە دەبێ هەم لوطف هەم عەدالەتی تیا هەبێ.

عەدالەت: دادپەروەری.

حەیفە: موخابینە.

گەداتان: هەژارتان، سواڵکەرتان و مەبەستی لە مسکێن و گەلە و گلەییان لێ دەکات.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٢، گل/٣، ف، کو، جلی، نم/١، نم/٣، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، برایی، بەیان/٦٤)دا دووەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیەوە، هەروەک لە سەرەتاوە بەپەراوێزەکەی (عن) بۆمان دەرکەوت کە ئەم تاکە بێ گومان هی (کوردی) و دووەم تاکە بەپێی دەستنووسی خودی (کوردی). هەروەها ئەم تاکە بەهەڵە لە (عق، بەیان/٦٤)دا دووەمینە و بەناوی (نالی)یەوە نووسراوە، دیسان لە (نم/٣)یشدا هەر دووەمینە و بەڵام بەهەڵە کراوەتە هی (غەریب) لەگەڵ ئەوەشدا لە (ئاسۆ)دا هەر دووەمینە و بەهەڵە بەناوی (مەحموود)ەوە چاپ کراوە، جگە لەمانەش لە (گل/٨، ڕۆشنبیری نوێ)دا، هەر بەهەڵە بەناوی (غەریب)ەوە سێیەمین تاکە و لە (ر)یشدا هەر بەهەڵە سێیەمین تاکە بەناوی (مەحموود)ەوە، وەک لە دوو نوسخەی (عن)یشدا چوارەمینە و بەهەڵە هەر جارەی بەناوی یەکێ لە (مەحموود) و (غەریب)ەوە نووسراوە، بەڵام (ن، ص) هەرچەند بە هی (کوردی)یان داناوە، بەڵام لەم دوو سەرچاوەیەدا پانزەیەمین تاکە، وە لەوانی تردا نییە.

لوطف (پەیام): لەتف.

گەلێ (ر، عن، نم/١، نم/٣، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، برایی، ڕۆشنبیری نوێ، ئاسۆ، جلی، بەیان/٦٢، ٦٤): بەخوا.

گەلێ (کو، یح): بخدا.

٣- نیگەهدار: چاودێری کار.

سەرا: سەرۆکی خانەدان، چاک، خاوەن پیاوەتی، بەخشندەیی، پشت و پەنا، گەورەی گەل، بەرزی – هەرچەندە بەواتە (بارەگای فەرمانڕەوا)یشە، بەڵام لێرەدا مەبەستی لەمەیان نییە، چونکە بەم واتەی دواییيان لە تاکی چواردەمیندا هاتووە – بڕوانە ئەوێ.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا بەناوی (مەحموود)ەوە سێیەمینە و لە جێگەکردنیدا، بەسێیەمین بەناوی (کوردی)یەوە لە (عن)دا بۆم ساغ بووەوە، هەرچەندە لە نوسخەیەکی تری (عن)دا بەهەڵە بەناوی (خەستە)وە نووسراوە وە لە (ن، ص)یشدا پێنجەمینە بەناوی (کوردی)یەوە، هەرچەندە نوسخەیەکی تری (عن) بەهەڵە و بەر لەوە بۆی ساغ بێتەوە هی کێیە بەناوی (غەریب)ەوە بەپێنجەم تاک نووسیویە، وەک دیسان بە هەڵە بەشەشەم تاکی (مەحموود)یشی وەرگرتووە و، لەوانی ترا نییە.

خودایە (ن، ص): خودایی.

سەراتان (ن): قەڵاتان. بۆیە لێرەدا (قەڵاتان) چونکە لە تاکی چواردەمیندا (سەراتان)ە.

سەراتان (ص): کەشاتان.

ئەم تاکە هێشتە چاپ نەکراوە.

٤- چاوی پڕ لە خوێن: مەبەست لەوەیە لەبەر گریان و خەفەتباری و بەداخەوە ڕۆژکردنەوە، چاوی خوێنی تێ زاوە و سوور بووە بەبۆنەی ئەو کارەساتەی کەوا بووەتە هۆی ئەو سەرهەڵگرتنەی (کوردی) و دەستەیەکی تریش لە هۆنەرەکان لە سولەیمانی.

بەتەفصیلات: بەفراوانی، بەدرێژی.

ماجەرا: ڕووداو، کارەسات.

ئەم تاکە هەرچەند بەپێی دەسنووسی خودی (کوردی) چوارەمین و هی کوردییە وەک لە (عن، گل/٢، ف، نم/١، جلی، کم، گ/٢، س، گ/٣)شدا هاتووە، هەروەها (کۆ، پەیام، بەیان/٦٤)یشدا بە هی (کوردی)یان داناوە، بەڵام لەواندا پێنجەمین تاکە و لە (جلی)دا چوارەمینە، دیسان (برایی) بە هی (کوردی)ی داناوە و دەیەمین تاکە، لە (گل/٣، نم/٣)شدا هەر هی (کوردی)یە و بەڵام یانزەمین تاکە و، لەم سەرچاوانەی خوارەوەشدا بەهەڵە بەناوی هۆنەری ترەوە، جێگۆڕکەی پێ کراوە، وەک لە نوسخەیەکی تری (عن)دا دەیەمینە و لە (گل/٨، ق/٣، نم/٣)شدا یانزەیەمینە و لە هەموویاندا بەناوی (غەریب)ەوەیە وە لە (عق، بەیان/٦٤)دا بەناوی (نالی)یەوە پێنجەمینە و لە (ر، ڕۆشنبیری نوێ)دا بەناوی (مەحموود)ەوە هەشتەمینە و لەوانی تردا نییە.

وەرن بنوارنە (عق، بەیان/٦٢، ئاسۆ): وەرە بڕوانە.

وەرن بنوارنە (ر، پەیام): ورن بنوارەنە.

وەرن بنوارِنە (نم/١، گم، جلی، گ/٢، س، گ/٣): وەرە بنوارِە.
چاوی پڕ لە خوێنم (ر، ڕۆشنبیری نوێ): چاو پڕ لە خوێنم.
چاوی پڕ لە خوێنم (پەیام): چاوی لە خو نیم.
بەتەفصیلات (ڕۆشنبیری نوێ، ئاسۆ): بەتەفصیلەن.
ببین (جلی): بەبین.

٥- گەلی خو یا گەلێ خۆ: گەلی خۆتان (کورد) وە یا گەلێک (زۆر) خۆیی (نابێگانە).
چ دادێکتان دەدا: چ کەڵکێکتان دەگری، کام سوودتان پێ دەبەخشێ.

چقـقـە: ئـەو نیشـانـە نایابـەیە لە زێڕی گـەوهـەربەند لە شـێـوەی پەڕێکدا دەکـرا بەسـەر و کـڵاو (سـەرپێچ)ی پاشا و فـەرمانڕەوا و گەورە گەلییەکانەوە، کە بەپێی بابانەکان لە شێوەی پەڕێکی ڕەنگاوڕەنگا، یا چەتاڵ یا چەڵەنگیشی پێ وتراوە، کە سوڵتانی عوسمانی پێشکەشی پاشا و فەرمانڕەواکانی سەر بە(عوسمانی)یان کردووە.

کـولا = کڵاو یا کـولاه: ئەو سـەروپێچـەی مـەبـەسـتـە کە ئەو چقـقـە یا ئەو چەڵەنگ یـا چەتاڵە دیارییەی سـوڵتانی پیا چەقێنراوە لە ڕێگەی بەجێـهێنانێکی کۆمـەڵایەتیدا بەقازانجی سـوڵتان.

ئەم تـاکـە بەپێی سـاغکردنـەوەکـەی عـەلی ئاغـای نـەوتچی لە (من)دا پێنجـەمین تاکی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یە، هەروەک لە (گل/٣)یشدا بەناوی (کوردی)یەوەیە بەڵام تاکی سێیەمی لە (ن، ص)یشـدا هـەر بە هی (کـوردی) دانراوە، بەڵام تـاکی شـەشـەم، کـە پشـتگیـریـی ئەو سـاغکردنەوەیە دەکەن، هەرچەندە بەر لـە ساغکردنەوەکەش هەر (عن) لە سێ نوسخـەی تریدا هەر جارەی بەناوی یەکێ لە (خـەستە) تاکی چوارەم، وە بەناوی (مـەحمـوود) تاکی حـەوتەم وە بەناوی (غەریب) تاکی شەشەمەوە نووسیویەتی، وە لە سەرچاوەکانی تردا ئەم تاکە نییە.

بێگانە (ص و هەرسێ نوسخەکەی تری عن): بێگانان.
چققەی (ن): حقّی.
ئەم تاکەش هێشتە چاپ نەکراوە.

٦- لە دوای گۆڕەکەی ئەلی (عەلی) گێز و گوڵنگ: (پەندێکی پێشینانمانە) بۆ کردنی شتێکی بێ کـەڵک لە پێناوی قـازانجی شـتێکی تردا بەکـار دێت، (گـێـز و گـوڵنگ)یش بەواتـە (گوڵنکە و ڕیشوو)ە وەک بەگۆڕێکدا هەڵواسرێ چۆن کەڵکی بۆ مردووەکە نییە، ئاوەهایە.

ئەم تاکە (عن) ساغی کردەوە کە شەشەمینە و هی (کوردی)یە و لە (گل/٣)دا کە سێیەمینە و لە (ن، ص)یشـدا کـە حـەوتەمـینە، هـەر بەنـاوی (کـوردی)یـەوەیە هـەرچەنـدە (عن) بـەر لە سـاغکردنەوەکـەی بەهەڵە لە دوو نـوسخـەدا بەناوی (خـەسـتـە)وە، بەپێنجـەمـین تاک و بەناوی (مەحمود)ەوە بەهەشتەمینی وەرگرتووە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

لە دوای (ن): لەوی.
سا (ص): خو.

سا (ن): کس.

نادا (ن، ص): ناکا.

دەواتان (گل/٣، ن، ص): شیفاتان.

٧- ئەم تاکە (عن) بەحەوتەمین و بەناوی (کوردی)یەوە ساغی کردووەتەوە کە (گل/٣) بەپێنجەمین و (ن، ص) بەهەشتەمینیان داناوە و بەناوی (کوردی)یەوە، بەڵام (عن) بەر لەوە لە سێ نوسخەدا بەهەڵە بەناوی (خەستە) شەشەمین و (مەحموود) نۆیەمین و (حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی) حەوتەمینی وەرگرتووە و لە سەرچاوەکانی تردا نییە و، لە هەموو ئەو سەرچاوانەدا تیا هاتووە، چوونیەکە و هێشتە چاپیش نەکراوە. وە لێرەدا (عن) بەفارسی ئەم پەراوێزەی نووسیوە: (کردین این قصیدە را در ترک سلیمانیە بعد از سقوط ببە خطاب بە عبدالله پادشاه ببە و هوادارانش فرمودە - علی) واتە: (کوردی ئەم چامەیەی لە بەجێهێشتنی سلێمانی دا و، لە دوای ڕووخانی بابانەکان ڕووبەڕووی عەبدوڵڵا پاشای بابان و دارودەستەکەی فەرموویەتی - عەلی). چونکە بەخیانەتی ئەو عەبدوڵڵا پاشا، لە بابانە و هاوکاری لەگەڵ هێزی تورکی عوسمانی، بابانی ڕووخاند و لە پاداشدا، کردیانە (قائیمقام).

٨- کۆی: جێگای، شوێنی، بەڵام لێرەدا مەبەستی لە (کۆی) شاری کۆیە (کویسنجق)ە کە هەرای شکان و ڕووخانی فەرمانڕەوایی بابان لەوێوە بووە، وە هەوادارانی عوسمانی لە پێشا (کۆیە)یان گرتووە.

خاطر: مەبەس لە: دڵ، هیوا و خواستە.

سەرو: سارد - ئەو بایە نەشئەیەی لای ئەوانەوە بۆی هاتووە.

بۆی: بۆنی، بۆ ئەو.

صوورە: وێنە، دیمەن.

ناتەبا: ناڕێک، یەکنەگرتوو، دووبەرەکی، دردۆنگی.

ئەم تاکە (عن) بەهەشتەمین تاک و بۆ (کوردی)ی ساغ کردووەتەوە وە لە (گل/١، ف، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا بەناوی (کوردی)یەوە، نۆیەمینە و لە (گل/٣)شدا هەر هی ئەوە و حەوتەمینە و لە (ن، ص)دا دیسان بەهی ئەو دانراوە و دوانزەمینە و لە (برایی)دا، بەهی (کوردی) دانراوە و حەڤدەمینە و لە (گل/٢، نم/١)یشدا هەر هی ئەوە و بەهەژدەمین تاکیان داناوە.

بەڵام لە (ق/١)دا هی (نالی)یە و پێنجەمینە و لە (عق، بەیان/٦٤)دا هەر هی (نالی)یە هەشتەمینە و لە (گل/٤، گل/٥)دا پێنجەمینی (خەستە)یە و لە نوسخەیەکی تری (عن)دا بەدوانزەیەمینی (خەستە)ی وەرگرتووە و لە (گل/٨ و نوسخەیەکی تری عن، نم/٣)دا هەژدەیەمینە، بەناوی (غەریب)ەوە، وە لە (ئاسۆ)دا چواردەمینە بەناوی (مەحموود)ەوە، وە لە نوسخەیەکی تری (عن)یشدا دوانزەمینی (حەسەن ئەفەندی)یە و، لە سەرچاوەکانی تردا نییە.

نەسیمی کۆی تان (نم/١، نم/٢): نسیم کوی تو.

نەسیمی کۆی تان (عق، ف، ر): نسیمی کوی تو.

کـۆی تان (نم/١، نم/٣، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، برایی، بـەیان/٦٢، بەیان/٦٤): کـویی تو – ئەمیش نابێ چونکە هەڵبەستەکە هەمووی لەگەڵ گشت دەدوێ نەک یەک کەس (تاک).

کۆی تان (ئاسۆ): کوێی تۆم.

دەکا (پەیام): ئەکا.

سەرد (نم/١، برایی): شاد.

سەرد (عق، نم/٣، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٢، بەیان: ٦٤): جەم.

سەرد (ئاسۆ): جەمع.

بەبۆی (عق): بو بوی.

بەبۆی (ئاسۆ): بەبۆنی – ئەمیش لەنگ دەبێ.

صوورەی (نم/١، نم/٣، گ/٢، س): طرەی.

صوورەی (عق، کم): طرّەی.

صوورەی (گ/٣، بەیان/٦٢، بەیان/٦٤): طورڕەی.

صوورەی (برایی): تورڕەی.

صوورەی (پەیام): تووڕەی.

پەشـێـوی (ئەم وشـەیە لە سـەرچاوە دەسنووسـەکـاندا، بەشـێـوەی «پشـیـوی» نووسـراوە کـە ئەمیشیان بۆ هەڵبەستەکە دەگونجێ و ئەشێ (کوردی)ش ئەمەیانی وتبێ.

ناتەباتان (عق، نم/١، نم/٣، کم، گ/٢، گ/٣، پەیام، برایی، بەیان/٦٢، بەیان/٦٤): پانیاتان.

٩- خورڕەم: شادمان، کەیفخۆش.

بو کـێ: ئەم وشـــەیە بەڕێنووسـی کـۆنـە (بو کی)، (بۆ کـێ = لە بـۆ چ کـــەسێ) وە (بـووکـێ = بووکـەکە)ش دەخـوێندرێتـەوە کـە ئەم هەردوو واتایەش بۆ ئێـرە دەگونجێ، چونکە (کێ)یەکـە (عـوسـمـانـی) و (بووک)ەکەش مـەبەست لـەو (قـائیـمـقـامـیـەت)ە تازەیە بووە کـە لە شـوێنی فەرمانڕەوایی (پاشا) بابانییەکان و بەسەرۆکایەتیی عەبدوڵڵا پاشای بابان پێکیان هێناوە. دیارە (کوردی) بەم وشەیە جیناس ئارایی نواندووە.

نیکاح: مارەکردن.

باطیل: پووچ، هەڵوەشاوە.

ئەم تاکـە لە (عن)دا بۆ (کـوردی) بەنۆیـەمـین تاک سـاغ کرایەوە هـەروەک (ن، ص) بەنۆیەمـینـی ئەویان دانـاوە و لە (گل/٣)دا هـەشـتـەمـینە و هـی (کـوردی)یە و، (ق/١) بۆ (نـالی)ی داناوە و هـەشـتەمین تاکە. وە لە (گل/٤، گل/٥)دا بەناوی (خـەسـتە)وەیە هـەشـتـەمـینە و لە نوسخـەیەکی (عن)دا نۆیەمینە بەناوی (خـەستە)وە، و، لە (گل/٦)دا دەیەمینی (غـەریب)ە وە لە دوو نوسخـەی

تری (عن)دا بەناوی (مەحموود)ەوە دەیەمینیە و بەناوی (حەسەن ئەفەندی)یەوە هەشتەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

وا خوورەمن (ن): دڵخۆش دکەن.

نیکاحی (ن، ص، ق/١): نتیجەء.

١٠- ئیخلاف: پێچەوانەکردن.

وەعد: بەڵێن.

ئەم تاکە بەدەیەمین بەناوی (کوردی)یەوە، جێگیر کراوە و لە (عن)دا و لە (ن، ص)یشدا هەر دەیەمین و هی (کوردی)یە، بەر لەو ساغکردنەوەیەش لە سێ نوسخەی تری (عن)دا بەناوی (خەستە)وە بە هەشتەمین و (حەسەن ئەفەندی) بەنۆیەمین و، (مەحموود) بەیانزەمین بەهەڵە وەری گرتووە.

و، لەم سەرچاوانەشدا ئەم تاکە چونیەکە و لەوانی تردا نییە و، هێشتە چاپیش نەکراوە.

(کوردی) نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوەی لە سەرەتای هەڵبەستێکی تری (نالی) وەرگرتووە کە: (مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت)ە – بڕوانە (دیوانی نالی) مامۆستا مودەڕیس لاپەڕە/١٤٨.

ئەم (وەعد)ەش ئەوە بووە کە چەند جارێک پادشاکانی بابان نامەی نهێنیی (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابانیان گرتووە کە بەدزییەوە بۆ والیی (بەغدا) یا (ئەردەڵان) یا (کرماشان) ناردوونی کە لەشکری بدەنێ و بابانیان بۆ بڕووخێنی و لەوەوە هەموو چووبوونە لای (مەولانا خالید) لە خانەقایەکەیدا لە سولەیمانی و لەوێ (عەبدوڵڵا پاشا) بەقورئان و بەتەڵاق سوێندی خواردووە کە ئیتر ئەو کارانە نەکات وەکو بیستوومە لەو کۆبوونەوەیشدا (نالی) ئامادە و شاهید بووە لە پەیمان بەستنەکەیاندا، لەسەر دەستی مەولانادا. بەڵام خائین هەر خائینە و ئەوەتا ئەو عەبدوڵڵا پاشا بێ تەڵاق و بێ ئاین و بێ بڕوایە، لە ئاکامدا بابانی ڕووخاند و لێرەدا، (نالی) و (کوردی) هەردوو، وەک (پلار) ئەو پەیمان شکاندنەیان لە عەبدوڵڵا پاشایان گرتووە، ئەمەش لە مێژووەکاندا نووسراوە.

١١- ڕەهگوزار: ڕێگوزار، سەرەڕێی.

گوزەر: تێپەڕین، ڕابوردن.

ئەم تاکە عەلی ئاغای نەوتچی لە کەشکۆڵەکەیدا ساغی کردووەتەوە کە یانزەمین تاکی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یە و، لە (گل/١، ف/١، کو، یح، نم/١، کم، گ، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا دیسان بەناوی (کوردی)یەوەیە، بەڵام سێیەمینە و، لە (نم/٣، برایی)دا هەرچەند شەشەمینە دیسان هەر دراوەتە پاڵ (کوردی).

لە لایەکی ترەوە (عق، بەیان/٦٢) بەتاکی سێیەمی (نالی)یان داناوە وە (ر، ق/١، ق/٣، ڕۆشنبیری نوێ) بەدووەمین تاکی (مەحموود) و (عن، ئاسۆ) بەسێیەمین تاکی (مەحموود)یان

داناوە. وە لە (نم/٣)دا هی (غەریب) و شەشەمین تاکیەتی. لە نوسخەیەکی تری (عن)دا بەر لە ساغکردنەوەکەی بەپانزەمین تاکی (حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی) داناوە، وە لە سەرچاوەکانی تردا نییە.

خۆڵی (بەیان/٦٢ و ٦٤): خۆڵە.

ڕەهگوزارم (ر، نم/١، نم/٣): ڕەگزارم.

ڕەهگوزارم (کو): ریگزارم.

ڕەهگوزارم (پەیام): ڕاگوزارم.

١٢- هەوا: فیز، لووت بەرزی، پۆز. دیسان مەبەستیش لەوەیە کە خۆی بەرامبەر هەر خراپەیەکی ئەوان بێ دەنگ بووە و ئەوان وەک ئامێری مۆسیقی هەر سەد ڕەنگە مۆسیقییە هەڵبژاردەکەی (باربود)یان بەرامبەر بەو لە هیچە لێوە هاتووە و هەر ئەم خۆی لێ پاراستوون و ئەوان بەرامبەری پتر هاتوونە دەنگ و بەهەوا (ئاوازی مۆسیقی) و گێچەڵی تریان پێ کردووە، واتە ویستوویانە سووکی بکەن.

ئەم تاکە (عن) بە هی (کوردی) و دوانزەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەی جێگیر کردووە، هەروەها (گل/٢، گل/٣) بەشەشەمین تاک و (برایی) بەچواردەمین و (نم/٣) بەپانزەمین تاکی (کوردی)یان داناوە و، (ق/١)یش کردوویە بەسێیەمین تاکی (نالی) و، (گل/٤، گل/٥) بەسێیەمین تاک و (گل/٨) بەشەشەمین تاکی (خەستە)یان داناوە، وە لە (ئاسۆ)شدا یانزەمین تاکی (مەحموود) و لە (نم/٣)دا پانزەمین تاکی (غەریب)ە و لە سەرچاوەکانی تردا نییە.

هەتاکو (گل/١، گل/٢، گل/٣، نم/٣ و نوسخەیەکی تری نم/٣، برایی): هەتا من - دیارە ئەمەش بەپێی وێژەی دێرین ناگونجێ و ناشێ یا زۆر بەدەگمەن، یەکێکی وەک (کوردی) لە یەک تاکدا و دووجار وشەیەکی وەک (من) دووبارە بکاتەوە.

١٣- بووم: (من بووم) وە یا (کوندەبوو) بەواتا لە جێگەی من ئەوا ئەو کوندەپەپووە، شێخ و مەلاتانە، کە شوێنی خوێندنی هەر وێرانەیە لە سایەی ئێوەوە و، ئاوا پلەی کۆمەڵایەتیتان هاتووەتە خوارەوە.

شێخ: سەرەکی (تەریقەت) یا پیاوی بە(تەمەن)ی کارامە و ڕێنوماکار.

ئەم تاکە لە (عن)دا ساغ کراوەتەوە کە سیانزەیەمینی (کوردی)یە، هەروەها لە (گل/٢)دا حەوتەمین و لە (ن، ص)دا سیانزەمین و لە (نم/٣)دا پانزەمینە و دراوەتە پاڵ (کوردی) وە لە (گل/٨)یشدا بەناوی (غەریب)ەوە پانزەیەمین تاکە و لەوانی تردا نییە، وە هێشتە چاپیش نەکراوە.

١٤- سەراتان: بڕوانە لێکدانەوەمان لەسەر تاکی سێیەمی ئەم هەڵبەستەی (کوردی). ئەم تاکە (عن) بە هی (کوردی) جێگیری کردووە و چواردەمینە، وە لە (مد/١)دا چوارەمینە و لە (ر، یح، پەیام، بەیان/٦٤)دا چوارەمین وە لە (گل/١، ف، جلی، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا

پێنجــەمین، وە لە (گل/٣، برایی)دا نۆیەمین، وە لە (گل/٢، نم/٣)دا دەیەمــینە، بەناوی (کــوردی)یەوە وە (عق، بەیان/٦٢) داویانەتە پاڵ (نالی) تاکی چوارەمــەوە، لە (ف/١، ق/٣، ڕۆشنبیری نوێ، عن)دا پێنجــەمینە بەناوی (مــەحمــوود)ەوە لە (ئاسـۆ)دا حــەوتەمــینی (مــەحمــوود)ە وە لە (نم/٣)دا دەیەمین و لە (عن)دا چواردەیەمــینە بەناوی (غــەریب)ەوە، نوسخەیەکی تری (عن) کردوویە، بەنۆیەمینی (خەستە) و لەوانی تردا نییە.

ڕۆیم (برایی): مردم.

لە من خاڵی مەکەن (برایی، ڕۆشنبیری نوێ، ئاسۆ): مەکەن خاڵی لە من.

١٥- ئەم تاکە هەڵبەستە ئەگەرچی بەژمارە پانزەیەمین تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی)یە، بەڵام لە ڕاستیدا خودی هەڵبەستەکە چواردەمین تاکە. چونکە یەکەمین تاکی هەڵبەستەکە هی (نالی)یە و (کوردی) کردوویەتی بەتاجی سەری هەڵبەستەکەی خۆی وەک لە پێشتردا ئەمەم بەدرێژی ڕوون کردووەتەوە.

موحەققەقمە: دڵنیام، لێم ڕوونە، بڕوام وایە، وای بەڕاستی دەزانم.

ڕەها: ڕسگار، قوتار.

ئەم تاکە لە (عن)دا بەپانزەیەمین تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی) جێگیر کراوە، بەیەکەمین تاکییەوە کە هی: (نالی)یە وەک لە پێشەوە نیشانەم بۆ کرد. بەر لەو ساغکردنەوەی (عن) کە لەسەر دەسنووسی خودی (کوردی) کردوویەتی لە کەشکۆڵەکەی لەمەڕ (موفتی زەهاوی)دا لە بەغدا، هەر (عن) لە شوێنی تریدا، ئەم تاکەی بە هی (غەریب) داناوە، لە سەرچاوەکانی تردا ئەم تاکە دوا تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی)ن. وە ئەم تاکە هێشتە چاپیش نەکراوە.

بەوەدا کە کوردی لەم دوا تاکی هەڵبەستەیدا نازناوی (هیجری)ی بەکار هێناوە، ئەم هەڵبەستەی لە دەرەوەی (قەڵەمڕەوی باباندا) داناوە و لەوێوە ناردوویەتی بۆ (سولەیمانی) و، من وەهای بۆ دەچم نوسخەیەکیشی لێ ناردبێ بۆ خودی عەبدوڵڵا پاشای بابان چونکە وەک دەرکەوت بەزۆری لەم هەڵبەستەدا یا ڕووی دەمی لەو عەبدوڵڵا پاشایە بووە وە یا بەهێما نیشانەی بۆ ئەو تیا کردووە، چونکە نەریتی (کوردی) وەها بووە کە هەر لە تەنیا ئەو هەڵبەستانەیدا کە لە خاکی باباندا دای ناون، نازناوی (کوردی)ی خستوونەتە سەر هەڵبەستەکەی تا ئێرە، سەرپاکی هەڵبەستە (ماڵئاوایی)یەکەی کوردیم بەساغکراوەیی بەڵگەی بەهێزەوە جێگیر و پێشکەش کرد.

ئیتر نۆرەی پێشکەش کردنی هەڵبەستەکەی (نالی)یە.

**(سەرەناوی ئەم هەڵبەستەی کوردی)**

یەکەمین کەسێک (سەرەناو)ی بۆ ئەم هەڵبەستەی (کوردی) داناوە، (عەلی ئاغای نەوتچی) بووە لە کەشکۆڵی (عن)یدا، کە ئەو بە(ویداعییە) پێناسەی کردووە.

وای بۆ دەچم ئەم ناولێنانەی (نەوتچی) لە هەڵبەستەکەی شاعیرمان (سالم) عەبدولڕەحمان

بەگی ساحیبقرانەوە بووە کە وتوویە:

(ئەلویداع، ئەی مولکی بابان ئەلویداع)

دوای (نەوتچی) مامۆستا نەجمەدین مەلا، ئەم هەڵبەستەی (کوردی)ی بەناوی (ماڵئاوایی)یەوە داناوە لە کەشکۆڵەکانیدا و ڕەنگە هەر (ویداعی)یەکەی (نەوتچی) بێ و بەکوردی دای ڕشتووە، منیش لە مامۆستا نەجمەدین مەلاوە لەم پەڕاویەمدا (ماڵئاوایی)یەکەم بۆ بەکار هێناوە و هەندێ جاریش ئەم کۆمەڵە هەڵبەستەی شەش هۆنەرەکەم کردووەتە (ماڵئاوایی نامە) و سەرناوی (نیو باڵی یەکەم)ی هەڵبەستەکەی (نالی)م داونەتێ.

لەم دواییەشدا (دکتۆر مارف خەزنەدار) لە گۆڤاری برایەتیدا بە ٢٩ تاک بەناوی کوردییەوە و پێناسە یا سەرەناوی (وەصیەت نامە)ی داوەتێ کە وێ دەچێ، ئەگەر کەڵکی لەوانی سەرەوە وەرنەگرتبێ و تیایدا ویستوویەتی سەربەخۆییەکی لەم ناو لێنانەدا هەبێ، چونکە دوکتۆر لە زۆربەی نووسینەکانیدا مافی نەجمەدین مەلای هاویشتووەتە (خەزینە)کەی خۆیەوە و، ئەوی کەشکۆڵەکانی مامۆستا نەجمەدینی هەبێ و زۆربەی نووسینی دوکتۆری خوێندبێتەوە لەم ڕاستییە دەگات و بۆ نموونە کە لە (دیوانی حەمدی)دا هەر بەجارێ قوڕی داوە بەمافی مامۆستا نەجمەدین مەلادا.

خۆ ئەگەر دوکتۆر لەوانەوە سەرەناوی (وەصیەت نامە)کەی وەرنەگرتبێ ئەوا: ئەوەی لە سەرەناوی هەڵبەستی (شیڤیچکۆ)ی شاعیری نیشتمانپەروەری (ئۆکرانی)یەوە خواستووە لە بەراوردکارییەکەیدا لە نێوان هەڵبەستی (کوردی) و ئەو شاعیرەدا کە دوکتۆر سەرچاوەی ئەو پێناسەیە و هەڵبەستەکەی (کوردی)یشی لە (خەزینە)کەی خۆیدا بە(پەنگەمووس) کردووە، هەر بۆیەش ئەم سەرەناوەی ئەم لە چوارچێوەی نووسینەکە تێ نەپەڕیوە.

## هەڵبەستەکەی نالی

١- «ڕەفــیـــقـــان من ئەوا ڕۆیم لە لاتـان،
لە مــەظلوومـان، بلا چۆڵ بێ: (ویـلا)تان»
٢- بـلا بـا شـــار بەشـــار و دێ بەدێ بین
لە دەست (یاران)، بکەین (طەیی) ولاتان
٣- ســەفــەرمـان چونکە ڕێی هات و نەهاتە
دوعـــامــان بۆ بکەن ئێـــوە و خــواتـان
٤- مــەڵێن کــەڵکی نەبوو ڕۆیی جــەهەننەم
ســەرم قــەڵغـانە بۆ تیـری قــەضــاتان
٥- منم ســـەرکـــردەتان بۆ لەشکری غـــەم
دەترسم من بـڕۆم بشکـێ ســـــوپاتـان
٦- شکاری وەحشیـان بەس دەستەمۆ کەن
نەوەک بـەربێ شـکاری خــــــانـەزانـان
٧- ئەوەندە ئەرجوو دەکا (نالی) کە جار جار
بکەن یادی مــــوحـــیــــبی بێ ڕیاتـان

---

١- ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە، لە خودی خۆیدا، یەکەمین تاکی هەڵبەستەکەی (نالی)یە و لەبەر دڵگیـرییـەکـەی و بەپێی دەسـتـووری وێژەی (کـۆن)، هۆنەرمـان (کـوردی)یش، بەیەکـەم تاکـە هەڵبەستەکەی خۆی دای ناوە، وەک لە سەرەتای پێشکەشکردنی هەڵبەستەکەی کوردیدا ڕوونم کردووەتەوە.
لەبەرئەوەی لە سـەرەتای ئەم هـەڵبەسـتی ژمـارە (٣٨)ەدا ئەم تاکـە هەڵبەسـتـەم بەدرێژی و لە هەمـــوو لایەنێکەوە تۆژیومـــەتەوە و لەوێدا پێــشکەشم کــردووە، بۆیە؛ لێــرەدا چاوپۆشـی لە لێکدانەوەی دەکەم.
ئەم هـەڵبـەسـتـەی (نـالی) ئەوەنـدە کـاریگەر بووە لە دەروونی (هـۆنەر)ە هاودەردەکـانیـدا لە ئاوارەیی و، من ئەوەندەی پێم زانیـوە، کـە پێنج هۆنەری ترمـان: (کـوردی) و (مـەحـمـوود) و (غەریب) و (خەستە) و (حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی)، لەسەر کێش و پاشبەند و هەمان بابەتی ئەم هەڵبەستەی (نالی) هـەریەکەی هەڵبەستێکی داناوە، لە لایەکەوە و، لە ناوە (بابەتی

– سـەرچاوەکـانی ئەم هـەڵبـەسـتـەدا) لە لایەکی ترەوە دەردەکـەوێت کـە بریتین لە دەیان سـەرچاوەی دەسنـووس و چاپکراو بـۆ نموونە چـەند تـاکـێکی ئەم هـۆنەرەیـانمان لـە چەندین سـەرچاوەدا بەناوی (فلان) هۆنەریانەوەیە و هەر ئەو تاکە هەڵبەستانە لە سەرچاوەی تریاندا بەناوی (فیسارە) هۆنەری ترەوە.

ئەو کـارە ئاڵۆزکـاوییـە گـەورەترین کـێشـەی دژوار و نالەباری وێژەی کـورد و هـەڵبـەسـتـە کوردییەکانە. یەکەمین کەسێک کە هەستی بەو ئاڵۆزی و ئاوێتەبوونە کردووە، وێژەوانی مەزنی ورد و لێزانمان عەلی ئاغای نەوتچیی نەمری کەرکووکی بووە، کە لە کەشکۆڵی (عن)یدا، ئەو ئاوێتە کرانانەی، ئەم بە هی ئەوی هەست پێ کردووە و لە ساغکردنەوەیاندا کۆشاوە.

لەو لێکۆڵینەوانەیدا ڕێگەی کـەوتووەتە لای (مـوفتی زەهـاوی) لە بەغدا و باسی ئەو ئاڵۆزییـەی لەگەڵدا کردووە. ئەویش کەشکۆڵێکی دەسنووسی خـودی (کوردی)ی لای خۆی پیشان داوە، کە تیایا بەدەستنووسی (کوردی) هەردوو هەڵبەستەکەی (نالی) و (کوردی خۆی) بەجیاواز لەیەک تێدا نووسیوە.

عـەلی ئاغـای نەوتچی لە کـەشکۆڵی (عن)یدا، هەردوو هەڵبـەسـتـەکـەی نووسـیونـەتەوە و بەوە زۆربەی هـەرە زۆری ئاڵۆزی و کێشە گەورەکەی بۆ ئاسـان کردووین. لە دوای ئەوەوە لە چەندین سـەرچاوەی دەسنـووس و چاپکراوی تردا دیسـانەوە تـاکە هەڵبەستی ئـەم بەناوی ئەوەوە و، یا بەپێـچـەوانەوە نووسـراون و بڵاو کـراونەتەوە بەبێ ئەوەی کـەسـێک وەک عـەلی ئاغـای نەوتچی کارەکەی ئاسان کردبێ.

بەدوای ئەواندا تـەنیا من یەکـەمین کـەسم لـە پێناوی یەکالا و سـاغکردنەوەی هەڵبـەسـتـەکـەی (کـوردی)دا بـەتەنگ شـێکردنـەوەی ئەو ئاڵۆزییی ناو هـەڵبـەسـتی (مـاڵئـاوایی) هـەر شـەش هۆنەرەکەوە بووم. خـۆشبـەختـانە (عەلی ئاغا)ی ناوبراو لە ئاڵۆزی و ئاوێتـەی هەردوو پارچە هەڵبـەسـتـەکەی (نالی) و (کـوردی) بێ خـەمی کـردم و، پشتم لـێ کردەوە. دەمـێنێتـەوە سـەر هەڵبـەستی چوار هۆنەرەکەی ترمان، (مـەحمـوود) و (غەریب) و (خـەستـە) و (حەسەن ئەفـەندی برادەری کوردی)، من لـە دوای پێشکەشکردنـی ئەم هەڵبـەسـتـەی (نالی)یەوە، بۆ ئاسـانکاریی کەسانێک کە بیانەوێ پارچە هەڵبەستی هەریـەکێ لەو چوار هۆنەرەمان سـاغ بکەنەوە، من لەم ڕێگە دوور و سـەخت و شـەونخوونی و ئەرکی بەدواداچوون و مەسرەفی زۆر و سەربەکۆشی ئەم و ئەودا کردن، ئەوی بەدەستم هێنان، وازم لێ نەهێنان و، هـەموویان وەک کەرەستەیەکی خاوی ئامـادە و پوختـەکراو بەجێ دەهێڵم لەم پەڕاویەمدا، کـە ناوی سـەرچاوە و، ژمـارەی زنجیرەی هـەر تاکێک لە هـەر هەڵبەستێکیاندا دەنووسمەوە.

بەتێکڕایی تاکـە هەڵبـەسـتـەکـانی هەر شـەش هۆنەرەکـە لە دەیان سـەرچاوەی دەسـنووسی و چاپکـراودا، لە لای من گـەیشـتـوونەتە (٤٣) تاکـە هەڵبـەست و ئەوە بوو لەوانە (١٤) تاکیـانم بەناوی (کوردی)یەوە بەساغکراوەیی پێشکەش کردن و، ئەوا لێرە و دواوە (٧) تاکە هەڵبەستە ساغکراوەکەی (نالی)یش بەیەکلایی کراوەیی پێشکەش دەکەم.

کەواتە (١٤) تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی) لەگەڵ (٧) تاکە هەڵبەستی (نالی)دا دەبن بە(٢١) تاکە هەڵبەست، لە سەرجەمی هەر (٤٣) تاکە هەڵبەستەکانی هەر شەش هۆنەرەکەماندا. لەو (٤٣) تاکەیش تەنیا ئەمێنێتەوە (٢٢) تاکیان کە (ناوکۆی) هەر چوار هۆنەرەکەی تر (مەحموود) و (غەریب) و (خەستە) و (حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی) دەمێننەوە.

لەبەرئەوەی تایبەتمەندی ئەم بابەتی هەڵبەستی (ماڵئاوایی نامە) یا: (ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان)ە هەر تەنیا هەڵبەستەکەی (کوردی)یە لە پلەی یەکەمدا و، (بۆ مێژوو) یا وەک (پێشەکییەک) هەڵبەستەکەی (نالی)م بە شیکراوەیی دوور لە دژواری و ئاڵۆزی پێشکەش دەکەم. بەڵام بۆ گوم نەکردن و پشتگوێ نەخستنی و، بۆ دەستنیشانکردنی تاکەکانی هەر پارچەیەک لە هەڵبەستی هەریەکێ لەو چوار شاعیرانەمان کە بەئەرکێکی زۆر سەرچاوەکانیانم بەدەست هێناون، بۆیە وەک کەرەستەیەکی پوختەکراوی ئامادە ئەو سەرچاوانەی هەر چوار پارچە هەڵبەستەکەم پاراستن و دوای پێشکەشکردنی ئەم هەڵبەستەی نالی پێشکێش بەوانە دەکەم کە دەیانەوێ پارچە هەڵبەستی هەریەکێ لەو چوار هۆنەرە لە یەکتری بەتەواوی ساغ بکەنەوە کە ئەو کارە کاری ئێرەی من نییە و، نەمویست خۆم بەویشەوە ئەوەندەی تر خەریک بکەم بەیەکلایی کردنەوەیانەوە و ئەو سەرچاوانەم بۆ لێکۆڵەرەوان وەک کەرەستەیەکی کاڵ و ئامادەی بێ ئەرک بەجێهێشتن، خۆزگە ساغ دەکرانەوە.

ئەمجا ئەمیش هەڵبەستەکەی (نالی)یە کە لە تاکی دووەمییەوە دەست پێ دەکەم:

٢- (نالی) لێرەدا خۆی بە(کۆ) ڕاگەیاندووە، کە فەرموویەتی (بین) و (بکەین) کە مەبەستی هەر تەنیا لە (خودی) خۆی نەبووە، لە ئاوارەکردنی کەسانی (هۆنەر) و (شێخ) و (مەلا) و (زانا) و (گەورەپیاوان)ی کوردی تر لە باباندا، کە ڕژێمی عوسمانی ڕەهەندە و ئاوارەی وڵاتی کردوون مەبەستی بوون.

یاران: هەرچەندە بەواتا (دۆستان)ە، بەڵام (نالی) بەتەوسەوە ئەو خراپکارییانەی ڕژێمی (تورکی دڕندەی عوسمانی) و (دەربار)ە هەلپەرستەکانی مەبەست بووە.

ئەم تاکەم لەم سەرچاوانەی دواییدا دووەمین تاکە و لە (٩) سەرچاوەدا بەناوی (نالی)یەوەیە کە ئەوانیش: (عن، گل/٤، ف/١، ش، حم، ق/٤، ئا، نع، ڕۆشنبیری نوێ)ن وە لە (٣) سەرچاوەدا بەناوی (غەریب)ەوەیە کە (گل/٨، نم/٣، عن)ەوە لە دوو سەرچاوەشدا کە (ن، ص)ە بەناوی (کوردی)یەوەیە وە لە دوو نوسخەی (عن)دا بەناوی هەریەکێ لە (خەستە) و (مەحموود)ەوەیە و، لە (ئاسۆ)دا پێنجەمین تاکە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە وە لە (گل/٢، نم/٣)یشدا هەشتەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و، لە (عق، بەیان/٦٢)دا دەیەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە بەڵام لە ڕاستیدا دووەمین تاکی هەڵبەستەکەی (نالی)یە و لەوانی تردا نییە.

بلا (لە یەک سەرچاوەی «نع»)دا: بلێ.

سا (عق، دوو سەرچاوەی «نع»)دا: با.

دێ بەدێ (عق، بەیان/٦٢): دە بەدی.

بـێن (نم/٣، ئاسۆ): بم.

بکەین (نم/٣، ئاسۆ): بکەم.

٣- ئەم تاکە لە (عن، حم)دا سێیەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە وە لە (مد/١)دا دووەمینە وە لە (ن، ص، کـۆ، نم/٣، برایی)دا دیسـان سـێـیـەمـینە بـەڵام بەناوی (کـوردی)یەوەیـە وە لە (نم/٣ و عن)یشـدا هەر سـێـیـەمـینـە و بەناوی (غـەریب)ەوەیە وە لە (گل/٤، ف/١، ش، ق/٤، ئا، نع، ڕۆشنبیری نوێ)دا چوارەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە وە لە (ق/١)دا شـەشـەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە و، هەروەها لە (گل/٥، گل/٦)یشدا هەر شەشەمینە، بەڵام بەناوی (خەستە)وەیە و، لە (عن، بـەیان/٦٢)دا دوانـزەیەمـیـنـە، بەنـاوی (نالی)یـەوەیە و، لـە (گل/١، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا دوانزەیەمینە و بەناوی (کـوردی)یەوەیە وە لە (گل/٨)دا سیانزەیەمینە و بەناوی (غەریب)ەوەیە وە لە (گل/٢)دا پانزەیەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و لە (ئاسۆ)دا بیست و شەشەمینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.

بەڵام وەک ساغ بووەوە ئەم تاکە سێیەمین تاکی هەڵبەستەکەی (نالی)یە.

خوداتان (نم/١، نم/٣): خواتان.

خوداتان (پەیام): خۆتان.

٤- وەک سـاغ کـرایەوە، ئەم تاکە چوارەمین تـاکی هەڵبـەسـتـەکەی (نالی)یە، هەرچەندە لە (گل/٤، ف/١، ش، ق/٤، ئا، نع، ڕۆشنبیر)یشدا سێیەمینە و بەناوی (نالی)ەوەیە وە لە (عن، حم)یشدا چوارەمـینـە، بەناوی (نـالی)یەوە هەروەک لە (مـد/١)دا سـێـیـەمـینـە، و لە (ن، ص)یشـدا هەر چوارەمـینە، بەڵام بەنـاوی (کـوردی)یەوە وە لە (ر، ق/٣، ڕۆشـنـبـیـری نـوێ)دا شـەشـەمـینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە و لە (گل/٥، گل/٦)یشدا شـەشەمینە، بەڵام بەناوی (خەستە)وەیە وە لە (ق/١)دا حـەوتەمـینە بەناوی (نـالی)یەوە وە لە (گل/١، ف، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا هەشـتـەمـینە بەناوی (کـوردی)یەوە وە لـە (ئاسـۆ)دا نۆیەمـینە، بـەناوی (مـەحـمـوود)ەوە و، لە (دوو نـوسـخـەی عن)دا بـەنـاوی هـەریـەکێ لـە (خـەسـتـە) و (حـەسـەن ئەفەندی)یەوەیـە دەیەمینە وە لە (عق، بەیان/٦٢)دا پـانزەیەمینە وە لە (برایی)دا دوانـزەیەمـینە بـەنـاوی (کـوردی)یـەوە وە لە (گل/٨)دا هـەر دوانزەیەمـینـە بەناوی (غـەریب)ەوە وە لـە (گل/٢، نم/٣)دا سـیانزەیەمـینە بەناوی (کوردی)یەوە دیسـان لە (نم/١، عن)دا هـەر سـیانزەیەمین تاکە بەناوی (غەریب)ەوە وە لەوانی تردا نییە.

مەڵێن (بەیان/٦٢): نەڵێن.

مەڵێن (مد/١): ملی.

قەڵغانە (گ/٢، س، گ/٣): قەڵخانە.

قەڵغانە بۆ (ئاسۆ): قەڵغانە لە بۆ - ئەمیش لەنگە.

٥- سـاغ بووەوە کە ئەم تاکە پێنجەمین تـاکی هەڵبـەسـتـەکەی (نالی)یە وە لە (ق/١)دا چوارەمینە، بەناوی (نالـی)یەوە و لە (گل/٥، گل/٦)دا هـەر چوارەمـینە بەناوی (خـەسـتـە)وە و لە (ر، ق/٣،

ڕۆشنبیری نوێ)دا هەر چوارەمینە، بەناوی (مەحموود)ەوە. وە بەپێی (عن، گل/٤، ف، ش، حم، ق/٤، ئا، نع، ڕۆشنبیری نوێ) وەک ساغ بووەوە هی (نالی)یە وە لە (ئاسۆ)دا هەشتەمینە، بەناوی (مەحموود)ەوە و لە (گل/١، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)یشدا هەر هەشتەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و، لە دوو نوسخەی (عن)دا بەناوی هەریەکێ لە (غەریب) و (خەستە)وە یانزەیەمینە و لە (برایی)شدا بەناوی (کوردی)یەوەیە و یانزیەمینە و، لە (گل/٨، نم/٣)دا دوانزەیەمینە بەناوی (غەریب)ەوە و هەروەها لە (گل/٢، نم/٣)شدا هەر دوانزەیەمینە بەناوی (کوردی)یەوە وە لە (عق، بەیان/٦٢)دا سیانزەیەمینە بەناوی (نالی)یەوە، و لە (ف)دا دیسان سیانزەیەمینە بەناوی (کوردی)یەوە و لەوانی تردا نییە.

دەترسم (ش، نم/٣، ق/١، پەیام، و، لە دوو نوسخەی «نع»دا): ئەترسم.

٦- ئەم تاکە لە (گل/٢، نم/٣، برایی)دا پێنجەمینە و بەناوی (کوردی)یەوە و هەروەها لە (گل/٨، نم/٣)دا هەر پێنجەمینە و بەناوی (غەریب)ەوەیە، وە هەروەک ساغیش کرایەوە کە ئەم تاکە شەشەمین تاکی هەڵبەستەکەی (نالی)یە وەک لە (عن، حم، نع)یشدا هاتووە. وە لە (ر، ڕۆشنبیری نوێ)دا نۆیەمینە، بەناوی (مەحموود)ەوە سیانزەیەمینە لە (ئاسۆ)دا بەناوی (مەحموود)ەوە و لەوانی تردا نییە.

شکاری وەحشیان (گل/٣، گل/٤، ر، نم/٣، ق/٣، ڕۆشنبیری نوێ، ئاسۆ): صەیادان وەحشیان.

بەس (گل/٤، نم/٣): بین.

٧- ئەم تاکە لە (یح)دا پێنجەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و لە (گل/٤، ق/١، ش، ق/٤، ئا، ڕۆشنبیری نوێ)دا شەشەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە و لە (عن، حم، نع)دا حەوتەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە وەک ئەمەش جێگیر بووە کە دایەوە و، دیسان لە (گل/٥، گل/٦)دا هەر حەوتەمینە، بەڵام بەناوی (خەستە)وەیە و لە (ق/١)دا هەر حەوتەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە و لە (ق/٣)یشدا هەر حەوتەمینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە وە لە (ر، ڕۆشنبیری نوێ)دا یانزەیەمینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە و لە (گل/١، ف، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا سیانزەیەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و لە (عق، بەیان/٦٢)دا چواردەیەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە و لە (عن)دا پانزەیەمینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە و لە (برایی)دا نۆزدەیەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و لە (گل/٢، نم/٣)دا بیستەمینە و بەناوی (کوردی)یەوەیە و لە (نم/٣)دا دیسان بیستەمینە و بەناوی (غەریب)ەوەیە و لە (ئاسۆ)دا بیست و نۆیەمین، تاکە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە و لەوانی تردا نییە و لە هەموو ئەم سەرچاوانەشدا دوا تاکە و جگە لەوانەیان کە بە هی (نالی)یان داناوە لەوانی تردا بەناوی ئەوانەوەیە.

ئەوەند (لە دوو نوسخەی «نع»دا): ئەوەن.

ئەوەند ئەرجو دەکا نالی کە (گ/٢، س، گ): تکای کوردی وەهایە ئێوە.

دەکا (ر، پەیام، نوسخەیەک لە «نع»دا): ئەکا.

دەکا (دوو نوسخە لە «نع»دا): دەکەم.
نالی (گل/١، گل/٢، گل/٣، کو، ف، نم/١، نم/٣، ق/٤، کم، گ/٢، س، گ/٣، ن، ص، پەیام، برایی، بەیان/٦٤): کوردی.
نالی (گل): هجری.
نالی (ر، ق/١، ڕۆشنبیری نوێی، ئاسۆ، عن): مەحموود.
نالی (عن، گل/٥، گل/٦): خەستە.
نالی (گل/٨، عن، نم/٣): غەریب و سەیر ئەوەیە لە «نم»دا کە بەناوی غەریبەوەیە و نازناوی (کوردی)یە.
کە جار جار (ف): کە جاری.
بکەن (عق): مکن.
یادی موحیببی (ر، یح): یاد محب.
بەو بۆنەیەوە کە لەم هەڵبەستە جگە لە (نالی) و (کوردی) دراوەتە پاڵ (غەریب)، (مەحموود)، (خەستە) وە (حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی) بۆیە بەجێی خۆی دەزانین ئەوی لە بارەی سەرگوزەشتەی ئەو چوار هۆنەرانەمانەوە دەستم کەوتبێ چەردەیەک بنووسم.
١- خەستە: وەک لە لاپەڕە/٢٣٤ی «نم/١»دا هاتووە، مامۆستا نەجمەدین مەلا نووسیویە: (سەرگوزەشتەی ژیانی ئەم شاعیرە باش نازانم، ڕەنگە لە ناوەڕاستی عەصری سیانزەیەمیندا ژیابێ، دەردەکەوێ خەڵکی سولەیمانی بووە، چونکە شێوەی شیعرەکانی لە شێوەی ولاتی سولەیمانی نزیکە). وە لە لای منیش پانزە پارچە هەڵبەستی چنگ دەکەوێ.
٢- غەریب: مامۆستا عوسمان هەورامی لە (ئاسۆ)دا بە(مەلا مەحموودی گەناوێ)ی ناوبردووە کە نازناوی (غەریب) بووە، دیسان پێنج پارچە هەڵبەستی لای من هەیە و منیش (مەحموود) و (غەریب) بەیەک شاعیر دەزانم.
٣- حەسەن ئەفەندی برادەری کوردی: بەپێی نامەیەکی هۆنراوەی (کوردی) لە ژێر ناوی (دڵم کەیلە لە میحنەتدا ڕەوانە خوێن لە چاوانم) دەردەکەوێ کە زۆر دۆست و برادەری (کوردی) بووە. جاری تر (عن) بەناوی (حسن افندی همزە آغا مصرف)ە و ناوی بردووە کە ئەو (حەسەن ئەفەندییە مامی «پیرەمێرد»ی نەمرە) لە حەسەن ئەفەندی (مەصرەف) بووە.

### (ئەمیش تاکە ناو کۆیی و پەراگەندەکانە)

ئەو تاکە هەڵبەستی چوار هۆنەرەمان (٢٢) تاکی و ناو ئەوانەدا ئەم (١٠) تاکەی دوایی تەنیا سەرچاوەیان (ئاسۆ)یە و هەمموو بەناوی (مەحموود)ەوەن:
١- (بەتەنهایی من و گەنجی کەساسی کەسم ئێوە و، کەسی باوک و براتان)!!
ئەم تاکەی سەرەوە لە سەرچاوەکەیدا پانزەیەمینە و ئەشێ وشەی (گەنج)ەکەی (کونج) بێ

هەرچەندە نیوەی دووەمیشی لاوازە.

٢- (بەبێزاری نەخۆشی تەشنەلەب بووم          لە منتان شاردەوە ئاوی شیفاتان)

ئەم تاکەی سەرەوە لە سەرچاوەکەیدا حەڤدەمینە، ئەشێ لە جێگەی (نەخۆشی) وشەی (نەخۆش و) بێ.

٣- (ئەوەند گریام تکا، ئاو رووم ئابرووم          بەلێوم.. گێژاوی حەیاتان)

ئەم تاکەی سەرەوە لە سەرچاوەکەیدا هەژدەمینە، هەروەک ئەبینرێت شێواو و ناتەواوە.

٤- (لە نیهانی قسەتان گوێم گەرچی پڕ بوو          دەمم پڕ بێ لە شیرینیی نەباتان)

ئەم تاکەی سەرەوەش لە سەرچاوەکەیدا بیستەمینە و، نیو باڵی یەکەمی لەنگە و بەتێکڕایی لاوازە.

٥- (لە کەونان چونکە ناساز بوو نەوامان          مەترسن نایە ناڵەی بێ نەواتان)

ئەم تاکەی سەرەوەش لە سەرچاوەکەیدا بیست و یەکەمینە و مامۆستا هەورامی وشەی (کەونان)ی بە(دەورانی دنیا) لێک داوەتەوە و بەڵام دیسان تاڵێکی کەم هێزە وەک هی هۆنەرێکی سەرەتایی وایە.

٦- (سەری خۆم با لە بەردەستان خەلاس کەم          ئەگەرچی ڕۆح و جانە بیکەم فیداتان)

ئەم تاکەی سەرەوەش لە سەرچاوەکەیدا بیست و دووەمینە و، دیسان لاوازە و (روح) و (جان)یش هەر یەکن.

٧- (کەسێکی تر وەدۆزن بەشکە وەک من          بکێشێ میحنەت و جەور و جەفاتان)

ئەم تاکەش لە سەرچاوەکەیدا بیست و چوارەمینە، بەم (وەدۆزن)یدا (مەحموود) هی ناوچەی سلێمانی نییە.

٨- (لە حاڵی زیللەتیشدا من کەسێکم          بەلوطفی عالەمی نادەم جەفاتان)

ئەم تاکە لە سەرچاوەکەیدا بیست و پێنجەمینە و مامۆستا هەورامی بەپەراوێز لەسەری نووسیوە (دووبارەبوونەوەی وشەی - جەفاتان -ی ئەم دێڕە «ئەشێ» وشەیەکی تر بووبێ) کە دیارە (ئەشێ) بەهەڵەی چاپی هەڵبوێردرا بێ.

٩- (خەتامان خۆ نییە ئازاد کەن ئێمە          لە ئەستۆمان بنێن تەوقی خەتاتان)

ئەم تاکەی سەرەوە لە سەرچاوەکەیدا بیست و حەوتەمینە و زۆر لاواز و بێ واتایە و ئاشە و پاشەیە.

١٠- (کە سەبزەی ئارەزوومان وشک و زەرد بوو          بەمن چی چیمەنی سەبزی گیاتان)

ئەم تاکەی سەرەوەش لە سەرچاوەکەیدا بیست و هەشتەمینە و لە واتادا هیچی بەسەر هیچەوە نییە و ئاوەژوو و دوا تاکی زیادەکانی ناو ئەم سەرچاوەیەیە کە لە هەر چل و سێیەمین تاکەکەی تردا نین ئەمانی دواین.

١١- (کە منتان ماتی خانەی کوولی غەم کرد          بەمن چی ڕۆی پیادە و سوار و شاتان)

سەرچاوەی ئەم تاکە لە (ر، ق/٣، ڕۆشنبیری نوێ)دا حەوتەمین و لە (ئاسۆ)دا شانزەمینە و لە هەمووانیشدا بەناوی (مەحموود)ەوەیە، بۆیە خستمانە دوای ئەو (١٠) تاکەی سەرەوە کە ئەوانیش بەهەمان ناوەوەن وە جگە لە (ئاسۆ) هەموو سەرچاوەکانیش بەلای مامۆستا (قەرەداغی)یەوەن کە لە (ڕۆشنبیری نوێ)دایە، بەرامبەر بەنیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە نووسیویە (ئەم نیوە شیعرەم بۆ ساغ نەکرایەوە) بەڵام لە (١٩٨٢/١١/٢٢)دا مامۆستا (قەرەداغی) پێی ڕاگەیاندم کە ئەو نیوە شیعرەی بۆ ساغ بووەتەوە، کە لە یاریی شەترەنجە ئەگەر (پاشا)ی بەرەیەکی ئەو دوو یاریکەرە کوژرا (مات) کرا، ئەو یاریکەرە دەڵێ: (منت ماتی کوولی غەم کرد) و ئەم نیو تاکەش دیاردەیە بۆ ئەوە.

ڕۆی (ڕۆشنبیری نوێ): ڕۆیی.

ڕۆی (ر): روی ، ڕاستییەکەی دەبێ (ڕۆی) بەواتا ڕۆ ڕۆی ئەو پیادە و سوار و شایەی ترە، بەو چی؟ کە شای خۆی مردووە.

١٢- (وجوودم گەر بەخاکیش بێ خودایا　　　گلێنەی چاوی من بێ خاکی پاتان)

ئەم تاکە لە (عن)دا چوارەمینە و بەناوی (حەسەن ئەفەندی)یەوەیە و لە (گل/٣)دا یانزەیەمینە بەناوی (کوردی)یەوە و لە (ر، ق/٣، ڕۆشنبیری نوێ)دا دەیەمینە و، لە (ئاسۆ)دا نۆزدەمینە و بەناوی (مەحموود)ەوەیە، بەم پێیە کە زۆرترین سەرچاوە بە هی (مەحموود)ی داناوە، ئێمەش خستمانە دوای ئەم تاکانەوە کە بە هی (مەحموود) دانراون.

خودایا (ئاسۆ): خودایە.

تا ئێرە ئەو تاکانە بوو، کە درابوونە پاڵ (مەحموود) جگە لە تاکی دواییان دوانزەیەمین کە بەناوی (کوردی) و (حەسەن ئەفەندی)شەون، و ئەم نۆیەمین تاکەی دواییش هەرچەندە بەناوی ئەم یا ئەو هۆنەرەوەن، بەڵام لەسەر هەر تاکەیان زۆرترین سەرچاوە بە هی (غەریب)ی داناوە، بۆیە ئەوانیش بەڕیز دەنووسم، کە:

١٣- (ایلاهی من ببم ڕۆژی دوصەد جار　　　بەقوربانی گەدا و پادشاتان)

ئەم تاکە لە (گل/١، ف، جلی، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان: ٦٤)دا حەوتەمینە وە لە (برایی)دا هەژدەمینە وە لە (گل/٢، نم/٣)دا نۆزدەمینە و هەموو بەناوی (کوردی)یەوە نووسیویانە وە لە (عق، بەیان/٦٢)دا دراوەتە پاڵ (نالی) و، حەوتەمین تاکە هەروەک ساغیش کرایەوە هی (نالی) و (کوردی) نییە ئەمجا لە چوار هۆنەرەکەدا (عن) بەناوی (حەسەن ئەفەندی)یەوە وەری گرتووە، بەڵام لە سێ سەرچاوەی (گل/٨، نم/٣ و لە نوسخەیەکی تری «عن»دا) بەنۆزدەمین تاکی (غەریب) دانراوە بۆ بەجارێ خستنە ڕیزی ئەو تاکانەوە کە دەنگی (غەریب)یان لەسەر هەیە هەتا ڕۆژێک دێ ساغتر دەبێتەوە.

١٤- (لەگەڵتان عومری خۆم صەد جار تەلەف کرد　　　نییە عومری بەمەرگی خۆم وەفاتان)

ئەم تاکە لە (گل/٢) سێیەمینە و لە (نم/٣، برایی)دا حەوتەمینە وە لە (گل/٣)دا دەیەمینە و،

له هەموویاندا بەناوی (کوردی)یەوە کە هی (کوردی) نییە، بەڵام لە نێوان چوار هۆنەرەکەی تردا بەناوی دووانیانەوە هاتووە کە یەکەمیان (مەحموود)ە و دەنگی لەسەر کەمە کە لە (عن)دا سیانزەیەمینە وە لە (ئاسۆ)دا چواردەمینە، ئەوی کەیان (غەریب)ە، کە ئەم دەنگی لەسەر پترە و لە سێ سەرچاوەی (گل/٨، نم/٣)دا حەوتەم و لە (عن)دا دوانزەیەمینە و لەم هەرسێ سەرچاوەیەدا بەناوی (غەریب)ەوەیە کەواتە بەپێی سەرچاوە ئەوا لێرەدا جارێ لەگەڵ ئەوەکانی (غەریب) ریزم کرد. چونکی لە تاکی پێشوودا تەنیا (حەسەن ئەفەندی) بەیەک دەنگەوە بەرامبەر بە(غەریب) بۆ کردم، بەیەکەم بەڵام لێرەدا (مەحموود) بەدوو دەنگەوە بەرامبەریەتی کردمە دووەم.

لەگەڵتان (نم/٣): لە گلستان (و نوسخە): لە گلشەن. ئەمیش هەڵە و لەنگە.

نییە (گل/٨): نیو.

مەرگی (گل/٨): عمری.

١٥- (لە بەرگی عەیش و صیحەت خۆم دەکەم رووت          بڵا دەستی من و چاکی کەواتان)

ئەم تاکە لە (برایی)دا هەشتەمینە و لە (گل/٢، نم/١)دا نۆیەمینە بەناوی (کوردی)یەوە کە دەرکەوت هی (کوردی) نییە بۆ چوار هۆنەرەکەی تریش ناوی سیانیان هاتووە کە (حەسەن ئەفەندی)یان تەنیا لە یەک سەرچاوەی (عن)دا بەسیانزەمین تاک هاتووە وە، (مەحموود)یان لە دوو سەرچاوەی (ئاسۆ)دا بەشەشەمین تاک و لە نوسخەیەکی تری (عن)دا، بەچواردەمین تاک هاتووە، بەڵام (غەریب)یان، بەتەنیا سێ دەنگی هەیە واتە لە (گل/٨، نم/٣، عن)دا و لە هەموویاندا نۆیەمین تاکە، بۆیە بەپێی زۆریی دەنگەکە، کردمنە سێیەمین تاک لەگەڵ ئەوەکانی دەنگی (غەریب)یان لەسەر زۆرترە هەتاکو ساغتر دەبێتەوە.

صیحەت (گل/٨، نم/٣، ئاسۆ): صوحبەت.

دەکەم (برایی): ئەکەم.

١٦- (جەفاتان دام و کوشتمتان بەزاری          نزولی رەحمەتە جەور و جەفاتان)

ئەم تاکە لە (گل/١، ف، جلی، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، پەیام، بەیان/٦٤)دا شەشەمینە و لە (برایی)دا شانزەیەمینە و لە (گل/٢، نم/٣)دا حەڤدەیەمینە و هەموو بەناوی (کوردی)یەوەن و لە (عق، بەیان/٦٢)ش داویانەتە پاڵ (نالی) شەشەمین تاک کە هی هەردووکیان نییە و تەنیا لە (گل/٨، نم/٣)دا بەناوی (غەریب)ەوەیە بۆیە ئەویشم لێرەدا ریز کرد.

١٧- (ئەگەر سەر بوو ئەگەر ماڵ بوو ئەگەر رۆح          هەموو رۆین، چییە ئیتر تەماتان)

ئەم تاکە لە (گل/٢، نم، برایی)دا چوارەمینە و لە (گل/١، ن، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، بەیان، بەیان/٦٤)دا یانزەیەمینە و لە هەموویاندا بەناوی (کوردی)یەوەیە و، لە (عق، بەیان/٦٤)یشدا نۆیەمینە و بەناوی (نالی)یەوەیە کە وەک ساغم کردەوە هی هیچ کامیان نییە، ئەمجا بەپێی

سەرچاوە لە نێوان دوو هۆنەری تردایە کە (عن) بەشەشەمین تاکی (حەسەن ئەفەندی)ی داناوە بەڵام لە دوو سەرچاوەدا کە (گل/٨، عن)، بە هی (غەریب)یان داناوە و چوارەمین تاکە، بۆیە من بەپێی ئەم زۆریی دەنگە لێرەدا لەگەڵ ئەوەکانی (غەریب) ڕیزم کرد تا ڕۆژی خۆی.

ماڵ (کم، گ/٢، س، گ/٣، کو، ن، نم/١، پەیام، بەیان/٦٤): دڵ.

ڕۆح (نم/٣، برایی): دڵ.

ڕۆین (عق، نم/٣، پەیام، برایی، بەیان/٦٤ و ٦٢): ڕۆیی.

١٨- (لە پێشدا لوطفتان بێ گفتوگۆ بوو ئەمێستا نابیەم، حەتتا صەداتان)

ئەم تاکە لە (برایی)دا سیانزەیەمینە و لە (گل/٢، نم/٣)دا چواردەیەمینە و بەناوی (کوردی)یەوە بوو کە هی ئەو نییە، بەڵام بەناوی دووان لە چوار هۆنەرەکەوە لە سەرچاوەکاندا ناویان هاتووە کە ئەوانیش یەکەم: (مەحموود)، کە تەنیا یەک دەنگی هەیە و ئەویش لە دەیەمین تاکی (ئاسۆ)دایە و ئەویکەش (غەریب) و کە لە دوو سەرچاوەدا (گل/٨، نم/٣)دا بەچواردەمین تاک ناوی هاتووە. بۆیە ئەمیشم لێرەدا دانا تاکو ساغکردنەوەی تری.

لە پێشدا (نم/٣، برایی): لە پێشا.

لوطفتان (نم/١، برایی): لفظیان = لەفزیان.

بێ (ئاسۆ): با.

ئەمێستا (نم/٣): امیستە و، بەهەڵەی چاپی لە (ئاسۆ)دا (ئەڤیستا) نووسراوە.

نابیەم (نم/٣): نابیم.

١٩- (بەصەد جەور و جەفا تا ڕاغیبیش بووین نەبوو غەیری جەفا زەرڕێک جەزاتان)

ئەم تاکە لە (برایی)دا پانزەیەمینە و لە (گل/٢، نم/٣)دا شازدەمینە وە بەناوی (کوردی)یەوەیە کە هی ئەویش نییە، بەڵام لە چوار هۆنەرەکەی تر، ناوی سێیانیان هاتووە لەوانە دووانیان یەکی یەک دەنگیان هەیە کە (مەحموود)ە لە (ئاسۆ)دا دوانزەمینە و (حەسەن ئەفەندی)یە لە (عن)دا پێنجەمینە. بەڵام سێیەمەکەیان دوو دەنگی هەیە کە لە (گل/٨، نم/٣)دا بەشانزەیەمین و بەناوی (غەریب)ەوەیە، لەبەرئەوە دیسان ئەم تاکەم لە ڕیزی ئەوانی ناوی (غەریب)یان زۆرتر لەسەرە دانا، وەک بناغەیەک بۆ ساغکردنەوەی:

ڕاغیبیش (نم/٣): ڕاغبت.

ڕاغیبیش (برایی): ڕاغیبەت.

جەفا زەرڕێک (نم/٣): جفا و زوریک.

جەفا زەرڕێک (برایی): جەفا و زۆری.

جەزاتان (نم/٣): جفاتان.

وە ئەم تاکەش لەگەڵ شێواویدا دیسان لاوازە و (جەفا)ی تیا دووبارەیە.

٢٠- (کە مەحکووم بم بەنەومیدیی دیارم غەریب و بێ کەسم خەستەی فیداتان)

ئەم تاکە لە (گل/٣)دا بەناوی (کوردی)یەوە دوانزەمین تاکە و دیارە هی ئەویش نییە وە بەناوی سێ هۆنەری ترەوەیە کە لە (عن)دا هی (مەحموود) و دوانزەمینە دیسان لە (عن)دا هی (خەستە) و سیانزەمینە، بەڵام لە (گل/٨، عن)دا بەناوی (غەریب)ەوەیە کە بەڕیزە بیستەم و حەڤدەیەمین تاکە و بەم پێیە لەگەڵ ئەوانی (غەریب)دا، جارێ پارێزراوە، وە بەوەدا کە بەناوی (غەریب)ەوە ناوی (خەستە)ی تیا هاتووە هەر جارێ کراوەتە هی یەکێکیان، وە هێشتە چاپیش نەکراوە.

٢١- (لە پێشتان بووم بەتوهمەت ئاشنا بووم ئەبێ چی بێ ئەگەر کەوتمە دواتان)

ئەم تاکە لە (ن، ص)دا بەناوی (کوردی)یەوەیە کە هی ئەویش نییە و تیایاندا چواردەیەمینە و تەنیا لە نوسخەیەکی (عن)دا بەناوی (غەریب)ەوەیە بۆیە خستمە دوا تاکی (غەریب)ەوە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٢٢- (بڵا با من لە شامی غوربەتا بم بەشەرتێ..............................)

سەرچاوەی ئەم تاکە کە دواییەکەشیمان لەبەر پەرپووتی بۆ نەخوێندرایەوە تەنیا (عن)ە کە دووەمین تاکی (حەسەن ئەفەندیی برادەری کوردی) داناوە و بەو بۆنەیەوە کە ناوی کەسێکی تری لەسەر نەهاتووە جارێ با هی (حەسەن ئەفەندی) بێ.

لەم تاکە ئاوێتانەدا دەبینرێت بەناوی (خەستە)وە چیمان جیا نەکردەوە لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرچاوەکاندا ناوی هاتووە هەروەها لەم یەک تاکەی دواییشیان بەولاوە بەناوی (حەسەن ئەفەندی)یەوە چیترم دانەنا کە ناوی ئەویش هاتووە، ئەمەش لەبەرئەوە کە سەرچاوەکان بەزۆری بەناوی (مەحموود) و (غەریب)ەوە نووسیویانن و هێشتە چاپیش نەکراوە.

ئەمجا ئەم پارچە هەڵبەستە لە ئاڵۆزترین پارچەکان بوو کە لێکۆڵینەوەی هۆنراوەی (کوردی)مان لەگەڵ کرد و گەیشتمە دەقەکەی و بەپاڵ ئەویشدا ئەوی (نالی)شم بۆ ساغ کرایەوە، بەڵام بەپێی چوار هۆنەرەکەی تر لەوەندە پترمان بۆ دیاری نەکرا بەهیواین کە لە دوارۆژا پتر شوێنی خۆیان بگرنەوە، چونکە هێشتا بەئاڵۆزی ماونەتەوە.

**(کۆتایی و هەندێ لە سەرچاوەکان)**

مایەی شادمانیمە کە هەتا ڕادەیەکی زۆر توانیم زاڵ ببم بەسەر کێشەی ئاڵۆزییە بێ هاوتاکانی ئەم شەش پارچە هەڵبەستی (ماڵئاوایی)یەدا. لەم بوارەدا گەلێ خاڵ و ئاگەداریی گرنگ و دانسقەم لەم بابەتەوە ڕاگەیاندوون کە ئەمە یەکەم جارە لە چاپەمەنیی کوردیدا سەر هەڵبدەن.

لە ناوەرۆکی لاپەڕەکانی ئەم بابەتەدا بەدەیان سەرچاوەی دەسنووس و سەرچاوەی جۆراوجۆری بەڵگەییی زانیاریم دەستنیشان کردوون هەروەک ناوی زۆریشیانم نەنووسیون. هەندێ لەوانەیان کە لێرەدا بەبیرمدا بێت کە نەمنووسیون، ئەمانەی دواین کە بۆ ئەم بابەتە سوودی زۆرم لێ وەرگرتوون:

١- ئاترۆ پاتین - سەید حسەین حوزنی موکریانی - بەکوردی.
٢- الادب الجاهلي - طه حسين - بەعەرەبی.
٣- ئیران باستان - حەسەن پیرنیا - بەفارسی.
٤- تاريخ الادب العربي - عیزەت دەروەزە - بەعەرەبی.
٥- التاريخ القديم - سپایزەر - بەعەرەبی.
٦- تەئریخی سولەیمانی و، ولآتی - ئەمین زەکی بەگ - بەکوردی.
٧- تواريخ عديده ومتنوعه - لە بارەی مێژووی تازەی عیراقەوە - بەعەرەبی.
٨- خلاصة تاريخ الكرد وكردستان - ئەمین زەکی بەگ - گۆڕینی لە لایەن محەمەد عەلی عەونییەوە - بەعەرەبی.
٩- دائرة معارف القرن العشرين - ١٠ بەرگ - فريد وجدى - بەعەرەبی.
١٠- ڕاپۆرتی فەلەستینی لە بارەی قارەمانێتیی خاتوونی کورد (حەیات) بلّباسییەوە - بەعەرەبی.
١١- ڕادیۆی لەندەن - وتاری زرە تورکمانێکی کرێگرتەی تورکیا لە بارەی ئەوە کە سەرژمێری تورکمانی عیراق (٣) ملیۆنە لە هاوینی ٢٠٠٤ز.دا - بەعەرەبی.
١٢- رحلة ريچ/١٨٢٠ - بەعەرەبی.
١٣- رحلة متنكرة - سۆن - ٢ بەرگ - بەعەرەبی.
١٤- زەردەشتی - پوور داوود - بەفارسی.
١٥- سموم الافعى الصهيونية - عبدالجبار فهمى - بەعەرەبی.
١٦- العثمانيه - فريد وجدى - بەعەرەبی.
١٧- العراق القديم - طه باقر - بەعەرەبی.
١٨- فرهنگ عميد - بەفارسی.
١٩- فەرهەنگی شیرین - فاضل نظام الدين - بەعەرەبی بۆ کوردی.
٢٠- القرآن الكريم - بەعەرەبی.
٢١- المنحرفون (لە بارەی خراپکارییەکانی بەعسییەوە/١٩٦٣) - بەعەرەبی.
٢٢- موسوعة الادب - المهندس - وهبة - بەعەرەبی.
٢٣- مشاهير الكرد وكردستان - محەمەدئەمین زەکی بەگ - گۆڕینی لە لایەن خاتوو دکتۆرە سانیحە ئەمین زەکییەوە - بەعەرەبی.
٢٤- هەمبانە بۆرینە - هەژار و گەلێکی تریش.

٣٩

## ناصیحی موشفیق

١- ناصـیـحی مـوشـفـیق و، ئەی واعـیظـی ئاشـوفـتـەدڵان
شـاویری حـائیـر و، وەی مـودبیـری ئەمـری خـەجـڵان
٢- چارەیی عـــیللەتی حـــیـــرمـــان و دەوای مـــأیووسی
مـۆمـیـا و شـــەربەتی ســـەوداســـەر و ڕەنجـیـدە تەنان
٣- بەقـیـــەدۆزی جگەری لـەت لەتی شـمـشـێـری جـەفـا
مـــەرهەمی ســـینەیی مـــەجـرووحی سـینانی هـیـجـران
٤- داریکی عـــیللـەتی بێ چارەیی وەک من خـــەســـتـــە
بێ نەظارەی روخ و بێ تەجـریبـەیی (نەبض) و (زوبان)
٥- ظاهیـــرا دیجلەیی لوطف و کـــەرەمت هاتەوە جـــۆش
بۆیە ڕەشـــحـــەی قـــەڵەمت جـــاریە بۆ توشنە لەبان
٦- نامـــەکـــەت وا بەکـــەرەم کـــردووە زیبی تەحـــریر
بۆ نەجـــاتی دڵ و ئارامـــیی تەن و ڕاحـــەتیی جـــان
٧- (ئەو) لەمە مـونشـەریحـە: گـەر هەتە؟؟ دەعـیـەی مـەردی
قـەت مـەبە، طالیـبی سـیـمین زەقـەن و، مـاه ڕۆخـان!!
٨- یا دەفـەرمـووی: چیـیە؟؟ ئەم عـوزلەتی وەحش ئالوودە،
یا: لە جل عـاری، لە کـول (غـار)ی، لە (غـار)ی لە ژیان
٩- گـوێ لە من بگرە دەمێ، ناصـیـحی پڕ لوطف و کـەرەم
تا عـــەیان کـــەم لە تۆ ئەم دەردە چ ظاهیـر چ نیـهـان
١٠- ڕوو (لە دووی ئەهلی دڵ و جەمعی وەفا) بۆ کوێی کەم؟؟
نەک لە (جل) بۆچی لە پێـست لاری نەبم ســا قــوربان
١١- ئەوی ڕووی داوە لە من کـــاری دڵی بەدبەخـــتـــە
وا منی کـــردووە بۆ تیـــری مـــەلامـــەت بەنیـــشـــان

١٢- بێ فەڕ و گوێ لە نەصیحەت نەگر و سەرکەش ڕیند
سەفڵە و هەرزە و ئەوباش و بەدئەطوار و نەزان
١٣- تا، لە لای من بوو لە مەنعی نەدەبووم قەت غافڵ
گەه، بەلۆمە و هەڕەشە، گا، بەدەخیل و ئامان
١٤- کە ئەویش زانی، ئەمن (ئەومە) لەسەر مەنعی ئەویی
ناعیلاج ئاخری کردی لە منیش عەطفی عەنان
١٥- ساڵە وەختێکە، بووە ئێستە بەمەجبووری کەسێ
فاریغ ولبالە: لە طەعنەی من و لۆمەی دیگەران
١٦- ئەوە سەر مەنشەئی ئیفساد و، ئەمن بەدناوم
ئەوە موستەوجیب و، من ئەومە لەزەجر و لێدان
١٧- گەر بەدەستم بکەوێ شەرت بێ لە پێش چاوی ئەتۆ
جاڕس و موفتەضەحی کەم وەکو (کوردی) لە جیهان

........................................

١- ناصیح: ئامۆژگاریکار.
موشفیق: بەبەزەیی، دڵسۆز.
واعیظ: پەندگۆ، پەنددەر، پەندوێژ.
ئاشوفتە: پەشێو، شێواو، تێکچوو، دێوانە، غەمبار، بێ دەق.
شاویر: ڕاوێژکار.
حائیر: سەرسام.
مودبیر: کار ڕێکخەر.
ئەمری: مەبەست لە (کاروباری)یەتی.
خەجڵان: شەرمەزاران، شەرمن (بۆ تاک و بۆ گشت – کۆ –)یە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (ن، شح، مع، ف، ش، کش «مستەفا بەگ»، نم، ق/٤، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە نێوانیاندا (کم)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی. لە (ن، شح)دا ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە، لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسراوە:
(جوابنامەء مصطفی بیک کوردی برای فخر العلماء سنندج رحمهما الله) واتە: (ئەم هەڵبەستە وەڵامنامەی مستەفا بەگی کوردییە بۆ مەلا محەمەدی مەردۆخیی فەخرولعولەمای سنە، بەناوبانگی نووسیوە خوا لە هەردووکیان خۆش بێت). بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو نامەیەی کە (فەخرولعولەما) بەهەڵبەست بۆ (کوردی)ی نووسیوە، دەستم نەکەوتووە کە (مامۆستا مەلا

عەبدولکەریمی مودەریس)یش فەرمووی (کەوا «فەخرولعولەما» هەڵبەستێکی لەسەر هەمان کێش و پاشبەند بۆ «کوردی» نووسیوە کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوە وەڵامەکەیەتی و، گوایە لەسەر ئەوەی کە مستەفا بەگی کوردی لە ساڵانی دواییی تەمەنیا و پاش ڕووخانی فەرمانڕەواییی بابان کەوتووەتە بارێکی دژوار و ناهەمواری دەروونی «نەفسی»ی ئەوتووەوە کە بەدێوانەیی و گوێی بەخۆ نەدان و لە خزم و دۆست و ناسیاوان دوورەپەرێزی گرتن و لە کۆڕی وێژە و زانستی خۆ دوورخستنەوەدا ژیاوە و هەندێ جاریش بەڕووتوقووتی بەشار و گوندانددا سووڕاوەتەوە.

جارێکیان فەخرولعولەما لە سنە ئاوقای دەبێ و لەگەڵیا خەریک دەبێ تا ئەیباتە مزگەوتەکەی خۆی و لەوێ ئەو نامە هەڵبەستەی کە لەوەپێش بۆی ئامادە کردووە بۆ «کوردی»ی دەخوێنێتەوە کە بریتی بووە لە ئامۆژگاریکردن و ڕێنومایی بۆ گۆڕینی ئەو بارەی ژیانی و کەوتنەوە سەر بارێکی ئاسایی و دەربڕینی بەزەیی و دیاریکردنی پایەی بەرزی هونەری و فاملیاییی «کوردی» و ڕەخنە لە هەندێ هەڵبەست گرتنی و ئامادەیی پیشاندانی بۆ پێشکەشکردنی یاریکاری و... هتد.

«کوردی» ئەو نامەیەی لێ وەر دەگرێ و لە پشتی هەمان نامە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی لە هەمان دانیشتندا بۆ دەنووسێتەوە و دەیداتێ و دیسان سەری خۆی هەڵدەگرێتەوە).

زۆر موخابنە ئەو هەڵبەستەی فەخرولعولەما بەر ئەم پەڕاویە نەکەوت.

ناصیحی (ش، نم/١): ای ناصحی.

موشفیق و (ش، کم): مشفق.

ئەی (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، کش، ق/٤): وەی.

ئەی (ش): وای.

واعیظی (ن، ش): واعظ.

ئاشوفتە (ن، شح، مع، نم/١، ش، کم): آشفتە.

شاویری (ن، کم): شادر.

شاویری (ف، نم/١): شاورو.

حائیر و (کم): حائرە.

حائیر و (کش): حاور.

حائیر و (ف): حاویر.

حائیر و (ش، ق/٤): حالم و.

وەی (ف، کش، ش): ای.

مودبیری ئەمری (کش): مدبر امر.

٢- عیللەتی: دەردی، نەخۆشی، خەستەیی.

حیرمان: پرزە بڕاوی، بێ بەشی، بێ بەهرەیی، نائومێد.

دەوای: دەرمانی.

مأیووسی: بێ هیوایی، ئاوات بڕانی.
مۆمیا: دەرمانێکە ئازار و نائارامیی لەش ناهێڵێ و لەشی مردووی پێ خۆش دەکرێت کە نەڕزێ و بۆگەن نەکا و هەزاران ساڵ بمێنێتەوە (تەحنیط).
سەوداسەر: دڵدار وە یا نەخۆشی دەمار (عەصەبی).
ڕەنجیدە تەنان: لەش ڕەنجاوان. ئەرک کێشەکان، ڕەنجبەران، لەش ڕەنجاوان.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا نییە.
مۆمیای (کش): مۆمیا و.
ڕەنجبدە تەنان (گ/٣): ڕەنجیدەتان.
٣- بەقیەدۆز: جۆرە دروومانێکە بەهێزترە لە درووماني ئاسایی بۆ پێڵاو، درووماني دووبارە.
شمشێر: جۆرە چەکێکی بڕندەیە.
مەجرووح: بریندار، زامدار، کول.
سینان: نووکە ڕم (سەرە ڕمب).
هیجران: لێجیایی.
ئەم تاکە لە (کش)دا نییە و لە (ش، ق/٤)دا دووەمینە.
بەقیەدۆزی (ش): بقیەدوز.
جگەری (کم): جگەر.
مەجرووحی (ش): مجروح.
سینانی (گ/٣): سەنانی.
هیجران (ش، ق/٤): مژگان.
لە چاپەکاندا (مۆمیای) هاتووە کە هەڵە و جیایە لە (شەربەت).
٤- داریک: هەستکار، زانەر. مەبەستی وەک: (پزیشک)ە.
عیللەت: لێرەدا بەپێچەوانەی واتەی تاکی پێشووەوە مەبەستی لە (هۆی نەخۆشی)یە.
بێ چارە: بێ عیلاج، بێ دەسەڵات.
خەستە: نەخۆش، دەردەدار.
نەظارە: تێ ڕوانین (بینەر)، (فەحص)کردن و، واتە تەماشاکردنی ڕووی نەخۆشەکەیە، وەک پزیشکێکی شارەزا بەڵام ئەم بەبێ ئەو (نەظارە)یە نەخۆشییەکەی دەزانێ.
نەظارەت مەبەستی لە پشکنینی (فەحص) پزیشکە.
ڕوخ: ڕوو - کە پزیشکی چاک بەڕوخساردا جۆری نەخۆشی دەزانێ.
تەجریبە: تاقیکردنەوە.
نەبض: پلدانی دەمار - کە پزیشک باری لێدانی دڵ و جووڵەی خوێنی پێ دەزانی.
زوبان: زمان و مەبەست لە تەماشاکردنی زمانە لە لایەن پزیشکەوە بۆ ناسینەوەی ڕواڵەتی نەخۆشی لە بار و چۆنێتی و ڕەنگ و بەلخ و تەڕی و، وشکیی زمانەکەوە (بەڵام ئەم بەبێ دەوانە دەیزانێ)ی مەبەستە.

ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا نییە وە لە (کش)دا سێیەمینە.
داریکی (نم/١، نسخە لە «ن»دا): دارویی.
داریکی (کم): وارەکی – هەڵەیە.
داریکی (ق/٤، گ، س، کش): وارەگی. ئەمیش هەڵەیە.
داریکی (گ/٣): وارِەگی – دیسان هەڵەیە.
بێچارەیی وەک (نم/١): بیچارە وەکو – ئەمیش لەنگە.
من (کم): منی – ئەمیش لەنگە.
ڕوخ (کم): روح.
ڕوخ (نم/١): رخ.
بێ تەجریبەیی (گ/٣): بێ تەجروبەیی.
بێ تەجریبەیی نەبض و زوبان (نم/١): بی تجربەبی نبز و بیان.
بێ تەجریبەیی نەبض و زوبان (ف): بێ فکر و بێ بند و بیان.
نەبض و زوبان (کش): بند و بیان.
زوبان (گ/٣): زەبان.
٥– ظاهیرا: دیارییە، ئاشکرایە، دەردەکەوێ.
دیجلە: یەکێکە لە دوو ڕووبارە مەزنەکەی عیراق (دیجلە و فورات).
لوطف: دڵسۆزی، چاودێری.
کەرەم: بەخشندەیی، پیاوەتی.
هاتەوە جۆش: نیشانەیە بۆ نامەیەکی تری فەخرولعولەما کە بۆ کوردی بەر لەم نامەیەی کە ئەم وەڵامەی سەرەوەی داوەتەوە
کە ئەمەم لە (میرزا عەبدوڵڵای غەریقی هۆنەری بانەیی کە لە ساڵە چلەکاندا لە سولەیمانی کۆنەفرۆش بووە، بیستووە و گوایە ئەو نامەیەی یەکەمی فەخرولعولەما و وەڵامەکەی (کوردی)ش بە(هەورامی) بووە کە بەداخەوە ئەو دوو وەڵام و نامەیەشم دەست نەکەوتووە. کە هەردووکیان لە بەغدا بەیەک گەیشتوون و لەوێ هەردووکیان هەڵبەستەکەیان داناوە.
ڕەشحە: پاڵاوتە، ڕینگاو، دەڵاندن – هەروەها (ڕەشحە) بەواتە لستنەوەی (کار و بەرخ و کارمامز)ە لە لایەن دایکیانەوە لە کاتی گۆشکردندا بۆ وشککردنەوە و بووژاندنەوە – کە ئەمەش دیاردەیەکی (کوردی)یە بۆ ئەوە گوایە: بە لوطفی کێ وەک دایک و باوکییەوە ئاوا (فەخرولعولەما) ئەوی لاواندووەتەوە.
قەڵەم: خامە.
جاریە: ڕەوانە، وەک ڕووبارێک ئەو پاڵاوتەی خامە و لوطفە دەڕوا.
توشنە لەبان: لێو تینووان، دەم وشکان، لێو بەبار.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا نییە و لە (کش)دا چوارەمینە.
کەرەمت (گ/٣): کەڕەمت.

هاتەوە (نم/١، کم): هاتوتە.
هاتەوە جۆش (ف، کش): هاتە أجوش.
توشنە (گ/٣): تەشنە.
بۆیە (ف، کش): بویی.
٦- زیب: زینەت، ئارایش، ڕازاوە.
تەحریر: نووسین.
نەجات: ڕسگار، دەرباز.
ڕاحەت: ئاسوودەیی، لەسەرخۆیی، ئاسایش، حەسانەوە.
جان: گیان.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا سێیەمینە و لە (کش)دا پێنجەمینە.
کردبوو (گ/٢، س، گ/٣): کردبووە.
زیبی (ش): زیب.
زیبی (کش): زەیلی.
نەجاتی (ش): نجات.
ئارامی تەن و ڕاحەتی (ش): ئارام تن راحت.
جان (گ/٢، س، گ/٣): گیان.
(کوردی) لەم تاکەیدا کە وشەی (کەرەم)ی وتووە، ئەمەش یەکێکە لەو ڕواڵەتە دانسقانەی ئەو. چونکی ئەو یەکێک بووە لەو هۆنەرە هەرە کەمانەی کە ئەم وشەیەی لە هەڵبەستیدا بەرامبەر بەخەلق بەکار نەهێناوە، بەپێچەوانەی زۆربەی هۆنەرانی تری ناوچەکە و کوردیشەوە کە لە خوازەڵۆکیانەوە ئەم وشەیان گەلێ جار لە هەڵبەستیاندا بەکارهێناوە، بۆ سوود وەرگرتن لەوەی کە هەڵبەستەکەیان بۆ وتووە، بەڵام «کوردی» لێرەدا کە ئەم وشەیەی بەکاربردووە ئەوەی دیاری کردووە کە کەرەمەکە (نامە)یە نەک پارە و شتی تر ئەمەش ئەوپەڕی نەفس بەرزی و ڕەوشت پاکیی «کوردی» ئەگەیەنێ.
لە چاپەکاندا سەرەتای نیو باڵی یەکەم بەم جۆرەیە: (نامەیێکت بەکەرەم کردبوو ) - نووسراوە.
٧- ئەم نیو باڵی یەکەمە بەپێی سەرچاوەکانی تری بەم جۆرە بوو: (مونشەریح بوو لەوە کە تۆ،......) بەپێی دوو سەرچاوەی (ن، شح) وەک سەرەوەم لێ کرد کە گونجاوترە، هەروەها نیو باڵی تاکی پێشوو (شەشەم)یشم لەسەر ئەو دوو سەرچاوەیە چاک کرد.
ئەو: مەبەستی لە نامەکەی (فەخرولعولەما)یە.
مونشەریح: لێکدەرەوە، ڕوونکەرەوە، بریتییە لە.
دەعیە: ئارەزوو، گێز.
طالیب: خواستیار.
سیمین زەقەن: چەناگەی زیوین، مەبەستی لە ڕەنگی سپیی چەناگەی خڕ و تۆپە.
ماه ڕوخان: ئەوانەی ڕوویان وەک مانگە، جوانان.

ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا چوارەمینە و لە (کش)دا شەشەمینە.
هەتە دەعیەی (کش): هەیە پیت داعیەء.
٨- عوزلەت: لاگیر، دوورەپەرێز، لاتریسکە.
وەحش ئالوود: کێوییانە، کێوی ئاسا.
جل: بەرگ، پۆشاک، مەبەستی لە هەندێ جار بەڕووتی گەڕانی بووە.
عاری: ڕووت، (لاری) بوون لە شتێک.
کول: گشت، هەمووان، خەڵکی، خەڵکان، هەموو کەس.
(غـار)ی یەکـەم بەواتە دوورکـەوتنەوە (بەغـار) لە خـەڵک و دووەمـیـان بەواتە ئەشکەوتە - مەبەستی لە خەڵک خۆ بەدوورخستنی (کوردی) بووە.
ئەم تاکە لە (ن، شح، نع، ق/٤)دا هەیە هەشتەمینە لەوانی تردا نییە، هێشتە چاپیش نەکراوە و (کوردی) جیناس ئارایی لە (جل و کول) و (غار غار و غار)دا کردووە و جوانیی وێژەیی لەم تاکەیدا هەیە.
٩- عەیان: ئاشکرا، ڕوونکردنەوە.
ظاهیر: دیاری، ئەوی بەڕووەوەیە.
نیهان: شاردراوە، نادیار، پەنهان.
ئەم تاکە لە (ش)دا پێنجەمینە و لە (ق/٤)دا شەشەمینە و لە (کش)دا حەوتەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا هەشتەمینە و لەوانی تردا نۆیەمینە.
لە تۆ ئەم دەردە (ف): لە تو ام نیکتە.
لە تۆ ئەم دەردە (ش): بو تو ام نیکتە.
لە تۆ ئەم دەردە (کش): بەتو ام نیکتە.
لە تۆ ئەم دەردە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): بەتو ئەم دەردە.
نیـهان (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): عـەیان - ئەمـەش هەڵەیە و لەگەڵ واتای هەڵبەستەکەدا ناگونجێ بۆیە:
لێرەدا بەسـەر ئەوەوە ناچم کە لاپەڕە ٣ی دیوانی کوردی - چاپی سێـیەم مامۆستـای نەمر (گـیـوی مـوکـریانی) نووسـیـویە: کـە سـەرچاوەیەکی چاپی (دوو)، و (سێ)ی ئەم دیوانە کەشکۆڵێکی دەسنووسی (حاجی قادری کۆیی)یە لە کاتێکا بەفەقێیەتی لە (سابڵاخ) بووە نووسیویەتەوە و، هەڵبەستی (شێخ ڕەزا)شی تیایە.
سـەرچاوەیەکی چاپی (دوو)، و (سێ)ی ئەم دیوانە کەشکۆڵێکی دەسنووسی (حاجی قادری کۆیی)یە لە کاتێکا بەفەقێیەتی لە (سابڵاخ) بووە نووسیویەتەوە و، هەڵبەستی (شێخ ڕەزا)شی تیایە.
ئەمجا (حاجی قادر) کە لە (١٨٥١ز.)دا لە دایک بووە ئەبێ تەمەنی ئەو نووسینەوەیەی (٢٥) ساڵان بووبێ کە ئەوسایە (شێخ ڕەزا) تەمەنی (٣) ساڵان بووە و هێشتە شیعری دانەناوە. هەروەها ئەم هەڵبەستەی (کوردی) هی دوا دوای ژیانی و پاش ڕووخانی بابان (١٨٥١)ە و،

دەکەوێتە دوای ١٥ ساڵێک لە فەقێیەتییەکەی (حاجی)، جگە لەمانەش (حاجی) هەڵەی وا ناکا وشەی (نیهان) لە جێگەی (عەیان) بنووسێ دەشبینرێت سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە زۆر کۆن نییە، بۆیە (ئەو لاپەڕە «٣»یە)ی لای گیو چاو پیا خشاندنەوەی دەوێت.

١٠- لە دووی: لە دوای، لە پاش.

ئەهلی دڵ: هاواڵە هونەرمەندە پەرتەوازەکانی مەبەستە.

جەمعی وەفا: مەبەستی لە داروەستەی فەرمانڕەواییی بابانە کە ڕووخاون.

پێست: مەبەستی پێستی لەشی خۆیەتی کە لەویش لارییەتی و دەیەوێ دای ماڵێ نەک دادڕین و فرێدانی بەرگ لە داخانا.

ئەم تاکە هەر لە (ن، شح، مع، ق/٤)دا هەیە و دەیەمینە و لە سەرچاوەکانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە (ق/٤)یشدا هەیە و حەوتەمینە.

(کوردی) لێرەدا ئەوپەڕی نائارامی، پشێویی دەروونی و بەئەمەکی خۆی بەفەلسەفەیەکی تایبەتی لە ژیانیا ڕاگەیاندووە و دەبینرێ لەو بای شێت ئاساییەیدا ئەم هەڵبەستە بەهێزەی داناوە.

١١- بەدبەخت: لێرەدا مەبەست لە زۆردارە.

مەلامەت: توانجکاری.

ئەوی ڕووی داوە لە من (نم/١، کم): ئەمە ڕویداوە لە من.

ئەوی ڕووی داوە لە من (ش، ق/٤): ئەوی کردویە بە من.

ئەوی ڕووی داوە لە من (کش): آنچە رویداوە لە من.

ئەم تاکە لە (ش)دا شەشەمینە و لە (کش، ق/٤)دا هەشتەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نۆیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا یانزەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

١٢- بێ فەڕ: پووچ، بێ کەڵک.

سەرکەش: سەرکێش، توند و سەرەڕۆ.

ڕیند: فێڵباز، چاونەترس، بێ سنوور، پنتی، زوو بیرکەر، وە (عەربید) -وە لە جێگەی ئەم وشەی (ڕیند)ە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا بەهەڵە و لەبەر وێکچوونی نووسینی، هەیە وشەی (ڕەند)یان نووسیوە و ئەمیش بۆ ئەم شوێنە نابێ. چونکی ئەم ڕواڵەتانەی کە (کوردی) داونیەتە پاڵ (دڵەکەی) خۆیەوە، دوورن لەگەڵ واتای (ڕەند)دا کە: (ڕوو خۆش، زمان شیرین، جوامێر، خواپەرست، گۆشەگیر)ە.

سفڵە: پەست. چی لە بەرچاو نەبوو، پێ نەزان.

هەرزە: هەڵەشە، نەفام، هەڵەوەڕ، خوێڕی.

ئەوباش: سەرسەری، (لەوار = مەوتوور)ی عەرەبی.

بەدئەطوار: بەدخوو، بەدسروشت.

ئەم تاکە لە (ش)دا حەوتەمینە و لە (کش، ق/٤)دا نۆیەمینە و لە (ف، کم، نم/١، گ/٢، س، گ/٣)دا دەیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا دوانزەیەمینە.

بێ فـــەڕ (نم/١، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣، ش، ق/٤، کش): بێ دڵ – ئەمـــەش هـەڵەیە و نـابێ، چونکە خۆی دڵە ئیتر چۆن (بێ دڵ) دەبێ؟؟.

ڕیند (گ/٢، س، گ/٣): ڕەند، ئەمیش هەڵەیە و ڕێنووسی کۆنی (رند)یان بە(ڕەند) وەرگرتووە نەک (ڕیند).

١٣– مەنع: بەرهەڵست، بەرگری، ڕێنەدان.

غافڵ: بێ ئاگا.

لۆمە: سەرزەنشت، توانج.

دەخیل و ئامان: لێ پاڕانەوە، تکا لێ کردن، دەستەوداوێن بوون.

ئەم تاکە لە (ش)دا هـەشـتـەمـینە و لە (کش، ق/٤)دا دەیەمـینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا یانزەیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا سیانزەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

نەدەبووم (ق/٤): نەبووبم.

لۆمە و (ش، ق/٤): زجر و.

گا (ش، ق/٤، کم، گ/٢، س): گە.

دەخیل و ئامان (نم): دخیل و بە امان.

گا بەدەخیل و ئامان (کش): گە دخیل گە بە امان – ئەمەش لەنگە.

وەک لە شوێنی تری ئەم پەڕاوییەمدا هاتووە لە جارێکی دتریشدا، (مەردۆخی – فەخرولعولەما – ئایەتوڵڵای سنەیی) لە (تاران) (کــوردی)ی لە شـــەقـــامــێک بەڕووتی دیوە و ڕەخنـەی لە ڕووتیـیـەکـەی (کـوردی) گـرتـووە و لەوێدا (کـوردی) بەدەمـی وەڵامی داوەتەوە بەڵام وەڵامـێکی فەلسەفیی (مرۆڤایەتی)یانە.

١٤– ناعیلاج: بەناچاری، ناچار.

عەطفی عەنان: وەرگێڕانی جڵەو، لێ لادان، هەڵگەڕانەوە.

ئەم تاکـە لە (ش)دا نۆیەمینـە و لە (کش، ق/٤)دا یانزەهەمـینە و لە (ف، نم/١، گ/٢، کم، س، گ/٣)دا دوانزەیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا چواردەیەمین تاکە.

ئاخری کردی لە منیش (ش، ق/٤): کردی لە من ئاخری ئەو.

ئاخری کردی (کش): آخر کرتی.

لە منیش (کش): لە منیچ.

عەطفی (کش): عطف.

١٥– مەجبوور: دڵبەست، ئەوین، خواستیار، ئارەزوومەند.

فاریغ ولبال (فارغ البال): بێ باک، بێ خەم، خام تەما.

طەعنە: توانج.

دیگەران: ئەوانی کە، خەڵکی.

ئەم تاکە لە (ش)دا دەیەمینە و لە (کش، ق/٤)دا دوانزەیەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا سیانزەیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا پانزەیەمینە.

وەختێکە (گ/٢، س، گ/٣): وەختێکی.
بووە (ش): بوو.
مەجبووری (کش): مجبور.
مەجبووری (کم، گ/٢، س، گ/٣): مەحکومی.
طەعنەی (ش، ق/٤): منعی.
١٦- مەنشەء: سەرچاوە.
ئیفساد: خراپی، ئاشووب، پیسی، گەندەڵی، بۆگەنی، گەنیو.
موستەوجیب: شایان.
ئەم تاکە لە (ش)دا پانزەیەمینە و لە (کش، ق/٤)دا سیانزەیەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا چواردەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە (ن، شح، مع)دا شانزەیەمینە.
موستەوجیب و (نم/١): مستوجبی.
بەدناوم (نم/١): بدنامم.
من ئەومە (گ/٢، س، گ/٣): من کەوتمە.
لەزەجر و (ف): لە بن زجر و.
لەزەجر و (کم): لە بەینی زجر و. **کە ئەمانەش هەموو لەنگن و هەڵەن**
لەزەجر و (ش، ق/٤): لەپی زجر و.
لەزەجر و (کش): لە پی زجری.
١٧- جاڕس: هەراسان، چاش.
موفتەضەح (مفتضح): ریسوا، ئابڕووبراو، ترۆ.
جیهان: دونیا، گێتی.
ئەم تاکە لە (ش)دا دوانزەیەمین و لە (کش، ق/٤)دا چواردەیەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پانزەیەمینە و لە (ن، شح، مع)دا حەڤدەیەمینە و لە هەمووانیشدا دوا تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
گەر بەدەستم بکەوێ (ش، ق/٤): گەر ئەبەر دەستم کەوی.
بکەوێ (نم/١، ف): اکوی.
بکەوێ (نم، گ/٢، س، گ/٣، کش): دەکەوی.
چاوی ئەتۆ (کم، گ/٢، س، گ/٣، کش): چاوی تو.
جاڕس و (کش): جارس.
موفتەضەح (ش): مفتزح. وە تاکەکانی (٢، ٣، ٤، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠، ١٢، ١٤، ١٦) یەک بڕگەی سووک لە کێشیاندا هەیە.

٤٠

## ئەی دوڕی تاجی

١- ئەی دوڕی تاجی سەری شاهانی ئیقلیمی جیهان
شەمسی ئەفلاکی کەماڵ و شەمعی بەزمی عاریفان
٢- ئەی بەنادیدە، بەشوهرەت، صەد وەکو من عاشقت
وەی لە تاوی فیرقەتت عالەم هەموو ڕەنجیدە جان
٣- سابیقەن پرسیت، کە دڵ ئەفسوردە و سەوداسەرم
یا لە سەرمایە هەوا و میهر و شۆری دولبەران
٤- واقیعا، شیرین سوئالێکە، بەڵا، لێکین دەبوو
مەسئەلە بڕوا بەلای شەخصێکی دانا و حاڵزان
٥- من دڵم شێواوە یەکسەر، دەفعی کاروباری خۆم
سا چلۆن پێم دەکرێ ئیتر حەللی عوقدەی سائیلان
٦- گەر دەپرسی مەنزیل و شکڵ و لیباس و طابیعی؟؟
ماڵیان نەزدیک بە بەندیخانەیە و ئاشی ئەحان
٧- ئەسمەرە، لاغیر تەنە، باڵا میانە، کەچ کولاهـ،
سوخمە سەبزە، مەیتەن ئاڵە، چاو خومار، ئەبرۆ کەمان
٨- عاقڵ و دانا و موئەددەب، وەحش و مەغروور و عەجوول،
گەهـ دەڵێ: سنگان، بەعاشق، گەهـ دەڵێ: چاوم قوبان
٩- زود خێز و توند ڕەوتە، مەستە دائیم چاو بەخەو
گاهـ بەدخوو و ظاڵمە، گەهـ موشفیقە و شیرین زوبان
١٠- سا؛ لە هەر کوێ بێ کە مستت گرت؟ سوئالی لێ بکە
ڕازی پەنهانی، سەراسەر بۆت دەکا ئەڵبەت عەیان
١١- ڕەهڕەوت (قادر) بێ بۆ ئیعطای جوابی مەسئەلەت
وەرنە (کوردی) ناتوانێ حاڵی خۆی بۆ بکا بەیان

.................................................................

١– دوڕ: یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان (گەوهەر).
ئیقلیم: یەکێکە لە بەشەکانی جیهان بەپێی دابەشکردنی جوگرافی، هەرێم، کۆن. بەم پێیە دەبوو ئیقلیمەکانی بوتایە، بەڵام کێشی هەڵبەستەکە دەرەتانی نەداوە کە ئەمەش لە هەڵبەستی کۆندا ڕێدراوە و ڕەوایە.
شەمس: ڕۆژ، خۆر.
ئەفلاک: چەرخەکان، ڕێڕەوی ئەستێرەکان.
کەماڵ: هەرە تەواوێتی و زاراوەیەکی صۆفیانەشە.
عاریفان: دانایان و، دیسان وشەیەکی صۆفیانەیە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (ن، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە نێوانیاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە.
وەک دەردەکەوێ ئەم پارچە هەڵبەستە وەڵامی نامەیەکە بەڵام بەداخەوە نەمزانی بۆ کێ و ئەو نامەیە کامەیە و کە ئەگەر وا نەبووایە، لام وایە ئەم هەڵبەستە گەلێ لە ئێستەی ڕوونتر دەبوو.
٢– بەنادیدە: بەنەدیتوویی، نایابی، بەبێ بینین، لە نەدیتە.
شوهرەت: ناوبانگ.
ڕەنجیدە جان: دڵ یەشاو، گیان بەئازار، دڵ شکاو، بەگیان بێزراو.
عاشقت: (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف): موختەلیف.
٣– سابیقەن: لەمەوبەر، لە پێشدا.
ئەفسوردە: غەمگین، زویر.
سەوداسەر: دڵدار.
میهر: خۆشەویستی.
شۆر: ئارەزوو.
سابیقەن (کم، گ/٢، س، گ/٣، ف، نم/١): سابق.
پرسیت (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف): پرسی.
لە سەرمایە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف): لە سەرمایەی.
٤– واقیعا: لە ڕاستییا.
بلا: با وا بێ.
لێکین: بەڵام.
واقیعا (نم/١، گ/٢، س، گ/٣): واقیعی.
سوئالێکە (گم): سوئالیلە = دیارە هەڵەی چاپییە.
بلا (نم/١): بلان.
بلا (کم): بەلان.

بلا (گ/٣، س): بەلاَن.

٥- نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە بارەی دەستووری زمانییەوە پێکەوە نەبەسترانێکی تیایە و ئەشێ لە دەستاودەستا بەهەڵە وەرگیرابێ و ڕاستییەکەیم دەست نەکەوتووە، کە لە پێش (دەفعی)یەوە وەک: (لە)یەک دەخوازێ.

دەفعی: پاڵ پێوەنانی، چاری.

حەل: هەڵهێنان، چارکردن.

عوقدە: گرێ و مەبەست لە سەختیی کارەکەیە.

سائیلان: پرسیارکاران.

٦- مەنزیل: شوێن و مەبەست لە (ماڵ)ە.

شکل: شێوە.

لیباس: بەرگ.

طابیعی: ڕەوشت و خووی، سروشتی.

ئاشی ئەحان: دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتی ماڵی خۆیان (کوردی) و مزگەوتی حاجی ئەحانەوە کە لە هەڵبەستی تریدا لێی دواوم.

طابیعی: (نم/١، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣): طائیفەی - هەروەها لە وەڵامەکانیدا لە تاکەکانی دواییدا لە (طەبع) دەدوێ نەک طائیفە.

٧- ئەسمەر: گەنم ڕەنگ، سەوزە.

لاغیر: لاواز (لاغیر تەن = لەش لاواز)

میان: دەستە، مام ناوەندی، گردە.

کولاه: کڵاو.

مەیتەن: بەرگێکی کۆنی وەک تەکمە وابووە.

٨- عاقڵ: ژیر، هێژا.

دانا: تێگەیشتوو.

موئەدەب: ڕەوشت جوان، پەروەردە چاک، شکۆمەند، ڕێزمەند.

وەحش: کێوی.

مەغروور: بایی، بەفیز، لووت بەرز.

عەجوول: زۆر بزێو، بەپەلە، خێرا، جووڵە جووڵ کەر.

سنگان: جوێنێکە - و ئاواتەخوازی بۆ هاتنی سنگان (بزمار) لە لەشی ئەو کەسەی جوێنەکەی پێ دەدرێ.

قوبان: سووککراوەی وشەی (قوربان)ە (کوردی) جاری کەش بەکاری هێناوە.

عاقڵ (گ/٢، س، گ/٣): عاشق.

وەحش (گ/٢، س، گ/٣): وەحشی.

٩- زودخێز: گورج هەڵسەر، خێرا ڕاپەڕ، سووکەڵە، چوست.

ظالم: زۆردار، ستەمکار.

موشفیق: دڵسۆز، بەبەزەیی، دڵنەواییکار.

دائیم (گ/٢، س، گ/٣): دائم.

دائیم (نم/١، ف، کم): دایم.

زوبان (کم، نم/١، ف): زبان.

زوبان (گ/٢، س، گ/٣): زمان

١٠- ئەڵبەت: بێ گومان.

عەیان: ئاشکرا، دەرخستن.

(کوردی): بەم تاکەی، پاکانەیەکی ئەوتۆ کۆتایی پێهێنەری لە خۆی کردووە، کە بەس بێ بۆ دەمکوتکردنی هەموو ئەوانەی کە ناو و ناتۆرەی سووکیان بە(کوردی)یەوە هەڵبەستووە، بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێ بیر بکەنەوە و تێگەیشتنی خۆیان بەکار بهێنن هەر یەکسەر تاوانبارکردنی ئەویان یەک لە یەک قۆزتووەتەوە کە گوایە (کوردی) بەنیازی خراپ و پیس پەیوەندی لەگەڵ (قادر)دا هەبووە.

چونکە ئەگەر ئەوی ئەیدەنە پاڵ (کوردی) ڕاست بووبێ ئاوەها ڕەپ و ڕاست هەموو شتێکی نەدەخستە پێش ئەو پرسیارلێکەرەی و ئازاریی نەدەدایە کە خۆی بەتەنیا بچێتە بنجوبناوانی ئەو تاوان پێکردنەوە و لێی بکۆڵێتەوە.

مستت گرت (کم، گ/٢، س، گ/٣): مەستت کرد.

کە مستت (ف): لە مستت.

لێ بکە (گ/٢، س، گ/٣): لێ بکەی.

دەکا (نم/١): ئەکا.

١١- ڕەهڕەو: هاوڕێ.

قادر: یا خوا، یا (غەوسی گەیلانی) یا (قادری برازای کوردی) بووە کە خۆی بەخێوی کردووە و، بەم سێ واتایە لە هەڵبەستەکانیدا هاتووە.

ئیعطا: پێ دان.

جواب: وەڵام.

مەسئەلە: ئەو کارەی گیروگرفتەکەی لەسەرە.

جوابی (گ/٢، س، گ/٣): جەوابی.

بەیان (ف، نم/١، گ/٢، کم، س، گ/٣): عەیان – ئەمەیش دووبارەیە و نابێ.

٤١

## چاو ئەگەر یارای ڕوانینی نەبێ

١- چاو ئەگەر یارای ڕوانینی نەبێ، ئەمڕۆ بەڵان
چاری ناچاری، دەبێ نووکی قەڵەم بێتە فیغان
٢- دڵ لە میحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناو شارم نییە
هەردوو چاوم خوێنی تێ زاوە لە داخی تورکەکان
٣- چاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەضعی دەهری دوون
سەیر کە سا تورکی فەلەک چی کرد بەزومرەی کورد زوبان
٤- صاعیقە و بەرقی نحووسەت ظولمەتی دا شەرق و غەرب
بەردەبارانە، بەمەخصووصی لەسەر مولْکی بەبان
٥- ئەو هەوای کەوتبووە کەللەی خائینانی تەخت خواه
تەختی کرد بۆ سوودی ڕۆمی، تەخت و بەختی دوودمان
٦- عاقیبەت دادی دەلیلانی نەدا بێدادی ڕۆم
مایە پووچ و ڕوو ڕەشی هەردوو جیهانن بەدفەڕان
٧- ئاگری نەگبەت لە خەرمەنهایی طالع هەڵکرا،
شەمعی دەوڵەت هەر طەرەف دەگرا، هەموو خامۆش کران...
٨- بێ زوبان کووکوو زەنان هەر خانەدانە سەیر دەکەم
عەنکەبووت خواجە نوشین و جووتی کوندن دیدەبان
٩- جوملە سادات و مەلا و حاجی بلا شین کەن بەسۆز
دەفتەری ئەهلی وەظائیف سەر هەتا پێ حەک کران
١٠- چارەسەر کەن بێ نەوایان، ناز و نیعمەتیان بڕا
لوولە بوون سفرە و نەواڵە، ون کران ظەرف و خوان
١١- کەوڵ بەدۆش و خەرقەپۆش بێن تاج و کەشکۆڵ هەڵگرن
ڕووکەنە ئەفلاکی پەست و بچنە شاری خامۆشان

١٢- حــەلقــەدەن یاران بلا ئاشــوفــتــە بەخت و تیــرە دڵ
ڕۆژگــار دونیــای لـە ئێـمــە کـردە گـێــســووی دولبــەران
١٣- قــەومی کـوردان گـریەکـەن بۆ خــانەدان و گــەورەتان
نیمـە مـەحـبـووس، هەندێ مـەقـتوول باقیـان مـەنفی کران
١٤- جـەمـعی ئەهلی دڵ ئـەمـێـستـە لێـرە بوونە بـەفـری پار
لانـەواز و دەربـەدەر، وێڵـن لـە کـــووچـەی شـــارەکـــان
١٥- (کـوردی) تۆش یا بـاری ســەختـی نەگـبـەتی هەڵبگرە یا
تەرکـی ئەم شــارە کـە، ســەر هەڵگرە ســەد ئـەلئــەمــان

---

١- یارا: توانایی، لە وزەدا بوون، (وزە).
بەلآن: بەلام.
نەک تەنیا ئەم تاکەی سەرەوە بەشکو ئەم پارچە هەڵبەستە هەمووی لەو (٤٠) سەرچاوەیەدا کە لە دواترا ناونووسییان دەکەم، جارێک بە هی (کوردی) و جارێک دراوەتە پاڵ (سالم) وەک ئەو سـەرچاوانـە ژمـارەی تاکەکانـی ئەم هەڵبـەسـتـەمـان لە لا گـەیوەتـە (١٥٦) تاک کـە (مـامـۆسـتـا سـجـادی) لە (مـێـژووی ئەدەبی کـوردی) لاپەڕە (٢٤٧)ی چاپی یەکـەمـیـدا و دکـتـۆر عـیـزەدین مـسـتـەفـا لە (الواقـعـیـە فی الادب الکردی) لاپەڕە (٧٨)یدا ژمـارەی ئەم هەڵبـەسـتـەیان بەناوی (سـالم)ەوە بـە(٨٥) تاک ناو بردووە، کە لەم دواییـیـەشدا مـامـۆسـتـا (عـەبدولڕەزاق بیـمـار) لە گـۆڤـاری (بـەیان) ژمـارە (٧٥)ی سـاڵی ١٩٨١ لـە لاپەڕە (٣٢)دا بە(٩٤) تـاکی ناو بـردووە بۆ (سـالم) کـە ئـەم دوو ژمـارەی تاکـەش تا ئێـسـتـا یەکـەم و زۆرترین ژمـارەیەکی چاپ کـراوە، بەرامبـەر بەتاکەکانی ئەم هەڵبـەسـتـە لەگەڵ ئـەوەشدا هەتا ئێسـتـە وەک پێم زانیبێ تەنیـا (٨٥) تاکی لێ چاپ کراوە کە ئەوەتا لێرە (٧) تاکی تری چاپ نەکراوی پێشکەش دەکەم.
وە لەو (١٥٦) تاکە بەچاپکراو و چاپ نەکراوەیەوە (١٥) تاکیم بەنـاوی (کوردی)یەوە، بەتەواوی بۆ سـاغ کـرایەوە کـە ئەم تاکـەی سـەرەوە سـەرەتای ئەو پـارچە (١٥) تاکـیـیـەی (کـوردی)یە و (١٤١) تاکیشـی لە دواترا بەپەراوێز، بەناوی (سالـم)ەوە پێشکەش دەکەم کە بەتەواوی ئەویشم بۆ ساغ بووەتەوە.
ئەو سـەرچاوانەی بۆ ئەم هەڵبـەسـتـە کەڵکم لێ وەرگرتوون کێشـە و جیـاوازی و ڕاڕاییـیـەکی فـراوانیـان لە نێـواندایە کـەوا (١٤) ســەرچاوەیان بە هـی (کـوردی) و (٢٦)یشــیـان بـە هـی (سالم)یان داناوە.
وە ئەو سـەرچاوانەش وەنەبێ ژمارەی تاکەکانیان تێدا چوونیەک بێ، بەشکو لە (٨) تاکییـەوە هـەیانە هـەتا ئـەگاتە (١٤٢) تاکی کە لە دواترا دەستنیشـانیان دەکەم و، ڕوونیشـی دەکەمـەوە

کەوا ئەو (١٤١) تاکەی (سالم) خۆی بریتی بووە لە (١٧٥) تاک واتە لەویش هێشتا (٣٦) تاکی تری ماوە و، بەم سەرچاوە زۆریەشەوە کە دەسم نەکەوتوون، بەهیوام کە لەمەودوا، بەرە بەرە لە لایەن دڵسۆزانی کەلەپوورمانەوە بخرێنە ڕوو و جێگەی خۆیان بدرێتێ.

بەر لەوەی جیاوازی و کێشە و ڕاڕایی و ئاوێتەکردنی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە لە نێوان سەرچاوەکانیدا کە هەندێ بەهی (کوردی) و هەندێ بە هی (سالم)یان داناوە، بخەمە ڕوو، وە بۆ دوایی پێهێنانی ئەو کێشەیە ئەوا ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە دەنووسمەوە کە لە (عن)م وەرگرتووە:

لە سەرەتای ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی)دا نووسیویە:

(در این بیاض دیده میشود که بعضی أز أبیات قصیدهء زیر باسم کردی بایک قصیدهء دیگر بإسم سالم رحمهما الله بسبب مشابهت در بحر قافیه مضمون ئامیختهء یکدیگرند و همانا در بسیاری از بیاضهای دوستانم کماهو، و با اختلافات و پیش پسی و نواقص جزئیهء جداگانەگی مندرج اند، زیرا صعوبت تفریق ابیات هریکی از دو شاعر و تثبیت اهل بیت مایهء نگرانی گروه شعر دوستانم گشته لیکن مرا مصادفت یاری و حل ان دشواری کرد که برادرم حسن افندی حمزه اغای مصرف این قصیدەرا با عنوان زیر باسم کردی بخط مبارکش در بیاض خود نوشته و در جایی دیگر قصیدهء مذکور سالمرا با عنوانی دیگر درج فروده که هردو قصیده حاوی از تحدید ابیات هریکی از دو شاعر است چون خود برادرم هریکی از این دو قصیدەرا از نسخهء خود شاعرش بر گرفته و بنده با ستایش لایتناهی باری دیگر در اینجا هردو قصیدەرا نقل کردم اما متأسفانه که صفحات اخیره و حواشی ان بیاض، دریکی از حوادث اخیرهء سلیمانیه سوخته، لذا قصیدهء سالم را کاملا حاصل نکردم و حسب الفرمایشی ان برادرم منظمی از (١٧٥) بیت بوده و از فعال لمایرید خواهانم که شادانی نایل باکمال ابیات ناقصه و تتمهء ان شوم اه من الموت – علی).

واتە: (لەم کەشکۆڵەی مندا «مەبەستی لە خۆیەتی کە عەلی ئاغای نەوتچییە» دەبینرێت کە هەندێ لە (تاک)ەکانی ئەم چامەیەی خوارەوە «مەبەستی تەنیا لەم چامەیانە کە بەناوی «کوردی»یەوە بۆم ساغ بووەتەوە و لە سەرەوە نووسیومە» کە بەناوی «کوردی»یەوەیە، ئاوێتەی چامەیەکی تر بووە بەناوی «سالم»ەوەیە خوا بیانبەخشێ ئەویش بەهۆی وێکچوونی پاشبەند و ئاهەنگ «بەحری هەڵبەستەکە»وە ناوەڕۆکی هەردووکیانەوە بووە بەیەکتری، هەروەک لە زۆر لە کەشکۆڵی تری دۆستانیشمدا هەروا بەئاوێتەیی و جیاوازی و پاش و پێشی و کەموکوڕی و هەریەکەی بەناوی یەکێ لەو دوو هۆنەرەوە نووسیویانە. چونکە سەختی و دژواریی تاکەکانی هی هەریەکێ لەو دوو هۆنەرە و جێگیرکردنی خودی تاکەکان بوونەتە مایەی دڵگرانیی دەستەی شیعردۆستەکانم بەڵام من ڕێکەوت یاریدەی دام و لێم بووە هۆی کردنەوەی ئەو ئاڵۆزییە بەوەی کە برادەرم حەسەن ئەفەندی «ئەشێ ئەم حەسەن ئەفەندییە هەر ئەو حەسەن ئەفەندی برادەری «کوردی»یە بێت کە لە هەڵبەستی «ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان»دا ناوم بردووە» بێ کوڕی

هەمزە ئاغای مەصرەف ئەم چامەیەی «کوردی» بەم سەرەناوەی خوارەوە «کە لە دواوە دەینووسم واتە سەرەناوی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە» بەناوی «کوردی»یەوە بەدەسنووسی پیرۆزی خۆی و لەو کەشکۆڵەیدا نووسیویەتەوە هەروەک لە جێگەیەکی تری «کەشکۆڵەکەشی»دا دیسان چامەی ناوبراوی «سالم»ی بەسەرەناوێکی تر «کە ئەو سەرەناوەش لە سەرەتای دەس بەنووسین کردنی هەڵبەستەکەی «سالم»دا دەنووسم» نووسیوەتەوە کە نووسینەوەی ئەو جووتە چامەیە تاکەکانی هەریەکێ لەو دوو هۆنەرە دیاری و جێگیر دەکات و ساغیان دەکاتەوە چونکە ئەو برادەرەم «مەبەستی لە حەسەن ئەفەندییە کە دەبێتە مامی حاجی تۆفیق پیرەمێرد هۆنەری نەمرمان کە «حەسەن ئەفەندی» و باوکی پیرەمێرد «مەحموود ئاغا» هەردوو کوڕی «هەمزە ئاغای مەصرەف و سەرەکی وەزیران وە وەزیری دارایی بابانەکان» بوون و ئەو هەمزە ئاغایەش کوڕی مەحموود ئاغا بووە کە یەکێک بوو لە پاڵەوانە نەمرەکانی دوانزە سوارەی مەریوان کە باوکی پیرەمێرد بەناوی ئەوەوە ناونراوە» هەریەکێ لەو دوو چامەیەی لەبەر نوسخەی دەستنووسی خودی هەردوو هۆنەرەکە (واتە «کوردی» و «سالم») وەرگرتووەتەوە، ئەمجا بەندەش (مەبەستی لە خودی عەلی ئاغای نەوتچی خۆیەتی) بەسوپاس و ستایشی بێ پایانەوە ئەوا جارێکی تریش لەم کەشکۆڵەمدا ئەو هەردوو چامە (ناوبراوەکەی «کوردی» و «سالم»ە جیا جیا) کەم وەرگرت بەڵام بەداخەوە کە لاپەڕەکانی دوا دواوە لێوارەکانی ئەو کەشکۆڵەی «حەسەن ئەفەندییە» لە یەکێ لە کارەساتەکانی ئەم دواییەی سولەیمانیدا سووتاوە، بۆیە چامەکەی (سالم)م بەتەواوی دەس نەکەوت کە هەروەک ئەو برادەرەم «حەسەن ئەفەندی» فەرمووی ئەو چامەیەی (سالم) بریتی بووە لە (١٧٥) تاک (کە وەک گوتم هێشتا «١٣٩» تاکم دەست کەوتووە) وە لەو خوایەی کە ئەوەی بیەوێ دەیکات (ئەمە دیاردەی دوو ئایەتی قورئانە کە لە سوورەی هود/١٠٧ و سورەی البروج/١٦)دا هاتوون) دەخوازم کەوا شادمانم بکات، بەپایەی گەیشتن بەتەواوکردنی تاکە ناتەواوەکان (دیارە لە قەراغی کەشکۆڵەکەوە چەند تاکێک لە ناوەڕۆکی هەڵبەستەکەی سالمدا بووە، و بەر سووتاندنەکە کەوتووە) و پاشماوەکەی ئەو چامەیە ئاخ لە دەست مردن – عەلی) – ڕاستە وەک دەبینرێت لە هەڵبەستەکەی (کوردی)دا نازناو هاتووە بەڵام لە هەڵبەستەکەی سالمدا، چونکە وەک دەرکەوت ناتەواوە نازناوی (سالم) نەهاتووە کە ئەوە گەورەترین بەڵگەی ناتەواویی چامەکەیە هەروەک لە هەموو هەڵبەستەکانی چ (کوردی) و چ (سالم)دا ئەم نەریتی نازناو دەربڕینە باوە.

هەروەک کەمێ لەمەوبەر ڕام گەیاند، سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە بەناوی ئەو دوو هۆنەرەمانەوە (٤٠)ن و ئەوانیش: (عن چوار نوسخە، مس، گل/١، گل/٢، گل/٣، گل/٤، گل/٥، گل/٦، گل/٧ دوو نوسخە، گل/٨ دوو نوسخە، گل/٩ دوو نوسخە، گل/١٠ دوو نوسخە، ن، نوسخەیەکی لەمەڕ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس کە لەسەر نوسخەیەکی پەڕاویخانەیەکی، ئەوروپاوە وێنەی بۆ گیراوەتەوە، مع دوو نوسخە، عب، ص، شح، مر، م دوو نوسخە، نم/١، کم، گ/٢،

س، س/٢، گ، گـۆڤـاری گـەلاوێژ ژمـارە (١٢)ی سـاڵی ١٩٤٣ و ژمـارە (١، ٢) سـاڵی ١٩٤٤ و پەڕاوی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی – ڕەفیق حیلمی بەرگی ٢، سا و گۆڤاری بەیان ژمارە (٧٥) سـاڵی (١٩٨١) و گـۆڤـاری (کـوردسـتـان) ژمـارە (١، ٢، ٤)ی سـاڵی ١٣٣٥ی کـۆچی (ئەستەمبووڵ) کە نیشانەی (کد)مان بۆ دانا.

بە سەرنجدانێکی هەریەکێ لەم سەرچاوانەی سەرەوە و بەراوردکردنیاندا لەگەڵ ئەم دوو پارچە ساغکراوەیەی ئەم پەڕاوییەمـان بەئاشکرا شـێواوی و، پاش و پێشی و پێکەوە نەبەسـترانی زنجیرەیی واتا و ئاوێتەیی و پچڕ پچڕی و... هتدی تاکەکانیمان بۆ دەردەکەوێ جگە لە بوونی جیاوازی لە وشەی زۆربەی تاکەکانیشا، دەریش ئەکەوێ کە ئەو سەرچاوانە زۆریان لە یەکتری وەرگیراون لەگەڵ کەمە دەسکارییەکدا.

من ئەو شـێـواوی و جـیـاوازییـانـەم لە بن هـەر تاکـێکدا چ ئەوی (کـوردی) و چ ئـەوی (سـالم) بەدیاریکردنی شوێنی ئەو تاکەوە لە هەریەکێ لە سەرچاوەکانیدا جێگیر کردووە تاکو ئەوی خـەریکی (سـالم)یش بـێ کەڵکی زانسـتییـانەیان لێ وەربگرێ و لـە نێوان ئەو سـەرچاوانەشدا (عن)مـان کردە بـنکەی لێکۆڵینەوە و نووسـینی چامـەکەی سالم لەبەر گرنگی مێژوویی و لەبەر یەک (بابەتیی)دا بەوی (کوردی)یەوە بۆیە هەردووکیانم جێگیر کردن.

ئەوە بوو لە پەراوێزە فارسییەکەدا نیشانە بۆ سـەرەناوی ئەم هەڵبەستە کرا، کە لە سـەرەتای ئەم هەڵبەستەدا (عن) نووسیویە: (کردی رحمه الله بر ای واقعهء سقوط دولت بەبە فرموده) واتە (کوردی خوا لێی خۆش بـێ بۆ ڕوودانی ڕووخـانی فـەرمـانڕەوایی بابـان ئەم هەڵبەسـتـەی فـەرمـووە) بەڵام ئەوەکـەی (سـالم) وەک هاوچەشن (ڕەدیف)ی ئـەمـەی (کـوردی) لە دوای ئەوی (کوردیی) وتراوە بەبۆنەی شۆڕشـەکەی عەزیز بەگی بابانەوەیە کە لە شوێنی خۆیدا بەفراوانتر ئەمە ڕوون دەکەمەوە.

ئەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوە لە (عن دوو نوسخـە، مس، گل/٢، گل/٤، گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، م، مع دوو نوسخە، مر)دا یەکەمە و لە (گل/٢، گل/٣، گل/٧، مر، نوسخەیەکی مع)دا بەناوی (سالم)ەوەیە و لە هەشت نوسخەکەی ترا بەناوی کوردییەوەیە و لەوانی تردا نییە.

یارای (عن – نسخه، مس): توانای.

یارای (گل/٢، گل/٤، گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠): هانای.

بەڵان (مر): بلام.

چاری ناچارە (مع – نسخه، مس): ناعیلاجه هر.

چاری ناچارە دەبێ (مر): ناعیلاجه گر بکا.

نووکی قەڵەم (مر): زاری قلم.

بێتە فیغان (مر): زاری و فوغان.

فیغان (عن – نسخه، م): زبان.

تێبینی: ئەم تاکەی سەرەوە یەکەم تاکی هەڵبەستەکەی (کوردی)یە کە لە پێشدا دەستم پێ کرد

و دوای ئەوە، دەست دەکەمەوە بەپێشکەشکردنی هەڵبەستەکەی (سالم) و تۆژینەوەی تاکەکانی ئەویش.

ئەم تاکە هێشتا چاپ نەکراوە.

٢- ئەم تاکە لە (عن: دوو نوسخە، گل/٢، گل/٧، م، ن)دا دووەمینە وە لە (مس، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، م: نسخە، سا)دا سێیەمینە و لە (کم، گ/٢، س، گل/٣، گل/٦)دا پێنجەمینە وە لە (ص، مودەڕیس، گ، عب، س، گەلاوێژ، شیعر و ئەدەبیات)دا شەشەمینە و لە (نم/١)دا حەوتەمینە، لە (عن: نسخە)دا هەشتەمینە وە لە (کد)دا دوانزەیەمینە و لە (مع: نسخە)دا نۆزدەیەمینە وە لە (گل/١٠)دا بیست و حەوتەمینە و لە (مع: نسخە)دا بیست و هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەی کوردییە بەڵام:

ئەم تاکە لە (عن: دوو نسخە، مس، گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، مع نسخە، نم/١، کم، گ/٢، س)دا بەناوی (کوردی)یەوەیە، وە لە (عن: نسخە، گل/٣، گل/٦، گل/١٠ نسخە، ن، مودەڕیس، ص، مع: نسخە، م، س/٢، گەلاوێژ، گ، عب، شیعر و ئەدەبیات، سا)دا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.

مەیلی (سا، مودەڕیس، گ): تابی.

هەردوو چاوم (سا، س، گ، گەلاوێژ، شیعر و ئەدەبیات، عب): عەینی چاوم.

تورکەکان (مودەڕیس، سا، گ، عب، س/٢، گەلاوێژ، شیعر و ئەدەبیات): مەردومان - دیارە لە سەرەتاوە لە ترسدا گۆڕدراوە.

لە داخی تورکەکان (کد): لە داخی...... کان - دیارە نەیوێراوە لە ئەستەموولّ و سەرینی عوسمانیدا ناویان ببات.

تێبینی: لە (س/٢)دا لە لاپەڕە/٩٦دا نیشانە بۆ ئەوە کراوە کە (مامۆستا محەمەد مستەفا کوردی) ئەم هەڵبەستەی بەناوی (سالم)ەوە لە گۆڤاری رزگاری ژمارە/١٠ و ١١ و ١٢ی ساڵی ١٩٧٠دا بە٣٨ تاک چاپ کردووە و مامۆستا گیویش لە (س/٢)یدا کەڵکی لێ وەرگرتووە، وە ئەویش سەرچاوەیەکی ئەم هەڵبەستەمانە.

٣- عیبرەت: پەند.

وەضع: بار.

دەهر: چەرخ، ڕۆژگار.

دوون: چرووک، پەست، خراپ، ڕژد.

تورک: مەبەسی عوسمانی و دارودەستەکەیەتی بەسەرۆکایەتیی عەبدوڵڵا پاشای بابان.

فەلەک: دیسان چەرخ و مەبەست لە ڕۆژگاریشە.

زومرە: کۆمەڵ، گەل و مەبەستی نەتەوەکەی خۆیەتی.

ئەم تاکە لە (عن دوو نوسخە، گل/٧، م، مع نوسخە، نم/١)دا سێیەمینە و لە (مس، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، کم، گ/٢، س)دا دووەمینە و لە (کد)دا نۆیەمینە و لە هەموویان بەناوی

(کوردی)یەوەیە. هەروەها لە (گل/٤، مـودەڕیس)دا دووەمـینـە و لە (عن نسـخـە، م نوسـخـە)دا چوارەمـینە و لە (ن)دا پێنجـەمـینـە و لە (گل/٣، گل/٦، مس)دا شـەشـەمـینـە و لە (ص)دا حەوتەمـینە و لە (س/٢، گەلاوێژ، شیعر و ئەدەبیات)دا نۆیەمینە و لە (گ، عب)دا شـانزەیەمینە و لە (شح)دا نۆزدەیەمـینە و لە (مع)دا بیست و چوارەیەمـینە و لە (گل/١٠ نسـخـە)دا بیست و نۆیەمین تاکی هەڵبەستەکەیە، وە لە هەموو ئەمانەدا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.

دەهری (گەلاوێژ، شیعر و ئەدەبیات): دەوری.

دەهری (مس، ن، ص، مودەڕیس): دهر.

سـەیر کـە سـا تورکی فـەلەک (کد، نم/١، کم): سـەیر کە سـا......... فلک – دیارە (نم/١، ک) لە (کد)یان وەرگـرتووە و ئەویش لە ئەسـتـەمـووڵ و لەسـەرێنی عـوسـمـانیـاندا نـەیوێراوە (تورکی) بنووسێ بۆیە (......)ی داناوە.

سەیر کە سا تورکی فەلەک (گ/٢): سەیری کە سا...... فلک.

سەیر کە سا تورکی فەلەک (س): سەیر بکە ساقی فەلەک.

سەیر کە سا تورکی فەلەک (س/٢، سا): سەیری کە ڕۆمی دەڵەک.

سەیر کە سا تورکی فەلەک (گەلاوێژ، عب، گ، شیعر و ئەدەبیات): سەیر کە سا تورک، فەلەک.

سەیر کە سا تورکی فەلەک (مس، ن): سیر کە دیسان فلک...

٤– صاعیقە: سایەخ، ساماڵ، هەورە برووسکە.

بەرق: برووسکە، چەخماخە، تریشقە.

نحووسـەت: بەدبەختی، ناکامـەرانی، خراپی، تەم و دووکەڵ، سـتـەم، دیسـان (نەحس) ناوە بۆ جـووتە ئەستێرەکەی کە نیشانەی نـاکامـەرانین (زوحەل) و (موشتـەری) هەروەها ناوە بۆ سێ شـەوەی دوایی مـانگی (مـانگی – قـەمـەری) کە جیـهانیـان تیا تاریکە و، هەمـوو ئەمـانە لەگەڵ هەڵبەستەکە دەگونجێن.

بەردەباران لە کوردیدا بۆ (لە شار دەرکردن)، (شاربەدەر) = کۆتاییە کە مەبەست لە ڕووخانی بابانە.

ظولەت: تاریکایی.

شەرق: ڕۆژهەڵات.

غەرب: ڕۆژئاوا.

بەمەخصووصی: بەتایبەتی.

ئەم تاکە لە (عن: نوسخە، مس، م)دا چوارەمینە و لە (گل/٧، نم/١، کم، گ، س)دا یەکەمینە و لە (مع)دا دووەمـینە و لە (کد)دا هەشتـەمـینە و لە (گل/٨، گل/٩، گل/١٠)دا شەشـەمـینە و لە هەمــوو ئەمــانـەدا بەناوی (کــوردی)یەوەیە، بەڵام لە (مــودەڕیس)دا یەکــەمــینـە و لە (ص، م: نوسخـە)دا دووەمینە و لە (گل/٤)دا چوارەمینە و لە (عن: نوسـخـە)دا شەشـەمینە و لە (گل/١، سـا)دا پێنجـەمـینە و لە (گل/٣، گل/٦، ن)دا حـەوتەمـینـە و لە (س/٢، گـەلاوێژ، شـیـعـر و

ئەدەبیات)دا هەشتەمینە و لە (گل/٢)دا دەیەمینە و لە (عب، گ)دا پانزەهەمینە و لە (گل/١٠: نسخە)دا بیست و هەشتەمینە و لە (مع)دا هەشتا و نۆیەمین تاکە و لە هەموو ئەمانەشدا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.

نحووسەت (مودەڕیس): ندامت.

موڵکی (ن، ص): خاکی.

٥- هەوا: ئارەزوو، مەبەست.

تەخت خواه: مەبەستی ئارەزووکردنی کورسیی فەرمانڕەواییە.

تەختی کرد: وێرانی کرد، تەخت و تاراجی تێک دا، ڕووخانی، کاولی کرد.

ڕۆمی: مەبەست لە عوسمانییە (تورکە دڕندە)کانە.

دوودمان: فامیلیا، خێزان و مەبەستی خانەوادەی بابانییە فەرمانڕەواکانە و ئەوی ئەو خیانەتەشی کرد، عەبدوڵڵا پاشای بابان بوو.

ئەم تاکە لە (گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، مع)دا چوارەمینە و لە (عن)دا پێنجەمینە و لە (مس، م)دا حەوتەمینە و لە (عن: نسخە)دا دەیەمین تاکە و لە هەموویاندا بەناوی (کوردی)یەوەیە.

وە لە (ن)دا هەشتەمینە و لە (مر)دا چل و دوویەمینە و لە (مع: نسخە)دا چل و نۆیەمینە و لە (گل/٤)دا هەشتا و سێیەمینە و لە (ص)دا سەدەیەمین تاکە و لەمانەشدا هەموو بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.

وە ئەم تاکەش هێشتا چاپ نەکراوە.

ئەو هەوای (مر، ص): أگری.

ڕۆمی (م، ن، مر، ص): ترکان.

دوودمان (م، ص): شای ببان. واتە پادشای بابان.

٦- عاقیبەت: لە ئاکاما، دوایی، پاشان، سەرئەنجام.

دادی: کەڵکی، سوودی، قازانجی.

دەلیلان: ئەوانەی ڕێنومایی عوسمانییان کرد دژی بابانییان.

بێدادی: ناعەداڵەتی، خراپی، ناڕەوایی.

ئەم تاکە لە (گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، مع)دا پێنجەمینە و لە (عن)دا شەشەمینە و لە (مس)دا هەشتەمینە و لە (م)دا نۆیەمینە و لە (عن: نسخە)دا یانزەیەمینە و لە هەموو ئەمانەشدا بەناوی (کوردی)یەوەیە.

هەروەها لە (ن)دا نۆیەمینە وە لە (مر)دا چل و سێیەمینە وە لە (مع: نوسخە)دا پەنجایەمینە و، لە (گل/٤)دا هەشتا و پێنجەمینە وە لە (ص)دا سەد و یەکەمین تاکە و لە هەمووشیاندا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە و ئەم تاکە هێشتە چاپیش نەکراوە.

عاقیبەت (ص، م): ئاخری.

ڕۆم (م، ص): ترک.
دەلیلانی (م، مع، ن، ص): ئەوانیشی.
جیهانن (گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، عن: نوسخە): جهان بون.
بەدفەڕان (ن، ص): خائنان.
بەدفەڕان (مع، ن، مر): ناگهان.
جیناس ئارایی لە (داد) و (دا) و (بێداد) و لە زۆربەی هاتنی پیتی (ر)دا لەم تاکەدایە.
٧- خەرمەن: خەرمان.
طالع: بەخت. ئەم ئاگر لە خەرمان هەڵکردنەش چەند جاری تر لە هەڵبەستی (کوردی) و هۆنەرانی تری هاوچاخیدا هاتووە بەڵگەی بوونی ئەم نەریتە بووە کە خەرمان و پاوەن سووتێنراوە، هەروەک لە هەڵبەستەکەی (سالم)یشدا دەردەکەوێ کە لە دوای ئەم هەڵبەستەوە دەینووسین مەبەست لە کڵوکۆ دامرانی حکوومەتی بابان و کوژانەوەی یەکجارەکیی بووە.
شەمعی: مۆمی و مەبەستی لە چرای یا ڕووناکییەتی. نیشانەی بوونی مۆمە لە کۆڵانەکاندا بەشەوان بۆ ڕووناکیی ڕێگەوبان.
کوژان: کوژێنران، کوژانەوە.
خامۆش: خەفە، خپ، کپ، تاریک، بێ دەنگ.
دەوڵەت: مەبەست لە فەرمانڕەواییی (حوکومەت)ی پاشایەتیی بابانە کە هەموو شارەکان و ئەوی لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو گیراوە.
ئەم تاکە لە (کد)دا پێنجەمینە و لە (گل/٧)دا شەشەمینە و لە (عن)دا حەوتەمینە و لە (گل/٨، گل/٩، م، مع)دا هەشتەمینە و لە (کل، گل/١٠)دا نۆیەمینە و لە (عن: نسخە)دا دوانزەمینە و لە هەموویاندا بەناوی (کوردی)یەوەیە.
وە هەر ئەم تاکە لە (من: نوسخە)دا حەوتەمینە وە لە (عب، گ)دا نۆیەمینە و لە (ن)دا یانزەیەمینە وە لە (مر)دا حەفتا و نۆیەمین تاکە لەمانیشا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.
شەمعی (عن: نسخە، ن، مس): شمع.
ئەم تاکەش هێشتە چاپ نەکراوە.
نەگبەت (عب، گ): نیگبەت.
دەگرا (عن: نسخە، ن، مر): کوژان.
دەگرا (کد): دگرّان.
هەڵکرا (گ، عب. کد): کەوتەوە.
لە خەرمەنهایی (کد): لە ناو خرمانی.
٨- بێ زوبان (یا بێ زمان): مەبەستی لە بەستەزمانی واتە بێ چارەیی و دەستەپاچەییە.
کووکوو زەنان: کووکوو کار. واتە کوا کوا کردنی ئەو بێچارانە بۆ فریادڕەسێک، هاوار.

عەنکەبووت: جاڵجاڵۆکە، داپیرۆشک.

خـواجـە نوشـین: جـووتێ سـەکۆ بوو کـە جـاران لەمـلا و ئەولای دەرگـای دەرەوە، یا لە هـەردوو تەنشتی سەرەوەی پلیکانەکە ڕووی دەکردە خانووی عەمارتە و نهۆمی سەرەوە دروست دەکران و پاســەوان و بەردەســتـیـان لێ دەبـوو، گـوایە لـە جـێـی ئەوانە جـاڵجـاڵۆکـە تاری هێـلانەی هەڵبەستووە لەبەر چۆڵی و کاولی.

کوند: کوندەبوو، بایەقوش، کوندەپەپوو، مەلێکە بە شووم و وێرانە نوشین ناسراوە.

دیدەبان: پاسەوان، پاساوڵە.

ئەم تاکە لە (مس، م)دا پێنجەمینە و لە (کم، گ/٢، س)دا شەشەمینە و لە (عن، نسخە، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، مع)دا حەوتەمینە و لە (عن، نم/١)دا هەشتەمینە و لە (گل/٧)دا نۆیەمینە و لە (کد)دا سـیـانزەهەمـینـە و لە هەمـوو ئەم سـەرچاوانەشـدا بەناوی (کـوردی)یەوەیە و لە (ص)دا سـێـیـەمـینـە و لە (مـودەڕیس، سـا)دا حەوتـەمـینـە و لە (عن: نوسـخـە)دا نۆیەمـینـە و لە (گل/١٠: نوسـخــە، م: نوسـخــە)دا دوانزەهەمــینـە و لە (عب، گ)دا هـەژدەیەمـینـە و لە (مع: نسـخـە)دا سەدەیەمینە لەمانەشدا بەناوی (سالم)ەوەیە.

زوبان (گ/٢، س): زمان.

خانەدانە سەیر دەکەم (عن: نسخە): خاندان دفکرم.

خانەدانە سەیر دەکەم (مودەڕیس، کم، گ/٢، س، سا، عب، گ، کد): خانەدان تێ دەفکرم.

خانەدانە سەیر دەکەم (نم/١): خانەدانە تێ دەفکرم.

نوشـین و جووتی (یا جووتێ) کوندن (مودەڕیس، عب، گ): نشینە و جفت جوغدن.

نوشـین و جووتی (یا جووتێ) کوندن (سا): نشینە، جفت جوغدە.

جوغد، واتە کوندەبوو.

٩- جوملە: گشت، سەرپاک، بەجارێ، هەموو.

دەفتەر: مەبەستی دەفتەری دایەرەی تایبەتی مووچەخۆرانی بابانییە.

ئەهل: دەستە، کۆمەڵ، خەلق.

وەظائف: کاربەدەستێیەکانی بابانی مەبەستە.

حەک: کوژانەوە، سڕدرانەوە، سڕینەوە، کڕاندنەوەی نووسین.

ئەم تاکە لە (کم، گ/٢، س)دا چوارەمینە، لە (عن: نسـخـە، ص، م، نم/١)دا شـەشـەمـینە و لە (گل/٧)دا هەشتەمینە و لە (عن، گل/٨، گل/٩، مع)دا نۆیەمینە و لە (گل/١٠)دا دەیەمینە و لە (کد)دا یانزەیەمینە و لەمانەدا هەموو بەناوی (کوردی)یەوەیە.

هەروەها لە (ص)دا پێنجەمینە و لە (مودەڕیس)دا چوارەمـینە و لە (عن: نسخـە)دا یانزەیەمینە و لە (ن)دا سـیانزەیەمـینە و لە (عب، گ)دا بیسـتـەمـینە و لە (مع: نسـخـە)دا سـەد و یەکەمـینە و لەمانەش بەناوی (سالم)ەوەیە.

جوملە (عن: نسخە، مودەڕیس، عب، گ): ئەهلی.

سادات و (مس، ص، ن): سادات.
سادات و (عب): سالوات و.
بلا (یا: بلاّ) (نم/١، کم، گ/٢، س): بەلاّ. ئەمەش هەڵەیە.
وەظائیف (مودەڕیس، ن): وظایف.
سەر هەتا پێ (عن: نسخە): دیم تماماً.
سەر هەتا پێ (مودەڕیس، عب، گ): دیم عموماً.
سەر هەتا پێ (مس، گل/٧، گل/٨، گل/٩، گل/١٠، ص، ن): سر هتا پا.
١٠- نیعمەت: مەبەست لە خواردن و مووچە و چاویرییە، خێر و خۆشی لە بابان بەبێ نەوایانی داوە و (کوردی) بۆیان دەپارێتەوە کە نانیان بڕاوە.
لوولە بوو: پێچرایەوە، لوول درا، هەڵگیرا.
نەوالە: تەیکە، جۆرە نانێکیشە، یا ئەو سەبەتە تەختەی نانی لەسەر خوراوە.
ظەرف: ئامان، قاپ و قاچاخ (زەرف).
خوان: نانەبەرە، تەیکە.
ئەم تاکە لە (کم، گ/٢، س)دا سێیەمینە و لە (عن: نسخە، نم/١)دا پێنجەمینە و لە (گل/٧)دا حەوتەمینە و لە (گل/١٠)دا هەشتەمینە و لە (عن، مس، گل/٨، گل/٩، م، مع، کد)دا دەیەمینە و لەمانەدا هەموو بەناوی (کوردی)یەوەیە.
وە لە (مودەڕیس)دا سێیەمینە و لە (ص)دا چوارەمینە و لە (عن: نسخە)دا دەیەمینە و لە (م)دا سیانزەیەمینە و لە (ن)دا چواردەیەمینە و لە (عب، گ)دا نۆزدەیەمینە و لە (مع: نسخە)دا سەد و doوویەمین تاکە و لەمانەشدا بەناوی (سالم)ەوەیە و لەوانی تردا نییە.
بێ نەوایان (مودەڕیس، عب، گ): أهلی درویش.
ناز و نیعمەتیان (کد، گم، گ/٢، س، نم/١): نان و نیعمەتتان.
ناز و نیعمەتیان (مودەڕیس): نان و مفتمان.
ناز و نیعمەتیان (عب، گ): نانی منعمتان.
کران (کم، گ/٢، عب، گ، کد، مودەڕیس، س): کراوە.
کران (نم/١): کرا.
بوون (مودەڕیس، کم، نم/١، عن: نسخە، کد): بو.
بوون (گ/٢، س): بۆ.
ظەرف و (مودەڕیس، کد، عب، گ): ضرف و.
ناز و (عن: نسخە): نان و.
تێبینی: ئەم تاکەی (کوردی) دەنگ لەوپەڕی مرۆڤایەتیی دەدا کە بانگەوازی هەمووانی کردووە بۆ چارەسەرکردنی بێ نەوا و ناز و نیعمەت بڕاوان و سفرە و نەواڵە لێ لوول کراوان و زەرف خوان لێ شاردراوان و لە ژێرەوە تاوانباریی عوسمانی و خائنان دەردەخات لەو حاڵە.

١١- کەوڵ بەدۆش: کەوڵ بەشان - و مەبەست لە دەروێشی و صۆفیێتییە کە نیشانەیان: کەوڵ (پێستە)ی مەڕ یا بزنێکی خۆشەکراو بووە داویانە بەشانیاندا وەک کۆڵوانە بەپشتیانەوە بووە.

خەرقەپۆش: دیسان مەبەست لە صۆفیگەری و گۆشەگیرییە، کە خەرقەیان لەبەردا بووە.

تاج: هەرچەند ئەو کڵاوە زێڕین و گەوهەربەندە ڕازاوەیەیە کە پادشایان دەیکەنە سەریان - بەڵام لێرەدا مەبەست لە کڵاوی دەروێشییە کە پرچە و یا کڵاوی صۆفیگەرییە کە هەوادارانی ڕێگە (طەریقە) لەسەری دەکەن.

کەشکۆڵ: ئەو کۆلە هێلکەیییە توێکڵە گوێزی هندستان یا قاپووڕە دارەیە کە لە شێوەیەکی درێژکۆڵەیی قوڵفداردا دەروێش هەڵی دەگرن یا دەیکەنە مل، وەک سەتڵۆکەیەک بۆ خواردن و ئاو.

ئەفلاک: مەبەسی چەرخی ڕۆژگارە.

شاری خامۆشان: گۆڕستان، مەزارستان.

ئەم تاکە لە (مع)دا شەشەمینە و لە (کم، گ/٢، س)دا هەشتەمینە و لە (گل/٧)دا دەیەمینە و لە (عن، مس، گل/٨، گل/٩، م)دا یانزەیەمینە و لە (نم/١)دا دوانزەیەمینە و لە (کد)دا پانزەیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە هەمووادا بەناوی (کوردی)یەوەیە.

هەروەها لە (نم/١، کم، گ/٢، س)دا دوا تاکی ئەم هەڵبەستەی (کوردی)یە بەڵام بەهەڵە لە (م: نسخە) یانزەیەمینە و لە (مع: نسخە)دا دوانزەیەمینە و لە (عب، گ)دا هەشتەمینە و لە (عن: نسخە، مودەریس)دا سیانزەیەمینە و لە (ن)دا پانزەیەمینە و لە (ص)دا حەڤدەهەمین تاکە و لەمانە هەموو بەناوی (سالم)ەوەیە.

کەوڵ (نم/١، کم، عب، گ): کول.

کەوڵ (گ/٢، س): گۆڵ.

و خەرقە (عب): با خرقە.

و خرقە (گ): یا خرقە.

ئەفلاکی (عب، گ، مودەریس): املاک.

پەستو (عن: نسخە): پیری.

پەستو (عب، گ): بترو.

پەستو (ن): بدخو.

١٢- حەلقە: چەرخە، ئەڵکە.

ئاشوفتە: شێواو، پەشێو.

تیرە: ڕەش.

زولفی دولبەرانە کە مەبەستی لە ڕەشی و لوولی و پێکاچوویەتیی کە وەک بەختی ئەوان ڕەش و شێواوە.

ئەم تاکەش هەڵوێستەیەک هەڵدەگرێ کە بەراوردی بارێکی ئاوای نیشتمانی پێ کردووە لەگەڵ

زوڵفی دڵبەراندا.

ئەم تاکە لە (کد)دا شەشەمینە و لە (گل/٧، مع)دا پانزەیەمینە و لە (عن، گل/٨، گل/٩، گل/١٠)دا دوانزەیەمینە و لە (عن: نسخە)دا چواردەیەمینە و لە (گل/١٠)دا پانزەیەمین تاکە و بەناوی (کوردی)یەوەیە.

هەر ئەم تاکەش لە (عن: نسخە)دا پێنجەمینە و لە (مع: نسخە)دا نۆیەمینە و لە (عب، گ)دا دوانزەیەمینە و لە (ن)دا

هەر ئەم تاکەش لە (عن: نسخە)دا پێنجەمینە و لە (مع: نسخە)دا نۆیەمینە و لە (عب، گ)دا دوانزەهەمینە و لە (ن)دا شانزەیەمینە و لە (گل/٤)دا هەشتا و شەشەمینە، بەڵام بەناوی (سالم)ەوەیە.

حەلقەدەن (عب): حلقەدین.

بەختو (عن، عن: نسخە، ن): بخت.

گێسووی (عن، عن: نسخە، ن): زلف.

کردە (گ، کد): کردبە.

١٣- مەنفی: دوورخراوە. لێرەدا نیشانە بۆ دوورخستنەوەی زۆر لە ناودارانی ئەوسا و گرتن و کوشتنیان لە لایەن عوسمانییەوەیە.

ئەم تاکە لەم سەرچاوانەدا بەناوی (کوردی)یەوەیە کە لە (کم، گ/٢، س)دا حەوتەمینە وە لە (عن: نسخە)دا هەشتەمینە وە لە (نم/١)دا دەیەمینە و، لە (مس، گل/٧، مع)دا دوانزەمینە و لە (عن، گل/١٠، م)دا سیانزەیەمینە و لە (گل/٨، گل/٩)دا چواردەیەمین تاکە، هەروەها لەم سەرچاوانەی تریشدا بەناوی (سالم)ەوەیە کە ئەوانیش: (م: نسخە)یە کە دەیەمینە و لە (عن: نسخە)دا دوانزەیەمینە و لە (ن)دا حەڤدەیەمینە و لە (گل/٤)دا هەشتا و حەوتەمینە و لە (مع: نسخە)دا سەد و چل و یەکەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

قەومی کوردان (عن: نسخە): ئەهلی دەروێش.

خانەدان و گەورەتان (عن: نسخە): خانەدانی ئاغەکان.

خانەدان و گەورەتان (نم/١، کم، گ/٢، س): ئاغەکان و گەورەکان.

نیمە (نم/١، کم، گ/٢، س): نیوە.

هەندی (نم/١، کم، گ/٢، س): نیوو.

هەندی (عن: نسخە): نیمە.

باقیان (نم/١، کم، گ/٢، س): نیوەیان.

باقیان (عن: نسخە): نیمەیان.

١٤- جەمعی: کۆمەڵی، دەستەی.

ئەهلی دڵ: مەبەستی لە پیاوە ئاینی و سەرانی ڕێگەی تەریقەت و گەورە گەورەکانی وڵات و پیاو ماقووڵان و فەرمانبەرانە.

بەفری پار: لە پەندی پێشینانێکی کۆنەوە وەرگیراوە مەبەست لەوەیە کە وەک بەفرەکەی پار تواونەتەوە بەکوشتن و گرتن و شاربەدەر و، وێڵ و ڕەهەندەیی.

لانەواز: خانەبەدەر.

ئەم تاکە لە (عن: نسخە)دا سیانزەمینە و لە (عن)دا چواردەمینە و لە (گل/٧)دا پەنجا و پێنجەمینە و لە (م)دا هەشتا و چوارەمینە و لە (مع)دا هەشتا و پێنجەمینە و لە (گل/٩)دا هەشتا و شەشەمینە و لە (مس)دا هەشتا و هەشتەمینە و لە (گل/١٠)دا نەوەت و نۆیەمین تاکی هەڵبەستەکەیە و بەناوی (کوردی)یەوەیە.

وە لە (ن)دا هەژدەمینە و لە (گل/٤)دا هەشتا و هەشتەمینە و لە (مع: نسخە)دا سەد و چل و دووهەمین تاکە و بەناوی (سالم)ەوەیە. وە لەوانی تردا نییە و ئەم تاکەی سەرەوە لە (مع: نسخە)دا دوا تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

وە ئەم تاکە هێشتە چاپ نەکراوە.

١٥- تەرک: جێهێشتن.

ئەلئەمان: وشەی هانا بۆ بردنە لە دەستەودامێن بووندا دەوترێ.

ئەم تاکە لە (عن)دا پانزەیەمینە و لە (عن: نسخە)دا بیست و نۆیەمینە و لە (گل/٧)دا پەنجا و شەشەمینە و لە (گل/٨)دا حەفتا و دووەمینە و لە (م)دا هەشتا و پێنجەمینە و لە (مع)دا هەشتا و شەشەمینە و لە (گل/٩)دا هەشتا و حەفتەمینە و لە (مس)دا هەشتا و نۆهەمینە وە لە (گل/١٠)دا سەدەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

وە لە هەمووانیشدا بەناوی (کوردی)یەوەیە و دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

نەگبەتی (عن: نسخە، گل/٧، مع): وحشی.

تا ئێرە هەڵبەستە (١٥) تاکەکەی (کوردی) بوو، کە لە نێوان (١٥٦) تاکی بەردەستماندا ساغمان کردەوە و جێگیرمان کرد، کەوا بەبۆنەی ڕووخانی فەرمانڕەواییی بابانەوە وتوویەتی.

دەمێنێتەوە سەر (١٤١) تاکەکەی تری هەڵبەستەکە کە بەناوی (سالم)ەوەیە و ئەویش لە هاوچەشن (ڕەدیف)ی هەڵبەستەکەی (کوردی) واتە لە دوای ئەو ئەم هەڵبەستەی بۆ شۆڕشەکەی عەزیز بەگی بابان داناوە کە دژی بابانە ڕووخێنەرەکان کردوویەتی.

٤٢

## کوان ڕەفیقانی طەریقەت

١- کوان ڕەفیقانی طەریقەت، دەردی عەشقم چارەکەن
یا بەجاریٔ بمکوژن، جەرگم بەخەنجەر پارەکەن

٢- ئاخ لەبەر جەوری ڕەفیقان و لە طەعنەی دوشمنان
من کە نالێم، تۆ بلێ، بۆچی ئەمەم دەربارەکەن؟

٣- خاکی بەردەرگانەکەی تۆ مەسکەنی صەد سالەمە
حەیفە بۆ تۆ ئێستەکێ لەم قاپیەم ئاوارەکەن

٤- شێخ و صۆفی دین و ئیمانیان دەکەن پێشکەش ئەگەر
دەفعەیێ وەک من تەماشای ئەم کەوا گولنارەکەن

٥- زاهیدان مەنعم دەکەن، بۆچ وا دەکەی؟ ئابڕووت دەچێ
هێند کەرن، ناکەن کە چاو لەم کەبکی خۆشڕەفتارەکەن

٦- لەت لەتی جەرگم (دەلێن)ی چاوی پڕ کردوومەوە
خوێن بەخوڕ نایێ، مەگەر جۆمالی ئەم جۆ بارەکەن

٧- کەس نەلێ (کوردی) وەرە تۆ دەس لە یارت هەلگرە،
زەحمەتە، نابێ مەگەر جووتم لەگەل سێدارەکەن

---

١- طەریقەت: ڕێگە - بەلام مەبەستی لە ڕێگەی دلداری وە یا سۆفیگەرییە.

ئەم هەلبەستە لە نێوان سێ دەستە سەرچاوەدایە کە هەر لایەیان بە هی هۆنەرێکی داناوە، ئەوانیش:

یەکەم - لە (عق)دا کراوە بە هی (نالی) و تەنیا چوار تاکی هەلبژاردەی نووسیوە، کە ئەم ڕایە جێگەی بڕوا نییە، بەلام سەرچاوەیەکی بەنرخ و گرنگە بۆ لێکۆلینەوە و تەنیا ئەم سەرچاوەیە لە سەرچاوەی ترەوە بەناوی (نالی)یەوە وەری گرتووە.

دووەم - ئەو دەستەیەیە کە هەلبەستەکە بە هی فیکری دەزانن، ئەوانیش کەشکۆلی (ر)یە کە تەنیا بەهەلبەست و کەشکۆلی (ف)یە، کە بەپێنج خشتەکی و ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (٤٧٦)ی ڕۆژی ١٩٧٩/٥/٢٨ (بەغدا)یە کە مامۆستا جەمال محەمەد لە ژێر ناوی (غەزەلێکی

بڵاو نەکراوەی فیکری)دا بڵاوی کردووەتەوە کە بۆ ئەمەی مامۆستا جەمال نیشانەی (هج)م دانا، هەرچەندە بەپێچەوانەی نووسینەکەی (هج)ەوە وەک هەڵبەستەکە (غەزەل) نییە، بەشکو (پێنج خشتەکییەکی ناتەواوە، هەروەها «بڵاونەکراوە»ش نییە، چونکە بەر لەو بە شەش ساڵ مامۆستا گیوی موکریانی لە دیوانی (کوردی) چاپی سێ (گ/٣)یدا بڵاوی کردووەتەوە، ئەویش بەناتەواوی.

سێیەم – ئەو دەستەیەیە کە بە هی (کوردی)یان داناوە و ئەوانیش (عن، ن، گل/١، ص، حم، گ/٣) و (دیوانی فیکری) دەستنووسی خۆم (حەمەبۆر) کە نیشانەی (فح)م داوەتێ و لە هەموویاندا پێنج خشتەکییەکە بەتەواوی نووسراوەتەوە، بەدیاریکردنی ئەوەی کە (هەڵبەست)ەکە هی (کوردی)یە و (فیکری) کردوویەتە (پێنج خشتەکی) جگە لە (گ/٣)یان کە تیا ناتەواوە و هەر بە هی (کوردی) داناوە.

من لەسەر ئەوەم کە هەڵبەست هی (کوردی)یە و (فیکری) کردوویەتە، پێنج خشتەکی (تەخمیس) و جگە لەمانەش گۆرانیبێژی نەمرمان، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی – سەی ئەسکەر)یش لە کاتی خۆیدا بەگۆرانییەوە هەندێکی بەشێواوی تۆمار کردووە، بەبێ دیاریکردنی هۆنەرەکەی.

وەک بۆمان دەرکەوت کە هۆی ئەم سەرشێوانەی کە یەکێ بە هی (کوردی) و ئەویکە بە هی (فیکری) داناوە هاتنی نازناوی ئەو دوو هۆنەرەیە لە دوا پارچەی پێنج خشتەکی یا هەڵبەستەکەدا لەو سەرچاوانەدا بەنەشارەزاییەوەیە. ئەمجا هەتا بەڵگەی بەهێزتر دێتە ئاراوە با وەک ئەم جیاکردنەوەیەم بێ و لەو سەرچاوانەشدا کە ژمارەیان گەیشتە (١١) تەنیا (عن)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی وە لە دوای هەر تاکێکیشەوە (پێنج خشتەکی)یەکەی لەبەر سێ هۆ پێشکەش دەکەم.

یەکەم: لەبەر ئەو تێکەڵاوییەی کە لە سەرچاوەکاندا لەسەر هەڵبەستەکە و پێنج خشتەکییەکە هاتووە وەک لە سەرەوە دیاریم کرد.

دووەم: لەبەرئەوەی تاکو ئێستا بەم دەقە تەواو و باوەڕ پێکراو و پەسەندەی من پێشکەشی دەکەم، ئەم پێنج خشتەکییە و بەلێکۆڵینەوەیەوە ئاوا بڵاو نەبووەتەوە.

سێیەم: بۆ سەرنجدانی پێنج خشتەکییەکە هەمووی و تیایا ڕەچاوکردنی جیاوازیی ئاشکرای شێوەی هەڵبەستەکەی (کوردی)ی (مامۆستا) لەگەڵ شێوەی پێنج خشتەکییەکەی (فیکری)ی (قوتابی)ی (کوردی)دا و بەراوردکردنی هێز و پایەی هەردووکیان.

کوان (عق، سەی ئەسکەر): ئەی.

کوان (ف، ر، حم، فح، هج، گ/٣): کوا.

طەریقەت (ر): طریقی.

دەردی (عق): درد.

ئەمیش پێنج خشتەکیی ئەم تاکەی سەرەوەیە:

ئەی حەکیمان ئێوە بێن دەرمانی ئەم بیمارەکەن
سەیری ناسۆری برینی سەختی ئەم ئازارەکەن
یا هەتاکو ڕۆژی مەحشەر صەف بەصەف نەظظارەکەن
«کوان ڕەفیقانی طەریقەت دەردی عەشقم چارەکەن
یا بەجارێ بمکوژن جەرگم بەخەنجەر پارەکەن»

بیمارەکەن (ف، فح): بێچارەکەن.
ئەی حەکیمان (ف، فح): ئەی ڕەفیقان.
سەختی (ف، فخ): سەخت.
یا هەتاکو (گ/٣): من دەڵێم تا.
یا هەتاکو (هج): من دەڵێم دایم هەتاکو.
یا هەتاکو (ف، فح): من دلیم دایم هتااو.
صەف بەصەف نەظظارەکەن (ف، فح): صف بصف.
صەف بەصەف نەظظارەکەن (هج): سەف بەسەف.
کە هاتن (صەف) باسە (سەف) لە پاشبەندی ئەم پێنج خشتەکییەدا کە پاشبەندەکانی باڵەکانی بێ (...... رەکەن)ە دیارە هەڵە و نەگونجاوە.
لە جێگەی نیو باڵی سێیەمی پێنج خشتەکییەکەی سەرەوە لە (گ/٣)دا نیو باڵی چوارەمی کە هی (کوردی)یە بەهەڵە نووسراوە و لە جێگەی چوارەمیش ئەوی سێیەم کە هی (فیکری)یە، بەهەڵە نووسراوە و ئەمیش لە شێوەی پێنج خشتەکی (تەخمیس) کردندا نەهاتووە و ناگونجێ.
عەشقم (گ/٣، هج): عیشقم.
کوان (گ/٣، هج): کوا.
ناسۆری (هج): ناسۆرو.
٢- جەور: سزا.
طەعنە: توانج، پلار.
جەوری (ف، ر، عق، حم، فح، هج، گ/٣): ظولی.
ڕەفیقان و (ف، ر، عق، فح، هج): ڕەقیبان و.
ڕەفیقان و (گ/٣): ڕەقیبان وای.
دوشمنان (گ/٣): دوژمنان.
من کە ناڵێم تۆ بڵێ (ر، حم): تو بلی نالیم امن.
بۆچی (ر): بوچ.
ئەمەم (ر): امم - ڕێنووسی کۆنە.

ئەمەم (گ/٣): ئەوەم.
دەربارەکەن (ف، فح): دەربارەکەم – ئەمیش هەڵەیە و لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ.
دەربارەکەن (ر): دربارەکەن.
ئەم تاکە لە (عق)دا نییە.
ئەمیش پێنج خشتەکییەکەی (فیکری)یە لەسەر ئەم تاکی دووەمەی سەرەوە:

یارەبی چ بکەم لە دەست جەوری ڕەقیبی بەد زوبان
نایەڵێ ڕووی تۆ ببـینم یا بەظاهیـر تا نیــهـان
هەر دەڵێم دائیم هەتا ئەو ڕۆژە مـابێ قـەلب و جـان
«اَ خ لەبەر جەوری ڕەفیـقـان و لە طەعنەی دوشـمنان
من کـە ناڵێم، تۆ بڵێ، بۆچی ئەمــەم دەربارەکــەن»

یارەبی (گ/٣): ئەی خودا.
لە دەست (گ/٣): لە دەس.
لە دەست (هج): لە دەستی – کە ئەمەش لەنگی دەکات.
ڕەقیبی (هج): ڕەقیب.
زوبان (گ/٣): فیگار – ئەمەش لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و هەڵەیە.
ڕووی تۆ (گ/٣، هج): یارم – بەپێی دەستووری زمانی لەم پێنج خشتەکییەدا ئەم (یارم)ە هەڵەیە.
نیو باڵی دووەمی ئەم پێنج خشتەکییە لە (گ/٣)دا لەگەڵ نیو باڵی سێیەمیدا بەهەڵە پاش و پێش کراون کە ناگونجێ.
هەر دەڵێم (گ/٣، هج، ف، فح): من دەڵێم.
دائیم هەتا (هج): هەتا – ئەمیش لەنگی دەکات.
مابێ قەلب و جان (گ/٣): نابێ ڕوح و جان – واتە نادات چونکە (ڕۆح) خۆی (گیان)ە.
مـابێ قـەلب و جـان (هج): ناڵی بم نیـهـان – ئەمەش جگە لەوەی کـە لەنگە و واتاش نادات هەروەها وشەی (نیهان) لەم پێنج خشتەکییەدا دووبارەیە کە ناگونجێ و هەڵەیە.
٣– مەسکەن: شوێنەوار، نشینگە.
حەیفە: موخابنە – لەنگی دەکات.
قاپی: دەرگا.
ئاوارە: دەربەدەر، ڕەهەندە.
ئەم تاکە لە (حم)دا شەشەمینە و لەوانی تردا هەر سێیەمینە و، لە (عق)دا دووەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
خاکی (ف، فح): چونکە.

ساڵەمە (ر): سالمە.

ساڵەمە (عق، هـج): ساڵمە. لەگەڵ پاشبەندی پێنج خشتەکییەکەیدا ناگونجێن و هەڵەن.

بۆ تۆ (حم): بو ایوە – ئەمیش لەنگە.

ئێستەکێ (ر): ایستکە.

ئێستەکێ (گ/٣): ئێستەکە.

ئێستەکێ (حم): ایستە – ئەمیش لەنگە.

قاپیەم (حم): دەرەم – دیسان هەر لەنگە.

ئەمیش پێنج خشتەکییەکەی (فیکری)یە لەسەر ئەم تاکەی سەرەوە:

من لە حەسرەت چاوی مەستت، ڕۆژ و شەو هەر ناڵەمە

تۆ نییە ڕەحمت بەحاڵم، چونکە سەختیی تاڵەمە

بۆیە ڕازیم بەم جەفایە صەد شوکور بەم حاڵەمە

«خاکی بەردەرگانەکەی تۆ مەسکەنی صەد ساڵەمە

حەیفە بۆ تۆ ئێستەکێ لەم قاپیەم ئاوارەکەن»

من لە حەسرەت (هـج): من لە مەستی.

مەستت ڕۆژ و شەو هەر (گ/٣): مەستی تۆ شەو و ڕۆژ.

ناڵەمە (هـج): لە.

تۆ نییە ڕەحمت (گ/٣): تۆ بەسە ڕحمێک.

سەختیی تاڵەمە (گ/٣): سەختی تاڵمە – ئەمیش لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و واتا نادات.

سەختیی تاڵەمە (ف، فح): سختی ظالمە – هەڵەیە و ناگونجێ.

بۆیە (هـج): بۆیە وا.

بەم حاڵەمە (گ/٣): بەو حاڵەمە.

بەم جەفایە صەد شوکور بەم حاڵەمە (هـج): ئەمن بەم فیرقەت و شەو ناڵەمە – ئەمەش جگە لە یەکجار لاوازییەکەی (ناڵە)ی دووجار تیا دووبارەیە کە ناگونجێ.

بەم جەفایە (گ/٣): بەو جەفایە.

نیو باڵی دووەمی ئەم پێنج خشتەکییە لەگەڵ نیو باڵی سێیەمیدا ئاڵوگۆڕ پێکراوە و ئەمیش هەڵەیە و واتا نادات.

٤– کەوا: بەرگێکی نێر و مێی کوردانەیە.

گوڵنار: ڕەنگی گوڵە هەناری، واتە سوورێکی بەرەو نارنجی – هەروەها (گوڵنار) جۆرە کر (قوماش)ێکی کۆن بووە کە بۆ بەرگی ئافرەتان و کچان بەکار هاتووە و نەخشی گوڵە هەناری تیا بووبێ.

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە و، لە (حم)دا پێنجەمینە. بەڵام لە (عق)دا هەرچەندە چوارەمینیشە، دیسـان دوا تاکـە و لـە دوای ئەم تاکـەوە لە (عق)دا جـێگەی (٣ – ٤) تاکێک بـە سـپـێتی جێ هێڵراوە.

پێشکەش (حم): پشکش.

ئەگەر (ر):... (لەناوچووە ناخوێندرێتەوە).

دەفعەیێ (ر): دفعهء.

دەفعەیێ (حم): دفعەیە.

دەفعەیێ (هج): دەفعەیەک.

گوڵنارە (حم): گلنارە.

گوڵنارە (هج): گوڵدارە.

ئەم کەوا گوڵنارەکەن (عق): یاری خـۆش ڕەفتارەکەن – ئەمیش بەپێی دەقی سەرچاوەکانی تر لاوازە و بێ واتای گونجاوە و – ئەگەر واش بێ (ئەم)ێکی دەوێ و هی تاکی دواییە.

ئەمیش پێنج خشتەکیی ئەم تاکەی سەرەوەیە:

بۆچی وا مـــەنعم دەکــەن ئەی زاهیـــدانی بێ خـــەبەر
بێن تەمــاشــاکـەن ببـینن دولبـەری شـیـرین کـەمــەر
عـالەمی شـەیدا دەبێ بۆچ ئێـوە چین قـوڕتان بەسـەر
«شێخ و صۆفی دین و ئیمانیان دەکەن پێشکەش ئەگەر
دەفـعـەیێ وەک مـن تەمـاشـای ئەم کـەوا گـوڵنارەکـەن»

بێ خـــەبەر (هج): با خـــەبەر – ئەمـــیش هەڵەیەکی ئاشکرا و گـــەورەیە، دوورە لە واتـای هەڵبـەسـتـەکـە و لە بیـروڕای هۆنەرانـەوە، چونکە هەمـوو دژی (زاهیـدانن) و بەخـراپ ناویان دەبەن، کەواتە ئەم (با خەبەر)ە لە نەشارەزاییەوە وای لێ هاتووە.

دەبێ (هج): دەبن – دیسـان هەڵەیە؛ چونکە (عالەم) (تاکـە) نەک (گشت)، بۆیە (دەبن)ەکە بۆ (کۆ)یە و بۆ ئێرە ناشێت.

٥– مەنعم دەکەن: ڕێم لێ دەگرن، بەرگریم دەکەن، نایەڵن.

کەبک: کەو.

ڕەفتار: ڕۆیشتن (مەبەستە).

ئەم تاکە لە (گ/٣)دا نییە بەپێنج خشتەکییەکەیەوە، هەروەها لە (عق)دا سێیەمین و لە (حم)دا چوارەمینە و لەوانی تردا پێنجەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

زاهیدان (عق): صوفیان.

هێند کەرن (عق): احمقن.

هێند کەرن (ر): هێند کزن.

هێند کەرن (هج): هێند... (کەرن)ەکەی نەخوێندرایەوە. بەڵام سەرو جوان نارِوات، کەو جوان دەرِوات

ناکەن (ف، فح): نایەن.

کەبکی (ر): سرو.

کەبکی (هج): سەرو.

کەبکی (حم، ف، فح): سەروی.

کەبکی خۆشرِەفتارەکەن (عق): او کوا گولنارەکەن – ئەمیش هی تاکی پێشووە و لەگەڵ ئەویدا ئاڵوگۆڕ کراوە.

ئەمیش پێنج خشتەکییەکەی ئەم تاکەی سەرەوەیە:

سـەرویی ناز و، نازەنین و شـاهی خـووبان وا دەبێ

وەختێ جیلوەی خۆی دەدا بێ شک قیامەت ڕادەبێ

من کـە دەیبـینم لە تاوان دەچمـە مـردن جێ بەجێ

«زاهیدان مەنعم دەکەن، بۆچ وا دەکەی؟ ئابرِووت دەچێ

هێند کەرن، ناکەن کە چاو لەم کەبکی خۆشرِەفتارەکەن»

سەرویی (هج): سەروو.

دەدا (هج): بدا.

بێ شک (هج): یەعنی.

٦- دەلێن: ناوی ڕووبارێکە و بەدرێژی لە شوێنی تردا لێی دواوم و لە شارەزوورە.

جۆماڵ: پاککردنەوەی جۆگە، لە زەل و زیوار و قوڕ و بەرگر و بەستەڵەک و قامیش.

ئەم تاکە لە (جم)دا سێیەمینە و لە (گ/٣)دا بەپێنج خشتەکییەکەیەوە چوارەمینە و لەوانی تردا، شەشەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

دەلێنی (گ/٣): گلێنەی. هەرچەندە دەگونجێ بەڵام (دەلێن)ەکە بەهێزترە.

نایێ (گ/٣، ف، فح): نایە.

دەلێنی (هج): دەلێن – ئەمیش هەڵەیە و لەنگە.

ئەم (هج): ئەو – هەڵەیە.

جۆ بارەکەن (ر): جۆ بارەکەم – لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و هەڵەیە.

جۆبارە (هج): جۆیبارە – ئەمیش قورسی دەدا بەکێش.

جۆبارە (جم): روبارە.

ئەمیش پێنج خشتەکییەکەیەتی:

دەردی عەشقم هێند گرانە صەد کەرەت کەوتوومەوە

باوەڕت بێ من نەمـابووم، تازە زیندوو بوومـەوە

جۆگەلەی خوێنین دیارە وا بە صەفحەی ڕوومەوە
«لەت لەتی جەرگم دەلێنی چاوی پڕ کردوومەوە
خوێن بەخوڕ نایێ مەگەر جۆماڵی ئەم جۆبارەکەن»

عەشقم (هج): عیشقم.

هێند (گ/٣): چەند.

نەمابووم (ف، فح، گ/٣، هج): نەماوم – ئەمەش ناشێ.

نیو باڵی دووەم و سێیەمی پێنج خشتەکییەکە دیسان لە (گ/٣)دا پاش و پێشە.

٧– ئەم تاکە لە هەمووباندا جگە لە «عق»دا دوا تاکە و، لەوانی تردا حەوتەمینە، جگە لە (گ/٣) کە پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

(کوردی) (ف، فح، هج): فیکری – و، ئەم جێگۆڕکێ بەنازناوکردنە، بووەتە هۆی شێواندنی خاوەنی هەڵبەستەکە و پێنج خشتەکییەکەی – ئەمەش لە هەڵبەستە کوردییەکانی هۆنەرانی دیکەشماندا زۆر ڕووی داوە. کە بژارێکی ورد و بەپارێزەوەی دەوێت.

جووتم لەگەڵ (حم): کلەم لسر.

وەرە تۆ (هج): ئەتۆ بێ.

جوانیی وێژەیی لە (جووت) و (سێ)ی سێدارەدا هەیە.

ئەمیش دوا پێنج خشتەکیی (فیکری)یە لەسەر ئەم تاکەی (کوردی).

ڕوومەتی یارم لە پەڕەی گوڵ گەلێ نازکترە
جەرگ و دڵ (فیکری) بەتاوە، پڕ لە پشکۆی ئاگرە
فەرموو هەر خۆت بمکوژە کوشتن لەمە زۆر چاترە
«کەس نەڵێ (کوردی) وەرە تۆ دەس لە یارت هەڵگرە
زەحمەتە، نابێ مەگەر جووتم لەگەڵ سێدارەکەن»

پەڕەی: ئەگەر ئاوا بەقورسی نەخوێندرێتەوە کێشەکەی سووک دەکات.

فیکری (ف، فح، گ/٣): هێند بۆی.

فیکری (هج): وا بۆی. نەنووسینی نازناوەکە شێوانی دروست کردووە

فەرموو هەر (ف، فح): تۆ وەرە.

فەرموو هەر (هج): تۆ وەدە.

دیسان تاکی دووەم و سێیەم لە (گ/٣)دا پاش و پێشە و باڵی سێیەم لە (گ/٣)دا بەم جۆرە شێواوە: (حەز دەکەم تۆ بمکوژی لەم حاڵە کوژتن چاترە).

٤٣

## مـن ئەوا بۆ هـەجويی پیرێژن

١- مـن ئەوا بۆ هـەجـــويی پیـــرێژن دڵم کــــەوتە فـــڕین
با بکەم هەجـويی، کـەواتـە: قـەط نەکـەم تەقـصـیـر لە قین
٢- ظـاهـیـــرا پیـــرێژنێکە قـــوربـی خــــانەی ئێـــمــــەیـە
فـیـتنە جـۆیە، بێ حـەیا، هەرگـیـز نیـیـە مـیـثلـی چونین
٣- دەم دەمـی گـــورگ و یـەکـــانە، دان و دڵ وەک زاغـی ڕەش
صــاحـیــبی بوخـتــان و دوو نـان وەک عــەزازیلی لـەعین
٤- عـەفعـەفی دێ عـەینی سـەگ وەخـتێ کە دێتـە گفـتووگـۆ
کــەف چڕینی زاری قـــەوچەی مـــاکـــەرە بێ لێ پەڕین.
٥- تەرحـی چون ڕووبایـی پیـر و چاوی وەک هـی کـویرە مـار
پرچی کلکی کـــەمـــتـــیـــار و، لۆچی لاچاو چرچ و شین
٦- هـێندە بەخــورۆش و بەتاوە پیــرەژن (مـــردووی مـــرێ)
ناڵێ (بەسـیـە)، بێـتـوو گـەر بیگێ هەمـوو ئەهلـی زەمین
٧- جـۆشـی (کـوورە)ی پیـرەژن وەک: (دۆزەخـە زێدە طەلەب)
دەسـتی ڕاسـتی (بـانەگا)ی دەگلـۆفێ هی چەپ بۆ خـورین
٨- سپڵـەیەکە ناپەسـەند، هـەنگوین بەقـوڕگیـا کەی بە دەس
قـــەت خـــەلاصـی نابێ ئەو دەســـتـــە لە زاری بێ گـــەزین
٩- (کـوردی)یە هـەجـوت دەکاتن ئەی عـەجـووزی جینسی کەر
چونکە هێندە لێت بەداغـە، مـیـثلی دوشـمـن (دەرکـەمین)

---

١- هـەجو: بەخراپ پیا هەڵخوێندن. داشۆرین.
تەقصیر: کورتی.
قین: ڕق.
سـەرچاوەی ئەم هەڵبەستە تەنیا سیانە، ئەوانیش: (گل/١، ر) و ڕۆژنامەی کوردی (عێراق)

پاشکۆی (العراق) ژمارە (١٩)ی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٨ – بەغدایە. کە لەمانەشدا (گل/١)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی.

پیرێژن (عیراق): پیرەژن – ئەمیش لەنگی دەکات.

هەجویی (ر): هجو.

پیرێژن (ر): پیرژن.

لە قین (ر، عیراق): یەقین.

تێبینی: بڵاوکردنەوەی ئەم هەڵبەستە لە ڕۆژنامەی (عیراق)دا لە لایەن مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغییەوەیە کە نووسیویە کە لە کەشکۆڵی (مەلا ڕەسووڵی تۆربەیی) کە سەرچاوەیەکی بەنرخ و ٣١٧ لاپەڕەییە، وەری گرتووە کە (٢٣) پارچە هەڵبەستی (کوردی)ی تیایە و لەوانە هێشتا چواریان چاپ نەکراون و، ئەمەی سەرەوە یەکێکیانە.

٢– ظاهیرا: بەسەرزاری، بەئاشکرایی، وا دیارە، لە ڕاستیدا.

قورب: نزیک، دراوسێی مەبەستە.

خانە: خانوو، ماڵ – (کوردی) ماڵی خۆیانی مەبەستە کە لە گەڕەکی حاجی ئەحان بووە و ئێستەش شوێن خانووەکەیان ماڵی بنەماڵەی صاحیبقرانەکانە لە سولەیمانی، نزیک دەرکی ڕۆژاوای مزگەوتی حاجی ئەحان.

فیتنە: زمان بەد و (ئاشووبگێڕ = فیتنە جۆ).

بێ حەیا: بێ ئابڕوو، بێ شەرم.

چونین: هەروەها، ئاوەها و ئەم وشەیە بەڕێنووسی کۆن لە سەرچاوە دەسنووسە کۆنەکانیدا بەشێوەی (چنین) نووسراوە کە بە(چ نین، چونین، چەنین، جینین)یش دەخوێنرێتەوە و، من (چونین)ەکەم هەڵبژارد.

ظاهیرا (عیراق): ظاهیرەن.

پیرێژنێکە (ر): پیرژنی بو.

پیرێژنێکە (عیراق): پیرەژنێ بوو.

قوربی (ر): قرب.

فیتنە جۆیە (عیراق): فیتنەگەر بوو.

فیتنە جۆیە (ر): فتنەگر بوو.

هەرگیز نییە میثلی چونین (ر): هرگز نبو مثل جنین.

نییە (عیراق): نەبوو.

٣– یەکانە: نێرە بەرازی خڕی چوار ساڵەی شەفرە دەرهاتوو کە دانی پیرێژنەکە وەک شەفرەی بەرازەکە وابوو.

زاغ: قەلەڕەش، قەل.

صاحیبی: هاواڵی، خاوەنی.

بوختان: دووزمانی و پیا هەڵبەستن بەخراپە.

دوون: چرووک، پووچ، پەست، سووک.

عەزازیل: یەکێکە لە ناوەکانی شەیتان.

لەعین: بەلەعنەت کراو، ئافەرۆز کراو، نەفرین کراو.

دەمی گورگ (ر): وکو کرکو.

دەمی (عیراق): وەکوو.

یەکانەدان و دڵ وەک زاغی ڕەش (ر): دلی هروک سیاهی زاغ رش.

یەکانە دان و دل وەک زاغی ڕەش (عیراق): دڵی هەروەک سیاهی زاغی ڕەش.

دوو نان (عیراق): خۆی بوو.

صاحیبی بوختان و دوو نان وەک عەزازیلی لەعین (ر): صاحب نختانی خوی و بو وک عزرایل لعین.

سەرنجدانێکی ئەم نووسینی سەرچاوەی (ر)یە، ئەو ئەرک و ماندوویێتی و بەدەسەوە داومە دەردەخا کە لە ڕێگەی ساغکردنەوەی هەڵبەستەکانی (کوردی)دادا و لە دەیان کەشکۆڵی کۆندا هاتووەتە ڕێگەم تاکو پوختەیەکی وەک تاکی سەرەوەم لێ هێناوەتە دی. بەتایبەتی کەشکۆڵی پەرپووت و کوژاوە و نووسینی شکستەی فارسی و ناخۆش ڕێنووسی کۆن و... هتد.

٤- عەفعەف: حەپەی سەگ، گەڤ گەڤ، حەو حەو، عەو عەو.

عەینی: چەشنی، وەک.

کەف چڕین: کەف هاتنە خوارەوەی دەمی مەبەستە.

زاری: دەمی.

قەوچە: دەم تەقاندن و ملّچە ملّچ و خەیاتەکردنی زێی ماکەر بەر لە لێ پەڕاندنی.

بێ لێ پەڕین: بێ ئەوەی نێرەکەر سواری بێ، لێی بپەڕێ.

عەینی (ر، عیراق): هەر وەکو.

کە دێتە (ر): بحث و.

کە دێتە (عیراق): بەحس و.

کەف چڕینی زاری قەوچەی (ر): کف لزاری دیتە خواری.

کەف چڕینی زاری قەوچەی (عیراق): کەف لە زاری دێتە خوارێ.

ماکەرە بێ لێ پەڕین (ر): هروکو کلبی هزین.

ماکەرە بێ لێ پەڕین (عیراق): هەروەکو کەلبی (هەزین)؟؟.

٥- تەرحی: شێوەی، دیمەنی، جۆری.

ڕووبا: ڕێوی.

کلکی کەمتیار: کورتە و گوایە ئەویش پرچی رووتاوە بووە.

تەرحی (ر، عیراق): طەرحی.

وەک (ر، عیراق): چوون.

وەک هی (ر، عیراق): هەروەک.

پرچی (ر): پرچ.

کلکی (ر): کلک.

لۆچی لاچاو (گل/١): نسخە لۆچی خانەء.

لۆچی لاچاو (ر): لوچ خایەء.

لوچی لاچاو (عیراق): لۆچی خایەی.

چرچ و شین (ر):...... خوشین (نەخوێندرایەوە).

٦- خورۆش: ئالۆش، خارشت، خوروو.

بەتاو: بەجۆش و گەرم.

بەتاوە (ر، عیراق): بەتاو بوو. ئەمەش لە رووی دەستووری زمانەوە ناگونجێ.

مردووی مرێ: یا مردووت مرێ: جوێنێکی سەیر و باوی کوردانەیە و بەپێی دەربڕینەکەی خراپی و زیانی و ناخۆشی ناگەیەنی. بەڵام بەپێچەوانەوە وەردەگیرێ و دەبێتە مایەی دڵگرانی. ئەمە وەک وتەی (گا قسە بکا کلکی دەبڕم) وایە، کە لە ڕاستیدا (گا) قسە ناکا و ئەمیش کلکی نابڕێت. ئەمجا لێرەدا کە دەڵێ: (مردووی) - بەواتە ئەو کەسەی لێی مردووە (بمرێت)، ئەمەش نە جنێوە و نە هۆی ناخۆشی و خراپی هێن، چونکە: (مردوو)ەکە خۆی لە خۆیدا (مردووە) و ئیتر مردن لە پاش مردن (نابێ)، کەواتە ئەم جوێنە یا ئەم بەواتە (خواستی خراپییە) شتێکی خراپ و ناخۆشی بەرامبەر بەو کەسەی ناگەیەنێ کە ڕووی دەمی لێیەتی و لە هەمان کاتا دەتوانرێ ئەم وتەیە بەخواست بۆ ڕوودانی (مردن) لەو کەسە دابنرێت، هەرچەند لە ڕووی زمانییەوە دەربڕینەکە هەڵەیە و ئەوە ناگرێتەوە، کە دەبوو بوترایە: دەک مردنت لێ ڕوو بدات.

ناڵێ بەسیە بێتو گەر بیگێ (ر): نی گت... بیان کامی (زەریف نەخوێندرایەوە).

ناڵێ بەسیە بێتو گەر بیگێ (عیراق): نەی دەگوت بەس گەر بیان گایێ.

لێرەدا مامۆستا قەرەداغی نووسیویە: ئەم نیوە شیعرە لە دەستخەتەکەدا هەندێکی کوژێنراوەتەوە، ئەوەی بە(بەس) نووسیم وەک (بکس) دەچێت. هەروەها (بیان گایێ) بە(بیان کامی = بیان گامی) نووسراوە، بەڵام من بەلامەوە ڕاست نەبوو.

٧- جۆشی: کوڵی، بەتاوی.

کوورە: مەبەستی دەعباکەی پیرێژنە وەک کوورەی ئاگر گەرم و بەجۆش.

دۆزەخی زێدە طەلەب: ئەمە دیاردەی شتێکی ترە کە پێویست بەلێکدانەوەی نابینین لە ئایەتی (هل من مزید)دا.

طەلەب: داواکـردن – بەڵام لە کـوردیدا (هـاتنە) فـاڵـی مـاین و ئێسـتـر و کـەرە کـە بۆ مـانگا دەگوترێ هاتووەتە (کەڵ).

بانەگا: سەر بەر، ڕووی دەعباکەی.

خورین: خوراندن – دیارە لەو (دۆزەخ)ە دیاردی بۆ کراوە کە (زیاتر) دەخوازێ؛ هینەکەی ئەم (گڵۆفتن و خوراند)نیشی سەربار بووە.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا نییە و لە (گل/١)دا حەوتەمینە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٨– سپڵە: پێ نەزان، چاکە لە بەرچاو نەبوو، بەدئەمەک.

ئەم تاکە لەو پەندی پێشینانەوەیە کە دەڵێ: (هـەنگوین بەدەمیـا بکەی کـە دەسـتت دەرهێنایەوە دەیگەزێ) بـابەتی نیـشـانە بۆ پەنـدی پێـشـینـان (ئیـدیۆم)کـردنی کـوردی لە هەڵبـەسـتـەکـانی (کوردی)دا زۆرە و لێدوانێکی تایبەتیی دەوێ کە ئێرە جێگەی ئەو درێژەیەی نییە، هەروەها ئەم ڕواڵەتە لە هەڵبەستی هۆنەرە کۆنەکانیشماندا زۆرە. ئەم تاکەش دیسان لە (ر، عیراق)دا نییە و لە (گل/١)دا هەشتەمینە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

خەلاص: ڕسگاری.

٩– عەجووز: پیر.

جینس: ڕەگەز، نەتەوە، نەژاد، توخم.

کەمین: بووسە، حەشار، مەکۆگا. (دەرکەمین) واتە لە بووسەدا بوون.

ئەم تاکە لە (ر، عیراق)دا حەوتەمینە و لە (گل/١)دا نۆیەمینە و لە هەموویاندا دوا تاکە.

چونکە هێندە لێت بەداغە (ر): من لە هجو دە بداغم.

میثلی (ر): مثل.

چونکە هـێندە لێت بەداغـە (عیـراق): من لـە هـەجـوی تۆ بەداغـم. دیارە ئەمـەش هەڵەیە؛ چونکی کوردی لە پیرەژنەکە بەداغ بووە نەک لە هەجوەکەی.

تێـبـینـی: تا ئێـسـتـە و بەپێی ئەو چوار جـار چاپکردنـی دیوانـی (کـوردی) و لێـدوانی نەشـارەزایانـەی ئەوانەی لە بـارەی (کـوردی)وە دواون تەنیـا بەهـۆنەرێکی خـاوەن هەڵبـەسـتی دڵداری دانراوە، بەڵام ئەوە تا لێرەدا و لە شـوێنی ترا هەڵبـەسـتی (هـەجـو) و لە جـێی ترا هـی (نیشـتمـانی) و... هتدیشی زۆرن. کە بەداخـەوە تـا ئێستـە ئەم هۆنەرە باڵایـەمـان مـافی خـۆی نەدراوەتێ و وەک بووە نەخراوەتە ڕوو.

٤٤

## تاكی یار فیتنەی جیهان بێ

١- تاكی یار فیتنەی جیهان بێ؛ صەبر و هۆش و عەقل و دین
بۆ دەوا دەس ناكەون ناویان لەسەر ڕوویی زەمین
٢- لێی دەپرسم؛ بۆچی (كل ساو)ە موژە و ئەبرۆت؟ دەڵێ:
تیغ و تیر ژهراو دەدەم تا هەر بەناسۆر بن برین
٣- دەست ئەوا دێنم و دەبەم یارم كە نێزم لێ بدا،
مۆڕ دەبێتوو پێم دەڵێ: لێم لادە، ڕۆڵە ئێمە نین
٤- یار دەڵێن ئەمڕۆ ڕقی هەڵساوە یاران بێنەوە
فرصەتە بەڵكو دوو جوینمان بەركەوێ مەحرووم نەبین
٥- ئەو عەزیزی نامرێ بگرین بەبێ خۆف و خەطەر
بەو بەهانە قوڕ بپێوین تێر لە چیغیاندا، ورین
٦- چاو لە گەرد و تۆزی فیرقەت كوێر بووە چار ناكرێ
تا جەلا نەدرێ بەخاكی ژێری پێی ڕوحولئەمین
٧- یار لە ترسانا خەوی لێ ناكەوێ باوەڕ بكەن
خێر، عەبەث بۆ قاتیلان، بۆ قەتڵی دڵ چووەتە كەمین
٨- پادیشاهم، تاكو چینی زوڵفی ئەفشان كا شەماڵ
قافڵەی تالان دەكەم؛ هەر (تاجیر)ێ بڕواتە چین
٩- دڵ دەڵێ: یار چووەتە كانی، بانگ دەكا بەل بەغڵەتی
ناوی (كوردی)ی وا لە دەمدا یارا، كە ئێمەش بابچین

---

١- تاكی: تاكو، تاكە، هەتا، تا، هەتاكو، هەتاوەكو، تاوەكو.
فیتنە: ئاشووب.
صەبر: ئارام.
عەقل: ژیری.

دەوا: دەرمــان (بۆ دەوا دەس ناکـەوێ نـاویان) نیـشــانەی یەکـجـار کـەمـیـیـە، کـە تەنـانەت (ناو)یشیان بۆ دەرمان دەست ناکەوێ.

سـەرچاوەی ئەم پـارچە هەڵبـەسـتـە کـەمـە، بەپێی هەڵبـەسـتـەکـانی تری (کـوردی)، بۆیە هـەندێ شـوێنی ئەم هەڵبـەسـتـەم بەدڵی خـۆم و وەک هـەندێ لە هەڵبـەسـتـەکـانی تر بۆ سـاغ نەکرایەوە و سـەرچاوەکانیـشـی ئەمانەن: (گـل/٦، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)ن وە لە نێوانیـاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.

تاکی (ف، نم/١، کم): تاکە.

جیهان (ف، نم، کم، گ/٢، س): زەمین.

لەسـەر ڕوویی زەمین (نم/١، کم): لە کل□ێ روی زەمین.

لە چاپکراوەکـاندا: (ناکـەوێ) نووسـراوە کـە بۆ (تـاک = مـفـرد)ە و هەڵەیە و ڕاسـتـیـیـەکـەی (ناکــەون)ە چونـکە دەنگ لـە چەند ڕواڵـەتێکی زیندەوەری وەک: صـــەبر، هـۆش، عــەقل و دین، نەدات کە (کۆ = جەمع)ن و بۆیە من کردمە (ناکەون).

٢- کل: جـۆرە گڵێکی ڕەشی بریقـەداری کـانزایی (مـەعدەنی)یە، بـۆ ڕەشکردنی برژانـگ و پێڵـو و، نواندنـی چاو بـەگـەورە بەکــار ئەهێنـرێ و (کل ســاو) یـا (ڕشـتن، ڕژتن)ی پـێ دەڵێن و چیــای (سینـا) بەو گڵە بەنـاوبانگە. لێرەدا (کـوردی) کە لە برۆ ڕشـتن دواوە، ئەمـە نەبیسـتـراوە و دەبێ لەو سـەردەمەی ئەودا هـەبووبێ.

موژە: برژانگ، مژۆڵان، موژک.

ناسۆر: نازای کولاندنەوەی برین، جۆرە برینێکیشـە.

بۆچی کل سـاوە موژە و ئەبرۆت دەڵێ (ف، نم/١): بوچ بەکل سـاوی مژت ابروت وتی – ئـەمەش واتا نادات و شێواوە.

بۆچی کل ساوە موژە و ئەبرۆت دەڵێ (کم): بۆچ بەگل ساوی مژەت ابروت وتی.

کل ساوە (گ/٢، س، گ/٣): بۆچ بەکل ساودەی – واتا نادات.

تیغ و تیـر (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): تیغی تیـژ – ئەمەش هـەڵەیە؛ چونکە هـەڵبەسـتەکـە (لەف و نەشری موشەوەش)ە و تیغ مەبەس لە (برۆ) و (تیر)ەکەش موژەیە.

ناسۆر بن (ف، نم/١، کم): ناسۆر بی.

٣- مۆڕبوون: بەڕقەوە سـەیرکردن، تێرامان بەئەندێشـەوە.

ڕۆڵە: وشـەیەکی بانگ لێکردن و وریاکردنەوەیە بۆ منـاڵ و بۆ لە خـۆ بچووکتـر بەکار دێت، یا بۆ سـووکی.

دەست ئەوا دێنم و دەبەم (گ/٣): دەست لە داوێنی دەدەم.

دەبەم (ف): دوم.

یارم کە تیرم (ف): بلی او تیریکم.

یارم کە تیرم لێ بدا (گ/٣): بێ ئاورێ دا لابەلا.
لێم لادە (گ/٢، س، گ/٣): بەولاوە.
٤- فرصەت: هەل، دەرفەت.
مەحرووم: بێ بەش، ناکام.
فرصەتە (گ/٢، س، گ/٣): فرضە - هەڵە و لەنگییە.
٥- عەزیز: خۆشەویست.
خۆف: ترس.
خەطەر: مەترسی.
چیغ: چنراوێکە لە جووتکردنی قەڕەم (قامیشی باریک)ی درێژی چونیەک، بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ و نەخش و، بەتەنشت یەکەوە وەک پەردەیەک بەند دەکرێن، وە بۆ جیاکردنەوە و بەش بەشکردنی ناو ڕەشماڵ و حەوشە و سەربان بۆ تیا دانیشتن و نووستن و ئاژەڵ تیادا کردن کە وەک ژوورێکی سەر نەگیراوی لێ دێ.
ورین: مانەوە - بێ گومان (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لە ناو ڕەشماڵ و چیغدا داناوە، بۆ جوانێکی ڕەشماڵ نشین و، کوردیش ویستوویە لە چیغەکەدا بەو بۆنەیەوە بمێنێتەوە.
ئەو عەزیزی (گ/٢، س، گ/٣): خۆ عەزیزێ.
خۆف (گ/٢، س، گ/٣): خەوف.
بەو بەهانە (ف، نم/١): بو بهانەی.
بەو بەهانە (کم): بو بەهانە.
تێر (گ/٣): تێر.
چیغیان (ف): چخ مان.
چیغیان (نم/١، کم): چیخمان.
چیغیان (گ/٢، س، گ/٣): خۆشمان.
٦- فیرقەت: دووری.
جەلا: مشتوماڵ، پاککردنەوە، بریسک و باک پێ پەیاکردن، ڕووناکبوونەوە.
ڕوحولئەمین: مەبەست لە فریشتە جیبرەئیلە.
گەردو (ف، نم/١): گردی.
گەردو (کم): گەردی.
چار (ف، نم/١، کم): چا.
ژێری (ف، نم/١، کم): ژیر.
٧- خێر: نەء، نەخێر، نا نا.
عەبەث: ئەفسووس.

قاتیل: بکوژ.

قەتڵ: کوشتن.

کەمین: بووسە، حەشار، مەکۆ.

٨- پادیشاهم: من پاشام. هەتا شەماڵ ئەو زوڵفەی شانە بکات لە خۆشیی ئەو دیمەنە جوانەی دڵم لەو چینی زوڵفەی دایە و جێی خۆمە و ڕێگەی کەسی تری تیا نادەم.

ئەفشان: پەخش، بڵاوکردنەوە، پەخشان.

قافڵە: کاروان.

تاجیر: بازرگان.

چین: هەرچەند ناوی وڵاتی (چین)ە، بەڵام مەبەست لە چینی زوڵفە و (کوردی) کە پادشایە هەرچی وەک دڵی ئەم قافڵەی بازرگانیی بچێتە ئەو زوڵفەوە، نایەڵێ و تاڵانی دەکا و جێی خۆیەتی.

پادیشاهم (گ/٢، س، گ/٣): پادشا بم.

زولفی (گ/٢، س، گ/٣): زولف.

دەکەم (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): ئەکەم.

٩- بەل: بەشکو، بەڵکو.

غەڵەتی: غەڵەتی، هەڵەیی... واتە لە (کانی) بەهەڵە ناوی (کوردی)ی بردووە و ئەمەش نیشانەیەکی ڕەشماڵ نشینیی ئەو یارەیە لە کانی.

بەل بەغڵەتی (نم/١): بلبل بغلطی.

بەل بەغڵەتی (ف): بلی بغلطی.

بەل بەغڵەتی (کم): بل بغلطی.

بەل بەغڵەتی (گ/٢، س، گ/٣): بەل بەغلطی.

وا لە دەم یارا (گ/٢، س، گ/٣): بێ بەدەمیادا.

٤٥

## ئەهلی تەقوا

١- ئەهلی تەقوا لێرە بۆ گەردش، ئەگەر بوونە هەوێن
(زەرپەرست)، (لەملا)ن و شیعەی گێرەشێوێنیش لەوێن
٢- جووتەزا، مام و برازا شێر لە یەکدی ساو دەدەن
جاریّ (دەربار)ی (ئەمان) و گا (لەویّ) باریّ لەمێن
٣- گەردی شوبهەی گرتووە ئەمڕۆ کە ڕوشتەی باب و کوڕ
چاوی عیبرت ساتێ لێک نانێن، کەوا: بۆ کێ و؟ لە کێن؟
٤- تابەکەی دەبنە فتیلە و ژیلەمۆی بن کای وڵات
سوودی ئەغیار و زیانیی خۆیە، خۆ تەفرە و بەڵێن
٥- دڵ ئەوا سووتا، زوبانیش گەر بسووتێ؟ موضطەرم
(کوردی) هەر حەرفێکی ئەم نەظمەی بکێشێتن بەخوێن

---

١- ئەهلی تەقوا: خواپەرستەکان و مەبەستی لە هەندێ شێخ و مەلا و صۆفیان و بەتایبەتی هەندێ لە بەرەی، دوو طەریقەتەکەی (قادری) و (نەقشی)یە لە سولەیمانی، هەر (قادری)یەکان.
لێرە: مەبەستی موڵکی بابانە یا سولەیمانییە.
گەردش: ئاشووب نانەوە و پیلانگێڕان بۆ سوودی بێگانەی مەبەستە.
زەرپەرست: زێڕپەرست، پارەپەرست، پوولەکی و ئەشێ مەبەستی (سوننی) بێ.
لەم لا: مەبەستی بەرەی عوسمانییانە کە بێ گومان کاتی دانانی هەڵبەستەکە سەر بەعوسمانی بوون.
لەوێ: مەبەستی ئەودیو، ناو ئێران، ئەوانی سەر بە شای عەجەم.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە گرنگەی (کوردی) تەنیا کەشکۆڵەکەی عەلی ئاغای نەوتچییە (عن)ە کە بەپەراوێزی فارسی ئەمەی لەسەر نووسیوە:
(این قصیده را از یک بیاض عالم فاضل ملا محمد فیضی مفتی زهاوی افندی ادام الله عمره، استنساخ کردم کە شاعرش مصطفی بیک کردی رحمە الله در آن بیاض بخط مبارکش برای مفتی افندی نوشته فرموده - علی).
واتە: (ئەم چامەیەم لە کەشکۆڵێکی زانای بەڕێز مەلا محەمەد فەیضی موفتی زەهاوی ئەفەندی وەرگرت خوا تەمەنی پایەدار بکات کە هەر ئەم چامەیە هۆنەرەکەی مستەفا بەگی (کوردی)

خوا بیبەخشێ لەو کەشکۆڵەدا بەدەستنووسی دا بەنووسینی پیرۆزی (دەسنووسی) خۆی بۆ موفتی ئەفەندی نووسیوەتەوە – عەلی).
واتە ئەم هەڵبەستەیەم کە لەبەر دەستنووسی خودی کوردی وەرگرتووە.
٢– جووتەزا، مام و برازا: لە ڕاستییا لاپەڕەکانی مێژووی ئەو سەردەمە هەڵگەڕانەوەی بابانییەکان لە ناو خۆیاندا لە یەکتری و پیلانگێڕانی ئەم خزمی نزیک لەوی کەیانمان زۆر بۆ دیاری دەکەنەوە کە ئێرە شوێنی ناوبردنی یەکە یەکە و باسی کارەساتەکانیان نییە کە لەم پەڕاوییەمدا لە زۆریان دواوم.
ساو دەدەن: ئەسوونەوە، واتە شیر لە یەکتری تیژ دەکەن بۆ کوشتنی لەشکری یەکتر.
ئەمان: دیسان مەبەست لە عوسمانییەکانە و ئەوانی لەگەڵیا بوون و پێم وایە مەبەستیش (ئەمان الله خان)ی والی سنە بێ کە دوشمنایەتیی لەگەڵ جافدا کردووە.
لەوی: ئەمیش مەبەست لە عەجەم و ئەوانەیە کە لەگەڵیا بوون.
بارێ لەمێن: جارێک لێرەن – واتە ئەوانەی لە ناوخۆدا پیلانگێڕ بوون و هەڵگەڕاونەتەوە – هەروەها بەواتایەکی تر کە (بار = باری شتومەکی لە وڵاخ کراو) و یا پڕ بارێک لە قین و ڕق و، یا: جارێکیش (لە قین) لەقاندن و، جێگە بەیەک لەق کردن.
وە (مێ = مێیینە) و ئەمجا ئەوانە (باری لە مێیینە)ن لەبەر کردەوە و ڕەوشتە ناپاکەکەیان کە وەک نێرێتییان تیا نەبووبێ وا بوون. کە ئەمەیان وەک بەتویکڵ و توانجی تێ گرتبێ وایە.
٣– گەرد: تەپوتۆز، پیسیی با.
شوبهە: گومان، مەبەستی لە مەترسیی لە یەکتری کردنە.
ڕوشتە: پەیوەندی.
عیبرەت: پەند، فێربوون لە کارەساتی ترەوە.
بۆ کێ: واتە بۆ چ کەسێک یا بۆ کام بەرەی عوسمانی و عەجەم، لە کاران و لە پەیکاری دژی بەرژەوەندی ئەواندان.
لە کێن: لە چ گەلێکن و بێگانەکانیش کامەن و کەواتە بۆچی ئەو هەڵەداوان و لە یەکدانە لە ڕێگەی ئەواندا و ئاوا پشتی یەکتر بەردەدەن.
٤– فتیلە: ئەو شاپڵیتەیە بووە کە گویسوانە و کەپر و خەرمان و... هتدیان پێ سووتاندووە – مەبەستی ئەمیش لەمە ئەوەیە کە بۆچی دەبنە ئامێری خراپکاری و وێرانی.
ژیلەمۆی بن کا: لە پەندی پێشینان یا (ئیدیۆمێکی) کوردییەوەیە کە دەڵێن: (ئەڵێی ئاگری بن کایە) کە لە بنەوە و بەنهێنی وڵات دەسووتێنێ و زیانکاری و بەدی دەکات لە نیشتماندا و دژ خۆوڵاتییەکان.
ئەغیار: بێگانەکان.
تەفرە و بەڵێن: مێژوو پڕە لەم تەفرە و بەڵێنانەی عوسمانی و والییەکانی بەغدادیان و شا و

والییەکانی عەجەم کە پەت پەتییان بەبابانەکان کردووە.

ئەم تاکەی سەرەوە لە کۆتایی پەڕەیەکدایە و جارانیش لە جێگەی ژمارە بۆ لاپەڕە دانان، لە داوێنی خوارووی لای چەپەوە یەکەم وشەی سەرەتای پەڕەی دوایی دەنووسرا کە ئەم پەڕەیەش وشەی «دوودمان» لە داوێنی خوارووییەوە نووسراوە، واتە: سەرەتای پەڕەی دوای ئەم پەڕەیەی کە ئەم تاکەی سەرەوەی تیایە دەبێ تاکە هەڵبەستێک بێ کە بەوشەی (دوودمان) دەست پێ بکات، بەڵام لە کەشکۆڵەکەدا ئەو پەڕەیەی دوای پەڕەی ئەم تاکەی سەرەوە دڕاوە بۆیە لە پەڕەکەی بەرامبەریدا ئەو تاکە هەڵبەستەی کە لە سەرەوە نووسراوە بە(دوودمان) دەس پێ ناکات بەشکو بە(دڵ ئەوا سووتا)... دەست پێ دەکات، وەک لە دواترا ئەویش دەنووسم.

ئەمجا ئەو پەڕانەی ئەم هەڵبەستەی تیا نووسراوە لە شێوەی دوو ئەستێرەدا لە هەر لاپەڕەیەکدا تاکە هەڵبەستەکان نووسراون وەک لە نیوەی سەرەوەی پەڕەکەدا، لە سووچی لای ڕاستی پەڕەکەوە بەرەو سووچی لای چەپی خوارووی تاکێک و لە کۆتایی ئەوەوە کە ناوەڕاستی نیوەی سەرەوەی لاپەڕەکەیە بۆ گۆشەی چەپی سەرەوەش تاکێک، ئەمجا لە ناوەڕاستی لای ڕاستی پەڕەکەوە بۆ ناوەڕاستی ئەو نیوەیەی سەرەوە تاکێکی تر نووسراوە و لەو ناوەڕاستەشەوە بۆ ناوەڕاستی لای چەپی نیوەی سەرەوەی لاپەڕەکە تاکێک نووسراوە و ئەو لاپەڕەیە بەتاکێک بەشکراوەوە لە نیوەی دووەمی خوارەوەی جیا کراوەتەوە، هەروەها نیوەی بنەوەشی بەم جۆرە پێنج تاکی تیا نووسراوە، واتە لە هەر لاپەڕەیەکدا (١٠) تاک و ئەو دیویشی ئەگەر (١٠) تاک بووبێ کەواتە بەلای کەمەوە (٢٠) تاک لەم هەڵبەستە لەناوچووە بەدڕاندنی ئەو پەڕەیەی کەشکۆڵەکە. خۆ ئەگەر لە پەڕەیەک پتر دڕابێ ئەوا دوو جار (٢٠) تاکی لەناوچووە.

هەر لەبەرئەوەش کە تاکەکانی ئەم هەڵبەستە زۆر بووە کە ئەوەتا عەلی ئاغای نەوتچی لە کەشکۆڵەکەیدا (عن) ناوی ئەم هەڵبەستەی بە(قەصیدە = چامە) بردووە کە ئەمەش نیشانەی زۆری و لە غەزەل زیاترییە کە غەزەل (٧) تاک و چامە لە (٧) تاک بەرەو ژوورە.

کەواتە زۆر بەداخەوە بەلای کەمەوە (٢٠) تاکی ئەم چامەیەمان لەناوچووە، هیوادارم لە کەشکۆڵێکی تردا بکەوێتەوە بەر هەوێڵ و جێگەی خۆی بگرێتەوە.

٥- دڵ ئەوا سووتا: واتە لەم کارەسات و ناتەبایییە دڵ قرچەی تێ کەوت و سووتا.

ئەم تاکەش ئەو تاکەیە کە لە دوای پەڕە دڕاوەکەوە کە ناومان برد. یەکەم دێڕی پەڕە نوێیەکەیە.

زوبانیش گەر بسووتێ: واتە تەنانەت ئەگەر زمانیشم بسووتێنن و داخی بکەن، کە ئیتر قسەی پێ نەکەم.

موضطەرم: ناچارم کە ئەم قسانە بکەم، چونکە ئیتر توانای خۆڕاگرتنم نەما و دەیڵێم. بەڵام بەداخەوە هەموو وتنەکەیم دەست نەکەوت.

حەرف: پیت.

نەظم: هەڵبەست و مەبەستی لەم چامەیەتی.
بکێشێتن بەخوێن: واتە لە نرخی هەر پیتێ لە پیتی وشەکانی ئەم چامەیەدا جارێک خوێنی خۆم دەدەم و زیندوو بکرێمەوە و جارێکی کەش هەتا ئەوەندەی ژمارەی پیتەکانی ئەوەندە جارە خوێنی خۆم لەسەر قسەکانم دەرێژم و ئەوەندەی لەسەر سوورم هەتا تەواوی دەکەم.
بەرامبەر بەم تاکەی سەرەوە هەڵبەستێکی (فارسی)م بەبیرا دێت کە:

«مـرا دردسـت اندر دل، اگـر گـويم زبـان سـوزد

وگر پنهان كنم ترسم كه مغز استخوان سوزد»

واتە: دەردێکم لە دڵایە کە ئەیڵێم زوبان ئەسووتێ خۆ ئەگەر ئەشی شارمەوە (ئەترسم) مۆخی ئێسقانم بسووتێ).
بەڵام هەیهوو لەم هەڵبەستە و هەڵبەستەکەی (کوردی) کە هەرچەند بیرەکانیان دەچنەوە سەر یەک سەرچاوە، بەڵام ئەوەتا (کوردی) هەزار بەردی داوە بەپشتی ئەو هۆنەرە فارسییەدا و وەک ئەو ناڵێ (دەترسم) بەشکو ئەم ئەوەندەی پیتەکانی هەڵبەستەکەی خۆی (ئەوەندە جارە) خوێنی خۆی بەرشتن و خۆی بەکوشتن دەدات و ناترسێ کە نەک مۆخی ئێسقانی بسووتێ و بەس بەشکو خۆشی لەناوبچێ لە پێناوی وتنیدا بەچەندەها جار.
ئیتر خۆزگە، خۆزگە، هەموو هەڵبەستەکە دەدۆزرایەوە و دەخرایە ڕوو و هەتا ئەو سایە با ئەوەندەی پێشکەش بێ و، ئەمەش لایەنێکی تری نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتیی بابەتی هەڵبەستەکانی (کوردی)مانە.
ئەم هەڵبەستە لە پەڕاوی (چەپکێ لە هەڵبەستی بڵاو نەکراوەی مستەفا بەگی (کوردی)ی صاحێبقڕان و کورتەیەکی ژیننامەی)دا بڵاوم کردووەتەوە کە من لە ١٩٩٨ز.دا بەبۆنەی هەڵبەستنی گۆڕەکەی (کوردی) و (سالم)ەوە بەچاپم گەیاندووە کە لە کۆتاییی هەڵبەستە کوردییەکانی ئەم پەڕاوییەوە وەک پاشکۆ پێشکەش دەکەم.

٤٦

## ئەی حاریث

پێنج خشتەکیی (کوردی) لەسەر هەڵبەستی (نالی)

١- ئەی (حاریث)!! ئەگەر (دەوڵەت)و(جاه) و(حەشەم)ت بوو؟؟
دوڕڕ و، گـــــوهـەر و لـوئـلـوئـو، لـەعـل و، درەمـت بـوو،
(خـووبان)ی سـیـەه مـوویی (پـەری) ڕوو، خـەدەمـت بوو،
«هەرچەندە؛ کـە عـومری (خـضـر) و (جـامی جـەم)ت بوو،
چونکە (ئەمـــەل)ت زۆرە، چ عـــومـــرێکی کـــەمت بـوو».
٢- گـــاهێ بەدوعـــا ڕوو دەکــەیە قــیــبلـەیی حـــاجـــات
گـــاهێ لە ڕەعـــیـــیـــەت دەبیـــە مـــەرگی مـــوجـــافـــات
نـاکــەی لە دڵا قـــەت بەئەبەد فـــیکری مـــوکـــافـــات
«ئـەی جـــامـــیـــعی دونیـــا و قـــیـــامـــەت بە خـــەیاڵات
ئـەو ڕۆژە کـــــە مـــــردی نـە ئـەوت بوو نـە ئـەمـت بوو
٣- چیت کـرد، لە بـەدی، ئێـسـتـە وەکـو سـێـبـەری دووتە
بـویتـە کـەرەکـەی (جـــانە) کـــە ناگـــەیتـــە هەڕووتە
بۆ ئـاخـــری بێ قـــووتە، ئەوی بـاعـــیـــثی قـــووتە
«بێـــزارە لـە تـۆ ئێـــســـتـــە، هەم ئـاغـــۆشی عـــەدووتە
دونیـــا کـــە دوێنێ حـــەرەمی مـــوحـــتـــەرەمت بـوو»
٤- ئـەی مـــونکیـــری ئەفـــســـوردەیی، ظـالـم دڵی، بـەدذات
وەی زاهـیـــدی بـاطـین بەد و، ظـاهـیـــر بـەعـــیـــبـــادات
بێ تەربیـــەت و مـــورشـــیـــد و بێ طـەیی مـــەقـــامـــات
«دوێنـێ چ بـوو؛ دەتدا بـەزوبـان لافـی کـــــەرامــــات؟؟
ئـەمـــــڕۆ: نـە دەمت بـوو، نـە دەمـت بـوو، نـە دەمـت بـوو»
٥- ئـەووەڵ فـــــەرەحی دا فـــــەلەک ئـاخـــر غـــــەمی هێنا
کـــــەم بـوو لـە دەهـەن خـــــەندەیی دڵ مـــــاتـەمی هێنا

باقل دەمی مـــەرگـــە، کـــە هـەنـاســـەت کـــەمی هـێنا
«عـــومـــرت نەفـــەســـێکی کـــە هەمـــوو عـــالەمی دێنا
بمره لە غـــەمـــیـــدا کـــە هـەمـــوو حـــەرقی غـــەمت بوو»
٦- لای خـــاص و عـــەوام ظاهیـــرە، بەدخـــوویـیــیـــە کـــەتنت
وەک (گــای قــەشــە) وا غـــەرقی لە بن خـــەرقـــەیی لەعنت
نـاســـــــازە، ڕەعـــــــیـــــــەت بەڕەقـص نـایـەنـێ لـەحنت
«وەک شـــەڵتـە پەین، (گـەھ) پڕە (گـەھ) خـاڵیـیـە بەطنت
صـــــەوم و ئـەمـــــەلت، باعـــیـــــثی نـەفس و شکەمت بـوو»
٧- وا چاکـــە، لە خـــوا ترس و لـە خـــەڵکانی حـــەیاکـــەی
دوور بی لـە (عـــەجـــەم)، خـــۆت لە پەتی (ڕۆمـی) ڕەهاکـەی
نـاگـــەیتـــە ئەوەی (کـــوردی) کـــە پـابـەندی ڕیاکـــەی
«(نالی) چییـە وا مـیـثلی (جـوعـەول) غـەرقی شـیـاکـەی
خـــۆ تۆ بەحـــیـــســـابی وەکـــو پەروانـە شـــەمت بوو»

---

١- پێشدەستی:
(کوردی) وەنەبێ، هەر ئەم چەند پارچە هەڵبەستە جۆربەجۆرەی دانابێ کە لەم (پەڕاوییە)دان. کـە لەسـەر شـێوەی کـۆن بن کە ئێسـتـە بە(عـەمـوودی) نـاو دەبرێن، واتە هەڵبـەستی کـۆن = (کلاسیکی)ن؛ بەشکو بـەهـەموو توانایی و لێهاتوویی و بالادەستییەوە، پەلی بۆ گشت چەشنە هەڵبـەسـتـەکـانـی ئەو سـەردەمـەی خـۆی هاویشـتـووە، لە چوار باڵی (چوارینـە)، حـەوت بەند (تەرجیع بەند)، هاوچەشن (ڕەدیف) و، تێهەڵکێش (مولەممەع) و... هتد.
ڕواڵەتی گشتی و سـەرەکیی ئەو هەڵبـەستـە کۆنەیش ئەوە بووە کە هەر پارچەیـەی لە پاشبـەند (سـەروا)کانیدا کۆتاییی بەیەک جۆر پیتی هیـجـایی هاتووە و، لەوەوەیە کە بـە(عـەمـوودی)ش پێناسە کراوە.
لە سەرێنی کوردیدا و لە کوردستانی گەورەدا هەر لە قوتابخانەی لاکۆلانانەوە هەتا خوێندنی مـزگـەوت لە پلەی (سـوختـە)ی فەقـێیـەتیـیـەوە تا پایەی بەرزی (موسـتـەعـید) و، وەرگـرتنی گەواهینامەی مەلایەتی، خوێندنیان بەچوار زمان بووە.
یەکەم: زمانی کوردی کە ئەوە زمـانی زگمـاکی هۆنەرانمان بووە و تەنانەت دەسـتووری زمـان و فەرهەنگی عەرەبی و فارسی و تورکیش هەر بەزمانی کوردی خوێندراوە.

دووەم: زمانی عەرەبی بەهۆی ئەوەوە زۆرینەی نەتەوەی کورد لەسەر ئاینی ئیسلام بوون و هەن و پەڕاویی پیرۆزی ئەم ئاینەش کە (قورئان)ە، بەزمانی عەرەبی بووە و فەرمووده (حەدیث)ەکانی پێغەمبەری ئیسلام «د. خ» بەزمانی عەرەبی بوون بۆیە زمانی عەرەبی زمانێکی سەرەکیی هەموو قۆناغەکانی خوێندنی کوردستان بووە و لەم ڕێگەیەدا ئەوی زانایان و زمانەوانان و وێژەوانانی کورد پێشکەش بەزبان و فەرهەنگ و شەریعەتی ئیسلام و وێژەی عەرەبییان کردووە بەهەموو نەتەوەی عەرەب و نەتەوە ئیسلامەکانی تر ئەوەیان بۆ ئەم زمانە نەکردووە و، بۆیە بەپاڵ زمانی کوردییەوەیی هۆنەرانمان بەزمانی عەرەبییش هەڵبەستیان داناوە و یەکێک لەوان هۆنەرمان (کوردی) بووە.

سێیەم: زمانی فارسی – بەهۆی بەرزێتی وێژە و هەڵبەستی فارسییەوە و شاکارێتیی ئەم زمانە لە هەموو جۆرەکانی هەڵبەستدا، زمانی فارسییش هەر لە قۆناغی (قوتابخانەی لاکۆڵان)ەوە شانبەشانی زمانی عەرەبی خوێندراوە و شاعیرانمان و یەکێ لەوان (کوردی) هەڵبەستیان بەم زمانە داناوە جگە لە پەیوەندیی ڕامیاری.

چوارەم: زمانی تورکی – بەهۆی ئەوەوە کە زمانی ڕەسمیی خەلافەتی عوسمانی زمانی تورکی بووە و ئەو خەلافەتەش بەیەکەم خەلافەتی ئیسلامیی سەردەم زانراوە و بەهۆی ژێردەستیی کورد و کوردستانەوە بوو (عوسمانی) لێرە و لەوێی کوردستانی گەورەدا بۆیە زمانی تورکیش خوێندراوە و ئەوەتا پەڕاویخانە مەزنەکانی جیهان هەزاران پەڕاوی تورکییان تیایە کە زانا و وێژەوانان و زمانەوانانی کورد بەو زمانە دایان ناون، هۆنەرانیشمان هەڵبەستیان بەو زمانە داناوە وەک (کوردی) کە لە ڕووی ڕامیارییەوە ئەمەیانمان لێ بووەتە دەرد.

جا هۆنەرانمان و بە(کوردی)یشەوە لە هەڵبەستەکانیاندا بەم زمانانە هەرە وردەکاریترین و، هونەرمەندییان ڕاگەیاندووە و، (گۆی هونەر)یان تیا بردووەتەوە و هەریەکەیان شوێنێکی تایبەتی باڵای بایەخداری بۆ خۆی تیا دیاری کردووە. هەروەها وەنەبێ ئەوی لە دوو توێی ئەم پەڕاوییەدایە لە هەڵبەست تەنیا هەڵبەستی (کوردی)مان هەر ئەوەندە بێت، بەشکو ئەمە تەنانەت سەدیەکیش نییە لە هەڵبەستی (کوردی)، چونکە پیاوێکی گەڕۆک بووە و بەتێکرایی ژیانی لە گەڕیدەییدا بەسەر بردووە و، هەر شوێنەی چەندین هەڵبەستی جۆراوجۆری بەو زمانانە داناون، بۆیە لەبەر هۆی فراوانیی شوێنی تیا دانانی هەڵبەستەکانی (کوردی)مان، من دڵنیام لە سەد یەکێکیشیانم دەست نەکەوتوون.

ئەوا لێرەدا ئەو پارچە یا جۆرە هەڵبەستەی (کوردی) پێشکەش دەکەم، کە بە(پێنج خشتەکی = تەخمیس) ناسراوە کە لەسەر هەڵبەستێکی (نالی) کردوویەتی.

**پێنج خشتەکی چییە؟:**

پێنج خشتەکی، جۆرێکە لە شێوەی هەڵبەستی کۆن و هەر پارچە هەڵبەستێکی (پێنج خشتەکی) بریتییە لە چەند پارچەیەکی گچکەتر و هەریەکێ لەم پارچە گچکەیانەش بریتییە لە (پێنج) دانە نیو باڵی.

ئەمجا هۆنەر یا یەکسەر خۆی ئەم جۆرە هەڵبەستەی داناوە وە یا هەڵبەستی هۆنەرێکی تری وەرگرتووە لەسەر هەریەکێ لە (تاک)ە هەڵبەستەکانی ئەو هۆنەرەی ترە کە (دوو نیو باڵی)یە خۆی سێ نیو باڵی تری لەسەر هەمان کێش و پاشبەند داناوە و بەم سێ نیو باڵییەی خۆی و دووانەکەی هۆنەرەکەی ترەوە هەر پارچەیەک لە (پێنج خشتەکی)یە بووە بە(پێنج نیو باڵی) و ئەمە تەنیا بەرامبەر بە(پێنج خشتەکی) کردنی یەکەمین تاکی هەڵبەستی هۆنەرەکەی ترە کراوە.

بەڵام (تەخمیس) = پێنج خشتەکی کردنی تاکی دووەمی هەڵبەستی هۆنەرەکەی تر هەرسێ باڵی بەپێنج خشتەکی کردنەکەی خۆی لەسەر کێش و پاشبەندی نیو باڵی دووەمی هەڵبەستی هۆنەرەکەی تر کراوە، واتە ئەم پێنج خشتەکیی دووەمین تاکە (چوار باڵ)ی یەکەمیان لەسەر پاشبەندی دووەمین تاکەکە بووە و دوا نیو باڵی ئەم پێنج خشتەکیی دووەمە پاشبەندەکەی لەسەر پاشبەندی پێنج خشتەکیی یەکەمین بووە و بەم چوار لە پێنج خشتەکی تاکی دووەم بەدواوە لە شێوەی پێنج خشتەکیی تاکی دووەمەکە بووە.

ئەگەر پێنج خشتەکی هەمووی هەر هی خودی هۆنەرەکە بێ ئەوا لە رووی بابەتەوە ئەو بابەتە دەبێ کە هۆنەرەکە خۆی هەڵی بژاردووە و، هەڵی دەبژێرێت.

بەڵام ئەگەر پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستی هۆنەرەکەی تر بێ ئەوا (پێنج خشتەکی کار)؛ یا لەسەر هەمان بابەتی هەڵبەستە بەپێنج خشتەکی کراوەکە بووە، کە ئەمەیان ئەوەندە هونەرمەندی و توانایی و لێهاتوویی تیا نییە، وە ئەگەر هاتو ئەو هۆنەرەش کە هەڵبەستی هۆنەرێکی تری تەخمیس کردووە ئەوا (تەخمیس کار)ە ئەگەر بەتوانا و هونەرمەند بوو ئەتوانی لەسەر بابەتێکی تری هەڵبەستە تەخمیس کراوەکە بیکاتە پێنج خشتەکی و بابەتی هونەری خاوەن هەڵبەستەکە وەها لێ بکات کە بیگۆڕێ بەبابەتی خۆی کە جیایە لە بابەتی هەڵبەستەکە ئەمەش توانایییەکی لە رادەبەدەری دەوێت، وەک پێنج خشتەکییەکەی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) لەسەر هەڵبەستێکی دڵداریی سۆفیگەری (خواجە حافظی شیرازی)ی (کوردی زەنگنە)یە و کەچی (شێخ ڕەزا) هەڵبەستەکەی گۆڕیوە بەبابەتی بەدڕەوشتی (مەلا مارف «مەعروف»ی بیدایەت)، کە لە سەدان هۆنەردا یەکێکی وەهایان تیا هەڵناکەوێ کە ئەو توانایەیان هەبێ.

هەرچی وەکو ئەم پێنج خشتەکییەی (کوردی)یە لەسەر هەڵبەستەکەی (نالی) ئەمە ئەگەر لە بابەتیشدا هی هەردوو (نالی) و (کوردی) لێکەوە نزیکن، بەڵام (نالی) لە (شێخ مارفی نۆدێی) دواوە کە لە ڕێگەی چنۆکیدا گێچەڵی بە(مەولانا خالید نەقشبەندی) کردووە بۆ ئەوەی لە سولەیمانی (مەولانا) دەربپەڕێنێ و ئەو دیاری یاریدەیەی بە(خانەقای مەولانا) دراوە بەتەکیەی شێخ مارف بدرێت کە (مزگەوتی گەورە) بووە و، ئەو کەسانەی چوونەتە سەر ڕێباز (تەریقەتی نەقشبەند)ی لای (مەولانا) بچنە لای (شێخ مارف)ی (قادری) و لە ئەنجامدا (مەولانا)ی ئاوارەی (شام) کرد و لەوێ سەری نایەوە.

نالی لە هەڵبەستەکەیدا سەروپۆتەڵاکی (شێخ مارفی) تیا کوتاوەتەوە، بەڵام (کوردی) کە ئەم

هەڵبەستەی (نالی)ی کردووەتە پێنج خشتەکیی ئەم، ئەو سەروپۆتەڵاک کوتانەوەیەی دژی (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابان داڕشتووە لە پێنج خشتەکییەکەیدا و ئەمەش دیسان جۆرە هونەرمەندییەکی تایبەتیی تیایە.
بەڵام لەمەیش گرنگتر ئەوەیە کە (کوردی) لەم (بەپێنج خشتەکی کردنە)یدا هەڵبەستی کەڵە هۆنەرێکی وەک نالیی کردووەتە (پێنج باڵی)، کە هەموو هۆنەرێک پرکێشیی ئەوەی نەکردووە، کە خۆی لە قەرەی (نالی) بدات، بەتایبەتی پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستی مامۆستای وێژە و پسپۆری بێ هاوتا و بلیمەتی وەک (نالی) ئەوە کارێکی هەروا سووک و ئاسان نەبووە و نییە. چونکە ئەوی زۆر بەخۆیدا ڕانەپەرمووبێ و توانایی وەهای نەبووبێ کە بچێتە جەنگی ئەو هەڵبەستەی (نالی)یەوە، بۆ کردنی بەپێنج خشتەکی و شانبەشانێ لەگەڵ (نالی)دا بکات و خۆی لەگەڵدا ڕاست بکاتەوە و بۆیە توانیویە دەست بداتە ئەو کارە و وەک لەم پێنج خشتەکییەدا کە بەوردی (لێکی دەدەمەوە)، بەپێی سەرچاوە شیی دەکەمەوە لە ڕاستی ئەم تواناییەی (کوردی) دەگەیەنێت.

**لێکدانەوە:**

لەم یەکەم پێنج خشتەکییەدا کە لە سەرەتاوە پێشکەشم کرد چەند وشەیەک لە هی (کوردی)دا هەن، لێکدانەوەیان بەپێویست ئەزانم وەک:
حاریث: وشەیەکی عەرەبییە بەواتە جووتیار (ئەوی زەوییەک دەکێڵێ، کە «کوردی» و «عەبدوڵڵا پاشا»ی بابان)ی تیا کردووەتە جووتیارێک کە زنجیرەی ژیانی بەکاری «کێڵان» چواندووە و لە زۆر هەڵبەستی تریشیدا توانج و پلاری لەو (عەبدوڵڵا پاشا)یە گرتووە کە سەرەڕای ئەوەی بەر لە ڕووخاندنی بابان ئەو (عەبدوڵڵا پاشا)یە چەندین جار و بەپشتیوانیی (شای عەجەم)، یا (سوڵتانی عوسمانی)، یا (والی)یە مەمالیکەکانی بەغداوە یا والییەکانی (ئەردەڵان) یا (کرماشان) گێرەشێوێنی و لە پاشایەتی خستنی ئەم یا ئەو پاشای بابان و ئاژاوەنانەوەی بەرپا کردووە و لەو بەدکارییەی خۆی نەکەوتووە تاکو لە ئاکامدا بەپشتیوانیی بێگانە و دوژمن بەکورد لە ڕۆژی ٤/ی تشرینی دووەمی/١٨٥١ز.دا فەرمانڕەواییی بابانی ڕووخاند، وەک لە هەڵبەستی (چاو ئەگەر یارای ڕوانینی نەبێ ئیمڕۆ بەڵان)ی (کوردی)دا لەم پەڕاوییەدا ئەو ڕۆژی ڕووخاندنەم بەچەندین بەڵگەوە جێگیر کردووە و لە (ڕۆژژمێری هاوسەر)ی (مامۆستا هوشیار قەفتان)دا جێگیرم کردووە.
ئەو عەبدوڵڵا پاشایە پیاوێکی بەدڕەوشتی کەمەربەستەی (شای عەجەم) و ئەڵقە لە گوێی سوڵتانی عوسمانی و چڵکاوخۆری والییەکانی بەغدا و ئەردەڵان و کرماشان بووە و دژی فەرمانڕەواییە نیشتمانپەروەرەکەی خۆی (بابان) بووە. کلکی ئینگلیزەکانی بەغدای سەر بە(مستەر ڕیچ) بووە و هەر جارێ بەپشتیوانی و یاریدەی یەکێ دووان لەو دوژمنانە، جۆر و پیلانێکی لابردنی ئەم و ئەو پاشای بابانی ساز داوە، کە هەمـوو ئەو پادشایانەش خزمی نزیکی ئەو بوون و تەنانەت دوا پاشای بابان کە ئەم عەبدوڵڵا پاشایە، ڕووخاندی (ئەحمەد

پاشا) بوو کە برازای خۆی بوو، واتە مامی ئەحمەد پاشا بووە.
جاه: شوێن، پایە بڵندی بەڕێوەبەرایەتی و ڕامیاری.
حەشەم: خێزان و کەسوکار، دەستوپێوەند، ئەوانی لە بەردەستی (عەبدوڵڵا پاشا)دا بوون.
دوڕ: لە جۆرە گەوهەرێکی شووشەیی دەژمێردرێت (کریستاڵ).
گوهەر: گەوهەر بەنرخترین پارچە بەرد یا شووشە یا کانزایی و... هتدە.
لوئلوء: مروواری، مرواری، ئەمیش بەیەکێ لە چەشنەکانی گەوهەر دادەنرێ کە لە دەنکە گەردێکی بچووکەوە پەیدا دەبێ کە دەکەوێتە ناو (قاپووڕ)ی زیندەوەرێکی ئاوی (دەریایی)یەوە واتە (گوێچکە ماسی)یە و (مادە)ی (گەچی)ی بەسەردا دەدەڵێنرێت و بەرە بەرە گەورە دەبێ تا ئەوەندەی بۆڵە ترێیەکی ڕەنگ ئاوی وەیا بریسکەداری سپیی جوانی لێ دێتە بەرهەم و، زۆر بەنرخە بۆ خشڵ و ئارایشت.
لەعل: بابەتە گەوهەرێکی شووشەییی کانزاییە لە زۆربەی گەوهەرەکان بەنرخترە چەندین ڕەنگی هەیە.
درەم: درهەم (دراخم) کە بەر لە ڕژێمی (بەعسی سەدام) نرخی (٥٠) فلس بوو کە لێرەدا مەبەست لە (دراو = پارە)یە.
خووبان: جوانان وشەیەکی کوردی و فارسیشە.
سیەه: ڕەش.
پەری: فریشتەی بەهەشت ئاسایی (حۆری).
خەدەم: نۆکەر، کۆیلە، کارەکەر - وشەیەکی عەرەبییە.
تا ئێرە ئەوانە بوو کە (کوردی) بەرامبەر بە(عەبدوڵڵا پاشا) ڕای گەیاندوون و لەمیش بەدواوە (دوو باڵ) یا (تاک)ە هەڵبەستەی یەکەمی (نالی)یە کە (کوردی) کردوویە بەپێنج خشتەکی و بەستوویەتی بەڕواڵەتەکانی عەبدوڵڵا پاشاوە هەرچەند (نالی) بۆ (شێخ مارفی نۆدێی) وتووە کە لە هەموو پێنج خشتەکییەکاندا تاکەکانی (نالی)م خستنە ناو جووت کەوانە: «...»وە.
لێرەدا من تاکە هەڵبەستەکانی (نالی)م لێک نەدانەوە، چونکە بەڕێز مامۆستا (مودەڕیس) لە (دیوانی نالی)دا لێکی داونەتەوە و چونکە مامۆستا خۆی لەسەر ڕێبازی (نەقشبەندی)یە، بەتەواوی لە لێکدانەوەکەیدا پێی دانەگرتووە کە دەستنیشانی بکات: (نالی) مەبەستی لە (شێخ مارف) بووە لەو هەڵبەستەیدا و مامۆستا نەیویستووە دژی شێخ بدوێت و خۆی لێ پاراستووە، هەروەک لە دیوانی (مەحوی)یەکەیدا دیسان خۆی پاراستووە لە دەستنیشانکردنی گەلێ لە هەڵبەستەکانی (مەحوی) کە دژی (شێخ سەعید)ی کوڕەزای (حاجی کاک ئەحمەدی شێخ) بووە.

**سەرچاوەی ئەم پێنج خشتەکییە:**

سەرچاوەکانی ئەم پێنج خشتەکییە (عن، ف، کو)ن لەگەڵ (س/١، س/٢) و گۆڤاری (بەیان) ژمارە (٨٥)ی ساڵی ١٩٨٣ کە (مامۆستا جەمال محەمەدئەمین) بەسووکە وتارێک لەسەر ئەم

هەڵبەستەی نووسیوە لە ژێر ناوی: (لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم و فایەق...)دا بڵاوی کردووەتەوە، کەچی هەر ئەم پێنج خشتەکییە لە (س/١، س/٢)دا کە هەردوو دیوانە چاپکراوەکەی (سالم)ن بەناوی (سالم)ەوە چاپ و بڵاو کراونەتەوە.

منیش (حەمەبۆر) لە وتارێکی ڕەخنەییمدا لە ژمارەی ئایندەی هەمان گۆڤاردا جارێکی تر و بەپشتیوانی سەرچاوەی (عن، ن) ئەم پێنج خشتەکییەم بەڕاستی و بێ هەڵە و بەتەواوی لێک داوەتەوە و بەلێتۆژینەوەوە بڵاوم کردووەتەوە بەناوی (کوردی)یەوە.

نووسینەکەی (مامۆستا جەمال) هەڵە و ناتەواو و ناڕاست بوو. هەرچەند ئاگەدار بووم کە سەرچاوەی ئەو مامۆستایە کەشکۆڵێکی دەسنووسی کەشکۆڵ نووسی بەناوبانگ (مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەلاڵە) بووە، ئەو کەشکۆڵ نووسە هەڵەی نەبووە و لە سەرچاوەی ترەوە بەناوی (سالم)ەوە ئەم پێنج خشتەکییەی وەرگرتووە هەروەک لە (س/١، س/٢، کۆ) بەناوی (سالم)ەوەیە.

من لە دوای تۆژینەوەی زۆر بەناوی (کوردی)یەوە، لێرەدا جێگیرم کرد، چونکە سەرچاوەی (عن) بە(١٩) ساڵ و، (ن) بە(٢٣) ساڵ دوای مردنی (کوردی) نووسیویانەتەوە و لە ڕووی کۆنییەوە ئەم دوو سەرچاوەیە باوەڕ پێکراوترن، جگە لە پایەی بەرزی وێژەیی نووسەری کەشکۆڵی (عن) کە زۆر ورد و شارەزا بووە، بۆیە (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم پێنج خشتەکییە وەک لە دواتری ئەم باسەدا پتر ئەم ڕاستییە ڕوون دەکەمەوە.

**جیاوازییەکانی ئەم هەڵبەستە:**

ئەم پێنج خشتەکییە لە سەرچاوە زۆرەکانیدا جیاوازی لە پێکهاتەیی و لە وشەگەلی تاکەکانیدا دەبینرێت وەک:

گوهەر و (س/١، س/٢): صدف.

گوهەر و (مامۆستا جەمال): لوئل – ئەمەش جگە لەوەی هەڵەیە و شتێک نییە ناوی (لوئل) بێت هەرچەند ڕەنگە بەهەڵەی چاپی بێ و (لوئلوء) بووبێ لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا جەمال (لوئل)ی بە: (مادەیەکی جوان و بەقیمەت) لێک داوەتەوە وەک نەیزانیبێ کە (لوئلوء) (مرواری)یە.

درەمت بوو (س/١، س/٢): گوهەرت بوو، ئەمیش لەگەڵ پاشبەندا ناگونجێ، بۆیە دروست نییە.

موویی (س/١، س/٢، مامۆستا جەمال): موو – ئەمەش هەڵەیە و لەنگیشە.

پەری (س/٢): پەریی – ئەمیش واتای ڕستەکە دەشێوێنێ.

٢– گاهێ: دەمێ، کاتێ، سەردەمێ، سەرەتێ.

دوعا: پاڕانەوە و خواستیاری شتێک لە خوا و پێغەمبەر و پیاوی گەورەی ئاینی.

قیبلەیی حاجات: ئەو شوێنەی (قیبلە)یەی نیازی لێ گیرا، دەبێ سا یا کەعبە یا خوا و پێغەمبەر و... هتد.

ڕەعییەت: مسکێن. بێ گومان، عەبدوڵڵا پاشای بابان وەک داوێنی بەجێ گەیاندنی فرمانی

دوژمنانەکانی بێگانەی کردووە، بەلادا، هەروەها لەگەڵ گەلیش، خراپ بووە، بۆیە وای پێ وتووە.
مەرگی موجافات: مەرگی موفاجەئە، سەکتەی قەلب، دڵ وەستان، مردنی کتوپڕی – مامۆستا جەمال بە(مەرگی لەپڕ)ی لێک داوەتەوە کە (کوردی) مەبەستی لە مراندنی گەلە، بەدەست خراپیی عەبدوڵڵا پاشاوە.
بەئەبەد: هەرگیز.
فیکر: بیر.
موکافات: پاداش وەرگرتنەوە کە یا کەسان دانی چاکەی پیا بنێن و بۆی چاک بن و، یا لە چاکەکردنی خۆی خوا پاداشی چاکە و بەهەشتی بداتەوە.
قیبلەیی (س/١، س/٢): قبەیی.
موجافات (ن): مفاجات.
قەت (عن، ن، کو): قط.
موکافات (س/٢): حکایات. ئەمیش هەڵەیە.
فیکری موکافات (مامۆستا جەمال): فیکری مەرگی موجافات-ی نووسیوە، ئەمەش هەڵە و لەنگی و دووبارەکردنەوەیە، واتا نادا و نەشارەزایانەیە و کورد وا ناڵێ.
کە مردی (عن، کو، ن، مامۆستا جەمال): کە ڕۆیی.
نە ئەوت بوو نە ئەمت بوو (س/١، س/٢): نە ئەمت بوو نە ئەوت بوو – ئەمیش لەگەڵ پاشبەندا ناگونجێ.
٣- بەدی: خراپی.
جانە: وا دیارە خاوەنی کەرێکی پەککەوتە و بەدخوو بووە و دەبێ سەرگوزشتەیەکی سەیری لەدوو بووبێ بەڵام بەداخەوە وێنەکەوتم کە چۆن بووە.
هەڕووتە: هەورازێکە بەپشت شاری سولەیمانییەوە.
قووت: توێشووی چاکەی مەبەستە لای خوا و بۆ ڕۆژی قیامەت وە (قووت)ەکەی تریش خۆراکە و مەبەستی لە نان برینی خەڵکە لە لایەن عەبدوڵڵا پاشاوە بەخراپکاری و (کوردی) لێرەدا هەڕەشەی لێ دەکات.
ئەم پێنج خشتەکییە لە (کو، س/١، س/٢) و ئەوەکەی (مامۆستا جەمال)دا نییە و تەنیا لە (عن، ن)دایە و سێیەمینە بەپێی هەڵبەستەکەی (نالی)ش لە سەرچاوەکانیدا دیسان هەر سێیەمین تاکە تەنیا لە (گل/٣)دا چوارەمینە، چونکی لەم سەرچاوەیەدا تاکی شەشەمی هەڵبەستەکەی (نالی)ی بەدووەم داناوە.
سێبەری دووتە (ن): سێبەبری دووتە – ئەمیش مەبەستی لە جنێوێکە: کە ئەوەندە نامەردە بۆیە (دوو) پاش، فش، دەویتی.
ناگەیتە (عن، ن): ناکیتە.

٤- مونکیر: ئەوی نەی لە خوا و پێغەمبەر و فەرمایشیان دەکات.
ئەفسوردە: زەبوون، سیس، لەجەر، دڵسارد، کەنەفت، شێواو.
ظالم: ستەمگەر، زۆردار.
زاهید: مەبەست لە بەسەرزاری خواناسە.
باطین: دەروون، بەنهێن.
ظاهیر: سەرزاری، ئاشکرا.
تەربیەت: بەپەروەردە.
مورشیدی طەیی مەقامات: شێخی ڕێ پیشاندەر، بۆ بڕینی قۆناغی ساغی و حەق - ئەمەش ڕستەیەکی صۆفیانەیە.
ئەم پێنج خشتەکییە لە (کو، س/١، س/٢)دا و لەوەکەی (مامۆستا جەمال)دا سێیەمینە و بەپێی هەڵبەستەکەی (نالی) لە (گل/٣)دا پێنجەمین تاک و لە (نا، نع)دا چوارەمین تاکی پارچە هەڵبەستەکەیە،دەبێ «نالی» ئەمەی بۆ مردنی «شێخ مارف» گوتبێ.
ئەی مونکیری ئەفسوردەیی (س/١، س/٢): هەمین گەر آخر دەی - ئەمەش بەشێواوی وەرگیراوە لە نووسینەوەیدا و بۆیە هەڵە و بێ واتایە.
بەد ذات (مامۆستا جەمال): بەدی ذات - ئەوی سەلیقەی شیعری ببێ وا بەهەڵە و بێ واتا نایننووسێ هەرچەندە سەرچاوەکەشی وا بووبێ و پێویستە نیشانەی بۆ بکا کەوا هەڵەیە و لەنگە.
عیبادات (س/٢): عبادات.
بێ تەربیەت و (مامۆستا جەمال): بێ تەربیەتی.
چ بوو دەتدا (س/١، س/٢): کە چ بوو داتە.
زوبان (س/١): زبان.
زوبان (س/٢): زەبان.
نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی (نالی) لە (س/١، س/٢)دا: امرۆکە نە دامت بوو نە دامەت بوو نە دامەت بوو.
ئەمەش هەڵە و لەنگییە و لە (نا)دا (ئەمرۆکە)کەی نووسراوە (امرو).
کەرامات (نا، نع): کەرامەت - و بێ گومان (کەرامات) ڕاستە کە (کوردی) وەری گرتووە.
٥- ئەووەل: یەکەم، مەبەستی (لە پێشا)یە.
فەرەح: خۆشی، شادی.
فەلەک: ڕۆژگار، گەردوون.
ئاخر: لە دواییدا، لە پاشا.
دەهەن: دەم، زار.
خەندە: پێکەنین، زەردەخەنە، کەنین.

ماتەم: ناخۆشی، چەتاڵی، پەستی.

باقل: لام وایە، ڕەنگە، لەوە دەچێ، وابزانم، وا دیارە.

مەرگ: مردن.

کەمی هێنا: کورتی کرد، مەبەستی لە تەنگاوی تەنگەنەفەسی و هەناسەسوارییە.

نەفەسێکی (س/١): نفێکی – دیارە هەڵەی چاپییە.

نەفەسێکی (کو، نا): نفسیکە.

دێنا (عن): هێنا.

دێنا (مامۆستا جەمال): دنیا – ئەمەش بۆ ئێرە واتا نادا و هەڵەیە و لەگەڵ پاشبەندەکەش ناگونجێ. ئەگەر هەڵەی چاپی نەبێ. ڕەنگیشە، چونکە لە نیو باڵی یەکەمدا فەلەک و ئەوەل و ئاخر هەیە وای زانیبێ ئەمەش (دنیا) = جیهانە.

٦- خاص: تایبەتی – بەڵام مەبەستی لە دۆستان و پیاوە گەورە و مەلا و خوێندەوار و هۆنەر و ڕۆشنبیرانی ئەو سایە.

عەوام: مەبەستی لە مسکێن و ڕەشە خەڵکەکەیە.

ظاهیرە: ئاشکرایە، دیارە، دەرکەوتووە، زانراوە.

کەتن: کردنی شتێکی خراپ و ناپەسەند و بێ جێیە.

گای قەشە: ئیدیۆم (کینایە)یەکی کوردییە، بۆ کەسێکی دیاری بەکار دێ وەک عەبدوڵڵا پاشا و ئەشێ نیشانە بێ کەوا کەسێکی وەک (مستەر ڕیچ) کە فەلە (مەسیحی)یە و بۆ پیلانگێڕان لەو سەردەمەیا لە (١٨٢٠)دا هاتووەتە سولەیمانی و لەوە پێش و لەوە دواش هەردەستی پیسی و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی وەک عەبدوڵڵا پاشادا بووە کە (کوردی) ئەوی بە(قەشە) و عەبدوڵڵا پاشای بە(گا)ی ئەو دانابێ یا جنێوێک بێ کە: (قەشە)یەکی وەک (مستەر ڕیچ وای لێ کردووە).

غەرق: نوقوم.

خەرقە: جبە، پۆشاکێکی سەرەوەی پیاوە گەوران بووە و لەوانەیە نیشانە بێ بۆ خەرقەی سوڵتانی عوسمانی یا پاشای عەجەم کە باو بوو بەدیاری ئەیاندایە دۆستە ئەڵقە لە گوێیەکانی خۆیان و جوانی لە نێوان (غەرق) و (خەرقە)دا هەیە. کە (کوردی) ئەو خەرقەیەی بە(لەعنەت) داناوە.

لەعن: لەعنەت، نەحلەت، ئافەرۆز، بەدناو، ناوبردنێکی خراپ.

ناساز: نالەبار، ناهەموار – مەبەستی لە دەنگ و فرمانی عەبدوڵڵا پاشا و شێوەی کردەوە و ڕەوشتێتی کە پەسەند نەکراوە.

ئەو (شەڵتەیە پەین)ە: مەبەستی لە خڕی ورگنی شێخ مارف بووە.

ڕەعیەت: دیسان مەبەست لە: (گەل)، (مسکێن) و (خەڵکی)یە، کە لەگەڵ عەبدوڵڵا پاشا نەبوون، بەتێکڕایی و ئەویش بەهۆی چەند بەکرێگرتەیەکی وەک خۆی و پشتیوانیی بێگانە دوژمنەکان

هەمیشە دژی گەل و نیشتمان بووە.

ڕەقص: سووڕ و سەما و هەڵپەڕین – مەبەستی لەوەیە کە خەڵکەکە بەدەنگت، بەئاوازی ناسازت ناکەونە هەڵپەڕین واتە ئەوی تۆ دەتەوێ ئەوەیان لا چاک نییە و نایانەوێ بکرێ، واز بێنە.

لەحن: نەغمە، دەنگ و مەبەستی لە ڕەوشت و شێوەی نالەبار و ناهەموار و دوژمنانەی عەبدوڵڵا پاشایە کە بەلای خەڵکەوە خۆش نییە و ناسازە و بۆیە نایانخاتە هەڵپەڕین و لێرەدا عەبدوڵڵا پاشای کردووەتە (لۆتی). وەک لە پێشترا کردیە گای گێرەکە و گای قەشەیەکی وەک مستەر ڕیچ یا والییە مەمالیکەکان یا سوڵتان یا شای عەجەم و... هتد.

ئەم پێنج خشتەکییە لە (س/١، س/٢، ئەوەکەی مامۆستا جەمال، کۆ)دا نییە و لە (عن، ن)دا شەشەمینە و بەپێی سەرچاوەکانی دیوانی نالیش (نا، نع) هەر شەشەمین تاکی هەڵبەستەکەی نالییە و تەنیا لە (گل/٣)دا تاکی دووەمینە و ئەم تاکە لە (نا)دا نییە.

وا غەرقی (ن): معلومی.

ئاسانە (ن): آزانە.

٧- حەیا: شەرم، تەقیە، شوورەیی، هەڵسڵەمینە.

عەجەم: مەبەستی لە فەرمانڕەواکانی عەجەم (ئێران)ە کە دوژمنی فەرمانڕەوایی بابان و لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا پەیمان بەستە بوون بۆ لە ناودانی بابان لە جەنگی چاڵدیرانەوە.

پەتی: گوریسی، بەندی و مەبەستی لە پەت ئەوەیە عەبدوڵڵا پاشای وەک (سەگ) داناوە، لێرەدا چونکە سەگ پەت (سنەک) دەکرێ و (کوردی) داوای پەت پساندنی لێ دەکا، هەروەها لە چەند هەڵبەستێکی تریدا (کوردی) دیسانەوە عەبدوڵڵا پاشای کردووەتە (سەگ).

ڕۆمی: عوسمانی و مەمالیکەکانی مەبەستە.

ڕەها: ڕسگار، بەرەڵڵا.

پابەند: بەندیوار، دەربەست.

ڕیا: مەرایی – واتە من (کوردی) هەرگیز مەرایی تۆ ناکەم و گەل و نیشتمانم بۆ تۆ ناگۆڕمەوە و هەمیشە ڕاستی و ئەوی بەرژەوەندی گەل و نیشتمانەکەم بێ ئەوە دەڵێم. شایانی نیشانە بۆ کردنە کە لە شوێنی تری ئەم پەڕاوییەدا باسی (تێگیران) لە نێوان ئەم پاشایە و (کوردی)دا هەیە، لەگەڵ (کوردی) بەندکردنی و لەگەڵیدا کۆ بۆونەوە و... هتد.

ئەم پێنج خشتەکییە لە (کو، س/١، س/٢) و ئەوەکەی (مامۆستا جەمال)دا نییە و لە (عن، ن)دا حەوتەمینە و لە هەموو سەرچاوەکانی نالیشدا ئەم تاکەی (نالی) دوا تاک و حەوتەمینە و ئەم پێنج خشتەکییە لە هەردوو سەرچاوەکەیدا چونیەکە.

٤٧

## وەفا گەر بوو

١- وەفـــا گـــەر بـوو، لە لای دڵداری مـن بـوو
کــەوا بەم تـەرحـــە، تا ســـەر یاری من بـوو
٢- کــە هەوری نەگــبـەتـی ڕووی مــاهـی گــرتم
ئـیــــتـــــر نۆرەی شـــەوانـی تاری مـن بـوو
٣- بـەبێ کــــەس مــــامــــەوە بـێ نـاز و بێ یـار
شـــــــــەو و ڕۆژ نـاڵـە و هـاواری مـن بـوو
٤- کـــە طالـع وەرگـــەڕا، لێم بوو بـەدوشـــمـن
ئەوەی هـام صـوحـبەت و غـەمـخـواری من بوو
٥- کـــە ئـەو دەیـزانـی مـن ئـاوام بـەســـــەر دێ
هـەمـــیــشـــە هـەر خـــەریـکـی کـاری مـن بوو
٦- ڕەقـیـبـیش عـەکـسـی مـەطلەب بوو لـەگەڵـمـا
کـە پـیـشــە و کــۆشـشـی پـەیکاری مـن بوو
٧- بـەقــوربـانـی ســـەگێ بێ ئـەو ڕەقـــیـــبــە
کـــــەوا ئـاشـــــوبـی یـار و دیـاری مـن بـوو
٨- ئـەوەی من قـــەلـبـی خـــۆم دایـێ قـــەڵب بـوو
مــــەظـنـنـە بـەخـــــتـی تـار و لاری مـن بـوو
٩- بـەدۆســـــتـی خـــۆم دەزانـی عــــالـەمـــوڵڵا
کــەچی هـەرچی دەهـات ئەغـیــاری مـن بوو
١٠- وتم وا چـاکـــــە هـەڵبـــێـم لـەو ســــزایـە
جـەفا و مـیحنەت لە ڕێگەش سواری من بوو
١١- وتم بەڵکو لە ســای عــەشــقـا کــە لێــرە
لە غـــەم دەرچم کــەچی غـــەم باری من بوو

١٢- له (ئەستانە)ی غەریبی و بێ کەسیدا
کە بێ (ئاستانەیی) سەرباری من بوو
١٣- چەقۆم لێ ساو دەدا لێرەش کە کەوتووم
ئەوی هامرِازی زوو و، هامشاری من بوو
١٤- خودا خۆی عالیمولغەیبە و دەزانێ
بەناحەق ئەم شەرِە دووچاری من بوو
١٥- کە ئەو نەبووایە لەم غوربەت سەرایە
موحەققەق باعیثی بێزاریی من بوو
١٦- کە شاهم (ماتە) شاهیش بم لە غەمدام
ئەویش بێ مرووەتی خونکاری من بوو
١٧- ئەمیش (کوردی) لە ئاوارەی ولاتان
کە یومنی دۆستی ئیدباری من بوو

---

١- وەفا: بەئەمەکی، پێزانین، لە بەرچاو بوون، ناسپڵەیی.
تەرح: جۆر، شێوە، وێنە، چەشن، جۆن.
سەرچاوەی دەسنووسی ئەم هەڵبەستە (عن، ما، نم)ە لەگەڵ رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٦١)ی رۆژی ١٩٧٩/٢/١٢ (بەغدا) کە (مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی) حەوت تاکی تیا بڵاوکردووەتەوە، و، وا دەردەکەوێ کە ئەویش لە (ما)ی ناوبراوی وەرگرتبێ. هەرچەندە ئەم هەڵبەستە لە (ما)دا (٧) تاک و لە (م)دا (١٣) تاک و لە (عن)دا (١٧) تاکە.
من لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە؛ چونکە لە هەمووان رێکوپێک و گونجاوترە و، لەگەڵ کەمیی سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەشدا، دیسان زۆر باش ساغ کراوەیە.
(عن) لە سەرەتای ئەم هەڵبەستەدا ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوەی نووسیوە:
(کردی رحمه الله برای زیارت احمد پادشاه ببه سوی استانه رفته و در آنجا این قصیده را نظم فرموده که شکایت از بدی احول کرده - علی)
واتە: (کوردی خوا بیبەخشێ بۆ سەردانی ئەحمەد پاشای بابان چووەتە ئەستەمبووڵ و لەوێ ئەم چامەیەی هەڵبەستووە کە تیایا گازندەی لە ناباریی بارودۆخەکە کردووە - عەلی).
گەر بوو (ما): کر بی.
گەر بوو (هاوکاری): کەر بێ.

تا سەر (ما): تا سیر.

تا سەر (م): تا سر.

دیارە (کوردی) وەفاداریی زۆری لە ئەحمەد پاشا دیوە کە ئەوەتا بەم جۆرە لێی دواوە.

٢- ماه: مانگ و مەبەستی (ئەحمەد پاشای بابان)ە و دوا پاشای فەرمانڕەواییەکە بووە. لە پاڵ ئەم تاکەشدا لە (م)دا نووسراوە: (کردی بو احمد پاشای ببەی کوتوە لە استمبول).

تار: تاریکی.

نۆرەی (م): روژی. ئەمیش دەگونجێ و جوانییەکی وێژەییی تیایە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، م)دا دووەمینە و لەوانی ترا نییە، هێشتە چاپیش نەکراوە.

٣- ئەم تاکەش تەنیا لە (عن، م)دا سێیەمینە و لەوانی تردا نییە هێشتە چاپ نەکراوە.

٤- طالع: بەخت.

وەرگەڕا: واتە وەرگەڕا بەخراپی مەبەستی لە ڕووخاندنی فەرمانڕەواییی بابانە.

هام صوحبەت: هاودەم، هاودەنگ، هاواڵ.

ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا چوارەمینە.

ئەوەی (ما، هاوکاری): ئەویش.

صوحبەت و (ما): صحبت.

وەرگەڕا (ما): در کرا.

٥- ئەو: مەبەستی ئەحمەد پاشای بابانە و دیارە زۆر بەتەنگ (کوردی)یەوە بووە.

ئەم تاکە لە (ما، هاوکاری)دا دووەمین و لە (عن، م)دا پێنجەمینە.

کە ئەو دەیزانی من ئاوام (ما، هاوکاری): هەتا دەیزانی ئەو من وام.

٦- ڕەقیب: ناحەز و بێ گومان مەبەستی لە (عەبدوڵڵا پاشای بابانە).

عەکسی مەطلەب: پێچەوانەی خواست.

پەیکار: لە دووی سەر بوون بۆ لەناوبردنی، خەریکبوون لە کاروبارێکدا.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە.

٧- یار: ئەحمەد پاشای بابان.

دیار: نیشتمان و مەبەستی تێکدانی بابانە بەهۆی عەبدوڵڵا پاشاوە.

ئەم تاکە لە (عن)دا حەوتەمین و لە (م)دا شەشەمین و لەوانی تردا نییە.

٨- قەلب: دڵ.

قەڵب: هەڵگەڕاوە، خراپ، پووچ، بێ کەڵک.

مەظننە: باقل، وابزانم، ڕەنگە.

تار: ڕەش.

لار: خوار، چەوت، شەت، گێڕ.

ئەم تاکەش تەنیا لە (عن)دایە و هەشتەمینە و لەوانی ترا نییە و، هێشتە چاپ نەکراوە.

٩- عالەموڵڵا: بەواتە (جیهانی خوا)یە، بەڵام مەبەستی هەموو خەڵقی (مرۆڤ)ە.

ئەم تاکەی (کوردی) ئەوپەڕی مرۆڤێنیی ئەومان لێ دیاری دەکات.

ئەغیار: بێگانان و مەبەست لە دژێتییە.

ئەم تاکە لە (ما، هاوکاری)دا سێیەمین و لە (م)دا حەوتەمین و لە (عن)دا نۆیەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

عالەموڵڵا (هاوکاری): عالم ئەڵڵا.

عالەموڵڵا (ما): عالم ایستە.

کەچی (ما، هاوکاری): بەڵێ.

دەهات (ما، هاوکاری): کە هات.

١٠- هەڵبێم: هەڕاکەم، خۆ ڕسگارکەم، دەرچم بەخێرایی.

سزا: ئەرک و ئازار و ناخۆشی.

جەفا: ڕوو ساردی و وشکی و دژواری.

میحنەت: ئەرک، چورتم، نەهاتی.

سواری من بوو: سوارم بوو - یا من وەک پیادەیەک بووم و هەرچەندم دەکرد پێش ئەو نەدەکەوتم تا ڕسگار ببم چونکی ئەو سوارە بوو من پیادە، چونکە کوردی زۆری گەڕیدەییەکانی بەپیادەیی بووە.

ئەم تاکە لە (م)دا هەشتەمین و لە (عن)دا دەیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

١١- غەم باری من بوو: غەم بوو بەباری دڵ و دەروونم.

ئەم تاکە لە (م)دا نییە و لە (ما، هاوکاری)دا شەشەمین و لە (عن)دا یانزەمینە.

وتم (ما): وطم.

لە سای عەشقا کە لێرە (هاوکاری): بەسایەی عەشقی تۆوە.

لە سای عەشقا کە لێرە (ما): بسا بەعشق توە - لێرە مەبەستی ئەستەمووڵە.

**تێبینی:**

(کوردی) لە نێوان هۆنەرەکانماندا یەکێ بووە لە پیاوە ورد و، وتە لە جێگەی خۆیدا کار، هەرچەندە هەڵبەستەکانی (کوردی) لە ناو هی هەمووواندا بە(سۆز) و بە(سادەیی) ناسراون، لەگەڵ ئەو سادەییەشیدا زۆر وەستایانە و بەوردی وشەی لە هەڵبەستەکانیدا بەکار هێناوە تاکو پڕ واتاتر بن.

بەسەرنجدانێکی ئەم تاکە هەڵبەستی یانزەیەمین وەها دەردەکەوێ کەوا (کوردی) ئەوەندە خەفەتبار بووە و زۆر بیری (ئەحمەد پاشا)ی کردووە، ئەو گەشتی (ئەستانە = ئەستەمبووڵ)ی

کـردووه، بـۆ دیدەنی ئەحـمـەد پاشـا کـە لە دوای ڕووخـاندنەکـەی چووە لای خـەلیـفـە بۆ وەرگرتنەوەی دەسـەڵات و پاشایەتییەکەی فـەرمـانڕەوایی بابان و خـەلیفەش چونکە بـەفرمـانی خـۆی بابانی ڕووخـابوو، لەبەرئەوە هـەر دەسـتی دەسـتـیی بەئەحـمـەد پاشا کـردووە و ئەمـڕۆ بەسبەیی پێ کردووە.

(کوردی) کـە گەیوەتە لای ئەحـمـەد پاشـا، لە جێگەی شـادبوون کە تێ گـەییوە پاشـا هـیوای گەڕاندنەوەی ڕژێمی بابانی نییە ئەوا (کوردی) لە جێگەی شـاد بوون بەدیتنی ئەحمەد پاشـا، بەو هیوا نەبوونە غەمبـار بووە بۆیە وتوویە (غەم، باری من بوو) واتە غـەم بوو بەبارم، هـەروەها مـەبەسـتـیشی لەوەوەیە کە گـەیوەتە ئەسـتـەمـووڵ، ئەحـمـەد پاشـای بەغـەمـبـار دیوە بۆیە وتوویە (غـەمـبـاری من) واتە (غـەمگینەکەی من) کـە (ئەحـمـەد پـاشا)یە ئەمـانەش بەپێچـەوانەی واتای سـەرزاری تـاکـەکـەوە کـە وردیـی (کـوردی) دەگـەیەنن. وەک لە تاکـەکـانی دوایـیـدا ڕوونی کردووەتەوە.

١٢- ئەسـتانە: پایـتـەختـی ئەوسای عـوسـمـانی بوو کە دەکەوێتـە سـەر گـەرووی بۆسـفۆڕ و لە نێـوان هـەردوو دەریای ڕەش و مەڕمەڕە دایە و بەرێکی بەر (ئاسیا) و بەرەکەی تری کە ڕۆژئاوایە، بەر (ئەوروپا) دەکەوێت کە لە ڕۆژاوای سەرووی تورکیای ئێستەدایە.

غەریب: دووره نیشتمان مەبەست لەوەیە کە ئەحمەد شا هیوای بەبوونی ڕژێمی کوردی نەبووە، بۆیە کوردی خۆی بەغەریب و بێ کەس داناوە.

ئاستانە: شوێن.

ئەم تاکە لە (ما، هاوکاری)دا نییە و لە (م)دا نۆیەمینە و لە (عن)دا دوازدەمینە.

١٣- لێ ساو دەدا: لێ دەسوێت، لێ تیژ دەکات بەنیازی کوشتنم.

لێرە: مـەبەسـتی ئەسـتـەمـبـووڵە کە لەوێ ڕاپۆرتی لێ دراوە کە بۆ پیـلانگێـڕان لەگـەڵ ئەحـمـەد پاشادا خەریکە. لە لایەن زۆڵە کوردەکانەوە.

هامراز: هاوڕاز، هاودەنگ.

هامشار: هاوشار، خەڵکی سولەیمانی.

ئەم تاکە لە (ما، هاوکاری)دا نییە و لە (م)دا یازدەیەمینە و چاپیش نەکراوە.

١٤- عالیمولغەیب: نهێنی زان و ئەمە سیفەتێکی خوایە.

بەناحەق: بەبێ سووچ، بەناهەق و بێ گوناهی، ناتاوانباری.

شەڕ: گێچەڵ، چورتم، بەهانە، بەدرۆ تاوانبارکردنی.

دووچار: تووشبوون، گیرۆدەیی، تاوانبارکران.

ئەم تاکە لە (ما، هـاوکـاری)دا پێنجـەمـینە و لە (م)دا دەیەمینـە و لە (عن)دا چواردەهـەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

دووچاری (ما): دوجارە.

١٥- ئەو: مەبەستی لە ئەحمەد پاشای بابانە کە لەو ڕاپۆرت لێدانەیدا فریای کوردی کەوتووە.
غوربەت سەرا: مەبەستی لە ئەستەمبووڵە کە تیایا غەریب بووە.
موحەققەق: بەڕاستی، بێ گومان.
باعیث: هۆ.
ئەم تاکە تەنیا لە (عن)دایە و پانزەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.
١٦- شاهم: پادشای من، کە ئەحمەد پادشای بە شای خۆی ناو بردووە.
ماتە: بێ دەنگ و پەستە - دیارە بەڵێنێکی دڵخۆشکاری لە سوڵتانی عوسمانی وەرنەگرتووە - وە وتەی (شاهم ماتە) - لە یاریی (شەترەنج)دا شکان و خواردنی شایە کە ئەم دەربڕینە جوانیی وێژەیی تیایە.
بێ مروەتی: نامەردی و نامرۆڤایەتی.
شاهیش بم: کوردی بەخۆی وتووە تەنانەت ئەگەر من خۆم پادشاهیش بم هێشتا هەر غەمبارم لەبەر ماتیی شاهم ئەحمەد پاشا.
کە لە یاری (شەترەنج)دا وشەی (مات) واتە (مات بوون) و مردنی پادشای یارییەکەیە.
خونکار: خوینکار - هەروەها ناوی سوڵتانەکانی عوسمانییە و دیسان عەبدوڵڵا پاشای بابانە کە بەفیتی ئەو ڕاپۆرتی لێ دران، ئەمیش بەم دوو واتایە جوانی وێژەیی تیایە.
ئەم تاکە لە (م)دا دوانزەمینە و لە (عن)دا شانزەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە.
١٧- ئەمیش: واتە (کوردی)ش وەک زۆری تر.
لە ئاوارەی ولاتان: لەوانەی کەوا دوورە ولاتن و لە نیشتمان ڕەهەندە بوون (کوردی)ش یەکێکە - لە ڕاستیشدا لەو کەسانەمان لەو سەردەمەدا زۆرن، ئەوە (نالی) و (مەولانا خالید) و (مفتی زەهاوی) و (بێتووشی) و گەلێکی تریش وەک (حاجی قادری کۆیی) و (خەیالی) و (کەیفی) و... هتد.
یومنی: پیرۆزی.
ئیدبار: پشت لێ هەڵکردن.
ئەم تاکە لە (ما، هاوکاری)دا حەوتەمینە و لە (م)دا سیانزەمینە و لە (عن)دا حەڤدەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لە هەمووانیشدا دوا تاکە.
ئەمیش (کوردی) لە ئاوارەی ولاتان (هاوکاری): اویش کردی کە آوارەء ولاتان.
لە یومنی دۆستی ئیدباری من بوو (ما، هاوکاری): لیمن دوستی ادبار من بو - مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی نووسیویە: (ئەم تاکە شیعرەم باش بۆ نەخوێندرایەوە، بۆیە بەڕێنووسی دەسخەتەکە نووسیم) ئەوەتا من ساغم کردووەتەوە.

٤٨

## لە وێرانەی دەروونم

١- لە وێـرانـەی دەروونم، شـــــینـە بـێ تـۆ

ئیـتـر گـوڵزاری دڵ، کـەی شـینە بـێ تۆ

٢- لە ئەشک و ئاهی ســەردم ئایینـەی دڵ،

قـوبان؛ ســوور و ڕەشـە و ڕەنگینە بێ تۆ

٣- جێگام صەحرا و، وەحشیم یار و هاودەم

دڕک فـــەرش و گـــەون باڵینە بێ تۆ

٤- لە دووریی تۆ، بەمـــەرگ ئاواتەخـــوازم،

کە جـەسـتـەم خـەسـتـە و، دەردینە بێ تۆ

٥- ڕەهی وەصلت ئەوەندە ســەخت و دوورە،

بەنووکی دەرزی، بیـــر کـــۆڵینە بێ تۆ

٦- زومـســتــان مـەیلەکـەت، پایز براکـەم

بـەهـاری وەصـلـی تـۆم هـاوینـە بـێ تـۆ

٧- گریم من بوومە والی و شـاه و سوڵتان

توخوا سا کاکە گیان!! کەی ژینە بێ تۆ؟؟

٨- لە بتـخـانەی عـەشـقـدا بوویتـە قـیـبلەم

لەتاو هیـجـرە کـە مـەی نۆشـینە بێ تۆ

٩- دەڵێن (کـوردی)؛ لـە بۆ تۆ بووەتـە کـافـر

عـــەجــەب پیـــاوێکی بێ ئایینە بێ تۆ

---

١- وێرانە: کاول، خەرابە.

شین: شین و زاری، گریان، شیوەن، شەپۆڕ.

شین: ڕەنگی شین و مەبەستی سەوزیی ڕەنگی گوڵزارەکەیە، ئەمەش جیناسە کە هەردوو (شین)ەکە هەریەکەی بەواتایەکن.

سـەرچاوەی ئەم هەڵبەسـتـە لە دەسنووسـدا (مس، عن، گل/٥، ش، جلی، ف، نم/١) و، لە چاپکراوانیشدا (گۆڤاری زاری کرمانجی – ساڵی/٢ ژمارە/١١ی ڕۆژی ١٤ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٧ی زایینییە لە ڕەواندز کە مامۆستا و مێژووناسی مەزنمان (سەید حوسەین حوزنی موکریانی) دەری کردووە و لێرەدا بەنیشانەی (کرمانجی) دیاریی دەکەین، وە هەروەها سەرچاوەی (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە لەگەڵ (ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە/٧ ساڵی ٢ی ١٩٦٢ی زایینی کە لە (تەهران) دەرچووە بەنیشانەی (کوردستان) لێرەدا دیاریی دەکەم. لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و پشت بەوەکانی تریش دەبەستم، هەرچەند لەم پەڕاوییەمدا بەتێکڕایی کۆنترین چاپکراوم لەسەر هەڵبەستێک کردۆتە بنکەی، بەم پێیە دەبوو (زاری کرمانجی)م بکردایەتە بنکە بەڵام بەداخەوە لەم سەرچاوەیەدا هەندێ شێواوی لە هەڵبەستەکەدا هەیە و لەمەیش گرنگتر ئەوەیە کە: چ لەم سەرچاوەیەدا و چ لە زۆربەی سەرچاوەکانی ترشدا ئەم هەڵبەستە و هەڵبەستی (دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بێ تۆ)ی (کوردی)یان ئاوێتەی یەکتری کردووە لە هەندێکیشیاندا هەندێ تاکی ئەم دوو هەڵبەستە بەجیا هەیە و هەندێکی کە جگە لە جیاوازیش لە نێوان وشەکانی هەر تاکێکیاندا و، لەبەرئەوەی لە (عن، مس، گل/٥)دا بەتایبەتی ئەم دوو هەڵبەستەم لێک جیا کردووەتەوە کەوا بەدوو هەڵبەست دیارییان کردووە، بەپێچەوانەی ئەوانێکەوە کە هەموو کردوویانەتە یەک پارچە هەڵبەست بۆیە لێرەدا ئەم هەڵبەستە و، لە دواتریشدا هەڵبەستەکەی تر پێشکەش دەکەم بەوردی لێیان دەکۆڵمەوە لەم پەڕاوییەدا.

جوانیی وێژەیی لەم تاکەدا بەجیناس ئاراییی لە دوو وشەی (شین)دا. دیسان (شینە بێ تۆ) بەواتە شین دەبێتەوە، ئەڕوێت، سەوز دەبێت. بەپێی ئەوەی کە لە (گل/٥)دا نووسیویە: (چون شین بێت) واتە: چۆن شی (خاو) نەبێتۆ، یا لێک هەڵنەوەشێت، جگە لەوەی کە (کەی شین «سەوز» دەبێتەوە)ش دەدات کە ئەمانە هەموو وردەکارین، وەستایین لە وێژەی کۆندا.

لە سەرچاوەی (عن)دا بەپەراوێزێکی فارسی لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسیویە: («کردی» و «سالم»ی رحمهما الله ردیف یکدیگر فرموده اند – علی).

واتە: (کوردی) و (سالم) لە هاوچەشنی یەکتریان داناوە، خوا لێیان خۆش بێ – عەلی) کە ئەو هاوچەشن (ڕەدیف)ەی (سالم)یش سەرەتاکەی ئەمەیە:

«لە سینەمدا صەدای ناڵینە بێ تۆ
دڵی زارم بە سێ غەمگینە بێ تۆ»

کە لە هەموو دیوانە چاپکراوەکانی «سالم»دا نووسراون، بەڵام نازانرێ کە ئایا کامیان بەر لە کامیان وتوویانە، لەوانەشە ئەوەکەی (سالم) درێژتر بووبێ.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل/٥)دایە و لەوانی تردا نییە.

شینەبێ تۆ (عن) بەرامبەر بەیەکەمیان (شینە بێ تۆ) بۆ دووەمیان نووسیویە: نسخە شین

بیتو.

کەی شینە بێ تۆ (گل/٥): چون شی نبیتو.

کەی شینە بێ تۆ (عن): نوشیە نسخە: کو...

ئەم تاکەی سەرەوە هێشتە چاپی نەکراوە.

٢- ئەشک: فرمێسک، ڕۆنتک.

ئاهی سەرد: هەناسەی سارد.

ئایینە: ئاوێنە، قۆدیک، باڵەبان، نەینۆک.

قوبان: قوربان، بالاگەردانت بم، گوریێ تەمە.

سوور و ڕەش و ڕەنگینە: مەبەستی لە سووریی فرمێسکی خوێناوی، هەناسەی وەک دووکەڵ ڕەشە کەوا ڕەنگینە بەم ڕەنگانە.

بێ تۆ: بەبێ تۆ، (بێ توو) دەبێتەوە... یا بیتەوە.

ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و لە (عن، مس، گل/٥)دا دووەمینە و لە (کرمانجی، ف، کوردستان، مد/٢)دا چوارەمینە و لە (نم/١، کم، گ/٢، س، جلی، گ/٣)دا پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

ئاهی سەردم (جلی): آە تارا - واتە: ئاهی ڕەشدا.

ئاهی (عن، مس، گل/٥): آە.

سەردم (گ/٢، س، مد/٢): سەرد - ئەمیش لەنگە.

سەردم (کرمانجی، گ/٣): تار - دیسان لەنگییە.

ئایینەی (نم/١): آینەی - ئەمیش لەنگییە.

ئایینەی (جلی): سینەء.

قوبان (کرمانجی): جمال.

قوبان (گ/٢، س، گ/٣): جەمالی.

قوبان (جلی): قبان.

قوبان (عن): قبا.

قوبان (کوردستان): ئەوا.

قوبان (مد/٢): جیهان.

سوور و (جلی): زەرد و. ئیتر پاشماوەی ئەم نیو باڵە دڕاوە.

سوور و (کرمانجی): زەرەرد.

ڕەش و (کرمانجی): خیش.

ڕەش و (گ/٢، س، گ/٣): ڕەش.

ئەم تاکە لە (ف)دا چوارەمینە.

٣- صەحرا: دەشت و بیابان، چۆڵەوانی.

وەحشی: کێوی، مەبەستی لەو زیندەوەرانەیە کە کەوی نابن و دڕندەن.

یار و هاودەم: دۆست و هاودەنگ.

فەرش: ڕایەخ.

گەون: ڕوەکێکە لە چیا و پێدەشتەکانی کوردستاندا زۆرە و بریتییە لە تۆقەنێکی پڕی پێکاچووی لاسک باریکی وەک لاسکە گەنم و جۆ، بەڵام لە شێوەی شووڵدا نەک (پووش)، لە بنکیشەوە دڕکاوییە بەبەرزیی نیو مەترێک و شوێنی مەترێک چوارگۆشەیی لە زەویدا ئەتەنێتەوە. هەر تۆقەنێ جیایە لەوی ترەوە، ڕەنگەکەی کەسکێکی تەڵخ و بنی لاسکی سووربباوە، دڕکەکەی بەئازار و گوڵێکی وەک گوڵی دەمەشێری خڕکەڵەی ناوبۆشی هەیە، ڕەنگی مۆرباو و شین واشە، کە گوڵەکەی لەپڕ بگوشرێت دەتەقێ، لقی ئەو تۆقەنە جۆر، جۆرێ (کەتیرە) دەدەڵێنێ کە بریندار بکرێ.

(کوردی) ئەو ڕەگەی بەجێگە قۆڵی خۆشەویستەکەی داناوە کە بەشەو لە کاتی حەسانەوەیدا گوایە لە ژێر سەریایە وەک سەرین (پشتی).

باڵین: سەرین، بالیفک.

ئەم تاکە لە (مس، عن، گل/٥، جلی، ف، ش، کرمانجی، کوردستان)دا سێیەمینە و لەوانی تردا چوارەمینە.

وەحشیم (کوردستان): وەحشم.

جێگام (کوردستان): جێیەم - لە لایەنی کێشەوە ئەم وشەیە زۆر بەجێیە چونکە کێشی ئەم تاکە لە سەنگدا قورسییەکی لە دەربڕینی وەک وشەی (جێگام)ی نییە یا ئەگەر (کە جێم) بووایە سووکتر دەبوو و، ئەو گرانییەی نەدەما و سوارتر دەبوو، بۆیە ئەم (جێیەم)ەی سەرچاوەی (کوردستان) لە هەموو سەرچاوەکانی تر دەگونجێ و بەشێوەی (سنە)ییشە کە (کوردی) زۆر جاران زارگوتی ئەوێی لە هەڵبەستیدا بەکار هێناوە.

جێگام (مد/٢): جیکم.

هاودەم (کوردستان): هامدەم.

فەرش و (ش): فرش.

هاودەم (کرمانجی): همدنگ.

گەون (گل/٥، گ/٣، ف): کوچک - بەواتە بەرد - لێرەدا ئەوەم بەبیردا دێتەوە کە ئەحمەد حەمدی بەگی صاحیبقران لە کاتی دەربەدەری و چەک هەڵگرتنەکەیدا دژی ئینگلیزەکان، هەر کاتێ بەشەو لە چیا و ئەشکەوتەکاندا دەنووست بەپیاوەکانی خۆی دەگوت: (ئا کوڕینە بەردێکی نەرمم بۆ بێنن بیخەمە ژێر سەرمەوە تاکو سەرخەوێکی لەسەر بشکێنم) ئەمەم لە یەکێ لە پیاوەکانی (حەمدی) بیستووە کە ناوی (خولە کەڵەشاخ)ی شێخانی گوندی

(فەرزەنە)ی نزیک (پێنجوێن) بوو.

گەون (ش، مد/٢): کچک.

گەون (کرمانجی): کتک.

هاودەم (نم/١، ف): همدم.

لە نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە لە (جلی)دا تەنیا: (درک فرش)ی ماوە و ئەوی تر دڕاوە و لەناوچووە.

لە بارەی جوانیی وێژەییەوە لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتتەب) لە نێوان (صەحرا) و (فەرش)دا هەیە لەگەڵ (یار) و (باڵین)دا ئەمەش لە وێژەی کۆندا پەسەندی و وەستاییە.

لە (مد/٢): ئەم تاکە سێیەمینە.

٤- جەستە: لەش، قاڵب.

خەستە: نەخۆش.

دەردین: دەردەدار، دەردەداوی، نەخۆش.

ئەم تاکە لە (مس، عن، گل/٥)دا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە (کوردستان)دا هەشتەمە و، نیو باڵی یەکەمی ئاوێتەی سەر تاکی چوارەمی هەڵبەستی (دەروون زامدار و دڵ غەمگینە) کراوە و لەوانی تردا نییە. لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەم دوو هەڵبەستە کراونەتە یەک پارچە هەڵبەست و پاش و پێش و ئاوێتەکاری و گۆڕانیان تیا ڕوودراوە.

لە دووری تۆ (کوردستان): لە دووریتا.

ئاواتەخوازم: ئەم جۆرە دەربڕینە بەبناغەیەکی سەرەتایی پەیدابوونی (ئە)ی زاراوەی (زارگوت = لەهجە)ی سولەیمانی دابنرێت کە لە جێگەی (دە)ی هەموو زارگوتەکانی تری کوردستان بەکار دەبرێ، چونکە ڕستەی (ئاواتەخوازم)ەکە لە (ئاوات دەخوازم)ەوەیە و سووککراوەی وتەی (ئاوات ئەخوازم)ەکە (دە)ی (دەخوازم)ە کە بووەتە (ئە)ی (ئەخوازم) و ئەمجا لە زماندا سووکتر کراوە و بووەتە (ئاواتەخوازم) کە (دە) و (ئە)یەکەش سووڕاونەتەوە لەبەر ئاسانی لە دەربڕیندا و لە جێگەی (دە)یەکە (ئە) هاتووەتە ئاراوە و، ئەویش قووت دراوە ئەمەش وێنەیەکی ئەم ڕووە زاراوەییە (زارگوت)ەیە کە هەتاکو سەرەتای چەرخی بیستەمیش ڕواڵەتی بەکاربردووی ئەم (ئە)یەی سولەیمانییانەیە لە ڕاستیدا لە هەڵبەستی ڕەسەنی دەسکاری نەکراوی پێشووتردا نەبینراوە و نابینرێت و هەموو کەشکۆڵە کۆنەکان گەواهیدەری ئەم بۆچوونەمە، ئەم تاکەش هێشتە بەم جۆرەی سەرەوە چاپ نەکراوە.

٥- ڕەهی: ڕێگەی.

وەصل: پێکگەیشتن.

سەخت: گران، دژوار، ناهەموار، وەک شوێنی زبران و هەڵەت و چیا و دوور.

کۆڵین: هەڵکەندن.

ئەم تاکە تەنیا لە (مس، عن، گل/٥)دایە و پێنجەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

هاتنی (بەنووکی دەرزی بیر کۆڵین) لەم نیو باڵی دووەمەدا (ئیدیۆم – قسەی نەستەق و کینایە)یەکی کوردانەیە و بەڵگە بۆ دژواری و سەختی هەر کارێک و (کوردی) لە زۆربەی هەڵبەستەکانیدا پەنای بردووەتە بەر ئەم جۆرە (کینایە)یە و بارەها پەندی پێشینانی... هتدی تیا شەتڵ کردوون و ئەوەندەی تر بوونەتە هۆی کتوپڕی بەدڵ و دەروونی هەر کوردێکەوە نووساون و هەر لەبەرئەمەیە کە بەئاسانی کوردان هەڵبەستی (کوردی)یان بۆ لەبەر کراوە و بەهۆنەرێکی گەلێ مەزنیان داناوە لە چاو یەکێکی وەک (نالی)دا. هەر ئەمەش بووەتە هۆی سەرچاوە زۆری بۆ هەڵبەستەکانی (کوردی)، بەڵام بەهۆی ڕەوشتی گەڕۆکی و فرەگەڕیدەیی (کوردی)یەوە هەڵبەستەکانی ئەوەندە بەفراوانی و لە ناوچەیەکی بەریندا بەهەردوو کوردستانی عیراق و ئێراندا بڵاو بووەتەوە کە بەئاسانی گرد ناکرێتەوە.

بەگەڕانێک بەکەشکۆڵەکانی ئەو هەرێمانەدا ئەم ڕاستییە ئاشکرا دەبێ.

٦- زومستان: زستان، زۆستان.

مەیل: ئارەزوو – واتە: مەیلی تۆ بۆ من وەک وەرزی زستانە ئەوەندە ساردە.

پایز براکەم: نیشانەیە بۆ ئەو وتە کوردەواری (ئیدیۆم)ەی کە ئەگەر دۆستێک یا ناسیاو، یا خۆشەویست یا خزمێک درەنگ درەنگ پێک بگەن، پێی دەڵێن (ها... پایزە برا) واتە ئەوەندە دوور دوور دەرئەکەوی وەک پایز وەهای یا هەر پایزا و پایز ئەتبینین. و، ئەمەیش هەیە کە دەڵێن: (یا خوا بەخێر بێت میوانی ئازیز، بەڕۆژی بەهار بەشەوی پایز) و بۆیە شەوی پایزیش وتراوە کە وەک ڕۆژی بەهار زۆر درێژە و میوانی خۆشەویستیش کاتی درێژی پێ ئەوێ – هەروەک جاری تریش وتوومە، (کوردی) زۆر بەندیواری بەکارهێنانی ئەم وتە کوردەوارییانە بووە لە هەڵبەستەکانیا و، نەک هەر هەڵبەستەکەی پێ جوان کردووە، بەشکو بووەتە هۆی ئەوەی جێگیر بێ کە ئەو وتە کوردەوارییە لەو سەرێنییەشدا هەبووە و (کوردی) لە هەڵبەستەکانیدا بۆی پاراستووین.

وەصل: پێکگەیشتن – (بەهاری وەصلی تۆم...) واتە لە جێگە وەرزی بەهاری خۆش و دڵگیری وەک پێکگەیشتن (وەصل)ی ئاوات و هیوای من کەوا وەک بەهاری ڕەنگین و تەڕ و پڕ گیا و سەوزی و گوڵی جوان و زۆر و دڵگیری باخان و ئاهەنگی دەنگی مەل و بولبول و شالوول و ڕازاوەیی جیهان و... هتدی بەتۆ گەیشتن ئاساییەوە ئەوەتا ئەو خۆشییە بۆ من وەک وەرزی (هاوین)ی وشک و گەرم و ناخۆش و پڕ تەپوتۆز و... هتدە.

وەک لەم تاکەی سەرەوەدا هاتووە (کوردی) هەر چوار وەرزی ساڵی تیا دەربڕیوە و جگە لەوەی کە توانایی و هونەرمەندیی هۆنەری و وێژەیی تیایە هەروەها هەر ڕواڵەتێکی وەرزەکانیشی چواندووە بەشتێکی پەیوەندیت بەخۆی و دۆستەکەیەوە، کە ئەویش وەستاییەکی کەیە و لەگەڵ

(سالم)ی ئامۆزای بووە.
بەوەدا کە لەم تاکەشدا (براکەم) هاتووە من بەدووری نازانم کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی وەک نامەیەک بۆ (سالم) نووسیبێ کە لە پێشەوە دیاریم کرد. (سالم) هەڵبەستێکی هاوچەشن (ڕەدیف)ی ئەم هەڵبەستەی هەیە و، وەک بیستوومە ئەو هەڵبەستەی (سالم) وەڵامە بۆ ئەم هەڵبەستەی (کوردی) وە یا وەڵامی هەڵبەستی (دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بێ تۆ)ی (کوردی)یەوە یا جارێکی کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی سەرەوە یا هەڵبەستە ناوبراوەکەی تری لە وەڵامی ئەو هەڵبەستەی (سالم)دا داناوە کە لە دواوە هەڵبەستەکەی (سالم)یش پێشکەش دەکەم، چونکی یەکەم تاکێکی چاپنەکراوی تیایە، دووەمیش شێوەی هەڵبەستەکەی (سالم) ئەم بۆچوونەی من ئەگەیەنێ و لەوانەیە لە سەرچاوەی تردا ئەم بیستن و بۆچوونەم بەڕاست دەرچێ کە بڕوام پێیەتی.
ئەم تاکە لە (مس، عن، گل/٥)دا شەشەمینە و لە (ش)دا حەوتەمینە و لە (مد/٢)دا هەشتەمینە و لە (جلی، ف، کرمانجی، کوردستان)دا نۆیەمینە و لە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا دەیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
مەیلەکەت (ف، ش، کرمانجی، نم/١): مەیلەکەی – ئەمیش بەپێی هەڵبەستەکە و دەستووری زمانی ناگونجێ کە بۆ (غائب)ە و لە دوای ئەمەشەوە وشەی (پایز براکەم) هاتووە کە بۆ (مخاطب)ە سەرەڕای ئەوەی هەڵبەستەکە هەموو مخاطبە.
وەصلی تۆم (جلی، ش، کرمانجی، گ/٢، س، گ/٣، مد/٢): عمر و دین.
وەصلی تۆم (گل/٥): عمر من.
وەصلی تۆم (ف، نم/١، کم، کوردستان): وەصلی تۆ.
٧- گریم: وام دانا، ئەگەر هاتو.
والی: فەرمانڕەوایەک بووە لە لایەن (پاشا) یا (سوڵتان)ەوە خراوەتە سەر ناوچەیەک وەک (والی بەغدا) و (والی سنە = ئەردەڵان)ی ئەوسا.
شاه: پادشا، پاشا، شا وەک شای بابان و عەجەم.
سوڵتان: سەرۆکی هەرە گەورەی نیشتمانێک وەک (سوڵتانی عوسمانی)ی ئەوسا کە بەمە (کوردی) ناوی هەرسێ پایە هەرە مەزنەکەی ئەوسای ناوچەکەی لەم تاکەیدا ڕاگەیاندووە. هەروەها بیستوومە نازانم کە پایەیەکی فەرمانبەری بە(کوردی) سپێردراوە و ئەو نەیویستووە ڕەنگە ئەمە نیشانەی ئەوە بووبێ.
کاکە گیان: دیسان ئەو بڕوایە بەهێز دەکا کە لەگەڵ (سالم)ی بوو.
ئەم تاکە لە (مس، عن، گل/٥)دا حەوتەمینە و لە (ش)دا هەشتەمینە و لە (جلی، ف، کرمانجی، کوردستان)دا دەیەمینە و لە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا یانزەمین تاکە لە هەردوو پارچە هەڵبەستەکەدا.

گریم (ف، جلی، ش، نم/١، کر، کرمانجی، کم، گ/٢، س، گ/٣، کوردستان): ئەوا.
من بوومە (نم/١، کرمانجی): بوم من بە.
بوومە والی و شاھ و سوڵتان (جلی): بوم بشاە و سلطان و والی.
والی و شاھ و سوڵتان (ف، ش، گ/٢، س، گ/٣، کوردستان): شا و سوڵتان و والی.
کاکە گیان (نم/١، کم): تۆش وەرە.
کاکە گیان (گ/٢، س، گ/٣): کاکە گیانە.
کاکە گیان (ش، جلی): کیانکم.
کەی ژینە (ف، ش): بەژینە.
کەی ژینە (کرمانجی): ئەو ژینە.
کەی ژینە (کم، نم/١): لیم شینە.
٨- بتخانە: شوێن بت، پەرستنگای بت.
قیبلە: مەبەستی لە (مەککە) و شوێنی ڕووتێکردنی ئیسلامە لە نوێژ و حەجدا.
هیجر: جیایی، دووری.
مەی نۆشین: بادە خواردنەوە بۆ سەرخۆشبوون کە غەمی دووری بە با بدا.
ئەم تاکە تەنیا لە (مس، عن، گل/٥)دایە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە.
لەتاو هیجرە (گل/٥): لهجرتدا.
٩- کافر: ئەوی بڕوای بەخوا و پێغەمبەر نەبێ و پەیڕەویی فەرمایشیان نەکات.
عەجەب: جێگەی سەرسامییە، شایانی سەرسوڕمانە.
ئەم تاکـــــە لە (مس، عن، گل/٥)دا نۆیەمین و لە (ف)دا یانزەمین تاکی ئەم دوو پارچە هەڵبەستەی (کوردی)یە کە ئەویتریان لە پاشترا پێشکەش دەکەم. بەڵام جێگەی سەرسامییە کە لە (ف)دا ئەم تاکە دوا تاکی نۆیەمی هەڵبەستەکەی تری (کوردی) (دەروون زامدار و دڵ غــەمگینە بێ تۆ) یەک لە دوای یەک و ئەمی لە پێش ئەودا نووســیــوە کــە ئەویش نازناوی (کوردی)ی تیایە و ئەمەش نەبووەتە باو، بەتایبەتی لە لای (کوردی) کە لە پارچە هەڵبەستێکدا دووجار نازناوی خۆی دیاری بکات. بەڵام ئەم تاکەی سەرەوە ئاوێتەی ئەو هەڵبەستە کراوە لە (ف)دا بووە. بەدوا تاکی دانەناوە و لە سێ ســـــەرچاوەکـــــەی تردا ئەم تاکـــــە دوا تاکی هەڵبەستەکەی تری (کوردی)یە.

٤٩

## دەروون زامدار

١– دەروون زامدار و، دڵ غەمگینە بێ تۆ

سەرم گێژ و، تەنم بێ تینە بێ تۆ

٢– خەوم بێ هۆشییە، بەرگم پەلاسە

خۆراکم خوێنە، شادیم شینە؛ بێ تۆ

٣– لە چاو ئەشک و لە دڵ ئاهم کە دەردێ

دەڵێی طۆفانی با و بارینە بێ تۆ

٤– ڕەقیب ڕوو ترش و ئەشکی دیدە سوێرە

حەیات تەڵخ و ئەجەل شیرینە بێ تۆ

٥– صەبر چوو، هۆش و ئایین بوو فراندت

قەدر مەنزڵگەیی پایینە بێ تۆ

٦– کەباب دڵ، خوێن مەیە، ساقی فیراقت

قەدەح چاو و مەزەم ئەسرینە بێ تۆ

٧– دەروون گوڵزار و خوێن گوڵ باغەبان دڵ

فوغان بولبول جەفا پەرژینە بێ تۆ

٨– لە هاوسایان لەتاو ناڵینی کوردی

دوعای مەرگە، لە خۆم ئامینە بێ تۆ

..........

١– وەک لە هەڵبەستی پێشوودا ڕام گەیاند، کە ئەو هەڵبەستە (کوردی) وەک نامەیەک بۆ (سالم)ی ئامۆزای نووسیوە و لە کۆتاییی هەڵبەستەکەشدا وەڵامەکەی (سالم)م نووسیوە کە ئەم ئاگەدارییەم لەسەر ئەو دوو هەڵبەستە بەپێی بیستنم لە هۆنەری کارامە و، نووسەری بەهێز و، ڕۆژنامەنووسی بەتوانا و هاواڵم (مامۆستا عەلی کەمال باپیر ئاغا)م بیستووە، هەروەها لەوم بیستووە کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی ئێرە گوایە وەڵامی (کوردی)یە بۆ هەڵبەستە ناوبراوەکەی (سالم).

بەڵام لە سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستەدا (عن)ە، کە نووسەرەکەی وێژەوانی ورد (عەلی ئاغای

نەوتچی) بووە بەفارسی ئەم پەراوێزەی نووسیوە:

(«کوردی» و «سالم» در ردیف یکدیگر گفته اند خدا هر دورا غریق رەحمت خود گرداند – علی).

واتە: («کوردی» و «سالم» خوا نوقمی میهرەبانیی خۆیان بکات، ئەم هەڵبەستەیان لە هاوچەشنی یەکتری گوتووە – عەلی).

بەم پێیە دەبێ ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی) لە هاوچەشنی وەڵامە ناوبراوەکەی سالم بێت چونکە کێش و پاشبەندیان چونیەکە، ئەگەرچی من هەندێ لاوازی لەم هەڵبەستە و ئەوەکەی پێشووی (کوردی)دا ڕەچاو دەکەم و دووبارەبوونەوەشیان تیایە کە من بەشێواویی دەستاودەست و دەماودەمکردنی دەزانم، چونکە (کوردی) لەوە بەرزترە.

زۆربەی سەرچاوەکانی هەڵبەستی پێشوویش سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەن چونکە ئەو سەرچاوانە بەتێکڕایی ئەم پارچە هەڵبەستە و ئەوەکەی پێشوویان بەیەک هەڵبەست داناوە و من بەتۆژینەوەیەکی زۆر و درێژخایەن و سەرچاوەی دیترەوە بۆم کرا، کە ئەم هەڵبەستە و ئەوی پێشوو لە یەکتری جیا بکەمەوە بەتایبەتی ڕێنومام سەرچاوەکانی (عن، مس، گل/٥) کە زۆرم کەڵک لێ وەرگرتن لەم تۆژینەوەیەمدا، کە لەماندا جیاکراوەییم بینی. هەروەها کەموزۆر لە سەرچاوەکانی (ش، جلی، نم/١)وە لە چاپکراوانیشدا سوودم لە (زاری کرمانجی) ژمارە ٢١ی ئەیلوولی/١٩٢٧، کم، گ/٢، س، گ/٣، کوردستان–ی ژمارە ٧ی ساڵی/١٩٦٢ – تاران) وەرگرتووە، جگە لە (گەلاڵە/١٣٠٦، ڕێشاوی، مد/٤).

لە نێوان تێکڕای سەرچاوەکاندا (عن)م کردە، بنکەی ساغکردنەوە بۆ ئەم هەڵبەستە ئەگەرچی (زاری کرمانجی) کۆنترین چاپکراوەکانی سەرچاوەی ئەم هەڵبەستەیە، بەڵام لە دەقی هەڵبەستەکەدا شێواوی هەیە لەو گۆڤارەدا.

**لێکدانەوە و جیاوازیی سەرچاوەکان:**

زام: برین، کوڵک.

زامدار (کرمانجی): زاندارە – ئەشێ هەڵەی چاپی بێ.

دەروون زامدار و (کوردستان): دەروونی دڵ ئەدا – ئەمەش شێواوییە و، واتا نادات.

گێژ و (مد/٤): ژانو.

ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکاندا یەکەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

**جوانیی وێژەی کۆن:**

یەکخستنی وشەکانی (تەن) و (نین) لەم تاکەدا بەپێی وێژەی کۆن جوانی و جیناس ئاراییە.

٢– بێ هۆش: بێ ئاگا، وڕ، لە هۆش خۆ چوو، بووراوە.

پەلاس: بەرگێکی شڕۆڵە و هەرزانی کۆن و چڵکن و لە چڵکدا ئەستوور بووە و مەبەستی لە گوێ بەبەرگی خۆنەدانە.

خۆراک: خواردەمەنی، خۆرشت.
کردنی خـۆراک بەخـوێن، مـەبەست لەوەیە کە لە خـەفـەتاندا وەک خـوێنی نەمـابێ وایـە کە ئەو خوێنەی خۆی لە جێگەی خۆراک خواردووەتەوە (نەهێشتووە).
شادی: خۆشی و، لە کەشکۆڵەکەی (گەلاڵە، گل/٥)دا بەرامبەر بەم وشەیە نووسیویە:
(نوسـخـە: شـایـی، نوسـخـە: شـاهـی) واتـە بەم دوو جـۆرە وشـەیەش و، لە سـەرچاوەکـاندا ئەم وشـەی (شـادی)یەش هاتـووە کـە دەگـونجێن بۆ هـەڵبـەسـتـەکـە. هەروەهـا لەم تاکـەدا دەبینرێ (کـوردی) وشـەکـان (خـەو)، (خـۆراک)، (خـوێن)ی یەک خـسـتـوون کـە ئـەم کـارەش بەپێی وێژەی کۆن جـوانیی جیناس ئاراییی تیـایە لە (لە یەکترچوونی) دەنگ و ڕەنگی ئەم وشانەدا، هەروەک وشەکانی (هۆش) و (شادی) و (شین)یش.
شـین: شیوەن، شەپۆڕ.
ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکانیدا دووەمینە.
نیـو باڵی دووەمی ئەم تاکـەی سـەرەوە لـە (جلی)دا تەنیـا وشـەی (خـۆراکم)ی مـاوە و ئەویـتـری لەبەر پەڕپووتی لەناوچووە.

٣- طۆفان: لافاو.

ئەم تاکە لە (نەوتچی، عن) و (کرمانجی) و (ڕێشاوی) (کاگردەڵی) و (کوردستان)دا نییە.
ئەشک: فرمێسک، ڕۆنتک.
ئاه: هەناسەدانی خەفەتباری.
دەڵێی (مینا و کاگردەڵی): ئەڵێی.
طۆفـان (ع): لافـاوی گـەورە، لافـاویش بەپێی باری جـوغـرافـیی کـوردسـتـان و تەڕ و تووشـیی شـوێنەکـەی و تـوانەوەی بەفـر و سـەهـۆڵی زۆری سـەر چیـا و نسـرمـەکـانی و زۆری کـانی و سەرچاوە و جۆگە و ڕووبارەوە شتێکی ئاسایی و زۆر دووبارەیە لە کوردستاندا و ئەوەتا یەکەم لافاوێکی مـەزنی مێژوویی ناودار کە شێوەی ئەفسـانەییشی وەرگرتووە (لافاو - طۆفـان)ەکەی نووح پێغەمبەر لە کوردستاندا ڕووی داوە کە لە قورئانیشدا لە ئایەتی ٤٤ی سورەتی (هوود)دا دەڵێ: (واستوت علی الجودی) واتا کەشتییـەکەی نوح لە ئاکامدا کە ئاو کز بوو بەسـەر شاخی (جـوودی)یەوە نیشـتـەوە کـە جـودی یان بە(پیرەمـەگروون) یـان بە(ئەرارات) لێک دراوەتەوە کـە هەریەکێ لەم دوو چیایە بێ لە کوردستاندان.
بارینە (کاگردوڵی، مـەریوانی، میـنای شکسـتـە، گیـوەکان، کوردسـتـان): بارانـە - کـە ئەمـەش بەپێی سـەروا (پاشبـەندی) هەڵبەسـتەکە هەڵەیە، چونکی هەمـوو (غەمگینە و بێ تینە و بالینە) و... هتدن و کەواتە (بارانە) هەڵەیە و ناشێ و ئەم سەرچاوانە بەهەڵەیان نووسیوە.
لەم تاکـەدا وەسـتـاییی پێکهێنانـی (لەف و نەشری) مشووەشی تیـایە کە ئەشکەکە دەگەڕێتـەوە بۆ بارانەکە و ئاهەکە دەگەڕێتەوە بۆ بایەکە و چونکی (ئەشک و ئاه) پاش و پێش نین وە یا (با

و باران) پاش و پێش نین بۆیە بە(مشوەش) دانراوە.

**تێبینی:**

سالم وتوویە:

لە چاو ئەشک و لە دڵ ئاهم بیرون دێ          دەڵێی تۆفانی با و بارانە ئەمشەو

کە چ (کوردی) و چ (سالم) لەوە نەبوون یا لەو پلەیەدا نەبوون کە دزی لە یەکتری بکەن، بەم جۆرە و ئەگەر لەبەر خۆشەویستیی یەکتری نەبووبێ، بێ گومان دەسکاریی ئەدەبدۆستان ئەم گۆڕانەی لەم تاکەی کوردی یا سالمدا کردووە کە ئەم هەڵبەستەی سالم لە لاپەڕە/١٢٠ی چاپی گیودایە و زۆر نزیکایەتی لەگەڵ تێکڕای ئەم هەڵبەستەی کوردیدا هەیە و وەک جۆرە ڕەدیفێک بن وەهان.

٤- ئەم تاکە لە (ڕێشاوێ)دا شەشەمینە وە لە (کوردستان) و (نەوتچی) و (کاگردوڵێ)دا هەشتەمینە و لە گەلاڵەییدا سیانزەمین تاکە.

ڕەقیب: دژ، ناحەز، دوشمن.

ئەشک: فرمێسک، ئەسرین، ئەسر، ڕۆنتک.

ئەشکی (ڕێشاوی): ئەشک.

دیدە: چاو، بینایی.

سوێرە (کرمانجی): شۆرە.

سوێرە (نەوتچی): سوورە.

حەیات (ع): ژیان، ژین، زیندەوەری.

حەیات (کردستان): ژیان.

حەیات (مد/٦): حیاتم.

تەڵخ: تاڵ.

تەڵخ و (مینای شکستە): تاڵ و.

تەڵخ (گل/٥): شین.

تەڵخ و (مد/٦): تلخ.

ئەجەل (ع): کاتی مردن، کۆتاییهاتنی ژین، مردن.

ڕەقیب ڕوو ترش و ئەشکی دیدە سوێرە (کوردستان): لە دووریتا بەمەرگ ئاواتەخوازم.

ئەم نیو باڵە جیاوازیی (کوردستان) نیوەی یەکەی تاکێکی تری سەربەخۆی ئەم هەڵبەستەیە کە ئاوێتەی (کوردستان) کراوە وەک لە تاکی دواییدا دەبینرێ.

(کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا وەستاکارانە و شارەزایانە چەندین چێژی وەک ترش و سوێر و... هتدی گرد کردوونەتەوە.

٥- ئەم تاکە تەنیا لە گەلاڵەیی (١٣٠٦ ک)دا هەیە و لەوانی تردا هەر لە بن نییە.

صەبر: ئارام، پشوو، خۆڕاگرتن، دان بەخۆداگرتن.
ئایین (ع): دین و مەبەسی ئاینی ئیسلامییە.
قــەدر (ع): ڕێز، کـە (قــەدەر) واتە بڕیار لەســەر دراویـی (خـوا)یش دەگـرێتــەوە، کـە ئەمــەش فەلسەفەیەکی ئاینی ئیسلامە.
مەنزڵگە: شوێنەوار، بارەگا.
پایین: خوارویینی، پەست، هەرەداوێن، دوا پایە و پلە.

٦- قەدەح: پیاڵە.

ئەم تاکە لە (ڕێشاوی)دا چوارەمینە و لە (نەوتچی) و (کاگردوڵێ) و (کوردستان)دا شەشەمینە وە لە (مس، گل/٥، جلی، نم/١، کرمانجی، گ/٢، گ/٣، کم، س)دا حەوتەمین تاکە.
کەباب (مەریوانی): کەبابی.
خوێن (مەریوانی): خوین - ئەمیش لەنگی دەکات.
خوێن مەیە (کرمانجی): خوینمە.
خوێن مەیە (مد/٢): خوینە ساقی.
ساقی (ع): ئەوی بادە دەدات، مەیدەر.
مەیە (جلی): می.
فیراق: دووری، لێ جیایی.
قەدەح (ع): پەرداخ، بادە یا ئامانی مەینۆشی، پیاڵە.
چاو و (ڕێشاوی «ش»، مد/٦): چاوم.
مەزە: ئەوی بەدەم بادە یا مەینۆشییەوە دەخورێ بۆ تامی دەم خۆشکردن و پێوە ڕابواردن.
ئەسرین: فرمێسک، ڕۆنتک، ئەسر.
کەباب: گۆشتی قیمە کراوە کە تێکەڵ بەئارد و تەماتە و پیاز و خوێ دەکرێ و بەشیشەوە لەسەر ئاگر دەبرژێنرێت، کە (کوردی) دڵەکەی خۆی کردووە بە(کەباب) لە دووریی یاری (وەک ئاگر) وا برژاو داناوە... لە جێگەی بادە (مەی) خوێنەکەی خۆی خواردووەتەوە کە لە خەفەتدا خوێنی کەم بووەتەوە وەک بخورێت، کە دوورییەکەی (ساقی)یە وە بەزۆر دەرخواردی دەدات و خوێنەکەی خۆی لە چاویدا وەک پیاڵەی خوێنین کە لە هەمان کاتدا مەزەکەی فرمێسکەکەی بووە جوانی لەوەدایە بادە خواردنەوەیەکی (کار ئامەدییانە)ی لەم تاکەدا گرد کردووەتەوە.

٧- ئەم تاکـە لـە (ڕێشـاوی)دا پێنجـەمـینە و لە (کـرمـانجی)دا هەشـتـەمـینـە و لە (کـاگـردوڵێ) و (نەوتچی) و (کوردستان)دا حەوتەمینە.
گوڵزار: باغ، گوڵستان.
گوڵزار (جلی): گلزارە.
باغەبان (گیوەکان): باخەوان.

باغەبان (مەریوانی): باخبانی.

فوغان: ناڵە و هاوار، فیغان.

جەفا: خراپی، خەمساردی، بەدی، بێ مەیلی.

پەرژین: تەیمان، تانۆک...

دەروون گوڵزار: مەبەستی لە خەفەتی (ڕەش)ی دەروون و زەردی خەمباری کە بەم ڕەنگانەی گوڵزاری پێک هێناوە بەخوێنی چاوی (فرمێسکی) سوورە و دڵەکەیشی باخەوانی ئەو باخەیە، گریانی وەک خوێندنی بولبولی لە دووریی یارەکەی و جەور و جەفای یار وەک پەرژینی ئەو باخە بوون کە پەرژینی دڵ و دەروونی ئەویان کردووە.

٨- ئەم تاکە لە (ڕێشاوی، مد/٢)دا نۆیەمینە و لە (نەوتچی، کوردستان، کرمانجی)دا پانزەمینە و لە (مینای شکستە و کاگردۆڵێ و گیوەکان و مەریوانی)دا دوانزەمین تاکە، بەڵام لە هەموو سەرچاوەکاندا دوا تاکە.

هاوسایان: دراوسێیان، دراوسێیەکان.

ناڵین: هاوارکردن، ناڵە ناڵ.

دوعا (ع): نزا، لە خوا پاڕانەوە، خواست لە خوا ویستن.

دوعای مەرگە واتە لە دراوسێکانەوە دوعای مردنی منە.

لە خۆم: واتە: بەڵام لە خۆشمەوە لەسەر دوعاکەی ئەوان (ئامین) کردنە و نیشانە بۆ سوورەتی (ئەلحەمد) لە قورئانی پیرۆزدا کە کۆتایی دێت (ئامین) دەکرێ.

ئامین (ع): وشەیەکی عەرەبی و کەرەستەیەکی ئیسلامییە گەلە ئیسلامەکان لە دوای دوعاکردنەوە بەمەبەستی گیرابوون ڕووەو خوا دەیڵێن.

ئەشێ (کوردی) مەبەستی لە ئافرەتێکی (ئامینە) ناو بووبێ.

لە هاوسایان (جلی): همیسان دا.

لە هاوسایان (مد/٦): کە هامسایان.

لە خۆم (جلی): دوای.

لە خۆم (مد/٦): لەکی.

**تێبینی:**

بەپێی نەریتی کۆن کە دەبێ تاکەکانی هەڵبەست ژمارەیان (تاک) بێت، نەک (جووت) کە ئەم هەڵبەستە (٨) تاکە واتە (جووت)ە و کەواتە تاکێکی بەلای کەمەوە ناتەواوە.

هەرچەند لە هەندێ سەرچاوەدا تاکە هەڵبەستی:

«سەدای سەمتووری کەللەم گەرمە ئەمشەو» خراوەتە ئەم هەڵبەستەوە، بەڵام من بەپێی سەرچاوەی تر ئەو تاکەم لە لا (چوار باڵی)یە، بۆیە ئەوم خستە هەڵبەستی دوایی، واتە ژمارە پەنجایەمینەوە، بڕوانە ئەوێ.

٥٠

**تەنم**

چوار باڵی (چوارینە)

١- تـەنم یـەک پـارچـەیـی (دەنـگین)ە بـێ تـۆ،

کـە (شـەیپـوور)ی گـەرووم، دەرینـە بێ تۆ

٢- سـەرم سـەمـتـوورە سـینـەم چەنگە دڵ دەف

خـــەفـــەت تار و مـــەقـــام ناڵینـە بێ تـۆ

................................................................

١- سەرچاوەی ئەم تاک (دوو باڵ)ی یەکەمی ئەم چوار باڵییە تەنیا (عن) و بەدەمی لە هۆنەر (مەلا ئەحمەد)ی نازناو (شەفیق)ەوەیە کە برای مەلا عەبدوڵڵای پێنجوینی (موفتی)ی شاعیرە و مامۆستا حاجی عەبدولکەریمی باوکیشیان هەر هۆنەرێکی بەتوانا و لێهاتوو بووە کە ئەم تاکەم لە شێوەی (چوار باڵی)دا لە دەمی شەفیقەوە لە ساڵی ١٩٤٢ز.دا لە ناوچەی (پێنجوێن) وەرگرتووە کە هاوینی ئەو ساڵە من (موضەمید)ی صیحە (تەندروستی) بووم و بۆ کوتانی خەڵکی دژی نەخۆشیی ئاوڵە بەگوندەکانی (ناحیەی پێنجوێن)ی ئەو سایەدا لەگەڵ مەلا ئەحمەد (شەفیق)دا دەگەڕام کە (ئەو) ئەو سایە (پۆلیسی غیرە نیظامی) بوو، بۆ پاراستنی من خرابووە تەکم.

دەنگین: دەنگدەر وەک ئامێرە مۆسیقییەکان - چونکە کوردی مامۆستایەکی تایبەتمەندی (مۆسیقا)ی فەرمانڕەواییی بابان بوو. کە ئەم وشەیەی بەکار بردووە؛ وا دیارە زارگوت = (مصطلح)ێکی سەردەمی کوردی بووە.

شەیپوور: جۆرە ئامێرێکی مۆسیقیی جەنگییە کە بەفوو تێکردن دەنگ دەدات و دەنگەکەی یەکجار گەورە و بەرز و گڕە و جۆرێکە لە (کەڕەنا)، کە سەرەتای کەڕەنا لای مرۆڤە سەرەتاییەکان (شاخی گا و گامێش) بووە، کە دوای لێ دەرهێنانی کرۆکە ئێسقانەکەی ناوی، نووکە تیژەکەی کونێکی بچووکی تێ کراوە و، وەک ئامێرێکی مۆسیقی و بەتایبەتی لە جەنگدا بەکار هاتووە بەفوو پیاکردنی.

کوردی وەک (لەشی خۆی) کردووە بەیەک پارچە (ئامێری دەنگین) هەروەها گەرووی خۆیشی چواندووە بەشەیپوور لە دووریی یار.

٢- ئەم تاکە لە (ڕێشاوێ)دا نییە و لە (مد/٦، کرمانجی، کوردستان)دا پێنجەمینە و لە (جلی)دا چوارەمینە و بەتێکڕایی لە سەرچاوەکانی هەڵبەستی پێشوودا بەتاکێک لەو هەڵبەستە دانراوە.

سەمتوور: ناوی یەکێکە لە ئەمرازە مۆسیقییە هەرە کۆنە تەلییەکان لە جۆری (قانوون) کە

ناوی لە (تەورات)دا بە(سەنطیر) هاتووە.

عەرەب و فارس و تورک بە(سەنتوور)، (سەنطوور)، (سەنطیر) و (صەنطیر)ی ناو دەبەن و ئەورووپاش (سەنتیر)ی پێ دەڵێن و دیارە کوردیش وشەی (ن) (سەنتور) یا (سەنتیر)ی گۆڕیوە بەوشەی (م) و کردوویە بە(سەمتوور) کە ئەم جۆرە گۆڕینەش لە کوردیدا زۆر و باوە، واتە گۆڕینی پیتی (م) و (ن) بەیەکتر.

سەمتوور بریتییە لە چوارچێوەیەکی چوار لایی دوو تەریبی (شبە منحرف) کە لە داری (گوێز) یا داری (نارنج) دروست دەکرێ و ئەم چوارچێوەیە ناوی (دامە)یە و بەدوو لای ڕاست و چەوتە بەرامبەر بەیەکەکەیەوە تەلی زەرد یا مسی وەک یەک ئەستووری پێوە بەندە کە هەر تەلەی لە چوار تەلی باریکتری لە ئەستووریدا چوونیەکی لێک بادراو و پێک هاتووە و زۆرترەکەی لە شێوەدا لە (قیثارە)ی کۆنی گەلەکانی عیراق دەکات کە پێش (٣ – ٤) هەزا ساڵ بەر لە ئێستە بەکاریان هێناوە و، لەوانەیە (سەنتوور) جۆرێکی بچووککراوەی ئەو بێت. ئەم ئەمرازە بەگوێرەی زۆری و کەمیی ژمارەی تەلەکانی جۆری جیا جیای هەیە کە تێکڕا لە نێوان (١٢) تەلەوە هەتا (٥٤) تەلی پێوەیە کە هەر (٣) تەلەی لەسەر جۆرە ئاوازێک لە توند و شلیدا دەبەسترێ (دۆزان) واتە ڕێکخستنی تەلەکان.

بەو کەسەی ئەم ئەمرازە بەکار دێنێ ئەوترێ (سەمتوورچی، لێدەری سەمتوور، یا (نۆبە) یا (سائق) و بەجووتێ (لێدەری تایبەتی) لە جێگە پەنجە لێ ئەدرێ کە وەک دەمە چەقۆ وەهان. یا ئەموستیلەیەکە دوو سەرەشوژنی پێوەوەیە و دەکرێتە پەنجە و پێی لێ دەدرێ.

سەمتوور یەکێکە لەو حەوت ئەمرازە مۆسیقییەی کە بە: (حەوت ئەمرازی دەنگخۆش) بەناوبانگن کە ئەوانیش (چەنگ) و (عود) و (قانوون) و (کەمانچە) و... هتدن وە یەکێکیشە لە ئەمرازە مۆسیقییەکانی (چاڵغی بەغدادی) کە (تەخت)یشیان پێ دەڵێن.

هەر ئەم سەمتوورە ئێستە جۆرێکی سێ سووچیشی هەیە کە (شلیشلیم)ی پێ دەڵێن و، جۆرێکی تریشی لە ئەورووپادا هەیە کە بەپەنجە لێ دەدرێ و لە تەوراتیشدا جۆرێکی تریشی ناوی هاتووە بە(بنبل).

ئەمجا کە (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا (سەمتوور)ی بەسەری خۆی داناوە لەوەوەیە کە سەمتوور گەلێ دەنگی جیا جیای لێوە دێ بەپێی توندی و شلیی بەستنی تەلەکانی (دۆزان) و بەپێی شوێنی لێدانەکەی کە ئایا لە سەرەوە یا لە خوارەوەی تەلەکە دەدرێت کە مەبەستی لەوەوە بوو سەری خۆیشی ئەوەندە هاژەی پەژارە و دەنگی زۆری لێوە هاتووە و، ئاوەها ژاوەی لێوە هاتووە لە تاو خۆشەویستە دوورەکەی. (قاموس الموسیقی العربیە – د. حسین علی محفوظ) و (الموسیقی النظریة – سلیم الحلو).

سەمتوورە (مینای شکستە): سەمطور و.

سەمتوورە (کاگردەڵێ «ف»، گیوەکان «گ/٢، س، گ/٣»): سەمتوور و.

سینە: سنگ.

چەنگە (مەریوانی): چەنگە و.

چەنگە (گیو/٣): چەنگو.

چەنگ: ناوی یەکێکە لە ئەمـرازە مۆسـیـقـییـە کۆنەکان و لـە (تەوراتیـشـدا) نـاوی هـاتووە و لە هەمان کاتا بە(چەنگ) و بە(چلبل)یش ناوی بردووە کە (چلبل) بەناوی (نای)یش هـاتووە.

چەنگ لە جۆرە ئامێرە مۆسیقییە تەلییەکانە و هەروەک سەمتوور وایە، بەڵام جیاوازییان لەگەڵ یەکدا ئەوەیە کە چەنگ (٢٤) یا کەمتر و هەتا (٣٥) تەلی لێ دەبەسترێ، بەڵام چوارچێوەکەی ئەم پێستـی تێ دەگیرێ و تەلەکان بەسەر پێستەکەوە کە پتر دەنگ دەدەنەوە و درێژی (١٦) تا (١٨) گرێیە و کۆتاییی تەلەکان لە (چەنگ)دا بەبەنێکی موو دێت کە ئەم بەنە بەخاو و کرژکردن (دۆزان)ی تەلەکان لەسەر جۆرێکی تایبەتی لە پیتە مۆسیقییەکان ڕێک دەخرێن.

هەر ئەم (چەنـگ)ە ئەگەر کلیل بەکۆتایی تەلەکـانییـەوە هەبوو، پێی دەوترێ (آکـری) و هەندێ جـار بەچەنـگ ئەوترێ (سـاز) کـە ناوی (سـاز) لـە هەمـان کـاتدا بەواتـە (ئاواز) و ناوی جـۆرە گـۆرانییـەکیـشـە، دیسـان ناوی جـۆرە ئەمـرازێکی تری مـۆسـیـقی و هەروەهـا ناوی (سـینە کەمان)یشـە کە ئەمیش جۆرە کەمـانێکی بچووکە چەنگیش وەک لە (لێکدانەوە)ی سـەمتووردا گوتم، یەکێکە لە حەوت ئەمرازە مۆسیقییە دەنگخۆشە بەناوبانگە کۆنەکانی جیهان.

یۆنانییـەکـانیش ئەمرازێکی مـۆسـیقـیـان هەیە وەک (چەنگ) وایە پێی دەڵێن (شلیـاک) و ئەم هەردوو ناوەش لە ڕووی زمـانییەوە لە یەک و دوو نزیکن، هەروەک عەرەبەکـانیش (صـەنج)ی پێ دەڵێن کە (صـەنج) هەندێ جار ناوی (چەقـەنە)یشـە و، هیندییـەکانیش بەچەنگ دەڵێن (جـهانج) کە ئەم نـاوانە هەمـوو لە ڕکـەی زمـانیدا دەچنـەوە سـەریەک و ناوە کـوردییـەکـەی کـە بە(چنگ) دەگیرێ و لێ دەدرێ.

ئەم ئەمـرازە بەلەرانـدنەوەی سـەر و خـوار و ناوەنـدی هەریەکێ لە تەلـەکـانی دەنگێکی خـۆشـی تایبـەتی جیـا لە دەنگەکـانـی کـەی دەدات لە دەنگی (گـڕ)ەوە هەتا (زیل = ناسـک) و بـەپێی ئەو ئاوازەی کە پێـویسـتـە لێـدەرەکـەی (چەنگی) دەنگەکـان ڕێک ئەخـات و عـەرەبەکـان ئەم وشـەی (چەنگ) بە(جەنک) دەنـووسن دەردەبڕن و هەروەک وشە عارەبییەکان لەگەڵیا دەگۆڕن و ئەگەر لێـدەرەکـەی ئـافرەت یا مـێـینە بوو لە جـێی (چەنگی) دەڵێن (جـەنگیـە) و بەچەند چەنگێکیش دەڵێن: (جُنُوك یا جُنُكْ). (قاموس الموسیقێ العربیە - د. حسـین علی محفـوظ) (کوردی)یش کە سنگی خـۆی کـردۆتە چنگ لەوەوەیە کە لە دەردەداریی خـۆی یا لە ئاه و هەناسـە هەڵکێـشـان و جۆرەها دەنگی وەک چەنگ لە سنگییەوە هەڵدەسێ لەتاو یارەکەی جگە لەوەی کە چەنگ بەپانی و پێست تـێ گیراوەکەی لە سنگی (کوردی) دەچێ و ئەم کە لە تاواندا بەسنگی خـۆیدا دەماڵێ وەک لێدانی چەنگەکە وایە... هتد.

دەف: یەکێکە لە ئەمـرازە مـۆسـیـقـییـە هەرە کۆنەکان کـە بەپیـامـاڵین و لەراندنەوە دەنگ دەدات

(ایقاعی). ئەمیش بریتییە لە چەمەرەیەکی چوارچێوەیی یا کەوانی کە بەسەر ئەو چوارچێوە یا چەمەرەیەیدا پێستەکە دەگیرێ و تیرە (قطر)ەکەی لە نێوان ١٠ پەنجەوە هەتا سێ بستێکە و، بەدیوی ناوەوەیدا و بەلێواری چەمەرەکەدا و نزیک بەچەرمەکە (پلێپلە) یا سێ چوار ئەڵقەی لە یەکتری خراو بەند دەکرێ کە بەلەراندنەوە و دەس پیادانیدا دەنگێکی تایبەتی و ناڵە و هاڕەیی لێ هەڵئەستێ.

(کوردی) کە لەم تاکە هەڵبەستەدا دڵی خۆی کردووەتە (دەف) لە لێدانی گورپە گورپی دڵدارانەوە و، دڵەکوتێی خێرایەوە کە وەک دەنگی دەفەکە ناڵەی لێوە دێ.

تار و (مینای شکستە «نم»، کاگردەڵێ «ف»، مەریوانی «کم»، گیو/٢، ئۆفسێت): یار و.

تار و (ڕیشاوی، گیو/٣): بار و.

تار: بەواتە ڕەشیی و ماتەمینی و کۆست کەوتن و تاریکی.

تار: داو، وەک تەلی مووی زوڵفی درێژ و ڕەش.

تار: تەلی ئەمرازە مۆسیقییە (تەل)دارەکان کە دەنگیان لێوە دێ.

تار: ناوی جۆرە ئەمرازێکی تەلیی وەک (کەمان – کەمانجە)ی بچووک بوو کە ئێستە نەماوە و بەزۆری لەگەڵ (عوود)دا لێ دراوە کە ئێستەش لە ناو کوردا باوە دەڵێن (تار و عود) یا (عود و تار) کە ئەم جووتە ناوەش لە هەڵبەستی زۆر لە هۆنەرانماندا هاتووە، چونکە وانە (دەرس)ی (مۆسیقا)یش جاران لە مزگەوتاندا دەخوێندران.

مەبەستی کوردی لە وشەی (تار) تاریکی و ماتەمینی درێژ و ڕەشی بێ برانەوەی وەک تاری زوڵفی خۆشەویستەکەی و لە دەنگی خەمباری خۆی، وەک تەلی ئەمرازە مۆسیقییەکان و بەتایبەتی (تار) پێناسە کردووە.

مەقام: بەواتە شوێن، گا، وەک دەڵێن یەک گا و دوو گا و... هتد، (مەقام) ئەو بنچینە سەرەتایی و سەرەکییەیە، کە ئاوازی گۆرانیی لەسەر دادەمەزرێنرێت و بریتییە لە کۆمەڵە توخمێکی بناغەیی وەک: دەنگی ئەو (مەقام)ە بناغەیە کە مەقامەکەی لێ پێک هاتووە و ئەویش چەند (هەشت) دەنگە و، بۆیە هەر جۆرە مەقامەی بەیەکێ لە ناوی ئەو دەنگانەوە ناودارە و هەریەکەیان سروشتی و ئاوازی خۆی هەیە کە پێی دەڵێن (پلە) یا (پەیژە) وە یا دیوانی بناغەیی مەقامەکە و ئەمجا دیوانێکی دووەمی ئاوێتە ئەکرێ کە دەبێتە وەڵامی دیوانی یەکەم کە بەمە دەربڕینی مەقامەکە فراوانتر و ئازادیی دەسکاری تیاکردن لە سازەکەیدا زۆرتر دەبێ وە بەم پێیە مەقام بریتییە لە چەند دەنگێکی کە بەشێوەیەکی تایبەتی ڕێکخرابن و خاوەنی سروشتی و ئاوازێکی دیاریکراو بن.

مەقامیش زۆرە و هەیانە بناغەیی و هەیانە پەلوپۆی ئەو بناغەییانە، بۆیە هەر مەقامەی بریتییە لە پتر لە یەک ساز و ئاوازی (لێک جیا) چ لە بناغەکەیا و چ لە دیوانەکەیا. (الموسیقی النظریة – سلیم الحلو).

مەقام سەرچاوەکەی ئەم ناوچەیە و بەزۆری کوردستان و ئێران و هیندستان دەبینرێ (ناو) و (زاراوە)کانی هەموو کوردین و گەلانی تر لێوەیان وەرگرتوون و ناوەکە هی خۆیان نییە و هی (کوردی)یە و بێ شەرمانە کردوویانەتە خۆ. دەبینرێ (کوردی) زۆر ناوی ئەمرازە مۆسیقییەکان و مەقامەکانی بردووە و کەسێ لە شتێ زۆر ڕۆ بچێ دەتوانرێ (کوردی) بە(دەنگخۆش) و (مەقامزان) و (مۆسیقەژەن)یش دابنرێ کە ئەمەش تەنیا بۆچوونێکە و لەوانەیە بەڵگەی لە هەڵبەستەکانی خۆیەوە پتر بێتە دەست بۆ ڕاستیی ئەم بۆچوونەم و خۆزگە ئەم تۆژینەوەیە دەکرا.

٥١

## شوێنی دڵم هێناوە

١- شوێنی دڵم هێناوە (قوبان) تاکی دەرکی تۆ
یا (شوێنی دەرکە)، یا (بدە دڵ)، یانە (سوێند بخۆ)
٢- تۆ (تیغ بەدەست) و (پەنجە بەخوێن) سوور و دڵ کوژی
لەونیش ثوبوتی دەعویە یا (ڕاست) وەگەر (درۆ)
٣- چاوت لە عەینی مەرحەمەتا قاتیلی دڵە
وەک لوطفی بەچچە، گورگە مورغی دەستەمۆ
٤- ئەمشەو خەیاڵی زوڵفی سیات هاتە خاطرم
بێچارە؛ (مار گەزیدە) دڵ زامی هاتە سۆ
٥- بۆی خاکی ژێری پای سەگی دەرگای ڕەقیب دەکەم
چۆن ڕێ لە حاجیب دەگیرێ لە دەرکی تۆ، دە بۆ؟؟
٦- ئەی دڵ ئەگەر بێ تەجروبە بۆ ڕێی عەشق چوویی؟؟
(مَنْ جَرَّبَ المُجَرَّبْ)ت ئەر بیستووە؟؟ مەچۆ!!
٧- صەبر و قەرار و تاقەت و ڕاحەت نەما لە لام
هەر ماوە (ڕوح) و پێی بڵێ (کوردی) ئەتۆش بڕۆ

................................................................

١- شوێن: جێگە - مەبەستی لە شوێن پێ هەڵگرتنە، کە ئەمەش هونەرێکی وردی کۆنی کوردەوارییە کە بۆ (زانیاری دۆزینەوەی تاوانبار) لە جیهاندا بایەخ و گرنگییەکی تەواوی پێ دراوە و لە زووەوە لە فۆلکلۆرە کوردیماندا نیشانەی بۆ کراوە وەک بەیتی (قەڵای دمدم) و لە کورددا پسپۆری وریای ئەم هونەرە هەڵکەوتووە وەک: (عەلی عەبدوڵڵا قوربانی ١٩٠٣ - ١٩٦٩ز)ی هەولێری - بڕوانە پەڕاوی (عەلی شوێن هەڵگر - دانراوی (کاردۆ گەلاڵی ١٩٧٨ - چاپخانەی ئەسعەد - بەغدا).
کە من ئەو (عەلی شوێن هەڵگرە)م لە کاتی کارکردنیا لە (ئاڵتوون کۆپری - پردێ) لە ١٩٥٢ز.دا دیوە.
(کوردی) کە ناوی ئەمەی بردووە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوسایە ئەم هونەرە باو بووە و ئەمیش

شوێنی دڵی خۆی تادەرکی یاری هەڵگرتووە و داوای ئەوەی لێ دەکا یا شوێنەکە لە ماڵی خۆی دەرکا یا دڵەکەی بداتەوە یا سوێندی بۆ بخوا کە لە لای ئەو نییە.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گ/٣)یە لەگەڵ نووسینێکی مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار لە گۆڤاری (نووسەری کورد) ژمارە/٣ی ساڵی/١ی ئابی/١٩٧١ لە ژێر ناوی (دەسنووسێکی غەزەلی کورد)دا کە چەند تاک و پارچە هەڵبەستی (کوردی)ی تیا بڵاو کردووەتەوە. جگە لەم سێ سەرچاوەیە من کەڵکم لە ڕاستکردنەوەی هۆنەری لاهووتیمان (مەلا مەحموودی بێخود ١٨٧٨ – ١٩٤٧ز) وەرگرتووە لەم هەڵبەستەدا.

لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکە، بەپشت بەستن بەڕاستکردنەوەی (بێخود).

تاکی (نووسەر): تاکو.

قوبان (گ/٣): قوربان – ئەمیش لەنگە.

بدە دڵ (نووسەر): بدە – ئەمیش لەنگە و نەشارەزاییی قووڵ.

یانە سوێند (گ/٣): یا قەسەم – دەسکاریی پێوە دیارە.

جوانی لەم تاکە هەڵبەستەدا لە لایەنی هونەری و وێژەییی کۆنەوە بەکاربردنی وشەی (تاکی)یە بەپاڵ وشەی (دەرکی)یەوە کە (تاکی) وەک واتەی تاکو، (هەتا)... دەدات لێرە (واتە)ی (تاکە دەرگا)ش دەدات. جگە لە زیندووکردنەوە و ناوبردنی ئەم هونەری (شوێن هەڵگرتنە).

٢– لەون: ڕەنگ – مەبەستی ڕەنگی سووری خوێنەکەیە کە بەپەنجەی یارەوە و بەو تیغەی دەستی لە کوشتنی دڵەکەی (کوردی)دا خوێنەکەی تێوە چووە.

ثوبوت: بەڵگە، ئیسپات، جێگیرکردن.

دەعوا: ئەو داپرسییەیە خوێن سووری و تیغ بەدەستی و دڵکوژییەکەی بەڵگەی تاوانبارییە و بڕاوەتەوە.

تۆ تیغ بەدەست و (گ/٣): تۆ دەس بەتیغ و.

دڵکوژی (گ/٣): دڵ قەتیل واتە (دڵ کوژراو) و ئەمەش هەڵەیە و دەسکاری کراوە.

لەونیش (نووسەر): لەویش. ئەشێ هەڵەی چاپی بێ.

دەعویە (گ/٣): دەعوەیە. ئەمەش هەڵەیە کە دەعوە (زیافەت)ە.

یا ڕاست وەگەر (نووسەر): یا ڕاستە، یا.

یا ڕاست وەگەر (گ/٣): سا ڕاست بێ یا.

ئەم تاکەش دیسان هەر لە بارەی دۆزینەوە و بەڵگەی تاوانبارییە بەپێی زانستی تاوانبار دۆزینەوە وەک تاکی پێشوو و، واقیعیەت خوبێنییەکەیە تەنانەت درۆش بێ، بەڵام چونکە بەڵگە هەیە ئیتر کارەکە جێگیر و ئیسپاتە و، ئەمەش لایەنی قانوون گرتنە نەک عاطیفە و ڕێڕەوی دادوەری گرتنە.

٣– لە عەینی: لە هەرەتی، لە کاتی.

مەرحەمەت: چاوێری.
قاتیل: بکوژ، کوژەر، خوینکار.
لوطف: دڵسۆزی.
بەچچە: مناڵ، یا بێچووە گورگ کە مناڵ بەبێ ڕق لێ بوون بەناوی یارییەوە مەلی دەستەمۆ دەکوژێت.
قاتیلە: دەکوژێت.
مورغ: مەل، پەلەوەر، باڵندە.
بەچچە (گ/٣): بەچەیی - ئەمەش لەنگی دەکات.
قاتیلە بۆ (عن): گورگە - ایضا نسخە: قاتلی.
مورغی (نووسەر): تەیری - ئەمە دەسکارییە.
(کوردی) یارەکەی وەک ئەو مناڵە داناوە کە لە خۆشەویستیی ئەو مەلەدا کە بەدەستییەوەیە (مەلەکە) هەڵدەگولۆفێ و دەیکوژێ و، یارەکەش تەنانەت لە کاتی چاوێریشدا دڵەکەی (کوردی) ئاوا دەکوژێ.
کوردی یارەکەی بە(مناڵ) یا بێچووە گورگ چواندووە.
٤- خەیاڵ: بیر لێکردنەوە.
سیا: ڕەش.
خاطر: مەبەستی (بیر)ە. (بەبیردا هاتنەوە).
بێچارە: مەبەستی لە دەستەپاچەیی دڵەکەی خۆیەتی وەک بڵێ: هەژارە.
مار گەزیدە: مارانگاز، مار گەستوو.
ئەمەش لەو پەندی پێشینانەوەیە کە دەڵێ: مارانگاز لە خشپەی (یا لە خشەی) مار دەترسێ - و (کوردی)یش تەنیا بەبیرکردنەوە لە زوڵفە ڕەشەکەی وەک مارانگاز برینی دڵی هاتووەتەوە ئازار و سۆ.
زام: برین.
سۆ: ئازار، ژان.
ئەم تاکە لە (نووسەر)دا نییە و لە (عن) و (گ/٣)دا چوارەمینە.
مار گەزیدە (گ/٣): مار گەزیدە بوو. ئەمیش لەنگی دەکات.
٥- بۆی خاک: ئەم بۆی خاک کردنەش دیسان پەیوەندیی بەشوێن هەڵگرتنەکەی تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەوە هەیە چونکە پاک و پیسیی قاچ و دەست و شوێنەواری پاشماوەی تاوانکار و بۆ چەوتی و لاری، قورسی و سووکی و گەورەیی و بچووکی و جۆرەها ڕواڵەتی تر کە لە تاوانبار بەجێ بمێنێ دەبێتە هۆی دۆزینەوە و یەکلاکردن و ئاشکرابوونی تاوانەکەی.
(کوردی)ش بەبۆنی ژێر پێی سەگی دەرگای ناحەزەکەیدا (ڕەقیب) زانیویە کە سەگەکە

گەمارۆی کەسێکی داوە و ڕێی چوونە ژوورەوە و بەیار گەیشتنی نەداوە چونکە، کە شوێن پێی ئەو کەسەشی هەڵگرت و ئەو (حاجیب = پەردەدار) و دۆست بوو، بەڵام دژەکە ڕێی ئەوی نەداوە و سەگەکەی لێ دەرنەکردووە و تا گەڕاوەتەوە و ئەمجا (کوردی) ئەم کارەساتە ئاشکرا دەکات بەجەختەوە پرسیاری هۆی ڕوودانی دەکات.

ئەم تاکە لە (نووسەر)دا نییە و لە (عن، گ/٣)دا پێنجەمینە.

دەگـیـرێ لە دەرکی (گ/٣):... دەرکی – (دیارە بۆی نەخـوێندراوەتەوە)، یا لـەناوچووە بۆیـە بە سپێتی شوێنی (دەگیرێیە)کەی بەجێ هێشتووە.

دەبۆ (گ/٣): دەبوو – ئەمیش نابێ و لەگەڵ پاشبەندەکانیش ناگونجێ و هەڵەیە.

چۆن (گ/٣): چون.

دە بۆ: ئیتر بۆچی، دە لەبەرچی، بەجەختەوە پرسیارکردنە.

تەجروبە: تاقیکردنەوە، ئەزموون.

مَنْ جَرَّبَ المُجَرَّبْ: ئەوی تاقیکراوەی تاقی کردەوە.

٦– ئەم تاکەی (کوردی)ش دیسان لە تاکەکانی تری نەپچڕاوەتەوە لە واتادا، چونکە دڵی خۆی وریا دەکاتەوە کە لە کارا (ورد) بێ و هەڵەشـەیی نەکا و دوور بێ لە سـەرەڕۆیی و بەبێ لێکدانەوە و تاقیکردنەوەی پێشووەوە نابێ ڕۆ بچێتە کارەوە و پێویستە ژیری (عەقڵ) ڕێنومای بێ.

هەروەها ئەم تاکە هەڵبەستە نیشانەیە بۆ تاکە هەڵبەستێکی تری (خواجە حافظ شیرازی)ی کورد کە وتوویە:

«هرچند کازمودم، از وی نبوو سودم
(مَنْ جَرَّبَ المُجَرَّبْ) حـلَّتْ بِهِ النَدامَة»

واتە: (هـەرچەند کـە تاقـیـم کـردەوە و خـۆڕاگـریم کـرد، چ سـوودێکم لەو وەرنـەگـرت. ئەوی تاقیکراوە تاقی بکاتەوە پەشیمانی بەسەرا دێت) و (کوردی) دڵەکەی ئاگەداری ئەم تاکە دەکا پێی دەڵێ ئەگەر (ئەر) بیستووتە ئیتر بۆ ڕێی عەشق مەچۆ کە کەڵکی نییە بۆ تۆ.

ئەم تاکە لە (نووسەر)دا چوارەمینە و لە (عن، گ/٣)دا شەشەمینە.

چویی (گ/٣): دەچی. ئەمەش هەڵەیە وەک لە یەکەم تاکەوە ئەو چووە و شوێنی هەڵگرتووە.

چویی (نووسەر): ئەچی. ئەمەش نوێیە.

ئەی دڵ (گ/٣): ئەی عەقل. ئەمەش نابێ چونکە عەقل (ژیری) وا ناکا کە عەقڵ بێ.

عەشق (نووسەر، گ/٣): عیشق. ئەم گۆڕینە بێ جێیە چونکە کورد هەر (عەشق) بەکار دێنێ.

المجربت (گ/٣): المجربەت – هەڵەیە.

تەجروبە (نووسەر): تەجرەبە. دیسان پڕ بەپڕی کێش و گوتنی کوردانە نییە.

بێ تەجروبە (گ/٣): بەتەجروبە – ئەمەش هەڵەیە و (کوردی) و کەس شتی وا ناڵێ.

٧– صەبر: ئارام، پشوو.

قەرار: خۆڕاگرتن، بڕیار.

تاقەت: وزە، توانایی.

ڕاحەت: حەسانەوە، ئاسوودەیی.

ڕوح: گیان، جان، ڕەوان.

بڕۆ: بەزمانی عارەبی (رووح)ی پێ دەڵێن و ئەمیش جوانییەکە، کە لێرەدا هەردوو وشەی (رووح = بڕۆ)، (رووح = گیان)ی بەکار بردووە کە لە وێژەی کۆنماندا وردەکاریی پێ دەڵێن. هۆنەرە کۆنەکانمان لە پەیکاری ئەم شتانەدا بوون.

دوای ئەم هەموو وریاکردنەوەیە و ئاگەداری پیشاندانەی (کوردی) لە تاکەکانی پێشەوەیدا بەناچاری کە تەنیا (گیان)ی ماوە، ئەویش لە ڕێگەی دڵداریدا دادەنێ ڕێی پێ دەدا کە ئەویش بڕوات کە ئەوپەڕی چارە نەمان و بێزارییە.

ئەم تاکە لە (نووسەر)دا پێنجەمین و لە (عن، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە هەمووانیشدا دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە، بەڵام ئەم تاکە لە (گ/٣)دا بەم جۆرە شێوەوەی دواییە:

«عەقڵیش دەڵێ وەکو دڵ دەچمە کۆیی یار

(کوردی) فیراق بەلایەوە ئاسانە تۆش بڕۆ»

ئەوی شایانی نیشانە بۆ کردنە مامۆستا (بیمار) لە گۆڤاری (نووسەر)دا کە هەڵبەستەکەی نووسیوە لە کەشکۆڵێکی نووسراوی سەرەتای چەرخی بیستەمی وەرگرتووە کە هی خانەوادەی (جەلی زادە)ی کۆییە کە لە خاتوو نەجیبە خانی جەلی زادەی وەرگرتووە. بڕوانە ئەو گۆڤارە و من لەم پەڕاوییەدا بە(جلی)ی کورتکراوەی (جەلی زادە) نیشانەم بۆ کردووە.

٥٢

## لـه کوخجی بێ کەسـیدا

١- لە کـونجی بـێ کـەسـیـدا فـەردم ئەمـرۆ،

زەلیـل و زار و بـێ هـەمـــــدەردم ئـەمــــرۆ

٢- شـەمـاڵ نامـەی زەلیلی و بـێ کـەسـیی من

بـەرە بـۆ یـاری دڵ پـڕ دەردم ئـەمــــــرۆ

٣- گـــەواهـی لافـی عـــەشـــقی تـۆیـە قـــوربـان

سـوروشکی سـورخ و ڕەنگی زەردم ئەمـرۆ

٤- وەکو مـەجنوون، لە دووریی لـەیلی بێ مـەیل،

خــــەریک و وێڵـی بەڕیـە و هـەردم ئـەمــــرۆ

٥- لە سـۆزی عـەشق و سـەردیی مـیـهـری تۆیە

دەروونـی گـــەرم و، ئـاهـی ســــەردم ئـەمـــرۆ

٦- وەکـــو طـەیرێکی گـــوم بـووبێ جـــەناحی

هـێـــــلانـە وازو بـەردا و بـەردم ئـەمــــرۆ

٧- مـەگـەر سـروەی نەسـیـمی وەصـڵی تۆ بێ

مـــوعـــەططەر کـــا دڵەی پڕ دەردم ئـەمـــرۆ

٨- لە عـەرصـەی وەصـفی ئەو مـەحـبـووبە لەنگە

خـــەیاڵی وەک ســـوارەی (جـــەڵد)م ئەمـــرۆ

٩- لە بۆ وەصـڵی جـەمـالی یاری، (کـوردی)!!

ئـەگـــەر ڕۆحـم نـەدەم نـامــــەردم ئـەمــــرۆ

---

١- کونج: گۆشە، کەنار، سووچ، قوژبن.

فەرد: تاک، تەنیا.

زەلیل: زەبوون، کەنەفت.

زار: بێچارە، پەرێشان، بەناڵە، زەبوون.

هەمدەرد: هاودەرد.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە کەشکۆڵی دەسنووسدا ئەمانەن کە:

(عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ف، ش، ر، با، نم/١، ق)ن و، لە چاپکراوەکانیشدا ئەمانەن کە: (ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣)ن وە لە نێوان هەموویاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە. هەروەها ئەم پەراوێزە فارسییەی خوارەوە لە (عن)دا وەک سەرەناوێک بۆ ئەم هەڵبەستە نووسراوە و لە سەرچاوەیەکی تردا شتی وام بەرچاو نەکەوتووە ئەویش: (سالم کە در بندخانەء طهران زیندانی بودە مصطفی بیک کردی این قصیدە را برای او فرستادە ود پایان جواب (سالم) رحمهما الله دیده میشود – علی).

واتە: (سالم، کە لە بەندیخانەی تاراندا بەندی بووە، مستەفا بەگی «کوردی»، ئەم چامەیەی ناردووە، لە کۆتاییشدا وەڵامی سالم خوا بیانبەخشێ دەبینرێت – عەلی).

بەڵێ منیش لە دوای ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی)یەوە ئەو وەڵامەی (سالم) پێشکەش ئەکەم.

هەمدەرد (ف، ر، نم/١، کم): هامدەرد.

هەمدەرد (گ/٢، س، گ/٣): هاودەرد. کە ئەمە دەسکارییە.

٢– شەماڵ: بای شەماڵە و لە ناو هۆنەراندا باو بووە کە شەماڵیان کردووەتە نامەبەر.

دەرد: نەخۆشی – بەڵام لە (عن)دا لەسەر ئەم وشەی (دەرد)ە ئەم پەراوێزە فارسییەی هەیە کە نووسیویە: (درد مقصود از بیماراست کە یکی از تخلصهای سالم است – علی). واتە (ئەم وشەی (دەرد)ە لێرەدا مەبەست لە وشەی (بیمار)ە کە (بیمار)یش یەکێکە لە نازناوەکانی (سالم) خوا بیبەخشێ – عەلی) بەڵێ (سالم، بیمار و ڕەنجور) نازناوی ئەو بوون چونکە (دەرد، بیماری، ڕەنجوری) بەواتایەک دێن.

ئەم تاکە لە (گل/١، نم/١، ف، کم، گ/٢، با، س، گ/٣)دا نییە و لە (عن، گل/٦، گل/٨، ش، ق)دا دووەمینە و لە (گل/٩)دا سێیەمینە و لە (عن)دا پێنجەمینە و لە (ف)دا حەوتەمین تاکی ئەم چامەیەی (کوردی)یە.

شەماڵ (گل/٦، گل/٨، ف، ر، ئا): صبا، (صەبا).

بەرە (ف، ق): ببە.

پڕ دەردم (ئا): وەک بردم (بەردم).

٣– گەواهی: شایەتی. (مەبەستی لە ئالایەکی سوور و زەرد)ە.

لاف: خۆهەڵکێشان و، مەبەستی شانازی و پێوە لەخۆبایی بوونە.

سوروشک: فرمێسک.

سورخ: سوور.

ئەم تاکە لە (ش، ق)دا نییە و لە (گل/١، گل/٩، ف، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا

دووەمینە و، لە (عن، گل/٦، گل/٨، ر، ئا)دا سێیەمین تاکی ئەم چامەیەیە.

گەواهی (گل/١): کواە.

لافی (گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ر): لاف.

عەشقی (گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ر): عشق.

عەشقی (گ/٣): عیشقی – ئەمیش کوردانە نییە.

سوروشکی (گل/١، گل/٦): سرشک.

سوروشکی (نم/١، ف): سرشکی.

سوروشکی (گل/٨، گل/٩، ر، عن، با، گ/٢، گ/٣، کم، س): سرشکی.

سوروشکی (ئا): سروشکی.

سورخ و (گل/١، گل/٦، ر): سرخ.

سورخ و (گ/٢، س، گ/٣): سوور و.

ڕەنگی (گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩): رنک.

ڕەنگی (کم): رونگی – دیارە هەڵەی چاپییە.

ڕەنگی (ر): رنگ.

قوربان (گل/١، گل/٨، ر): فرهاد – ئەمەش جێگەی سەرسامییە بۆ وشەی (فەرهاد) لێرەدا.

٤– مەجنوون: لەگەڵ لەیلدا مەبەست لە (لەیل و مەجنوون)ی داستانەی عەرەبە و لەیلیش یارەکەی و خۆی کە (مەجنوون)ە لە تاو بێ مەیلی (بێ تاقەتی لەبەر بەندێتییەکەی).

بەڕیە: بیابان.

هەرد: هەڵەت، بەرزایی، شاخ.

ئەم تاکە لە (گل/١)دا سێیەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ش، ق)دا چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

لەیلی (گل/١، گل/٨، ش): لیل.

وێڵی (گل/١، گل/٨، ش): ویل و.

بەڕیە (لە سەرچاوەکانیدا بە): برّیة نووسراوە کە ڕێنووسی کۆنە.

ئەمڕۆ (ش): امرو امرو – دووجارە بەم شێوەیە نووسراوە و دیارە هەڵەیە.

٥– سۆز: جۆش، تاو، گوڕ، گڕپە و گڕی سووتان.

سەرد: سارد.

میهر: لاواندنەوە، خۆشەویستی، چاودێری، ئارەزوو، ناوی ئەستێرەی خۆشەویستی (ڤینۆس)، گومەزێکی ئاڵتوونی گچکەیە دەخرێتە سەر گۆڕ (مەزار). کە هەموو ئەم واتانە بۆ ئەم شوێنە دەس ئەدەن.

ئەم تاکە لە (ش، ق)دا نییە و لە (ر، ئا)دا دووەمینە و لە (ف، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا

سێیەمینە و لە (گل/١)دا چوارەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٨، گل/٩)دا پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

سۆزی (ر): سودای.

سۆزی (ف، نم/١، کم): سوزەی.

عەشق و (گل/١، گل/٦، گل/٨، ر): عشق.

عەشق و (ف، نم/١، کم، گ/٢، س): عشقی.

عەشق و (گ/٣): عیشقی – دیسان دەسکارییە.

میهری (گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ر): مهر.

دەروونی (گل/١، گل/٨، ف، نم/١، کم، گ/٢، س): دَرون (دەروون).

ئاهی (گل/١، گل/٦، گل/٨، گل/٩، ف، نم/١، کم): آه.

ئاهی (گ/٢، س، گ/٣): هەناسەم.

سەردم (گ/٢، س): سارد – ئەمیش لەنگە و دەسکارییە.

سەردم (گ/٣): سەردە – لەگەڵ پاشبەند (سەروا)ی هەڵبەستەکەدا ناگونجێ و ئەشێ هەڵەی چاپی بێ.

٦– طەیر: مەل، باڵندە، پەلەوەر، پەڕندە، باڵدار.

جەناح: بەواتا باڵ و باڵی تەیریش لە هەمان کاتا بەواتا قۆڵ، پەل، لا، وە یا بۆ شوێنی شتێکیش دێت – لێرەدا وەک لە وێژەی دێریندا باوە کە هۆنەر بەفێڵ وشەیەکی چەواشەکار دەخاتە شوێنی گونجاوی هەڵبەستەکەیەوە کە ئەویش بەوەستاکاری و شارەزایی و جوانی دانراوە وەک: چەسپاندنی وشەی (جەناح) بۆ پاڵ (مەل) و لە نێوانیاندا وشەی (گوم) هەیە کە لە ڕاستییدا مەل باڵی لێ گوم نابێ بەڵام (لا) یا (شوێن)ی لێ گوم دەبێ کە (کوردی) ئەمەیانی مەبەستە هەرچەندە (مامۆستا ڕۆژبەیانی) دەڵێ: (ڕێی تێدەچێ کە ئەم «گوم»ە «کۆم» بێ) منیش ئەمە بەبۆچوونێکی تایبەت بەخودی ڕۆژبەیانی دەزانم لە (کۆم)گەریدا، چونکە (باڵ کۆم نابێ).

هێلانە واز: هێلانە لێ تێکچوو.

بەردا و بەرد: لەم بەردەوە بۆ ئەو بەرد، ڕەهەندە، وێڵ.

ئەم تاکە لە (ر، ئا)دا نییە وە لە (ش، ق)دا سێیەمینە و لە (ف، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا چوارەمینە و لە (گل/١)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا شەشەمینە.

طەیرێکی (نم/١، ف، کم): طیریکم.

طەیرێکی (با): طیریکم و.

بووبێ (با): بی.

هیلانە واز و (ش، ق): هیلانە دوز و.

بەردا و بەردم (ف): هردا و هردم.

بەردا و بەردم (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): هەردا و هەردم – کە ئەمیش ئاوێتەیە، چونکی لە تاکی چوارەمدا هاتووە و، (دووبارە)یی لە وێژەی کۆندا نارەوایە و ناشیرین و لە (کوردی) نایەت.

٧- سروەی: شنەی.

نەسیم: بای بەرەبەیان.

وەصڵ: پێک گەیشتن، بەیەک شادبوون.

موعەططەر: بۆنخۆش، عەتراوی، گوڵاوای.

ئەم تاکە لە (گل/٦، ش، ق)دا نییە و لە (ر، ئا)دا چوارەمینە و لە (ف، با، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە و لە (گل/١)دا شەشەمینە و لە (عن، گل/٨، گل/٩)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

سروەی (ر، ف، نم/١، کم): سوزەی.

سروەی (گ/٢، س، گ/٣): سوزی.

تۆ بێ (ف، ئا، نم/١، کم): او بی – ئەمیش لەگەڵ ڕێڕەوی ئاراستەکاری ڕووبەڕوویی (کوردی)دا بەرامبەر بە(سالم) ناگونجێ و (تۆ بێ) تەواوترە و لە (ئەو بی) بۆ (غائب)ە.

تۆ بی (ر): جانان.

دڵەی (ئا): دلی.

٨- عەرصە: گۆڕەپان، مەیان، پانتایی، شوێن سوارچاکی، تەراتێن گا.

وەصف: هەڵنان، لێدوان بەجوانی و چاکی.

مەحبووب: خۆشەویست و لە عارەبیدا کە ئەمرازی مێیینە (مەحبووبە) کە (ھ = ت)یەکەی دوایی وەک (مەحبووب – مەحبووبە) ئەم (ھ) یا (ت)یەی دوایی (مەحبووبە)یە مەبەست لەوە نییە کە (سالم) مێیینە بووە بەشکو (ھ)یەکە ئەمرازی (دانە پاڵ)ی زمانی کوردییە.

لەنگە: سوار نییە، شەلە، ئەلەنگێ – ئەم وشەیە لە پاڵ (مەحبووب)ەکەدا وا دیاری دەدا کە (مەحبووب)ەکە لەنگە و، کەچی مەبەسی لەنگی (خەیاڵ = بیر) یا لەنگی (خەیاڵ = سوارە)کەیە و ئەمەش فێڵ و وەستایییەکی زمانی و وێژەی جوانی کۆنینەیە.

خەیاڵ: بیر و ئەندێشە و لە هەمان کاتدا مەبەست لە (سوار)یشە کە جوانیی تیایە بەپێی وێژەی دێرینەمان.

جەڵد: گورج، چوست، چالاک.

ئەم تاکە لە (ش، ق)دا پێنجەمینە و لە (ف، با، ئا، ر، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لە (گل/١، گل/٦)دا حەوتەمینە و لە (عن، گل/٨، گل/٩)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

خەیاڵی (ش، ق): خیالم.

جەردم (گ/٣): جەردە – ئەمەش ئەگەر هەڵەی چاپی نەبێ، دەسکارییەکی هەڵەیە و بۆ ئەم تاکە ناگونجێ.

٩- جەمال: جوانی، بەڵام مەبەستی خودی (سالم)ی جوانە.

کوردی: ئەی کوردی و خۆی بەخۆی دەڵێ.

ڕۆح: گیان.

ئەم تاکە لە (ش، ق)دا شەشەمینە و لە (ر، با، نم/١، ئا، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (گل/١، گل/٦، ف)دا هەشتەمینە و لە (عن، گل/٨، گل/٩)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەموو ئەم سەرچاوانەشدا دوا تاکە.

وەصڵی (ئا): وەصفی – ئەمیش هەڵەیە.

یاری (ف): یارە.

کوردی (ر): هیجری – وە بەپێی هەموو سەرچاوەکانی تر (کوردی)یە نەک (هیجری) هەرچەندە لە وەڵامەکەی (سالم)دا نیشانە بۆ ئەم هەردوو نازناوە لە تاکی حەوتەمینیدا کراوە.

ئەمیش لە خوارەوە وەڵامەکەی (سالم)ە کە لە بەندیخانەی (تاران)ەوە بۆ (کوردی)ی نووسیوەتەوە وەک لە پەراوێزی تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی (کوردی)دا ئەم بەڵێنەمان دابوو.

ئەوی شایانی دیاریکردنە ئەوەیە کە ئەم وەڵامەی دوایی (سالم) هێشتا چاپ نەکراوە و تەنیا لە سەرچاوەی (عن)دایە وەک بەپەراوێزدا نووسیویە: (جواب سالم برای کردی رحمهما الله) واتە: (وەڵامی «سالم» بۆ «کوردی» خوا لێیان خۆش بێ).

**وەڵامەکەی «سالم» بۆ «کوردی»**

١- لە زیندانا کە بێ هەمدەردم ئەمرۆ
ئەسیری ناکەس و دڵ بەردم ئەمرۆ

٢- لە دارولحوزنی دووریدا صەبا بوو
گەیاندی نامەیی هەمفەردم ئەمرۆ

٣- لە پام گەر بەندە، (دەر)، واژە لە مەیلم
دڵم لاتە زەبوون و زەردم ئەمرۆ

واتە ئەگەر دەرگا لەسەر پێ (قاچ)م داخراوە کە دەرنەچم بەڵام دەرگای سەر بیر و هۆش و هەست و ئارەزووم ئازادە و دەرگای لەسەر دانەخراوە (وازە)، ئەمەش ڕاستە کە بەندیخانە و سزا، بیری ڕاستییان پێ داناماڵرێ.

پا: پێ، قاچ.

بەند: گرتوو، بەندی.

دەر: دەرگا، دەروازە، دەرگانە.

واز: کراوە – بەڵام جوانی لە یەکخستنی (دەر) و (واز)دا هەیە کە بەهەردووییان جارێکی تر دەبنە (دەروازە) بەواتە (دەرگا) وەردەگیرێ.

لاتە: بێ دەسەڵاتە و لاوازە وە یا لە لای تۆیە.

٤– گلەی ناحەق مەکە، پرسی دڵم کە
ئەگەر بێ مەیلە؟ من نامەردم ئەمرۆ

٥– بەسرووەی فێنکی بادی شەماڵت
بووە هاوین، لە ئاهی سەردم ئەمرۆ

٦– خۆشا، گەر تۆ لە پەروازی وەکو مەل
ئەمن پابەندی بەندیی فەردم ئەمرۆ

ئەمە نیشانە و وەڵامە بۆ تاکی شەشەمینی نامەکەی (کوردی) کە گوتبووی: (وەکو تەیرێکی گوم بووی جەناحی هێلانە وازە...)م و دەڵێ ئەی (کوردی) خۆشی لە خۆت کە تۆ وەک مەلێکی ئازادی ئەفڕی، بەڵام من (سجنی ئینفرادی)م پابەندم.

هەروەها ناوبردنی ئەم (پابەند)ییەش لەوە دەچێ کە (کۆت) و (زنجیر) و پێوەند کرابێ بەپێی نەرێتی ئەو سەردەمە و (بەندیی فەرد)ەکەش ئەشێ کەوا بەجیا بەند کرابێ، واتە لە (ئینفرادی)دا بووبێ لە بەندیخانەی قاجارییەکاندا.

٧– ئەگەرچی بولبولی سەرخاری هیجرم
تەمەنای عەطری عەینی وەردم ئەمرۆ

لە (عن)دا لەسەر ئەم تاکە بەفارسی ئەم پەراوێزەی نووسیوە کە:

(این بیت مقصود از دو تخلص هجری و کردی مصطفی بیک است).

واتە: (لەم تاکە هەڵبەستەدا مەبەست لە هەردوو نازناوەکەی (هیجری) و (کوردی)ی مستەفا بەگە) کە ئەوەتە لە نێو باڵی یەکەمیدا (هیجر) نیشانە بۆ (هیجری) و لە نیو باڵی دووەمیدا (وەردم) = واتە گوڵم کە بەعەرەبی (عەینی وەرد = وەردی، یا (کەلوەرد) یا (کورد) تا (کَوَردی) (کَورْدی)وە بەڕێنووسی کۆن بە(کوردی)ش دەخوێنرێتەوە کە ئەمیش نازناوەکەی تری (کوردی)یە.

٨– قەریحەی شیعرەکەی پێشووم نەماوە
ئەوەند خەستە و دەروون پڕ دەردم ئەمرۆ

٩– بەدڵ دەستی دوعای بەرزە کە (سالم)
بەرەو شەمسی جەماڵت گەردم ئەمرۆ

دەبینرێت کە (سالم) هەر تاکێکی ئەم وەڵامەی بەزنجیرە، بەرامبەر بەتاکەکانی تری (کوردی)یە واتە یەکەم بۆ یەکەم، دووەم بۆ دووەم و... هتد.

٥٣

## عالەمت

١- عالەمت ئاسان کە تەسخیر کردووە، ئەی ماهڕوو
سامیری ئاسای و پیشەت جادووە، ئەی ماهڕوو
٢- دەست بەخەنجەر دێی و، باز خۆت دەگری، سا کەی، لێم دەدەی؟
ئینتیظارم، بمکوژە تاکو زووە ئەی ماهڕوو
٣- دڵ دەبەی بەدزی و، لە ناو خەڵقی دەڵێی خۆی داگیە پێم؟؟
من بەتۆم دا؟؟یا لە داوت خستووە ئەی ماهڕوو؟؟
٤- بێچووە جەللاد خۆت لە ناو مەردوم بەصۆفی بۆ دەکەی؟؟
خۆم کە زۆر چاک شارەزاهەم لەم خووە ئەی ماهڕوو
٥- پڕ دڵم خوێن کرد و دام پێت وا بەزوودی جێبەجێ
یەعنی بەدمەستم پیاڵەم پڕ بووە ئەی ماهڕوو
٦- مەست و سەرسامم لە پێچ و دەورە و تەفرەت (قوبان)
خورد و خاو و صەبر و هۆشم لا چووە ئەی ماهڕوو
٧- زەردی دەردی تۆیە (کوردی) و پێی دەڵێی بێنە بەهێ
وەختی بەی کوا؟ بەسیەتی ئەم بیانووە ئەی ماهڕوو

.................................................................

١- عالەم: جیهان – بەڵام مەبەستی خەلقییە.
تەسخیر: دەردەست.
ماهڕوو: ڕوومانگ.
سامری: فریشتەیەکی جادووزان بووە لە هەڵبەستی تردا لێکم داوەتەوە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (عن، گل/٦، گل/٩، ف، نم/١، نن)ە وە لە چاپکراویشدا (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە لەگەڵ گۆڤاری (نووسەری کورد)ی ژمارە/٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧١دا کە (مامۆستا حسەین نێرگسەجاڕی) ئەم هەڵبەستەی بەشێواوی تیا بڵاو کردووەتەوە، گوایە هێشتە چاپ نەکراوە، کەچی بەچل ساڵ بەر لەو (کوردی و مەریوانی) لە (دیوانی کوردی)دا و لە هەردوو چاپی دووەمی و سێیەمی ئەم دیوانەشدا (گیوی موکریانی)

چاپی کردووە و، من نیشانەی (نووسەر)م بۆ ئەم گۆڤارە دانا و لە سەرچاوەکاندا (گم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی هەڵبەستەکە، کە وەک دەردەکەوێ ئەوەندە شێواوە و دەسکاری کراوە لەوانەیە نەک بەهی (کوردی) نەزانرێ، بەشکو ڕواڵەتی هۆنراوەیی پێوە نەماوە هەرچەندە هێشتە مۆرکی (کوردی)ی پێوەیە و هەموو سەرچاوەکانیش بە هی ئەویان داناوە.

عالەمت ئاسان کە تەسخیر کردووە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، نووسەر، گ/٣): وا بەئاسان عالەمێ تەسخیری تۆ بوون – ئەمەش لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و شێواوە.

ئەی ماهڕوو (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): ماهڕو.

ئەی ماهڕوو (ف، نن، نووسەر): هەی تەرەس – وە هەموو پاشبەندەکانی تری ئەم هەڵبەستەش لەم سێ سەرچاوەیەدا (هەی تەرەس)ە، لەبەرئەوە بەپێویستم نەزانی کە لە تاکەکەی تردا ئەمە چەند بارە بکەمەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دەربڕینە بە هی (کوردی) ناچێ و ئەویش یەکێکە لە شێواوییەکانی هەڵبەستەکە.

٢– باز: دیسان، هەمیسان، جارێکی کەش.
ئینتیظار: چاوەنوارِ.
تاکو زووە: تا درەنگ نەبووە، خێراکە.
لێم دەدەی: لە من دەدەی وە یا دەسا (لێم بدە) سا دەی ئەمیش جوانییەکی وێژەییە.
دەست (نووسەر): دەس.
دێی و (ف، نووسەر): دییت و – ئەمە لە ڕووی دەستووری زمانییەوە ناگونجێ.
باز (نووسەر): بازی – ئەمەش هەڵەیە.
دەگری (نم/١): اگری – ئەمە دەسکارییە.
لێم دەدەی (کم، نم/١، نووسەر): لێم ئەدەی – ئەمەش دەسکارییە.
لێم دەدەی (ف) لێم نەدەی – ئەمەش هەڵەیە.
ئینتیظارم بمکوژە (نم/١، کم، نن): اینتظاری کوشتنم.
ئینتیظارم بمکوژە (گ/٢، س، گ/٣): انتظاری کوژتنم.
ئینتیظارم بمکوژە (ف، نووسەر): انتظاری کوشتنی – ئەمەش نابێ.

تاکو زووە (ف، نم/١، نن، کم، گ/٢، س، گ/٣، نووسەر): زوو لێمدە یاللـ□ـه – ئەمیش لەنگە و لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و شێواوە.

٣– داگیە: داوێتی – ئەمە زاراوەیەکی سنەییانەیە و (کوردی) جگە لەوەی کەوا لە بنەچەدا سنەییە، بەڵام ئەویش و زۆربەی هۆنەرانمان لەو سەردەمەدا گەلێ لە زاراوەی سنەییانەیان لە هەڵبەستیاندا بەکار هێناوە، چونکە سنە (سەنەندوج) شارێکی مەزنی کورد و سەرچاوەی زانستی و هونەر و وێژە و شارستانێتی ئەوسای ناوچەکە بووە و ڕۆشنبیران پەیوەندییان

پێوەی بووە.

دەبەی بەدزی و (ف، نن، نم/١، کم، گ/٢، س): دەبێ بدزی – ئەم گۆڕدرانەش لەوەوەیە کە ڕێنووسەکە هەردوو جۆرەکەی (دەبەی بەدزی و) وە (دەبێ بدزی) بە(دبی بدزی) دەنووسرێ و ئەو سەرچاوانە هەریەکەی بەجۆرێک خوێندوویەتەوە و وەری گرتووە.

لە داوخستن: ڕاوکردن، بەداوگرتن.

خۆی داگیە پێم (نم/١): خوم داگە پیم. – ئەمە هەڵەیە.

خۆی داگیە پێم (ف): خو داگیە پیم.

خۆی داگیە پێم (نن): خۆی داگە پیم. – ئەمەش هەڵەیە.

خۆی داگیە پێم (نووسەر): خۆی داویە پێم. – ئەمەش دەسکارییە.

بەتۆم دا، یا لە داوت خستووە ئەی (نم/١، نن، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣، نووسەر): دڵم دا پێت بەڕاست دادەی بزانم – ئەمەش هەرچەندە لەگەڵ پاشبەندەکان ناگونجێ و شێواوییەکی زۆری تیایە، لە هەڵبەستیش ناچێ.

٤– جەللاد: سەرپەڕێن، ئەوی فرمان بەسەرادراو بێ دەکوژێ – بێچووە جەللاد – مەبەستی لەوەیە کە لەو پەروەردەیەوە پێ گەییوە و فێری خەلق کوژی بووە، لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، کە باوکی (جەللاد) بووە.

مەردوم: خەلقی – ئەمیش زاراوەیەکی سنەییانەیە.

صۆفی: هەوادارانی ڕێگەی نەقشبەندی (نەخشی) کە کوردی لەمانە بووە.

بۆ دەکەی (نم/١): اکەی – هەڵەیە و لەنگە.

مەردوم (گل/٩): خلقی.

مەردوم (نن): خلقی – نسخە: مردم.

بەصۆفی بۆ دەکەی (نن): بو دکەی – ئەمیش ناتەواوی و لەنگییە.

خۆم کە زۆر چاک شارەزاهەم لەم خوە ئەی (نم/١، نن، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣، نووسەر): هیچ کەس نەتناسێ خۆم چاکت دەناسم – ئەمە جگە لەوەی کە لە (نم/١، نن، نووسەر)دا لە جێی (هیچ کەس) بە(هیچ کەسی) نووسراوە و لە (نم/١)دا لەباتی (دەناسم) نووسراوە (اناسم) کە هەموو ئەمانە لەگەڵ پاشبەندەکانی هەڵبەستەکەدا ناگونجێن و لە هەڵبەست ناچن و شێواوییەکی زۆریان تیایە.

٥– بەزوودی: بەزوویی، بەخێرایی، بەگورجی، دەستبەجێ.

جێبەجێ: دەستبەجێ، گورج، کتوپڕ، خێرا.

یەعنی: واتە.

مەستم: سەرخۆشم – (بەدمەست) ئەوی کە لە سەرخۆشیدا بکەوێتە زمان درێژی و گێچەڵکردن و بەهانە لە خەڵق دۆزینەوە و خراپەکردن و تێکچوون و جنێودان.

پیاڵەم پڕ بووە: دیاردەی پەندێکی پێشینان یا ئیدیۆمێکی کوردییە کە ئەڵێ (کاسەی پڕ بووە) واتە لە خۆی دەرچووە و قەیرانی هاتووە – (کوردی)ش دڵە پڕ خوێنەکەی خۆی کە داوە بە(ماهڕوو)ەکەی کە لە بەدمەستییبا کاسەی پڕ بووە و دەیەوێ نەمێنێ.

بەزوودی (گ/٢، س، نووسەر): بەزوویی – ئەمیش دەسکارییەکی نوێیە.

یەعنی (گ/٢، س، گ/٣): باعثی.

بەدمەستم (نم/١، ف، کم): بد مستیمە.

بەدمەستم (گ/٢، س، گ/٣): بەدمەستیە – ئەمیش لەنگە.

پیاڵەم پڕ بووە (نم/١، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣): دەشکێنم پیاڵە.

پیاڵەم پڕ بووە (نن، نووسەر): دەشکێنم پیاڵەی مەی – ئەمیش لەنگە و هەموو سەرچاوەکانی (نم/١، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣، نووسەر) بەشێواوی وەریان گرتووە کە لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ و لە هەڵبەستیش ناچێ و لەنگن.

٦- ئەم تاکی شەشەمینە تەنیا لە (عن، گل/٦، گل/٩)دا هەیە و لەوانی ترا نییە و لەم سێ سەرچاوەیەشدا شەشەمینە و هێشتە چاپیش نەکراوە. لە ڕاستیشدا سەرچاوەکانی تر کە هەموو شەش تاکی بەپێی وێژەی کۆن ناتەواوییە، چونکە ژمارەی (شەش) جووتە و پێویستە ژمارەکانی هەڵبەست تاک بێ.

سەرسام (گل/٩): حەیرانم.

٧- بەی: بەهێ – ئەشێ ناوی ئەو ماهڕووە بێ کە دوور نییە سنەیی بووبێ ناوی (بەهێ) بووبێ.

زەردی دەردی تۆیە کوردی و پێی دەڵێی بێنە بەهێ (گل/٦، نن، ف): ڕەنگی زەردت دیم دەڵێی کوردی بڕۆ بێنە بەهێ. – شێواوی بەمەیشەوە دیارە.

زەردی دەردی تۆیە کوردی و پێی دەڵێی بێنە بەهێ (نم/١، کم): ڕەنگی زەردیت دیم و دەڵێی کوردی بڕۆ بێنە بەهێ – ئەمیش دەسکارییە و لەنگە و شێواوە.

زەردی دەردی تۆیە کوردی و پێی دەڵێی بێنە بەهێ (گ/٢، س، گ/٣): ڕەنگی زەردیت دیم دەڵێی کوردی بڕۆ بێنە بەهێ.

زەردی دەردی تۆیە کوردی و پێی دەڵێی بێنە بەهێ (نووسەر): ڕەنگی زەردت پێم دەڵێ کوردی بڕۆ بێنە بەهێ.

وەختی بەی کوا بەسیەتی ئەم بیانووە ئەی (نم/١): بەس بیانوو بگرە وەختی بهی کوانی – ئەمیش لەنگە و شێواوە و لەگەڵ پاشبەندا ناگونجێ.

وەختی بەی کوا بەسیەنی ئەم بیانووە ئەی (ف، کم، گ/٢، س، گ/٣، نووسەر): بەس بیانوو بگرە وەختی بەی کوانێ – ئەمیش شێواوییە و لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ، ئەم تاکەش لە هەمووواندا دوا تاکە.

٥٤

## شەوی یەڵدایە

١- شـــەوی یەڵدایە، یا دەیجـــوورە ئەمـــشـــەو،

کـــە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەمـــشـــەو

٢- دڵم وەک حـــاکـــمـی مـــەعـــزوولە قـــوربان

خـەڵاتـی وەصـڵی تۆی مـەنظوورە ئەمـشـەو

٣- کـە تۆی شـای کـەچ کـولاهـی دیدەمـەستـان

چ باکم قـەیصـەر و فـەغـفـوورە ئەمـشـەو

٤- ســروشکم نەخـشـی ناوی تۆ دەکـێـشـێ،

کە جێم سەرداریيەکەی مەنصوورە ئەمشەو

٥- دڵـیش مـــــــــائیل بـەدیدەی تـۆیە بـۆیە

لە من وەحـشـی و ڕەمیـدە و دوورە ئەمـشـەو

٦- لە خـــــەو هـەڵســـاوی؟ یا ئاڵۆزە چاوت؟

هەمـیـشـە وایە؟ یا مـەخـمـوورە ئەمـشـەو؟؟

٧- لە دووریت؛ من وەکـــو بولبـــول دەناڵم،

بەوەصـڵت عـالەمێ مـەسـروورە ئەمـشـەو

٨- ســـوپای مـــوژگـــان، بەتیـــغی ئەبروانت

شکسـتـەی فـیـرقـە و طابوورە ئەمـشـەو

٩- ئەگـــەر یاران دەپرسن حـــاڵی (کـــوردی)

لە کـونجی بێ کـەسی مـەهجوورە ئەمـشـەو

---

١- یەڵدا: وشـەیەکی (سـوریانـی)یە، بەواتە لە دایکبوون و نیشـانەیە بۆ لە دایکبـوونی حـەزرەتی عیسا، کە لەو شەوەدا بووە (شەوی یەڵدا) دوا شەوی وەرزی پایز، کە درێژترین شەوە، لێرەدا کە نیشانەی بۆ کراوە، لەبەر درێژی و درەنگ بڕینەوە-کەیەتی... و یەکەم شەوی لە دایکبوونی زستانیشی مەبەستە.

دەیجوور: شەوی زۆر تاریک: یا: زۆر تاریکی.
دوور لە تۆ: ئەوپەڕی خۆشەویستی پیشان دەدا کە لەو شەوە تاریک و خەفەتباری درێژ و ناخۆشی و بێ نووریی چاوی خۆیدا کەوا ناوی ئەمانە دەبات و دەڵێ ئەمانە و بێ نوورییەکەی چاوم دوور بن لە چاوی تۆ ئەی خۆشەویستەکەم و، ئەمەش (کینایە = ئیدیۆم)ێکی کوردییە و بەزۆر بۆنەوە، لە گەلێ شوێندا بەکار دەهێنرێ.
ئەم هەڵبەستەی سەرەوە مایەی کێشەیەکی زۆر و درێژی نێوان گەلێ سەرچاوەی دەسنووس و چاپکراوان و ڕۆشنبیرانمانە کەوا هەندێ بە هی (کوردی) و هەندێکی تریش بە هی (نالی)یان داناوە. بەڵام لای من، بە هی (کوردی) ساغ بووەوە بۆیە لێرەدا جێگیرم کرد و ئەمیش سەرچاوەکانن.
ئەو سەرچاوە دەسنووسانەی کە ئەم پارچە هەڵبەستەیان بەهی (کوردی) داناوە و (١٠) کەشکۆڵن و ئەوانیش: (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، ما، ما: نسخە، نن، نم/١، ر، دەسنووسێکی کۆنی لای مامۆستا جەمال محەمەد وەک لە گۆڤاری بەیان ژمارە/٦٤ی تەممووزی ساڵی/١٩٨٠دا نووسیویە، هەرچەندە لەسەر دیاریکردنی خاوەنی ئەم هەڵبەستە مامۆستا (جەمال) خۆی بێ لایەن و حوکم نەدەر داناوە و حوکمی ئەمەی داوەتە دەست خوێندەواران. کە بڕیار بدەن جگە لەو سەرچاوانەی کە ناوم بردن، شەش سەرچاوەی چاپکراویش ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیان بە هی (کوردی) داناوە کە ئەوانیش: (کم، گ/٢، س، گ/٣) وە سەرچاوەی (ت) لە (دیوانی نالی) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا فاتیح عەبدولکەریم و مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمدا کە هەڵبەستەکەی داوەتە پاڵ (کوردی)، هەروەها (دوکتۆر مارف خەزنەدار)یش لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان ژمارە/٣٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٥ و کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦دا لەسەر ئەوە سوورە کە هەڵبەستەکە هی (کوردی)یە و هی (نالی) نییە. لە لایەکی ترەوە، شەش سەرچاوەی دەسنووسی کەم لە بەردەستدایە کە هەموو ئەم هەڵبەستە بەهی (نالی) دەزانن و ئەوانیش: (ف، ش، عق، ف/١، ق/٤، حم)ن. ئەمە بەبێ ئەوەی کە لە پێنج سەرچاوەی چاپکراویشدا ئەم پارچە هەڵبەستە کراوەتە هی (نالی) کە ئەوانیش (دیوانی نالی – چاپی دووەمین لە لایەن مامۆستا گیو موکریانییەوە) (دیوانی نالی + مامۆستا مودەڕیس)ی ناوبراو و کوڕەکانی کە ئەویش بەپێی حەوت سەرچاوە کە دیاری کراون لە لاپەڕە/٣٨٧یدا و، مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغیش لە دوو ژمارەی گۆڤاری (بەیان)ی (٦٢)ی ساڵی ١٩٨٠ و ٦٩ی ساڵی ١٩٨١ لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێی) ژمارە/٥٠ی ساڵی ١٩٧٦دا پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە ئەم پارچە هەڵبەستە هی (نالی)یە و پشت بەم سەرچاوانە دەبەستێ کە بەهی (نالی)یان داناوە، هەروەک مامۆستا مودەڕیس و کوڕانی لە دیوانە ناوبراوەکەدا نووسیویانە (لامان وایە لەبەرئەوە کراوە بەهی (کوردی) چونکە (کوردی) چەند پارچەیەکی تری لەم هەوایەی هەیە). منیش لەو

گۆشـەیەوە دەڕوانمە بڕیاردان کـە بـوونی هەڵبـەسـتی تری (کـوردی) لەم هـەوایە بەڵگەیەکی ئەوەندە بەهێز نییە، کە هەڵبەستەکە هی ئەو بێ، یان هی ئەو نەبێ، چونکە لە دیوانە چاپکراوە کوردییـەکاندا، زۆر هەڵبەسـتی هاوچەشن و یەک هەوا هەن کـە هەریەکەیان بەناوی یەکێکی کـەوە نووسـراون و نەکـراونەتە هـی یەک کـەس، بۆیە پەنا دەبەمـە بەر ئەو وردەکـاری و خـەسـتـوخـۆڵی و یاری بە وشـەکردن و بەپێچ و پەنا بڕینی (نـالی) و سـەرنجێک بـۆ ئەم پارچە هەڵبـەسـتـەی سـەرەوە دەکـێـشـین کـە ئەو مـۆرکـە تایبـەتیـیـەی (نالی) بـەتێکڕایی لـەم پارچە هەڵبـەسـتـەدا ڕەچاو ناکرێ، ئەوەندەی ڕەوانی و سـادەیی لەم هەڵبـەسـتـەدا هـەن کـە ئەوانیش ڕواڵەتی مـۆرک و شێوەی دەربڕینی (کوردی)ن، لەبەرئەوە بەهـی (کـوردی)م دانـا و هەتا بەڵگەی بەهێزتریش بۆ (نالی) دێتە کایەوە با هی ئەم بێ.

لە ناو سەرچاوەکاندا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە.

شەوی (ر): شب.

کە دیدەم (ر): لە دیدم.

دوور لە تۆ (ر): دور تو.

**تێبینی:**

لە نێوان سەرچاوەکاندا (ما) کە ئەم هەڵبەستەی لە دوای هەڵبەستێکی (بیمار)ەوە، نووسیوە و لە سـەرەتای ئەم هەڵبـەسـتـەشـدا (وَلَهُ = ئەمـیش هی ئەوە) و بەهـی (بیـمار) بەڵام کە دوا تاکی هەڵبەستەکە دەبینرێ نـازناوی (بیمـار)ی پێوەیە، بەشکو نازناوی (هیـجری)ی پێوەیە کە وەک ورياکردنـەوەیەک ئەمەشم نیشانەم بۆ کرد، نەبا یەکێکی کە بە هی (بیمار) وەربگرێت، چونکە (محەمەد ئەسوەد) لە کەشکۆڵەکەیدا (ما) هەڵەی کردووە. لە دیاریکردنی خاوەنی هەڵبـەستەکە و سـەرنجی ئەوەی نەداوە کـە لـە کـۆتاییی هەڵبـەسـتـەکـە نـازناوی (هـیـجـری)ی پێـوەیـە کـە نازناوێکی تری (کوردی) و بەواتای ئەوەیە کە ئەم هەڵبەستەی لە دەرەوەی (کوردستان) داناوە چونکە نەریتی کـوردی، وەها بووە هـەر هەڵبـەسـتـێکی لـە کـوردسـتـاندا دانا بێ، نـازناوی (کوردی)ی تێ هاویشتووە.

٢- حاکم: فەرمانڕەوا.

مەعزوول: لە کار دەرکراو، کەنارەگیر، نیشتەماڵ، خانەنشین.

خەڵات: پێشکەشکردنی شتێ دڵ پێی خۆش بێ، دیاری.

مەنظوور: چاوەڕێ، ڕەچاو، بەرچاوگرتن، مەبەست.

ئەم تاکە لە (مـا: نسـخـە)دا نییـە و لەوانی تردا دووەمین تاکی ئەم هـەڵبـەسـتـەیە و لە (ق/٤)دا پێنجەمینە.

مەعزوولە: (ف، عق، ما، نم/١، حم): مغدورە.

مەعزوولە (نن): معذولە.

مەعزووله (ر): مغروره.

مەعزووله (ش): معزوره و له پەراوێزیشەوه نووسراوه: نسخه – معزوله.

خەڵاتی (عق): خلات.

خەڵاتی (ما): خلاط.

تۆی (ر، حم، نگ): تو.

هەروەها مامۆستا قەرەداخی له وەڵامی (مامۆستا جەمال محەمەد)دا نووسیویه که نوسخەکەی (مامۆستا جەمال)یش (مەغدوره)یه.

بیری ئەم تاکەی سەرەوەش لەوەوه هاتووه که هەر والییەک له کارەکەی لادەبرا (مەعزوول دەکرا) خۆی دەگەیانده لای سوڵتانی عوسمانی دیاری و بەرتیلی باشی خۆی بدایه، خەڵات دەکرا و دەخرایەوه جێگەکەی خۆی (کوردی)یش ئەو خەڵاتەی له خۆشەویستەکەی لەو شەوەدا دەخوازێ.

٣- شای: پادشاهی.

کەچ کولاه: کڵاو لار.

دیده: چاو، دیدەمەستان، چاوەمەستان.

چ باکم: چ دەربەستم.

قەیصەر: پادشای کۆنی ڕووس (قەراڵ) و ڕۆم بەڵام ڕۆمی عوسمانی نا.

فەغفوور: ناوی پادشاکانی (چین)ه واته (خاقان).

ئەم تاکه له (ما: نسخه)دا دووەمینه و له (ما، نم/١، عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف)دا سێیەمینه و له (نن، نع: نسخه، ش، عق، حم، ف/١، نگ، نع)دا چوارەمینه و له (ر) و (ق/٤)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچه هەڵبەستەیه و لەوانی تردا نییه.

کولاهی (ش، ما): کڵاو – له دەسکاری دەچێ.

کولاهی (عق، ق/٤، نگ): کڵاو و.

کولاهی (ما: نسخه): کلاه.

قەیصەر و فەغفووره (نگ): قەیسەر و فەخفووره.

قەیصەر و فەغفووره (ر): قیصره و فخفوره.

قەیصەر و فەغفووره (گ/٢، س، گ/٣): قەیسەر و فەغفووره.

قەیصەر و فەغفووره (حم، ما): قیصر و مغفوره.

٤- سروشک: فرمێسک، ئەسر، ئەسرین، ڕۆنتک.

بیری ئەم تاکه هەڵبەستەی (کوردی) دیاردەی ئەوەیه که کاتێ مەنصووری هەلاجیان دەکوشت و خوێنەکەی دەڕژا، گوایه: ڕێچکەی خوێنەکە ناوی (الله)، یا ئەو، وته بەناوبانگەی مەنصووری دەکێشا که بەبەهانەی ئەو وتەیه کوشتیان ئەویش (انا الحق) بوو.

(کوردی)یش کە زۆر شێفتەی (مەنصووری هەلاج) بووە و لە زۆر جێی تری هەڵبەستەکانیدا ناوی بردووە و نیشانەی بۆ کراوە و لێرەدا خۆی وا داناوە کە ئەو شەوە جێگەی: سەردارەکەی (سێدارەکەی) وە یا (سەردارییەکەی) واتە شوێن و پایەی گەورەیی و پێشەوایی (سەرداری) لە شەهیدی و (خۆبەختکردن لە ڕێی: (حەق) و (حەق بێژی)؛ (صۆفیەتی) و (عاشقی ڕاستی و)... هتددا پێ براوە ئەمیش وەک مەنصوور لەو (سەرداری)یەیدا فرمێسکەکەی بەچۆڕاوگە نەخشی ناوی خۆشەویستەکەی دەکێشێ لەو کاتی (کردن بەدارا و) کوشتنەی ئەو شەوەیدا لە پایەی (سەردارێتی) وەک مەنصووریدا.

لە کۆنەوە هۆنەرانیش لە ژێر گەلێ پەردەی صۆفیگەری و دڵداری و ڕامیاری و... هتددا ئەم بیرەیان دەربڕیوە بەجۆرەها شێوە، لەوانە تاکە هەڵبەستێکی حافظی شیرازییە کە لە چاپی تارانی/٣٢٤یدا لە لاپەڕە/٤٦یدا گوتوویە:

«کشد نقش انا الحق برزمین خون

چو منصور، ار کشی بردارم امشب»

واتە:

«ئەنالحەق نەخشەکێشێ، خوێن لەسەر خاک

وەکو مەنصوور، لە دارم دەی کە ئەمشەو» – حەمەبۆر –

جا وەک دەردەکەوێ کە بیر و شێوەی دەربڕین و کێش و پاشبەندی ئەم هەردوو هەڵبەستەی (کوردی) و (حافظ) لە یەکترییەوە زۆر نزیکن و هەرچەندە (کوردی)ش وەستاییی وێژەوانی و زمانزانیی خۆی تیا بەکار هێناوە، بەڵام چێژ وەرگرتنی لە (حافظ)، چ لێرەدا و، چ لە شوێنی تردا کە جار جارە نیشانەم بۆ کردووە، ئاشکرایە بەتایبەتی کە (سروشتی) ئەم هەردوو هۆنەرە هاونەژادی بووە.

ئەم تاکە لە (ر)دا سێیەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف، ق/٤)دا چوارەمینە و لە (نن، حم، نع، نع: نسخە)دا شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە و لە (حم)دا دوا تاکی هەڵبەستەکەیە.

نەخشی (ف، حم، نن، نم/١، کم، نع، نع: نسخە): نەقشی – یا (نقشی).

نەخشی (ر): نقش.

ناوی (ر، نن، حم، نع، نع: نسخە): چاوی.

بەپێی سەرچاوە کۆنەکان و بەپێی ئەوەی (کوردی) نیشانەی بۆ کردووە و، وەک لێکم دایەوە خوێنەکەی مەنصوور نەخشی ناوی (الله)ی نووسیوە و ئەمیش بەو پێیە لە چۆڕاوگەی فرمێسک نەخشی ناوی خۆشەویستەکەی دەنووسێ نەک (چاوی).

تۆ دەکێشێ (ر): اوکیشی – ئەمەش هەڵەیە.

کە جێم (ف): جێگە – ئەمیش لە ڕووی زمانییەوە کووڕ و لە کێشا لەنگە.

کە جێم (ر، نن، حم، ق/٤): جێگەم – ئەمیش کوورِ و لەنگە.
کە جێم (گ/٢، س): جێگا – ئەمیش لەنگ و کوورِە.
کە جێم (گ/٣): جێگای – ئەمیش لەنگ و کوورِە و نابێ.
کە جێم (کم، نع، نع: نسخە): جێگام – ئەمیش کوورِ و لەنگە.
سەرداریيەکەی (ق/٤، گ/٢، س، گ/٣): سێدارەکەی.
سەرداریيەکەی (ف، نم/١، نن، حم، کم، نع، نع: نسخە): سەردارەکەی.
سەرداریيەکەی (ر): سرداریک.
٥– مایل، (مائیل): بەرەو، ڕووەو، ڕوو لە شتێک بوون، ئارەزووکردن...
وەحشی: کێوی، مەبەستی لە (تەرین = تەربوون، رەوین)ە.
ڕەمیدە: سڵ، ڕوو کردوو – ئەم (وەحشی و ڕەمیدە)یە لە دوای دڵ مایل بەدیدە (چاو) بوونە نیشانە بۆ ئاسک و جوانیی چاوەکانیەتی کە ئەمە لە وێژەی کۆندا وەستایی و جوانییە.
ئەم تاکە لە (نن، نع، نع: نسخە، ف/١، ش، عق، ق/٤، حم، نگ)دا سێیەمینە و لە (ر)دا چوارەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف) پێنجەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.
مائیل (ف، عق، نم/١، نن، نگ، نع، نع: نسخە، کم): مایل – و هەردووک یەکن و ئەمیان سووککراوەی (مائیل)ە عارەبییەکەیە.
بەدیدەی (نم/١): یدیدەء.
بۆیە (ر): بویی.
وەحشی (ر، عق، کم): وحش و.
وەحشی و (نن، حم): وحشی.
ڕەمیدە و (کم): رمیدە.
ڕەمیدە و (گ/٢، س): ڕەمین و – ئەمیش لە دروستکراو دەچێ و واتە نادات.
ڕەمیدە و (گ/٣): ڕەمی و – دیسان واتە نادات و ڕەنگە دروستکراو بێ.
ڕەمیدە و (ن): رمیدەء.
وەحشی و ڕەمیدە و (نم/١): وحشی رُمیدە و.
دوور (ر): زویر – ئەمیش هەرچەند واتە دەدات بەڵام لەگەڵ پاشبەندەکاندا ناگونجێ.
٦– لە خەو هەڵساوی: مەبەستی چاوی خەواڵووە کە کەسێ تازە لە خەو ڕابووبێ (بێدار بووبێ) چاوی جۆرە جوانییەکی (خەواڵوویی) هەیە.
ئاڵۆزە چاوت: مەبەستی کاریگەریی چاوەکانیەتی و بەپێی دڵی (کوردی) ئاڵۆزییەکی بووە.
مەخموور: بەخومار، سەرخۆش، مەبەستی لە چاوەکانیەتی وەک چاوی سەرخۆشە کە جۆرە نەرمی و جوانییەکی هەیە (چاوی بەخومار).

ئەم تاکە لە (نن، عق، حم، نع، ما)دا پێنجەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، مع، مع: نسخە، ف)دا شەشەمینە و لە (ق/٤، ر)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە وە لە (عق)دا دوا تاکی هەڵبەستەکەیە.

هەڵساوی (نن، حم، نع، نع: نسخە): هلساوە (هەڵساوە) وە لە سەرچاوەیەکی (نع)دا بەنیشانەی (چر) ناوبراوە بەوشەی (هەڵساوی) نووسراوە.

هەڵساوی (ما، عق): هستاوی.

لە خەو هەڵساوی (ر): لخو هستا – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

چاوت (ف، ر): چاوی.

٧- بەوەصڵت: بەگەیشتنت، بەپێک گەیشتنت.

عالەمێ: جیهانێ – بەڵام مەبەستی خەڵکی ئەو ناوە بووە، یا ئەوانی پێیان زانیوە.

ئەم تاکە وەها دەگەیەنێ کە (وەصڵ)ەکە (گەیشتن)ە نەک (پێک گەیشتن)ی ڕەگداری و جنسی بەشکو مەبەس لە هاتنەوەی یەکێ لە گەورە پیاوان و خۆشەویستی هەمووان بووە، بەڵام کێ بووە؟ ئەوەم بۆ ساغ نەبۆتەوە.

ئەم تاکە لە (ق/٤)دا دووەمینە و لە (ما: نسخە)دا سێیەمینە و لە (ما)دا چوارەمینە و لە (ر)دا پێنجەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٩، نم/١، نن، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.

بەوەصڵت (ما): لوطفت.

دەناڵم (نم/١): انالم.

٨- موژگ: برژانگ (موژگان): برژانگەکان.

فیرقە و طابوور: هەردوو ناون بۆ کۆمەڵێکی مەزن لە سوپا.

ئەم تاکە لە (ما: نسخە)دا چوارەمینە و لە (ر)دا پێنجەمینە و لە (ما، ق/٤)دا شەشەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، نم/١، نن، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.

سوپای (ما: نسخە): سپاه.

موژگان بە (ف، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): موژگان و.

موژگان بە (ما: نسخە، ر): مژگان.

تیغی (گ/٣): تیخی. دەسکاریی (گیو)ە.

تیغی (ما: نسخە): تیغ.

شکستەی (ما، ما: نسخە): شکستەء.

فیرقە وو (ما، ما: نسخە): فرقەء.

فیرقە وو (کم): فرقەی.

فیرقە وو (ف، گ/٢، نم/١، س، گ/٣): فیرقەیی.

فیرقە وو (ق/٤): لشکر.

فیرقە وو (ر): فرقی.

طابوورە (ما): تابورە.

٩- کونج: گۆشە، سووچ، قوژبن.

بێ کەسی: مەبەسیی دووری بوو لەو کەسەی کە ئەم هەڵبەستەی پیا هەڵداوە و ئەو شەوە هاتووەتەوە و تێی گەیاندووە کە بەبێ ئەو بێ کەس بووە و ئەوی بە(یاران) ناوبردووە کەوا یەکێ بووە لە یارانی، و یا دەنگی یارانی لەو هاتنەوەیە داوە.

مەهجوور: دوور، پشتگوێخراو و مەبەسیی ئەوەیە بەهاتنەوەی ئەو خۆشەویستە ئیتر لە گۆشەی بێ کەسی (دوورکەوتووەتەوە – مەهجوور بووە).

ئەم تاکە لە (ما: نسخە، ف/١، ش، نگ)دا پێنجەمینە و لە (ما، نع، نع: نسخە)دا حەوتەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٩، نم/١، ر، نن، کم، گ/٢، س، گ/٣، ف، ق/٤)دا نۆیەمینە و لەم هەموو سەرچاوانەشدا دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.

جوانیی ئەم تاکە هەڵبەستە لەوێدایە کە سەرزاری وا دێتە بەر بیر گوایە کە (کوردی) وتوویە لە کونجی بێ کەسیدایە و مەهجوورە بەڵام ئەم دەربڕینە یاریکردنێکی زمانی و فێڵێکی تیایە، چونکە ئەو وای مەبەست نییە بەشکو دەڵێ: لە کونجی بێ کەسی مەهجوورە، واتا ئیتر بەهاتنەوەی ئەو بێ کەسییە و لەو کونجەدا کە جاران تیا بێ کەس بووم، ئێستە ڕەوی کردووە. ئەمەش جوانییەکی وێژەیییە.

ئەگەر یاران (ف/١، ش، ق/٤، نگ، نع، نع: نسخە): موسوڵمانان (مسلمانان).

دەپرسن (ر): بپرسن.

حاڵی (ما): حال.

کوردی (ف، ما، نن): هجری و ئاستی (هیجری) دەبی چونکە خۆشەویستەکەی هاتووەتەوە نیشتمان.

کوردی (ف/١، ش، ق/٤، نگ، نع، نع: نسخە): نالی – ئەمەش هەڵەیە.

لە کونجی (ر، ما، ما: نسخە): لکنج – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

مەهجوورە (ر): مخمورە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (س)دا پەڕیوە و بەر چاپ نەکەوتووە.

٥٥

## لە غەم شاری دەروون

١- لە غـەم شـاری دەروون، مـەعـمـوورە ئەمـشـەو
بناغـەی مـولْکی دڵ خـاپوورە ئەمـشـەو

٢- ڕەوانسـەر بوو لە زێدی من فـەرەنگی
لە بەردەرگـای ڕەقـیب مـەسـروورە ئەمـشـەو

٣- ئەمن فـەرهاد و شـاهیـد بێسـتـوونە،
ئەتۆ شـیـرین، شـەمـاڵ؛ شـاپوورە ئەمـشـەو

٤- لە وەصـڵت مـەنزیلی دوورکـەوتەوە، دڵ
دوو صـەد مـەنزیل لە شـادی دوورە ئەمـشـەو

٥- برا گـیـان، گـیـان و تۆ؟ گـیـان ئەلویدایە
هەوای کۆی (تۆ) و (دیگەر)، مەستوورە ئەمشەو

٦- بەمـوژدەی وەصـڵی تۆ دڵ شـاد بێ حـەقـیـە
کـە هەروەک حـاکـمی مـەغـدوورە ئەمـشـەو

٧- لە من نافکرێ ئەغـیـار، ئەی چ گـەوجـە،
بەوەصـڵی لوطفی تۆ مـەغـروورە ئەمـشـەو

٨- لەتاو ئاسکۆڵە ڕەوتەی چاو شـەهێنم
دڵ بەئاه و واز و چاو بێ نوورە ئەمـشـەو

٩- لە صـوبحی، عـیـد و شـەوقی مـانگەشـەو، ئاخ
لە بەخـتی من وەها دەیجـوورە ئەمـشـەو

١٠- بە(حـاضـرباش)ی (فەوجی غوصـصـە) ناڵەم
وەکـو (زیلە)ی (ئەوەڵ شـەیپـوور)ە ئەمـشـەو

١١- لە ناڵین مـەنعی (کـوردی) مـەحـضی کـوفـرە
فـەقـیـر و، ناخـۆش و مـەعـزوورە؛ ئەمـشـەو

١– مەعموور: ئاوەدان، کە مەبەستی لە کاولبوونە لە غەمباریدا.
بناغە: بنچینە.
مولّک: ولاّت. مەبەست لەو خاکەیە هی ئەو یا هی هەر کەسێکە و نەک نیشتمان کە (شوێن نیشتەنی)یە.
خاپوور: وێران، کاول، تەخت و تاراج تێکدراو.
لێرەدا جوانیی دەربڕین و وەستاییی (کوردی) خۆی دەنوێنێ کە (ئاوەدان) و (خاپوور) دژی یەکدیشن و کەچی هەردوویانی بۆ مەبەستی ناخۆشی و چۆڵەوانێتی و بەسەریەکدادراوی دەربڕیوە و لە وێژەی کۆندا پەسەند و، وردەکارییە.
ئەم پارچە هەڵبەستە هەرچەندە گومان لەوەیدا نییە کە هی (کوردی)یە و مۆرک و شێوەی وتنی ئەوی پێوەیە، بەلاّم دەبینرێ کە وەک زۆربەی هەڵبەستەکانی تری بەسەریا زاڵ نەبووبێ وایە، لە یەکالاّکردنەوە و، لە لێکدانەوەیدا پڕ بەپڕی و دەرخستنی بۆنەی و... هتدی وەک یەک نییە و لاوازە. بەتایبەتی لە تاکی دووەم و هەشتەم و... هتدیدا ئەمە دیارە و شێواوە.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (گل/٦، یح، ف، نم/١، ق/٤)ە لە دەسنووسدا و لە سەرچاوە چاپکراوەکانیشیان (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە نێوان ئەم سەرچاوە کەمەشدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
هیوادارم، کە لە پاشترا، ئەم پەردەی تاریکییەی لەسەر لابدرێ، وە ڕوون ببێتەوە، وەک زۆربەی هەڵبەستەکانی تریم ساغ کردنەوە و تاکو ئەمیش کەڵکی کەلەپووری و وێژەیی و مێژوویی هەبێ.
مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی پاشبەندەکانی ئەم هەڵبەستەی لە (ق/٤)یدا بەشێوەی ئیمشەو نووسیوە کە ئەمیش لە لاپەڕە (٣٠٤)ی مەلا عەزیزی هەڵەبجەیی وەری گرتووە و ئەمەش شێوە (فارسی)یە بەکوردی (ئەمشەو)ە.
٢– وەک لە پەراوێزی تاکی پێشوودا نیشانەم بۆ کرد، ئەم تاکەی ئاڵۆزە و بۆم ساغ نەکرایەوە، بەتایبەتی لە نیو باڵی یەکەمیدا کە وشەی (ڕەوانسەر) و (زید = نیشتمان) و (فەرەنگی = فەرەنسی یا ئەوروپی)ی لێک داوە و لەگەڵ ئاشکرایی و ڕەوانی نیو باڵی دووەمیدا واتای ڕووناک و دڵ دامرکێن ناگەیەنێ، وەک هەر تاکێکی تری (کوردی) ناگونجێن و لیژنەی کۆڕی زانیارییش لە ساغکردنەوەیدا تەقەی سەریان دەهات و هەر وا مایەوە.
ئەم تاکە و هەتا تاکی نۆهەمیش لە کەشکۆڵی (گل/٦)دا تەنیا یەک هەتا سێ وشەی سەرەتای هەر تاکێک ماونەتەوە و ئیتر ئەو لاپەڕەیەی ئەم هەڵبەستەی تیا نووسراوە، پەرپووت بووە و هەڵوەریوە و ناخوێندرێتەوە، (ڕەوانسەر)یش سەر ئۆستان (پارێزگای)ی کرماشانە لە نێوان ماهیدەشت و جوانڕۆدایە.
ڕەوانسەر (گل/٦، یح، ف/١): روانسر – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
بوو (گ/٣): بۆ.

له زێدی (گل/٦، یح، ف، ق/٤): له زیدی.
له زێدی (گ/٢، س): له زێدی.
له زێدی (گ/٣): له زیددی.
من فەرِهنگی (گل/٦، یح): من فرنکی.
من فەرِهنگی (نم/١، ف، ق/٤، گ/٢، س): من فەرهنگی.
من فەرِهنگی (کم): من فرهنگی (فەرِهنگی، یا فەرِهنگێ) چونکه ڕێنووسەکه کۆنه.
من فەرِهنگی (گ/٣): من فەرهنگی.
ئەم شێوه سەرچاوانەی سەرەوه و جیاوازییەکانیانم (بۆیه نووسین) که وەک بناغەیەک بێ بۆ وێکەوتن و پتر ساغکردنەوەی نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوه که هێشته بەجۆرێک بۆم ساغ نەبووەتەوه که دڵ ئاوی پێ بخواتەوه و لەگەڵ نیو باڵی دووەمیدا بگونجێ.

٣- فەرهاد: ئەو دڵدارەی شیرینه که کێوی بێستوونی هونەرمەندانه هەڵکۆڵی و کردیه شوێنەوار و نەخش و نیگار له خۆشەویستیی شیریندا، هەروەک شاپووریش هاواڵی خوسرەو و، وێنەکێشێکی بەتوانا بووه یەکەم جار وێنەی شیرینی بۆ خوسرەو و هی ئەوی بۆ شیرین کێشاوه و بووەته مایەی ئەوەی بەدڵی تردا بچن، وەک فێنکیی شەماڵ له نێوان هەردوویاندا بووه.

٤- مەنزیلی (یا – مەنزڵێ) یا مەنزڵێ: که له ڕێنووسی کۆندا تەنیا بەشێوەی (منزلی) دەنووسرێ، مەبەست له شوێنەواره و لەم تاکەشدا هەرسێ شێوه ڕێنووسە نوێیەکەی و هەرسێ واتاکەی دەگونجێن چونکو ئەگەر مەبەستی (مەنزیلی) ئەو واته مەنزیلی (شوێنەواری) دڵ بێ، یا ئەگەر مەبەستی (مەنزیلێ = مەنزیلێک، شوێنەوارێک) وه یا (قۆناغێک له ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوه) بێ ،ئەوا هەرسێ واتەکه بۆ ئەم تاکه دەشێن و (کوردی) ئەو مەنزیلەی (یەک بەدوو صەد) داناوه وەک له نیو باڵی دووەمیدا، ئەمه دیاری دەکات.
مەنزیلی (یح): عالمی.
ئەم تاکه له (ق/٤)دا نییه و له جێگەی ئەم تاکه تاکی چوارەمینی هەڵبەستی پێشوو (شەوی یەڵدایه)ی نووسیوه بڕوانه ئەوێ. کەوا ئەو تاکەی ئاوێتەی ئێره کردووه.

٥- گیان و تۆ: مەبەسی گیانی خۆی و ئەو (خۆشەویستەکەی)یەتی.
گیان ئەلویدا: لێکجوێبوونەوەی گیان – واته جیایی من و تۆ وەک جیابوونەوەی گیان (دوعاخوازی کردن له گیان) و چونکه ئەو بایەی له لای تۆ (ئەو خۆشەویستەوه) دێت، ئیتر بەری گیراوه، شاردراوەیه (مەستووره).
کۆی: شوێنی، لای.
دیگەر: ئیتر، ئیدی، ئیکه، هی که، بێگانه، خەڵکی تر.
مەستوور (یا: مەستووره): شاردراوه، داپۆشراو، پەنهان. بەڵام ئایا مەبەستی (مەستووره خانم = ماه شەرەفخانمی ئەردەڵانی یا کوردستانی هۆنەری کورد) نەبووبێ کەوا (نالی)یش

هەڵبەستەکەی بەسەرا هەڵداوە و هاوچاخ بوون؟.

ئەم تاکە لە (ق/٤)دا نییە و لە هەموو سەرچاوەکانی تردا پێنجەمینە و لە جێگەی ئەم لە (ق/٤)دا تاکی دووەمینی هەڵبەستی پێشوو نووسراوە.

کۆی تۆ و دیگەر (کم): کوی تو دگر.

کۆی تۆ و دیگەر (نم/١): کوی تو دەگر.

کۆی تۆ و دیگەر (یح): کوی توی دکرد.

مەستوورە (یح): دستورە.

٦- مەغدوورە: ستەم لێکراوە، ماف خوراوە، زۆر لێکراوە، جاری تریش ئەم (حاکمی مەغدوور)ەی ڕاگەیاندووە کە ئەو سایە ستەم لە (حاکم = پاشا)کان کراوە.

مەغدوورە (یح): مغدورە - وە بە(مغدورە)ش دەخوێندرێتەوە.

ئەم تاکەش لە (ق/٤)دا نییە و لە جێگەی ئەم تاکی هەشتەمینی هەڵبەستی پێشوو نووسراوە. وە لەوانی تردا شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

٧- نافکرێ: بیر ناکاتەوە، سەرنج نادات، ناڕوانێ.

ئەغیار: بێگانان - بەڵام لە عەرەبیدا ئەم وشەیە بۆ (کۆ = جەمع) واتە بێگانەکان لەگەڵ ئەوەدا لە کوردیدا مەبەست لە (کۆ = جەمع) نییە و بەشکو مەبەست لە (بێگانە)یە؛ چونکە (کوردی) ئەوەندە نەشارەزا نەبووە، ئەم ڕواڵەتە هەست پێ نەکات.

گەوج: گێل، نەفام، تێنەگەیشتوو، نادان.

وەصڵ: پێک گەیشتن. هەرچەندە زۆر جاری تریش ئەم وشەیەم لێک داوەتەوە.

لوطف: چاودێری، لاواندنەوە، دڵسۆزی.

مەغروور: لەخۆبایی، بەفیز.

ئەم تاکە لە (ق/٤)دا نییە و لە جێگەی ئەم، تاکی سێیەمینی هەڵبەستی پێشووی نووسیوە - بڕوانە وا ئەوێ - هەروەها ئەم تاکە لە هەموو سەرچاوەکانی تردا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

بەوەصڵی (نم/١): لە وەصفی - ئەمەش هەڵەیە.

بەوەصڵی (ف، کم، گ/٢، س، گ/٣): بەوەصفی - دیسان هەڵەیە و لە وەرگرتنی شێوە و کۆنەکەیدا بەهەڵەیان وەرگرتووە.

مامۆستا ڕۆژبەیانی لای وایە کە لە جێی (ئەی) وشەی (ئای) ڕاستترە. بەڵام ڕۆژبەیانی هەڵەیە، چونکە کێشی (ئای) لە (ئەی) قورستری ئەکات.

٨- ئاسکۆڵە: ئاسکە چکۆڵە، بێچووە ئاسک.

ئاسکۆڵە ڕەوت: تیژ ڕۆینی وەک ئاسکۆڵە.

شەهێن: مەلێکی چاو جوانە، وەک چاوی خۆشەویستەکەی لە جوانییدا.

ئاهو واز: وەکو ئاسک و مەبەستی لە گورجی و خێرایی ئاسکە. کەوا ئەمیش دڵی گورپە گورپ

دەکا و بەگوڕ لێ ئەدا.
نوور: ڕووناکی، مەبەسی لە بینایی چاویەتی کە هێز و کاریگەری ئەو چاو شەهێنە و جوانییەکەی وایان لێ کردووە چاوی هانای ئەو تیشکی جوانیی چاوی یار و، ڕەوتە ئاسکۆڵەییە چوستەی نەکات کە لە کارتێکراویدا چەواشە بێت.
ئەم تاکە لە (ق/٤)دا نییە و لە جێگەی ئەم، تاکی شەشەمینی هەڵبەستی پێشووی نووسیوە و، ئیتر لە هەموو سەرچاوەکانی تری ئەم پارچە هەڵبەستەماندا ئەم تاکەی سەرەوە هەشتەمینە و یەکێکە لە تاکە شێواوەکان کەوا بۆم ساغ کرایەوە.
لەتاو (گ/٣): لەناو.
ئاسکۆڵە ڕەوتەی (ف، نم/١، ق/٤، گ/٢، س، گ/٣): ئەشک و، لە ڕووتەی.
دڵ (نم/١): دلی.
ئاهو و واز و (یح): آهودار و.
جوانیی وێژەیی لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتتەب)ە کە دڵەکەی (کوردی) دەگەڕێتەوە بۆ (خێرایی ڕەوتەکەی) یاری و، چاوە بێ نوورەکەی، خۆیشی دەچێتەوە بۆ چاوە شەهێنییەکەی ئەو، کە ئەمەش پەسەندیی هەبووە لە وێژەی کۆندا.
٩- صوبح: بەیانی، بەرەبەیانی، سبەینێ.
عید: جەژن، دیارە جەژنی قوربانیش بووە کە لە ١٢/ی مانگدایە و مانگ بەئاسمانەوە تیشکدارە.
شەوقی: پەڕتەو، تیشک، مەبەست لە ڕووناکیی مانگە، (تریفە)ی مانگە.
(کوردی) ئاخی کێشاوە کە بەو تریفەی مانگەیشەوە و، خۆشی بەرەبەیانی جەژنەوە کەوا خەلقی تیا دەکەونە بارێکی نوێ و بیرەوەرییەکی پیرۆزی تیا نوێ دەکەنەوە و بەبۆنەی جەژنەوە دۆست و دوشمن ئاشت دەبنەوە و دەست لەملانی یەکتر دەبن، کەچی ئەم بەختی خۆی لەو تریفە و بەیانیی خۆشی جەژنەدا ڕەش و چەتاڵ دیوە و ناهەموار بووە لە تاریکییدا ژیاوە لەبەر دووریی یار.
دەیجوور: تاریک و نووتەک.
ئەم تاکە هەر لە هی لە (ق/٤)دا نییە و لە جێگەی ئەمیش وەک تاکەکانی تری پێشووی ئەم هەڵبەستە تاکی تر دانەنراوە و لە سەرچاوەکانی تریاندا نۆیەمین تاکی هەڵبەستەکەیە. بەڵام لە هەمووواندا شێواوە و بۆم ساغ کرایەوە بڕوانە ئەم جیاوازی و شێوائیییانەی خوارەوە:
عید و (نم/١): عیدا – ئەمیش لە لایەنی زمانییەوە گونجاوترە، بەڵام لە لایەنی هۆنراوەییەوە لەنگە و ناشێ.
عید و (گ/٢، س، گ/٣): جەژن و – ئەمەش یەکێکە لە دەسکارییە بەکوردی کردنەکانی (گیو).
صوبحی عید و (یح): صبح عید – کە ئەمەش بەرێنووسی کۆنە.
شەوقی (نم/١، ف، کم، گ/٢، س، گ/٣): شوبهی، شبهەی، شوبهەی.

شەوقی (یح): شوی – هەڵەیە.
لە بەختی (یح): لە بخت – ڕێنووسی کۆنە.
وەها (نم/١، ف): الیی.
وەها (کم، گ/٢، س، گ/٣): دەلێی.
١٠- حاضرباش: ئەم وشە لێکدراوە لە لایەن مەشق پێکەری سوپاوە، وەک فرمان دراوە بەسەر سەر و بەو بەشە سوپایەی کە مەشقی پێ کردووە، بەواتا (ئامادە بە = استعد) وە لە دوو کەرتی (حاضر)ی عارەبی بەواتە (ئامادە) و (باش)ی تورکی بەواتا (ببە) پێک هاتووە هەروەک لە کاتی جەنگیشدا ئەم فرمانە دراوە بۆ ئامادەبوونی کەوتنە جەنگەوە، دیارە لە سەرێنی کوردیدا سوپای (بابان) ئەم شێوەی فرمانەی (عوسمانی)ی تیا بەکارهێنراوە.
فەوج: وشەیەکی عارەبییە و ناوە بۆ بەشێک لە سوپا.
غوصصە: پیشخواردنەوە، خەم، خەفەت، لێرەدا دەردەکەوێ کە (کوردی) ماتەمینی و پیشخواردنەوەی خۆی بە(فەوج)ێک چواندووە. کە ئەو (فەوج)ە هەمیشە لە ئامادەییدا بووە کە هەرچۆنێ فرمانی پێ بدرێ لەو بارەی خۆیەوە بگۆڕدرێ بەبارێکی تر.
ناڵە: ناوی دەنگی گریان و ئاە و فیغان کردنە کە سەرکردنی ئەو ناڵەیە لە دەروونییەوە وەک فرمان دانە بۆ سەر پیشخواردنەوەکەی ئەمجا گوتوویە.
زیلە: دەنگێکی تیژ و باریکە لە سەرەتای دەربڕینی دەنگە مۆسیقییەکاندا وە یا لە گۆرانی و مەقامەکاندایە و ئەم دەنگی زیلەیەی چواندووە بەناڵەکەی خۆی لەتاو فەوجی پیشخواردنەوەی دەروونی کە دەنگی (زیلە)کە یا (ناڵە)کەی خۆی لە جێگە فرمانی (حاضرباش – ئامادە ببە)یە کە بووە بەنیشانەی ئامادەبوونی تاکو بکەوێتە خورپەی خەفەتەوە.
ئەوەڵ شەیپوور: یەکەم شەیپوور.
شەیپوور: ئامێرێکی مۆسیقیی جەنگیی باوی ئەو سەردەمە بووە کە لە مەشقی سوپایی یا لە جەنگدا بۆ سوپا لێ دراوە و ئەو دەنگ (زیلە)یەی ئەوەڵ شەیپوورە، دەنگی تایبەتی خۆی هەبووە لە ساز و ئاوازیدا و سوپایەکان پێی ئاشنا بوون بەپێی جۆری دەنگ و ساز و ئاوازی مۆسیقایەکەی جووڵاونەتەوە و فرمانیان بەجێ گەیاندووە بەڵام بەپێی ئەم دەربڕینەی کوردی ئەو فرمانی زیلەی ئەوەڵ شەیپوورە لە دەروونی (کوردی)دا خورپەی ئامادەبوون بووە، بۆ پیشخواردنەوە (غوصصە). کە هەتا دەنگەکە گڕتر بووبێ فرمانەکە گرانتر و قورستر و ناخۆشتر بووە.
زۆر لەوە دەچێ کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی شەوی جەژنێکی دوا دوای تەمەنی فرمانڕەوایی (بابان)دا دانابێ کە وەک لەم هەڵبەستەوە، ئەوە ڕەچاو دەکرێ وەک بمانگەڕێنێتەوە بۆ ژیان و سوپای (نیظام)ەکەی دوا پاشای بابان (ئەحمەد پاشا) کە ئەو سوپا نیشتمانییەی دامەزراند، بەچەکی نوێ و مەشقی مەشق پێکارانی بێگانەوە، بەڵام بەداخەوە عوسمانی و بەپشتیوانی عەبدوڵڵا پاشای مامی ئەو (ئەحمەد پاشا)یە زووتر لە بابان هاتە دەست و فرمانڕەواییەکەی

ڕژێمی بابانی بۆ هەتا هەتایە ڕووخاند. بۆیە ئەحمەد پاشا نەگەیشت لە سای بەرهەمی ئەو سوپای (نیظام)ەیدا خۆی ڕژێمەکەی و گەلەکەی بحەسێنەوە.

(کوردی) کە لەم هەڵبەستە و چەند هەڵبەستێکی تری پێش و دوای ئەم هەڵبەستەیدا بەپاشبەندی وشەی (ئەمشەو) کۆتایی پێ هێناون کە (شەو) کاریگەرییەکی گەورەی لە دەروونی زۆربەی هۆنەرانماندا هەبووە لە پەژارەییاندا (شەو) بێدار بوون و بەناوی ئەو شەوەوە هەڵبەستیان داناوە.

لەم تاکە لە (ق/٤)دا نیوەی دووەمی وەک ئەوەکەی لە سەرەوە هاتووە، وەهایە و بەلام؛ نیو باڵی یەکەمی، بەم جۆرەی خوارەوەیە و نۆیەمینە و لە هەموو سەرچاوەکانی تریدا دەیەمینە:

(چریکەی «قەلب»ی پڕ دەردم بەقوربان)

لەوانەیە ئەم نیو باڵییە نیو باڵی دووەمەکەی لەناوچوو بێت و دەست من نەکەوتووە.

ناڵەم (گ/٣): ناڵە.

حاضرباشی فەوجی (گل/٦، یح): حاضرباش فوج. ئەمەش بەڕێنووسی کۆنە.

١١- مەنع: بەرگری، نەهێشتن، ڕێ نەدان.

مەحض: پەتی، بەتەووایی مەبەستە.

کوفر: دژی خوا و پێغەمبەر و ئاین بوون.

فەقیر: هەژار، بێ دەس، بێچارە، ناتوان کە مەبەستی هەژاری و دەسکورتی نییە.

ناخۆش: نەخۆش، وە دەربڕینی ئەم وشەیە لەم تاکە هەڵبەستەدا وەک دەڵێن (بۆ وەزنی شیعر) یا (لەبەر کێشەکەی) بووە، خوێندنەوەی دەبێ گورج بێ، ئەگەر نا لەنگ دەبێ.

مەعزوور: ئەوی مافی شتێکی ببێ و ڕێگەی بدرێ بیکا و بەڵگەی مافی کردنی بەدەستەوە بێ، ئەمیش بەڵگەیەکی ترە کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لە دوا دوای ژیانیا داناوە.

ئەم تاکە لە (ق/٤)دا دەیەمینە و نیو باڵی دووەمی بەم جۆرەیە لەوێدا:

(زەلیل و عاجز و مەهجوورە ئەمشەو)

لەوانەیە ئەم نیو باڵە ئاوێتەیە لەگەڵ نیو باڵە زیادە ئاوێتەکەی پێشووی (ق/٤)دا بێ کە هەروەک تاکێک بووبن لەگەڵ هەندێ دەسکاریدا. بەلام هەموو ئەم تاکە لەوانی تردا یانزەیەمین تاک و لە هەمووانیشدا دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

مەعزوور (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، یح): مەغدورە (مغدورە) ئەمیش نابێ و دووبارەیە؛ چونکە لە تاکی حەوتەمدا پاشبەند (مەغدوورە)یە.

مەنعی (گل/٦، یح): منع - ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

مەحضی (گل/٦، یح، نم/١): محض - دیسان ڕێنووسی کۆنە.

ئەمشەو (گل/٦): قربان - دیارە ئەمەش هەڵەی نووسینە.

دوا وتەم لەسەر ئەم پارچە هەڵبەستە، دەربڕینی هیواباریە بۆ ساغبوونەوەی ئەو شوێنانەی لەم هەڵبەستەدا بۆم ساغ نەکرایەوە و پتر ڕوونبوونەوەی لە ئامانجەکانی منە.

## ٥٦

## ڕەفیقان

١- ڕەفیقان دڵ لە میحنەت کەیلە ئەمشەو
یەقین قیبلەم لە من بێ مەیلە ئەمشەو
٢- لە صەفحەی عەشقدا گریان و شینە
صەدای دڵ دەرکەنار و زەیلە ئەمشەو
٣- نیشانەی (تۆف) و (طۆفان)ی سورشکم
لە ڕوو و، دامانم هەر سوو سەیلە ئەمشەو
٤- سەراپام غەرقی ئەشکی سوور و دڵ وا
خەریکی مەوجی دووریی لەیلە ئەمشەو
٥- لە من هاوار و غەوغای ڕۆژی حەشرە
لە یار ئارامەکەی (واللیل)ە ئەمشەو
٦- شەرارەی ئاگری عەشقە لە جەستەم
دەڵێی (بئس المصیر) و (ویل)ە ئەمشەو
٧- شەوی تار و درێژ و چارە تاڵە
کە (کوردی) وێڵەکەی دوجەیلە ئەمشەو

..................................................................

١- ڕەفیق: هاواڵ، دۆست، هاودەم، برادەر، هەڤاڵ.
میحنەت: خەفەت، ناخۆشی، باری گران لەسەر دڵ.
کەیل: مەست، تێر، پڕ، سەرڕێژ.
یەقین: بێ گومان، بەڕاستی، بەتەواوی.
قیبلە: (کەعبە) کە ئیسلامەکان لە نوێژدا ڕووی تێ دەکەن - لێرەدا مەبەست لە خۆشەویستەکەیەتی کە هەمیشە ئەم ڕووی خۆی و دڵی لەوە.
مەیل: ئارەزوو، ڕوو تێکردن، گێز - مەبەستی بێ مەیلی یارەکەیەتی.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە تەنیا دووانە و ئەوانیش (عن، ق/٣)ن کە هێشتە ژێر چاپیش نەکەوتووە. بەلام لە (ق/٣)یاندا کە هەر تەنیا دوو تاکی (یەکەم و چوارەمی) نووسراوە کە

ئەویش لەبەر کەشکۆڵێکی (مەلا عەزیز ناوێکی هەڵەبجە)ی وەری گرتووە، بۆیە (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە.

لە میحنەت (ق/٣): لە غەمدا.

قیبلەم (ق/٣): قلبم – ئەمیش نابێ و ئەشێ بەهەڵە وەرگیرابێ.

٢– صەفحە: ڕووپەڕە، لاپەڕە، سەرڕوو (کەڤاڵ = لەوحە).

عەشق: دڵداری، ئەڤین.

صەدا: دەنگ، ئاواز.

دەرکەنار: پەڕ، لە گۆشەوە – مەبەست لە پەراوێزی پەڕاوییە، کە دڵداری بەپەڕاوییەک داناوە و دەنگی دڵەکەی پەراوێزێتی.

زەیل: داوێن، گۆشە، کلک. بەڵام لێرەدا مەبەست لەمە نییە بەشکو مەبەست هەر لە (پەراوێز)ی ناوبراوە لە پەڕاوی دڵداریدا. ئەشێ (زەیل)ی (زیل و بەم)ی مۆسیقەیشی مەبەست بووبێ کە بەڕێنووسی کۆن بە(زیل) دەنووسرێ نەک (زەیل) یا پشتگوێ خراوە.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا نییە و لە (عن)دا دووەمینە.

٣– تۆف: زریان.

طۆفان: لافاو.

سورشک: فرمێسک، ئەشک، ئەسر، ئەسرین، ڕۆنتک.

لە ڕوو و: لە ڕوخسار و – وە بەڕێنووسی کۆن بەشێوەی (لرو) دەنووسرێ کە بە(لەڕ و = لاواز و)ش دەخوێندرێتەوە و بۆ ئێرەش دەگونجێ و وردەکارییە.

دامانم: داوێنم – هەروەها (خەریکبوونم)یش دەگرێتەوە. داماوێتیم، دیسان ئەمەش وردی و وردەکارییە.

هەرسوو: هەر لا.

سەیل: چۆڕاوگە، جۆگەلە، ڕێچکەی ئاو، مەبەستی لە ڕێچکەی فرمێسکەکەیەتی.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا نییە و لە (عن)دا سێیەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.

جوانی لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتتەب)ە کە (تۆف)ەکە لە ڕوو (ڕوخسار)یدا و (طۆفان)ەکەش لە چۆڕاوگەی فرمێسکی (دامان)ی دایە.

٤– سەراپام: سەرتاپام، هەموو لەشم.

غەرق: نوقوم، خنکاو.

ئەشک: فرمێسک.

خەریکی: داماوی، گیرۆدەی، دووچاری، ئاوقای.

مەوج: شەپۆڵ.

لەیل: نیشانەیە بۆ چیرۆکی (لەیل و مەجنوون) و مەبەست لە خۆشەویستەکەیەتی.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا دووەمینە و دوا تاکە و لە (عن)دا چوارەمینە.

سەراپام (ق/٣): سراپا – ئەمیش واتا نادات و دیارە هەڵەی نووسینە.

ئەشکی (ق/٣): اشک.

دڵ وا (ق/٣): قربان.

خەریکی (ق/٣): غریق – ئەمیش نابێ و ئەشێ بەهەڵە وەرگیرابێ، و لە شێوەی کۆندا دووبارەبوونەوە ناپەسەندە بۆیە ناگونجێ.

مەوجی (ق/٣): بحری.

٥– غەوغا: هەرا و هەڵا، دەنگە دەنگ، هەراوهۆریا، قەڵەباڵغی، ژاوە.

ڕۆژی حەشر: ڕۆژی قیامەت.

ئارام: پشوودان، حەسانەوە.

وەل لەیل (والليل): نیشانەیە بۆ ئایەتی (٦٧) لە سورەتی (یونس) (٦١) لە سوورەتی (غافر) و (٨٦) لە سوورەتی (النحل) و... هتد کە (خوا) تیایانا (شەو)ی بۆ حەسانەوە و پشوودان و ئارام داناوە، بەپێچەوانەی باری (کوردی)یەوە.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا نییە و لە (عن)دا پێنجەمینە.

٦– شەرارە: گڕپە، گڕ، بڵێسە، کڵپە، پزیشکە، پزیسکە، نێڵە نێڵی ئاگر.

جەستە: لەش.

بیئسەلمەصیر (بئس المصير): خراپترین ئەنجام یا ئاکام یا چارەنووسی بەد – بەڵام مەبەست لە ناوی یەکێکە لە شوێنە هەرە خراپەکانی دۆزەخ کە لە ئایەتەکانی ١٢٦ و ١٦٢ی سوورەی (البقرة) و ١٦ی سوورەی (الانفال) و ٧٣ی (التوبه) و ٥٧ی (النور) و ٨ی (المجادلة) و ١٠ی (التغابن) و ٩ی (التحريم) و ٦ی (الملك)دا هاتووە.

وەیل: هەرچەند بەواتا هەڕەشەیەکە بەڵام ئەمیش ناوی شوێنێکی تری دۆزەخە کە (خوا) هەڕەشەی لە کافر و موشریک و ستەمگەر و درۆزن و... هتد پێ کردووە لە ئایەتەکانی ٧٩ی (البقرة) و ٢ی (ابراهيم) و ٣٧ی (مريم) و ٢٧ی (ص) و ٢٣ی (الزمر) و ٩ی (فصلت) و ٦٥ی (الزخرف) و ٧ی (الجاثية) و ٦٠ی (الذاريات) و ١١ی (الطور) و لە ١٥ – ٤٩ی (المرسلات)دا ١٠ جار هاتووە.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا نییە و لە (عن)دا شەشەمینە.

٧– شەوی تار و درێژ: مەبەس لە درێژترین شەوی پایزە ئەشێ لە سەردەمی رووخانی باباندا دای نابێ.

چارە: بەخت (چار و تاڵ): بەخت ڕەش.

دوجەیل: ئەو دەشتەی مەبەستە کە (مەجنوون) تیا وێڵ بووە بەدوای لەیلا و عەشقیا.

ئەم تاکە لە (ق/٣)دا نییە و لە (عن)دا حەوتەمینە.

## ئەریَ یاران

١– ئەریَ یاران، شـەوی هیـجـرانە یاخـۆ مـەحشــەرە ئەمـشـەو؟؟
صەدای (عـەبباس)ە، یا ناڵە و فیـغانی (ئەصغەر)ە ئەمشەو؟؟
٢– ســـوپـای غـــەم هاتە تـاراجی قـــەرار و هـۆش و ئـارامم،
کــە زانیی مــوڵکی دڵ بیَ شــەهریار و لەشکەرە ئەمــشــەو
٣– مـوشــەخـخــەص مـردنم نەزدیکە سـا یاران خـودا حـافـیظ
لە بۆ قـەصـدی هیـلاکی من مـوژەی وەک خـەنجـەرە ئەمـشـەو
٤– هەنـاســەی ئـاگــرینم بیَ ســەبەب نابیَ (زوحــەل) ئـاســا
کـە (دەورە)ی قـرمـزی پۆشـا تەنم وەک مـەجـمـەرە ئەمـشـەو
٥– بەخـەططی سـەبزی رەیحـانی و جـەمـاڵی ئاتەشین رەنگی
فـرۆغی (حـوسن) و، ئیـعـجـازی خـەلیلی ئـازەرە ئەمـشــەو
٦– چ حـاصل؟ مـوهرەیی بەخـتـم دووشـەش بێنیَ ئەمـێـسـتـاکـە
کە داشـی دڵ لە خـانەی دەرد و هیـجـرا شـەشـدەرە ئەمـشـەو
٧– لە ئیــقلیــمـی مــەلاحــەتدا (فــەریدە) و نادری عــەصــرە
جـلـەوداری وەکـو (ئەلپ ئەرســەلان) و (سـەنجـەر)ە ئەمـشـەو
٨– لە مــەســتــیـدا وەکـو (رەهام) و بـۆ مـەردی وەکـو (شـیـد)ە
بەتوندی هەروەکو (طـووس)ە بەشـۆخی (جـەعفـەر)ە ئەمشـەو
٩– ئەوا (کــوردی) لە کـونجی بیَ کــەســیـدا زار و بیــمــارە
بەوەصڵی مـەر عیلاجی کـەن کە (حەججـول ئەکبەر)ە ئەمشـەو

---

١– هیجران: دووری، جیایی، جودایی.
مەحشەر: مەبەست لە رۆژی قیامەتە.
صەدا: دەنگ، ئاواز، گۆرانی، چریکە.
عەبباس: گۆرانیبێژێکی دەنگ کاریگەر بووە لە سەردەمی کوردیدا.

ئەصغەر: ئەمیش گۆرانیبێژێکی وەک عەبباس بووە (سنەیی) و باپیری سەید عەلی ئەصغەر (سەی ئەسکە)ی نیوەی یەکەمی چەرخی بیستەم بووە.
سەرچاوەی دەسنووسی ئەم هەڵبەستەمان (گل/١، گل/٦، ف، بل، ما، نم/١)ە و هی چاپکراویش (گ/٢، کم، س، گ/٣)یە و لە نێوان ئەم (دە) سەرچاوەیەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆنەی ئەم هەڵبەستەم زۆر لێ ڕوون نییە، ئەگەرچی سەرچاوەی (دمادەم)م زۆرە.
هیجرانە (گ/٣): یەڵدایە – دەسکارییە.

٢– تاراج: تێکدان، وێرانکردن، ڕووخاندن، خاپوورکردن، کاولکردن.
قەرار: خۆڕاگرتن، سانەوە، بڕیاردانیش دەگرێتەوە.
هۆش: مەبەست لە عەقڵ و هەست و تێگەیشتنە.
هۆش و (ف، نم/١، کم، گ/٢، بل، ما، س، گ/٣): صبر و – بەڵام (صەبر) بەواتە (ئارام)ە و ئارامیش لەم تاکەدا هاتووە.
موڵک: خاک، وڵات، نیشتمان.
شەهریار: شارەوانی، فەرمانڕەوای شار.
لەشکەرە (گل/١، نسخە: ر): (عسکر)م کە ڕێنووسی کۆنە (عەسکەرە)یە.
لەشکەر: بەشێوەی فارسییە (لەشکەر) نووسراوە، لەبەر پاشبەندەکانی تر، چونکە شێوە کوردییەکەی (لەشکر) لەگەڵدا ناگونجێ و هەر خۆشی گونجاوی وتووە.
شەهریار و (بل): شهرویار و.

٣– موشەخخەص: دیاریکراو، دەستنیشان کراو، بەڕاستی، بەتەواوی، بێ گومان، بەدەسنیشانی.
نەزدیکە: نزیکە، نێزیکە و کوردی لە ساڵی ١٨٥٩ز = ١٢٧٦ک. دا مردووە.
حافیظ: پارێزگار (دوعاخوازیی بۆ مردن کردووە).
قەصد: ویستن، خواستن، ئارەزوو.
هیلاک: کوشتن، لەناوچوون، لەناوبردن، لەناودان، مردن...
موژە: برژانگ، مژۆڵان.
ئەم تاکە لە (گل/١، گل/٦، بل، گ/٣، ما)دا سێیەمینە و لە سەرچاوەکانی تردا، چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
موشەخخەص (گ/٢، س): بەڕاستی – دیارە دەستکاری مامۆستا گیوە.
مردنم (ف، نم/١، کم): فوتی من = فەوتی من.
نەزدیکە (گ/٣): نێزیکە – دیسان دەسکاریی مامۆستا گیوە.
سا یاران (بل): سا یا. [دڕاوە و (ران)ی یاران لەناوچووە].
قەصدی (بل، ما): قصد – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

هیلاکی (بل، ما): هلاک – دیسان ڕێنووسی کۆنە.
قەصدی هیلاکی من (ف، نم/١، کم، گ/٢، س): لە بو قتلی منی بیکس = لە بۆ قەتڵی منی بێ کەس.
موژەی (بل، ف، ما، نم/١، گ/٣): مژت (موژەت) و ئەمیش نابێ؛ چونکە تێکڕای هەڵبەستەکە، ڕووی دەمکردنە خۆشەویستەکە (موخاطەب) نییە.
٤– سەبەب: هۆ.
زوحەل: ئەستێرەیەکی کۆمەڵەی ڕۆژی (المجموعة الشمسية)یە کە بەجغز (دائرة)یەکی ڕووناکی ئاگرین پشتێنە دراوە و ئەستێرەکەی پێ وەک پارچەیەک پشکۆی ئاگرین دەنوێنێ.
دەورە: بەرگێکی کۆن بووە لە سەرەوە وەک عەبا و سەرپۆش بەسەر خۆدادراوە یا لەبەرکراوە ئەشێ (پاڵتۆ) بێ.
قرمز: سوور، ئاڵ.
پۆشا: پۆشیی، لەبەری کرد – وا دیارە ئەوسا وشەی (پۆشا) کورتکراوە بووە وەک خرۆشا باو بووە.
تەن: لەش.
مەجمەر: کوورەی ئاگر، ئاگردان، پشکۆدان، کوورە.
ئەم تاکە لە (گل/١، گل/٦، بل، ما، گ/٣)دا چوارەمینە و لەوانی تردا نییە.
لێرەدا (کوردی)، کە یارەکەی ئەو (دەورە) قرمزییەی وەک خرۆگەی دەوری (زوحەل) پۆشیوە، نەک هەر خۆی پێ ئاگرین کردووە بەشکو (کوردی)یش لە تیشکی ئەوەوە هەناسەی بووەتە ئاگرین و بەدەوری خۆیدا وەک جغزە ئاگرییەکەی ئەستێرەی (زوحەل) جارێکی تر خۆی پێ کردووەتە کوورەی پڕ لە پشکۆی گەشاوە، بەتایبەتی کە یارە ڕەنگ ئاگرینەکەی لە ناو دڵی خۆیدا بووە (دڵی کوردی)، خۆی پێ گڕ تێ بەرداوە، ئەمە جگە لە جوانیی دەربڕینەکەی، شارەزایی خۆی لە ئەستێرەشوناسیدا پیشان داوە و هەر بۆیە هاواڵی ئەستێرەشوناسی ئەوسا یە(ڕەنجووری)یش بووە.
نابێ (بل): نای.
نایێ (گ/٣): نایە.
زوحەل ئاسا (بل، ما، کم، گ/٢، س، گ/٣): پی اندر پی (پەی ئەندەرپەی).
کە دەورەی (گل/١، گل/٦، بل، ما): کدورەء.
کە دەورەی (گ/٣): کە بەرگی.
پۆشا (گ/٣): پۆشی.
٥– خەططی سەبز: مەبەست لە گەندەمووی ڕیش و سمێڵ و ڕووی ئافرەتیشە. (خەتی سەوز): خەتی ڕوومەتە.

ڕەیحان: ڕووەکێکی ڕەشی وەنەوشەیی یا سەوزی بۆن، خۆشە وەک گەندەمووەکە.
جەماڵ: جوانی.
ئاتەش: ئاگر – ئاتەشین وەک ئاگر، ئاگرین.
فرۆغ: پەڕتەو، تیشک، ڕووناکی.
حوسن: جوانی (وشەیەکی عارەبی)یە.
ئیعجازی خەلیلی ئازەر: موعجیزە و، یا ئەو ڕواڵەتە لە ڕادەبەدەرەی (ئیبراهیمی خەلیل) بوو کە خرایە ئاگرەوە و نەسووتا. هەروەک یارەکەی (کوردی)ش بەو جوانی و پەڕتەوەوە، لە حەزرەتی (برایم) دەچێ کە لە ئاگرەکەدا بووە ئەمیش موعجیزە ناسووتێ و (حەزرەتی برایم) خودی زەردەشت پێغەمبەری کوردانە، بۆیە پێغەمبەری ئیسلام کە لە نەوەی عەرەب نییە.
زنجیرەی بیری گڕ و ئاگر و... هتدی ئەم تاکەش پەیوەندیی بەتاکی پێشووەوە هەیە.
ئەم تاکە لە (گل/١، گل/٦، بل، ما)دا پێنجەمینە و لە (گ/٣)دا شەشەمینە و لەوانی تردا نییە.
بەپێی وێژەی دێرین ئەم تاکە (لەف و نەشری مورەتتەب)ە کە (فرۆغی حوسن)ەکە دەگەڕێتەوە بۆ (خەططی سەبز)ەکە و، (ئیعجازی خەلیلی ئازەر)ە کە دەچێتەوە بۆ (جەماڵی ئاتەشینی ڕەنگ)ەکە و ئەمەش وەستایی و جوانییە. جگە لە یەکخستنی ڕەنگی سەوز و سووری ئاگرەکە کە ئەمیش جوانییەکی ترە.
بەخەططی (ما): بخط. (ڕێنووسی کۆنە).
سەبزی (ما): سبز و.
ڕەیحانی و (ما، گ/٣): ڕوخساری (رخساری).
ڕەیحانی و (بل): ریحانی.
جەماڵی (بل): جمال.
ڕەنگی (گل/٦، گل/٩، بل): رنکی.
فرۆغی (ما):...... دڕاوە و لەناوچووە ناخوێندرێتەوە.
فرۆغی (بل): فروغ.
حوسن و (گ/٣): شەمسی.
حوسن و ئیعجازی (ما): شمع اعجاز.
حوسن و ئیعجازی خەلیلی (بل): حسن اعجاز خلیل – کە ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
٦– حاصڵ: بەرهەم، دەسکەوت، دەرامەت، سوود، کەڵک.
موهرە: مۆر – مەبەست لە (زار)ی یاریی تاوڵە و نەرد و ئەمانەیە.
دووشەش: دیوێکی (زار)ی تاوڵە و نەردی شەشەمینە و ئەگەر هەردوو زارەکە ئەو دیوەیان دەست کەوت لە هەڵدانی زارەکاندا و، یا لە شوێنی زارەکاندا شەشەمین جێ گیرا، ئەوا ئەو

دووشـەشـە زۆر چاکـە و بەوەش دەڵێن (شـەشـدەری لـێ گـیـراوە) و (دووشـەشـی هـێناوە) بەڵام کوردی شەشدەرەکەی گیراوە بۆیە (کەڵک)ی لە دووشەش وەرنەگرتووە.

داش: بەرد – مـەبەست لە پوولی دامـە و نەرد و تاوڵە و شـەترەنجـە کە بەپێی هاتنی ژمـارەی دیوی زارەکـە شـوێن گـۆڕکـێـیـان پـێ دەکرێ و سـوودی دەبـێ، بەڵام کوردی دانەکـانی دڵی بەو جێگۆڕکێیەش کەڵک وەرناگرێ، چونکە بەدەرد و هیجرا بووە.

خانە: شوێنی پوولی یارییەکە (داش).

هیجر: دووری، جیایی، کە بەو جیاییە شەشدەری لێ گیراوە.

شـەشدەر: دەسکەوتنی ئەو یارییـەیە لە یەکێک لە یاریکەرەکان شـەشدەری لێ بگیـرێ دۆڕاوە و ژێر کەوتووە.

کـە لێـرەدا (کـوردی) یەکـجـار بەشـارەزایی خـۆی بردوویـەتەوە، لەم جـۆرە یارییـانەدا کـە ئەو سایەش باوبوون و لە هەڵبەستی ترا ئەم شارەزاییەی خۆی ڕاگەیاندووە.

ئەم تاکە لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا سـێیەمـینە و لە (گل/١، گل/٦، بل، ما) شـەشـەمـینە و لە (گ/٣)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.

چ حاصل (ف، نم/١، ما، کم، گ/٢، س): چە حاجت (چە حاجەت).

موهرەیی بەختم (ف، نم/١): طاس اقبالم.

موهرەیی بەختم (کم): طاسی اقبالم.

موهرەیی بەختم (گ/٣): تاسی ئیقبالم.

موهرەیی بەختم (بل): داش اقبالم.

موهرەیی بەختم (س): تاسێ اقبالم.

کە داشی دڵ (گ/٢، س): کە بەردی دڵ – دەسکارییە.

کە داشی دڵ (بل): کداش دل – ڕێنووسی کۆنە.

کە داشی دڵ (ما): کدور لەو چاوە.

لە خانەی دەرد و هیجرا (بل): لخانەء درد هجران.

لە خانەی دەرد و هیجرا (نم/١): لە دەردی خانەی.

لە خانەی دەرد و هیجرا (ف، کم، گ/٢، س): لە دووریی داوی خانەی – ئەمەش لەنگە.

لە خانەی دەرد و هیجرا (ما): داش دامی لخانەی؟؟

لە خانەی دەرد و هیجرا (گ/٣): لە خانەی صەبر و هیجران.

٧- ئیقلیم: کیشوەر، هەرێم.

مەلاحەت: جوانی، شیرینی، دڵگیری.

فەریدە: نـاوی دوو ئافرەتی زۆر جوان و یـەکجار دەنگخـۆش و لە گۆرانیـبێژەکانی خـەلیفـەکانی (عـەبـبـاسـی) بوون بە(فـەریدەی بچـووک) و بە(فـەریدەی گـەورە) بەناوبانگ بوون یـەکـەمـیـان لە

سەرێنی و لای (خەلیفە واثیق) و دووەمیان لای (جەعفەری بەرمەکی) و (ئەمین) بووە، کە پترێک بەوە دەچێ (کوردی) مەبەستی لەمانە بووبێ چونکی ئەگەر بەو واتایە سەیری ئەم وشەی (فەریدە)یە بکەین کە واتەی (نایاب، نادیدە) کەم هاوتا و تاکانە دەدات لە دوای وشەی (نادر)ەوە، هاتووە ئەمیش بەتێکڕایی هەمان واتا دەدات کە ئەمیشیان ناوی (نادر شا)ی ئەفشاری (هەوشاری)یە کە (نادر شا) بەجوانی (مەلاحەت) بەناوبانگ نەبووە، بەشکو توندوتیژ بووە. کەواتە زۆرتر وێ دەچێ کە مەبەستی لەو دوو ئافرەتە بووبێ.

نادر: نایاب، نادیدە، هەڵکەوتوو، کەم هاوتا، بێ وێنە.

جڵەودار: ئەوی ئاوزەنگی و جڵەوی وڵاخی بۆ دەگرێ لە دابەزین و سواربووندا.

ئەڵپ ئەرسەلان: (١٠٢٩ – ١٠٧٢ز)، یەکێکە لە پادشا بەناوبانگەکانی سەلجووقی و ئازا و سوارچاک و توانا بووە، وڵاتی لە ئەفغان و ئەرمینیاوە گەیاندە حیجاز و سنووری فاطمیی ئەوسا و لەم لایشەوە لە جەرگەی ئێرانەوە گەیاندە ناوەندی تورکیای ئێستە سنووری بێزەنطی و گوایە یارەکەی (کوردی) لە ناوداریدا پیاوی وەک ئەم پاشایە جڵەوداری بووە. ئایا مەبەستی لە (ئەحمەد پاشای بابان) نەبووە؟؟.

سەنجەر: (١٠٨٦ – ١١٠٧) پاشایەکی تری بەناوبانگی سەلجووقییان و ئازا و بەدەسەڵات بووە لە دوای ئەوەوە فەرمانڕەواییەکەی هاتە نوشوستی و نەمان و گوایە ئەمیش بەجڵەودارێکی تری خۆشەویستەکەی (کوردی) شایان بووە بێ گومان (کوردی) ئەم هەڵبەستەی بۆ یەکێ لە ناودارەکانی بابان داناوە کەوا بۆ شوێنێک چووە و لە (کوردی) جیابووەتەوە، لەوە دەچێ کە جیابوونەوەی شکستەش بووبێ، بەڵام بەتەواوی بۆم ساغ نەبووەتەوە کە بۆ کێیە. بەتایبەتی ئەم هەڵبەستە لە کەشکۆڵەکەی (عن)ی (عەلی ئاغای نەوتچی)دا نەهاتووە، چونکە وەک لە زۆر شوێنی ئەم پەڕاوییەدا دیارە ئەو: بەسەر ڕوونکردنەوەی بۆنە و ئاشکراکردنی نهێنی و گەلێ شتی تری هەڵبەستەکانەوە نەچووە، بەپەراوێزە گرنگی و ڕەخنەگری و یەکالا کارەکانی ڕێنومایییەکی ئەوتۆی کردووین کە باری گەورەی ئەم پەڕاوییەی بەسەر شانەوەیە و جێ پەنجەی دیارە.

ئاشکرایە لەو جۆرە کەسانەش وە نەبێ هەر ئەومان بووبێ و تاقانەی بابەتی خۆی بووبێ، بەشکو بەرهەمی ئەوانەمان بەداخەوە زۆر زۆر لەناوچوون.

ئەم تاکە لە (گل/١، گل/٦)دا حەوتەمین تاکە و لە (گ/٣)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا نییە.

فەریدە و (گ/٣): فەرید و.

ئەڵپ ئەرسەلان (گ/٣): قزڵ ئەرسەلان – ئەمیش جگە لەوەی کە لە هەردوو سەرچاوە کۆنەکەی ترا نەهاتووە، ناشبێ، چونکە لە مێژوودا بەگشتی و لە سەلجوقییەکاندا بەتایبەتی (قزڵ ئەرسەلان)، نەهاتووە و مەگەر لە ڕووی زمانییەوە بەواتە (شێری سوور) تەماشای ناوەکە بکەین کە ئەمەیش زۆر جێگیر نییە.

٨– له مەستیدا: له سەرخۆشیدا – بەڵام مەبەست له بێ پەروایی و هۆنەکردنەوە و ملنان و چاو نەترسییە.

ڕەهام: کوڕی (گۆدەرز)ی کوڕی (گشواد)ە.

گۆدەرز له سەرۆک و فەرمانڕەوایانی کەڵوڕ (کەلهوڕ)ی کوردە و له نەوەی (کەلاهۆر)ی پاڵەوانی ناوداری ئەم تیرەیەیە.

باوکی (ڕەهام) پاڵەوان و سەرفەرماندەی لەشکر و، وەزیری بەناوبانگی (کەیکاوس)ی پاشای (کەیانی)یەکان بووە و، دوو کوڕی بووە کە ئەوانیش (گیو) و (ڕەهام) بوون.

ڕەهام له سەرێنی (لهراسب) پاشای کەیانییەکاندا سەرلەشکر بوونی و بەفرمانی پاشا، هەڵی کوتاوەتە سەر (شام) و (فەلەستین) و (میسر) و کوشتارێکی بێدادی کردووە و سەریش کەوتووە، بۆیە چاو نەترس و ئازا و بێ پەروایەکی مەستانە، بەناوبانگەوە بە(ڕەهام)یش ناسراوە و دوا والیی کلدانییەکان بووە لەسەر بابل و پاشتر مێژووناسەکان عەرەب بە(بخت النصر)ی گەورە یا (نبو خذ نصر) ناویان بردووە و توانیویە دەست بەسەر تەختی فەرمانڕەواییەکەدا بگرێ و بەناوی (ئاشوور) و لە ساڵی (٦٠٤ – ٥٤٨)ی پێش زاینیدا فرمانڕەوایی بکات. (کوردی)ش لەم هەڵبەستەیدا نیشانەی بۆ ئەو بێ پەرواییەی (ڕەهام) کردووە، بەتایبەتی بەسەر (جوو)دا.

شید: له بارەی زمانییەوە بەواتە (ڕۆژ، پەڕتەو)، تیشک، ڕووناکی و، مامۆستا ڕۆژبەیانی دەڵێ (شید) کورتکراوەی ناوی (حەفید جەم)ە کە بەمەرد و چاکەکار بەناوبانگە، ئەم ڕایەش تەنیا بەهارات پێوەکردنێکی ڕاگەیاندنەکانی منە. هەروەها له ڕووی (مەبەست)یش، مایەی بەهرەمەندی مرۆڤە لەبەر و بوومی ئەو گەورە پیاوەمان لە لایەکی ترەوە لە (الشرفنامە)کەی عارەبی گۆڕینی مامۆستا ڕۆژبەیانی)دا هاتووە کە عارەبەکان کەسیەتی ناوی (شید)ەکەیان بە(شەیتان) گۆڕیوە، بەلای منەوە دوور نییە ئەم (شید)ە لە پێشا (شەیدا) بووبێ بەڵام لە (الشرفنامە)دا (شید) نووسراوە.

طووس: یا (طووسی نەوزەر) کە لە دائرە المعارفی ئیسلامیدا، (توس توتر) بەهەڵە ناوبراوە. ئەمیش سەردارێکی ئازا و لێهاتوو لە لایەن ساسانییەکانەوە، لەسەر ناوچەی (تووس = طووس = سووس = شووش)ی لای خوراسان و شاری (طووس)ی ئاوەدان کردووەتەوە و دوای ئەوەی کە جەمشید دروستی کردبوو، کاول بووبوو کەواتە (شید جەمشید) نەبووە، بەپێچەوانەی ڕای مامۆستا ڕۆژبەیانییەوە.

شۆخ: گەلێ واتای جیا جیا دەدات و لەوانە و ئەوی بۆ ئەم هەڵبەستە بگونجێ واتای (چوست، جوان، نەترس).

جەعفەر: کوڕی ئەبی طالب و برای حەزرەتی عەلی و ئامۆزای پێغەمبەر «د. خ» بووە، لە (غەزوە)ی (مۆتە)دا ئاڵا هەڵگری ئیسلامەکان بوو و هەتا هەردوو دەستی نەپەڕیوە، ئاڵاکەی

بەر نەداوە، لەسەر ئەوە پێغەمبەر بە(ذو الجناحين) ناوی بردووە و لە ساڵی ٨ی کۆچی = ٦٢٩ی زاینیدا مردووە و (کوردی) مەبەستی لە ئازایی و چاونەترسیی ئەم بووە کە ناوی بردووە.

ئەم نیشانە بۆ کردنانەی (کوردی) بۆ ئەم کەسانە و لە هەڵبەستی تریشیدا بۆ زۆر کەسی مێژوویی تر بەڵگەی ڕۆشنبیری و شارەزایی بوو لە مێژوودا، بەپاڵ جۆرەها شارەزاییی تری ئەو سەردەمی (کوردی)دا باو بوون وەک (ئەستێرەشوناسی) و (مۆسیقا) و... هتد کە لە شوێنی خۆیاندا نیشانەم بۆ کردوون.

ئەم تاکە لە: (ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا پێنجەمینە و لە (گل/١، گل/٦، گ/٣)دا هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە دوو سەرچاوەکەی تردا نییە.

لە مەستیدا (گل/١، گل/٦، ف، نم/١): (لمستیدا) – لە مستیدا. ئەمەش دیارە بەڕێنووسی کۆنە کە (لە مستیدا) بەواتە: لە چنگیدا، یا لە لەپی دەستیا دەخوێندرێتەوە – ئەمجا و ێدەچێ کە مەبەستی (کوردی) لەوە بێ کە هی وەک (ڕەهام) ژێردەستەی ئەو کەسەدایە کە ئەم هەڵبەستەی بەسەردا هەڵداوە.

ڕەهام (ف، نم/١): ڕهتامە و ئەشێ ئەم دوو نوقطەی (ت)یە لەم (ڕهتام)ەدا نیشانەی گرتن (گیراو بێ) = شەددە – ّ – بووبێ و ئەو نقطە وەرگیرا بێ.

ڕەهامە (کم): رهّامة.

ڕەهامە (س): رُوهامة.

شیدە (س): شَيْدَ.

طووسە (س): طوسّە.

٩– کونج: گۆشە.

زار: بێ دەسەڵات، پەککەوتە.

بیمار: نەخۆش، خەستە.

وەصڵ: پێکگەیشتن – لە سەرچاوەکاندا بەڕێنووسی کۆن نووسراوە (بوصلی) = کە (بەوەصلی = وەصڵی ئەو) وە (بەوەصڵێ = یەک وەصڵ) دەخوێندرێتەوە کە هەردووکیان دەگونجێن کە من لە سەرەوە شێوەکەیم جیا نەکردەوە کە کامیانە، چونکە هەردووکیان ئەشێن.

عیلاج: چارە، بیمار.

حەججولئەکبەر: (حەجی گەورەتر)، حەج یەکێکە لە پێنج پێویستییە سەرەکییەکەی کە خوا بەسەر ئیسلامی داداوە، ئەمجا حەججولئەکبەر (حج الاكبر) لە ئایەتی سێیەمینی سوورەتی (التوبە)دا ناوی هاتووە لێکدەرەوەکانی قورئان دەڵێن: (حەج) لە (عەرەفە = عارفە)دا کە (شوێنێکە) دەبێ و (عارفە)ش ڕۆژی پێش جەژنە و (جەژن)یش لێرەدا مەبەست لە (جەژنی قوربان)ە کە ڕێکەوتی (٩/ی مانگی ذی الحججە)ی ساڵی (هیجری = کۆچی)ی هەر ساڵێک

دەكات. وە لە سەرەتاوە (حەججولئەكبەر = گەورەترین حەج) كردنی ئەو (حەج)ە بووە كە ئیسلامەكان بۆ دوا جار بەهاوبەشی لەگەڵ (موشریك)ەكاندا پێكەوە كردوویانە و، ئیتر بەپێی ئایەتی (بەرائەت) قەدەغە لە (موشریك)ەكان كراوە كە ببڕای ببڕای (حەج) نەكەن و ڕێگەی چوونە ناو (كەعبە)یان نەدرێ، ئەمە (حەججولئەكبەر)ێكە بەلای هەندێكەوە، واتە لە باوەڕپێكراوە ئاینەكانی ئیسلام. بەڵام بەلای هەندێكی ترەوە (حەججولئەكبەر) بریتییە لە (ڕاوەستان لە كەعبەدا بۆ «حەج»كردن و سەربڕینی قوربانی، سەرتاشین و بەرد هاویشتن (ڕەجم) = یا ئافەرۆری «شەیتان» و... هتد)ە. چونكە دەڵێن ئەگەر (حەج)كردنەكە ڕاوەستانی تیا نەبوو یا لە كاتی تردا بوو ئەوە (حەججولئەصغەر = بچووكترین حەج)، وە یا (عەمرە)یە.

بەلای هەندێكی تریشەوە (حەججولئەكبەر) ئەو (حەج)ەیە كە ڕۆژی (عارفە) ڕێكەوتی ڕۆژی (هەینی = جومعە) بكات چونكە (نوێژی جومعە) بە(حەجی هەژاران) دانراوە، بەم پێیە كە هەردوو حەجەكە یەك بگرن، ئەوە (حەججولئەكبەر)ە كە بەكوردی (حەجی دوو حەج)ی پێ دەڵێن.

(كوردی)ش بە(یار گەیشتن) ئەو شەوەی نەك هەر بە(حەج) بەشكو بە(حەججولئەكبەر) داناوە ئەویش یا لەبەر گرنگیی بە یەكگەیشتنەكە و، یا هەر لە ڕاستیشدا ئەو شەوە ڕێكەوتی شەوی هەینی (جومعە) و شەوی (عارفە)ی كردووە كە بۆ بەیانی (جومعە) و حەجی تیا كراوە كە ئەمەشیان زۆر لە ڕوودا (واقع)ەوە نیزیكە، چونكە هەروەك دەزانین زۆر جۆرە (بۆنە) هەیە دەبێتە هۆی جووڵاندنی هەستی هۆنەر و هەڵبەستی لەسەر دادەنێ دوور نییە كە ئەو ڕێكەوتی (ئەو شەوە)، (هەینی) و (عارفە) و... هتد بووبێتە هۆی دانانی ئەم هەڵبەستە، خۆ ئەگەر وەها بووبێ ئەوا بەلێكدانەوە و، دەرهێنانی ئەو ڕۆژە هەینییانەی كە بەر ڕۆژی (عارفە)ی (جەژنی قوربان) كەوتوون وە بەیەكگرتنیان لەگەڵ ڕۆژی (٩ی (ذی الحجە)دا لە ژیانی (كوردی)دا ئەوا بەسەرنجدانی (پەڕاوییە ساڵنامە و ڕۆژمێری – تەقویمی)یەكان بۆمان دەردەكەوێ كە هەر لە فامكردنەوەی (كوردی)یەوە، تاكو دوایی ژیانی تەنیا (هەشت جار) (حەججولئەكبەر) ڕوویان داوە ئەوانیش:

١- ڕۆژی هەینی ٤ی مایسی ١٧٩٩ز بەرامبەر بە ١٢١٤ك كە تەمەنی (كوردی) ١٧ ساڵی بووە.

٢- ڕۆژی هەینی ٧ی مایسی ١٨٠٧ز بەرامبەر بە ١٢٢٢ك كە تەمەنی (كوردی) ٢٥ ساڵی بووە.

٣- ڕۆژی هەینی ١٢/ت/٢ی ١٨١٥ز بەرامبەر بە ١٢٣٠ك كە تەمەنی (كوردی) ٣٣ ساڵی بووە.

٤- ڕۆژی هەینی ١٧ی ئەیلوول ١٨٢٠ز بەرامبەر بە ١٢٣٥ك كە تەمەنی (كوردی) ٣٨ ساڵی بووە.

٥- ڕۆژی هەینی ١٧ی ئابی ١٨٢٣ز بەرامبەر بە ١٢٣٨ک کە تەمەنی (کوردی) ٤١ ساڵی بووە.
٦- ڕۆژی هەینی ٢٢ی حوزەیران ١٨٢٨ز بەرامبەر بە ١٢٤٣ک کە تەمەنی (کوردی) ٤٦ ساڵی بووە.
٧- ڕۆژی هەینی ٧ی مارت ١٨٣٦ز بەرامبەر بە ١٢٥١ک کە تەمەنی (کوردی) ٥٤ ساڵی بووە.
٨- ڕۆژی هەینی ٥ی/ت/١: ١٨٥١ز بەرامبەر بە ١٢٦٧ک کە تەمەنی (کوردی) ٧٠ ساڵی بووە.
نابێ بەسەر ئەوەشەوە بچین کە کردنی جەژن و ڕەمەزان و بۆنە ئاینەکانی ئیسلامی بەپێی (بینینی مانگ)ە نەک بەلێکدانەوەی زانستی وەک ئەمەی من کردوومە، لەبەرئەوە لەوانەیە پاش و پێشی یەک دوو ڕۆژ بووبێ، بەهۆی گۆڕینی ساڵەکەش بەڵام بەتێکڕایی ئەم لێکدانەوەی من زانیاریترین و نزیکترین و ڕاستترین دەسنیشان کردنێکە کە بێ گومان (کوردی) لە نێوان ساڵانی (١٨٠٧ - ١٨٣٦ز)دا دەبێ ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی لە سولەیمانی دانابێ کە ناوی کەسەکانی ئەوێی بردووە کە ئەو ساڵانە نزیکترێکن لە هەڕەتی شێوە و بیری هەڵبەستەکەیەوە.
ئەمیش تەنیا بۆچوونێکی تایبەتی نوێیە لە (تەحقیقات)ی هەڵبەستی شاعیرانی کورددا کە پێم نەزانیوە بەر لە من کرابێ و من یەکەم کەسم لەم کارەدا لە کوردیدا.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س)دا شەشەمینە و لە (بل، ما)دا حەوتەمینە و لە (گل/١، گل/٦، گ/٣)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەمووانیشدا دوا تاکە.
لە کونجی (گل/١، گل/٦، بل): لکنج - ئەمیش ڕێنووسی کۆنە.
بەوەصڵی مەر عیلاجیکەن (بل، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): بوصلی خوت علاجی کە - ئەمیش دیسان لەگەڵ (صیغە)ی هەڵبەستەکەدا ناگونجێ، چونکە لە سەرەتاوە تا دوایی (ڕووبەڕوویی) قسەی نەکردووە.

٥٨

## صەدای سەمتوور

١- صەدای سەمتووری کەللەم گەرمە ئەمشەو
چریکە و بانگی دڵ بێ شەرمە ئەمشەو

٢- بەناخوون، (کاری فەرهاد)، دێ لە دەستم،
وەها شاهووله سینەم نەرمە ئەمشەو

٣- لە تەنهایی بەیادی ڕۆحی مەجنوون،
خەیاڵی گەشتی دەشت و دەرمە ئەمشەو

٤- غوباری خاکی (وامیق) گەر بەهەشتە
کە قاپی تۆ صەبووری دەرمە ئەمشەو

٥- لەسەر ڕووم (زامی ناخوون) نەخشی تۆی بەست
تەمای صنعاتەکەی (ئازەر)مە ئەمشەو

٦- لە دەوری (شەم) گەڕا پەروانە ناکام
لەسەر ڕێی وەصڵی تۆ ڕەهبەرمە ئەمشەو

٧- ئەگەرچی یار و یاوەر بوون بەدوشمن
غەمی بێ یاری بوو یاوەرمە ئەمشەو

٨- کە چونکە بۆی ویصاڵی تۆی تێدایە
نەسیمی صوب خەبەر ئاوەرمە ئەمشەو

٩- سەرم شۆری ویصاڵی کەوتە سەر باز
دیسان (کوردی) کە دەردی سەرمە ئەمشەو

---

١- صەدا: دەنگ، ئاواز، ساز.
سەمتوور: ئامرازێکی مۆسیقییە و لە هەڵبەستی تردا لێکم داوەتەوە.
شەرم: ئابڕوو - مەبەستی لەوەیە کە بێ پەروا و بێ پەرهێز لە کەس دڵەکەی دەچریکێنێ و بانگ هەڵدەدات.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (عن، گل/١، گل/٦، کو، ف، یح، ر، دیوانی ئەحمەد حەمدی ساحێبقران، نم/١) وە لە چاپکراوانیشدا (کم، گ/٢، س، گ/٣، دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ ساحێبقران، گۆڤاری بەیان ژمارە ٦٤ی تەممووزی ٩٨٠ لە نووسینی مامۆستا جەمال محەمەدئەمین).

هەروەها لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم پارچە هەڵبەستە.

سەمتووری (کم، گ/٢، س، گ/٣، بەیان): سەمتوورە – ئەمیش نابێ و هەڵەیە و لە بەیاندا تەنیا ئەم تاکەی سەرەوە هەیە.

سەمتووری (یح، ر): سمتور.

سەمتووری (ف): سمطورە.

کەللەم (یح، ر): کلّم – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

گەرمە (یح، ر): کرمە.

چریکە و (ر): چریکی.

چریکە و (ف، کم، گ/٢، س، گ/٣): چریکەی.

بانگی (ر، یح): بانک.

بوونی ئەم هەڵبەستە لە هەردوو دیوانە ناوبراوەکەی (حەمدی)دا لەبەرئەوەیە کە (حەمدی) کردوویەتە پێنج خشتەکی (تەخمیس)، بەڵام شەش تاکی، ئەمجا یا پێنج خشتەکی سێ تاکەکەی تر لەناوچوون یا هەر ئەو شەش تاکەی دەستکەوتووە یا خۆی ئەوەندەی مەبەست بووە، چونکە هەڵبەستەکە (٩) تاکە.

٢– ناخوون: نینۆک.

کاری فەرهاد: مەبەستی لەو کەندکارییە هونەرمەندانەیە کە کێوکەنێکی کوردی وەک فەرهاد لە چیای بێستووندا لە عەشقی شیریندا کردوویەتی کە (کوردی)ش ئەو کارەی لە سنگی خۆی وەک کێوی بێستوون لە دەست دێت بەنینۆک نەک بەتەشوێ و قوڵنگ.

شاهوول: شاقوول – واتە ڕاست و دۆخێکی تەواو ڕێک بەشێوەیەکی قنجی (عەمودی) کە شاقوول یا (شاهووڵ) کەرەستەیەکی خانوو دروستکردنە بریتییە لە پارچە ئاسن یا مسێکی بچکۆلە و پەتێک (بەنێک)ی باریک بەناوەڕاستییەوە بەندە، و لەسەر دیوارەوە بەرەو خوار ئاڕاستەی دەکەنە خوارێ وە بەپێش و پاشدا (ڕۆیشتنی) دیواری پێ دەزانرێ.

(کوردی)ش گوایە بەنینۆک سنگی خۆی ئاوا لە شاهووڵداوە وەک شاهووڵییەکەی شاخی بێستوون کە فەرهاد ڕێکوپێک دای تاشیوە.

سینە: سنگ.

نەرمە: نەرمیی سنگی خۆی وەک نەرمی کەژی بێستوون داناوە (ئەم) لەبەر نینۆکی خۆیدا و (ئەو) لەبەر تەشوێی فەرهاددا نەرمن.

بەناخوون (دیوانی حەمدی دەستنووس و چاپ): بەنینۆک.
کاری (یح): کار.
فەرهاد دێ (ف، ر، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، حەمدی دەسنووس): فرهادی.
وەها شاهووله (حەمدی چاپ، گ/٣): وەها شاهۆله – ئەمەش هەڵەیە.
وەها شاهووله (ر، ف، نم/١، کم، حەمدی دەسنووس): وها شاهوله.
سینەم (ف، ر، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، حەمدی دەسنووس و چاپ): ناڵەم.
وەها شاهووله سینەم (یح): بهایوهو لنالم = بەهایووهوو له ناڵەم.
نەرمە (ف، ر، کم، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): گەرمە.
نەرمە (یح): کرمە.
بەناخون کاری (یح): بناخن کار.
٣- ڕۆحی: گیانی، ڕەوانی، جانی.
مەجنوون: مەبەستی مەجنوونی شەیدای لەیلایە. وەک خۆی کە شەیدای یارییەتی.
خەیاڵی: بیری، (ئارەزووی مەبەستە).
دەشت و دەر: مەبەستی لە چۆڵگەڕییەکەی مەجنوونە کە ئەمیش وەک ئەو ڕەهەندەی بیابان بێت.
تەنهایی (یح، ف، کو، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، حەمدی چاپ و دەسنووس): تەنیایی.
گەشتی (ر): گشت و.
گەشتی (یح): کشت.
خەیاڵی (ر): خیال.
خەیاڵی (یح): خیالِ.
٤- غوبار: گەرد، تەپوتۆز – بەڵام مەبەستی لە گەردی ئێسک و پرووسکی لاشەی ڕزیوی (وامیق)ە کە دڵداری (عەزرا) بووە وەک مەجنوون شەیدای لەیلا و فەرهاد و شێفتەی شیرین بووە، کە لەم هەڵبەستەدا ناویان هاتووە – بەڵام (کوردی) واز لەو گەشتە دەهێنێ بەیادی گیانی (مەجنوون)ەوە کە لە تاکی پێشوودا دەری بڕیوە و واز لەوە دێنێ کە گەردی ئێسک و پرووسکی خۆیشی وەک هی (وامیق) (بەهەشت) بێ بەشکو کەوتنی لە بەردەرگای یارەکەیدا پێ لەو بەهەشت چاکتر و پتر ئارامدەرە. بۆیە پاشگەز دەبێتەوە قاپییەکە دەگرێ.
قاپی: دەرگا.
صەبووری: ئارام، پشوو. (صەبووری دەرمە) دیسان (صەبووری دەرگامە)ش دەگرێتەوە.
ئەم تاکە لە (گل/٦، ر، حەمدی چاپ و دەسنووسدا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە.
وامیق (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): واحق – ئەمەش هەڵەی وەرگرتنە.
لە قاپی (گ/٢، س، گ/٣): لە دەرگای.

قاپ: قاچ، واتە لە بەرپێیدا.

گەر بەهەشتە (ف، نم/١، گ/٢، س، گ/٣): گەر بەهەشت بێ.

گەر (یح): کر.

غوباری خاکی (یح): غبار خاک – ڕێنووسی کۆنە.

صەبووری دەرمە (یح، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): خەبەر ئاورمە – ئەمەش پاش و پێشە لەگەڵ تاکی هەشتەمین.

٥- زامی ناخوون: برینی چڕنووک لەخۆگرتن لە خەفەتی دووری و جەوری خۆشەویستەکەیدا.

نەخشی: (نەقشی) وێنەی، شێوەی، ئەم وشەی (نەخشی)یە هەندێ سەرچاوە بە(نەخشی)یان نووسیوە هەرچەندە پیتی (خ)ی وشەکە پڕ بەپڕ و گونجاوی زمانی کوردییە، بەڵام پیتی (ق)ی (نەقشی)یەکە هی زمانەکەشمان نییە تاکو ڕادەیەک تەکەی بەهەندێ پیتی تری وەک (خ، ک)داوە و کەوتووەتە زمانەکەمانەوە.

تۆی بەست: تۆی کێشا – واتە نەخشی تۆی کێشا.

صنعاتەکەی ئازەر: بت تاشی بووە.

ئازەر: باوکی حەزرەتی ئیبراهیمی بت تەراش بووە و، مەبەستی (کوردی)ش لەوەیە کە بەنینۆک لە (لەش) و (ڕوو)ی خۆی شێوەی خۆشەویستەکەی وەک (خاڵ کوتان) کێشاوە یا لە لەشی خۆی کۆتەڵ (هەیکەل = بت)ێکی لە شێوەی خۆشەویستەکەی ویستوویە دروست بکا وەک چۆن ئازەر بەتەشوێ بەردی تاشیوە و کردوویەتی بەبت ئەمیش ئاوا (پەیکەرتاشی) بکات.

ئەم تاکە تەنیا لە (ف)دا شەشەمینە و لەوانی تردا پێنجەمینە.

نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە لە (ف، نم/١، هەردوو دیوانی چاپ و دەسنووسی حەمدی، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا بەم جۆرەی دوایییە.

«دڵم وەک حاکمی مەغدورە قوربان»

ئەم نیو باڵەش لە تاکی دووەمی هەڵبەستی (شەوی یەڵدایە یا دەیجوورە ئەمشەو)ەوە بەهەڵە ئاوێتەی ئێرە کراوە. بڕوانە ئەوێ کە دەردەکەوێ هی ئەوێیە و بۆ ئێرە ناگونجێ.

زامی ناخوون نەخشی (یح، ر، کو): زام ناخن نقش – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

٦- شەم (شەمع – شمع): مۆم – مەبەستی چرا و هەر ڕووناکیدەرێکی تری وەک چرا و، قوتیلە و، فەنەر و، لالەیە.

پەروانە: پەپوولەیەکە بچووک شەیدای ڕووناکییە – بەشەو لە هەر شوێنێ چرایەک، مۆمێک... ببینێ لە دەوری دەفڕێ و ئەوەندە خۆی پیا دەدا هەندێ، جار خۆی دەسووتێنێ و هۆنەران لە هەڵبەستیاندا بەنیشانەی دڵدار ناویان بردووە.

لەسەر ڕێی: مەبەستی (لە ڕێگەی)یە.

وەصڵ: پێک گەیشتن.

ڕەهبەر: ڕێ پیشاندەر، ڕێنوما.

ئەم تاکە لە (هەردوو دیوانی حەمدی دەسنووس و چاپ)دا نییە و لە (ف)دا پێنجەمینە و دیارە پاش و پێش بووە و لە (عن، گل/١، گل/٦، یح، کۆ، ر)دا شەشەمینە و لە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە. لەبەرئەوەی کە هەموو سەرچاوە کۆنە دەسنووسەکانی ئەم هەڵبەستەیان بەشەشەم داناوە.

لە دەوری شەم (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): لە دەوریشم – دیارە ئەمانە بەهەڵە لە ڕێنووسە کۆنەکەیان وەرگرتووە کە:

لە دەوری شەم (یح، ر): لدوریشم.

لە دەوری شەم (کو): لدورشم.

گەڕا (نم/١): کەرا.

گەڕا (ف): اگر.

گەڕا (یح): کرا.

لەسەر (ر): اسر (ئەسەر).

لەسەر ڕێی (یح): لسرروی.

تۆ ڕەهبەر مە (نم/١): نوری هجرمە.

تۆ ڕەهبەرمە (گ/٢، کم، س): نوری هجرە.

تۆ ڕەهبەرمە (گ/٣): نووری هیجرە.

٧- یاوەر: هاودەم، کۆمەککار، یاریدەدەر، پشتیوان.

و یاوەرمە: مەبەستی یا (غەمی یاوەرمە) وە یا (غەمی بێ یاوەریمە)یە یاوەرەکەش ئای بۆ (کوردی) خۆی و، یا یاوەری یارەکەیەتی.

ئەم تاکە لە هەردوو دیوانی (حەمدی) چاپکراو و دەسنووسدا چوارەمینە و لە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لە (ف، یح، ر، کو، عن، گل/١، گل/٦)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە. ئەمجا لەبەرئەوەی لە هەموو سەرچاوە کۆنە دەسنووسەکانی ئەم هەڵبەستەماندا ئەم تاکە حەوتەمینە، بۆیە کردمە حەوتەمین.

بوون بە (نم/١، هەردوو حەمدی): بوونە.

دوشمن (گ/٢، س، گ/٣، هەردوو حەمدی): دوژمن.

غەمی (گ/٢، س، گ/٣): خەمی.

غەمی (ر): غم.

بێ یاری بوو یاوەرمە (یح، ر): بی یار و بی یاورمە.

بێ یاریی و یاوەرمە (کو، کم، گ/٢، س، گ/٣): بی یاوەری یاوەرمە.

بێ یاری بوو یاوەرمە (ف): باوری یاوەرمە.

بێ یاریی و یاوەرمە (نم/١): بی یادەری یاوەرمە.

بێ یاریی و یاوەرمە (هەردوو دیوانی حەمدی چاپ و دەسنووس): بی یاوەری و یاوەرمە.

٨- بۆی: بۆنی، بێنی.

ویصال: پێکگەیشتن.

نەسیم: بای بەرەبەیان – کە هۆنەران زۆر جار دەیکەنە نامەبەر یا نامەهێن.

صوب: (صوبح – صبح)، بەرەبەیان، بەیان.

خەبەر ئاوەر: خەبەرهێن، مژدەهێن، دەنگدەر، کە بای (نەسیم)ەکە خەبەری بۆ دێنێ.

لە تاکی چوارەمیندا نیشانەم بۆ ئێرە کرد، کە ئەم (خەبەر ئاوەر)ە لە هەندێ سەرچاوەدا ئاوێتەی ئەوێ بووە و (صەبووری دەر)ەکەی ئەوێ، ئاوێتەی ئێرە کراوە، بەڵام بەپێی سەرچاوە کۆنەکان و گونجانی واتا کە (بۆن) هی (نەسیم)ە کە (خەبەر) دەهێنێ، بۆیە وەک لە سەرەوە هاتووە، ئەم تاکە و تاکی چوارەمم جێگیر کرد – هەڵە و دووبارەیی نەما.

ئەم تاکە لە هەردوو (دیوانی حەمدی) ناوبراودا نییە و لە (ر)دا حەوتەمینە، چونکی تاکێک لەم سەرچاوەیەدا ناتەواوە و لەوانی تردا هەشتەمینە.

جوانی و، وردەکاری (بەپێی وێژەی دێرین) لەم تاکەی سەرەوەدا هەیە، وەک جیناس ئارایی (بۆی) و (تۆنی)دا و پەیوەندیی بۆی نەسیمی خەبەرهێنەوە.

ویصاڵی تۆی تێدایە (ر): وصال توی دی سما.

ویصاڵی تۆی تێدایە (کو): وصال توی بدایە.

ویصاڵی تۆی تێدایە (یح): وصال توی تێدا بێ.

نەسیمی صوب (یح، ف): نسیم صب.

نەسیمی صوب (ر): نسیم صب.

نەسیمی صوب (نم/١): نسیم صبح.

نەسیمی صوب (کم، گ/٢، س، گ/٣): نەسیمی صوبح.

خەبەر ئاوەرمە (ر): حور آورمە یا حبور آورمە.

٩- شۆر: سەودا، عەشق، ئارەزوو.

باز: دیسان، (باز) ناوی مەلێکی گۆشتخۆری ڕاوکەر و چاو جوانە ئەشێ مەبەستی ئەمە بووبێ. هەروەها (سەرباز) بەواتە سوپایی کە، ئارەزوو و(شۆر)ی (جەنگ)ی بووە و بووەتە (سەرباز) یا ئارەزووی کەوتووەتە سەر (سەربازێتی – سوپاییێتی)، یا (سەری) خۆی وەک (باز) ئارەزووی (ڕاو)ی یارەکەی خۆی کردووە.

هەروەها بەرێنووسی کۆن (سەر) بەشێوەی (سر) دەنووسرێ کە بەسیرِ = س□ر□ = نهێنیش دەخوێنرێتەوە و ئەمەش بۆ هەڵبەستەکە دەگونجێ – کە هەموو ئەمانە بێ گومان دەست

ئەنقەست و بەوەستایی (کوردی) وەک وردەکاری گردی کردوونەتەوە لەم تاکەدا و ئەمیش لە وێژەی کۆندا جوانی و پەسندی بوون.
ئەم تاکە لە (یح)دا نییە وە لە هەردوو دیوانی دەسنووس و چاپی (حەمدی)دا شەشەمین و لە (ر)دا هەشتەمین و لەوانی تردا نۆیەمین تاکە و لە هەموو ئەو سەرچاوانەدا کە هەیە دوا تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
دیسان (گل/١): دیسا.
دیسان (ر): همیسان.
کوردی (کو، ف، بەیان): هجری. بەڵام (من) بۆ ئێرە (کوردی)یە کە بەڕاست دەزانم.
کە دەردی سەرمە (کو): کە داوای سرمە.
کە دەردی سەرمە (ف): کە داد سرمە.
کە دەوری سەرمە (گ/٣): لە دەردی سەرمە.

٥٩

## ئەجەل یاران

١- ئەجەل یاران سەری لێ داوم ئەمشەو
لەگەڵ مەرگم کە تێک ئاڵاوم ئەمشەو

٢- بەتیری کافر و جەللادی بەدخوو
برینداروزەدە و ئەنگواوم ئەمشەو

٣- نیشانەی مەرگمە بۆ خۆم دەزانم
سەری کردووە لە دەم زووخاوم ئەمشەو

٤- لە حاڵی غەرغەرە و ئاخر نەفەسدام
بکەن کارسازی کفن و ئاوم ئەمشەو

٥- بدەن بەو کافری بێ ڕەحمە موژدە
کە (ئەو خۆش) وا لە گیان ئاراوم ئەمشەو

٦- وەرن دەورم بدەن، خواکەی ڕەفیقان
لە نێوان هەڵدەگیرێ ناوم ئەمشەو

٧- دیفاعم حەق دەکا (کوردی) قیامەت،
ئیتر دەبڕێ لە چاوتان چاوم ئەمشەو

.................................................................

١- ئەجەل: مردن، ڕواڵەتی مردن، گیان دەرچوون.
سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە تەنیا سێ سەرچاوەی دەسنووسە و ئەوانیش (عن، حم، ق)ە و لە نێوانیاندا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە هەرسێ سەرچاوەکەشدا ئەم تاکەی سەرەوە چوونیەکە لە سەرەتای هەڵبەستەکەیە.

٢- کافر: ئەوی بڕوا بەخوا و پێغەمبەر و ئاین نەکات.
جەللاد: ئەوی بەفرمانی میری سەری تاوانباران دەبڕێ یا دەیانکوژێ یا لە سێدارەیان دەدا.
زەدە: لێدراو، کاری خراپ و زیانی پێکراو، پێکراو، ئەنگێوراو.
ئەنگواو: ئەنگێوراو، پێکراو.
جەللادی (ق): جلاّد.

بەدخوو (ق): ئەم وشەیە چاک ناخوێندرێتەوە، وەک شێوەی (بختر) وە یا (شبخیز) نووسراوە. بەڵام لە هەردوو سەرچاوەکەی تردا (بەدخوو)ە.

زەدە و (ق): زدەء.

ئەنگواوم (ق، حم): انکواوم.

٣- زووخاو: ئەو کەف و تەڕاییەیە کە لە کاتی مردندا لە دەمی مرۆڤەوە سەر دەکات، کێم، زووخ، عەذاب، خەفەت و، ئەم هەموو واتایەش بۆ ئەم تاکە دەگونجێن.

وا دەردەکەوێ لەم پارچە هەڵبەستەیدا و بەتایبەتی لەم تاکەیدا (کوردی) چێژی لە (نالی) وەرگرتبێ وەک: لەم تاکەی (نالی)دا هاتووە:

«ئـەوا نیشـانەیی مەرگـم عەیانـە،

کە من غەرقی غەم و خوێن و زووخاوم»

٤- غەرغەرە: قرخە قرخی کاتی مردن.

ئاخر نەفەس: دوا هەناسەی ژیان.

کارسازی: ئامادەکاریی ڕێکخستنی کار، پێکهێنانی کار.

کفن و ئاو: مەبەستی ئامادەکردنی کفن و ئاوی پێ شۆشتنی لەشە مردووەکەیەتی.

٥- بێ ڕەحم: بەبەزەیی، دڵڕەق - مەبەستی لە (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابان بووە.

ئەو خۆش: واتە بەهۆی مردنی (کوردی)یەوە ئەو کافرە شاد.

گیان ئاراو: گیاناراو، گیانەڵاو، کاتی سەرەمەرگ.

بدەن (ق): بلین.

بدەن (حم): بلین - ئەمیش هەڵەیە و نابێ.

کافری (ق): کافرەء.

٦- خواکەی: توخواکەی، لە ڕێی خوادا.

وشەی نێوان = (ناو)تان و (ناو)م هەریەکەی واتایەک دەدات و ئەوی یەکەمیان مەبەستی لە (نێوتان)ە وەک لە (عن)دا هاتووە و ئەوی دووەمیان مەبەستی ناوی (کوردی) خۆیەتی، بەڵام کۆنەکان ئەوی یەکەمیان بە(نێوتان) دەربڕیوە وەک لە هەڵبەستی تری (نالی) و (سالم) و... هتددایە.

وەک لە تاکی سێیەمدا نیشانەم بۆ کرد کە (کوردی) چێژی ئەم تاکەشی لە (نالی) وەرگرتووە کە وتوویە:

«مەکەن مەنعم لە شیوەن ئەی ڕەفیقان

کە مەحزوون و غەمین و دڵشکاوم»

ئەم تاکە لە (ق)دا دوا تاکی پارچە هەڵبەستەکەیە و لەبەرئەوەیە کە لەم سەرچاوەیەدا نیشانە بۆ هۆنەرەکەی نەکراوە چونکە (نازناو) لە تاکی دواییدایە کە نازناوی (کوردی)ی پێوەیە و

لێرەدا نییە.

لە نیوتان (ق، حم): لە ناوتان.

٧- دیفاع: بەرگری.

حەق: مەبەست لە خوایە. هەرچەندە ڕاستی و پاکیی خۆیشی دەگرێتەوە. لێرەدا کوردی بێ گوناهیی خۆی دەربڕیوە، ئەوەندە چاک بووە لە ژیانیدا.

قیامەت: ڕۆژی حەشر کە خوا دەکەوێتە لێپرسینەوە.

دەبڕێ لە چاوتان: لە بەرچاوتان نامێنم و ئەمەش (کینایە - ئیدیۆم)ێکی کوردییە.

ئەم تاکەی سەرەوە لە (ق)دا نییە و تەنیا لە (عن، حم)دا حەوتەمینە.

دەکا (حم): اکا - ئەمیش دەسکارییە.

دەبڕێ (حم): ابری - ئەمیش دەسکارییە.

بەدڵنیاییەوە جێگیری دەکەم (وەکو بیستووم) ئەم پارچە هەڵبەستەی دوا هەڵبەستی کوردی بووە لە ژیانیدا و خۆی نەیتوانیوە بینووسێ و، خزمانی نووسیویانەتەوە.

٦٠

## زەمانی فیرقەتی یارانە

چامەی یەکەم

١- زەمـانی فـیـرقـەتی یارانە ئەمـشـەو،
لە چاوەی چاو کە خوێن بارانە ئەمشەو
٢- زەمــانە ڕۆژی کــردینە شــەوی تار
صـەفای (ئەسـتـانە) و (تاران)ە ئەمشەو
٣- ئەگـەرچی جـەژنی خـەڵقە، وا لـە بۆ من
هـەوایی تەعــزیەدارانە ئـەمــشـــەو
٤- لـە لایێ شـین و، لایێ بـەزم و شــــادی
یەقـین دیاریی سـتـەمکارانە ئـەمـشـەو
٥- بـەبالآی دڵ، کـــە کـــالآی غـــەم بڕاوە
وەکـو تـەخـتـی بەبە وێرانە ئەمــشــەو
٦- لە گـوێی دڵدا صـــەدایێ دێت مـەظننە
زڕەی زنجـیـرەکـەی جـارانە ئـەمـشـەو
٧- زڕەی زنجـیری دڵ پـەیوەسـتـی عـەرشـە
لـە دووریی ڕوویی دڵدارانە ئـەمــــشـــەو
٨- زڕەی زنجـیـر و کـۆتی دڵ کـە هەڵسێ
نیـشـانەی کۆچی شـا و یارانە ئـەمشـەو
٩- عـەجـائب نامـرێ (کـوردی) ڕەفـیـقـان
کە وەختی ڕیحلەت و هیـجرانە ئەمشەو

---

١- زەمانی: کاتی، دەمی، هەڕەتی، سەرێنی، سەردەمی - بێ گومان ئەم هەڵبەستە دوای ڕووخانی بابان و ڕەوکردنی گەورە پیاوانی بووە لە (سلێمانی) لەتاو خراپی عوسمانییەکان.
فیرقەت: لێک بڕان، جیایی، جیابوونەوە، ڕەوکردن.

یاران: مەبەستی لە ئەحمەد پادشای بابان و دەستوپێوەندەکەیەتی کە دوای ڕووخانی بابان لە لایەن (عەبدوڵڵا پاشای) بابانەوە بەپشتیوانیی (عوسمانی)ی کە لە ژێرەوە لەگەڵ عەجەمیشدا هاوپەیمان بووە، بۆ لەناوبردنی فەرمانڕەواییی بابان.

سەرچاوەی دەسنووسی ئەم هەڵبەستە: (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ف، ر، ش، ما، ق/٤، نم/١، با، م)ە و سەرچاوەی چاپکراویشی: (کم، گ/٢، س، گ/٣ وە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێی» ژمارە/٥٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٦ بەغدایە کە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی نووسیویە.

لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی؛ چونکە هەموو تاکەکانی ئەم پارچە هەڵبەستەی بەڕێکوپێکی تر تیایە.

هەروەها (عن) لە سەرەناوی ئەم هەڵبەستەدا ئەم پەراوێزە (فارسی)یە بەنرخەی خوارەوەی نووسیوە کە:

(کردی بە مناسبت رحیل بعد از سقوط احمد پادشا یبە رحمها اللە سەه قصیدە آتیەء با مطلع «زمانی فیرقەتی یارانە امشو» فرمردە – علی).

– قصیدەء أول –

واتە: («کوردی» بەبۆنەی کۆچکردنی دوای ڕووخانی ئەحمەد پادشای بابانەوە لە سولەیمانی خوا بیانبەخشێ سێ چامەی دوایی بەسەرەناوی «زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو» فەرمووە – عەلی).

(چامەی یەکەم) کە مەبەستی ئەم هەڵبەستەی سەرەوەیە. وەکو دەردەکەوێ کە (کوردی) ئەم هەڵبەستەی سەرەوە و هەردوو پارچە هەڵبەستەکەی دوای بەڕستەی «زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو» کەوا پڕ بەپڕی بۆنەی بۆ وتنەکەیە، دەست پێ کردووە، و، لە (عن)دا لەسەر هەریەکێ لە سێ پارچە هەڵبەستەکەش بەڕیزە ئەم سێ سەرەناوەی: (قصیدەء اول)، (قصیدەء دویم) و (قصیدەء سیوم)ی نووسیوە بەواتە (چامەی یەکەم)، (چامەی دووەم) وە (چامەی سێیەم) و هەمان سەرەناویان: لە جێگەی سەرەناوەکەی خۆیاندا کە بریتییە لە نیو باڵی یەکەم لە هەر پارچە هەڵبەستێک وە بۆ ئەوەی لەیەکیش جیا بکرێنەوە، چونکە ئەگەر ئەم یەکەم و دووەم و سێیەمەیان نەدرێتێ هەموو یەک سەرەناویان دەبێ و جیا ناکرێنەوە. هەروەها زنجیرەی یەک لە دوای یەکی هەرسێ پارچە هەڵبەستەکەشم بەپێی دانانی (عن) وەرگرتنە ئەم پەراوییەوە و، ئەم تاکەش لە هەموو سەرچاوەکاندا یەکەمە. بەو هۆیەوە کە تاکەکانی ئەم پارچە هەڵبەستەی سەرەوە و هی دوو پارچە هەڵبەستەکەی دوایی لەیەک دەچن و، بۆ یەک ئامانج گوتراون و لەسەر یەک کێش و پاشبەندن، بۆیە لە سەرچاوەکانی هەرسێ پارچە هەڵبەستەکەدا تاکەکانی ئەم ئاوێتەی ئەویتریان بووە بۆ هەندێ تاکیش لەم سەرچاوەدا هەیە لەویتردا نییە، بەپشتیوانیی سەرچاوەی کۆن و باوەڕپێکراوەوە توانیم هەرسێ هەڵبەستەکە لەیەک جیا

بکەمـەوە و تـاکی هـەریەکێ لـە شـوێنی خـۆیدا جـێگیـر بکەم، وەک لە لێکۆڵینەوەکـانیـاندا ئەم ڕاستییانە دەردەکەون.

زەمانی فیرقەتی یارانە (ش): زمان فرقت یاران.

کە خوێن بارانە (ق/٤، ڕۆشنبیری): خوون بارانە.

زەمانی (ڕۆشنبیری): زەمانەی.

٢- زەمانە: ڕۆژگار، سەروەخت.

تار: تاریک، ڕەش، نووتەک.

صەفا: خۆشی، دڵ پێکرانەوە، شادمانی.

ئەستانە: ئەستەمبووڵ - پایتەختی عوسمانیی ئەوسا و مەبەستی لە بەرەی عوسمانییانە بەشکاندنی بابان.

تاران: پایتەختی ئەوسای قاجارییەکانی عەجەم (ئیران) کە مەبەستی لە قاجارییەکانی هاوپەیمانی عوسمانییە بۆ لەناوبردنی بابان بەهۆ و ڕێنومایی عەبدوڵڵا پاشای بابانەوە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و دووەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

تاران (ما، م): طهران.

٣- خەڵق: مەبەستی لە بەرەی عوسمانی و عەجەمە بەگشتی و لە دەسوپێوەند و هاوکارەکانی عەبدوڵڵا پاشای بابانە بەتایبەتی.

هەوای: شیوەنی، مەبەستی (وەکێتی)یە = وەکو پرسەدار وەهام.

تەعزیەدار: ئەوەی کەسێکی بمرێ و بەپێی دەستووری کۆمەڵایەتی چەند ڕۆژێک پرسە دابنێ و خەڵکی بەپرسەوە بێن. (کوردی)ش بەڕووخانی فەرمانڕەوایی بابان و لە سولەیمانی دەرچوونی ئەحمەد پاشا، خۆی بە تەعزیەدار داناوە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و سێیەمە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

ئەگەرچی (گل/٦): اگر - ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

خەڵقە (گل/٦): خلقان.

وا لە بۆ من (گل/١، گل/٦): جا لبو من.

هەوایی (گل/٦): هوای.

٤- لایێ شین: مەبەستی بەرەی ئەحمەد پاشای ڕووخاو و نیشتمانپەروەرانە.

لایێ بەزم و شادی: مەبەستی لە دەستەی عەبدوڵڵا پاشای ڕووخێنەرە.

یەقین: بەڕاستی، بێ گومان.

ستەمکاران: بەرەی عەبدوڵڵا پاشا و عەجەم و عوسمانی پشتیوانیەتی.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

لایێ شین و لایێ (م): لایە شین و لایە.

یەقین (م): بەڵێ.

٥- کالا بەبالا بڕان: نیشانە بۆ کینایە (ئیدیۆم)ێکی کوردییە کە دەڵێ (کالایە و بەبالای بڕاوە) وە پەندی پێشینانیشە - کە (کوردی) زۆر جار لە هەڵبەستەکانیدا پەنای بردووەتە بەمرئەم جۆرە وتەی پێشینانەمان. لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە کالای غەم بەبالای دڵی بڕاوە لەبەر ئەو کارەساتە تووش و ناخۆشە.

تەختی بەبە: پایتەختی بابان، شاری سولەیمانی مەبەستە، هەرچەند لە پێشتردا قەلاچوالان بووە کە ئەمیان لەبەر چۆڵکردن و (سولەیمانی)یش لەبەر جەنگ و هەرای داگیرکەران وێران بوون. (کوردی) دڵی خۆی وەک ئەوان بەوێران (کاول) داناوە.

ئەم تاکەش لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و پێنجەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

تەختی (گل/١، گل/٦، ما): تخت.

جوانی لەم تاکەدا جیناس ئارایی (بالا و کالا)یە.

٦- صەدا: دەنگ، ئاواز، بانگ.

مەظننە (مَظْنَّە): مەزندە، مەزننە، باقڵ، وا دیارە، لەوە دەچێ.

زڕەی زنجیرەکەی جاران: نیشانەیە بۆ پیلانگێڕانی تری عەبدوڵڵا پاشا لە دژی پاشاکانی پێشووی بابان و هەرجارە بەفیتی لایەکی (عوسمانی) یا (ئیران) و (مەمالیکەکانی) بەغدا و والی بێگانەکانی (ئەردەلان) یا (کرماشان)، کە مێژوو ئەمانەی ڕوونووس کردوون تۆمار کراون.

ئەم تاکە لە (ف، ش، نم/١، با، ق/٤، کم، گ/٢، س، گ/٣) سێیەمینە و لە (ر)دا چوارەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە (ڕۆشنبیری)دا نییە.

دێت (ما، ر، ف، م): دی.

مەظننە (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣، م): مەزندە.

مەظننە (ش، ما): مزنە.

مەظننە (ق/٤): مەزنە.

زنجیرەکەی جارانە (ما، ش): زنجیرکی جاران.

زنجیرەکەی (ر): زنجیرکەء.

٧- پەیوەست: بەندیوار.

عەرش: شوێنی خوا لە ئاسمانی حەوتەم، لای (سەدرەتولمونتەها) – کە هانای دەباتە بەر – یا لە ئاکامی تەختی نوێیەوە ڕەچاوی زڕەی زنجیری کردووە. لە نادادیی عەبدوڵڵا پاشا. دووریی ڕووی دڵداران، بەدوورکەوتنەوەی ئەحمەد پاشا و دەسوپێوەندەکەیەتی.

ئەم تاکە لە (ق/٤، ڕۆشنبیری)دا سێیەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا حەوتەمینە و لەوانی تردا نییە و لەوە پێشا کە هەیە، چوونیەکە.

٨- کۆت: کۆتەرەدارێکی گەورە یا بنکەدارێکی ئەستوورە، بەدرێژیی دوو قاشی دەکەن و هەردوو قاشەکەی بەرامبەر بەیەک ئەوەندەی لوولاقی زەلامێکی تیا بەند بێ دەیکۆڵن و لە هەردوو تەنیشتییەوە شیش و قوڵفە و قفڵی لێ دەدەن بەیەکەوە لاقی (بەندیی) تیا گرێ دەدەن لە بەندیخانە کۆنەکاندا. بۆ ئەوەی بەندیی لەبەر قورسییەکەی هەڵنەیەت و سزاش بکێشی. ئەمجا زڕەی (کۆت مەبەستی لە زڕەی شیش و قفڵەکەیەتی و ئەو زڕەیەی بەنیشانەی فیتی دوشمنان و هەڵاتنی پاشا و دۆستانی داناوە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و هەشتەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە لەوانەیشدا کە هەیە، چوونیەکە جگە لە: شا و یارانە (ما) شای خووبانە.

٩- عەجائب: جێگەی سەرسامییە، سەرسوڕمانە.

ڕیحلەت: کۆچکردن.

هیجران: جیابوونەوە و مەبەستی ئەحمەد شا و یارانیەتی. (کوردی) ئەوەندەی بەلاوە ناخۆش بووە کە بە(عەجائیب)ی زانیوە نامرێ.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا نۆیەمینە و لە (ق/٤، ڕۆشنبیری نوێ)دا شەشەمینە و لە هەمووواندا دوا تاکە و لەوانی تردا نییە.

ڕەفیقان (ما، ق/٤، ڕۆشنبیری): بەوللە.

کە وەختی ڕیحلەت و هیجرانە (ما، ق/٤، ڕۆشنبیری): کە وقتی کۆچی نازارانە.

(کوردی) (ق/٤، ڕۆشنبیری): مەفتوون – هەروەک خاوەنی هەڵبەستەکە (مەفتوون) ناوێک بێ وایە لامان وایە هەڵەیە؟ ڕۆشنبیریش لە کەشکۆڵی (مامۆستا سەید حەبیب)ی وەرگرتووە، لە هەمان نوسخەی (سەید حەسیب) لە (ق/٤) و لە (ح = حەمەبۆر)یشدا هەیە.

٦١

## زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو

چامەی دووەم

١– زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو

ئوفوولی زوهرەیی پایانە ئەمشەو

٢– بڵێسەی ئاگری شەوقی دەروونم

وەکو دۆزەخ سزای طۆفانە ئەمشەو

٣– لە ئەشکی لەعل گوونی چاوی تارم

لە ئەفلاکا مەلەک گریانە ئەمشەو

٤– لە بێ ئارامیا، چۆن شەق نەبا دڵ؟؟

لە جەوری دڵڕەقی جانانە ئەمشەو

٥– تەرازووی دەهرە، خۆشی بێ لە ئەغیار،

کە جووڵەی شایەن و شایانە ئەمشەو

٦– لە کەعبەشدا، لە ئەغیار (صەد) بەرائەت

کە هێند بێ شەرت و بێ پەیمانە ئەمشەو

٧– کەوا شاهم لەسەر عەزمی ڕەحیلە

دڵ و جانم لە ڕێی، پایانە ئەمشەو

٨– سەرم مەستی شەرابی ئەشکی سوورە

لە جۆشی دڵ جگەر، بریانە ئەمشەو

٩– عەشق گەرچی بەئازاریشە (کوردی)

فیراق پارسەنگی دەرد و ژانە ئەمشەو

---

١– ئەم نیو باڵی یەکەمەم لە پەراوێزی هەڵبەستی پێشوو (چامەی یەکەم)دا لێک دایەوە، پێویستی دووبارەی نابینم.

ئوفوول: ئاوابوون، مەبەستی لە ڕووخانەکەی بابانە.

زوهره: یەکێکە لە ئەستێرەکانی کۆمەڵەی ڕۆژی (المجموعە الشمسیە) و یەکجار جریوە جریوکەر و بریسکەدارە هەندێ جار بەرەبەیان و هەندێ جار سەر لە ئێواراندا هەڵدێ و شەو ئاوا دەبێ، لە کوّندا بە(خـوای جـوانی) ناوبراوە. (کوردی)ش لەبەر ئەم ڕواڵەتە ناوی بەفەرمانڕەوایی بابانی هاوتا کردووە.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م، ق/٤، ڕۆشنبیری نوێ)یە کە لە سەرچاوەکانی هەڵبەستی پێشوودا لێی دوام، هەروەها (عن)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە. کە بەپێی پەراوێزی (عن) لە هەڵبەستی پێشوودا (کوردی) ئەمیشی بۆ چۆڵکردنی سولەیمانی لە لایەن ئەحمەد پاشاوە دوای ڕووخانی بابان گوتووە و ئەم هەڵبەستە (چامەی دووەمینە) و، ئەم تاکە لە هەمووواندا یەکەمینە و تەنیا لە (ق/٤، ڕۆشنبیری نوێ)دا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٢– شەوق: ئارەزوو.

دۆزەخ: جەهەننەم.

طۆفان: لافاو.

ئەم تاکە لە (ق/٤، ڕۆشنبیری)دا چوارەمینە و لەوانی تردا دووەمینە.

ئاگری شەوقی (ق/٤): آگر شوق.

سزای (ڕۆشنبیری): نەڕای – وا دیارە بەهەڵە وەرگیراوە.

٣– ئەشک: فرمێسک.

لەعل گوون: لەعل ڕەنگ، واتە: سوور – لەعلیش بەردێکی بەنرخ (گەوهەر)ێکی ڕەنگ سوورە.

تار: تاریک، ڕەش داهاتوو، لێڵ، کە لە گریانا وای لێ هاتووە.

ئەفلاک: مەبەستی لە ئاسمانەکان و گوایە شوێنی فریشتەیە.

مەلەک: فریشتەی ئاسمانی – گوایە بەزەییان بە(کوردی)دا دێتەوە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا دووەمینە و لە (ق/٤، ڕۆشنبیری)دا پێنجەمین تاکی ئەم چامەی دووەمەیە.

لەعل گوونی (ق/٤): لعل کونی.

تارم (ما، ق/٤، ڕۆشنبیری): کوێرم.

گریانە: بە(گریانە)ش دەخوێندرێتەوە و دەشگونجێ (واتە گریان گرتووە، هاتوونەتە گڕ و جووڵە).

٤– جەور: ستەم، زۆر.

جانان: هەرچەند بەواتەی (گیانان)یش دێت، دیسان مەبەست و واتای (جادووکار، حیلەباز، دەسبڕ، بێ ڕاز)یش دەدات کە مەبەستی لە عەبدوڵڵا پاشای بابان و هاوچەشنەکانی بووە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و

هێشتە چاپیش نەکراوە و لەو سەرچاوانەشدا کە هەیە چوونیەکن.

٥- دەهر: ڕۆژگار، گەردوون.

ئەغیار: بێگانان – ئەوانی خراپکارییان کردووە لەو کارەساتەدا.

جووڵە: مەبەستی بەرز و نزمیی ئەملا و ئەولای تەرازووەکەیە کە گوایە ئەمە ڕۆژە و جارێ بۆ (ئەم) و جارێکی کە بۆ (ئەو) خۆشییان لێ بێ.

شایەن: ئەو سەنگەیە کە لە تەرازوودا شتی پێ دەکێشرێ، وەک هۆقە و کیلۆ و تەن و... هتد، مەبەستی لە بەرەی عەبدوڵڵا پاشایە کە وەک پارسەنگی تەرازوو و (شایەن) ڕۆژگار خستووینییە جووڵە و باو...

شایان: لایق و مەبەستی ئەحمەد پاشا و بەرەکەیەتی.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و پێنجەمینە و لەوانی ترا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە و لە هەموو سەرچاوەکانیدا چوونیەکە.

٦- کەعبە: مەبەستی لە (مەکە) و (قیبلە)یە و شوێنی حەج.

بەرائەت (البراءة): نیشانەیە بۆ چەندان ئایەتی قورئانی وەک نۆزدەیەمین سوورەتی (الانعام)، چل و هەشتەمینی (الانفال) و سێیەمین (التوبة) و دووسەد و شانزەمین (الشعراء) و چوارەمینی (الممتحنة) و... هتد کە خوا خۆی و پێغەمبەرانی لە کافران و موشریکان و درۆزنان و خراپکاران و... هتد جیا کردووەتەوە ئافەرۆزی کردوون، ڕێگەی حەجکردنیشیان لەگەڵ ئیسلامەکاندا لە کەعبەدا لێ قەدەغە کراوە و کوردییش نەک لە سلێمانی وێراندا بەشکو لە کەعبەدا لە جێی جارێ صەد جار ئەغیاری ناوێ.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا شەشەمینە و لەوانی ترا نییە و لە هەمووان‌دا چوونیەکە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٧- شاه: مەبەستی ئەحمەد پاشای دوا پاشای بابانە.

عەزم: ئارەزوو، ویستن، خواست.

ڕەحیل: کۆچکردن، بارکردن، لە شوێنی خۆ چوونەدەر.

جان: گیان، ڕەوان.

پایان: کۆتایی – واتە بالاگەردانی ئەوە، گۆڕیی ئەوە، (پایان) = (پێ)یان.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و حەوتەمینە و لە هەموواندا چوونیەکە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

٨- جۆش: کوڵ و ئارەزووی دڵ.

بریان: سوورکردنەوە – واتە بەگەرمیی جۆشی دڵەکەی.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دایە و هەشتەمینە و لە هەمووان‌دا، چوونیەکە و لەوانی تردا هێشتە چاپیش نەکراوە.

٩- عەشق: دڵداری و مەبەستی خۆشەویستیی ئەحمەد پاشا و نیشتمانە.

فیراق: جیایی، لێکدابڕان.

پارسەنگ: ئەو سەنگ (قورسی)یەیە کە باری لارەسەنگی پێ ڕێک دەکرێ و دەخرێتە لای تای سووکییەوە بۆ چوونیەکبوونەوەی هەردوو تا. مەبەستی لەوەیە کە لێک بڕانەکە پارسەنگی ئازار و دەرد و ژانە.

ئەم تاکە لە (عن، ما، م)دا نۆیەمینە و لە (گل/١، گل/٦، گل/٨)دا دەیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

عەشق گەرچی بەئازاریشە کوردی (گل/١): عشق بو من آزاردره امّا.

عەشق گەرچی بەئازاریشە کوردی (ر): لە عشقا بو من آزاردره امّا.

فیراق پارسەنگی دەرد و ژانە (گل): فراق یارە آزارانە.

پارسەنگی دەرد و ژانە (ر): پارسنگ آزارانە.

٦٢

## زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو

چامەی سێیەم

١- زەمانی فیرقەتی یارانە ئەمشەو
شنۆی بای هیجری نازدارانە ئەمشەو

٢- صەدای تەپڵی فیراقم دێتە گوێوە
سەعاتی نەحسی بێدارانە ئەمشەو

٣- فیراقی یارە، ڕێی هات و نەهاتە
ڕەحیلی شاه، ڕووەو شارانە ئەمشەو

٤- لە صەحرای سینە خاری غەم ڕواوە
لە هەوری دڵ، خەفەتبارانە ئەمشەو

٥- کەبابی دڵ لە ئەشکی دیدە سوێرە
لەکن من جەژنی مەیخوارانە ئەمشەو

٦- بەڕوومدا قەطرەیی ئەشکم کە دەتکێ
خیضابی دەستی ئەغیارانە ئەمشەو

٧- حەریری زەرد و سووری ڕەنگ و ئەشکم
مەتای کاروانی غەمبارانە ئەمشەو

٨- حەیات و مەرگ و، وەصڵ و هیجر جووتن
دەڵێی بوحرانی بیمارانە ئەمشەو

٩- مەکەن مەنعم لە ئاه و ناڵەی (کوردی)،
صەبووری؛ خووی ڕیاکارانە ئەمشەو

........................................................................

١- دیسان بەپێویستی نازانم کە نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە لێک بدەمەوە، چونکە لە هەڵبەستی پێشتردا: (چامەی یەکەم)دا، لێکم داوەتەوە.
شنۆ: شنە.

هیجر: دووری، جیایی.

نازداران: خۆشەویستان و، مەبەستی لە ئەحمەد پاشا و داروودەستەکەیەتی.

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، ف، ش، ر، ق/٤، با، نم/١، م)و، لە چاپکراوانیشدا (کم، گ/٢، س، گ/٣، گۆڤاری (بەیان) ژمارە/٦٤ی تەممووزی ١٩٨٠ی بەغدایە کە مامۆستا جەمال محەمەدئەمین تاکی یەکەمی ئەم هەڵبەستەی تیا بڵاو کردووەتەوە و ئەویش لە کەشکۆڵێکی دەسنووس لاپەڕە/١٨٣ی وەرگرتووە و ئەم هەڵبەستە کە (٩) تاکە بە(٧) تاکی داناوە، هەروەها گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە/٥٠ی حوزەیرانی ١٩٧٦یش سەرچاوەیەکی ترە کە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی شەش تاک لەم سێ پارچە هەڵبەستی (چامەی یەکەم و چامەی دووەم و چامەی سێیەم)ەی نووسیوە و گوتوویە کە لە کەشکۆڵی (مامۆستا سەید حەبیب)ی وەرگرتووە بەڵام من لام وایە کە (مامۆستا سەید حەسیب)ە نەک (سەید حەبیب)، چونکە منیش و (ق/٤)یش لە (سەید حەسیب) هەمان هەڵبەستمان وەرگرتووە.

ئەوی شایانی وتنە کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوەش (چامەی سێیەم) دیسان (کوردی) بۆ کۆچی پاش ڕووخانی ئەحمەد پاشای وتووە بەپێی پەراوێزەکەی (عن) کە کردمە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئێرەش.

زەمانی فیرقەتی یارانە (ش): زمان فرقت یاران.

شنۆی (نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): شنەی.

بای (ر): یار – وا دیارە ئەمە هەڵەی وەرگرتنە لە نووسینی فارسییەوە کە لە شێوەی فارسیدا پیتی (ی)ی دوایی و تەنیا وەک پیتی (ر)یەکی درێژ و داکشاو دەنووسن، ئەمجا لە وەرگرتنا (بای) بووە بە(بار) و نوختەی (ب) (بار)ەکەش گەورە کراوە و بووەتە (یار).

هیجری (ش، ر): هجر.

هیجری (لە بەیان)دا ئەم وشەی (هیجری)یە خراوەتە ناو کەوانەوە و بووەتە: (هیجری) هەروەک مامۆستا جەمال بەنازناوی (کوردی)ی دانابێ وایە. کە ئەمەش نابێ؛ چونکە تێکڕا هۆنەران نازناوی خۆیان لە سەرەتای هەڵبەستا دەرنەبڕیوە.

نازدارانە (گ/٢، س، گ/٣): ناودارانە.

نازدارانە (ش): نازان – ڕەنگە ئەمیش هەڵەی نووسین بێ.

دوا وتەم لەسەر ئەم تاکە ئەوەیە کە بەپێویستم نەدیت کە دەقی پەراوێزە بەنرخەکەی (عن) لەسەر هەڵبەستی (چامەی یەکەم) کە بەفارسییە و گۆڕیومەتە سەر کوردی لە بارەی بۆنەی ئەم هەڵبەستەوە بۆیە جارێکی تر دووبارەی ناکەمەوە.

ئەوەندە هەیە ئەم تاکەی سەرەوە لە هەموو سەرچاوەکاندا یەکەمینە جگە لە (ق/٤، ڕۆشنبیری) کە ئەم تاکەیان تیا نییە.

٢- صەدای: دەنگی، بانگی، ئاوازی.

تەپڵ (طەپڵ): ئامێرێکی مۆسیقییە کە بەپیاماڵین دەنگ دەدا و لە پێشتردا لێکم داوەتەوە - لە کۆندا باو بووە بۆ کاتی هـاتنەوەی کەسێکی مەزن یا جەنگ یا خـۆشـی یا بەبۆنەی کۆچکردنەوە هـەر جـارەی بەئاوازێکی تایبـەتی لە تەپڵ دراوە - لێـرەدا (کـوردی)ش نیـشـانـە بۆ ئەو نەریتـە دەکات کـە (تەپڵی بازی) تایبـەتی لەگەڵ دەسـتوپێـوەندەکەی ئەحـمـەد پاشـادا بووە و بەبۆنەی لە شـار ڕۆیشـتنەکەیەوە لێیان داوە لەسـەر ئاوازی (کۆچکردن = ڕیحلەت) کە خـەڵکی دەنگەکەیان ناسیوەتەوە.

فیراق: جیابوونەوەی ئەحمەد پاشای مەبەستە.

سەعات: کاتی مەبەستە.

نەحس: بەد، شووم - ئـەمەش لەوەوەیە کە جـاران بڕوایان بەوە بووە کە هەندێ کـات (شـووم) و هـەندێ چاکە، کاروباری تیـا بکرێت وە ئەو بڕ و بەشـیـان بەزانینی ئەوسـای ئـەسـتێرەشـوناسـی جیا کردووەتەوە کە بڕیار دراوە کام (سەعات نەحس) و کامە (سەعد) = کامەرانییە.

بێدار: وریا، ئەوی لە خەو ڕابووە یا نەنووستوە ئەو شەوە لەو داخەدا.

ئەم تاکـە لە هەمـوو سـەرچـاوەکـاندا دووەمـینە کـە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، مـا، م، ق/٤، ڕۆشنبیری)ن.

تەپڵی (طەبڵی) (ق/٤، ما): خیلی.

تەپڵی (ڕۆشنبیری): خێڵی.

گوێوە (ق/٤، ما): کویوە.

٣- فیـراقی یارە: جـیابوونەوەی ئەحـمەد پاشـایە بۆ پەنابردن بەشـای عـەجەم یا مـەمالیکی بـەغدا و سـوڵتـانی عـوسـمـانی بۆ گـەڕانەوە بۆ سـەر پاشـایەتیی بـابان لە سـولەیمـانی - بەڵام وا دیارە (کـوردی) هیـوای بـەو گەڕانەوەیە نەبـووە بۆیە بە(هـات و نەهـاتی) ناوبردووە و لە ڕاسـتیـشـدا وا بووە.

ڕەحیلی شاه: کۆچەکەی ئەحمەد پاشا بەرەو شاران.

ئەم تاکـە لـە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، گـل/٩، مـا، م)دا سـێـیـەمـینە و لەوانـی تردا نیـیـە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

فیراقی یارە (ما): فراق یار و.

ڕەحیلی (ما): رحیل.

شاه (م): شا.

شارانە (گل/٩، ما): ئەستـانە - ئەمەیان ڕاستە چونکە ئەحمەد پاشـا چووە ئەوێ دەستیی پێ کراوە و ڕەنگە (کوردی) وشەی (ئەستانە)ی گوتبێ.

٤- صەحرا: بیابان.

سینه: سنگ.
خار: درک، زیی، ستری، ئەستری.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، گ/٢، کم، گ/٣، س، ش، با، ق/٤)دا دووەمینە و لە (ر)دا سێیەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا چوارەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.
لە صەحرای (با): لە باغی.
خاری (ر): خار.
لە صەحرای (ما): لصحرا - ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
غەم (گ/٢، س، گ/٣): خەم - ئەمەش لە دەسکارییەکانی مامۆستا (گیوی موکریانی)یە.
ڕواوە (ش): ڕواوەیە.
بارانە (ش): باران.
٥- کەباب: قیمەی گۆشتی برژاوە، بەشیشە و، کە لە پێشتردا لێی دواوم.
ئەشک: فرمێسک ئەم سوێرییەی وەک مەزە داناوە بۆ مەی خواردنەوە.
مەیخواران: مەیخۆران، بادەنۆشان.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣، ش، ق/٤)دا چوارەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، ر، م)یشدا پێنجەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.
کەبابی (ما، ر، ش): کباب.
لە ئەشکی (ما، ر، ش، گل/١، گل/٦): لە اشک.
سوێرە (گ/٣): سووێرە - ئەمەش نووسینی مامۆستا (گیو)ە.
سوێرە (ر): سویر بو.
لەکن من جەژنی (ر): عزابی من جژن؟؟.
٦- بەڕووما: بەسەر ڕووما، بەڕوخسارما، بەدەموچاوما.
قەطرە: دڵۆپ کە بەڕوویدا چۆڕابێتە خوارێ بەسووری، خوێنین.
خـیـضـاب: ئەوی ڕەنگ بکات وەک خـەنە کـە دەگـیـرێتـە دەست، وەک ڕەنگی فـرمـێسکە خوێناوییەکەی سوورە، بەدەستی عەبدوڵڵا پاشا و دەستەکەیەوە کە بەخوێنی خەڵکی وڵات سوور بووبوو.
ئەغیاران: بێگانان - کە ئەمەش (کۆی کۆ - جمع الجمع)ە. مەبەستی دوشمنانی وڵاتە.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.
بەڕووما (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣، ما): لەسەر دڵ، (لسر دل).
بەڕووما (م): بەڕوما.

٧- حەریر: ئاوریشم، ئارمووش - بەڵام مەبەسی لە کر (قوماش)ی ئاوریشمە.
ڕەنگ: مەبەستی لە زەردیی ڕەنگی خۆیەتی وەک زەردیی ئاوریشمەکە.
مەتا: کاڵا، (مەتاع، متاع)ی کاروانەکەی ئەحمەد پاشا کە غەمباری بووە.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا پێنجەمینە و لە (ف، نم/١، با، ر، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لەوانی تردا نییە.
جوانی لەم تاکەدا (لەف و نەشری مورەتەب)ی زەردیی ڕەنگ و سووریی ئەشکە کە وەک کاڵای ئاوریشم پێشکەش بەکاروانە غەمبارەکەی ئەحمەد پاشا دەکا واتە: لە خەفەتدا ڕەنگی زەردە و دەگری و فرمێسکی خوێنین دەڕێژێ و جوانی لە (بارانە)دایە کە دوو واتا دەدات (بار) و (بارین).
ڕەنگ و (ف، نم/١، با، ر، ش، ق/٤، گ/٢، س، گ/٣): رنگ (رەنگی).
ئەشکم (ر): فرمێسک.
مەتای (ر): متاێ.
مەتای (ش): متای - ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
٨- حەیات: ژیان کە دژی مەرگە.
وەصڵ: پێکگەیشتن کە دژی هیجر = لێک بڕان و جیاییە و ئەو ژانە لەوشەوەدا بوون.
بوحران: ئەو گۆڕانە کتوپڕیەیە بەرەو خراپی لە نەخۆشییە تیژ (حاد)ەکاندا (بیماران) هەروەها هەڵچوونی هەست و تێکچوونی هێزی هەستکردنە بەهۆی توندیی نەخۆشییەوە کە (کوردی) ئەم ڕواڵەتانەی لە باری ژیان و مەرگ و وەصڵ و هیجردا ڕەچاو کردوون.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا شەشەمینە و لە (ر)دا دووەمینە و لە (ف، کم، با، گ/٢، س، گ/٣، نم) سێیەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا هەشتەمین تاکە و لەوانی تردا نییە.
مەرگ (ر): مرک - ڕێنووسی کۆنە.
هیجر جووتن (نم/١): هجری خوشیم.
هیجر جووتن (ف، با، کم، گ/٣): هجر و خوشیم.
هیجر جووتن (گ/٢، س): هجر خوشیم.
دەڵێی (ش): الی (دەلیی).
دەلێی (ر): وەلی.
بوحرانی (ف، ش، ق/٤، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): هجرانی - ئەمیش نابێ و هەڵەیە.
بیمارانە (گ/٣): بێمارانە.
٩- مەنع: بەرگری، ڕێ لێ گرتن، نەهێشتن، نەهێڵان.
ئاه: مەبەستی هەناسەی ساردی خەفەتبارییە.

ناڵە: هاوار بەگریان و کڕووزانەوە.
صەبووری: ئارام، خۆڕاگرتن بۆ پێوە دیاری نەبوونی خەفەت.
ڕیا: مەرایی، کە لە (کینایە – ئیدیۆمی کوردی)دا (تەشی ڕستن و، ماستاو ساردکردنەوەشی پێ دەڵێن).
مەبەستی (کوردی) لەوەی کە (صەبووری) خودی ڕیاکارانە ئەوەیە کە ئەوی خۆی دیار بخا کە خەفەت و پێ ناخۆشی بۆ ئەو بارەی ئەحمەد پاشا نییە ئەوە بێ گومان دەستەی عەبدوڵڵا پاشایە و دەیەوێ مەرایی ئەو بکات بەوەی کە پێی ناخۆش نییە چی بەسەر ئەحمەد پاشا هاتووە. بۆیە (کوردی) لەو شەوەدا ئارام (صەبووری)ی لێ هەڵگیراوە و دەیەوێ هەر کەس ئاشکرای بکات وەک خۆپیشاندان و بیر دەربڕینێک دژی ئەو کارەساتە، ئەمەش جۆرە بیروباوەڕێکی (فەلسەفی)ی (کوردی) کە لەسەری سوورە.
ئەم تاکە لە (ش، ق/٤)دا حەوتەمینە و لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، ر، گ/٣)دا هەشتەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٦، گل/٨، ما، م)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەموو سەرچاوەکانیشیا دوا تاکە و لەوانی تردا نییە.
خووی (گ/٢، س، گ/٣): خۆی.
دوا وتەمان لەسەر ئەم هەڵبەستە ئەوەیە کە (عن) لە کۆتایی ئەم هەڵبەستەدا کە سێیەمین چامەی (کوردی)یە بۆ چۆڵکردنەکەی سولەیمانی وتووە لە لایەن ئەحمەد پاشای بابانە دوای ڕووخانی (عن) نووسیویە:

(تمت و شاید این سه قصیده هفت بند و هم ترجیع بند بوده والله اعلم – علی).

واتە: (تەواو، بەڵام ئەشێ ئەم سێ چامەیە لە خۆیدا حەوت بەند و تەرجیع بەندیش بووبێ – خوا دەیزانی – عەلی) ئەم تێبینییەش بۆچوونێکی جوانە و بەدواداچوونی دەوێ. کێ دەڵێ نایەتە دی؟؟، ئەم چەشنە تەرجیع بەندە کە تاک یا نیو تاک دووبارە بکرێتەوە یەکەم جارە کە کوردی لە هەڵبەستدا خۆی دای ناوە.

٦٣

## لاڵ بم

١- لاڵ بم ئەگەر شەبیهی برۆی کەم بە ماهی نەو
یا دڵ بدەم بەمیهری نیگارێ بەغەیری ئەو

٢- تەسخیری ڕۆم و غارەتی ئێران دەکا ئەگەر
کاکۆڵی زەنگباری بەهێرش بخا جڵەو

٣- شادم، کە بەڵکو بێتە خەوم، یار و بەختەکەم
بەدبەختی نایەڵێ کە دوو چاوم بچێتە خەو

٤- حاصل؛ بەغەیری دەرد و جەفا و ئەلەم نییە
ڕۆژێ کە بێن زەراعەتی عومرم بکەن درەو

٥- منم و جەفاو و فیراق و ئومێدی ویصالی یار
کاغەز ڕەفیقی ڕۆژمە، شەمعیش ئەنیسی شەو

٦- (کوردی) دلێری عەرصەیی نەظم و فەصاحەتە
جەولان دەکا هەمیشە وەکو بەرقی تێژڕەو

---

١- شەبیهی: هاوتا، بەیەک چواندن، لێکچواندن، هاووێنە، بەیەک شوبهاندن.
ماهی نەو: مانگی نوێ، کە وەک برۆ کەوانەییە.
میهر: خۆشەویست، مانگ، ئەوپەڕی جوانی.
نیگار: جوان، خۆشەویستە ڕەنگینەکەی مەبەستە.
بەغەیر: جگە، بێجگە، بلی، بەبێ.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە زۆر کەمە و لە دەسنووسدا (ف، نم/١، کۆ، گل/١٠، ما)یە وە لە چاپکراویشدا (کم، گ/٢، س، گ/٣)دایە. (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و، لە سەرەتای ئەم هەڵبەستەشەوە مامۆستای نەمر (عەلی کەمال باپیر آغا «با» نووسیویە (مقدم لەسەر غزلی پێشوو) کە غەزەلی پێشووش مەبەستی هەڵبەستی (لە کونجی بێ کەسیدا فەردم ئەمڕۆ)یە کە لەوێشدا ئەم نیشانەیەم بۆ ئێرە کردووە.
شەبیهی (گل/١٠): تشبیهی - ئەمیش لەنگی ئەکات.
برۆی (گل/١٠، کم، گ/٢، س، با): ڕوی - ئەمیش ناگونجێ چونکی ماهی نەو برۆیە نەک ڕوو.

برۆی (گ/٣): روخی – دیسان نابێ.
برۆی (نم/١، ف): برۆت – ئەمیش نابێ و هەڵەی زمانییە بەپێی هەموو هەڵبەستەکە.
برۆی (کو): برو.
نیگارێ بەغەیری ئەو (گل/١٠): نیگاریکی غیری او.
غەیری ئەو (گ/٢، س): غیر ئەو.
٢– تەسخیر: دەردەست، بەزۆرگرتن، بەسوخرەگرتن.
غارەت: تالآن، ڕەو، هێرش.
زەنگبار: قولەڕەشی زەنگی کە جاران ئەیانفرۆشتن وەک کالآی کاروان بوون.
بخا جڵەو: ئەوەی بەتاو غار بکا و جڵەو بەریدا بۆ تیژڕەوی وڵاخەکەی.
دەکا (ف، نم/١): ئەکا.
٣– دیارە (کوردی) تووشی خەوزڕانیش (ئیرەق) بووە کەوا بەوەش شاد بووە، ئەگەر بەخەویش بێ، یارەکەی یا بەختی خۆی بەچاکی ببینێ، بەڵام نەنوستووە تاکو ئەو خەوە ببینێ.
کە بەڵکو بێتە (کو): کە بیتە خوم – ئەمیش لەنگە.
بەدبەختی (ف، کو، با، نم، گ/٢، کم، س): بەدبەختە – ئەمیش هەڵەیە.
٤– حاصل: بەرهەم و، (دوایی و ئاکام)ی مەبەستە.
زەراعەت: کشتوکاڵ، کشتیاری.
جەفا: ناخۆشی، وشکی لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتدا.
ئەلەم: ئازار، ئێش، سوێ.
عومر: تەمەن.
درەو: دروێنە.
حاصل (نم/١، با، ف، کم): حاصلی – ئەمیش هەڵەیە.
درەو (گ/٢، س): درو.
٥– ئومێد: هیوا، ئاوات.
کاغەز: نامە، مەبەستی بەنووسینەوەوە خەریکبوونە یا خوێندنەوە.
شەمع: مۆم و مەبەستی چرا و هەر ڕووناکی کارێکی ئەو سایەیە.
ئەنیس: هۆی پێ ڕابواردن، هاودەم.
منم و (گ/٢، س، گ/٣): ئەمن و.
جەفاو و (ف، گ/٢، س، گ/٣): جفا (جەفا).
جەفاو و (نم/١، کم): جەفا و.
ویصال (چاپەکان): بەویصالی نووسیویانە، لەنگ دەبێ.
ڕۆژمە (نم/١، کم): ڕۆژمە و. ئەم تاکە ئاوێنەیەکی ژیانی (کوردی)یە.

٦- نەظم: هەڵبەستن، هۆنینەوە.

فەصاحەت: زمان پاراوی، زمان ڕەوانی.

دلێر: پاڵەوان لە ناواندا دیار. کەڵە.

عەرصە: (مەیدان)، گۆڕەپان، کۆلک، کۆڕ.

جەولان: هاتوچۆ.

بەرق: برووسکە.

تێزڕەو: تیژڕەو، گورج، چوست، خێرا، بەلەز.

کوردی (گل/١٠، ف، کو): هیجری - ڕاست نییە.

نەظم و (کو): نظم.

تێزڕەو (گ/٢، س، گ/٣): تیژڕەو - دەسکارییە.

**تێبینی:**

بێ گومان ئەم پارچە هەڵبەستە لە (٧) تاک کەمتر نەبووە، ئەگەر زۆرتریش نەبووبێ، لەوانەیە بەلای کەمەوە تاکێکی تری دەست من نەکەوتبێ؛ چونکە نەریتی وێژەی کۆن وا بووە کە دەبووایە ژمارەی بەیت (تاک) لە هەر پارچە هەڵبەستێکدا (تاک بێت نەک جووت) کە ئەوەتا ئەم پارچە هەڵبەستە (٦) تاکە واتە جووتە ئەمجا ڕۆژگار و هەوڵ و کۆششی وێژەدۆستان دەرباری ئەوەن کە ناتەواوییەکەی ئەم هەڵبەستە دەرخەن.



٦٤

## شێخ بۆچی

١- شـێخ بۆچـی لەسـەر مـەسـتی لەگـەڵ من بەعـیـتـابە
مـەر (دڵشکەنی) و (کـافـری) کـەمـتـر لە شـەرابە
٢- (عەشق) ئـەر غەمی هیجرانی نەبێ؟ خۆشـە بڵێ ڕاست
(بێ دەوڵـەتی)، هـەر چاکـەـ، بەڵا قـوڕتـی خـەرابە
٣- عـومـرێ بەفـیـراق بگوزەرێ، ئایا چ مـەلایەک؟؟
بێـتـوو کـە غـەڵەت کـا؛ بڵێ: ئەو عـومـرە حـیـسـابە
٤- عـاشق کـە لە دونیـا غـەم و هـیـجـرانە نەصـیـبی
صـەد دۆزەخـی بـۆ تـاوە چ بـاکی لـە عـەذابـە
٥- هـات بـۆم سـەگی دەرگـای و زریقـایـەوە دەیوت
هـەر لـێـی گـەڕێ، بـا بـیـگـەزێ ئـازاری ثـەوابـە
٦- دڵسـوخـتـەگی، خـۆشـە، کـە شـایەد سـەگی دولبـەر
بێ دەنگ بێ، کـە بۆی بێنی وەها بزانێ کـەبابە
٧- ئـەی دڵ بەتـەمـای ڕەحـمـی لە یـار؟؟ نابـەڵەدی بۆچ؟؟
کـەی ڕەحـمـی لە دڵدا بووە؟ ئـەو رافـضـی بابە
٨- نامـەکـەی بـەخـەمـۆشی؟؟ کـە جـواب دایەوە زانیم
بۆ مـن نـەنـوویسـینـی جـوابـنامـە جـەوابە
٩- وەعظی عولەما (کوردی) لە نێو مـەجمـەعی عوششـاق
بێ عـەینی قـصـەی قـەوم و گـوزارشـتی غـوڕابە

---

١- شێخ: لە ناو کوردا دوو جۆرە: یا بەخواناسی پێ دەگا کە (شێخی بەرماڵ)ی پێ دەڵێن و، یا لە

نەوەی پێغەمبەری ئیسلامە و، سەرۆکی (طەریقەت)یش لە هەردوو جۆرەکە دەشێ. (کوردی) مەبەستی لە شێخە سەرزاری دڵشکێن و کافر و درۆزنەکانیان بووە.

مەستی: سەرخۆشی.

عیتاب: گلەیی، گازندە.

مەر: مەگەر.

دڵشکەنی: دڵشکێنی، دڵشکاندن.

شەراب: خواردنەوەیەکی سەرخۆشکار (بادە)یەکە لە ترشاندنی ترێ و مێوژ و گەرانەوەی و نەکولاندنی دروست دەبێ؛ چونکە ئەگەر نەگەڕێتەوە و بکوڵێنرێت دەبێتە (سرکە) و (ترشیاتی لێ دەکرێ).

سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (گل/١، گل/٦، ف، ما، ما/١، ق، نم/١، با)یە و لە چاپکراویشدا (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە نێوان ئەمانەدا (کم)م کردە، بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە.

مەر (ف، نم/١، کم، با): هەر – ئەمیش ناگونجێ.

شەرابە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س): عەذابە – ئەمیش نابێ و دووبارەبوونەوەیە لە تاکی چوارەمدا.

٢– هیجران: جیایی، دووری، لێکبڕان.

ئەر: ئەگەر.

بێ دەوڵەتی: مەبەستی لە نەبوونی و هەژارییە، بێ مەڕوماڵاتیشە لەگەڵ نەهامەت.

بلا: دەی سا، قەی ناکا، بەلام، دەبا، با وابێ و، (بەلا)ش دەگونجێ.

قۆرت: تەگەرە، نەهامەتی، چورتم.

بلێ (گ/٢، س، گ/٣): بەڵێ.

هەر (ما، ما/١): زور.

هەر (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): خۆی.

بلا (بەلا) (کم، گ/٢، س، گ/٣): بەلا (بەواتە بەلام).

خەرابە (نم/١): خراپە.

بلا (ما، ما/١): اما.

٣– عومر: تەمەن، ساڵەکانی ژیان.

بگوزەرێ: ڕابووری، تێپەڕ بێ، بەسەرچێ.

فیراق: لێک جیایی لە دۆست، دووری.

مەلا: پێشەوای ئاینی ئیسلام.

غەڵەت (غلط): هەڵە.

حیساب: مەبەستی لە ژمێردراو، دانراو، وەرگیراوە (بەتەمەن)، ژماردن.
ئەم تاکـە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نیـیـە و لە سـەرچاوەکانی تردا سـێیـەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و هێشتە چاپیش نەکراوە.
بێتوو کە غەڵەت کا (ما، ما/١): بی ئەم کە غلطە کا.
ئەو عومرە (ما، ما/١): ئەم عومرە.
بگوزەرێ (ما، ما/١): بکزری... ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
٤- عاشق: دڵدار.
دونیا: جیهان، گێتی.
هیجران: دووری، لێکبڕان، جیایی لە خۆشەویست.
نەصیب: بەش.
دۆزەخ: جەهەننەم، دۆژە.
بۆ تاوە: بۆ گەرم کراوە، بۆ تاو دراوەوە و لە گەرمییدا سوور بووەتەوە.
باک: پەروا، پەرهێز.
عەذاب: سزای خوایی لە دواڕۆژا. کورد بە(عەزاب)ی دەردەبڕێت.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا سێیەمینە و لەوانی تردا چوارەمینە.
دۆزەخی (ما، ما/١): دوزخ.
غەم و (گ/٢، س): غـەمی – وە بەلای (مامۆستـا ڕۆژبەیانی)یەوە وشـەی (غەمی) گـونجاوترە بۆ هەڵبـەستـەکە. ئەمـەش تەواو نییـە. چونکە مەبەسـتی کوردی (غـەمی هیجـران)ییە کە یەک شـتـە بەشکو (غەم) و (هیجران) ڕاستە، کە دوو شتە.
٥- سـەگ: (کـوردی) و هۆنـەرانی کـەی ئەو سـەردەمـەی سـولەیمانی گـەلێ جـار ناوی (سـەگی دەرگا)یان بردووە ئەوە، بەڵگەی سەگ ڕاگرتنە (لە ماڵان) لەوسادا بەپێی باری کۆمەڵایەتی.
زریقایەوە: بەنازەوە پێ دەکەنی و بەدەنگی بەرز و پێکەنینەوە دەیگوت.
ثەواب: چاکە (خێر)، باش، خاس.
ئەم تاکـە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا چوارەمـینە و لەوانی تـردا پێنجـەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.
دەرگای و زریقایەوە (ما، ما/١): درکایو دزیقایوە.
دەرگای و زریقایەوە (با): دەرگای و دزیقایەوە.
دەرگای و زریقایەوە (ف، نم/١، کم): دەرگای و زیقایەوە.
دەیوت (گل/١، گل/٦، ما، ما/١): دیکوت.
دەیوت (نم/١): ایوت (ئەیوت).
هەر لێی گەڕێ (ما، ما/١): ای لی کر□ێ. (واتە ئەبێ لێی گەڕێ).

هەر لێی گەڕێ (ف): هر لی بگرین. (واتە هەر لێی بگەڕێن).
با بیگەزێ (نم/١، با، کم): با بیگری.
با بیگەزێ (ف): بیگری.
با بیگەزێ (ما، ما/١): با بی کزی. (با بی گەزێ).
ئازاری (ما، ما/١): ازاری.
ثەوابە (ما، ما/١): سوابە.
٦- دڵ سوختەگی: دڵسووتاوی، دڵسووتان لە عەشقا.
شایەد: بەشکو، تەمی، بەڵکو، شایەت.
کەباب: گۆشتی قیمەی بەشیشەوە برژاو.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، گ/٣، س)دا نییە و لەوانی تردا شەشەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و هێشتە چاپیش نەکراوە.
بێ دەنگ بێ (مامۆستا ڕۆژبەیانی) بەلایەوە (بێ دەنگێ) گونجاوترە من و ئەوی سەرەوە بەلاوە ڕاستە، بۆیە ئەم ڕایەم وەرنەگرت.
سەگی (ما، ما/١): سک – ڕێنووسی کۆنە.
٧- تەما (طماع): ئارەزوو، گێز، مرخ لێ خۆشکردن.
ڕەحم: دڵسۆزی، بەزەیی.
نابەڵەد: نەشارەزا، بێ ئاگا.
رافضی: یەکێکە لە بەشەکانی (شیعە) و سەر بەئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و، لە ڕواڵەتەکانی ئەم ڕێگەیە لە فەرماندەی خۆیان تەنانەت لە جەنگیشدا و لە یاری ترشدا دەستیان هەڵگرتووە، بۆیە وایان پێ وتوون. واتە (ڕەفضیان کردووە) یا (ڕەت) دەکەن، جنێو بەعور دەدەن و بێ بارن. گوایە خۆشەویستەکەی (کوردی)ش ئاوا بێ بارە و کەم ڕەحمە.
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا حەوتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
ڕافضی (ما، ما/١): رافظ.
٨- نامە: ئەو پەیامەیە کە بۆ یەکتر دەنووسرێ. (نامەی) مەبەستی لەو نامەیەیە کە (کوردی) بۆ خۆشەویستەکەی ناردووە و بێ وەڵام ماوەتەوە.
خەمۆشی: بێ دەنگی و مەبەستی، وەڵام نەدانەوە و لێ کڕبوونی نامەکەیەتی.
جەواب: وەڵام – (جەوابنامە = وەڵامنامە).
ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم)دا نییە وە لە (گ/٢، س، گ/٣)دا شەشەمینە و لە (گل/١، گل/٦، ما، ما/١، ق) هەشتەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستە.
نامەی (گ/٢، س، گ/٣): نامەم – ئەمیش ناگونجێ.

خەمۆشی (ما، ما/١): خموشیش.

نەنوویسینی (گ/٢، س): نەنویسی.

نەنویسینی (گ/٣): نەنویسیٚ.

٩- وەعظ: ئامۆژگاری، پەند (نەسیحەت)، ئامۆژیاری.

عولەما: زانایان، زانیاران لە پیاوانی ئاینی.

مەجمەع: کۆڕ، کۆمەڵ، دەستە.

عوششاق: دڵداران.

بیٚ عەینی (بیعینە): مەبەستی لە (هەروەک)، (کوتومت)ە.

قصە: قسە، وتە، گفتوگۆ.

قەوم: مەبەستی لە ڕەمەکیی گەل و بازاڕی (عەوام)ە، کە زانا نین وە زمانەکەشیان و دەربڕینیشیان وەک هی زانایان نییە.

ئەم تاکە لە (ف، نم/١، با، کم)دا شەشەمینە و لە (گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (گل/١، گل/٦، ما، ما/١، ق)دا نۆیەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەموو سەرچاوەکانیشیدا دوا تاکە.

وەعظی (ما، ما/١): وعظ.

مەجمەعی (ما، ما/١): مجمری – ئەمیش هەڵەیە.

قصەی (گل/١، گل/٦، ما، ما/١): قصەء – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

گوزارشتی (ما، ما/١): کذارشتی – و مەبەست لە (وتە، ڕستە، دەربڕین)ە و مەبەستی لە (قڕە)ی قەلەکەشە کە وەک یەک وان.

غوڕاب: قەلەڕەش، کەوا باوە لە ناو کوردانا کە مەلێکی شووم و دەم ڕەش و قڕاندنەکەی نەگبەتی و شوومی دەهێنیٚ بۆ ئەو شوێنەی بەسەریدا دەقڕێنیٚ و وێرانی دەکا. جاران کە دەیقڕاند دەتگوت: (ماڵی دەویت، ماڵی دەویت) واتە ئەو وێرانییە بۆ ماڵی دەویت (نامەرد) بیٚ.

٦٥

## ئاغە گیانا

١- ئاغــە گــیــانا، تۆ دەچی بۆ شـــار و من لـەم غـوربـەتە
زەحـمــەتە یاران خــەلاصـیم بێ لە پاش ئەم هیـجـرەتە

٢- هـەرکـەسێ شـەهدی ویصـال و، زەهـری دووریی چێشتبێ
ئـەو دەزانێ دەردی دووری چـەند گـــران و زەحـــمـــەتـە

٣- دێ بەتاو ئـەشکی دوو چاوم هـەروەکـو (نیـل) و (فـوڕات)
مـەزرەعـەی غـەم سـەبز و دڵ تێـراو دەکـەن ئەم دوو شـەتە

٤- تـا ئەســـیـــری دامـی تۆم ڕەحـــمـێ بـەحـــاڵم کــە نـەوا
مـــوددەتێکی تـر لە دەســـتت ڕابـووڕێ ئەم فـــرصـــەتـە

٥- دڵ ئەمـانـەت بوو لە لات ئێـسـتـاکـە وا حـاشـا دەکـەی؟
وەرنە ســـەیری ظولـی ئەم کـــافـــر بـەچەی بـێ مـــروەتە

٦- جـەننەتـە جـێم چونکە ئەم شـۆخـە بەناحـەق دەمکوژێ
هێند شـەریف و پاکـە، حـەتتـا کـوشـتنیـشی ڕەحـمـەتە

٧- ڕوو لە قـیـبلـەی مـصطەفـا ناکـا دەڵـێ (کـوردی) هـەتا
تاقـی ئەبـرۆی خـــۆی نومـــایان کــا لە عـــالـەم ئەم بوتە

---

١- ئاغە (ئاغا): بێ گومان یەکێ یا ئاغایەکی دەوری (سولەیمانی) بووە و (کوردی) لای ئەو بووە و ئەویش پێویستی بەچوونە شـار (سولەیمانی) هەبووە، بۆیە (کوردی) پێ ناخـۆشی خۆی لەو جیاییە بەم هەڵبەستە دەربڕیوە.

غوربەت: بیانی.

زەحمەت: گران، سەخت، نەنگ، قورس.

خەلاصی: ڕستگاری، ڕەهایی، دەربازی، قوتاربوون.

هیجرەت: جیایی، دووری.

ســەرچاوەی ئەم هـەڵبـەسـتـە (عن، ع، یح، گل/١، گل/٦، کش کـە مـحـمـدئەمین ناوێک ئەم هەڵبەستەی بۆ مەلا حامیدی مامۆستای تیا نووسیوە، ف، نم/١، ئا)یە و لە چاپکراوەکانیشدا

(کم، گ/٢، س، گ/٣)یە کە لەمانە (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە.
ئاغە گیانا (کش):... گیانە (چونکە سەرەتاکەی دڕاوە لەم سەرچاوەیەدا).
ئاغە گیانا (ف): آغە گیانە – لەنگە.
ئاغە گیانا (با، کم، گ/٢، س): آغە گیان.
ئاغە گیانا (گ/٣): ئاغە گیان – لەنگە.
ئاغە گیانا (نم/١): آغا گیان – لەنگە.
تۆ دەچی (با، کم): تو خوت ئەچی.
تۆ دەچی (نم/١): تو خوت اچی.
تۆ دەچی (گ/٢، س، گ/٣): تۆ خۆت دەچی.
من (کم): ئەمن – ئەمیش لەنگی دەکات.
خەلاصیم بێ (کش):... صیم بی (چونکە دڕاوە لە سەرەتاوە).
خەلاصیم بێ (گ/٣): بمێنم.
لە پاش (یح): لتاو (لەتاو).
لە پاش (ف، نم، کم، با، گ/٢، س): لە دەس.
هیجرەتە (ف، نم/١، ب، کم، گ/٢، س): فرقەتە.
هیجرەتە (گ/٣): فیرقەتە.
٢– شەهد: هەنگوین.
ویصال: پێکگەیشتن.
زەحمەت: سەخت، ناخۆش، دژوار، ناهەموار، نالەبار.
ئەم تاکە هەمووی لە (کش)دا بەدڕان لەناوچووە.
شەهدی (ع، یح، گل/١): شهد – ڕێنووسی کۆنە.
ویصال و (ع): وصال ئەر.
زەهری (نم/١، ف، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): ژهری (ژەهری).
دووری چێشتبێ (گل/١): دور چیشتبی – ڕێنووسی کۆنە.
چێشتبێ (با، کم): چەشتبێ.
چێشتبێ (گ/٢، س، گ/٣): چەژتبێ – بەگۆڕینەکانی مامۆستا گیوی دەزانم.
ئەو دەزانێ (ف): ار ازانی.
ئەو دەزانی (نم/١): او ازانی.
دەردی (گل/١، یح، ع): درد.
گران و (گل/١، یح، ع): گرانو.
گران و (نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): گرانە و – چونکە لە شێوەی ڕێنووسی کۆندا وشەی

(گران و) و (گرانە و) هەر بەشێوە (گرانو) دەنووسراو دەخوێندرایەوە، بۆیە ئەم جیاوازییە لە وەرگرتنی ئەم وشەیە و ئەم جۆرە وشانەدا پەیا بووە کە بەم شێوەیەن.

٣- بەتاو: بەگوڕ، بەخوڕی.

ئەشک: فرمێسک، ئەسر، ئەسرین، ڕۆنتک.

نیل: ڕووبارێکە لە (میسر) لە خوار (جنووب)ەوە بۆ سەرەوە دەکشێ درێژاییەکەی: ٦,٧٧١ کیلۆمەترە لە ئەفەریقای ناوەندەوە تا (میسر) و دەڕژێتەوە دەریای سپی ناوەڕاستەوە. درێژترین ڕووباری جیهانە و لە کۆڕی وێژەییی هۆنەراندا زۆر ناوی هاتووە.

فورات: یەکێکە لە دوو ڕووبارە مەزنەکەی عیراقی (دوو ئاوان - میزۆپۆتامیا) درێژییەکەی ٢٧٧٧ کیلۆمەترە لە کوردستانی تورکیاوە هەڵدەقوڵێ و بەسەر سووریادا دێتە کوردستانی عیراق و لە خوارووی عیراقەوە لەگەڵ ڕووباری (دیجلە - ١٩٥٠ کیلۆمەتر) لە (قورنە)دا لەیەک دەدەن و دەڕژێنە خلیجی بەسرەوە کە دیجلەش لە کوردستانی تورکیاوە هەڵدەقوڵێ و بەسەر کوردستانی عیراقدا بەرەو خوار دەبێتەوە کە (فورات و نیل) لە دیجلە بەگوڕ و بەتاوتر (خوڕتر)ن.

مەزرەعە: کشتوکاڵگە، کێڵگە.

سەبز: سەوز، شین مەبەستی لە جوان ڕواویی و تێراوییە.

شەت (شط): ڕووبار.

ئەم بەشە ڕەش مەکەوە.

ئەشکی (ع، یح، گل/١): اشک.

نیل و (یح): نیل.

نیل و (نم/١، با، کم): دجلە و.

نیل و (گ/٢، س، گ/٣): دەجلە و.

غەم (گ/٢، س، گ/٣): خەم.

سەبز و (ف): سوز و.

غەم سەبز و (کش): غمسوزی.

مەزرەعەی (گل/١، ع، یح): مزرعەء - ڕێنووسی کۆنە.

سەبز و (ع، یح): سوز.

تێراو دەکەن (یح، ع، نم/١، کم، با): تیر آوەوەک.

تێراو دەکەن (ف): تیراو دەکا.

تێراو دەکەن (گ/٢، س، گ/٣): تێراوە وەک.

شەتە (یح، ع): شطە - ئەمیش لە پاشبەندا ناگونجێ.

٤- ئەسیر: دیل.

دام: داو – کەرەستەیەکی ڕاوی نێچیر و پەلەوەر پێ گرتنە.(کوردی)ش خۆی بەنێچیرێکی خۆشەویستەکەی داناوە.

ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی، نەوازش.

حاڵ: بار، چۆنێتی.

نەوا: نەوەک، نەبا، مەبا، نەک، نەکوو.

موددە: کات، سەردەم، سەروەخت، سەرەت، سەرێنی.

فرصەت: هەل، دەرفەت.

لەم تاکەدا دەربڕینی وشەی (ڕابووری) جۆرە قورسییەکی کەمی تیایە لە هەڵبەستی کۆندا ئەوە زۆر پەسەند نییە.

دامی (ن، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): داوی.

دامی (یح): داو.

دامی (ع، گل/١): دام.

بەحاڵم کە (ع): بحالم کر.

نەوا (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): توخوا – ئەمەش لەنگی دەکات.

موددەتێکی (ف، نم/١): مودەتیکی.

ڕابووریٚ (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): ڕادەبوورم – هەڵەیە.

فرصەتە (گ/٢، س، گ/٣): دەرفەتە – دەسکاریی مامۆستا (گیو)ە.

ڕابووریٚ ئەم فرصەتە (کش): رّابري ام فرصتە – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.

فرصەتە (نم/١، کم، با): فرستە.

٥– ئەمانەت: دانانی شتێک لای کەسێ یا لە شوێنێ بۆ ماوەیەک نەک یەکجاری.

حاشاکردن: نەچوونە ژێر ئەوەوە کە ئەمانەتەکە هەیە.

وەرنە سەیری: وەرنە تەماشای، بڕواننە، ببینن.

کافر بەچە: بێچووە کافر کە پەیڕەوی فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ناکا.

لە لات (ع، یح، کش): لە لای.

ئێستاکە وا (ع): ایستەاوا.

دەکەی (ع، یح، کش): دکا = دەکا.

وەرنە سەیری (با): ایوە وەرنە سەیری – ئەمیش لەنگییە.

سەیری ظولی ئەم (نم/١، کم): سەیری ئەم – لەنگە و هەڵەیە.

وەرنە سەیری ظولی (ف، ع): ورنە سیر ظلم – ڕێنووسی زۆر کۆنە.

وەرنە سەیری ظولی (یح): ورنە سیری ظلم – دیسان ڕێنووسی کۆنە.

وەرنە سەیری ظولی ئەم (گ/٢، س): وەرنە سەیر ئەم – هەڵەیە و لەنگییە.

بەچەی (گل/١، گل/٦، عن، ع، یح): بچەء – ڕێنووسی کۆنە.

نیو باڵی دووەمی ئەم تاکەی سەرەوە لە (گ/٢، س)دا بەم جۆرەیە:

**«وەرنە سەیر ئەم کافرەی بی آین و بێ مروەتە»** – ئەمەش بە دەسکاریی دەزانم.

هەروەها لە (گ/٣)شدا بەم جۆرەی دواییە:

**«ئەی موسوڵمانینە وەرنە سەیری ئەم بێ مروەتە»** – دیسان بەدەسکاریی دەزانم.

کە ئەم جیاوازییانە بەڵگەی دەستاودەست و دەماودەم کردنی زۆر و گۆڕان بەسەردا هاتنە و شێواندنیەتی بەم جۆرە بێ تامی و نەگونجاوییانە.

٦– چونکە ئەم (یح، ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): چونکە ئەو. (چونکە او).

چونکە ئەم (ع): چون کە او.

جەننەت: بەهەشت.

شۆخ: جوان، شەنگ و مەبەست خۆشەویستەکەیەتی کە بەجوانی داناوە.

بەناحەق: بەبێ سووچ و گوناح، بێ ئەوەی شایانی ئەوە بم.

شەریف: ڕەوشت و خوو بەرز، خاوەن شەرەف، پاک.

حەتتا: تاکو، تەنانەت.

ڕەحمەت: دڵ پێ سووتان، خێر و چاکە، بەزەیی، دڵسۆزیی.

دەمکوژێ (یح، ع، نم/١، ف، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): کوشتمی (کشتمی).

شەریف و (ع، گل/١): شریف – ڕێنووسی کۆنە.

حەتتا (گ/٢، س): هەتا – دەسکاریی مامۆستا گیوە.

حەتتا (گ/٣): هەتتا – دیسان دەسکاریی ئەوە.

کوشتنیشی (گ/٢، س، گ): کوژتنیشی – دیسان دەسکاریی مامۆستا گیوە.

بەڕاستی ئەم نیو باڵییەی دووەم ئەوپەڕی دەربڕینی ژیرانە و جوانە.

٧– قیبلە: کەعبە، مەککە، ئەو شوێنەیە کە ئیسلامەکان لە نوێژ و حەجدا ڕووی تێ دەکەن.

مصطەفا: مەبەست لە پێغەمبەری ئیسلامە (د. خ) چونکە یەکێ لە ناوەکانیەتی.

تاقی: کەوانەیی، (طاقی).

نومایان: دەرخستن، ئاشکرا، پیشاندان.

عالەم: جیهان و مەبەستی گشت خەڵقییە.

بوت (بت): ئەو کۆتەڵە بووە کە جاران وەک خوا پەرستوویانە (کوردی)ش خۆشەویستەکەی خۆی بەیەکێ لەو بتانە داناوە و پەرستنی ئەوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە کە بەڵگەی جوانپەرستییەتی.

دەلێ (کوردی) (کم، با، گ/٢، س، گ/٣): دەڵێ کوردی – لە ڕاستیدا ڕێنووسی کۆن وشەی (دەڵێ) و (دڵی) وەک یەک و بەشێوەی (دلی) دەنووسران هەروەک بۆیە (دڵی)یش دەگرێتەوە. وە

له (گل/١، یح، ع، ف، نم)یشدا (دلی) نووسراوه. بەڵام له (عن)دا جیای کردووەتەوە بەوەی که نووسیویه (دڵی) که ئەم سەرچاوەیەش زۆر شوێن بڕوایه.

کوردی (ع، یح، کش): هجری – ئەشێ (کوردی) یا (هیجری) له دەقی وتنەکەیدا بووبێ.

تاقی ئەبرۆی خۆی (ف، نم/١، با، کم، گ/٢، س، گ/٣): طاقی میحرابی برۆی – هەڵەیە و لەنگییە.

تاقی (یح، ع): طاقی.

نومایان کات (ف، نم/١، کم، با، گ/٢، س، گ/٣): دەرخا.

ئەم بوته (ف، نم/١): او بته.

ئەم بوته (کم، با): ئەو بته.

ئەم بوته (س): ئەم بوته.

ئەم بوته (گل/١، گل/٦، ع، یح، کش): او بته.

## صەدای کاروانی فیرقەت دێ

١- صـــەدای کـاروانی فـیـرقــەت دێ، دەڵێن ســەرقـافـڵـەچی یارە
زڕەی پێـــشـــەنگی هـیـجــرەت دێ، مــەگــەر کــاڵای خـــەم بارە

٢- ترنگەی تـەپڵی باز ئاتـڵانـی چاوەش، دەنگی جــــاڕچی؛ دێ
بەتـیـــپی غـــەم دەڵێن: نامـــەرد، ئەســـەر دڵ ئەمـــڕۆ ئێلغـــارە

٣- دەڵێی ئەســپی فــیــراق ســمکۆڵ دەکــا، وا لێــڵـــە بینایيم
دەڵێی (تـەپڵی تفـــاق)یان ژەند، کـــەوا، گـــوێم پڕ لە هـاوارە

٤- عــەجـــەب دەرناچێ ڕۆحم، شـــاهە، شـــامـــاتە بەری کـــۆچی
دەڵێی (شـــام)ە (نەهـار)ی چونکە بێ ســـەردارە ئەم شـــارە

٥- خـــودایا ڕیحلەتی شـــاد و ســـەعــاتی ڕیجــعـــەتی زوو بێ
بەلوطفی خـۆت، بەتەوفـیق و، بەخـێـری گـێـڕی، ئەم کـارە

٦- لە کـوێی بێنم ئیـتـر صـەبر و قـەرار و طاقـەت و ئولفـەت؟؟
کـــە یارم دەربەدەر، دۆســـتـــان هەمـــوو بێ ســـەر، دڵ ئاوارە

٧- سەبەبکارمـان، موعەییەن ڕووڕەش و سەرشۆڕە، ڕۆی مەحشەر
خـــودا بیکاتە ڕیســـوا و پەندی مـــیللەت هەرچی بەدکـــارە

٨- هیـــوایەکم بەشـــەیتـــان گـــەر ببێ؟؟ ئوممێـد بەتورک ناکـەم
ئەوا تـۆش چوویت و مـن چ بکەم؟، کــە ڕا هەر ڕای مـــوختـــارە

٩- لە پێش بەیداخی شـــادیی، یار؛ ئەوا ئەســـپی دەئاخـــێـــوێ
لە پشت تیـــــپی ســـــوپاســـــالارەوە، پێش بەند و دۆندارە

١٠- ئیـــتـــر ســـوارە و تفـــاق و دەســـتـــوپێـــوەندە بەدوویاندا،
بەتیـــــلاییش ئەوی ســــــەیریان بکا جـــــەرگی دەبێ پارە

١١- مـــەظننە هەوری مـیـحنـەت، ئاسـمـانی عـوشـرەتی پۆشـا،
کـــــەوا ڕۆژی ڕووناک ئەمـــــڕۆ، لە بەرچـاوم شــــەوی تارە

١٢- ئەمان سەرقافڵەچیی کاروان، دەخیل سەرچەرخەچیی لەشکر
جڵەو هەڵکێشە، ڕەحمێ کە، کە جارێکە و هەر ئەمجارە
١٣- دەبا تێر پڕ بەدڵ سەیرتان بکەم چونکە یەقینە لام
بەبێ ئێوە منیش دەمرم لە دەست ئەم چەرخە بێ بارە
١٤- ئەوا ئێوە دەڕۆن حەق بێ بەپارێزگارتان ئەمما،
بەکێی دەسپێرن ئێوە توو خوداتان، ئەم برینداره
١٥- کە ڕۆین توو خودا کێ بێتە سەر ناڵین و باڵینی
کە بمرێ کێ هەڵیگرێ و دەفنی کا، ئەم موردە بێچارە
١٦- ئەگەر نایبەن لەگەڵ خۆتان بەکوشتن سا عیلاجی کەن
کە وەڵڵا ئەو لە پاش ئێوە لە ڕۆحی خۆشی بێزارە
١٧- بەوەڵڵا حاجەتی قەتڵی نییە هیجرانتان مەرگە،
چ فایدە، هەروەکو (کوردی) ئەویش گیان سەخت و بێعارە

................................................................

١- صەدای: دەنگی.
فیرقەت: جیایی، جیابوونەوە.
سەرقافڵەچی: گەورەی کاروان، سەرقافڵە - بەڵام لێرەدا (چی)یەکی نیسبەتی زیادەشی خراوەتە سەر.
زرەی پێشەنگ: مەبەستی لە زرەی زەنگ و قۆڕی ملی ئەو وڵاخەیە کە لە پێش کاروانەوە دەڕوات - جاران بەهێزترین و جوانترین و قەڵەوترین وڵاخ ،کراوەتە پێشەنگ و زەنگ و قۆڕی زۆری کراوەتە مل، بەتایبەتی زەنگێکی گەورە کە (بۆڵ)یان پێ وتووە، لەگەڵ ملوانکەی وەک سوجادە چنراوی مووروەکەرانە (مووروەشینە) و کوژەکە و گوڵەنکە و زەنگوڵەی بچووک پیا گیراوە، بەسەر کەللەی جوان و ڕازاوە بە کورتانی دیارترین لە وڵاخەکانی تر ڕازاوەتەوە.
هیجرەت: دوورکەوتنەوە، جیایی.
سەرچاوەی دەسنووسی ئەم هەڵبەستە (عن، ن، گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ع، کو، ف، یح، جلی، ر، ش، نم/١)ە لە چاپکراویشدا: (کم، گ/٢، س، گ/٣)یە و لە نێوان ئەمانەدا (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەم هەڵبەستە.
**(بۆنەی ئەم هەڵبەستە):**
ئەو سەرچاوە چاپکراوانەی لە (کوردی) دواون و دیوانی ئەویان تیا چاپ کراوە دەگێڕنەوە: (کە «کوردی» حەزی لە کوڕێکی «قادر» ناو کردووە و ئەویش جاڕس بووە و لە دەستی

هەڵهاتووە بۆ شاری (سنە) و ئەمیش دووی کەوتووە و بەر لەو گەیوەتە ئەوێ، کە زانیویە هێشتا نەگەیشتووە، بەرەو رێگە گەڕاوەتەوە بەدوایا تاکو زەنگی ملی پێشەنگی کاروانەکەی (قادر)ی تیا بووە، هەستی (کوردی)ی جووڵاندووە و ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی بۆ وتووە). ئەم گێڕانەوە ناڕاستە، ناچاری کردم کە بەدرێژی وەڵامی هەموو گێڕانەوەکانیان بدەمەوە کە بەناڕەوایی (کوردی)یان تاوانبار کردووە.

هەر ئەو سەرچاوانە دەڵێن: («کوردی» ئەوە یەکەم سەفەری بووە بۆ ئێران) وە لە جێیەکی تریشدا دەڵێن: («کوردی» لە زووەوە پیاوێکی گەڕیدە و گەشتوگوزارکار بووە و چووەتە «شام» و دووجار سەری لە «پاریس»و «ئێران» داوە و خزمانی «سنە»ی زۆر بوونە و... هتد).

لە نێوان ئەو سەرچاوانەشدا خوا لێخۆشبوو (مامۆستا گیو موکریانی) لە چاپی دووەم و سێیەمی دیوانی (کوردی)یدا لە هەمووان بەجۆشتر هێرشێکی توندوتیژی بردووەتە سەر (کوردی) و بەبێ پەردە بەهەتیوباز تاوانباری کردووە.

(مامۆستا عەلائەدین سەجادی)ش لە (مێژووی ئەدەبی کوردی)یدا بەدرێژتر لە هەمان حەز لێکردن دواوە، بەڵام یەکەم سەرچاوەیە بەبەستنی حەز لێکردنەکەی بە(هەوای صۆفیگەری)یەوە پاکانەی لێ کراوە و بەخۆشەویستییەکی پاکی داناوە، منیش تا ڕادەیەکی دوور لەگەڵ ئەم بۆچوونەیدا نیم، وەک لێرەو دواوە ڕاستی دەردەخەم.

بەڵام سەرنجدانێکی ورد، گێڕانەوەکانی ئەو سەرچاوانە بەرپەرچ دەدەمەوە وەک لەم چەند خاڵەی دواییدا دەردەکەوێ:

١- بەپێی گێڕانەوەی گەڕۆکەکانی ئەو سەردەمەی وەک (مستەر ریچ)؛ ڕێگەوبانی نێوان (سولەیمانی) و (سنە) مەترسیدار بووە، کاروانی چەکدار نەبووبێ نەکەوتووەتە ڕێ، ئەمجا (قادر)یش کە هەڵهاتووە لەگەڵ کاروانێکی وا ڕۆیشتووە و، (کوردی)ش کە دووی کەوتووە یا بە سەڵتەزەلامی یا لەگەڵ کاروانێکی ئاوای تری پاش ئەو بەڕێ کەوتووە، ڕێکەوتنە تەنیاییەکەش یا بەدزی یا ئاشکرا بووە.

(کوردی) بۆ سوڵتە و دەسەڵاتی یا لەبەر مەترسی ڕێگە بەتەنیا نەڕۆیشتووە یا پایەی بەرزی خۆی و خێزانەکەی وای لێ کردووە کە ترسی ڕێگری نەبێ، لێرەشدا وەک وتراوە یەکەم سەفەری بووە، کەواتە شارەزای ڕێگە نەبووە و بەبێ پرسیار ڕێگەی دەرنەکردووە، ئەمەش ڕێگە گومکردنی لە ڕێدا بووە، خۆ ئەگەر شارەزاییش بووبێ دیارە یەکەم سەفەری نەبووە، کە لەم خاڵانەدا و ئەگەر لەگەڵ کاروانێکی تردا چووبێ، ئەوا ناگونجێ بەر لە کاروانەکەی (قادر) گەیشتبێ، خۆ ئەگەر بەدزییەوە چووبێ ئەوا (کوردی) کەسێکی ناسراو و، دۆستی پاشایانی بابان و پیاوماقووڵان و کوڕە وەزیر بووە، بۆیە گومبوونەکەی شتێکی گەورە بووە، ئەوسایە (سوارە) و (پیادە) گەڕاون بەدوایا، کە یا گێڕاویانەتەوە یا ڕۆیشتووە و نەدۆزراوەتەوە، لە هەردوو حاڵەکەشدا ئامانج لە ڕۆیشتنەکەی دەرکەوتووە، ئەمەش هەروا بەئاسانی بەسەرییەوە نەڕۆیشتووە، یا ئەگەر بەئاشکرا ڕۆیشتبێ ئەوا دیاریی زۆر بۆ خزمانی (سنە)ی و پیاوی

لەگەڵ ڕێ خراوە و لەگەڵ کاروانێکدا چووە، ئەوساش هەم لە پێش (قادر)دا نەگەیشتووە و هەم لە ناو خزمانی (سنە)یدا بەئاشکرا سۆراخی (قادر)ی بۆ نەکراوە، ئەگەر پێی زانرابێ دیسان دەرکەوتنی ئامانجەکەی نەک هەر ڕیسوایی بەشکو کوشتنیشی لە دوا بووە. کە سەرچاوەیەک ئەم ڕیسوایی یا کوشتنەیمان بۆ ناگێڕێتەوە. کەواتە گێڕانەوەکان بێ سەروبەرن و گەلێ ڕەخنەی تریشیان لێ دەگیرێت.

٢- ئەو (قادر)ەی لە دەست (کوردی) هەڵاتبێ، ئەگەر پەیوەندییەکی خزمایەتیی لەگەڵ خەڵکی (سنە)دا نەبووبێ ئەوا ڕووی نەکردووەتە ئەوێ کە (کوردی)یش خزمانی ناوداری لەوێ زۆر بوون، کەواتە ناگونجێ (کوردی) پرکێشیی کردبێ و دوای کەوتبێ بۆ (سنە) لەبەر ئاشکرابوون و ڕیسوابوون خۆ پێکادانی هەردوو خانەوادەی (قادر) و (کوردی).

دیسان (قادر) ئەگەر (مەرد) نەبووبێ لە دەست (کوردی) هەڵنەهاتووە، کەواتە (کوردی) دوای چوونە (سنە) نەیدەوێرا بگەڕێتەوە بەرەو کاروانەکە و ڕووبەڕوویی لەگەڵ (قادر) و کاروانییەکاندا بکات و، لەو ڕووبەڕووییەدا بێ گومان تێگیران قەوماوە، کەچی سەرچاوەکان شتی وایان نەنووسیوە.

خۆ ئەگەر (قادر) لەو ڕووبەڕووییەدا بێ دەنگ بووبێ و لەگەڵ (کوردی) چووبێتە (سنە)، دیارە (نامەرد) بووە، ئەو سایە لە دەستی هەڵنەهاتووە یا لەگەڵیدا نەدەچووە (سنە) بۆ ناو خزمانی هەردوو لا کە پەیوەندییەکەیان پایەماڵتر بێ.

ئەم چەواشەیی گێڕانەوەی سەرچاوانە ناڕاستی دەگەیەنن و ڕەخنەی تریش هەڵدەگرن.

٣- ئەم هەڵبەستەی سەرەوە کە گوایە (کوردی) بەبۆنەی دوورکەوتنەکەی (قادر)یەوە دایناوە، کەچی ناوی (قادر)ی تیا نییە و ناوەڕۆکەکەشی ئەو لێ گێڕانەوەیە ناگەیەنێ.

پایەی هەڵبەستەکەش لە هێزدا لە هینەکانی دوا ساڵانی ژیانی (کوردی) دەکات، نەک هی تەمەنی گەنجێتی کە گوایە ئەو کارەساتەی تیدا لێ قەومابێ. دیسان ئەو (١٣) کەشکۆڵە دەسنووسەی سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە کامیاندا یا لە شوێنی تردا یا لە دەم کەسانیشەوە دەرنەکەوتووە کە ئەم هەڵبەستەی بۆ (کارەساتێکی وا)دا نابێ جگە لەو سەرچاوە چاپییانەی ناوم بردن.

بەپێچەوانەوە لە (عن)دا بەفارسی (سەرەتا)ی ئەم هەڵبەستەدا نووسیویە:

(ایضاً کردي براي رحلت اخر احمد پادشاي بة رحمهما اللة فرمودة - علي).

واتە:

(دیسان ئەم هەڵبەستەش هی «کوردی»یە، وە بۆ ڕۆیشتنەکەی دوایی ئەحمەد پاشای بابان گوتوویە خوا لە هەردووکیان خۆش بێت - عەلی).

جگە لەویش لە (ن)دا ئەم سەرەناوە فارسییەی دوایی لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسراوە کە:

(قصیدەء کردی برای مسافرت احمد پادشا فرموده). واتە: (چامەی «کوردی» بۆ سەفەرکردنی ئەحمەد پاشای فەرمووە).

ئەم دوو بەڵگەیە لە نێوان ٢١ تا ٣٥ ساڵ دوای مردنی (کوردی)دا نووسراونەتەوە کە ئەمیش نزیکترین بەڵگەیە کە لە ڕاستییەوە، سەرەڕای ئەوەی دوور نییە نووسەرەکانیان (کوردی)یان دیتبێ.

بەبێ ئەمانەش ناوەرۆکی هەڵبەستەکە لەگەڵ ڕوودانی کۆچکردنەکەی (ئەحمەد پاشای بابان) و بۆ دوا جار (سولەیمانی) جێ هێشتنەکەی پاش ڕووخانی فەرمانڕەواییی بابان لە ساڵی ١٨٥١ زایندا دەگونجێ.

٤- ئەو سەرچاوە چاپییانەی دەگێڕنەوە کە (کوردی) لە هەمان سەفەری یەکەمیدا کە تیا دووی (قادر) کەوتووە لە کۆڕی هۆنەریی (تاران)دا بەسەر هۆنەرە ئێرانییەکاندا زاڵ بووە و کراوەتە ئەندامی ئەنجومەنی ئەدیبانی ئێرانی و لە (پادشای عەجەم) نزیک بووەتەوە و تەنانەت کردوویە بەمامۆستای منداڵەکانی خۆی و چەند ساڵێک لە کۆشکی شای ئێراندا ژیاوە و (قادر)یشی لەگەڵدا بووە.

(بەراوەژوویی)ش دیسان لەم گێڕانەوەیەدا هەیە، چونکە (قادر) کە لە دەست ئەو هەڵاتبێ، چۆن لەگەڵیدا چووە بۆ (تاران)، گریمان (نامەرد) بووە، کەواتە درۆیە (قادر) لە دەستی هەڵنەهاتووە، بۆیەش لەگەڵیدا چووەتە (تاران) کە ئەوێ بێ شک و دوور لە چاوی ناسیاوان بووە، تاکو لەوێ گوم بێن و پێکەوە ڕابوێرن، ئیتر ناشێ (کوردی) توانیبێتی بەو (لووسکە)یەوە خۆی لە هۆنەرانی ئێران ئاشکرا کردبێ، کە پیاوێکی وا سووک بووبێ چۆن بایەخی پێ دراوە و چۆن کۆڕی هۆنەری و ئەنجومەنیان، بەئەندام وەرگرتووە و، چۆن (شا) سەرەڕای ئەو هەموو زانا و هۆنەران و وێژەوانانی ئێرانی شیعەیە، (کوردێکی سوننی)ی مەزهەب جیای، ئاوا سووکی بەهەتیوێکەوە کردووەتە مامۆستای منداڵەکانی و لە کۆشکی خۆیدا بەهەتیوەکەیەوە وەری گرتوون و شازادەکانی ئێرانیش بەو جوانییە بەناوبانگەیانەوە، یا چۆن یەکێ لەو منداڵانە دەستدرێژییەکی (کوردی)یان ئاشکرا نەکردووە و چۆن تۆڵەی لێ نەسەنراوەتەوە و... ئیتر زۆر ڕەخنەی تریش هەڵدەگرێ.

٥- هەر ئەو سەرچاوە چاپکراوانە دەگێڕنەوە، کە لە دانیشتنێکدا لە کۆشکی (شا)دا و لەسەر داواکردنی (شا)، (کوردی) کەوتووەتە شەڕە شیعر و لەگەڵ میرزا حەبیبی خوراسانیدا کە بە(قائانی) بەناوبانگە و کوردێکی (زەنگنە)یی بووە. لە دانیشتنەکانی ئەو شاهانەشدا باو بووە هۆنەران و نوکتەبازان و گۆرانیبێژان و مۆسیقاژەنان و سوور و سەمادەران و بگرە خزمەتکار و کارەکەری جوانی شەربەت و (مەیگێڕ)یش هەبووە. لەو شەڕە شیعرەدا گوایە قائانی لە بۆڕ خواردندا بووە، بەڵام تێ گەییوە کە هۆی سەرکەوتنی (کوردی) لەوەوە بووە کە گوایە لە حەوزەکەی بەردەمیاندا تەماشای وێنەی (قادر)ی کردووە کە لە دوایەوە وەستاوە، بۆیە (قائانی) بەداردەستەکەی (کە شەل) بووە ئاوەکەی لێ شڵەقاند و (کوردی)ش هەستی بەوە کردووە و، بەدەم خوێندنەوەی هەڵبەستێکی فارسیی خۆیەوە کە بریتی بووە لەوەی: (لە ناو کوردەواریدا باوە کە مانگ بگیرێ لە (تەنەکە) و (مس) دەدەن تاکو جنۆکە لە ترسی

(تەقە)کە مانگەکە بەربدەن) و هەروەها (کوردی) بەپەنجەش وەک تەپڵ لە سەرە کەچەڵەکەی (قائانی)ی داوە و وتوویە: تۆ کە مانگەکەت گرتووم، منیش لە تەنەکە و مسی سەری تۆ دەدەم.

لەم گێڕانەوەیەدا (قادر) و حەز لێکردنەکەی (کوردی) شتێکی ئاشکرای هەموانە، ئەوەش لەگەڵ ئەوەدا یەک ناگرێ کە لە کۆشک و بارەگا و دانیشتنێکی ئاوای (شا) و ئەو هۆنەرانەدا بەخۆی و هەتیوەکەیەوە رێگە درابێ و قائانییەکی هۆنەری هەرە مەزنیان وا ڕەوا دیتبێ (کوردی)ی بەرەو ڕوو بکەنەوە.

دیسان (قادر) کە لە پشتی (کوردی)یەوە بووبێ، وێنەکەی لە ئاوی حەوزەکەدا لێ دەرنەکەوتووە، مەگەر لە تەنیشتییەوە بووبێ، کەواتە ئەشێ لەو کاتی شەڕە شیعرەدا ئافرەتێکی جوان، گۆرانیبێژێک، سوور و سەمادەرێک، لە تەنشت (کوردی)یەوە بووبێ و (کوردی) شەرمیشی کردبێ لەبەر شا و ئەو دانیشتوانە لای لێ بکاتەوە، بۆیە (کوردی) لە ناو ئاوەکەدا سەیری وێنەکەی کردبێ و... هتد و ئەمە ڕەخنەی تریش هەڵدەگرێ.

(کوردی)ش لەگەڵ ئەو هەوا صۆفیگەرییەی کە لە کەللەیدا بووە، دیسان کەسێکی ڕۆشنبیری کراوە بووە، کابرایەکی وشکی دوورەپەرێز نەبووە و، بێ پەروا هاوبەشی لەو جۆرە کۆڕانەدا کردووە بەسەرکەوتوویی هەرچەند نەبیستراوە بادەی خواردبێتەوە، وەک لە هەڵبەستی (دڵ لە میحنەت کەیلە ئەی پیری موغانی بەزمساز)یدا ئاشکرایە ئیلهامی شیعری لە شێوەیەکی جوان، دەنگ و ئاوازێکی خۆشی گۆرانی و مۆسیقا، و لە لەنجەیەکی دڵفرێن. وەرگرتووە و هەستیان جووڵاندووە نەک ئەو (قادر)ەی کە بەناڕاستی پێوەیان بەستووە کە لەو شیعری (صەدای کاروانی...)ەیدا زۆروکەم ناوونیشانی ئەوی تیا نەبردووە کە دەبوو لەوێدا لە هەر شوێنێکی تری هەڵبەستەکانی پتر ناوی ببردایە و نیشانەی بۆ بکردایە کە لەوێدا بەوپەڕی کراوەیی و سەربەستییەوە لە بەزمەکە دواوە.

بۆ ئەم دانیشتنی کۆڕی لەمەڕ (شا)یەشی، هەروەها بەناڕەوایی (قادر)یان پێوە لکاندووە. کە لەم تێ ڕۆچوونەمدا پاکێتی کوردی جێگیر دەکەم.

٦- هەر ئەو سەرچاوە چاپییانە بەهەزار پینە و پەڕۆ، هەندێ لە هەڵبەستەکانی تری (کوردی)یان بەستووە بەدڵداری کردنیەوە (وەک دەڵێن) لەگەڵ: (خوشکە قادر)، (قادر آغا)، (قالە) و... هتددا، بەبێ ئەوەی سەرنجێک بدەنە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەو بار و ڕۆژگارەی (کوردی) تیا ژیاوە، یا هەوڵیان دابێ بۆنەی هەڵبەستەکانیان بەڕاستی دەست کەوتبێ، وەک من بەکۆششی دەیان ساڵەم وێکەوتووم. یا ئەو سەرچاوانە ئاگەداریان لە زۆر لایەنی ژیانی (کوردی) بووبێ و... هتد، چونکە نە فەرمانڕەوایانی بابان وە نە سۆران و نە شای عەجەم و نە دیواخانەکانی پیاوماقوولان و سەرخێڵەکانی ئەو سایە وەک هی سەردەمی خەلیفەکانی عەبباسی نەبوون کە یەکێکی وەک (ئەبی نواس) بەئاشکرا هەڵبەستی ڕوو هەڵماڵراوی بەسەر لووسکەی جوان و هەتیوبازیدا تیا هەڵداوە، تاکو (کوردی)ش بەئاشکرا وا بووبێ و لێی قبوول کرابێ و، هەڵبەستی بڵاو بووبێتەوە کە

ئەوەش نەک بۆ ئەو سەرێنییەی (کوردی) نەشیاوە، بەشکو تەنانەت لەم سەرێنییە بەرەڵڵاییەی ئێمەدا کە باری ڕەوشت و خوو لە دۆخیانێکی زۆر جیای لەوسای (کوردی)دایە و دەسەڵاتداری ئایینی و کۆمەڵایەتیش کز و سەربەخۆیی کەسان زۆرتر و باوک چاری ڕۆڵەی خۆی پێ ناکرێ و هێشتاش بەلامانەوە (هەتیوباز) سووک بەخراپی دەزانین، ئەگەرچی چەمیش بێ چەقەڵ نابێ، بەڵام بۆ ئێستەمانە، نەک ئەوسای (کوردی) و، یا هۆنەرێکمان لەم ڕۆژەدا ناتوانێ ئاوا بەئاشکرا و یەکسەر هەڵبەست بەسەر هەتیودا هەڵبدا، ئیتر چۆن بۆ ئەوسای (کوردی) لواوە. بەڵگەی هەرە بەهێزی ئەو سەرچاوانەش بۆ ئەو (نێربازی)یە (کوردی) ئەم سێ وشەیەیە کە لە هەندێ هەڵبەستیدا بەکاری هێناون، کە ئەوانیش: (کاکۆڵ) و (خەتی سەبز) و (قادر)ن.

بۆ (کاکۆڵ)ەکە، هێشتا ساغ نەبووەتەوە کە تەنیا هەر هی نێرینە بووە و یا (ئافرەت)یش نەیبووە. چونکە هەڵبەستی فارسی و کوردی زۆرن کە لە یەک (تاک = بەیت)دا ناوی (کاکۆڵ و ئەگریجە و زولف)یش پێکەوە و لە لێدواننی جوانێکدا هاتووە، وەک لە شوێنی تری ئەم پەڕاوەیەمدا لەمەڕ (کاکۆڵ)ەوە بەدرێژی دواوم.

بەڵام (خەتی سەبز)ەکەش کە بەواتە گەندەموو، کە ئەمەش بۆ هی ڕووی کچۆڵەیەک و کوڕێکی تازە مووی سمێڵ و ڕیش دەرکردووەش لە هەڵبەستەکانی زۆر لە هۆنەراندا هاتووە، یەکلا نەکراوەتەوە کە مەبەست تەنیا لە کامیانە.

بۆ (قادر)ەکەش لە دواتردا لە باسێکی تایبەتیدا لە ژێر ناوی (قادر کێیە)دا ئەمە ڕوون دەکەمەوە. ئەمجا با بڵێین (کاکۆڵ و خەتی سەبز)ەکەی (کوردی) یەکسەر مەبەست لە نێرینەیە، بۆ ئەوەش ئاوڕدانەوەیەک لە هەرسێ ئاینە ئاسمانییەکەی (مووسا و عیسا) و(محەمەد «د. خ») کە ئەوانیش هەڵقوڵاوی شارستانێتی و بیر و فەلسەفەی گەلانی ئەو سێ ئاینەن؛ بەو (ئاوڕدانەوە)یە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا شەپۆڵێکی صۆفیگەرییان لێ جیا بووەتەوە لە هەڵبەستەکانیدا جۆراوجۆر تیشکی داوەتەوە و سەرەتا لە ستایشی خواوە سەری هەڵداوە، وە لە پێناوی پتر ڕێز لێگرتنی خوادا و بەرزکردنەوەی پایەی خوایەتیدا وەک (نێرینە)یەک ناویان بردووە، چونکە بەلایانەوە (مێینە) لە پایەدا لە (نێرینە) کەمترێکە و ئەمەش لە زمانەکاندا دەقی گرتووە و هەمیشە خوا بە(نێر) ناسراوە نەک مێینە لە ئاینە ئاسمانییەکاندا نەک لە بتپەرستیدا.

ئیتر هۆنەر و نووسەری ئەم گەلانە جوانیی خوا و خوایەتییان لە نێرینەیەکی جوانی ڕەوشت چاک و پاکی گەنجدا ڕەچاو کردووە و، دوای ئەو لە جوانیی پێغەمبەرەکانیان و یارانی ئەو پێغەمبەرانە و سەرۆکە ئاینی و ڕێگەی فەلسەفی و (تەریقەت)ەکانیان بەڕێزەوە دەربڕیوە و، لە خۆشەویستییاندا جوانی و ڕەوشتی ئەوانیان لە جوانی و ڕەوشتی خوا و خوایەتییاندا ڕاگەیاندووە و جوانیی خوا و خوایەتییان لەواندا دۆزیوەتەوە و کەسانی وایان هەبووە ئەوەندە قووڵ تێ ڕۆچووە و ئەو خۆشەویستەی خوا ئەوەندە لە دڵیاندا سەرڕێژی کردووە کە یەکسەر

جوانیی خوا و خوایەتییان لە هەر گەردیلکەیەکی لەشی خۆیاندا دیوەتەوە و ئەوەتا یەکێکی وەک (مەنسووری حەلاج) بێ پەروا بانگی (ئەنالحەق – انا الحق)ی لێ هەڵساوە واتە (من خوام).

بۆیە هۆنەرانی ئەم ڕێڕەوە وشەی (کاکۆڵ) و (خەتی سەبز)ی نێرینەیان بەشانازییەوە ئاوێتەی جوانی خۆشەویستەکانیان کردووە پێوە ڕازاندوویاننەتەوە و ئارایشیان داون وەک: (کوردی) و (خالید) و (نالی) و (سالم) و (فائیق) و (فەوزی) و (خانی) و (جزیری) و (صەیدی) و (مەولەوی) و (حاجی) و (وەفایی) و... هتدمانە و بۆ چارەڕەشی، ئەو سەرچاوە چاپییانە بەتەنیا (کوردی)یان تیا بەدناو کردووە کە هەمووش لە ئاگر پاکترێکن.

٧- سەرچاوە چاپییە ناوبراوەکان نووسیویانە: («کوردی» هەر خەریکی هەڵبەستی دڵداری بووە بەسەر «قادر»دا بۆیە هۆشی نەماوە بەلای باری ڕامیاری نیشتمانەکەیەوە وەک هۆنەرێک پێویستی سەرشانی خۆی نەزانیوە کە سەرنجێک بداتە شێواویی (سولەیمانی) و دژواریی کۆمەلایەتی و نائاسوودەیی بەڕێوەبەرایەتیی بابانییەکان و پیلانگێرانی بێگانەکان تاکو بەرامبەر بەوانە (کوردی) هەڵبەستی دانابێ.

بەڵام چاو پیا خشاندنێک بەم پەڕاوییەدا دەری دەخات کە (کوردی) هەڵبەستی ڕامیاری، نیشتمانی، کۆمەلایەتی، بەڕێوەبەرایەتی، ستایش، ئایینی، صۆفیگەری، فەلسەفی، ناووناتۆرە، نامە و... هتدی لە هەمەجۆرە زۆرن بەلام دەست ئەو سەرچاوانە نەکەوتوون.

هەر ئەو سەرچاوە چاپییانەش خۆیان بەدرۆ خستووەتەوە و نووسیویانە: (کوردی بەرگەی چاوپێکەوتنی ئەو حالانەی نیشتمانەکەی نەگرتووە و بۆیە هەر لە زووەکەوە دەستی داوەتە گەڕۆکی بە ولاتە بیانییەکاندا).

٨- دوا وەرگرتنم لە گێڕانەوەکانی ئەو سەرچاوە چاپییانەدا بەرامبەر بە(کوردی) ئەوەیە کە هەموو دەڵێن: (دەرحەق بە«کوردی» خەرافات زۆرە وەکو «خواردنەوەی پیاڵەیەک زەهری خواردووەتەوە و پێی نەمردووە» و «سووتانی بەئاگری عەشقی قادر» و «بێ مەزاری – گۆڕ» و «سەفارەتی «کوردی» لە «پاریس» و... هتد. کە ئەمانە لە شەخصیەتی «کوردی»دا حەقیقەتن و (خەرافات) نەبوون کە ئەو سەرچاوانە وای بۆچوون چونکە (خواردنەوەی زەهرەکەی)م لە هەڵبەستی (چێشتم ئەمڕۆ زەهری مار و ڕۆحی شیرینم نەهات)یدا لێک داوەتەوە و خەرافات نییە. (سووتانی بەئاگری عەشق)ەکەشی کەوا خۆڵەمێشەکەشی با بردوویەتی و نەگونجاوە لە گۆڕی بنێن» کە ئەمەش لە هۆنراوی هۆنەراندا شتێکی مەجازییە و زۆر وتراوە و نابێتە خەرافات.

بۆ بێ مەزار (گۆڕ)یەکەشی هەر ئەم سەرچاوانە خۆیان بەدرۆ خستووەتەوە کە نووسیویانە: (گۆڕەکەی لای گۆڕی «سالم»ەوەیە لە گردی سەیوان) هەروەک من وێکەوتووم، گۆڕەکەی لە خوار گومەزەکەی پاشاکانی بابانەوەیە بەلای ڕۆژئاوا و دیوی گەڕەکی سەرکارێزدا کە بەگومەزی شێخ مارف بەناوبانگە و کەمێک لێوەی دوورە و لای مەزاری (سالم) و لای سەرووی

(ئەحمەد حەمدی بەگی ساحیبقران)ەوەیە کە من بەهۆی خاتوونی شکۆمەند (هێرۆ خان)ی مامۆستا برایم ئەحمەدەوە، گۆڕەکەیمان هەڵبەست لە ئاهەنگێکی شایاندا و لەم پەڕاوییەدا بابەتێکی تایبەتیم لەسەر نووسیوە.

دەمێنێتەوە سەر سەفارەت (باڵیۆز)یەکەی لە (پاریس)ی فەڕەنسە، ئەمە ڕێی تێ ناچێ؛ چونکە باری فەرمانڕەواییی بابان لە دۆخێکا نەبووە کە پەیوەندی ئاڵوگۆڕی (باڵیۆزی)یان لەگەڵ فەرەنسەدا لە نێواندا بووبێ، هەرچەندە ئەشێ بابانەکان چەند جارێک بەباڵیۆزی فەرەنسی گەیشتبن لە (بەغدا) بۆ یاریدەی سیاسی و پشتیوانی. بەڵام دیسان باری فەرەنسە لە خەلافەتی عوسمانیدا ئەوەندە بێ هێز و لاواز بووە کە (هیوا) و (مەترسی) لە (فەڕەنسە) ئەوەندە نەبووە کە لە (ئینگلیز)ی ئەوسا کراوە.

ئەمجا (سەفارەت) ئەگەر مەبەست لە (سەفەر)کردنی (کوردی) بووبێ بۆ (پاریس) ئەمە شتێکی سەیر و خەرافات نییە، چونکە وەک لە هەندێ هۆنراوەی (کوردی)دا دەردەکەوێ چووەتە ئەستەمبووڵ بۆ لای ئەحمەد پاشای بابان و ئەشێ هەر بۆ لای ئەو چووبێتە (پاریس)یش کە ئەحمەد پاشا لەوێ بووە، نەچوونیشی موشکیلە نییە.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە (سەفارەت)ەکەی (باڵیۆز)ی بێ ئەمەیان ڕاستە و ئەم (سەفیر = باڵیۆز)یەی لە (پاریس)ی (فەڕەنسە) نەبوو بەشکو لە (پارس) بەواتە (ئێران) بووە، ئەمەشم لە شارەزا پیرەکانی بیستووە کە بەو هۆیەوە (کوردی) لای (شای عەجەم) پایەکی بەرز و ڕێز لێ گیراوی هەبووە، لە فارسیشدا یەکجار توانا بووە و زمان پاراو و قسەزان بووە، بۆیە چەند جارێک لە لایەن چەند پاشایەکی بابانەوە (کوردی) بە(سپارش) واتە (ڕاسپاردەیی) یا (سەفیری) نێردراوەتە (پارس) واتە (ئێران) بۆ لای (شای عەجەم) بۆ چاککردنەوەی ئەو پشێوییانەی لە نێوانیاندا ڕووی داوە و نەهێشتنی گیروگرفتەکانیان وە لەو کارەشیدا وەک سەفیر (باڵیۆز)ێکی سەرکەوتوو بووە و بەڵام سەرچاوەکان ساغیان نەکردووەتەوە کە من لەم پەڕاوییەدا ئەو خاڵانەم ڕوون کردوونەتەوە.

هەر لەمەوەیە کە ئەو سەرچاوە چاپییانە بەهەڵە (سپارش)ەکەیان لێ بووە بە(سەفارەت) و (پارس)ەکەیان لێ بووەتە (پاریس) و بەخەرافاتیان داناوە، دیارە ئەو سەرچاوانە لەمە بێ ئاگا بوون.

دوا وتەم بەرامبەر ئەو سەرچاوە چاپییانە ئەوەیە کە لە وەرگرتنی گێڕدراوەکانیاندا وەنەبێ مەبەستم دژایەتی لەگەڵ ئەم یا ئەویاندا بێ و چاوپۆشی کردن لەم یا ئەویتریان و لایەنگری کردنی (کوردی) بێ، بەشکو هەمووییانم لە لا بەڕێزن و بەوپەڕی توانامەوە هەوڵی ڕاستی و حەقیقەت دەرخستنم داوە، لە تێکڕای ئەم پەڕاوییەدا بەشێوەیەکی دوور لە عاتیفە و لایەنگری و ئامانجی زانستییەکی وێژەیی ڕووتە.

**پاکانە:**

دوای ئەمانە دەمەوێ لەم چەند خاڵەی دواییدا هەندێ ڕاستیی تریش لە ژیانی (کوردی)دا

ئاشکرا بکەم کە تا ئێستە نەزانراون تاکو پایەی ئەومان وەک خۆی بۆ دەربکەوێ و گەردی ئەم جۆرە پیا هەڵبەستنانەی لەسەر لابەرم، بەر لەوەی (قادر) ئاشکرا بکەم کە کێیە.

١- (کوردی) ئەوەندە شەخسیەتێکی بەهێز و پاک و بێگەرد و خۆشەویستی هەبووە، لە شارە تازە دروست کراوە بچکۆلەکەی (سولەیمانی)دا کە دوو شێخی طەریقەتی ناودار و بەدەسەڵاتی ڕێگە جیاوازی تیا بووە، ئەوانیش (شێخ مارفی نۆدێ) و (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بوون و خەلیفە و دەروێشێکی زۆریان لەو ناوچەیەدا هەبووە کە (کوردی) پیا گەڕاوە.

ئەگەر گەردێکی سووکی و ئەوی پێوەی هەڵبەستراوە بە(کوردی)یەوە بووبووایە، بێ گومان ئافەرۆز دەکرا و لە هەر شوێن ڕێگەی ژیانیان پێ تەنگ دەکرد.

مەولانا خالیدیان لە خانەقاکەیدا دەرکی کولبەکەی خۆی لە (کوردی) نەگرتووە. کە لەگەڵ (نالی و سالم و مەشوی) و... کێ و کێدا کۆڕی وێژەیی و شەڕە شیعری تیا ببەستن. لەگەڵ ناخۆشی و ئاڵۆزیی نێوان ئەو دوو شێخەشدا نەبیستراوە (شێخ مارف) خراپییەکی بەرامبەر بە(کوردی) کردبێ یا وتبێ و بەپێچەوانەوە لە ناو هەموو خەلیفە و دەروێشەکانیشیاندا بەڕێز و خۆشەویست بووە. هەڵبەستە صۆفیگەرانەکانی (کوردی)یان بەسروودی ئاینی و بەتەپڵ و دەفەوە ڕاگەیاندووە.

سەرەڕای پاشاکانی بابان، بەگزادە و میر و بەرپرسیار و گەورەکانی، بنکە فەرمانڕەواییە گرنگەکانی وەک (مەرگە) و (شیوەکەڵ) و (قزڵجە) و (کۆیە) و... هتد پەیوەندیی دۆستانە و نزیکیان لەگەڵ (کوردی)دا ئەوەندە بەهێز بووە کە هەمیشە بەسۆز و جۆشەوە چاوەنواڕی دیدەنیی بوون و لەسەر وانەکانیدا بۆ لای ئەوان بەچاوی پیرۆزییەوە سەیریان کردووە و هەڵبەستەکانی بەڵگەی ئەم ڕاستییانەی و کە دەست بەدەست پەیایان کردوون.

لە شاری (سنە)ی چاوکراوەدا هەر لە (والی)یەوە هەتا تێکڕای گەل (کوردی)یان ناسیوە و بەتاسەیەوەی بوون و یەکێکی هەرە بەناوبانگی ئاینی و کۆمەڵایەتی و وێژەییی مەردۆخییەکانی وەک (شێخ محەمەد)(فەخرولعولەمای کورد) دۆستی نزیک و گیانی بەگیانیی (کوردی) بووە و بەهەڵبەست و نامەیان لە نێواندا هەبووە و هەر ئەم نامە بەهەڵبەستەش لە نێوان (کوردی)دا لەگەڵ هەر یەکێ لە صەیدی، ڕەنجووری و سالم و... هتددا هەبووە کە ئەمانەش نیشانەیەکی تری پایەی بەرز (کوردی) لە کۆڕی ڕۆشنبیراندا و تاوانبارکردنی کوردی بەدرۆ دەخەنەوە. لە لایەن زۆربەی گەلیشەوە لە هەر شوێن و لەو سایشەوە تا ئێستەش هەڵبەستەکانی (کوردی) لەبەر سادەیی و سۆز و ساز و کاریگەرییان یەکسەر بەدڵەوە نووساون، بۆیە (کوردی) هەمیشە خۆشەویست بووە و ڕەوشت پاکییەکەشی ئەوەندەی تر شیرینی کردووە. هۆنەرێکی پسپۆڕی وەک: (حاجی قادری کۆیی) دوڕناس و بلیمەتێکی وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە لە پەنجەی ساغ مووی دەرهێناوە نامەی سپیی خوێندووەتەوە، هەردووکیان بەوپەڕی هەڵنان ڕێز و پایەبەرزییەوە لە (کوردی) دواون.

خۆشەویستیی (کوردی) لە نێوان شێخە مەزنەکانی بیارە و نێرگسەجاڕی زاوای و دەروێش و خەلیفەکانیان و سەرخێڵە کورد و ناو مەلا و مزگەوتەکاندا لە زۆربەی هەڵبەستەکانیا دەنگ و ڕەنگ دەدەنەوە.

پایەی پەروەردەیی ناو خێزانی ساحیبقران کە بەلای کەمەوە (٤٠٠) ساڵێک و پتر سەرچاوەی ناوداران و هۆنەران و باڵادەستان بوون و لە ماوەی ئەم چوار چەرخە پترەی ڕابوردوودا خێزانێکی سەردەستە بوون و دەتوانرێ بەوێنەی پەروەردە پاکی و چاکی بەنموونە بهێنرێتەوە و بەرهەمی وێژەیی باڵای ئەم خێزانە و پێشەوایەتییەی بەجوانترین ئاراستەی پاک و پوختە پەروەردەکردن و ڕێگەی ڕاست پیشانی گەلدان، پایەیەکی دیاری لە مێژووماندا هەیە و بەمێژوومانەوە ماوە و ڕەوشت چەوتێکی لەم خانەوادەدا دەستنیشان نەکردووە کە خراپ بووبێ.

ئەمانە و گەلێ بەڵگەی تر کە لە توێی ئەم پەڕاوییەدا هاتوون، بەڵگەی دڵنیاکاری پاکێتیی (کوردی) و مەزنێتی کەسەتییەکەین کە لەگەڵ تاوان پێکردنی ئەو سەرچاوە چاپییانەدا یەک ناگرنەوە کە بەرامبەر بە(کوردی) کە بەنەشارەزاییەوە نووسیویانە و بیرێکیان لە بناخەی نووسینەکانیان نەکردووەتەوە.

٢- بەپێویستی ئەزانم سەرنج بەلای گەشتەکەی (فریزەر)دا ڕاکێشم کە لە سەرێنی (کوردی)دا کردوویە بۆ ناوچەکە و لە (هبەب) لە دیمەن و ڕەوشتی چەند لووسکەیەک دواوە کە ئەوانە لە خانێکدا بەدەست یەکێکیان بوون و بەئاشکرا خەڵقی بەپارە وەک (ئافرەت) لەگەڵیاندا ڕایانبوارد و بەتوندوتیژییەوە هێرشی بردوونەتە سەر.

گیو گوتەنی: (ئەوەش پاشماوەی ڕەوشتی مەغۆلیان) بووە کە بێ گومان ئەگەر لە گەشتی تریدا لە ناوچەی سولەیمانی و شوێنی تری کوردستاندا بووبوایە ناوی ئەوانیشی دەبرد. چونکە ئەو گەڕۆکانە کە بەئامانجی تایبەتی و فرمانبەریی بەکوردستاندا گەڕاون بەپاڵ، زۆر شتی چاکی کورد دەربڕینیشەوە، هەر خشکەیی خراپکاریی خۆیان لەگەڵا کردووین و بەسەرمانەوە نەڕۆیشتوون.

ئەمجا (فریزەر)ێک لە هەزاران کیلۆمەتر دوورەوە بەوەی زانیبێ، ئیتر ئایا چۆن (کوردی) لەو بنەپاڵەوە و بەو گەڕۆکییەی خۆی و سەردانی بەغدایەی بەسەر ئەویدا و گوایە وەک پێشیەوە هەڵبەستراوە ئەوە ڕەوشتی بووبێ، چۆن بەیەکجارەکی ژیانی خۆی تەرخانی لە (هبەب)دا بەسەربردن، نەکردووە کە چەندان (قادر)ی لێ دەست دەکەوت؟؟.

٣- مێژووەکانی سەردەمی (کوردی) ڕۆژانێکی خوێن ڕژانی لەشکر لەیەک کردنی نێوان پاشاکانی بابان لە ناو خۆیاندا لەسەر کورسی و بەهاندانی بێگانە و جەنگەکانی بابان و عوسمانی، بابان و عەجەم، بابان و سۆران، بابان و مەمالیکی بەغدا و، پێکا هەڵپرژاندنە خوێناوییەکانی خۆبەخۆیی خێڵاتییەکان و... هتدمان بۆ دەگێڕنەوە کە هەموو دروێنەی گیانی (نێرینە)کانیان کردووە و بەوە ژمارەی (نێرینە) لە چاو هی (مێیینە)دا کەم بووەتەوە

و زۆربوونی (مێیینه)ش هاندانی ژنهێنانی داوه و باری پەروەردە و کۆمەلایەتی و ئاینیش پشتیوانی ئەو هاندانەیان کردووە کە ئەمانەش نەبوونی ڕواڵەتی نێرینەپەروەری و (نێربازی) و ئەم ڕەوشت پیسی و نابەجێییە دەگەیەنێ لە ناوچەی سولەیمانی و باباندا، هەرچەندە نەبیستراوە (کوردی) و (سالم)یش ژنیان هێنابێ، ئەویش لەبەر ئەو هەوا صۆفیگەرییەی بوویانە کە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ پاکداوێنی (کوردی) و تەنانەت (کوردی) لە دوای مردنی برایەکی (براژن و منالەکانی) بەخێو کردووە و لەبەر بێ نازبوون و ژنی نەهێناوە.

٤- دوا خالێک لەسەر پاکانە بۆ (کوردی) کردنمان ئەوەیە کە لە ڕێگەی وەدەستهێنانی زانیاری و هەواڵ لەسەر (کوردی) و گردکردنەوەی زۆرترین و تەواوترین و ڕاستترین هەڵبەستەکانیدا و گەیشتنە ئامانجی جێگیرکردنی ڕاستی و درۆی ئەوی تا ئێستە لەسەر (کوردی) چاپ کراوە (حەمەبۆر) لە ماوەی (٣٠ - ٤٠) ساڵی ژیانیدا گەلێ سەرچاوەی دەستنووسی و کەشکۆڵ (بەیاز)ی دەست کەوتووە کە زۆربەیان لە نزیک و سەرێنیی (کوردی)دا نووسراونەتەوە و زۆر لە نووسەرەکانیشیان هی سەردەمی کوردی و هاوالی (کوردی) بوون و بەتێکڕایی مەلای چاک و وێژەوانی شارەزا و هۆنەر و پیاوی گەورەی ئاینی و باوەڕپێکراو و فەقێی ئەوان بوون، کە هەموویان (کوردی) و هەڵبەستەکانیان بەپاڵ هی هۆنەرە مەزنەکانی وەک (مەولانا خالید و سالم و نالی و مەلا وەسمان (فائق) و ڕەنجووری و مەولەوی و صەیدی و فەوزی و... هتد)ەوە نووسیوە و بەڕێزەوە ناویان بردووە و گەلێ (سەرەناو)ی دیاری کار و (پەراوێز)ی بەنرخ و (وردەکاری)ای جوان و (زانیاری) و (شتی ورد)ی لە ئێمە شاردراوەیان لەسەر (کوردی) و هەڵبەستەکانی نیشانە کردووە، ئەمە جگە لە وەرگرتنی ئاگاداری و تێبینیی تر لە دەمی زۆرترین شارەزایانی (کوردی) لە کۆنە پیاوان و هۆنەران و وێژەدۆستان و مامۆستایان لە بارەی (کوردی) و هەڵبەستەکانییەوە، کە هەموو ئەمانە دەرگایەکی نوێیان لە ژیانی (کوردی) و هەڵبەستەکانی لێ کردینەتەوە و ئەو شێوە لێڵ و شێواوەی (کوردی)یان بەپاکی لێ دەرخستووین، وەک لە ناوەرۆکی ئەم پەڕاوییەدا هاتووە و هەموو دوورن لەوەی ئەو سەرچاوە چاپییانەی بە(کوردی)یانەوە بەستووە لەسەر (قادر).

**قادر کێیە؟:**

لە ڕاستیدا نەک یەک (قادر)، بەشکو لە هەڵبەستەکانی (کوردی)دا چەند (وشە) یا (ناو)ی (قادر)ێک هەن، بەلام هیچیان ئەو (قادر) یا (قالە)یە نەبوون کە گوایە (لووسکە)یەک بووە و (کوردی) شەیدا و دلداری ئەو بووە، وەک لە سەرچاوە چاپکراوەکاندا ئەم ناتۆرەیە بە(کوردی)یەوە هەڵبەستراوە.

ئەو سەرچاوانەیش یەکەمیان کە بۆ یەکەم جار بلاوبووەتەوە (دیوانی کوردی)یە کە لە (بەغدا)دا (کوردی و مەریوانی) لە ١٩٣١دا لە چاپیان داوە.

ئەو (کوردی و مەریوانی)یەش (کوردی)یەکەیان (مستەفا صائیب)ی برای هۆنەران (ڕەئووف صائیب) و (مەلا عارف صائیب) و (هادی صائیب) و نووسەر و خاوەنی (لە خەوما) جەمیل صائیب و... هتد بووە کە مامۆستا مەلا ئەحمەدی قادر قیچەی دیلێژەیی باوکیشیان هەر هۆنەر بووە و نازناوی هۆنەریی (صـــائیب) بووە و ئەم نازناوە بووەتە نازناوی خـــانەوادە ڕۆشنبیر و زانا مەزنەکەیان.

(مەریوانی)یە چاپکەرەکەش بەڕێز (دوکتۆر تاهیر بەهجەت مەریوانی) بووە کە سەرگوزەشتەی ئەمـــیش درێژ و ســـەیرە وەک من وێکەوتووم کـە لـە شـــوێنی تری نووســـینەکـانی جگە لەم پەڕاوییەمدا ساغم کردووەتەوە و نووسیومە.

ئەو (مەریوان)ەی کوردی کە یەکەم جاری چاپکردنی دیوانەکەی بووە، ئەگەرچی خزمەتێکی زۆر گەورە بووە و ئەو دوو چاپکەرەی چەندین خزمـــەتی (وێژە) و (مـێـژوو) و (ڕۆشنبـیـری) کوردییان کردووە، بەڵام لە تێنەگەیشتنێکی گچکەوە کە ئەم هەڵبەستە تێ نەگەیشتوون و بۆنەی هەڵبەستەکەیان نەزانیوە و تەنانەت بەوردی ئەم هەڵبەستەیشیان نەخوێندووەتەوە و هەر تەنیا بەوەی کە لە لایەکەوە بیستوویانە گوایە ئەم (وشەگەل) یا (چەند جار ناوبردن)ی (قادر)ە، نیشانەی ئەوە بووە کە (قادر) ناوێکی وەک خۆشەویستیی «ئافرەت»ی خۆش ویستووە و بەبێ سەرنجدانی ناوەڕۆکی ئەم هەڵبەستەش، هەر خودی ئەم هەڵبەستەیان کردووەتە بەڵگەی ڕووداوێک کە گوایە ئەو (قادر)ە لە (کوردی) جاڕس بووە و لە (سولەیمانی)یەوە هەڵاتووە و ڕۆیشتووەتەوە شاری (سنە)ی جێنشینە کۆنەکەی خۆی.

هەر لەو یەکەم چاپکراوەی دیوانەکەی کوردیشدا نووسراوە گوایە کە (کوردی) هەواڵی هەڵهاتنی ئەو (قادر)ەی بیستووە، لە شەیداییی خۆیدا بەدوایدا چووەتە (سنە) و ئەوەندە سەوداسەری ئەو (قادر)ە بووە لە پەلەیی خۆیدا گوایە بەر لە کاروانەکەی (قالە) بەچەند ڕۆژێک گەیوەتە (سنە) و (کوردی) لەوێ زانیویە کە هێشتە (قادر) نەگەیشتووە و کەوتووەتە چاوەڕوانی لەسەر ڕێگەی (سولەیمانی – سنە)دا و هەرکە بەنزیکبوونەوەی ئەو کاروانەی زانیوە کەوا (قادر)ی تیایە، لە خۆشییاندا ئەم هەڵبەستەی داناوە کە وەک لە دواترا دەردەکەوێ ئەم هەڵبەستە بە چ جۆرێ (نزیکبوونەوەی خۆشەویستێک) ناگرێتەوە، بەشکو (کوردی) ئەم هەڵبەستەی لەسەر کارەساتی ڕووخاندنی ڕژێمی بابان و، کۆچکردنی دوا پاشای بابان (ئەحمەد پاشا)ی دۆستی (کوردی) داناوە. هەروەها لە پاشترا دەردەکەوێ کە برازایەکی کوردی لە هەرەتی مێرمنداڵیدا لە دایکی خۆی زویر بووە کەوتووەتە تەک کاروانێک و (کوردی)ش کە (داشدیار)ی ئەو برازایەی و براژنەکەی بووە و، هەر لەبەر ئەو برازایەی ژنی نەهێناوە، نەوەک ژنەکەی ئەو برازایەی بێ ناز بکا (کوردی) بەدوای (قادر بەگ)ی برازایدا، چووەتە (سنە) کە کۆنە شاری خانەوادەی (ساحیبقران)ەکان بووە لە پیاو ماقووڵانی ئەو خانەوادەیە بوون.

ئەم کارەساتە و کارەساتی دەروێشێکی (قادری)ی سولەیمانی کە لە دواترا باسی ئەویش

پێشکەش دەکەم کە شەیدای (قادر) ناوێک بووە و ئەو قادرە لە دەستی هەڵهاتووە و... هتد کە ئەمەش تێکەڵ بەچوونەکەی (کوردی) بووە بەدوای برازاکەیدا.
بەبێ ئەمانە هاتنی ناوی (قادر) چەند جارێک لە هەڵبەستەکانی (کوردی)دا کە هەر جاری بەمەبەستێک لەوانی تر جیا بووە و ژن نەهێنانی (کوردی) وەک ڕام گەیاند، ئەمانە بووەتە (قاڵەی دەم)ی ئەم و ئەو و، کارەکەی شێواوە و، بەو جۆرەی کە وەک ڕام گەیاند لەو یەکەم (دیوان)ی (کوردی)یەدا (کوردی) تاوانبار کراوە بەناڕەوایی.
دوای ئەو سەرچاوە چاپکراوە، هاواڵم مامۆستا (گیوی موکریانی) کە چەند جارێک دیوانەکەی کوردیی چاپ کردووەتەوە هەمان تاوانبارکردنە (ناڕەوا)یەکەی دووبارە کردووەتەوە بە(لەسەر نووسینی) تاڵ و توندتری دژی (کوردی).
بەدوای ئەویشدا چەند سەرچاوەیەکی تری وەک (مامۆستا عەلائەدین سەجادی) لە (مێژووی ئەدەبی کورد)ی یەکەیدا هەمان هەواڵی تاوانبارکردنی (کوردی) بەشێوەیەکی لەسەرخۆتر نووسیوەتەوە، کە من لە دیدەنییەکی (سەجادی)مدا تێ نەگەیشتن لەم هەڵبەستەی (کوردی)م بۆ شی کردەوە و یەکسەر پەنجەی خۆی کرد بەدەمیدا و گەستی و فەرمووی: (ئاخ چۆن بێ سەرنجدانی ناوەرۆکی ئەم هەڵبەستە بەدوای گێڕانەوە هەڵەیەکەی سەرچاوە چاپییەکاندا ڕۆیشتووم) و ئافەرینی منی کرد کە لەم ڕاستییە وریام کردووەتەوە و پشتگیری منی کرد.
ئەمانە و گەلێ بەڵگە و بەراورد و ساغکردنەوەی ترم لەم بواری قادر کێیە؟ دا بەدرێژیتر لێرە و دواوە ڕادەگەیەنم بۆ گەیشتنە ڕاستیی کارەکە و ئەوانیش لەم چەند خاڵەی دواییدان:
١- (قادر کێیە) ئەم (قادر)یان لە ڕووی (زمانی)یەوەیە کە (ناو) یا (وشە)ی (قادر)ەکەی عارەبییە و لە زمانی کوردیدا بەواتا (توانا) و ئەم وشەیەش، یەکێکە لە سەد هەزاران وشەگەلی (عارەبی) و (کوردی)دا بەشێوەی (قادر) کە مەبەست لە واتای (توانا)یە.
هۆی پەیوەندی و بەندیواریی (کورد) و (عەرەب) یەکجار زۆر کۆنە لە دراوسێتیی یەکسەرەمانە و، باری (ئابووری) کە تازەترینیان لە (ئیسلامەتی)یە و، تەمەنی لە/١٤٠٠ ساڵ پترێکە، ئەمانە بوونە هۆی ئاوێتەبوونی وشەگەلی هەردوو زمانی یەکتر، کە بێ چاوێنی بێ، ئێمە لە هەموو بوارێکدا لە تێکۆشانی پاککردنەوەی زمانەکەماندایین لە وشەی (عەرەبی) بەتایبەتی و، وشەی نەتەوەی تر بەگشتی، بەلآم لە زمانی (عەرەبی)دا بەسەد هەزاران وشەی کوردیی پەتی و ڕەسەنی ئێمە خراونەتە ناو فەرهەنگە عەرەبییەکانیانەوە و بەپێچەوانەی ئێمەی ڕاست و ساغەوە، ئەوان لە ڕووی ڕەگەزپەرستیی سروشتییەوە، ئەو وشەگەلەی ئێمەیان تواندوونەتەوە بە(تەعریب) و بە(صەرف) و (ئیشتیقاق) و... هتد و کردوویانن بە هی خۆیان کە من پتر لە نیوەی فەرهەنگەکانی عەرەبی بەدڵنیاییەوە بە هی کوردی دەزانم.
ئەو وشـەگـەلە عـارەبیـیـەی کـە بەکـارمـان هێناون و تا ئێـسـتـەش بەکـاریان دەهێنین و هۆنەرانیشمان لە هەڵبەستیاندا بەو هۆیانەوە کە ناوم بردن بەکاریان هێناون کە یەکێکیان ئەم وشەی (قادر)ەیە بەواتا و مەبەستی (توانا) و بەس.

ئەمجا یەکگرتنی ئەو هۆ و، ڕووداوانە، (کوردی)یان پێ تاوانبار کردووە، بەتایبەتی (ڕەبەنی)ی (کوردی) کە ژنی نەهێناوە، ئەمانە وایان کردووە کە بەکارهێنانی وشەی (قادر) بەمەبەست و واتای (توانا) لە لایەن (کوردی)یەوە، لێی کراوەتە تاوانباری و کراوەتە (قادرێک) لە ژیانی (کوردی)ماندا و ئەمەیان (قادر)ێک بووە لە کاتێکا (حاجی قادری کۆیی) و (بێخود) ژنیان نەهێناوە.

**٢- دیسان قادر کێیە؟:**

بەڵێ لە لایەکی تر قادر (خوا)یە.

لە هەڵبەستی هۆنەرمان (کوردی) و چەندین هۆنەرانی ترماندا وشەی (قادر) بەمەبەستی (خوا) لە هەڵبەستەکانیاندا بەزۆری هاتووە.

هاتنی ئەم (خوا)یەش دیسان لە هەڵبەستی (کوردی)دا لێی کراوەتە (قادر)ێکی تر لە ژیانی (کوردی)ماندا، لە کاتێکدا لە ئیسلامەتیدا و لە نێوان (ناو) یا (ڕواڵەتەکان)ی خوای مەزندا کە بە(اسماء الحسنی) ناوبراوە خوای مەزن بە(قادر) و،(موقتەدیر)یش ناوبراوە کە لەو (ناو) یا (ڕواڵەتانە)ی خوای گەورە و باڵادەستن.

جگە لەوەی ئەم (ناو) یا (ڕواڵەت)ی خواییە لە ئایەتەکانی: (٣٥ و ٦٧)ی سوورەتی (الانعام) و (٩٩)ی (الاسراء) و (٣٣)ی (الاحقاف) و (٤٠)ی (القیامە) و (٨٠)ی (الطارق) و زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا کە لە هەموویاندا خوا بە(قادر = توانا) ناوبراوە.

هەر لەمەوەیە کە ناوی ئەم ڕواڵەتانەی (خوا) کە (قادر)ە لە کوردەواریدا (باو)ە و کراوە بەناوی منداڵەکانمان لە خۆشەویستیی ئەو (ناو) یا (ڕواڵەت)ی خواوە... لە نەشارەزاییی ئەو سەرچاوە چاپییانەوە، ئەم ناوە (بەرز) و (پیرۆز)ەی (قادر)ی خوایەیان گۆڕیوە بەو کوڕە جوانە (لووسکە)یەی شاعیرمان (کوردی).

ئا ئەمەش یەکێکە لەو (قادر)انەی ژیانی (کوردی) کە من لە پەیکاری ساغکردنەوە و گەیشتنە ڕاستیی دام.

**٣- دیسان (قادر) کێیە؟:**

قادرێکی تر لە ژیانی (کوردی)دا بەمەبەستی پاک. بەپێی باری کۆمەڵایەتی و پەروەردە و ئاینی و ڕەوشت بەرزیی کوردەواریمان، هێرشی شەپۆلێکی صۆفیگەری لە ناوچەی بابانی سەرێنی (کوردی)دا بەندیوارییەکی توندوتۆڵ و تۆکمە لەگەڵ یەکێ لە گەورە پیاوانی کوردمان (شێخ عەبدولقادری گەیلانی – واتە غەوسی گەیلانی، یا غەوسی بەغدا)دا هەبووە و، هەر ئەویش (واتە غەوس = غەوث) کوردێکی زانا و هۆنەرێکی لێهاتووی بەتوانا و صۆفییەکی سەرۆکی (طەریقەت = ڕێباز)ی (قادری)، یەکێ بووە لە چوار قوطبەکەی ئیسلام، لە نێوان ساڵانی (١٠٧٧ – ١١٦٦)ی زاینیدا ژیاوە.

دەسەڵاتی ئاینیی ئەو (عەبدولقادری گەیلانی)یە، سەرەڕای (کوردستان) تا ئێستەش پەیرەویکارانی لە (تورکیا)، (هندستان)، (یەمەن)، (صۆماڵ)، (سودان)، (میصر)، (مەغریب)...

هتددا، بەزۆری باوە و پەیڕەویکاری ڕێبازەکەی ئەون.
من خۆم ئەم ڕاستییەم لە کوردستانی عیراق و تورکیا و ئێران و هندستان و پاکستان و، یەمەن و میصر و مەغریبدا بەزۆری دیتووە کە ئەویان لە لا زۆر پیرۆزە.
هۆنەرمان (کوردی)یش ئەگەرچی خۆی وەک دەروێشێکی طەریقەتی (قادری) و (تەکیە) و (خانەقا) گرتن و برادەری گرتن لەگەڵ کەسانی کۆڕی ئەم تەریقەتە خۆی ئاشکرا نەکردووە، بەڵام لە هەر یەکێ لە دەروێشانی ئەم طەریقەتە بەندیواری دەقی دروستی طەریقەتەکە و طەریقەتی (نەخشی = نەقشبەندی)یش بووە. لە ڕێرەوێکی صۆفییانەی پاکی تایبەتدا و، هەوادارێکی سەر لە ڕێگەی (غەوس)دا و بەگیان خۆ بەپەیڕەویکارانی (غەوس) بووە.
ئەو بەندیوارییە گیانییە و بەدڵ خۆشەویستییەی لە چەند هەڵبەستێکی خودی (کوردی)دا سەریان هەڵداوە، کە لەم پەڕاوییەدا جێگیرم کردوون، بەلێکدانەوەیانەوە و بەساغکردنەوەی ئەو پەیوەندییە گیانییەیەوە و، تەنانەت بەناوی خودی (غەوث) خۆیەوە کە (عەبدولقادر = قادر)ەوە، ناوی بردووە و، چەندین جار چووەتە (بەغدا) بۆ بەهرەوەربوون لە پیرۆزیی سەردانی گۆڕەکەی (غەوس).
(کوردی) لەو هەڵبەستانەیدا ناوبردنی (قادر)ی بەمەبەستی خودی (غەوس) بووە کە ئەمەش یەکێکی ترە لەو (قادر)انەی ژیانی (کوردی) کە بەداخەوە، ئەم (قادر)ەشیان لێ کردووەتە ئەو کوڕە (قادر) ناوە جوانەی کە گوایە (کوردی) خۆشی ویستووە و لە پێناویدا ڕیسوا کراوە.
**٤– قادر کێ بوو؟** ئەم قادرەیان هێما (ڕەمز)ی فەلسەفەیەکی (کوردی)مان بووە.
ئاشکرایە هەر کەسە لە ژیانیدا ڕێرەوێکی تایبەتیی خۆی هەبووە و هەیە. (کوردی)یش وەک لە هەندێ لە هەڵبەستەکانییەوە دەردەکەوێ ڕێرەوێکی تایبەتی خۆی هەبووە وەک فەلسەفەیەکی صۆفیگەری (خودی – زاتی) (کوردی) لەم پەیڕەوی کردنی فەلسەفە صۆفیگەرییە تایبەتیەی ژیانی خۆیدا، نزیکایەتیی زۆری لەگەڵ (مەنصووری هەلاج)دا هەبووە و شێفتەی ڕێبازی ژیانی ئەو و، وتارەکانی بووە و، زۆر جار خۆی چواندووە بە(مەنصوور).
ئەو (مەنصوور)ەش وەک تارماییەکیم بۆ دەرکەوتووە کە بەبنەچە کورد بووە و ناوی (حوسەین کوڕی مەنصوور) بووە و لە سالانی (٨٥٨ – ٩٢٢)ی زاینیدا ژیاوە و خواناسی بەڕاستی و خواپەرستێکی پاک و دروست و ساغ بووە، صۆفییەکی زمان پاراو و، زانایەکی پڕ و بەڕاستی تێگەیشتوو بووە، خاوەنی ڕێگەیەکی فەلسەفیی تایبەتی خۆی بووە، بەرهەمی نووسراوی زۆرن، (مەنصوور) دوای هەشت ساڵی زیندانی بوون بەتاوانی دەربڕینی دیاریترین دروشمە فەلسەفییەکانی کە وتەی (انا الحق) بووە، زۆر بەنامرۆڤانە و بەدڕندانەترین سزا لە (بەغدا) بەپارچە پارچەکردنی کوشتوویانە.
(کوردی) لە فەلسەفەکەی ژیانی خۆیدا ئەوەندە شەیدای (مەنصوور) بووە، بەشانازیی زانیوە کە لە ڕێگەی ڕاستیدا بەدەردەکەی (مەنصوور) بچێ.
(کوردی)ش وەک کەسێتی (شەخصیەت)ێکی سەربەخۆ لە جێگەی وتەی (انا الحق)ەکەی

(مەنصوور) ئەم وشەی (قادر)ی کردووەتە (هێما) و دروشمی فەلسەفەی ژیانی خۆی، لە هەندێ هەڵبەستیدا کە جارێک ئەم وشەی (قادر)ەی بەمەبەستی (واتا زمانییەکەی = «کە توانا»–یە) و جارێکی تر یەکسەر بەنیشانەی خودی خوای مەزن و لە جاری تردا بەئامانجی (غەوس) و جاری تریش ناوی خۆشەویستێکی خۆی، سا هەر برادەرێکی گیانیی بووە کە دیسان سەرچاوە چاپییە ناوبراوەکان ئەو هەموو (قادر)انەیان لێ کردووەتە تەنیا یەک (قادر)ە لووسکەکەی کە گوایە خۆشی ویستووە.

٥– زۆر لە شاعیران هەڵبەستیان هەیە کە ناوی برادەرە گیانی و دۆستەکانی خۆیانیان تیا بردووە یا لە ناوەرۆکی هەڵبەستەکانیانەوە دەردەکەوێ کە ئەو هەڵبەستانە بۆ (نێرینە وتراون) نەک بۆ (مێیینە) کە ئەوەشیان وەک نامۆیی و (بیری یەکترکردن) و (لەیەک دووری) وەها بووە، کە ئەوەندە نموونەیان زۆرن ناو نەبردنیان باشترێکە.

بەڵام خۆشبەختانە ئەو هۆنەرانە بەدەردەکەی (کوردی) بەنارەوایی تاوانبار نەکراون، ئەگەر نا و ئەگەر تاوانبار بکرانایە ئەوسایە ڕەوشتی بەرز و پاک و مرۆڤانەی دروستی کوردەواریمان دەشێوا. بەداخەوە لە هەڵبەستی (کوردی)ماندا ئەو ناتۆرەیەی پێدا هەڵبەستراوە و هەمان (قادر)یان تیا قوت کردووەتەوە.

**٦– قادر کێیە؟:**

(جوانی پەرستی)ی (نێرپەرستی) نەبووە و نییە کەوا ئەو سەرچاوانەی لەمەڕ (کوردی)مان (قادر)یان تیا ئاوێتە کردووە خۆ هەرچی هەڵبەستی دڵداری هەیە هەمووی جوانی پەرستیی لەوانە (جوانیی دانسقەیی نێرینەیەک) و هەڵبەست پیا هەڵدانی کارێکی وێژەیی بووە نەک (ڕەوشت بەدی) کە بەداخەوە ئەو سەرچاوەیانە لە (کوردی)یان کردووەتە تاوان.

(ئەحمەد حەمدی بەگی ساحیبقران) لە تاکە هەڵبەستێکیدا ناوی (قادر)ێک دەبات کە ئەو (قادر)ە کوڕی برادەرێکی زۆر خۆشەویستی خودی (حەمدی) بووە، ئەویش (حاجی مەلا سەعید)ە کە پیاو ماقووڵ و زانای مەلا چاکی سولەیمانی بووە و، ئەو کوڕەی کە بەڕێز (قادر ئاغای حاجی مەلا سەعید) بووە کە حەمدی فەرموویەتی:

(لە من شـــەیداترە (واعیظ) بەحوسنی صـــوورەتی «قالە»

تەماشاکەن؛ لەسەر (قیل)ێک هەزار دەفعە، ئەڵێ: «قالە»)

کە لەم تاکە هەڵبەستەدا (واعیظ: حاجی مەلا سەعید و «قالە»ی یەکەم قادر ئاغای ناو براوە و «قالە»ی دووەم بەواتا «وتی عەرەبی»یە کە خۆشبەختانە کەس ناتۆرەی «قالە»ی بە(حەمدی)یەوە هەڵنەبەستووە چونکە پاک بووە (کوردی)یش خۆ پاک بووە و بۆچ؟

هۆنەری لێهاتوو، نووسەری بەهێز و ڕۆژنامەنووسی ڕۆشنبیر فراوانمان (مامۆستا عەلی باپیر ئاغا) لە ساڵە بیستەکانی چەرخی پێشوودا (هەڵبەستێک)ی بە(حەمە شوان) ناوێکی خەڵقی سولەیمانیدا هەڵداوە کە هاواڵم بەڕێز (دوکتۆری ددان و ددانسازی «گوێژەی کوڕی شەوکەتی دانساز») کە لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٧ز.دا لە سولەیمانی لە دانیشتنێکماندا بۆی گێڕامەوە کە

لە خودی (عەلی کەمال)ی بیستووە و سەرەتای هەڵبەستەکە ئەمەیە:

**(فەلەک ڕاست برۆ، فەلەک ڕاست برۆ**

**مانگی مــن جــوانە، وە یا مانـگی تۆ)**...... هتد

کە (عەلی کەمال) بۆی گێڕابۆوە و وەختە بووە لەسەر ئەو هەڵبەستە بەر تێهەڵدان بکەوێ بەڵام تێی گەیاندوون کە ئەمە بەخراپی لێدوان وە بەنیاز و مەبەستی خراپ نییە و ئەوجا وازیان لێ هێناوە، بەڵام نەبووەتە (وتەی) ســەرزاری ئەم و ئەو وەک چاپکراوەکــان بە(کــوردی)مــانیــان کردووە.

(زێوەرە فەندی) مـامـۆسـتـای پەروەردیاری مـەزن و هۆنەری بەتوانامـان لە هەڵبەستێکیدا لە بەڕێز (بابە عەلی)ی کوڕی شێخ مەحموودی حەفید دواوە و تیایا فەرموویەتی:

**(چاو)مکەت (بۆ من)، لە جێگەی نێرگسی شەهلا بەسە.**

کە لەم نیو باڵییە هەڵبەستەدا (چاو) بەعەرەبی (عەین)ە و بۆ من بەعەرەبی (لی)یە و (عەین و لی) دەبێتـە (عەلی) و خۆ ئەمـەش قـالەبازی نەبووە و ئەو چەشنـە بار و هەڵوێستانـە کارێکی (باو) بوون.

**٧–** هۆنەرانی نەک کورد بەشکو هی نەتەوە ئیسلامییەکانی تریش زۆر جار لە خوا دواون وەک (نێرینەیەک) لە هەڵبەستەکانیاندا باسیان کردووە، چونکە لە ئاینە ئاسمـانییـەکاندا ناوی (خوا) بەشێوەی مێیینەی (تەئنیس)ی عەرەبی نەهاتووە کە ئەوانەش بە لە (نێرینە دواندن) دەژمێـردرێن و بەدڕەوشـتی لەو کارەدا نییـە کـە (کوردی)مـان لەو چەشنە هـەڵبەسـتـەدا بەشدارە.

**٨– قادر کێیە؟**

قادر بەگی خوسرەو بەگی جافە.

یەکێ لە هاواڵە خۆشەویستە هاوبیر و ڕۆشنبیرەکانی (کوردی)مان (قادر بـەگی کەیخوسرەو بەگی جاف) بووە کە لە زۆر لە هەڵبەستیدا ناوی بردووە و لەم پەڕاوییەدا جێگیرم کردوون کە بەداخەوە ناوبردنی ئەو (قادر)ەش لە (کوردی) کراوەتە (قالە) بەناوەکەی گۆرین.

**٩–** کـارامـەیی (کـوردی) لە وێژەوانی و شـاعـیرێتـییـەکـەیدا، لێی بووەتە مـایەی تاوان پێـوە هەڵبەستن.

ئەوەتا (کــوردی) بەپێی وێژەی دێرین و بەپێی، توانایەتیی خـۆی لە هۆنـەریدا کـە ئەم چـەشنـە (قادر)ە جۆراوجۆرانـەی لە هەڵبەستەکانیدا ڕاگەیاندوون کە لە (دەسـتوور)ی ئەو وێژە کۆنەدا ئەوە وردەکاری و کارامـەیی و باڵادەستی لە هونـەرمـەندی و هۆنەری و زمـانـەوانـیدا ئەو کـارە چەشنـە ســەر لێ شــێــوانێکی وێژەیی کــۆن بـووە و (ناو)ێکی پەسند بـووە تەنانـەت لە ڕووی کۆمەڵایەتی و زمانی و ئاینی و... هتدەوە و بەجوانی و جوانکاری و، وەستایی دانراوە.

کەچی ئەوەتا: بەهۆی هـەڵەیەکی سەرنجنەدانەوە ئەو سەرچاوە چاپکراوانە ئەم شێوە وێژەییـە جوانـەی (کوردی)یان بەسـتووە بەبابەتەکەی (قادری جوان) و خۆشـەویستی (کوردی)یەوە وە،

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەم هەڵبەستە کە بەڵگەی دەستی ئەو سەرچاوانەیە لە دڵداری نادوێ دوورە لە باسی (قادر) و گەیشتنە (سنە)ی و بەشکو بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەم جۆرە بیروڕایانەوەیە کە لە دوورکەوتنەوەی دۆستێکی (کوردی) دواوە ئەوەندەی پێ ناخۆش بووە وتوویەتی کە ئێوە جیا ئەبنەوە و من لەگەڵ خۆتان نابەن کەواتە بمکوژن لە کۆچکردنی گەورە پیاوێک دواوە کە ئەحمەد پاشا بووە.

**١٠- قادر کێ بووە؟**

(قادر) ناوێک برازای (کوردی) بووە.

جگە لەو هەموو (قادر)انە، (قادر ناوێکی تریش) لە ژیانی (کوردی)دا هەبووە و (قادر)ێکی ڕاستەقینە بووە، ئەویش کوڕێکی خەڵکی سولەیمانی و بەبنەچە (سنەیی) و کەسێکی خانەوادەی (ساحیبقران) بووە.

لە کوردەواریدا پەندێک هەیە کە دەڵێن:

**(مزگەوت ڕووخاوە و میحرابی ماوە)**

ئێمەش ئەگەر سەرنجێکی هەر نێرینە و مێیینەیەکی ئەم خانەوادەیەی ئێستای (ساحیبقران) بدەین، بەتێکڕایی شۆخ و شەنگ و جوانیان دەبینین، کەواتە ئەم (قادر)ەش کە لەم خاڵی (دە)یەمینەدا لێی دەدوێم بێ گومان لاوێکی قۆز و جوان بووە.

بەگوێرەی ئەو بەند و باوەی دراوەتە پاڵ (کوردی) ئەگەر ئەو کوڕە جوانیش نەبووبێ، بەڵام لە بەردڵ و چاوی (کوردی) جوانییەکەی ئەوەندە کاری تێ کردووە کە (کوردی) خۆشی ویستووە. ئەمەیان ڕاستە کە کوردی لەم (قادر)ە یەکجار کەم جیابووەتەوە و هەمیشە لە دەر و دەشت و سەردانی خزمان و برادەران و کۆڕی وێژەوانان و لەگەڵا دانیشتنی پیاوە گەورانی وەک (شای عەجەم)دا هەر ئەو (قادر)ەی لەگەڵ خۆیدا گێڕاوە.

جا وەک چوومەتە بنج و بناوانی ئەم (قادر)ەیانەوە، بەتەواوی بۆم ڕوون بووەتەوە کە ئەم قادرە برازای خودی (کوردی) بووە و خۆی بەخێوی کردووە.

(کوردی) دوو خوشک و چوار برای لە دایک و باوکی هەبووە کە ئەمانەن:

١- خاتوو (سەلما) کە شووی کردووە بەضیائەدین شێخ عومەری بیارە و (شێخ نەجمەدین) لەو (دایک) و (باوک)ە بووە.

٢- خاتوو (پیرۆز) یا (پیرۆز خان) کە ئەمیش شووی کردووە بەشێخی مەزن و بەناوبانگ (شێخ عەبدولرەحمانی نێرگسەجاڕی) ناوی ئەم (خاتوونە و مێردەکەیم) لە شەوی ٧/٦ی ٢٠٠٤ـدا بەتەلەفۆن لە بەڕێز (مامۆستا شێخ حسەین شێخ عوسمانی نێرگسەجاڕی) وەرگرت کە هەتا کاتی ئەم ئاگەداری وەرگرتنەم هەردوو ناوەکەم دەست نەکەوتبوون و، لەوە بەولاوە کە زانیبووم ئەم خوشکەی (کوردی) شووی کردووە بەشێخێکی مەزنی نێرگسەجاڕی هەرچەندە مامۆستا (شێخ حسەین «باوکی پیرۆز خان» بە«حاجی حسەین بەگ») دەزانێ تەنانەت لە بەڕێز (عوسمان بەگی کوڕی ئەحمەد حەمەدی بەگی

ساحیبقران)یش پرسیاری هەردوو ناوی ئەم ئافرەتە و ناوی شێخی مێردیم لە هاوینی ١٩٧٦ز.دا پرسی و ئەویش فەرمووی لە باوکم پرسی کە هۆی تێکەڵیت لەگەڵ ئەم شێخانەی نێرگسەجارِدا چییە، لە وەڵامدا باوکم فەرمووی ئەمانە زاوامانن کە خوشکی (مستەفا بەگی کوردی)یان مارە کردووە.

بەڵام بەسوپاسەوە ڕای ئەگەیەنم کە بەڕێز (مامۆستا شێخ حسەینی نێرگسەجاڕی ئەم خاڵەی بۆ ڕوون کردمەوە تەنانەت لە کاتێکدا کە ئەندامی کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد) بووم و پاکنووسی ئەم پەڕاوییەم بۆ ئەندامەکانی ئەو لێژنەیە دەخوێندەوە بەئاواتی لە چاپدانییەوە لە لایەن ئەو (کۆڕی زانیاری)یەی، کە دەمڕاستی ئەو لیژنەیە (مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) بوو ئەویش ناوی ئەو (ژن و مێرد)ە ناوبراوەی نەدەزانی و خۆ ئەندامەکانی دیکە بەدرێژی ئەوەی کە لە دوو ساڵدا ئەم پەڕاوییەم بۆ دەخوێندنەوە تەنیا هەر (گوێگر) بوون و بەس و کەسێکیان وشەیەکی بۆ نەخستوومەتە سەر ئەم پەڕاوییە.

٣- ئەمین بەگ - کە کارگوزارێکی عوسمانی بووە و لە حیجاز (سعوودیە) مردووە.

٤- داوود بەگ - کە (بەرەی) ساڵح زەکی بەگی ساحیبقرانی هۆنەر و ڕۆژنامەنووس و ناودار لەون.

٥- ئیبراهیم بەگ - خێڵی باپیرانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحیبقرانی هۆنەر و تۆفیق بەگی هۆنەری برای و... هتد لە بەرەی ئەون.

٦- حەمید بەگ - ئەمیان لە سولەیمانی لەگەڵ باوکی و «کوردی»ی برای پێکەوە ژیاون و لەگەڵ (کوردی)دا یەکجار یەکیان خۆشویستووە و لە سەردانێکی (سنە)یدا مردووە، (کوردی) تەرجیع بەندێکی (سوگواری)ی زۆر نایاب و باڵای بە(کوردی و فارسی و تورکی و عارەبی) بۆ مردنەکەی وتووە کە بەداخەوە تاکو ئێستە ئەو هەڵبەستەم دەست نەکەوتووە، بانگەوازم بۆ سەرهەڵدانیەتی.

ئەم (حەمید بەگ)ە ژنێک و چەند منداڵێکی لە پاش بەجێ دەمێنێ کە هەموو پێگەییو بوون، تەنیا کوڕە بچووکەکەیان کە زۆر خۆشەویستی باوکی بووە ناوی (قادر) دەبێ، (کوردی) ئەم کوڕە و براژنەکەی دەگرێتە خۆی و واش دیارییان دەکات و خەریکی پەروەردەکردنی ئەو کوڕە دەبێ و خۆی دەبێتە مامۆستای و سەرەتای خوێندن و نووسینی فێر دەکا و دەینێتە بەر حوجرە و دواییش بەر (مەلا) لە مزگەوت. لە سەردانی خزمانی سنە و جێگایانی تریدا لەگەڵ خۆی گێڕاویەتی. ئەم پەیوەندی مام و برازایی و مامۆستاییە گەیوەتە خۆشەویستییەکی ڕادەی (باوکێتی) و بەتایبەتی مەیلی حەمید بەگی برایشی داوە بە(قادر بەگ)ی برازای و دوور نییە مایەی ئیلهامی شیعریشی بووبێ وەک (مامۆستا عەلائەدین سەجادی) بۆ (قادر)ەکەی تری بە(جوانپەرستیی صۆفییانە)ی لێک داوەتەوە، نەک ئەم (قادر بەگ)ەی برازای وەک لە چەند شوێنێکی تری ئەم پەڕاوییەدا لێی دوام کە ناوی ئەم (قادر)ەمان تیا هاتووە.

کە وەک لە خودی مامۆستا (سەجادی)م بیست، ئەو بەم (قادر)ی برازایەی نەزانیبوو لێرەدا

ئاگەدارییەکی گرنگم دەست کەوتووە لە ڕاگەیاندنیدا گێڕانەوەیەکی سەرچاوە چاپییەکان بەبارێکی ڕاستدا ساغ دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە:

(قادر بەگ)ی برازای (کوردی) وەک هەر گەنجێک لە هەڕەتی پێگەیشتن (موراهەقە – بلووغ)دا کە دەکەوێتە سەرپێچی و ئاڵۆزییەکی نەفسی و بیری و یاخیگەری و نامۆیی خۆ بەشت زانین و خۆ بەهاوتای لە خۆ گەورەتر کردن و... هتدەوە. ئەویش لەم تەمەنەی ژیانیدا جارێکیان لەگەڵ دایکیا تێ دەگیرێ و لێی زیز دەبێ و دەتۆرێ و، تەک کاروانێک دەکەوێ و ڕوو دەکاتە (خزمانی سنەی) دایکیشی لە تاو کوڕە وەک شێتی لێ دێ (کوردی)ش کە سۆراخی دەکات دووی دەکەوێ و لە (سنە) دەیدۆزێتەوە و دەیهێنێتەوە سولەیمانی، بەڵام هەڵبەست بەسەر زەنگی ملی پێشەنگەکەیدا هەڵنادا کە لە کاروانەکەیدا بووە، کە بەناڕەوایی ئەم هەڵبەستەیان بەستووە بەم کارەوە.

ئا ئەم ڕووداوەیە کە سەرچاوەکان بەنیوە و نیوەچڵی و شێواوی وەریان گرتووە و لە نەزانینەوە بەو جۆرە ناشیرینە نووسیویانە گوایە ئەو (قادر)ە کوڕێکی حەز لێ کردووی (کوردی) بووە و لە دەست (کوردی) هەڵاتووە لە جاڕسیدا و (کوردی) دوای کەوتووە بۆ (سنە)وە...هتد و ئەمەیان لێ کردووەتە تاوانباری و سەرچاوە چاپییەکانیش، یەک لە یەکیان قۆزتووەتەوە کە سەرچاوەی سەرەتاییی هەموویان (دیوانی کوردی – چاپی کوردی و مەریوانی)یە وەک لە پێشەوە ڕام گەیاند.

(کوردی) لە سەفەرەکانی ئێران و جێگایانی تریشدا و لە بارەگای (شای عەجەم) و کۆڕی هۆنەرانیشدا (قادر بەگ)ی برازای لەگەڵدا بووە. کە گەورەش بووە ژنی بۆ هێناوە، نەوەی تریش لە ئێران و عێراقدا زۆرن و لە دوا دوای ژیانی پەککەوتوویی (کوردی)دا (قادر) زۆر چاودێریی کردووە.

(قادر بەگ) کچێکی بووە ناوی (عادیلە) بوو، ئەو (عادیلە خان)ە ژنی (وەسمان پاشای جاف) بووە کە بە(خانمی وەسمان پاشا) بەناوبانگە و دایکی (تاهیر بەگی جاف: ١٨٧٨ – ١٩٠٨ز) و (ئەحمەد موختار بەگی جاف: ١٨٩٥ – ١٩٣٥ز) وە (ناهیدە خانم)ە کە هەرسێکیان هۆنەری بەتوانا بوون.

هەرچەندە لە: (دیوانی تاهیر بەگی جاف)ی چاپی مامۆستا گیودا ئەم (قادر بەگە، بەکوڕی ڕۆستەم بەگ کوڕی ئەحمەد بەگی ساحیبقران) ناوبراوە، کە من وەک بزانم مامۆستا گیو ئەوەندە قین و ڕقی لە (کوردی) بوو بەهۆی کووکەی (قادر)ەوە، بۆیە لێرەدا ویستوویەتی کە (عادیلە خان) دوور بخاتەوە لە (قادر)ەی لەمەڕ (کوردی) کە ئەم کارەی (گیو)یش وەک دەسکارییە زۆرەکانی لە هەڵبەستاندا کارێکی نازانیارانە بووە، ئەگەرچی ئەو لە پاکی و دڵسۆزییەوە ئەوانەی دەکردن. ئەمجا وەک من وێکەوتووم ئەو (ڕۆستەم بەگ)ەی کە (مامۆستا گیو) ناوی بردووە (ئەوە) برا گەورەی (قادر بەگی حەمید بەگی مەحموود بەگی ئەحمەد بەگی ساحیبقران) بووە، کە هەردوو (قادر بەگ) وە (ڕۆستەم بەگ) برازای شاعیرمان (کوردی)

بوون و (قادر بەگ) باوکی (عادیلە خانم – خانمی وەسمان پاشا) بووە.
لە کۆتاییی ئەم ساغکردنەوانەی ناو ئەم خاڵی دەیەمینەدا خۆم بەشاد و بەختیار دەزانم کە لە ئەنجامی تێکۆشانی بێ دریژانەی قووڵ و زۆرمدا توانیم بگەمە: بەدەستهێنانی ئەم ڕاستییانە کە بەر لە من بەم شێوەیە کەسێکی تر ئاوەها وێ نەکەوتووە و بڵاوی نەکردووەتەوە و، ئاواتەخوازم توانیبێتم لە چمکێکی بچووکی ئەم لایەنەوە خزمەتێکم کردبێ.
هەر لەم بوار و پێناوەشدا توانیم ئەوە بەڕوونی ساغ بکەمەوە کە ئەم هەڵبەستە بۆ هەڵهاتنی (قادر) و (دووکەوتنی) شاعیرمان (کوردی) نەگوتراوە بەشکو، وەک چەند جاری تر نیشانەم کردووە کە بۆ (سولەیمانی) جێهێشتنی ئەحمەد پاشای بابانی داناوە لە کاتی ئامادەکاریی لە شار دەرچوونەکەیدا کە هەموو تاکەکانی ئەم هەڵبەستە دەنگ لەم ڕاستی وێکەوتنەی من دەدەن. بەشکو بەپێچەوانەی سەرچاوە چاپکراوە ناوبراوەکانەوە کە لایان وەها بووە کە بۆ (قادر) گوتراوە. بۆ نموونە هەر لەم یەکەم تاکە هەڵبەستەی سەرەوەدا دەبوو (کوردی) لە جێگەی وشەی (فیرقەت) وشەی (قوربەت) واتە نزیکبوونەوەی بخستایە، ناو ئەم تاکە هەڵبەستەیەوە کە مەبەست لە هاتنی خۆشەویستەکەی بووە کە (قادر)ە نەک جیابوونەوە کە (فیرقەت)ە.
هەروەها لەباتی وشەی (هیجرەت) کە لەم تاکی یەکەمی هەڵبەستەکەدایە دەبوو، وشەی (وەصڵەت) یا (شادی)ی بگوتایە کە ئەگەر وەهایشی بگوتایە لەگەڵ واتا و مەبەستی تاکە هەڵبەستەکانی دوایی ئەم هەڵبەستەدا نەدەگونجا.
جگە لەوەی کە ئەو کاروانەی گوایە (قادر)ی تیا بووە دەبوو (کالا)یەکەی خۆشییەکی وەک (قادر) بووایە کەچی (کوردی) وتوویە (کالای خەم بارە) کە ئەمانەش وەک سەرچاوە چاپییەکان بۆی چوون (ئەمانە):
نابەستریێنەوە بەمەبەستی بۆچوونەکانی ئەو سەرچاوانەوە و، بەئاشکرا هەڵەیەتی سەرچاوەکان ئەگەیەنن.
وا جارێکی تریش دەگەڕێمەوە سەر ناوەرۆکی ئەم هەڵبەستە لە سەرچاوە دەسنووس و چاپییەکاندا، چونکە خاڵێکی گرنگی ترم بەدەستەوە ماوە لەسەر ئەم هەڵهاتنی (قادر) و بەدواداچوونی (کوردی)یە، کە لە (کابرا)یەکی تر و (قادر) ناوێکی تردا ڕوویان داوە کە ئەمەیە:
١١- لە ڕۆژی ٢٠٠٤/١١/٢٧ز.دا لە دیدارێکمدا لەگەڵ هاواڵی هۆنەر و هێژام دوکتۆری ددان و ددانسازی (گویژە شەوکەت دانساز)دا لە سولەیمانی و خواستی ئەوەم لێ کردەوە کە کارەساتی ئەو دەروێشە دێوانەیەم جارێکی تر بۆ بگێڕێتەوە کە شەیدای (قادر) ناوێک بووە لە سولەیمانیدا و لە ئەنجامی هەڵهاتی ئەو (قادر)ە و بەدواداچوونی دەروێشەکە و، دەروێشەکە کوژراوە، کە هەر هاواڵی ناوبراوم لە زستانی ساڵی/٢٠٠٠ز.دا ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕابوومەوە، بەڵام ئەو سایە هیوایەکم نەبوو کە ئەم پەڕاوییەم چاپ بکرێ، بۆیە ئەو

کارەساتەم هەر لە یادی خۆمدا هێشتبووەوە.
بەڵام کەوا ئێستە (٢٠٠٤ز)یە و دەست کراوە بە لە چاپدانی ئەم پەڕاوییە و کە گەیشتمە سەر ئەم هەڵبەستەش ئەو گێڕانەوەیەی هاواڵم (دوکتۆر گویژە)م بیر کەوتەوە و بۆ لێ وەرگرتنی دەقی کارەساتەکە چوومەوە لای و، بەم جۆرەی دوایی بۆی گێڕامەوە.
دوکتۆری ناوبراو، کارەساتەکەی لە دەمی هۆنەر و نووسەری ناودارمان (عەلی کەمال باپیر ئاغا)ی بیستووە کە مامۆستا (عەلی کەمال)یش خۆی سەرەتای کارەساتەکەی دیوە و ئەنجامەکەی بیستووەتەوە و بۆ دوکتۆری ناوبراوی گێڕاوەتەوە و بەم جۆرە:
(لە تەکیەی «قادری» واتە مزگەوتی کاک ئەحمەدی شێخدا دەروێشێکی دێوانە جێنشین بووە و لەسەر ئەو تەکیەیە ژیاوە و ڕۆژانی ژیانی بەخواناسی نوێژ و زیکر و ئەمانەوە بەسەربردووە.
لە سولەیمانیدا کوڕێکی (قادر) ناو هەبووە هەرکە ئەو دەروێشە ئەو کوڕەی دیتبێ کەوتووەتە حای و حووی زیکرەوە و بەپێی زاراوەی دەروێشانە (حاڵی لێ هاتووە).
نەریتێکی ئەو دەروێشە دیوانەیە وا بووە کە ئەویش ناوی (قادر) بووە لە کاتی کۆڕی زیکر بەستندا لە بەردەرکی مزگەوتی گەورەدا کە ئێستە ئەو شوێنە شەقامێکی پانە لەوێدا کۆڕی زیکر لە شەوانی سێشەممە و هەینییاندا بەستراوە، ئەو (دەروێش قادر)ە لە زیکرکارەکان بەدەم زیکر و خۆبادانەوە جیا بووەتەوە و ڕووی کردووەتە ئەو تاشە بەردە گەورەیەی کە لە نێوان ئەو شەقامە ناوبراوەی بەردەرکی مزگەوتی گەورە و (دەبۆ)یەکەی ئەوسادا بووە، (دەروێش قادر) بەدەم زیکرەوە چەند جارێک تەکانی بەستووەتەوە و، وەک بەرانێکی زۆر خورت و بەگوڕی (توخوس) بەسەری خۆی بەشۆقی لەو تاشە بەردە (قوت بووە)دا کێشاوە و، وتوویە: (شێخ مارف) ئەمەیان بۆ تۆ.
جارێکی تر گوڕی بەستووەتەوە و خۆی بەتاشە بەردەکەدا بەدەم زیکرەوە داوە وتوویە (کاک ئەحمەد) ئەمەش بۆ تۆ و ئیتر چەند جارێک بەو جۆرە شۆقی لە بەردەکە داوە و دوا جاریان وتوویە (قادر گیان) ئەمیش بۆ تۆ و ئیتر بێ هۆش کەوتووە ئەو (قادر گیان)ەش کوڕە جوانەکە بووە.
هەر ئەو دەروێشە دێوانەیە گەلێ جار چووەتە بەر دووکانی باوکی ئەو کوڕە (قادر) ناوە جوانەی کە ئەم دێوانەیە شەیدای بووە و بەرامبەر بەکوڕەکە ماوەیەک دانیشتووە و ئەگەرچی چەند جار دەرکراوە و لێی دراوە، کابرا وازی لەو دیدەنی (قادر)ە، نەهێناوە و بەتەنگ لێدان و ئازارەوە نەبووە و کۆڵی نەداوە.
دوا جار باوکی کوڕە وەها بەچاک دەزانی کە کوڕەکەی بۆ ماوەیەک بنێرێ بۆ ناو خزمانی لە کەرکووک بەشکو لەو ماوەیەدا دەروێش (قادر) کوڕەی لە بیر بچێتەوە و وازیان لێ بهێنێ.
هەرکە دێوانە (قادر) بەو کۆچەی (قادر)ی خۆشەویستی دەزانێ، بەگورجی ڕووەو کەرکووک دوای کوڕە دەکەوێت و گوایە لە کاروان بەزێکی ڕێگەدا دەگاتە کاروانێک و دەبینێ کەوا (قادر)ی خۆشەویستی لەسەر سێبەری ئەسپەکەیدا خەوی لێ کەوتووە و لە گەرماندا (ئارەقی

کردووەتەوە).

(دەروێش قادر) دەچێتە سەر (قادر) و لە بەرچاوی کەسانی کاروانەکە بەداوێنی کەوایەکەی خۆی باوەشێنی سەر و ڕووی (قادر) دەکات و کە (قادر) لەو فێنکیی بایە، بێدارەوە دەبێ و چاو دەکاتەوە (دەروێش قادر) دەبینێ و گورج پەلاماری دەدات و بەخەنجەر دای دەپاچێ بەبێ ئەوەی دەروێش دەست بکاتەوە یا خۆی دوور بخاتەوە بەشکو لەگەڵ هەر خەنجەرێکیدا دەڵێ:

(حەی، وەی، ئەمجارەی تریش بەقوربانی دەستت بم) هەتا بەو حاڵەوە گیانی دەردەچێ.

تا ئێرە ئەوەندە بوو کە لە هاواڵم (دوکتۆر گویژە)م بیست. بەڵام من هەر ئەم کارەساتەم لە ساڵی ١٩٤٣دا لە هۆنەرمان (مەلا ئەحمەد) کە نازناوی هۆنەری (شەفیق) بوو برای مامۆستا (مەلا عەبدوڵڵای پێنجوینی) تووتنچی (موفتی پێنجوینی)ی هۆنەر بووە لە مەلا ئەحمەدم بیستووە کە ئەو سایە من (مضمد صحی) بووم، بۆ کوتان دژی نەخۆشیی (ئاوڵە) بەگونداندا دەگەڕام و ئەو (مەلا ئەحمەد)ش (پۆلیسی غەیرە نیظامی) بوو کە پێیان دەوترا (جاش پۆلیس) کە خرابووە تەکم لە کاری کوتانی ئاوڵەکەدا.

ئەو مامۆستا مەلا ئەحمەدە ئەو سایە کارەساتێکی وەک ئەمەی سەرەوەی بۆ گێڕاومەتەوە کە ئەشێ هەردوو کارەساتەکە هەریەک ڕووداو بێ.

مەلا ئەحمەد ئەوەندەی بۆ گێڕاومەتەوە کە ئەو (دەروێشە ناوەکەی نەدەبرد) لە تەکیەی (کاک ئەحمەدی شێخ)دا جێنشین بووە لەبەر بێ کەسی و پیری لەسەر تەکیە ژیاوە و ڕێکەوت لە سولەیمانیدا کوڕێکی شۆخ و شەنگ هەبووە کە ناوی (قادر) بووە، هەر کاتێ ئەو دەروێشە ئەو (قادر)ەی دیتبێ کەوتووەتە (حای و حووی) و حاڵی لێ هاتووە و لە ئەنجامی خۆ بادان و سەرڕاوەشاندنی زۆردا بێ هۆش کەوتووە بۆ ماوەیەکی کەم.

کە ئەو حاڵەیان لەو دەروێشە پرسیوە وتوویە خوا شاهیدە هەرچی نیازی خراپی هەیە لەگەڵ ئەو کوڕەدا نیمە، بەڵام کە چاوم پێی دەکەوێ، هۆشم بەلای خۆمەوە نامێنێ و وا دەزانم وەکو باڵندەیەک بەئاسماندا دەفڕم هەتا دەگەمە سەر ئاسمانی تەکیەکەی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» لە بەغدا و بەسەر گومەزەکەیدا چەند سووڕێک دەفڕم و خۆم دەکەم بەناو ژووری گۆڕەکەی (حەزرەتی غەوس)دا و لەوێ بێ هۆش دەکەوم و کاتێ بەهۆش دێمەوە هەر لەو شوێنە دام ئەو (قادر)ەم دیوە.

ئەم بارەی دەروێش، ئەو (قادر)ە وەها لێ دەکات کە بڕواتەوە کۆنە شارەکەی خۆی کە (سنە) بووە و کاتێ دەروێش بەو هەڵهاتنە ئەزانێ ئەکەوێتە ڕێگە بەرەو (سنە).

ئەو (قادر)ەش لە ناو کاروانییەکاندا ڕەوشتی دەروێشەکە بۆ خەڵکەکە دەگێڕێتەوە و، هەموو سەرزەنشتی (قادر) دەکەن کە دەبووایە لە (سلەیمانی) ئەو دەروێشەی بکوشتبایە.

دەروێش بەڕێگەوە دەبێ دەگاتە ئەو کاروانە و چاوی بە(قادر) دەکەوێ و حاڵی لێ دێ و دەکەوێتەوە حای حووی و خەڵکەکە ئەزانن ئەوە ئەو دەروێشەیە کە (قادر) لە دەستی هەڵهاتووە و قادر هان دەدەن و لە کاتی بێ هۆش بوونەکەی (قادر) بەخەنجەر دەروێش دادەدڕوێت و

دەروێش بەهۆش دێ و ئەبینێ ئەوا (قادر) دەیکوژێ.
دەروێش هاوار ئەکات و دەڵێ هەزاران جار گوتوومە و ئێستەش چەند بارەی ئەکەمەوە کە خوا دەزانێ هەرچی نیازی خراپە، من بەرامبەر بەتۆ نیمە ئەی (قادر) بەڵام دەستت خۆش بێ و دەی چاک بمکوژە و لە خوێنی خۆم گەردنت ئازاد دەکەم لە بارەگای خوا و بەشایەتی ئەم خەڵکە بەمەرجێ هەتا گیانم دەردەچێ لە بەرچاوم دوور مەکەرەوە، دەروێش گیانی دەرئەچێ و کاروانییەکە دەروێش لەوێدا بەخاک دەسپێرن و (قادر)یش کە تووشی کاروانییەکی بەرەو سولەیمانی دێت دەگەڕێتەوە سولەیمانی.
وەک ڕای گەیاند بەدووری نازانم کە ئەم هەردوو گێڕانەوەی ڕووداوە هەر یەک ڕووداو بێ هەر ئەم ڕووداوەش دەماودەم ئاوێتەی ڕووداوەکەی (هەڵهاتنی قادر بەگ)ی برازای (کوردی) کرابێ و لە ئەنجامدا بووبێتە ئەوەی کە لە یەکەم سەرچاوەی چاپکراو (دیوانی) کوردیدا دراوەتە پاڵ (کوردی) و سەرچاوە لە سەرچاوەی بەهەڵە قۆزتووەتەوە.
پێم وایە ئەمەندە بەس بێ بۆ ساغکردنەوەی ئەم بە(کوردی)یەوە هەڵبەستنە کە ببێتە پاکانە بۆ کردنی و ئەوی بەهەڵە دراوەتە پاڵی بەدرۆ بزانرێ و لە چەندین شوێنی تری ئەم پەڕاوییەشدا بەپێی بۆنەی هەڵبەستەکەوە گەڕاومەتەوە سەر ئەم پاکانەیەی (کوردی) کە دوور بووە لەو بەدڕەوشتییەوە.
ئەمجا وەک کەمێ لەمەوبەر بەڵێنم دا کە دەگەڕێمەوە سەر شیکردنەوەی ئەم تاکی یەکەمەی ئەم هەڵبەستە و جیاوازیی وشەکانی بەپێی سەرچاوەکانی:
لە هەموو سەرچاوەکاندا ئەم تاکە هەڵبەستە یەکەمینە لەم پارچە هەڵبەستەدا.
فیرقەت (کو): هجرت.
دەڵێن (نم/١): الین.
دەڵێن (یح، ع): مگر.
دەڵێن (گ/٣): دەڵێ ی.
پێشەنگی (یح، ش): پیشانگ.
پێشەنگی (ر): پیش هنگ.
هیجرەت (ش، ر، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): محنت و، لە (ش)دا نووسراوە – نسخە: هجرت.
هیجرەت (گل/١، گل/٥، گل/٨): هجره.
مەگەر (کم، گ، س): دەلین.
مەگەر (ش، ر): دلین.
مەگەر (نم/١): الین.
مەگەر (یح، ع، کو): دلی.
مەگەر (گ/٣): دەلێ ی.

غەمبارە (گل/١، گل/٥، ع): غمی بارە.
غەمبارە (گ/٢، س، گ/٣): خەمبارە.
٢- ترنگە یا درنگە: ناوی جۆرە دەنگێکی تایبەتە و لێرەدا دەنگی تەپڵی مەبەستە.
تەپڵ: ئامێرێکی مۆسیقییە، کە بریتییە لە پیاگرتنی پێستەیەکی خاو، بەدەوری دەمی ئامانێکدا و، بەپیاماڵین (ترپە) دەنگی تایبەتی ئەدات بەپێی (ترپە)کە.
تەپڵی باز: جووتێ تەپڵی بچووکە، دەمی (ئامان)ەکەیان ئەوەندەی بستێک و، قوولاییيان قولانجێکە و، دەمیان والا و بنکیان قووچە، بەملا و ئەولای قەڵپوزی (زین)دا پێکەوە قوڵفە دەکرێن و بەند دەکرێن، کە بەسەر سوارییەوە (باڵباز) لێیان دەدات لەسەر سازی تایبەت بەبۆنەی لێدانەکەوە.
جاران، گەورە پیاوان لە گەشتوگوزار و بەهەر مەبەستێک کە لە شار چوونە دەرەوە لەگەڵیاندا دەبوو، وە بەپێی ئەو (بۆنە)یە لێ دەدران کە بۆی دەچوونە دەرێ وەک (ڕاو)، جەنگ.
باز: ئەو وشەیە جگە لەوەی لێکم دایەوە واتای (دیسان) و واتای جۆرە باڵندەیەک (باز) و چەندین واتای تریش دەدات.
ئاتڵان: وشەیەکی تورکییە بەواتە (سواربوونەوە) یا (سواری ماین بوون) و، بەواتای (دیسانەوە سواربوون)ی ولاخیش دێت لە شێوەی وشەی (بازئاتڵان)دا. کە مۆسیقاژەنەکان لە شوێنی خۆیانەوە بەمۆسیقا لێدان بەسواری دەگەیشتنە بەر بارەگای گەورەی ولات و لەوێ دائەبەزین و دەستیان دەکردە مۆسیقە لێدان و کە (گەورەکە) ئامادە دەبوو دیسانەوە ئەو مۆسیقاژەنانە سواریی ولاخەکانیان ببنەوە، ئەوە (بازئاتڵان) بووە.
چاوەش: پێم وایە لە بنچینەی وشەی لێکدراوی (جا) وە (وەش)ەوە هاتووە بەواتە (جێ چاک، شوێن چاک، پایە بەرز و چاک...) کە لێرەدا مەبەست لە (وەستا) یا (سەرۆک)ی مۆسیقەژەنەکانە، جگە لەم واتایانەش لە هێزە چەکدارەکاندا سێیەمین پایەی بەرزییە لە سەروو (سەرباز)ەوە، واتە (یەک خەت) و (دوو خەت) و ئەمجا (سێ خەت) کە خودی چاوەشە. هەروەها چاوەش واتای هەر جۆرە سەرکارێکی تریش دەدات وەک چاوەشی کرێکاران و... هتد.
جاڕچی: ئەو کەسەیە کە فرمانی (میری) وە یا هەواڵ و ئاگەداریی ڕەسمی بەدەنگی بەرز بەناو ئاواییدا بەخەڵکان ڕادەگەیەنێت. وا دیارە بۆ لە شار چوونە دەرەوەکەی (ئەحمەد پاشا) جاڕچی جاڕی داوە کە خەڵکی بچن بەبەڕێکردنییەوە.
تیپ: دەستە - کە مەبەستی لە هورووژاندنی کۆمەڵەی غەم و خەفەتە لە داخی چوونە دەرەوەی (ئەحمەد پاشای بابان) بەشکاوی (سولەیمانی). کە ئەو غەم و خەفەتە هێرشیان کردووەتە سەر دڵی خەڵکان بەو بۆنە ناخۆشەوە.
دەڵێن: دەڵێن، مەبەست لەوەیە کە (ترنگەی تەپڵەکە) و (دەنگی جاڕدانی جاڕچی) و (دەنگی هاتنی سواری مۆسیقاژەنان) و دابەزین و (دیسانەوە سواربوونەوەیان) و (دەنگی مۆسیقا) کە ئەمانە هەموو بەخەڵکی (دەڵێن) کە ئەوا هێرشی غەم و خەفەتە بۆ سەر دڵان.

نامەرد: ئەگەرچی واتای (ناپیاو)، (دەویت) دەدات، بەڵام لێرەدا وشەی هانا ئەبەر بردنێکە نەک جنێو.

ئەسەر: بۆ سەر، لەسەر. کە مەبەست لە کاریگەرێتییە.

ئێلغار یا یەلغار: ئەم وشەیە بەسەرزاری وا پێ دەچی کە وشەیەکی (تورکی) یا (تورکی ئامێز) بێ، بەڵام لە ڕاستیدا وەها نییە و، بەشکو وشەیەکی (لێکدراو)ی کوردییە و لە (ئێل = خێڵ = عەشرەت) وە لە (غار) بەواتە تاودانی وڵاخ بەسەر سوارییەوە. کەواتە مەبەست لە غار غارێن و تاودانی بەتوندی وڵاخە لە لایەن سوارەکەیەوە و، مەبەستی ئێرەش تاودانی دەستەی غەمە بۆ سەر دڵی خەڵکی لە عەزرەت ڕووخانی ڕژێمی بابان و لە شار دەرچوونی دوا پاشای ئەو ڕژێمە.

تێکڕای واتای ئەم تاکە هەڵبەستە، بۆ لە شار دەرچوونی ئەحمەد پاشایە کە لە دەنگی ترپ و هۆڕی سمی ئەسپی سواران و دەنگی مۆسیقا و جاڕچی و ژاوەی خەڵکی لە بەڕێکردنی دوا پاشایاندا.

هەروەها ئەم واتایانە بۆچوون و پیا هەڵبەستنی سەرچاوە چاپکراوەکانی لەمەڕ (کوردی)یەوە کە (قادر)یان بەناڕەوایی پیا هەڵبەستووە بەدرۆ دەخەنەوە کە ئەم تاکە بە چ جۆرێک بۆچوونی هەڵەی ئەو سەرچاوانە ناگەیەنێت و واتای ئەم تاکە (بۆ ڕۆیشتن)ە، نەک بۆ (هاتنی قادر).

ئەم تاکە هەڵبەستە لە (ر)دا نییە و لەوانی تردا دووەمین تاکە لەم چامەیەی (کوردی)دا. ئەمیش جیاوازیی وشەکانی ئەم تاکە هەڵبەستەیە لە سەرچاوەکانیدا:

ترنگەی (یح، ع): ترنکەء – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

ترنگەی (ش): ترنگ – ئەمیش لەنگی دەکات.

تەپڵی (یح، ع، ش، ف، نم/١): طپلی – ئەمیش جۆرە ڕێنووسێکی هەڵەیە کە (پیت)ی (ط) لە زمانی کوردیدا نییە و لەباتی (ت) لێرەدا نووسراوە.

ئاتڵانی (یح، ع، ش، جلی): آطلان – کە دیسان ڕێنووسێکی هەڵەیە و ئەم وشەیە لە (ئات = ماین) و (لان) بۆ سواربوونی ماین پێک هاتووە.

ئاتڵانی (ف، کو): اتلان – ڕێنووسی کۆنە.

ئاتڵانی (نم/١): اتلانی– دیسان ڕێنووسی کۆنە.

چاوەش (یح، ع، نم/١): چاوش – ئەمیش دەگونجێ و ڕاستە و بەڕێنووسی کۆنیشە.

دەنگی (یح): دنگ – ڕێنووسی کۆنە.

دەنگی (یح): دنگی – ڕێنووسی کۆنە.

بەتیپی (کو): بطبل – هەڵەیە و ڕێنووسی کۆنە.

بەتیپی (یح، ع): بطبلی– هەڵەیە و ڕێنووسی کۆنە.

بەتیپی (ش): بەطیپ – هەڵەیە و ڕێنووسی کۆنە.

بەتیپی (جلی): بەتیپ – ڕێنووسی کۆنە.

دەڵێن (نم/١): الین – ئەمیش دەگونجێ و بەڕێنووسی کۆنە.
دەڵێن (یح، ع، کو): دلی – هەڵەیە و بەڕێنووسی کۆنە.
دەڵێن (گ/٣): دەڵێ – دەسکارییە.
ئەمرۆ (یح، ع): امرۆ – بەڕێنووسی کۆنە.
ئێلغارە (ع، کو، ش، ف، نم/١، کم): یلغارە.
ئێلغارە (یح): ریلغارە – بەهەڵە لەباتی (أ) پیتی (ر) نووسراوە.
٣- فیراق: جیایی، کە مەبەست لە جیابوونەکەی ئەحمەد پاشایە.
تەپڵی فیراق: جۆرە ئاوازێکی (غەمگینییانە) بووە کە لە کاتی جیابوونەوەی خۆشەویستاندا بەتەپڵ و ئامێری مۆسیقا لێ دراوە.
(کوردی) وەها ڕادەگەیەنێ کە لە ناخییەوە هەستی کردووە ئەو جۆرە ئاوازی (تەپڵی فیراق)ە لێ دراوە بەبۆنەی ڕۆیشتنی گەورە پیاوێکەوە و ئەو جۆرە ئاوازی تەپڵەی بەلاوە وەک تەپەی سمکۆڵ کردنی ولاخ هاتووەتە گوێ و لە هەمان کاتیشدا تەپوتۆزی ئەو سمکۆڵ کردنە بەرچاوی (کوردی)ی تاریک کردووە، وە یا جیابوونەوەکەی بەئەسپێکی (خورتی بوغرا) داناوە کە سمکۆڵ بکات و تەپوتۆز هەڵسێنێ کە بەرچاوان تاریک بکا و، ئەو بارەی بە(تەپڵی فراق) لێدان داناوە.
وا لێڵە: ئەم وشەیە بەڕێنووسی کۆن بەشێوەی (وا لیلە) دەنووسرا، کە دەتوانرا بە (وا لێڵە) بخوێنرێتەوە و لە هەمان کاتیشدا بەعارەبی بە(وەل لەیلە) واتە (سوێند بەشەو) وە یا بەکوردی: (ئەوا شەوە) لە تاریکی ئەو تەپوتۆزەوە شەوی تاریک داهاتووە.
بینایی: دیتن، چاو، ڕوانین.
ئەمجا ئەم (وا لێڵە) کە بەواتە: (تاریکی، شێواوە، شێلەو) و بەڵام بەجۆرە عەرەبییەکەی (وەل لەیل = واللیل) نیشانە بۆ کردنە بۆ ئەم وشەیە لە (قورئان)ی پیرۆزدا کە لە ئایەتی ژمارە (٢٧)ی سوورەتی (یوونس) و (٤٤)ی (النور) و (٣٧)ی (یاسین = یاس) و بەتێکڕاییش (٩٤) جار لە قورئاندا ئەم وشەیە هاتووە کە ئەم کارەی (کوردی) بەم نیشانە بۆ کردنەی جوانکارییەکی وێژەی کۆن بووە کە لە دوو سەرچاوەی (عن) و (گل/١)دا نووسراوە (ئەو «وەللەیلە» مەبەست لە (والضحي والليل اذا سجا)یە. جگە لەوەی کە شاعیران بەزۆری لە (شەو) دواون و ئەمەش بابەتێکی گەورە و سەربەخۆی وێژەی کوردە.
تەپڵی تفاق: ئەمیش مەبەست لە دەنگی جۆرە ئاوازێکی غەمناکییە کە بە(تەپڵ) لێ دراوە و لە ئاوازی (تەپڵی فراق)ەوە نزیک بووە و نیشانەی ئەوە بووە کەوا گەورە پیاوێک (تفاقی کۆچکردن) گرد دەکاتەوە بۆ دوورکەوتنەوە کە بەواتا (تەپڵ لێدانی خۆ کۆکردنەوە و، خۆکەوتن و، پێچانەوەی بار و بنە و ئامان و قاپ و قاچاخ و نوێن و ڕایەخ و پێخەف و پێویستی ڕێگەی کۆچکردنەکەیە.
(کوردی) لە نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا دەنگ و هەرا و ژاوەی ئەو کۆچکردنەی

بەستووە بەوەوە کە کاری لە (چاوی) کردووە، بەڵام لەم نیو باڵی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەدا بەستوویەتی بەهەستی (بیستن) واتە (گوێچکە)ی خۆیەوە کە ئەو دەنگی (تەپڵی تفاق)ە لەبەر (گوێی)یدا، وەک هاتوهاوار وەها بووە.

واتای ئەم هەڵبەستە، دوورە لەو مەبەستەی سەرچاوە چاپکراوەکان کە گوایە بۆ گەیشتنی کاروانەکەی (قادر)ی وتووە کە ئەو سایە لەباتی ئەم ڕاگەیاندنە دەبوو جوانی ببینێ بەرچاوی خۆی و خۆشیی بیستن لە بەرگوێی خۆی تیا ڕای گەیاندایەوە، کەچی ئەوەتا لێرەدا بەپێچەوانەوەیە کە ئەمەش (هەڵەیەتی)ی ئەو سەرچاوە چاپکراوانە، (بەڕاستی تێنەگەیشتن) دەگەیەنێ و، نادروستی سەرچاوەکان و پاکیی کوردی و ناڕاستیی ئەو ڕووداوەی کە بە(کوردی) و (قادر)یشەوە هەڵبەستراوە، پیشان دەدات.

سەرسامم چۆن نووسەری ئەو سەرچاوانە ئەم ڕاستییانەیان لە هەڵبەستەکەدا هەست پێ نەکردووە و هەر بەبیستن (کوردی)یان تاوانبار کردووە.

لەبەر گرانییەک کە لە کێشی نیو باڵی یەکەمی ئەم هەڵبەستەدایە لە کاتی دەربڕینی (سمکۆڵ دەکا) کەوا ئەگەر زۆر خێرای وەک (سمکۆڵەکا) نەوترێ لەنگ دەنوێنێ و، ئەمەش لاوازییەکە بۆ هەڵبەستی کۆن و ئەشێ بەم جۆرە خێرایییەش کە وتبێتی: (ئە)ی (ئەکا)کە قووت درابێ و سووک کرابێ ئەمەش (باو) بووە.

دەڵێی (جلی): دلین.

دەڵێی (نم/١): دلیء – ڕێنووسی کۆنە.

دەڵێی (یح، ع، کۆ، ر، ش، ف): دلی – ڕێنووسی کۆنە.

ئەسپی (یح، ع، ر): اسپ – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.

دەکا (کم، گ/٢، س): ئەکا.

دەکا (نم/١): اکا.

وا للیلە (جلی)دا کویرە – نسخە: والیلە.

بینابیم (یح): بیتاییم – دیارە هەڵەی نووسینە.

دەڵێی (نم/١): دلیء – ڕێنووسی کۆنە.

دەلێی (یح، ع، کو، ر، ش، ف): دلی – بەڕێنووسی کۆنە.

تەپڵی تفاق (یح، ع، کو، ش): طپلی تفاق – ئەمیش دەگونجێ و ڕێنووسی کۆنە.

تفاق (گ/٢، جلی، س، گ/٣): فیراق – ئەمیش پتر دەگونجێ چونکە ناوی جۆرە ئاوازێکی تایبەتی (تەپڵی فیراق)ە کە بۆ دەست بەکۆچکردن بۆ گەشت و جەنگ لێ دراوە، لە هەمان کاتدا.

ژەند (جلی): زند.

ژەند (نم/١): ژاند.

کەوا (ش): نسخە: وها.

گوێم (یح، جلی، ع): کویم – ئەمەش جۆرە ڕێنووسێکی زۆر کۆنە کە بۆ پیتی (گ) تەنیا (یەک) (سەر) نووسراوە وەک: (ک).

٤– عەجەب: جێگەی سەرسامییە کەوا.

شاهە: پادشایە و مەبەستی ئەحمەد شایە.

شامات: ڕۆژئاوا، وڵاتی شام و جیناسیش کە دیسان نیشانەیە بۆ وتەی (شاه مات)ی یاریی (شەترنج) کە (بەرەی شاه) مات کراو دۆڕاوە و، ئەمیش جوانییەکە بەپێی وێژەی کۆن، جگە لە جیناس ئارایی (دەرناچێ) و (کۆچی) لە لایەک و (شاه) و (شاماتە) لە لایەکی کە وە لەگەڵ: (شامات) و (شادمات)یشدا، واتە (شامییەکان) و (پاشا مرد یا غەمبارە) کە جگە لە واتای ناوی شاری (شام = دیمەشق) کە ئەحمەد پاشا ڕووی تێ کردووە بۆ شام لە پێشا.

شام: ئێوارە یا شەو.

نەهار: ڕۆژ، دژی (شەو = شام) ئەمەش جوانیی وێژەیی تیایە.

سەردار: مەبەستی ئەحمەد پاشایە و ئەو نەماوە و ئیتر (کوردی) دانی بەبوونی (عەبدوڵڵا پاشای بابان) دانەناوە کە لە جێی ئەو و، ڕووخێنەری فەرمانڕەوایی بابان بووە.

ئەم شارە: مەبەست لە شاری (سولەیمانی) بووە کە پایتەختی ئەوسای بابان بووە.

ئەم تاکە هەڵبەستە تەنیا لە (عن، گل/١، ن)دا هەیە و چوارەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لە (ر)دا دووەمین تاکە.

شاهە (گل/١): شاکە.

شاهە (ن): شاهم – بەڵام ئەمە قورسە بۆ کێشی هەڵبەستەکە و ئەم تاکە بەتەواوی سەرچاوە چاپییەکان بەناڕاست دەردەکات.

لەم تاکەدا ئاشکرای کردووە کە لە سولەیمانی و بۆ شارێکی بەرەو شامات (وڵاتی شام) وە کۆچکەری بەمات داناوە.

٥– ڕیحلەت: کۆچکردن.

سەعات: مەبەست لە (کات، دەم)ە کە جاران بڕوایان وا بووە بۆ هەر شتێ سەعاتی (نەحس) واتە خراپ و تووش وە سەعاتی (سەعد) واتە کامەرانی هەبووە بەپێی نەریتی ئەستێرەشوناسی.

ڕیجعەت: گەڕانەوە بەوەرگرتنەوەی پاشایەتیی (ڕژێمی بابان)ەوە.

لوطف: چاودێری، دڵسۆزی، بەزەیی.

خێر: چاکە، خۆشی، کامەرانی.

ئەم کارە: مەبەستی لە کۆچکردنەکەیە بۆ پەنابردن بەسەرۆکە بێگانەکانی وەک (سوڵتانی عوسمانی) و (شای عەجەم) بۆ گێڕانەوەی فەرمانڕەواییەکەی.

بیستوومە کە ئەحمەد پاشا لە هەمان کاتدا نامەی بۆ شای عەجەم نووسیوە بۆ ئەو کارە.

ئەم تاکەش هەر لە (عن، گل/١، گل/٥، گل/٦، گل/٨، ن)دا هەیە و پێنجەمینە و هێشتا

چاپیش نەکراوە و لە هەمووواندا چوونیەکە و لە (ر)دا سێیەمینە.

جیناس ئارایی لە (ڕیحلەت) و (ڕیجعەت) و (خێری) و (گێڕی)دا هەیە.

٦- صەبر: پشوو، ئارام، خۆڕاگرتن، دان بەخۆداگرتن.

قەرار: ئارام، کەوتنەوە سەرخۆ.

طاقەت: خۆڕاگرتن، توانایی.

ئولفەت: دڵ بەیەک کرانەوە و هێیی بوونەوە بەیەکتر، ڕاهاتن، کەوی بوون.

یار: ئەحمەد پاشا.

دۆستان: ئەوانی سەر بەون و لەگەڵ (عەبدوڵڵا پاشا)دا نین، نەبوون.

بێ سەر: سەردار و، مەبەستی ئەحمەد پاشایە و دڵیش بەدوای ئەوا ئاوارەیە.

ئەم تاکەش لە (عن، گل/٦، گل/٨، ن)دایە و شەشەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپ نەکراوە و لە هەمووواندا چوونیەکە و لە (ر)دا سێیەمینە.

گرانییەک لە دەربڕینی (دڵ ئاوارە)دا هەیە ئەگەر بە(دڵاوارە) نەوترێ، جۆرە قورسی و نیمچە لەنگییەکی تیایە بۆ کێشی هەڵبەستەکە.

٧- ئەم تاکە تەنیا هەر لە (عن، گل/٤، گل/٨، ن)دایە و لەوانی تدرا نییە و لە (ر)دا چوارەمینە و، هێشتا چاپیش نەکراوە.

واتای ئەم تاکە نزای خراپە لە (عەبدوڵڵا پاشای بابان) و بەخراپی ناوبردنییەتی کە ڕووڕەشی ڕۆژی دوایی (قیامەت) و خواستی ڕیسوابوونی ئەوی لە خوا کردووە کە (بابان)ی ڕووخاندووە.

٨- ئەم تاکە هەڵبەستەش دیسان هەر لە (عن، گل/٤، گل/٨، ن)دایە و لە (ر)دا پێنجەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپ نەکراوە. ئەم تاکە سەر پڕکردنی تاکی پێشووە، ئامۆژگاریکردنی (ئەحمەد پاشای بابان)ە کە چووە بۆ (ئەستەمووڵ) بۆ لای (سوڵتانی عوسمانی) بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کردنی و گێڕاندنەوەی پاشایەتییەکەی لەسەر خاکی بابان، بەڵام کوردی ڕای خۆی وەها دەربڕیوە ئەگەر ئاواتی چاکە لە (شەیتان) بکات، بەڵام هەرچی هیوای چاکەیە بە(تورک)ی نەبووە، چونکە ئەو پاشایەتییەکەی تێک داوە و ئیتر چۆن دەیداتەوە بەئەحمەد پاشا و لەگەڵ ئەوەشدا (کوردی) وا دیارە تکای نەچوونی لە (پاشا) کردووە.

دوایی لە ناچاری وتوویە (هەر چۆنێ بێ ئەوا ئێوە ڕۆیشتن) بۆ لای (سوڵتان) و، یا مەبەستی لەوە بووە کە ئەوا وەک (پاشایەتییەکەی بابان) نەما، ئەوا (تۆش چوویت) و ئیتر ناگەڕێیتەوە و بەڵام (کوردی) بڵێ چی؟ کە (وا) بڕیاری چوون بۆ لای خەلیفە دراوە و (ڕا)یش هەر (ڕا)ی ئەحمەد پاشایە کە نازناوی (موختار) بووە وەک (نالی) بە(ئەحمەد موختار)ی ناوبردووە (موختار) مەبەست لە هەڵبژاردنی ڕایەکەی پاشایە.

٩- بەیداخ: ئاڵا - جاران بۆ هەر بۆنەیەک جۆرە ئاڵایەک هەڵکراوە و بەو هەڵکردنەی بۆنەکەی پێ زانراوە، ئەمە جگە لەوەی هەر فەرمانڕەواییەی ئاڵای تایبەتی خۆی هەبووە و تەنانەت

سەرخێڵ و شێخەکانیش بوویانە و دیارە بۆ ئەو بۆنەی ڕۆیشتنەی ئەحمەد پاشا (ئاڵای شادی)ی لە بەرچاوی دۆست و دوشمن هەڵکردووە و کە نەزانن ئەحمەد پاشا غەمبارە و بەشادی بزانن.

دەئاخێوێ: لێ دەخوڕێ، دەی ئاژوێت (ئاوژاوتن = لێخوڕین) = ئاخاوتن کە واتای (وتن)یشە.

تیپ: لێرەدا بەشێکە لە سوپا.

سوپاسالار یا سپاسالار: سەرکردەی لەشکر (سوپا) بووە.

پێش بەند: سەرۆکی دەستەیەک بووە و کار و پیشەیان گورجکردنەوە و ئاگاداریکردنی لارە سەنگی و شلوشۆڵی یارەکان بووە.

دۆندار: جاران تەپڵخانە (بەڕێوەبەرایەتیی مۆسیقا) لە ژێر دەستی (عەلەمدار)دا بوو و، لە خوار ئەوەوە (دۆندار) یا چاوەش و ئەمجا باڵباز بووە کە هەموو مۆسیقاژەن بوون.

ئەم تاکە لە (ر)دا پێنجەمینە و لە (ع، کو، یح، نم/١، کم، گ/٢، ف، س، گ/٣)دا چوارەمینە و لە (جلی)دا پێنجەمینە و لە (گل/١، گل/٥)دا شەشەمینە و لە (عن، ن، گل/٦، گل/٨)دا نۆیەمین، تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و ئەم تاکە لە (ش)دا نییە.

بەیداخی (یح): بیداخ – ڕێنووسی کۆنە.

بەیداخی (ع، جلی): بیداغ – ڕێنووسی کۆنە.

شادی (ر): شادی وا.

شادی (کو): شائی – ئەشێ ئەمە (شایی = شاهی) بێ و دەگونجێ.

ئەسپی (ر، جلی): اسپ – ڕێنووسی کۆنە.

ئەسپی (ع): اسپی و – هەڵەیە.

دەئاخێوێ (ر): داخوی – هەڵەی نووسینە لە تێنەگەیشتنەوە.

دەئاخێوێ (یح، ع): داخیوی.

دەئاخێوی (جلی): دآخیوی – ڕێنووسی کۆنە.

لە پشت (نم/١): لەسر.

لە پشت (کم، گ/٢، س، گ/٣): لەسەر.

لە پشت (ر): لە پیش.

تیپی (یح): طیپ – ڕێنووسی کۆنە.

تیپی (ع): طیبی – ڕێنووسی کۆنە.

تیپی (کو): طیپی – ڕێنووسی کۆنە.

تیپی (ر): طیپیش – هەڵەیە.

پێش (جلی): توش.

سوپاسالارەوە (ف): سپەسالار غم و دەگونجێ (سپاسالاری غەم) بێ.

سوپاسالارەوە (کو): سپاوسالار غم.

سوپاسالارەوە (ع، جلی): سپاسالار غم.

سوپاسالارەوە (یح): سپاەسالار غم.

سوپاسالارەوە (کم): سپاسالار و هەم.

سوپاسالارەوە (نم/١، گ/٢، س، گ/٣): سوپاسالار و هەم.

پێش بەند و (نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): پێشەنگ و.

پێش بەند و (کو): پشبند و.

پیش بەند و (ر): وا پشت.

پێش بەند و (جلی): پیشین.

١٠- سوارە: سوپایانی ئەحمەد پاشا - کە هەموو سواربوون بۆ ڕێگەی ئەستەمووڵ.

بەتیلایی: بەلاچاو، لە ژێرەوە.

پارە: لەت، کوت کوت.

ئەم تاکــە لە (گل/٥)دا دەیەمین و لە (عن، ن، گل/١، گل/٦، گل/٨)یشــدا هەر دەیەمــینە و لەوانی تردا نییە و هێشتا چاپیش نەکراوە و لە هەمووان‌دا چوونیەکە.

١١- مەظننە: باقڵ، وا دیارە، پێ دەچێ.

میحنەت: ناخۆشی و چورتم، خەمباری.

عوشرەت: خۆش ڕابواردن، شادی.

پۆشا: پۆشی، لەبەری کرد، کردیە بەر (بۆ بەرگ).

ڕۆژی ڕووناک بەشەوی تار بوون لەبەر هەوری ئاسمان جارێکی تر ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە کارەساتەکە لە پایزدا بووە وەک لە شوێنی تردا ئەمەم جێگیر کردووە، کە ڕووخاندنی بابان لە/٤ی تشرینی دووەمی/١٨٥١ز.دا بووە کە قەبزەی پایز و هەور و هەڵا بووە.

ئەم تاکە لە (جلی، ش)دا شــەشــەمــینە و لە (ع، کو، ف، یح، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (گل/٥)دا دەیەمینە و لە (عن، ن، گل/١، گل/٦، گل/٨)دا یانزەمین، تاکی ئەم هەڵبەستەیە و ئەم تاکە لە (ش)دا دوا تاکە. وە لە (ر)دا نییە.

مەظننە (نم/١): مزندە.

مەظننە (کم، گ/٢، س، گ/٣): مەزندە.

هەوری (جلی): هور.

میحنەت (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): رحمت (ڕەحمەت).

أسمانی (جلی): آسمان.

عوشرەتی (جل): عشرت.

پۆشا (ف، نم/١، کم): پوشی.

پۆشا (گ/٢، س، گ/٣): پۆشی.

پۆشا (جلی): پوشی.

ڕۆژی ڕووناک (گ/٢، س، گ/٣): ڕووناکی ڕۆژ.
ڕۆژی (یح، ع): ڕۆژ.
ئەمڕۆ (کو): ایمرو.
کەوا ڕۆژی ڕووناک ئەمڕۆ (جلی): کو ام ڕۆژ ڕووناکە.
لە بەرچاوم (س): لە پیش چاوم.
لە بەرچاوم شەوی (جلی): لە پیش چاوم شوی.
١٢- ئەمان: هاوار و هانا بەبەربردنە، دەخیل، لە ڕێی خودا.
سەرچەرخەچی: سەرۆکی پاسەوانانی دەوری لەشکر و کاروانەکە بووە.
جڵەو هەڵکێشە: وڵاخەکە ڕاگرە، ڕاوەستە و ویستوویەتی هەڵوێستەک بکەن تاکو کەمێک بۆ دوا جار سەیریان بکات.
ڕەحم: بەزەیی، دڵسۆزی، چاوێری.
جارێکە و هەر ئەمجارە: ئیدیۆمێکی کوردی (کینایە)یە وا دیارە (کوردی) هیوای بەهاتنەوەیان بووە، یار بەنەمانی خۆی دوای ئەوان و لە کاتی بارکردنەکەدا لەگەڵیان بووە.
ئەم تاکە لە (ع، کو، یح، ر، ش)دا نییە و لە (ف، کم، نم، جلی، گ/٢، س، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (گل/٥)دا یانزەیەمینە و لە (عن، ن، گل/١، گل/٦، گل/٨)دا دوانزەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
سەرچەرخەچی (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): ساچەرخەچی - ئەمەش نابێ، چونکە چەرخەچی زۆر بوون و سەرچەرخەچی (یەکێک) بووە.
١٣- یەقین: بەڕاستی، بەدڵنیاییەوە.
چەرخ: ڕۆژگار، گەردوون.
ئەم تاکە لە (ع، کو، ف، یح، ر، ش، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نییە و لە (گل/٥)دا دوانزەمینە و لە (عن، ن، گل/١، گل/٦، گل/٨)دا سیانزەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و هێشتا چاپیش نەکراوە.
تێر پڕ بەدڵ (ن): ایتر بەدل.
بەبێ ئێوە منیش دەمرم (ن): منیش دمرم بەبی ایوە.
بێ یارە (گل/٨): بیعارە.
١٤- حەق: مەبەستی لە خوایە... وە یا پاکی و ڕاستیی خۆتان بتانپارێزێ.
ئەمما: بەڵام.
ئەم تاکە لە (ن، گل/١، ش)دا نییە و لە (ر)دا شەشەمینە و لە (ع، کو، یح)دا هەشتەمینە و لە (نم/١، ف، جلی، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا نۆیەمینە و لە (گل/٥)دا سیانزەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٨)دا چواردەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
ئەوا (ع، یح): اوە.

دەڕۆن (یح): دچن.
دەڕۆن (ع): درّون – ڕێنووسی کۆنە.
حەق بێ (ع): حق بیت – ئەمیش لە کێشدا قورسە و لەنگی دەکات.
حەق بێ بە (گ/٢، س، گ): یەزدانە – ئەمە لە گۆڕین و بەکوردی کردنەکانی (گیو)ە.
پارێزگارتان ئەمما (ر): پاریزگارتان.
ئەمما (گ/٢): ئەما.
بەکێی (یح، ر): بکی – ڕێنووسی کۆنە.
بەکێی (کو): بەکی – ڕێنووسی کۆنە.
بەکێی (ع): بکن.
دەسپێرن (نم/١، ف): دسپیرن – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
ئێوە توو خوداتان (ر): ایوە و بێ خواتان.
ئێوە توو خوداتان (جلی): ایوە و دینی خۆتان.
ئێوە توو خوداتان (نم): تو خواتان.
ئێوە توو خوداتان (کم، گ/٢، س): ایوە تو خواتان.
ئێوە توو خوداتان (گ/٣): ئێوە تو خواتان.
ئێوە توو خوداتان (کو، ع): ایوە و بی خداتان.
ئێوە توو خوداتان (یح): ایوە بن خداتان.
ئێوە توو خوداتان (ف): یوە بنُ خداتان – کە ئەمەیان دەگونجێ.
ئەم بریندار و (ع): ام برندارە. – مەبەستی برینی ڕۆیشتنەکەیانە.
ئەم بریندارە (گ/٢، س): بریندارم.
١٥– ئەم تاکە و تاکی پێشوو بەتەواوی ئاشکرای دەکەن کە (کوردی) لە ڕۆیشتنی کەسانێک دەدوێ کە ئەحمەد پاشا و دەستەکەیەتی نەک لە هاتنی یەکێک دوابێ کە گوایە ئەو (قادر)ەیە کە لە سەرچاوە چاپییەکاندا نووسراوە.
ناڵین: هاوار، ناڵە، نرکەنرکی نەخۆشی و نکەنکی بەدەنگ بەرزییەوە.
باڵین: سەرین، بالیفک – مەبەستی ئەوەیە لە سەرەمەرگدا لە ژوورسەری بن.
دەفن: شاردنەوەی مردوو لە گۆڕدا، هەرچەندە کوردی بە(دفن) دەری دەبڕێ.
موردە: مردوو، کە گوایە هەر لەوساوە خۆی بەمردوو داناوە (وەک مردوو).
بێچارە: بێ دەسەڵات، دەستەپاچە، دەردەداری بێ دەرمان و پەککەوتە.
ئەم تاکە لە (ر)دا شەشەمینە و لە (ع، کو، یح)دا نۆیەمینە و لە (ف، جلی، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا دەیەمینە و لە (ن، گل/١، گل/٥)دا چواردەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٨)دا پانزەمینە و تەنیا لە (ش)دا نییە و لە (جلی)دا نۆیەمینە و کراوە بەژێرینەی کاغەزەوە و ناخوێندرێتەوە.

توو خودا (ع، یح، کو، کم): تو خدا – ڕێنووسی کۆنە.
توو خودا (نم/١، ف): تو خوا.
توو خودا (ر): او بو خدا.
توو خودا (گ/٢، س، گ/٣): بۆ خودا.
ناڵین و باڵینی (ر، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): باڵین و ناڵینی.
هەڵی گریێ (ع، یح): هلگری.
دەفنی (ع، ر): دفن – جگە لە (گ/٢، س، گ/٣) ئیتر هەموو سەرچاوەکانی تری ئەم تاکە بە(دفنی) نووسیویانە.
موردە (ع، یح، کو): مردوە.
موردە (ف): مردی (مەردی)یەکە ڕاستە بە(ئەم مەردە)ش دەخوێنرێتەوە.
موردە (کم): مردە.
موردە (ر): میت و سەرچاوەکانی تر: (مُردة) نووسراون.
١٦- عیلاج: چارە، چارەسەر، چار.
وەڵڵا (والله): بەخوا.
ئەو: مەبەستی لە خۆی (کوردی)یە کە ئەم خۆ بەچەند کەس زانینەی لە کاتی جیا جیادا زۆر جار و بگرە لە زۆر لە هەڵبەستەکانیدا دەری بڕیوە وەک لە شوێنی تریشدا لەمە دواوم و ئەمەش لە نێوان هۆنەراندا باو بووە.
ڕۆح: گیان، جان، ڕەوان، جگە لەمە، واتای (ڕۆحی خۆش): گیانی خۆشگوزەرانی دەدا.
خۆشی: خۆیشی واتە (کوردی) هەروەها واتەی (خۆشی = شادی)ش دەدات کە بەبێ ئێوە ئەگەر خۆشیش ببێ نایەوێ و لێی بێزارە. ئەمەش جوانییەکی وێژەییە.
ئەم تاکە لە (ش)دا نییە و لە (ر)دا هەشتەمینە و لە (ع، کو، یح)دا دەیەمینە و لە (ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا یانزەمینە و لە (ن، گل/١، گل/٥)دا پانزەمینە و لە (عن، گل/٦، گل/٨)دا شانزەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە (جلی)دا یانزەمینە و کراوە بەژێرپێنە و دەوردراوە ناخوێندرێتەوە، لەبەر (پینە)کراوی.
ئەگەر (یح، ع): اکر – ڕێنووسی کۆنە.
لەگەڵ (یح، ع، ر): لکل – ڕێنووسی کۆنە.
بەکوشتن (کو، یح، ر): بکشتن و ئەوانی تر (بکشتن)یان نووسیوە.
بەکوشتن (گ/٢، س، گ/٣): بەکوژتن – ئەمەش لە گۆڕینەکانی (گیو)ە.
بەکوشتن (ع): مردن – کوردی ئەوەندی (شا) خۆش ویستووە، داوای کوشتنی خۆی لێ کردوون.
سا عیلاجی کەن (ر): سا علاج کن – ئەمە ڕێنووسی کۆنە.
سا عیلاجی کەن (ع): سا علاجی کن – ڕێنووسی کۆنە.

که وەڵڵا (گ/٢، س، گ/٣): که بەخوا – ئەمیش مامۆستا (گیو) گۆڕیویە.
که وەڵڵا (ر): کواتە.
که وەڵڵا (گل/٥): نوالله.
له ڕۆحی (ر): لروح – ڕێنووسی کۆنە.
له ڕۆحی (گ/٢، س، گ/٣): له گیانی – ئەمیش گۆڕینی مامۆستا گیوە.
١٧– بەوەڵڵا (بەوالله): بەخوا.
حاجەت: پێویست.
قەتڵ: کوشتن، کوژتن.
هیجران: جیابوونەوە، دووری، (بێ ئێوەیی)ی مەبەستە، جیایی.
مەرگ: مردن، گیان دەرچوون.
فایدە (فائیدە): سوود، کەڵک.
ئەویش: مەبەستی له خۆیەتی کە لێرەشدا (کوردی) ئەو (قسەکەر)ە مەبەستی خودی (کوردی)یە، وەک چەند کەسێ بێ وایە.
بێعار: لەخۆنەگر، چەقاوەسوو.
ئەم تاکە له سەرچاوەکانیدا جگە له (ش) له هەمووانیدا دوا تاکە و له (ش)دا نییە و له (ر)دا نۆیەمینە و له (ع، کو، یح)دا یانزەمینە و له (ف، نم، کم، گ/٢، جلی، گ/٣)دا دوانزەمینە و له (ن، گل/١، گل/٥)دا شانزەمینە و له (عن، گل/٦، گل/٨)دا حەڤدەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە، وە له (س)دا نیو باڵی دووەمی نییە، کە دیارە بەر وێنەگری (ئۆفسێت)ەکە نەکەوتووە و له (جلی)دا نیوەی یەکەمی کراوەتە ژێرپێنەوە.
بەوەڵڵا (گل/١، یح، ع، ف): تو الله.
بەوەڵڵا (ر): نو الله – ڕێنووسی کۆنە.
بەوەڵڵا (گ/٢، س، گ/٣): بەیەزدان – ئاشکرایە کە گۆڕینی (گیو)ە.
قەتڵی (کو): ڕوحی – ئەمەش جوانە و دەگونجێ.
قەتڵی (ر): قتل – ڕێنووسی کۆنە.
قەتڵی (گ/٢، س، گ/٣): کوژتنی – ئەمیش گۆڕینی (گیو)ە کە کردوویە بەکوردی.
نییە هیجرانتان (کو): هجرانتان.
مەرگە (ح، کو، یح): هوکر؟؟.
هەر (ر): توش.
گیان (ع، یح): کیان – ڕێنووسی کۆنە.
سەخت و (ع، یح، ر): سخت – ڕێنووسی کۆنە.
بێعارە (ن): بیمارە – له کۆتاییدا خۆم بەبەختیار دەزانم کە ئەمە یەکەم جارە ئەم هەڵبەستەم بەڕاستی تۆژیوەتەوە و، کارێکی نوێم ئاوێتەی ئەم پەڕاوییە کردووە.

٦٨

## لـه دووری

١- له دووریی (توتیـا)ی خـاکی قـەدەمگات؛ دیده بێ نووره
لـه تینوویێتـیی لـەبی لەعلت دڵی دێوانه مـەخـمـووره
٢- شـەهەنشـاهی خـەیاڵت، مـەجلیسی بەزمی له تـەن دانا
دڵم ڕەقـقـاصـه، سینەم چەنگه، ناڵـەم ساز و سـەمتـووره
٣- خـەیاڵت پێی نەزانی عـاشـقی تۆم تاکـوو دوور کـەوتم
بەڵێ ئێستـا له سایەی هیجرتا ئەو عـەشـقه مەشـهووره
٤- گوتم: ئینصاف بکه، تاکەی ئەسیـری چاهی دووریت بم؟
وتی: هەی قورِ بەسەر؛ عاشق هەمیشه زار و مەحجووره
٥- له مـوڵکی دڵ، ئەگـەرچی باری کرد شـادی، بڵێ: ئەمما
له سای خەیلی غەما ئێستـا، له جاران زێده مەعمووره
٦- دەڵێ واعیظ: وەره، لەم دولبەره دەست هەڵگره، پێم گوت:
نەفـامی خـەر، ئەتو نازانی (بێ عـەهدی له دین دووره)؟؟
٧- له (تازی) و (تورک) و (فارس) وێنەیی یارت نییه (کوردی)
له چاوی بەد خـودا حـیـفظی بکا بیلا دەڵێی حـووره

---

١- دووری: دژی نزیکیـیـه و ئەم وشـەیه بەڕێنووسی کـۆن بە(دەوری)یش دەخـوێندرێتـەوه و هەردووکی دەگونجێن.
توتیا: قورقوشم (زینک) و له کۆنەوه و تا ئێستەش دەرمانی چاویەشەی لێ دروست دەکرێ، له هەندێ کیـمـیـای کـۆندا گـوایه زێڕی لێ دروست کـراوه کـه (کـوردی) گـەردی بەر پێی خۆشەویستەکەی بەم (توتیا)یه داناوه که بینایی له عاستیا بێ ڕووناکی بووه.
قەدەم: پێ، قاچ - (قەدەمگا): شوێن پێ، خاکی بەرپێ.
دیده: بینایی، چاو، چەم، چاڤ، دیه.
نوور: ڕووناکی، بینایی، تیشک، هێزی بینینی مەبەسته.
تینوویێتی: ئارەزووکـردنی خـواردنەوەیەک - سـەرخـۆشـیش بەخـواردنەوەی (باده) تینوویێتی

دەشکێنی و پەیا دەبێ، بەڵام (مەخمووری)یەکەی (کوردی) هەر بەبیر لێکردنەوەی لێوە وەک لەعلەکەی کە وەک ڕەنگی (شەراب – بادە)یە، یا بەبینینی سەرخۆش (مەخموور) بووە. کە ئەمە ئەوپەڕی تێ ڕۆچوون و دەربڕینی ورد و قووڵ و خەیاڵییە. کە ئەم موبالەغەیە لە وێژەی کۆندا زۆر پەسەند و جوان و باو بووە.

لەب: لێو، لچ، لێڤ. هەرچەند (لەپ) واتای (بەری دەست)دا، کە لێرەدا مەبەست نییە.

لەعل: بەردێکی بەنرخ (گەوهەر)ێکی شووشەییی ڕەنگ ئاڵی جوانە، وەک ڕەنگی لێوی یارەکەی و (بادە) وایە.

دێوانە: شەیدا.

مەخموور: مەست، سەرخۆش، گرتوو.

سەرچاوەی ئەم پارچە هەڵبەستە چوار دەسنووسی کۆنە کە (عن، ن، گل/١، جلی، ص) و دوو چاپکراوەکە (گ/٣) و (گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە/٣ی ساڵی یەکەم مانگی ئابی ١٩٧١)ە کە یەکێتیی نووسەرانی کورد لە بەغدا دەریان کردووە و (مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار) لە لاپەڕە (١١ – ١٦)ەیدا وتارێکی لە ژێر ناوی (دەسنووسێکی غەزەلی کورد)دا تیا بڵاوکردووەتەوە و لەسەر چەند هەڵبەستێکی (کوردی) دواوە کە ئەم هەڵبەستەی سەرەوە یەکێکیانە و ئەویش لە گەنجینەی بنەماڵەی (جەلی)ی کۆیەوە، بەهۆی خوشکی ئەدەبپەروەر (نەجیبە خانی جەلی زادە)وە کۆمەڵە دەسنووسێکی پێ گەیشتووە، لەوانە کەشکۆڵێکە هی دوا دوای چەرخی نۆزدەمەو ئەم هەڵبەستەی لێ وەرگرتووە کە بەنیشانەی (نووسەر) لێرەدا ناوی هاتووە و، لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە، هەرچەند ئەو (کەشکۆڵە)ش لەم پەڕاوییەدا بەنیشانەی (جلی)یە.

جیاوازیی سەرچاوەکانیش بەم جۆرەیە:

سەرەتای نیو باڵی یەکەمی ئەم تاکەی سەرەوە کە: (لە دووریی تۆتیای خاکی قەدەمگات)ە لە نووسەردا لە جێگەی ئەمە (نوختە...)ی داناوە، چونکە لە کەشکۆڵە سەرچاوەکەیدا دڕاوە و چاک ناخوێندرێتەوە.

لە دووری (ص): بەدەوری.

قەدەمگات (ص، جلی): قەدەمتا – وا دیارە لە کەشکۆڵەکەی سەرچاوەی (جلی و نووسەر)یشدا کە نووسراوە (... متا دیدە بێ نوورە) دەبێ ئەویش (قەدەمتا) بووبێ بەم پێیە سەرەتای ئەم تاکەش لە کەشکۆڵەکەی (نووسەر)دا ئەشێ (بەدەوری) بووبێ، چونکە: هەردوو وشەی: (بەدووری) و (قەدەمتا) لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن، وەک لە لێکدانەوەی (دەوری)دا لە سەرەوە لێکم دایەوە.

لە تینوێتیی لەبی (گ/٣، نووسەر): لە هیجری مەی لەبی.

دلی دێوانە (گ/٣): دڵ و... – کە ئەویش لەو کەشکۆڵەدا لێی وەرگرتووە، بەڵام بۆی ساغ

کراوەتەوە، ئەوا خۆشبەختانە من بۆ یەکەم جار بە ساغکراوەیی ئەم هەڵبەستە پێشکەش دەکەم .

٢- شەهەنشاه: شای شاهان کە ئەوساش ئەم ناوە هەبووە و مەبەستی (خەیاڵ)ەکەی خۆی بووە.

خەیاڵ: بیر - ئەو خەیاڵەی لە کۆڕێکی دڵداری لە (تەن = لەشی) کوردی لە نیو باڵی دووەمدا دروست کردووە.

مەجلیس: کۆڕی دانیشتن، بەزم و ئاهەنگ.

بەزم: کۆڕی ڕابواردنی گۆرانی و مۆسیقا و سووڕ و سەمای مەبەستە.

تەن: لەش، جەستە، قالب - (کوردی) مەبەستی لەشی خۆیەتی، وەک نیو باڵی دووەم.

ڕەققاص: سووڕ و سەماکار.

سینە: سنگ.

چەنگ: ئامێرێکی مۆسیقییە و لێی دواوم.

ساز و سەمتوور: ئامێری مۆسیقین و لێیان دواوم.

شەهەنشاهی خەیاڵت (جلی، نووسەر):... لت - کە لەبەر دڕاوی نەخوێندراوەتەوە.

لە تەن دانا (نووسەر): بتان دانا .

لە تەن دانا (جلی): لشان دانا .

سەمتوورە (جلی): سمطورە.

٣- هیجر: دووری، جیایی.

عەشق: دڵداری، ئەڤین.

مەشهوور: بەناوبانگ.

شەهەنشاهی خەیاڵت پێی نەزانی (نووسەر):... دەزانی - لەبەر دڕاوی بۆی نەخوێندراوەتەوە.

نەزانی (گ/٣، نووسەر): دەزانی.

بەڵێ (نووسەر): بلێ.

هیجرتا ئەو عەشقە (گ/٣): هیجر زۆر زۆر زۆر فاش و - ئەمیش لەنگە.

هیجرتا ئەو عەشقە (نووسەر): هیجری زۆر زۆر فاش و.

٤- ئینصاف: ڕاست و بێ لایەنگری.

ئەسیر: دیل.

چاه: چاڵ و مەبەست لە چاڵ خستنەکەی حەزرەتی یووسفە و نیشانەیە بۆ ئەو.

قوڕ بەسەری: لە کاتی کۆست کەوتەییدا قوڕ لەسەر دەگیرێ و لە توانج تێگرتنا ئەم وشەی (قوڕ بەسەر)ە بەکار دێ.

زار: پەرێشان، لە زاریدا بوو، گرین.

مەحجوور: دەسبەسەر، بەند، زیندانی، کەمەندکراو.

گوتم، وتی (جلی): کتم، کتی.

هەی (گ/٣، ن): ئەی، ئەرێ، هۆ.

هەمیشە (گ/٣، ن): بدائم (بەدائیم).

مەحجوورە (گ/٣، ص، نووسەر): مەهجوورە – ئەمەش زۆر پڕ بەپڕ نییە.

مەحجوورە (جلی): و کوژاوەتەوە و بەخەتێکی تر نووسراوە (مهجورە).

٥– موڵک: خاک، قەڵەمڕەو، نیشتمان.

ئەمما: بەڵام، بەڵان.

خەیل: زۆری، خێڵ، دەستە.

خەیل (جلی): خیل.

زێدە: زیاتر، زۆرتر، پتر.

مەعموور: ئاوەدان.

بڵێ (گ/٣): بەڵان.

بڵێ (ن): بلا.

لە سای خەیلی غەما (گ/٣، نووسەر): لە سایەی خەیلی غەم.

لە سای خەیلی غەما (ص): لگل خیل غما.

ئێستا (ن): هرماوە (هەرماو).

٦– واعیظ: ئامۆژگاریکار.

وەرە: ئەم وشەیە مەبەست لە بانگکردن نییە، بۆ لای (واعیظ) بەشکو بەواتە (وا بکە...)یە.

نەفام: تێنەگەیشتوو، نادان، کەودەن.

خەر: کەر و ئەم وشەیە بۆ ناژیریی کەسێک بەکار دەبرێ گوایە (کەر) زۆر ناژیرە، کەچی لەم دواییەدا لە دەستەی مەشق بەئاژەڵ و گیاندارە کیوییەکان (سێرک)دا ئاشکرا بووە کە (کەر) لە زۆر گیانداری تر زیرەکتر و زوو فێری جۆرەها مەشق دەبێ بەوردی من لە تەماشاگای (سێرکی قاهیرە)دا لە (میسر) کەرێکم دی، کە مەکینەی دروونی بەکار دەهێنا و زۆر چاک دروومانی پێ دەکرد و تەنانەت دەزووی بەدەزییەکەوە دەکرد.

عەهد: پەیمان.

دین: ئاین.

دەڵێ واعیظ (ص): گوتی واعیظ.

وەرە لەم دولبەرە دەست هەڵگرە پێم گوت (نووسەر): بەسە، دەست هەڵگرە! پێم گوت: لە خۆت هەڵدە و لە (جلی)دا (پێم کت لخوت هلدە).

دولبەرە (گ/٣): دڵبەرە.

پێم گوت (گ/٣): پێم کوت.

نەفامی خەر (جلی): نفامی وە بەخەتێکی تر لەسەر پەڕەدا نووسراوە (نفامی کر).

خەر (نووسەر): خۆ.

ئەتو (جلی): خواتو.

بێ عەهدی (گ/٣): بەدعەهدی.

٧- تازی: عەرەب.

حیفظ: پارێزگاری.

بیللا: بەخوا، سوێندم بەخوا، بخودێ.

حوور: ئافرەتانی ناو بەهەشت (پەری) - ئەمەش ئاراستەی ئەو سەرچاوە چاپییانەی (گیو) دەکەم کە دەڵێن (کوردی) دەبووایە بیوتایە (ئەڵێی غیلمانە).

تازی (گ/٣، نووسەر، جلی): ڕۆم - ئەمەش نابێ کە تورک و ڕۆم یەکێکن.

٦٩

## تا ڕەقیب حاضرە

١- تا ڕەقیب حاضرە، بۆ من: حەذەرە نەک حەضەرە،
ئەو سەگە تا لە کەمین بێ، حەضەرم هەر سەفەرە
٢- دەردی یار؛ لایێ، ڕەقیب لایێ، لە پەیکاری سەرن،
مەشقی مەجنوونە، کە جێم بێ دەریی و دەشتودەرە
٣- کە دەمی؛ سایەی طووبا، بە(عەفا) مەئواکەم
بێتە دڵ یادی (بەدیی ئەو سەگە)، جێم پێ سەقەرە
٤- ئاخ لە پاش ئەم هەموو هیجرانە بەکوێرایی ڕەقیب
دەمدی دەستم لە قەدی چەسپە بەمیثلی کەمەرە
٥- چین بەچین کەوتنە سەریەک لە دڵا، عوقدەیی خەم
مەر، بەماچی دەمی لاچێ لە دڵا ئەم کەسەرە
٦- بەقسەی خۆش، نییەتی وایە؛ قسەم پێ دەرخا
(صەد و سی) تووتکی وام، پێ کە بە(بەرد)ێکە، کەرە
٧- خۆشە، بۆ تیری موژەی؛ دڵ بەهەدەفکەی، (کوردی)
کەچی بۆ چارە ڕەشی، شیری ڕەقیبم لەسەرە

................................................................

١- ڕەقیب: ناحەز، بەدکار، دژ، دوشمن.
حاضر: ئامادە و مەبەستی لە: (لێرە)یە.
حەذەر (حەزەر): پارێز، خۆ دوورگرتن، خۆپاراستن.
حەضەر: نیشتەجێیی، ئاوەدانی نیشتن، دژی سەفەرکردنە.
کەمین: بووسە.
سەفەر: کۆچکردن، گەڕۆکی، گەڕیدەیی.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە (عن، ص، ص: نسخە، ر)یە کە لە هەموویاندا بەناوی (کوردی)یەوەیە، تەنیا لە (ر)دا نەنووسراوە هی کێیە لە نێوان ئەم سەرچاوانەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی و، هێشتە چاپیش نەکراوە. ئەم تاکەی سەرەوە لە هەموو سەرچاوەکاندا

چوونیەکە و جیناس ئاراییی تیایە.

٢- دەردی: مەبەستی نەخۆشی و خەمی و مەترسییە.

لە پەیکاری سەرن: بەدوای سەرا دەگەڕێن لە ناوی بەرن.

مەجنوون: مەبەستی مەجنوونی لەیلایە، وە یا (شێت)، (شەیدا)، (سەوداسەر).

بێ دەری: بێ دەرگەوبانی و جیناسی لەگەڵ (دەر)ی (دەشتودەر)ەکەدا هەیە و جوانییە.

وردەکاری لەم تاکەدا هەیە بەیەکخستنی ئەم هەموو پیتی (د) و (ر)یە لە تاکێکا هەروەها (دەریی): دەرگانەکەی ئەو یارەش دەگرێتەوە.

ئەم تاکە لە (ر)دا نییە و لەوانی تردا چوونیەکە.

ئەم پارچە هەڵبەستەی لە هاوچەشنی هەڵبەستێکی ئاوا وتووە کە سەرەتاکەی دەڵێ:

«وەصفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە،

ئیبتیدای مەدحی دەمی وەک خەبەری بێ ئەثەرە».

٣- دەمی: کاتێ و، لە ڕێنووسی کۆندا بەشێوەی (دەمێ)ش دەخوێندرێتەوە، بۆیە لە سەرەوە نیشانەی (٧)م لەسەر (یێ) کە (نەکرد) کە هەردووکی دەگرێتەوە، ئەمەش وردەکاری و جیناس ئاراییە.

سایە: سێبەر، لە بن.

طووبا: ناوی دارێکی بەناوبانگی ئاینییە، بەواتە: خۆشی، شیرینی، جوانی، چاکە، بەهەشت، بۆن خۆش، کە هەموو ئەمانەش دەگونجێن.

عەفا: بەمەبەست لێ خۆشبوون و چاوپۆشییە و نیشانەیە بۆ ئایەتی (٩٥) لە سوورەتی (مائدە) و لە چەند ئایەتێکی تری قورئان: (عفی الله عما سلف) واتە: خوا لەوی چوو، خۆش بوو.

مەئوا: شوێنەوار.

سەقەر: دۆزەخ، جەهەننەم.

ئەم تاکە لە (ر)دا دووەمین و لەوانی تردا سێیەمینە و لە هەمووواندا چوونیەکە.

٤- هیجران: دووری، جیایی.

قەد: کەمەر، ناوقەدی مەبەستە، بالا.

چەسپ: توند و، مەبەستی تێوەرکردنی دەست و تێئالانە.

میثل: چەشن، جۆر.

کەمەرە: جۆرە پشتێنێکی (زیو) و، (ئاڵتوونی) نەخشاوە بۆ ژن و پیاو.

ئەم تاکە لە (ر)دا سێیەمینە و لەوانی تردا چوارەمینە.

ئەم (ر): او = ئەو.

قەدی (ر): قدت (قەدت) - کە ئەمەش لە ڕووی دەستووری زمانییەوە هەڵەیە.

٥- چین بەچین: توێ بەتوێ، یەک لەسەر یەک.

عوقدە: گرێ.

مەر: مەگەر.
مــاچی: ئەو وشــەیەم بەڕێنووســە کــۆنەکــەی نووسی؛ چونکە بە(مــاچی) و بە(مــاچێ)ش دەخوێندرێتەوە و هەروەک دەگونجێن واتە (بەماچی) = بەئێمەچی، لەگەڵ (ماچ).
دەمی: دیســان ئەم وشــەیەشم هەر بەڕێنووســە کۆنەکەی نووسی؛ چونکە ئەمـیش بەشـێـوەی (دەمی = زاری ئەو) و (دەمێ = کاتێک) دەگونجێ.
لە (ماچێ) و (لاچێ) و (چین بەچین)دا جیناس ئارایی هەیە.
کەسەر: دڵشکستەیی، دڵڕەنجان، داخ، ڕەنجاویی.
ئەم تاکە لە (ر)دا چوارەمینە و لەوانی تردا سێیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.
مەر (ر): بی و بەواتە (وەرە) کە ئەمیش دەگونجێ.
دەمی لاچێ لە دلاّ (ر): دمەکت لادە دسا = دەمەکەت لادە دەسا.
٦- قسە (قصە): گفتوگۆ و قسەی خۆش = زمانی شیرین.
نیەتی (نییەتی): ئارەزووی، نیازی، خواستی.
صەد و سی: لێرەدا هەر تەنیا مەبەستی (ژمارە)کە نییە بەشکو بەحیسابی ئەبجەی (١٠٠ = ق) و (٣٠ = ل) و (ق + ل = قل = قەل) کە ئەمەش نیشانەی ئیدیۆمێکی کوردییە کە دەڵێن (صــەد قــەل و بەردێ) کــە ئەمــەش لە (عن)دا بەفــارسی لێک دراوەتەوە و (کــر = کــەر)یش بەحیسابی ئەبجەدی دەکاتە (٢٢٥) کە لە ژمارە (قەل)ەکە زیاترە و هتد... کە ئەم نەریتە لە وێژەی کۆن و ئەوسادا باو بووە.
تووتک: گوجیلە، بێچووی سەگ، گوجیلک، تووتە، تووتەڵە.
ئەم تاکە لە (ر)دا پێنجەمین و دوا تاکە و لەوانی تردا شەشەمینە.
تووتکی وام پێ کە بەبەردێکە (ر): طولک وام گرتووە حیز بابە کرە.
٧- تیری موژە: مەبەستی لە برژانگ، موژگ، مژیلەیە، کە بە(تیر)ی چواندووە.
هەدەف: نیشانگە، شوێن نیشانە.
ئەم تاکە لە (ر)دا نییە و لەوانی تردا حەوتەمین و دوا تاکە و لە هەمووشیاندا چوونیەکە.
وردەکاری و جیناس ئارایی لەم تاکە هەڵبەستەدا زۆرە و، ئەوەتا (خۆشە و موژە) و (ڕەشی و شیرینی) وە (تیری و شیری) و (تیر و هەدەف) (ڕەشیی چارە و سپێتیی شیر)دا ڕەشیی چارەی و ئەبرۆی وەک شیر مەبەست لە کەوانی برۆ و... هتدی تیا دەبینرێت کە هەموو لە وێژەی کۆندا بەوەستایی و توانایی دادەنرێن. کە بەڕاستی ئەم پارچە هەڵبەستەی (کوردی) لەوپەڕی نازکیدایە، بەبێ دەستووری وێژەی کۆن.
لە لایەکی کەوە ڕەنگە ئەو ڕەقیبە لەگەڵ (کوردی)دا خزمایەتی هەبووبێ، وەک دەڵێن: شیر لە بەینایە، یا برای شیرییە و ئەویش وتوویە ئەگەر شیری ئەو (ڕەقیب)م لەسەر نەبووایە، بۆ چارەڕەش من خـۆم دەکردە قوربانیی تیرە بارانی یارەکەم، بەلاّم ئەوەتا لەبەرئەوەی نمەک بەحەرام نیم، بۆیە ئەو خۆشییە وەرناگرم و بۆ چارەڕەشی دەمێنمەوە.

٧٠

## بۆ گەڕانی ئاشی دڵ

١- بۆ گــەڕانــی ئاشــی دڵ فــرمــێــسکی چاو (ئاق دەنز)ە،
غـــەیری هـیـــجـــران و بەڵا، ئەصـــــلا بەمن نادا مـــزە
٢- هەرکەسـێ عاشق لە دەست هیجران خەلاصکا مەردە ئەو
اَریێ، فــەرهـاد؛ تا حـــەشـــر مـــەمنوونی پووری هـورمـــزە
٣- خـــاڵـی ڕووت، قــوربان، بـەعـــەییـــاری دڵی خـــەڵقی دزی
تۆ (ئـەنێــو باخ) بـۆچی ڕێت دا ئـەو حـــەبەش زادەی دزە؟؟
٤- شـیـری ئەبرۆ و تیـری مـوژگـانت بەقـەتڵـی عـام دەڵێی
نووکی نێـــرەی تاج بـەخش و تیـــغی چنگی جـــەنگزە
٥- هێند بەتاو هات خوێنی مەقـتوولان لە موژگـانی سیـات
ئەسـپـەکـەت جـاران سـپی بوو، ئێستـە ڕەنگی قـرمـزە
٦- هەر ئەوەڵ ڕۆژ بووی بەتیـــرانداز، شـــوکـــور پێکات دڵم
ئەی فـیـــدای دەست و کـەمـانت بم کـوڕەی چاو مـامـزە
٧- هـەرکـــە زانیم چاوەکـــەت بیـــمـــــارە ئارامم نەمـــا
چاوی بیـــمـــــارت کـــەمـــەندی ڕاهی هـەڵدێر و خـــزە
٨- چاوی بیـمـــارتم کــە دیی ڕەحـــمم بەحـــاڵـی زاری هات
ئیکە بـۆ، بەو غـەمـزەیەت هەڵسـاند، لە نێو جـەرگم چزە؟؟
٩- وەزنی ضـەربی پەنجـەت ئەمرۆ؛ صـەرفی ڕووی جانانە کرد
ئەی مـوعـەللیم! بـۆ کـزت کـرد، دەک لە جـەرگت چێ کـزە
١٠- هێندە پەیکی دا لـە قـــەلبی عـــاشـــقـــانت چاوەکـــەت
دوودی ئـاهـی بـێ گـــــوناهـانە کــــــەوا لـێڵ و کـــــزە
١١- صـــەد کـە کـوشـتـەی دیدەنین ئەمما خـەمـۆشی دەردتین
دەسـتی خـۆش بێ (بابە جان) خـستنییـە خـەندە و نیـرە

١٢- بۆ شـیـفـای چاوت بدەین قـوربانی ئێـمـە بابە جـان،
تا لە داخـانا ڕەقـیـبـیش شـەق ببـا غـیـرەت سـزە
١٣- من بەناری سینە جـەرگم بۆی کـەباب کـردووە و دەڵێ:
(کـوردی) زۆر چاکـە کـەبابت آخ، چ فـایدە بۆ کـزە

.................................................................

١- ئاق دەنز: ناوێکی تورکییە کە (ئاق = سپی) و (دەنیز = دەریا) بەواتە (دەریای سپی) و مەبەست لە زۆری و فراوانیی ئاوی (دەریای سپیی ناوەڕاست)ە وەک فرمێسکی ئاشکێڕی چاوی (کوردی)، کە خۆی کردووەتە ئاشەوان.
غەیر: جگە، بەبێ، بێجگە، بلی، بی لە.
هیجران: دووری، جیایی، لێکبڕان.
بەڵا: ناخۆشی، گێچەڵ، چورتم.
ئەصلا: هەر لە بن، لە بنچینەوە.
مزە: کرێی ئاشەوانە کە بەدانەوێڵە نەک بەپارە و، بەڕێژەیەکی تایبەتی لەو دانەی دەیهاڕێ، یا لە دانەوێڵەیەکی تر وەری دەگرێ بەپێی ڕێککەوتن.
سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە لە دەسنووسدا (عن، گل/١، گل/٣، ع، ش، ف، جلی، ما، ما/١، نم/١)ە و لە چاپکراویشا (کم، گ/٢، س، گ/٣) و من (کم)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوەی.
لەسەرە ناوی ئەم هەڵبەستەدا لە (عن)دا بەفارسی نووسراوە: (بمناسبت خستەگی چشم احمد بگ پسر محمود آغای شیوەکل، کردی رحمهم الله این قصیدە در انجا فرمودە – علی).
واتە: (بەبۆنەی چاویەشەی ئەحمەد بەگی کوڕی مەحموود ئاغای شیوەکەڵە وە (کوردی) خوا بیانبەخشێ، ئەم چامەیەی لەوێ فەرمووە – عەلی).
گەڕانی (ع، ما): کرانی – ئەمەش ڕێنووسی کۆنە.
فرمێسکی (ع، ما): فرمیسک.
ئاق دەنزە (ع، ما): آخد نگزە – ئەمەش جۆرە (زارگوت = لەهجە)یەکە.
ئاق دەنزە (جلی): آغ دنگزە – ئەمەش جۆرە زارگوتێکە و لە نووسینی تورکیی کۆندا پیتی (گ)ی (دنگزە) بە(ن) دەخوێنرێتەوە و (دگرە) دەنووسرێ.
ئاق دەنیزە (ما/١، ش): آق دنگزە.
تاق دەنیزە (کم، گ/٢، س): آق دەنگەزە.
ئاق دەنزە (گ/٣): ئاق دنگەزە.
ئاق دەنزە (ف): آق دگزە – وە لە پەراوێزەوە بەفارسی نووسیویە:
(بە«نون» خواندەمیشوو، بترکی) واتە (ئەم پیتی «گ»ە لەم وشەی (دگزە)دا بە(ن) لە تورکیدا دەخوێندرێتەوە). کە لەم جۆرە وشانەدا نووسین و خوێندنەوەیان جیایە – بەڵام لە زمانی

کوردیدا (ئاق دنگز) دەردەبڕدرێن.
غەیری (ع، ما، ما/١): غیر – ڕێنووسی کۆنە.
هیجران و (ما): هجران – ڕێنووسی کۆنە.
هیجران و بەڵا (ما/١): هجران – ئەمەش لەنگە و ناتەواوە.
مـزە (کم، گ/٢، س، گ/٣): مـەزە – ئەمـەش هـەڵەیە؛ چـونکە وشـەی (مـەزە) بەواتـا (تام) و (چێژ)ە وە یـا (مـەزە) ئەو خـواردنە سـووکەڵە و مـیـوەیەیە کە بەدەم بـادەنۆشـیـیـەوە دەخـورێت کەواتە (مزە) و (مەزە) لەیەک جیاوازن و (مزە) ڕاستە، گۆڕینی مامۆستا گیوە.
وەک لە لێکۆڵینەوە و بەراوردی تاکەکانی ئەم هەڵبەستە دەردەکەوێ زۆر شێواوی لە ناوەرۆکیدا و ئاڵوگۆڕی لە شـوێنی تاکەکانیدا پەیا بووە، بەڵام من بەهۆی سـەرچاوەی زۆر و کۆن و باوەڕ پێکـراوەوە و بەپێی گـونجـاندن ڕاسـتـەکـان وێکەوتووم و شـوێنەکـانیـانم جـێگـیـر کـردووە تا ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بەلای منەوە نزیکتر بووە لە دەقی وتنەکەی (کوردی)یەوە.
٢- عاشق: دڵدار.
هیجران: جیایی، دووری، لێکبڕان.
خەلاص: ڕسگار، ڕەها، دەرباز.
فـەرهاد: ئەو هونەرمـەندەیە کە لـە خۆشـەویـسـتـیـی (شـیـریـن) چیـای بێـسـتـوونی بەتەشـویکاری ڕازاندەوە و ئاوەدانی کردووە، هونەرمەندیی تیا نواندووە.
حەشر: ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەی خوا لە کەسان (قیامەت).
مەمنوونی: سپاسگوزار، منەتبار.
پووری هورمز: تۆڵەی فەرهادی سەندووەتەوە، یا گوایە خوسرەوی دڵداری کوشتووە.
ئەم تاکـە لە (عن، گل/١، گل/٣، مـا/١)دا دووەمـینە و لە (مـا)دا شـەشـەمـینە و لە (ف، نم/١، گ/٢، کم، س، جلی)دا حـــەوتـەمـــینـە و لە (ع، ش، گ/٣)دا هـەشــتـــەمین تـاکی ئـەم پارچـە هـەڵبـەستـەیە کە بەپێی هـەرە کۆنەکانیـان و بەپێی واتای تاکەکەش ئێرە نزیکترین شـوێنێکە لە دەقی وتنی (کوردی)یەوە.
هـەر کەسێ (ما/١): هرکی – ئەمیش لەنگی دەکات.
دەست (کم): دەس – بە(سواندن) گۆڕدراوە.
مەرد ئەوە (گل/٣، ما/١، جلی): دوست اوە.
مەرد ئەوە (مـا): دوست – هـەر تەنیا پیـتی (أ)ی (ئەوە)کەی ماوە و ئیـتر ئەویکەی لەگەڵ نیوەی دووەمی ئەم تاکە هەڵبەستەی تیا لەناوچووە و دڕاوە.
مەرد ئەوە (ع): دواست اوە – دیارە هەڵەی نووسینە.
مەرد ئەوە (ش): دوس اوە – ئەمیش جۆرە سواندنێکی (فەیلی)یانەیە.
مەمنوونی (ع، جلی): ممنون – بەڕێنووسی کۆن.
پووری (گ/٢، س): پوورێ – و لە پەراوێز (س) نووسیویە: (رووڵەی).

پووری (گ/۳): پووره.

هورمزه (گ/۳): هۆرمزه – ئەمەش دەسکاریی مامۆستا (گیو)ە،

۳– بەعەییاری: بەشۆخیگەری و فێڵبازی و، باسی (عەیار)م لە شوێنی تردا کردووە.

ئەنێو: لە ئاو، بۆ ناو، بۆ چوونە ناو.

باخ: مەبەستی لە ڕوخساری ئەو خۆشەویستەیە.

حەبەش زادە: واتە ئەوی لە حەبەش بوو و، مەبەسی خەلقی حەبەشەی لای ڕۆژهەڵاتی ژووروی ئەفەریقایە کە ئێستە (ئەثیوبیا)ی پێ دەڵێن و لەبەر ڕەشیی پێستیان (کوردی) ناوی بردوون و کردوونی بەخاڵی ڕووی جوانەکەی کە بەو جوانییەی دڵی خەڵکی گیرۆدەی خۆی کردووە، دزیوە.

ئەم تاکە لە (ما/۱)دا نییە و لە (ما)دا چوارەمینە و لە (عن، گل، گل/۳)دا سێیەمینە و لەوانی تردا هەموو پێنجەمینە.

خاڵی ڕووت قوربان (ف، ما، نم/۱، کم): خاڵی لای لێوت.

دزی (ش): درّي.

تۆ (یح): بتو – دیارە بەهەڵە نوختەی (ب)یەکی کردووە بەزیادە.

تۆ ئەنێو باخ بۆچی ڕێت دا (ف، نم، کم): بوچی ریتدا بینە ناو باغ.

تۆ ئەنێو باخ بۆچی ڕێت دا (گ/۲، س): بوچی رێت دا بێتە – بەدەسکاریی مامۆستا گیوی دەزانم.

تۆ ئەنێو باغ بۆچی رێت دا (گ/۳): بۆچی ڕێت دا بێتە.

تۆ ئەنێو باخ بۆچی ڕێت دا (ما): بوچی رێدا بیتە ناو باغ (نوختەی پیتی «ت»ی بۆ نەکردووە لە (رێتدا)دا).

ئەو (ف، ما، نم): او – ڕێنووسی کۆنە.

زادەی (ع، ما): زادەء – ڕێنووسی کۆنە و من ئەو ڕێنووسە کۆنانەم گۆڕیونەتە سەر ڕێنووسی نوێی ئێستا، مەگەر وشەکە بەچەند جۆرێک بخوێندرێتەوە کە ئەوانەشم بەپەراوێز لێک داونەتەوە لە شوێنی خۆیاندا.

٤– شیری – بەهەڵە لە سەرچاوەکاندا (تیغی) نووسراوە کە هەم لەم تاکەدا (تیغ) دووبارەیە و، هەم شیر گونجاوترە لەگەڵ تیردا بۆیە ڕاستم کردەوە.

قەتڵی عام: کوشتن بەکۆمەڵ – (قەتلوعام)یش دەوترێ.

تیرە: چەکێکی نووک تیژە و بەکەوان لە جێگەی (تیر = گوللە)ی ئێستە هاویشتراوە.

تاج بەخش: دیارە کەسێکی بەنێزە وەشێن بەناوبانگ بووە، کە (تاج) پادشاکەیانی سەندووەتەوە.

چنگ: دەست، مست، قولی مست.

جەنگزە: جەنگیز خانی مەغۆلییە کە بەخوێنکاری بەکۆمەڵ بەناوبانگ بووە.

ئەم تاکە لە (ما، ما/١)دا نییە و لەوانی تردا چوارەمینە.
تیغی (جلی): تیغ – کە من کردم بە(شیری).
ئەبرۆ و (ف، جلی، نم، کم): ابروت.
ئەبرۆ و (گ/٢، جلی، س، گ/٣): ئەبرۆت.
قەتڵی عام دەڵێی (ف، نم/١): قتلوعامی دڵ.
قەتڵی عام دەڵێی (کم): قتل و عامی دل – هەڵەیە.
قەتڵی عام دەڵێی (گ، س): قتل و عامی دڵ – هەڵەیە.
قەتڵی عام دەڵێی (گ/٣): قەتڵ و عامی دڵ – هەڵەیە.
قەتڵی عام دەڵێی (ش): قتل عالم – ئەمیش لەنگە و ناتەواوە.
بەقەتڵی عام دەڵێی (جلی): بقتل عام دل – هەڵەیە.
نووکی (ع، جلی): نوک – ڕێنووسی کۆنە.
نێزەی (ع): نیزەء – ڕێنووسی کۆنە.
نووکی نێزەی (گ/٢، س، گ/٣): نووکی نێزە – هەڵەیە.
تاج بەخش و (ع، ف، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣): تاج بەخشە، لە ڕووی زمانەوە ناگونجێ.
تاج بەخش و (گل/١): تاج بەخشە و، – دەگونجێ.
تیغی (ع، جلی): تیغ – ڕێنووسی کۆنە.
چنگی (گل/١، جلی): چنگ – ڕێنووسی کۆنە.
چنگی (ع): چنکی – ڕێنووسی کۆنە.
چنگی (گ/٢، س، گ/٣): چەنگی – هەڵە و دەسکاریی خاوەنی سەرچاوەکانە کە (گیو) بووە.
جەنگزە (ع، ف، جلی، ش، نم، کم): چنگزە – ڕێنووسی کۆنە.
جەنگزە (گ/٢، س، گ/٣): چەنگزە – دیسان دەسکاریی خاوەنی سەرچاوەکانە.
٥– بەتاو: بەخوڕ، بەگوڕ، بەجۆش، بەتوند و خێرایی.
مەقتوولان: کوژراوان.
موژگان: برژانگەکان، مژوڵان، موژگ، موژە.
سیا: ڕەش.
قرمز: سوور – ئەویش لە ڕەنگی خوێنی کوژراوان سوور بووە.
ئەم تاکە لە (ما/١)دا چوارەمینە و لەوانی تردا دووەمینە، جگە لەوەی کە لە (عن، گل/١، گل/٣)دا پێنجەمین تاکی هەڵبەستەکەیە.
خوێنی (ع): خوین – ڕێنووسی کۆنە.
مەقتوولان (گ/٢، س، گ/٣): کوژراوان – ئەمیش گۆڕینی مامۆستا (گیو)ە لە دڵسۆزییەوە بۆ ئەوەی بیکاتە کوردی.
لە موژگانی (ع، ما): لمژگان – ڕێنووسی کۆنە.

له موژگانی (ش): لدامانی – هەڵەیە.
ئەسپەکەت (ما/١): سخمەکت – ڕەنگی سوخمە هەرگیز سپی نابێ.
ئەسپەکەت (گ/٢، س): ئەسپەکەی – هەڵەیە لە ڕووی زمانییەوە.
ئێستە (ما): ایستا – لەنگ و قورسییە.
ڕەنگی (ع، ما): رنگ – ڕێنووسی کۆنە.
ڕەنگی (ش): بوچی – هەڵەیە.
جوانی لە ڕووی وێژەی کۆنەوە لەم تاکەدا یەکخستنی ڕەنگەکانی، ڕەش و سپی و سوورە کە ئەمەش زۆر پەسند و، وەستاکارانە بووە.
٦– ئەوەڵ: یەکەم.
تیرانداز: تیرەنداز، تیرهاوێژ، تیرئەنداز.
پێکات: ئەنگاوتت.
فیدای: قوربانی، بالاگەردانی.
کەمان: کەوان (کەوانی تیروکەوان).
کوڕ: مەبەستی ئەحمەد بەگی مەحموود ئاغای شێوەکەڵە، (کوڕە) بۆ هەڵنانە وەک (کوڕە کوڕە).
مامز: ئاسک، جەیران، بەگیاندارێکی چاو جوان هۆنەران ناویان بردووە.
ئەم تاکە لە (ع، ش، ف، ما، نم/١، کم، گ/٢، س، گ/٣)دا سێیەمینە و لە (جلی، ما/١)دا پێنجەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٣)دا شەشەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە.
ئەوەڵ (گ/٢، س، گ/٣): لەوێ – دیسان دەسکاریی مامۆستا (گیو)ە بۆ پاککردنەوەی زمانەکەمان.
ئەوەڵ (ش): لە اول – ئەمیش لەنگە.
هەر ئەوەڵ ڕۆژ بووی (ما): هر – ئەمیش لەنگە و ناتەواوە.
بووی بە (ش): بوی.
ئەوەڵ ڕۆژ بووی بە (جلی):... وژ بوی بە... ئیتر ئەم نیو باڵییە دڕاوە.
بووی بە (گ/٢، س، گ/٣): بوویە – هەڵەیە لە ڕووی زمانییەوە.
تیرانداز (گ/٢، س): تیرئەنداز – قورسە و لەنگی و دەسکاری.
تیرانداز شوکور (نم/١، کم): تیرانداز و تو – هەڵەیە.
شوکور پێکات (ما): پیکان مژت پیکان – هەڵەیە.
کوڕەی (گل/١): گژەء – ئەشێ سێ نوختەی (ژ)یە کە لە نیشانەی (گیراویێ = شەددە =□)وە پەیا بووبێ (کژە ئەشێ و جوانە).
کوڕەی (ع، ف، ما، ما/١): کر□هء.
لە نیو باڵی دووەمدا (جلی)دا: هەر (... ت و کمانت بم کرەء چاو و...) ماوە و ئەویکەی دڕاوە.

ئەمەش کە (کوردی) ناوی (کوڕ)ی بردووە بەڵگەیەکی تری سەرچاوە چاپییەکانە و بەو هۆیەوە (قادر) و (کوڕ)یان پێوە هەڵبەستووە، ئەوا بەهۆی سەرچاوەوە ساغ بووەوە کە ئەم (کوڕە) لێرەدا کێیە و (قادر) نییە کە سەرەتا لە دیوانی کوردی چاپی مەریوانیدا دوای ئەو بەجەختەوە مامۆستا گیو (کوردی)یان بەناڕەوایی تاوانبار کردووە.

٧- کەمەند: مەبەستی لە کەمەندکێشییە و کەوا بەهۆی چاویەشەکەوە سەری داوە و، کەمەند گوریسێکی درێژە ولاخی بەلەسەی پێ دەگرنەوە و لە پێشترا لێی دواوم.

ڕاه: ڕێگە، ڕێی.

هەڵدێر: ڕێگەیەک بەلاشاخەوە تەسک و مەترسی کەوتنە خوارەوەی لێ بکرێ و، مەبەستی ڕێگەی سولەیمانییە بۆ شیوەکەڵ کە چووە بۆ سەردانی بەو ڕێگە ناخۆشەدا.

خز: دیسان ڕێگەیەکی تووشی ناخۆشە کە ولاخ و ڕێبواری تیا دەخلیسکێ و دیارە ئەو ڕێگەی شیوەکەڵە وابووە.

ئەم تاکە تەنیا لە (عن، گل/١، گل/٣)دا هەیە حەوتەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە هەرسێ سەرچاوەکەشدا چوونیەکە. لەم تاکەدا کوردی پەیوەندیی قووڵی دۆستانەی خۆی بەرامبەر بەئاغای شیوەکەڵ دەربڕیوە کە (کوردی) و (سالم) زۆر هامشۆیان کردووە بەپێی هەڵبەستەکانیان.

٨- چاوی بیمارتم: چاوی پەشاوتم.

ڕەحمم: بەزەییم.

حاڵی زار: حاڵی شەق، حاڵی ناخۆشی و مەبەستی لە کوڵکی چاویەتی بەو چاویەشەیە.

ئیکە: ئیتر، ئیدی، ئەی، ئیکە بۆ، ئیتر بۆچی، کەواتە بۆ.

غەمزە: جووڵانەوەیەکی دڵگرە لە چاو وا کە هەستی بینەر دەبزوێنێ.

هەڵساند: مەبەستی لە (هەڵت ساند)، (هەڵت گیرساند)ە.

لە نیو: لە ناو.

چزە: چزە چزی سووتانە بەئاگر و کسپەی سووتاندن لێ هەستانی.

ئەم تاکە لە (ع، گ/٣)دا شەشەمینە و لە (ش) حەوتەمینە و لەگەڵ ئەوی دواییدا ئاڵوگۆڕ بووە و ئەگەر نا هەشتەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٣)دا هەشتەمینە و لەوانی تردا نییە.

بیمارتم کە دی (ع، گل/١، س، ش، گ/٣): چاوی بیمارت کە دیم.

ڕەحمم (ع): رحمی.

ڕەحمم (ش): رحم.

ڕەحمم (گ/٣): ڕوحمم – گۆڕانی موکرییانەی مامۆستا گیوە.

بەحاڵی زاری هات (ش): بحالی قت نکرد.

بەحاڵی زاری هات (ع): بحال زاری هات – ڕێنووسی کۆنە.

ئیکە بۆیە و غەمزەیەت (ع): هر کە تو پرّ عمزیت.

ئیکە تو بەو غەمزەیەت (گل/٣): هرکە تو پر غمزەات.
ئیکە تۆ بەو غەمزەیەت (گ/٣): هەرکە تۆ غەمزەت.
ئیکە تۆ بەو غەمزەیەت (ش): هرکە تو غمزەکت.
هەڵساند (ع): هلسان.
هەڵساند (ش): هلستاندی.
هەڵساند (گ): هەڵستاندی.
لە نێو جەرگم چزە (گل/٣): لە نیو جرکم کزە.
لە نێو جەرگم چزە (ش): لناو جرگم کزە.
لە نێو جەرگم چزە (گ/٣): لە ناو جەرگم چزە.

٩- وەزن: سەنگ، قورسی، ئەندازەی پیامالینی ئامێری مۆسیقی.

ضەرب: پیامالین، ترپە، لێدانی ئامێری مۆسیقی.

صەرف: خەرج.

موعەللیم: مامۆستا، فێرکار، مەبەستی مامۆستای ئەحمەد ئاغا بووە کە لەسەر خوێندن پیا ماڵیوە.

بۆ کزت کرد: بۆ چاوت کز کردین و قورسایی پیامالینە. (لەگەڵ مامۆستایەتی).

کزە: کزەی سووتانی مەبەستە - نزایە لە مامۆستایەکەی کردووە.

ئەم تاکە پەیوەندیشی تیا هەیە بەزانستی مۆسیقاوە وەک لە لێکدانەوەی تاکی سێیەمی هەڵبەستی (دڵ لە میحنەت کەیلە)دا پیشانم داوە بەندە بە(دوم) و (تک)ی پێدا کێشانی مۆسیقییە و لێدانیدا، ئەمەش نیشانەیە بۆ کاریگەریی غەمزە و پەیکی جوانی چاو لە دڵدان.

ئەم تاکە لە (ما/١)دا سێیەمینە و لە (ما)دا پێنجەمینە و لە (ش، ف، نم/١، کم، جلی، گ/٢، س)دا شەشەمینە و لە (ع، گ/٣)دا حەوتەمینە و لە (ع، گل/١، گل/٣)دا نۆیەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە.

وەزنی (ع): وزن - ڕێنووسی کۆنە.
وەزنی (ما/١): طرب - ئەمیش لەنگە و ناڕاست و هەڵەیە.
ضەربی (ما/١): صرف وزن - ڕاست نییە.
ضەربی (ما، ع): ضرب - ڕێنووسی کۆنە.
پەنجەت (ع، ما، ما/١): پنجت - ڕێنووسی کۆنە.
صەرفی (ع، ما): صرف - ڕێنووسی کۆنە.
ئەمڕۆ صەرفی (ما/١): امرو... ئەویتری دڕاوە لەم نیو باڵی یەکەم.
تۆ (ع، ما، ما/١، جلی): بوچ.
ئەی موعەللیم (جلی): ... یلم... سەرەتاکەی دڕاوە.
ئەی (ما/١): لی.

دەک (ما/١): دک – ڕێنووسی کۆنە.

کزە (ع، جلی، ش): چزە – نابێ و دووبارەیە.

کزە (ما): چذە – هەڵەی (نووسین) و (گۆڕان)ی تیایە.

١٠– پەیک: تیر، گوللە.

قەلب: دڵ.

عاشقان: دڵداران، ئەوانەی ئەویان خۆش دەوێ کە ئەنگاوتەی چاوە جوانەکانین.

دوود: دووکەڵ، کادیی.

ئاهی: هەناسەی ساردی، لە تۆڵەی.

بێ گوناهان: مەبەستی لە دڵدارە پێکراوەکانی چاوە جوانەکانی ئەحمەد بەگە.

لێڵ: تەمبار، سوور هەڵگەڕانی چاویەشانەکەی مەبەستە.

کز: کەم بینایی بەهۆی ئاوسانی چاویەشەکەوە (ئەم کزە) جیناس ئاراییە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٣)دا دەیەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە.

دوودی (گل/٣): لێڵی.

کەوا لێڵ و (گل/٣): کەوا دیدەت – ئەمیش جوانە جیناسە لەگەڵ (دوود)دا.

١١– کوشتە: کوژراو – مەبەستی پەیکراوی چاوەکانی یاکوژراوی خەفەتی چاویەشەکەی.

دیدە: چاو، بینایی.

خەمۆش: مات و بێ دەنگ لە خەمی چاویەشەکە، خامۆش.

بابە جان: پزیشکێکی شارەزا و (حەکیم باشی) ئەوسا بووە، نەوەی لە کوردستانی عیراق زۆرن و ماڵەکەیان لە خوار کارێزی ئەحمەد زەنگەنە بووە لە سولەیمانی، (گوڵچین خان)ی خێزانی پزیشک بوو من دیومە.

خەندە: پێکەنین و مەبەستی لە کەوتنە خۆشییەوەیە بەچاکبوونەوەی چاویەشەکە.

بزە: دەم کردنەوە بۆ زەردەخەنە و نیشانەی شادییە.

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٣)دا یانزەمینە و لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە هەمووانیشدا چوونیەکە.

ئەم تاکە لە کێشدا قورس دەنوێنێ، ئەگەر وشەی (خستنییە) نەختێ بەدرێژتر دەرنەبڕدرێت وەک: (خستی. نییە) بۆ ئەوەی لەنگ نەبێ.

١٢– شیفا: چاکبوونەوە.

بابە جان: بابە گیان و مەبەستی لە قوربانیدانە بەگیان نەک سەربڕینی مەڕوماڵات.

ئەم (بابە جان)ەش لەگەڵ ناوی حەکیم باشیدا جیناس ئاراییە و (بابە گیان) = ئەی باوکە گیان.

ڕەقیب: ناحەز، دژ، بەدکار، خراپکار، نەیار.

غیرەت سز: بێ غیرەت، شەرم بەخۆ نەبوو، بێ ئابڕوو (سز = بەبێ – تورکییە).

ئەم تاکە لە (عن، گل/١، گل/٣)دا دوانزەمینە و، لەوانی تردا نییە و هێشتە چاپیش نەکراوە و لە هەمووانیدا چوونیەکە.

١٣- نار: ئاگر.

سینە: سنگ.

کەباب: گۆشتی قیمەکراوی بەشیشەوە برژاوە - جاری تر لێی دواوم.

فایدە: سوود، کەڵک.

بۆ کز: ئەو تام و بۆنەیە بەهۆی زۆر گەرمکردن یا سووتانەوە لە هەندێ خواردنی تریشا وەک (ماست) پەیا دەبێ = بۆن سووتاوی.

ئەم تاکە لە (ما/١)دا نییە و لە (ما)دا حەوتەمینە و لە (ف، جلی، نم/١، کم، گ/٢، س)دا هەشتەمینە و لە (ش، ع، گ/٣)دا نۆیەمینە و لە (عن، گل/١، گل/٣)دا سیانزەمین تاکی ئەم پارچە هەڵبەستەیە و لە هەمووانیشدا دوا تاکە.

بەناری (ع، ما): بنار - ڕێنووسی کۆنە.

کردووە و دەڵێ (نم/١، کم): کردو ئەڵێ.

کردووە و دەڵێ (ما): کرد او دلی.

کردووە و دەڵێ (گ/٣): کرد ئەو دەڵێ - دەسکارییە.

کردووە و دەڵێ (ش): کرد ئەولی.

نیو باڵی دووەمیش لە (گ/٢، س)دا بەم جۆرەیە: دڵ لە نێو زامی فراقی بووە کەباب و ئەو دەڵێ - لەنگیشە.

لە حەسرەت ئەو قەد و باڵای وەکوو نەی
دڵی من پڕ لە ئەفغان و خرۆشە
کە ڕوو نادا بەکەس نایێتە ناو ڕام
عەجایب ئاسکێکی وەحش و تۆشە
دڵ و دینی فڕاندووم و ئەمێستاش
بەئوممێد و تەماعی عەقڵ و هۆشە

***

بەسم دێوانە و ڕیسواکە قوربان
ئەگەر عەیبی منیشە عەیبی تۆشە
بەهەشتە چونکی تۆی تێدای لەکن من
جەهەننەم بێ ئەگەر، ئەم شارە خۆشە
(غەریب) و دەربەدەر ئەمڕۆ کەسێکە
کەوا حەلقەی غولامی تۆی لە گۆشە



٧٠

## بەبەرگی خونچەییدا

١– بەبەرگی خونچەییدا، سەبزە پۆشە
بەحوسنی خۆی، وەکو گولّ، خۆفرۆشە

٢– وەکو چاوی بەخوابی، نێرگسیی: مەست
لە گوێدا، وا گرانە؛ وا نەخۆشە

٣– بنازم، وردە خاڵی دەوری لێوی،
دەڵێی (زەنگی بەچە)ی شەککەر فرۆشە

٤– لە حەسرەت ئەو قەد و باڵای وەکو (نەی)
دڵەی من، پڕ لە ئەفغان و خورۆشە

٥– ئەمن نایدەم نیگاهی جیلوەیەکی،
بەهەرچی مەهڕوویی (کاکۆڵ) بەدۆشە

٦– کەوی نابێ بەکەس، نایێتە ناو داو،
عەجایب ئاسکێکی وەحش و تووشە

٧– (دڵ) و (دین)ی ڕفاندووم و، ئەمێستەش
بەئوممێد و، تەماعی: (عەقل) و هۆشە

٨– بەشی من (زاری) و (شین)ە لە دەستی
بەشی مەجمووعی خەلقی عەیش و نۆشە

٩– بەسم دێوانە و و ڕسوا کە قوربان،
ئەگەر عەیبی منە؟ خۆ عەیبی تۆشە

١٠– بەهەشتە؛ چونکە تۆی تێدای، لە لای من؛
جەهەننەم بێ، ئەگەر؟ ئەم شارە خۆشە

## ١١- غـەریب و دەربەدەر (کـوردی) کــەسـێکە
## کـەوا (حــەلقـە)ی غـولامـیـی تۆی لە گـۆشـە

.................................................................

**١- سەرچاوەی ئەم هەڵبەستە:**

لە سەرچاوەکانی ئەم هەڵبەستەدا، هەندێکیان بە هی (غەریب)یان داناوە و، هەندێکی تریشیان داویانەتە پاڵ (کوردی) و، لە هەندێکیاندا ناوی هۆنەرەکەیان نەنووسیوە و نەیانزانیوە.

دیارە ئەم جیاوازییەی سەرچاوەکان، ئاڵۆزییەکیان ڕەخساندووە لە ساغکردنەوەی ئەم هەڵبەستەدا. بەڵام من بەهۆی قووڵ و فراوان تێ ڕۆچوون و بیر درێژییەوە، هەروەها بوونی بەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە، لە لام جێگیر بوو کە هی (کوردی)یە. خۆ ئەگەر سەرچاوەی تری بەهێزتر لەمانی لای من سەری هەڵدا و، بە هی (غەریب) یا هۆنەرێکی دیکەیان ناساند، ئەوە ئاواتی گەیشتنە ڕاستیی منە، چونکە هی کام هۆنەرمان بێ بۆ من وەک یەکە و، کەلەپووری کوردیمانە،

**خاوەنی هەڵبەستەکە:**

تێکڕای ئەو سەرچاوانەی ئەم هەڵبەستە کە دەست من کەوتوون (١٦) سەرچاوەن و لەوانە (٩)یان دەسنووسن و (٤) چاپکراو، وە (٥)یان لە دەمی ئەم و ئەوەوە وەرگیراون و هەمووشیان لە ڕووی دیاریکردنی خاوەنی هەڵبەستەکەوە سێ بەشن و ئەوانیش ئەمانەی دوایین:

١- بەشی یەکەم - خاوەنی هەڵبەستەکەیان دیاری نەکردووە، ئەم سێ کەشکۆڵەی دوایین:

أ- کەشکۆڵی بەرباخەڵ: فرە نووسەر.

ب- کەشکۆڵی کۆن: فرە نووسەر.

ج- کەشکۆڵی سیسە: نەوەی شاعیری مەزنمان (صەیدی)ی کۆنە.

٢- بەشی دووەم - لەم بەشەدا خاوەنی هەڵبەستەکەیان بە(غەریب) داناوە، کە ئەمانەن:

أ- کەشکۆڵی مینای شکستە بەرگی/١ - (نم/١) دەسنووسی مامۆستا (نەجمەدین مەلا).

ب- کەشکۆڵی نووسراوی پەرێشان دەسنووسی هەمان مامۆستا و هی من بوو لە هەمان چارەنووسی نادیاریدایە.

ج- پەڕاویی (شاعیرە ناو ونبووەکانی کورد) - کۆکردنەوەی مامۆستای نووسەر و ڕۆژنامەنووس شاعیری مەزنمان (عەلی کەمال باپیر ئاغا) - کە لە چاپخانەی ڕاپەڕین لە سولەیمانی لە ١٩٧٠ز.دا چاپ کراوە.

لە لاپەڕە (٢٨)ی ئەم چاپکراوەدا (غەریب) بەم جۆرەی دوایی پێناسە کراوە:

(میرزا غەریب کوڕی مراد ئاغا) کە مراد ئاغا (قەندەلامە) واتە (قەندەدار)ی دوا پادشای بابان ئەحمەد پاشا بووە.

غەریب - کە دیاریی نەکردووە ئایا (ناو) یا (نازناو)ی شاعیر بووە، لە ساڵی ١٢٥٠ک =

١٨٣٤ز. دا لە شـاری سـولەیمانی لـە دایک بووە و هـەر لەو شـارەشـدا لـە سـاڵی ١٣٢٣ک = ١٩١٥ز. دا بەنەخۆشیی (چاوەقووڵە) کۆچی دواییی کردووە.
ئەو نـەخـۆشـییـە لەو سـاڵەدا لـە ناوچەی سـولەیمانـیـدا بڵاوبـووەتەوە و بەهـەزارەها خـەڵکی کوشـتووە. ئەو (غەریب)ە، بەپێی ساڵی کۆچی لە تەمەنی (٧٣) ساڵانیدا و بەپێی ساڵی زایینی لە تەمەنی (٨١) ساڵانیدا مردووە.
لێرەدا پێم باشـە کە نیشانە بۆ هەڵبەستی (ڕەفیقـان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان)ی ناو ئەم پەڕاوییە بکەم کـە لەوێدا لە چەند هۆنەرێکی نازناو (غـەریب)مـان دواوم، کـە ئەم (غـەریب)ەی ئێـرە، چ کامێک لەو (غەریب)انە نییە و یەکێکی ترە ناوی ئەو شاعیرە (مەحموود) بووە.
بەدووری نـازانم کـە هـەڵبـەسـتی (کـوردی)مـان وە یا هـی هـەر هۆنەرێکی ترمـان کـە کـرابێ بە(غـەریب) لەوەوە کـەوا نووسـەرەکـەی ناوی خـاوەنی شـیـعـرەکـەی نەزانیـوە و داویـەتە پاڵ (غەریب) بەمـەبەستی، یا واتای (نادیار و، نەزانراو، و، نامۆ، ئاوێتە و... هتد، نەک بەمـەبەستی ئەوەی کە گوایە خاوەنەکەی (ناو) یا (نازناو)ی: (غەریب) بووبێ.
جگە لەوەی کە (عـەبدوڵڵا پـاشـای بابان) زۆر قینی لە شـاعیـرمـان (کوردی) و (سـالم) بووە و، وەک پێشوو بەکەشکۆڵ و دەسنووسی فەقێ و مەلای مزگەوتەکانی قەڵەمڕەوی باباندا گەڕاوە و هـەرچی هەڵبەستی (کوردی) یا (سالم)یان تیا بووبێ کوژاندوویەتەوە، یا دڕاندوویەتی، ئەمجا لە ترسی ئەوە خـەڵکی کـە هـەڵبـەسـتی (کـوردی)یان دەسـتـکەوتبێ نازناوی (کـوردی) یا (هیـجری)یان نەنووسـیـوە، بەشکو داویانەتە پاڵ هۆنەرێکی تری وەک (غـەریب) یا (فـیکری) و... هـتـد، تەنـانەت (عـەبدوڵڵا پاشـا) (کـێل و هـەڵبـەسـتـنی) گـۆڕی هـەردوو شـاعیـرمـان (کوردی) و (سـالم)یشی هـەڵتـەکاندبوو، بەڵام من بەهـۆی هۆنەر (ئـەحـمـەد حـەمدی بەگی سـاحـیبـقـران) و پیـاوێکی ئەوەوە کە ناوی (سـالە نەریمان) بوو کە مێردی خـاڵۆزای دایکم بوو، هـەروەها بەهۆی (تۆفیق بەگی فەتاح بەگی ساحیبقران)ەوە و بەهۆی کوێرێکی قـورئان خوێنی پیـر، لە گەڕەکی (سـەرکـارێز) مەلا فـەرەج لە سـولەیمانی ئەو دوو گـۆڕەم لە سـاڵی (١٩٣٥ز.) وە بۆ دەسنیـشـان کـرابوو و، بەهـۆی یاریدەدانی بەڕێز (ئیـسـمـاعیل بەگی نووری بەگی سـاحـێبقـڕان)ەوە ئەو دوو گۆڕەم نیشانە کردن و ئەو پاراستنی کە گۆڕی تریان لەسـەر نەکرێن .
ئەم ئاگەداریانەشم بەم بۆنەیانەوە کە ڕایان دەگەیەنم خزمـەتی مێژووی وێژەی کوردمان دەکات و ئەگەر لە بابەت لادان بێ تکای، لێبووردنم هـەیە، چونکە ئاگەداری زۆری لەمانەم لە لایە و لەم چەشنە بۆنەیانەدا نەبێ لەوانەیە؛ بەیادمدا نەیەنەوە و، لە دەست بچن و لەگەڵ خـۆمدا بیانبەمە گۆڕەوە. بۆیە ئەم پەڕاوییەم زۆری لەم چەشنە لادانە تیایە و لە سوودبەدەر نییە.
د- سـەرچـاوەی چوارەمی ئەم بەشی دووەمـە کـە هـەڵبـەسـتـەکـەی تیـا بە هی (غـەریب) ڕاگـەیەنراوە. پەڕاویی: (کـەشـکۆڵی کـەلـەپووری ئەدەبی کـوردی) بەرگی شـەشـەم (گـوڵزار و بەهـار)ی دانـراوی مـامـۆسـتـا (مـحـەمـەد عـەلی قـەرەداغی) ئـەندامی کـارای کـۆڕی زانیـاری کـوردسـتـانە کـە لە سـاڵی ٢٠٠٤ز.دا لە دەزگـای ئاراس لـە هـەولێـر چاپ کـراوە لە بنکـەیەکی

ساغکردنەوەی ئەم هەڵبەستەیە.

لەو بەرهەمەدا مامۆستا لە لاپەڕە پەنجاویەکیدا بەپەراوێز ڕای گەیاندووە کە هەر لە کەشکۆڵی گوڵزار و بەهاردا نووسیویە: هەڵبەست بەبێ دیاریکردنی ناوی خاوەن وە یا بەنازناوی (غەریب) و (غەریبی)یەوە هەڵبەست هەیە و مامۆستا لە پێشکەشکردنی ئەم هەڵبەستە و هەڵبەستێکی تری ئەو (غەریب)ەدا نووسیویە: «بۆیە گومانم بۆ ئەوە دەچێت شیعری (غەریبی) بن، منیش لێرەدا تا دەردەکەوێ شیعری کێن تۆمارم کردن، بەڵام دووبارە کام (غەریبی)؟؟...»

ئەوەتا مامۆستاش لێرەدا هەمان ڕای منی بەرامبەر بەم هەڵبەستە دەربڕیوە کە من بەر لە ٣٠ – ٤٠ ساڵەوە لەسەر ئەم هەڵبەستە نووسیومە وەک لە پێشەوە ڕام گەیاندووە، ئەم هەڵبەستە لەو بەرهەمەی مامۆستادا لە لاپەڕە/پەنجاودوودایە و ئۆفسێتی دەمی نووسینی هەڵبەستەکە لە لاپەڕە (٨٤)دایە.

٣– بەشی سێیەم:

ئەو سەرچاوانەی کە ئەم هەڵبەستەیان بە هی (کوردی) تیا نووسراوە، چواریان کەشکۆڵی دەسنووسن و (٥)یشیان ئەو کەسانەن کە هەڵبەستەکەیان لەبەر بووە و منیش لە دەمی ئەوانەوە بەناوی (کوردی)یەوە لێم وەرگرتوون کە هەموانیان شوێن بڕوان و ئەمانەن:

أ– کەشکۆڵی وێژەوانی ورد و مەزنمان (عەلی ئاغای نەوتچی «عن»).

ب– کەشکۆڵی محەمەد صەدباری (ص).

ج– کەشکۆڵی دەسنووسی، هاواڵی وێژەوان و نیشتمانپەروەرم، نامیق ئاغای مستەفا ئاغای گەڕەکی سەرشەقامی سولەیمانی کە ئەویش ئەم هەڵبەستەی لە دەمی مامۆستا مەلا سەلامی کوڕی مامۆستای مەزن مەلا حسەینی پێسکەندییەوە وەرگرتووە.

د– کەشکۆڵی محەمەد ئەسوەد (ما).

هـ– لە دەمی مامۆستام مەلا فەتحوڵڵای پاوەییەوە لە مزگەوتی بن تەبەق (مزگەوتی هەرمنی) لە پشت سەرا و پۆلیسخانەی سولەیمانییەوە کە دەرگایەکی مزگەوتەکە ئێستە لەسەر شەقامی (پیرەمێرد)ە لە سەرەتایەوە، لە ساڵە سییەکانی چەرخی بیستەمەوە لێم وەرم گرتووە.

و– لە دەمی مامۆستام مەلا عەبدوڵڵای ڕەشەکانییەوە لە ساڵی سییەکانی چەرخی بیستەمەوە لێم وەرگرتووە.

ز– لە دەمی شاعیری لاهووتی کەم هاوتامان مامۆستا مەلا مەحمووودی (بێخود)ەوە لە بەیانییەکی هەینیی بەهاری ساڵی ١٩٤١ لە قوتابخانەکەی مامۆستا نەجمەدین مەلام کە ئەوسایە لە بن خانووەکەی ڕەفعەت ئەفەندییە درێژ)دا بوو لە خوار مزگەوتە گەورە و لە دەرکی لای ژووروی پردەکەی ژێر شەقامی مەولەویدا کە بەیانییانی هەینییان شاعیرانی سولەیمانی لەوێ کۆ دەبوونەوە هەتا نوێژی هەینی و ئەو ڕۆژە مامۆستا (بێخود) لە کەشکۆڵی (مینای شکستە – بەرگی/١)ی دەسنووسی نەجمەدین مەلادا ئەم هەڵبەستەی

سەرەوەی بەرچاو کەوت و دەستبەجێ فەرمووی:
(من لە فەقێیەتیمەوە، ئەم هەڵبەستەم بە هی «مستەفا بەگی کوردی» لەبەرە) و من کەشکۆڵەکەم ڕاگرت و ئەو لەبەر وەک نووسراوی ناو کەشکۆڵەکەی خوێندەوە.
ج- لە هاوینی ١٩٤٣دا کە ئەوسایە من (مضمد صحی) بووم لە خەستەخانەی گەورەی سولەیمانی و بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی (ئاوڵە)وە لە مرۆڤدا من نێردرامە ناوچەی پێنجوێن بۆ کوتانی خەڵک دژی نەخۆشیی ئاوڵە و، لەوێ لای هاواڵم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای تووتنچی (موفتی پێنجوێنی) بووم و باسی ئەم هەڵبەستە هاتە پێشەوە و ئەو فەرمووی ئەم هەڵبەستەمان لە گەنجییەوە لەگەڵ مەلا ئەحمەدی برامدا لەبەر کردووە کە هی (کوردی)یە.
ط- هەر لەو ڕۆژانەدا کە نێردرامە ناو گوندان بۆ ئاوڵەکوتی و پۆلیسێکی (غەیرە نیظامی)یان خستە تەکم کە ئەوسایە پێیان دەگوتن: (جاش پۆلیس) ئەو پۆلیسەش مامۆستا مەلا ئەحمەدی شاعیر و نازناو بە(شەفیق) و برای (موفتی پێنجوینی) بوو کە هەر دووانیان کوڕی مامۆستا حاجی مەلا عەبدولکەریمی گوندی (بیستانە)ی لا پێنجوێن بوون و (شەفیق) هەمان فەرموودەکەی (موفتی پێنجوێنی)ی برای بۆ دووبارە کردمەوە و فەرمووی:
(ئەم هەڵبەستە هی «کوردی»یە و لە کەشکۆڵەکەشمدا نووسیومە کە لەبەر کەشکۆڵی خوالێخۆشبوو، باوکم وەرم گرتووە). منیش بەداخەوە ڕایدەگەیەنم لە ڕۆژ و مانگ و ساڵی ئەو دیدارانەم لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەنووسیوە، کە ئەم جۆرە هەڵبەستانەم لێ وەرگرتوون. لە ڕاستیدا ئەوسایە، هەستم بەگرنگیی ئەو دیاریکردنە نەکردووە.
دەقی (لەبەر بوون)ی ئەم هەڵبەستە لە (موفتی پێنجوێنی) و لە مامۆستا مەلا ئەحمەدی برایەوە، وەک ئەوەکەی (میناى شکستە/بەرگی/١) وەهان کە ئەمان بەناوی (کوردی)یەوە پێیان ڕاگەیاندووم.
بەم جۆرە و بەم هەموو سەرچاوە و بەدواداچوونەم بۆم ساغ و یەکلایی بووەوە کە ئەم هەڵبەستە هی (کوردی)یە و لە نێوان ئەو ١٦ سەرچاوەیەدا (عن)م کردە بنکەی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی ئەم هەڵبەستە لەگەڵ کەلەپوور، بەرگی/٦ی مامۆستا قەرەداغیدا. چونکە وەک بۆم دەرکەوتووە، ئەم دوو سەرچاوەیە چاکترین و بەبایەخترین سەرچاوەن لەم پەڕاوییەمدا.

**شێوەی دەربڕینی ئەم چامەیە:**

ئەگەرچی ئەم چامەیە لە هەندێ سەرچاوەدا (٩) تاک و لە هەندێکی تریاندا (١١) تاکە، بەڵام بەتێکڕایی هەشت تاکی سەرەتایەکەی بەو شێوەیەی لە دڵخوازەکەی (کوردی) لە کاتی هەڵبەست دانانەکەدا و، یا بەپێی جۆری داڕشتن (صیغە)، دڵخوازەکە، لە ئارادا نەبووە و، بەغائیب لەو هەشت تاکەدا لێی دواوە.
بەڵام سێ تاکی دوایی چامەکە بەچەشنە داڕشتنێکە کە (کوردی) یەکسەر ڕووی دەمی

کردووەتە دڵخوازەکەی و وەک (موخاطەب) لەگەڵی دواوە و ئەم نەریتەش لە دەستووری وێژەی کۆندا، ڕێگە بەشاعیر دراوە، کە پەیڕەویی بکات.
لە شیکردنەوەی هەر (١١) تاکەکەی ئەم چامەیەدا زنجیرەی یەک لە دوای یەکی ئەو تاکانە و سەرچاوەکانیان و جیاوازی لە نێوان دەقی ئەم سەرچاوە و ئەوی تریاندا دیاری دەکەم بەم جۆرەی دوایی:

**شیکردنەوەی تاکی یەکەم:**

ئەم تاکە، کە لە سەرەتای ڕاز دادانی ئەم چامەیەوە لە سەرووی لاپەڕەدا پێشکەشم کرد، لە هەموو سەرچاوەکانیدا یەکەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و، ئەم جیاوازییانەی دوایی تیایە بەپێی سەرچاوەکان:
خونچەیی دا (عەلی کەمال): سەبزە «خونچە» – تەنیا لەم سەرچاوەیەدا وشەی «خونچە» خزاوەتە ناو جووت کەوانەی گچکەوە هەروەک (عەلی کەمال) لە خاڵبەندیدا ئەوەی دیاری کردبێ کە ناوی خۆشەویستەکەی شاعیر (خونچە) بووە و، ئەمەش بەم خستنە ناو کەوانەیە واتا دەدات و دەگونجێ.
خونچەیی دا (کۆن، سیسە، بەرباخەڵ، گوڵزار و بەهار): سەبزی غونچە – کە ئەمەش بەم شێوەیە واتا نادات و هەڵەیە و ناگونجێ؛ چونکە ئایا ئەشێ (خۆشەویستەکەی شاعیر) لە توێکڵی سەوزی دەوری خونچە بەرگی دروست کردبێ و پۆشیبێتی؟؟؟
حوسنی (عەلی کەمال): جوانی – ئەمەش زۆر جوان و ڕێک و گونجاوە و کوردییەکی پەتییە، بەڵام ئەوەتا زۆربەی سەرچاوە لە جێگەی ئەم وشەی (جوانی)یە، وشەی (حوسنی)یان تیا نووسراوە، بۆیە بەداخەوە نەمتوانی ئەم نیو باڵییە لەم وشەی عەرەبییە ناشیرین و بێگانەیە پاک بکەمەوە.
خۆ فرۆشە (بەرباخەڵ، سیسە، کۆن، ما، ص): خود فروشە – ئەمەش هەرچەند کوردییە و دەگونجێ و یەک واتایە بەڵام (خۆ)یەکە (باو)ترە و لە زۆرترین سەرچاوە دایە و ڕەوانتر و سوارترە لە کێشدا.
زنجیرەی هەر (١١) تاکەکەی (گوڵزار)، وەک زنجیرە نووسینی (١١) تاکەکەی ئەم چامەیەیە وەک من بزانم ئەم هەڵبەستە یەکەمین جار لە لایەن (عەلی کەمال) لە بەرهەمە ناوبراوەکەیدا وە، جاری دووەم لە لایەن مامۆستا (محەمەد عەلی قەرەداغی)یەوە لە بەرهەمە ناوبراوەکەیدا چاپ کراوە و لەم پەڕاوییەشدا دەبێ جاری سێیەمی چاپکردنی بێ.

٢- ئەم تاکە هەڵبەستە لە: (عن، سیسە، کۆن، ما، نامیق، گوڵزار)دا دووەمین تاکی ئەم هەڵبەستەیە و، لە سەرچاوەکانی تریدا نییە.
بەخوابی: بەخەوی مەبەست (چاوی خەواڵوو)ە و هۆنەران چاوی دڵخوازەکانیان لە زۆر هەڵبەست بە(نێرگس)ەوە بە(مەست = واتە چاوی سەرخۆش) چواندووە کە جۆرە، چاوێکە (چاوی نەرم)یشی پێ وتراوە وە چواندوویانە بە(نێرگسی مەست).

مەست: سەرخۆش – لەم تاكەدا جۆرە هونەرمەندییەک لە بەكارهێنانی ئەم وشەی (مەست)ەدا هەیە، ئەویش ئەم وشەی (مەست)ە لێرەدا مەبەست لە مەستی و سەرخۆشی (یار)ەكەیە، نەک (مەستی)ی نێرگسەكە. بەو واتایەی كە ئەو یارە دڵخوازە ئەوەندە مەست و سەرەڕۆیە، چاوە خەواڵووە نێرگسییەكەی ناداتە دڵدارە شەیدایەكەی خۆی و لە سەوداسەریی ئەو دڵدارە بێ باكە و تەماشای ناكات.

ئەمە بەپێی نیو باڵی یەكەمی ئەم تاكە هەڵبەستە، بەڵام بەپێی نیو باڵی دووەمی ئەم تاكە هەڵبەستە (كوردی) بابەتی (چاو، وە مەستییەكە) دەگۆڕێ بە(گوێ) و ئەو دولبەرە جوانە كە گوێی لە عاستی دڵداردا گرانە و وەک تووشی نەخۆشیی (گوێ گرانی) بووبێ لە عاستی (كوردی) و، (كوردی) وەهای دەرخستووە لەم نیو باڵی دووەمەدا.

(كوردی) لەم نیو باڵی دووەمەدا یارەكەی بەنەخۆشی (گوێ گران) ناو بردووە، چونكە ئەوەندە لە عاستی (كوردی)دا گوێی گران بووە و ڕاز و نیازەكانی (كوردی) نەبیستووە و، یا ئەو یارە خۆی وەها دەرخستووە كە ئەو نیاز و ڕازانە نابیەت لە گوێدا (گران) و (بێ گوێیە)...

بەخوابی (نامیق): خەواڵووی ئەمیش جوانە و چونكە هەر تەنیا ئەم سەرچاوەیە، بەشێوەی (خەواڵوو) نووسیویە و لەوانی تردا بە(بەخوابی)یە، بۆیە لێرەدا نەمگۆڕی بە(خەواڵووی).

لە گوێدا: ئەم وشە لێكدراوە – لە (ما، بەرباخەڵ، كۆن، سیسە)دا بەشێوەی (لە كویدا) نووسراوە كە ئەوەش ڕێنووسی كۆنە كە نووسەرە كۆنەكان وەک لە زۆر كەشكۆڵدایە بۆ پیتی (گ) هەردوو سەری پیتەكە نانووسن، بەشكو لە شێوەی (ک)دا دەینووسن و لە سەرچاوەكانی تردا بەشێوەی (لە گویدا) نووسراوە كە ئەمەیان بەڕاستتر دەزانم.

لە گویدا – دیسانەوە ئەم وشەیە وەک ڕام گەیاند لە سەرچاوەی (گوڵزار و بەهار)ی چاپی مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغیدا بەشێوەی: (لە كوێدا وا گرانە) نووسراوە كە لە (لە گویدا كەوا) بەپیتی (ک) و لە (گرانە)كە بەپیتی (گ) لە چاپەكەدا نووسراوە لە لاپەڕە (٥٢)دا و كە گەڕامەوە سەر وێنەی دەقی دەسنووسەكان كە مامۆستا بە(ئۆفسێت) لە پاشكۆی ئەم بەرهەمی (كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردی) – بەرگی شەشەم – گوڵزار و بەهار لاپەڕە/١٨٤دا سەرنجم دا كە بەشێوەی (لكویدا وا كرانە و) واتە هەردوو پیتی (گ) سەرەتای (گوێ) و (گران)ە كە بەپیتی (ک) نووسراون و مامۆستا یەكەمیان كە (گوێ)یەكەیە بە(ک) نەک بە(گ) وە دووەمیانی بەپیتی (گ) نووسیوە.

منیش لە دەقی هەڵبەستەكەی ئێرەدا لەسەرەوە (لە گوێدا)م نووسی بەپیتی (گ) كە واتای تەواوی دەدا؛ چونكە لە (كوێدا) واتای (لە كام شوێندا) دەدات، من لام وایە مەبەستی (بیستن)ە، بەرامبەر بە(بینینی) نیو باڵی یەكەم.

٣– ئەم تاكە لە سەرچاوەكانی (كۆن، نامیق، سیسە، عن، كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردی، گوڵزار و بەهار)دا سێیەمینە و لە سەرچاوەكانی (نم/١، نن، ص)دا دووەمینە و لەوانی تردا نییە.

لێوی (بەرباخەڵ، نم/١، نن، ما، عەلی کەمال)دا: لێوت نووسراوە، وەک لە سەرەتاوە ڕام گەیاند، ئەم چامەیە جگە لە سێ تاکە هەڵبەستە دواییەکەی، شاعیر؛ لە یارەکەی خۆی بە(غائب) دواوە و، تەنیا لەو سێ تاکەدا ڕووبەڕوویی بەشێوەی (موخاطەب) لەگەڵی دواوە. لەبەرئەوە من لە دەقی سەرەوەی ئەم تاکە هەڵبەستەدا وشەی (لێوت)م کردە (لێوی)، بەتایبەت لە زۆربەی سەرچاوە دەستنووس و (دەمی)یەکانیشدا (لێوی)یە.

لێوی (گوڵزار و بەهار) لە چاپەکە و دەسنووسەکەشدا بەشێوەی (لیمۆت) نووسراوە، منیش لەبەرئەوەی کە دەبینم باسەکە باسی (لێو)ە و (لێو)یش (ئاڵ)ە و (لیمۆ)یش ڕەنگی (زەرد)ە، بەلای منەوە (لیمۆ) بۆ ئەم شوێنە ناگونجێ و، (لێو) ڕاستە.

خۆ ئەگەر لە ڕووی چێژی لیمۆوە سەرنج بدەین کە (لیمۆ) شیرینە و لەگەڵ شیرینیی شەککەرینی ناو هەڵبەستەکەدا دەگونجێ ئەوا دەبێ بزانین کە (لیمۆ) جۆری (ترش)یشی هەیە و چێژی (ترش) لەگەڵ شیرینی شەکرینی (لێوە ئاڵەکە)دا ڕێک ناکەوێ و لەبەر ئەمەش (لیمۆ)یەکەم کردە (لێوی).

زەنگی بەچە: بێچووی (منداڵی) زەنگی.

زەنگی: زەنجی و مەبەست لە خەڵکی دوورگەی (زەنگبار = زەنجبار)ە کە کەوتووەتە لای ڕۆژهەڵاتی کیشوەر (قارە)ی ئەفەریقا یا (کیشوەری ڕەش = القارە السوداء)وە لە بەشی ناوەڕاستیدا لە ناو زەریا (محیط)ی هیندیدا کە نزیکە لە شاری (دار السلام)ی ڕژێمی وڵاتی (نایرۆبی)یەوە. هەروەها کەسانی ناوچەکە و کیشوەرەکە بەتێکڕایی و هی ئەو دووۆگەیە بەتایبەتی هەموو (قولەڕەشن) واتە ڕەش پێستن، وەک (کوردی) لەم تاکە هەڵبەستەیدا:

(خاڵە ڕەشەکانی) لالێوی خۆشەویستەکەی چواندووە بەمناڵی قولەڕەشەکانی ئەو دوورگەی (زەنگبار)ە، کە مناڵی ئەو (زەنگی – یا – زنجی)یانەش هەموو ڕەشن. وە لەبەرئەوەی ئەو خاڵە ڕەشانە (ئەو مناڵە زەنگییە ڕەشانە) بەنزیکی لێوی شیرینی یارەکەی (کوردی)یەوەن، بۆیە ئەو مناڵانەی چواندوون، بەشەکرفرۆشی شەکری شیرینی لێوەکەی، کە لە کاتی ماچکردندا شیرینی و خۆشییەکەی ئەزانرێ.

شەککەر: شەکر.

٤– ئەم تاکە هەڵبەستە لە سەرچاوەکانی (بەرباخەڵ، کۆن، سیسە، عن، نامیق، ما، عەلی کەمال، کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی/٦، نم/١، نن) و سەرچاوە دەمییەکاندا چوارەمین تاکی ئەم (چامە)یەیە و، لە (بەرباخەڵ)دا دووەمە و لە (ص)دا نییە.

نەی: جۆرە (قامیش)ێکە لە وڵاتە گەرمەکانی جیهاندا دەڕوێت و لە قامیشی لای خۆمان گەلێ ئەستوورترە و قامیشی لای خۆمان لە تەمەنی هەرە نوێی و باریکاییدا زەرد و ڕەق دەبێ و ئەو (نەی)یەی وڵاتە گەرمەسێرەکان هەتا (تەمەنێکی زۆر) قامیشەکەش هەر سەوز و تەڕ و ئاودارە و، کە بگوشرێ تامێکی شیرینی لێ دێت و کە بەددان ئەگەر بکرۆژرێت و بمژرێ دیسان چێژی شیرینی دەدات، لەبەرئەوەیە کە (نەی) لە هەمان کاتدا بە(قامیشی شەکر)یش (نەیشەکەر)

ناوی دەرکردووە و لە کارگەکاندا (شەکر)ی لێ دەردەهێنرێت.
هۆنەران لەبەر شیرینی و ڕاست هەڵچوونی ئەم جۆرە قامیشە، قەد و باڵای خۆشەویستەکانی پێ دەچوێنن وە یا دەیچوێنن بەقەد و باڵای خۆشەویستەکانیان لە هەڵبەستیاندا.
دڵەی: لە (نم/١، نن، هەر پێنج سەرچاوە دەمییەکە، عەلی کەمال، نامیق، بەرباخەڵ، کۆن، سیسە)دا: (دڵی) نووسراوە.
لە (کۆن، عن، ص، ما)دا بەشێوە (دڵێ) = دڵەی نووسراوە کە من (دڵەی)یەکەم پێ پەسندترە و وێژەییانەترە، بۆیە جێگیرم کرد.
ئەفغان: فوغان، فیغان، زاری و ناڵە و هات و هاوار.
٥- ئەم تاکە لە (کۆن، سیسە، ص، عن، ما)دا پێنجەمین تاکی ئەم (چامە)یەیە لە (بەرباخەڵ و نم/١، عن، عەلی کەمال)دا سێیەمینە و لەوانی تردا نییە.
نیگاه: تێڕوانین، تەماشاکردن و سەرنجدان و بینینی (یارەکە) مەبەستە.
جیلوە: ساودار، ساف و لووس و پڕتەوین، پرشنگ.
مەهڕوو: مانگ ڕوو، ئەوانەی ڕوویان وەک ڕووی مانگ ڕووناک و بێگەردە.
کاکۆڵ: بەزۆری و تێکڕایی مەبەست لە موو (قژ)ی سەری نێرینەی مرۆڤە وا من بەدرێژی لە لێکدانەوەی ئەم وشەیە لەم پەڕاوییەدا دوام و لە هەندێ هەڵبەستدا کاکۆڵ بۆ مێینەیش هاتووە، وەک لەو لێدواندنەمدا، نموونەم لەسەر هێناوەتەوە.
لەم تاکە هەڵبەستەدا (کوردی) خۆشەویستەکەی خۆی بە(مێینە) دیاری کردووە و ئەوەتا فەرموویە تەنیا تەماشاکردنێکی ئەو ناگۆڕمەوە وە یا نادەم بەهەرچی کاکۆڵ بەسەرێکە.
نایدەم (نم/١، عەلی کەمال، نن، نامیق، ما، سەرچاوە دەمییەکان): نادەم - لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو سەرچاوەکانی تردا (نایدەم)یان نووسیوە و من ئەمەیانم لا پەسندتر بوو، چونکە ئەو (ی)ی (نایدەم)ە دەگەڕێتەوە بۆ (نیگای جیلوەکە) و لە (نادەم) بەهێزترە بۆیە (نایدەم)م لە تاکە هەڵبەستەکەدا جێگیر کرد.
بەدۆشە (عەلی کەمال): بەجۆشە و کە هەڵەیە و ناگونجێ.
دۆش: شان، شان و مل - مەبەستی شۆڕبوونەوەی کاکۆڵەکەیە بەسەر شانیا.
٦- ئەم تاکە هەڵبەستە لە (کۆن، سیسە، عن)دا شەشەمین تاکی ئەم چامەیەیە و لەوانی تردا نییە. لە (عەلی کەمال)دا پێنجەمینە.
کەوی نابێ (عەلی کەمال، نم/١، نن): کە ڕوو نادا - ئەمەش ئەوەندەی (کەوی نابێ)یەکە گونجاو و بەهێز و پەسەند نییە کە هەر لەم نیو باڵییەدا (هاتنە ناو داو)یش هەیە کە (کەوی بوونی)ی لێوە نزیکە.
ناو داو (عەلی کەمال): ناو ڕام - ئەشێ ناو (دام) = (داو) بێ واتایش دەدات.
تووش: ئەم وشەیە لە پاشبەندا لەسەر شێوە و دەنگ و ئاهەنگی پاشبەندەکانی تر ئەم (چامە)یە نییە و ئەمەش لە دەستووری وێژەی کۆندا چەشنە لاوازییەکە، ئەگەرچی ڕێگەیش

دراوە کە پاشبەندەکانی تر بە(دۆشە) کۆتاییـیان دێت و، لێرەدا بەشێوەی (وشە)یە کە هاوچەشنی ئەوان نییە.
هەروەها (ئاسک) بە(داو) ناگیرێ و لە هەندێ شوێندا بە(تۆر) ئاسک دەگیرێ و بە(تەڵە)یش دەگیرێ لە بەفری (داو)ەکەم بەلاوە نەگونجاوە و بەهەرحاڵ لە ناچاری زۆردا. کەواتە (نایەتە ناو ڕام)ی سەرچاوەکەی (عەلی کەماڵ) بەگونجاوتر دەزانم.

٧- ئەم تاکە لە (نم/١، نن، نامیق، ما)دا پێنجەمینە و لە (ص)دا سێیەمینە و لە (بەرباخەڵ)دا چوارەمینە و لە (عەلی کەمال)دا شەشەمینە.
ڕفاندووم (عەلی کەمال، بەرباخەڵ، ص): فڕاندووم.
ئەمێستەش (کۆن، بەرباخەڵ، گوڵزار): ئەمێستەیش.
ئەمێستەش (عەلی کەمال): ئەمێستاش. وە (ئەمێستەش) لە هەمووان گورجتر و سوارترە، بۆ کێشی هەڵبەستەکە.
بەئوممێد و (کەشکۆڵی کەلەپوور/٦ لاپەڕە ٥٢): بەئوممێدی نووسراوەوە لە دەقی دەسنووسەکەی ناو ئەم سەرچاوەیەدا بە(ئومید طماع عقل هۆشە)یە. وەهای بۆ دەچم دەسکاری یا گۆڕان لەم تاکە و ئەوی دواییدا ڕووی دابێ، بەتایبەتی لە (ئومید و تەماع) یا (ئومێدی طەماع)دا.

٨- ئەم تاکە لە (ص)دا چوارەمین و لە (بەرباخەڵ)دا پێنجەمین و لە (نامیق)دا شەشەمینە و لە (کۆن، عن)دا حەوتەمینە.
زاری: گریان، ناڵە و فوغان لە خەفەتاندا.
شین: گریانە بەسەر و ئەژنۆی خۆداماڵینە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشەویستەی (کوردی) کوردی نەمردووە کە (شین)ی بۆ بکرێ چونکە شین بۆ مردنە و ئەم وشەی (شین)ەم بەلاوە وەهایە لە گۆڕان لەم وشەیەدا ڕووی دابێ.
ئەم تاکە یەکەمین جارە لە (کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی بەرگی/٦)ی مامۆستا قەرەداخیدا بەچاپکراوی دەیبێتم.
زاری (بەرباخەڵ، کۆن): شیوەن - من ئەم (شیوەن)ەش، بەجۆرە گۆڕانێکی دیکە دەزانم، چونکە (شیوەن و شین) هەر دووانیان یەک شتن و یەک واتا دەدەن بەلامەوە وەهایە کە گۆڕان یا دەسکاری لەم تاکە و ئەوی پێشوویدا ڕووی دابێ.
لە دەستی: واتە لە دەست خۆشەویستەکە.

٩- ئەم تاکە لە (ص)دا پێنجەمین و لە (بەرباخەڵ، نم/١، نن)دا شەشەمین و لە (سیسە، نامیق، عەلی کەمال)دا حەوتەمین و لە (عن)دا هەشتەمین تاکی ئەم چامەیەیە.
ڕسوا (بەرباخەڵ، سیسە)دا: شەیدا - و ئەویش ئەوەندەی بوونی (ڕسوا)یەکە بەهێز نییە.
منە خۆ (بەرباخەڵ، سیسە، نم/١، نن، گوڵزار، نامیق، عەلی کەمال): لە هەمووواندا نووسراوە (منیشە) بەڵام (منە خۆ)یەکەی سەرچاوەکانی تر لە ڕووی زمانییەوە بەجێترە، چونکە

(منیشـە)کە کە (ش) بـێژەر (خودی) شاعیری تیایە ئەمە (اضافـە)یە دەبێ (دووەم جار) وشـەکە یا ناوەکە پیتی (ش)ی تیا بێ، وەک لەم تاکەدا هاتووە.

کەواتە (منیشـە) و بەدوای ئەودا (تۆشـە) ناگونجێ، چونکە هەر یەک (اضـافـە) هـەڵدەگرێ و بۆیە (منە خۆ)یەکە ڕاستترە لە ڕووی زمـانییـەوە و ئەمـجـا (ئەگەر عـەینی خـۆ عـەیبی تۆشـە) دروست و گونجاوە.

١٠- ئەم تاکە هەڵبـەسـتـە لە (ص، مـا)دا شـەشـەمین و لە (بەرباخـەڵ، نم/١، نن)دا حـەوتەمین و لە (نامـیق، عـەلی کـەمـال)دا هـەشـتـەمین و لە (عن)دا نۆیەمین تاکی ئـەم چامـەیەیە. وە لە (کۆن) و (سیسـە)دا نییە.

چونکە: (نم/١، نن، عـەلی کـەمـال، بەربـاخـەڵ، کـۆن، سـیـسـە)دا نووسـراوە (چونکی) ئەمـیش هـەرچـەند دەشـێ و دەگـونجێ، بەڵام فـارسـی ئامـێـزە و لـە سـەرچاوەکـانی تردا (چونکە) نووسراوە، کە لە تاکە هەڵبەستەکەی سەرەوەدا ئەمەیانم هەڵبژارد و جێگیرم کرد.

لە لای من: لـە (نم/١، نن، عـەلی کـەمـال، نامـیـق)دا نووسـراوە: (لە کن من) کـە لە تاکـەکـەی سـەرەوەدا من (لە لای من)ەکـەم، جـێگیـر کـرد و بـەپەسندترم زانی وەک لە سـەرچاوەکـانی تریشدا هەر (لە لای من) نووسراوە.

ئەم شـارە: ئەشـێ مـەبەسـتی لە شـاری سـولەیمانی یا شـارێکی کـوردسـتـان بـێ، چونکە لە دوا تاکی هـەڵبەسـتەکەدا نازناوی (کوردی) هەیە کـە ئەم نازناوەش هەر لەو هـەڵبەستـانەیدایە کە لە (سولەیمانی) یا لە کوردستاندا دای ناون.

١١- ئەم تاکـە لە هـەمـوو سـەرچاوەکـاندا دوا تاکی ئەم هـەڵبـەسـتـەیە، ئەگـەرچی ژمـارەی تاک لە هـەمـووانیـاندا نـەگـەیشـتـوونەتە تاکی یانزەیەمـین. چونکە لـە (ص) و (مـا)دا حـەوتـەمین و لە (بەرباخـەڵ، کۆن، سـیـسـە، نم/١، نن)دا هـەشتـەمین و لە (نامـیق، عەلی کەمـال)دا نۆیەمین و لە (عن)دا دەیـەمین تاکـە هـەڵبـەسـتی ئەم چامـەیەیە، هـەرچی وەکـو سـەرچاوەی (کـەشکۆڵی کـەلـەپووری کـوردی بـەرگی/٦ و لاپەڕە ٥٢)دا ئۆفـسـێـتی دەقی دەسنـووسی هـەڵبـەسـتـەکـە بەتەواوی هـەروەک تاکە هەڵبـەستـەکانم پێشکەش کردن، زنجیـرەی یەک لە دوای یەکیـان وەک ئەم سـەرچاوەیـەیە و بۆیە لـە نێـوان سـەرچـاوەکـانـدا ئەم سـەرچاوەیە و «عن»م کـردە بنکەی ساغکردنەوەی ئەم چامەیە.

بەڵام سەرچاوە دەمییەکان کە لە دەقی (٥) کەسە کەڵە وێژەوان و هۆنەرەکانمان وەرم گرتوون، زنجیرەی یەک لە دوای یەکی تاکەکانی ئەم چامەیەیان بەتەواوی وەک (نم/١، نن، عەلی کەمال) وەها بوون واتە (٩) تاکیان تیا نووسراوە.

**خاوەنی ئەم هەڵبەستە:**

هـەروەک لـە سـەرەتاوە ڕام گـەیاند، لە سـەرچاوەکـانی (عن، ص، نامـیـق، مـا، وە هەر پێنج مـامـۆسـتـا و مـەلا چاک و وێژەوان و هـۆنەرەکـانمـاندا کـە ناوم بـردوون و بەدەمی پێـیـان ڕاگەیاندووم کە ئەم هەڵبەستە هی (کوردی)یە. کە ئەم هەڵبـەستـەیان بە هی (کوردی) داناوە

جگە لەم سەرچاوەیانەی ئیتر لە سەرچاوە دەسنووس و چاپییەکانی تریاندا لە هەموویاندا، واتە نیو باڵی (مەصرەع)ی دووەمی ئەم دوا، تاکە هەڵبەستەدا، لە جێگەی نازناوی (کوردی)یەکە وشەی (ئەمڕۆ)یان نووسیوە و بەمن گەیاندووە، لەبەرئەوەی کە لە سەرەتای ئەم دووەمین نیو باڵەشدا، وشەی (غەریب) هاتووە ئەو سەرچاوانەی تر، ئەم (غەریب)ەیان بەنازناوی هۆنەرەکەی داناوە و، داویانەتە پاڵ هۆنەرێکمان کە گوایە (غەریب) بووە، لە کامیاندا ساغ نەکراوەتەوە کە ئەو (غەریب) (نازناو) بووە یا (ناو)ی خودی شاعیرەکە بووە، تەنیا لە (عەلی کەمال)دا نووسراوە کە (میرزا غەریب) بووە و دەری نەخستووە کە ئایا ئەم (ناو) یا (وشە)ی (غەریب) (ناو)ی خودی شاعیرەکە بووە وە یا (نازناو)ەکەی بووە، بەلآم ئەوانی کە ڕام گەیاندن (نازناو)ی (کوردی)یان لە جێگە وشەی (ئەمڕۆ)ی ناو ئەم نیو باڵی دووەمەدا دیاری و جێگیر کردووە کە بەو هۆیانەوە و بەهۆی لێکچوونی مۆرکی هەڵبەستی کوردی بەمۆرکی ئەم هەڵبەستەوە و بەهۆی ئەوەوە کە هەندێ (بیر) و (وشەگەل)ی ناو ئەم چامەیەش لە هەڵبەستەکانی تری (کوردی)دا زۆر هاتوون، بۆیە لێرەدا بە هی (کوردی)م دانا.
هەروەک لەو ناوەرۆکەی ئەوی لەسەر ئەم چامەیە نووسیومە دەردەکەوێ کە لەم هەڵبەستەدا و لە هەڵبەستی: (ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لە لاتان)دا و چەند هەڵبەستێکی تری ناو ئەم پەڕاوییە ئاڵۆزی و شێواوی و بیروڕا لێک جیاوازیی ناو سەرچاوەکانیان یەکجار زۆر بوون.
منیش ئەوەندەی توانیم سەرچاوەم لە بارەیانەوە دەست بکەوێ و بەقووڵی لەم چەشنە هەڵبەستە ئاڵۆزە ڕووچووم و بەپێی توانایی خۆم ئەوەم لەسەر ڕاگەیاندوون کە من بڕوام پێی هەیە.
سا ئەگەر سەرچاوەی تر لەمەودوا دەرکەوتن وە (بڕوا) و (ڕا)یەکەمیان ژێر خست ئەوە بە: (ڕاستی دەرکەوتن)ی دەزانم کە منیش لە سنووری دەستووری (ڕاستی دەرخستن) دەرنەچوونم، بەپێی سەرچاوەکانم. هەرچۆنێک بێ من ئەوەندەی لەسەر ئەم چەشنە هەڵبەستە ئاڵۆزانە گردم کردوونەتەوە و لێیان تۆژیومەتەوە؛ بناغەیەکی پوخت و ئامادەکراو دەبێ بۆ هەر کەسێ دوای من بەپێی سەرچاوەی تر لەم جۆرە هەڵبەستانە بکۆڵێتەوە و، یا بەشکو هەر خۆم سەرچاوەی ترم دەستبکەوێ کە پتر پشتگیریی وێکەوتنەکانم بکەن و، یا لەسەر ڕاو بۆچوونەکانم پاشگەزم بکەنەوە و ئەمەش لە ملی ڕۆژگاری ئایندەدایە.